

عەباسی میلانی

# مەتەڵۆکەی هووەیدا

وەرگێڕانی

عەبدوڵڵا حەسەن زادە

عەبباسی میلانی

# مەتەڵۆکەی هووەیدا

وەرگێڕانی لە فارسییەوە
عەبدوڵڵا حەسەن زادە

کوردستان ٢٠١٠




حكومەتی هەرێمی كوردستان

وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوان

بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوكردنەوە

بەڕێوەبەرایەتی خانەی وەرگێڕان

[illegible]

- ناوی كتێب: مەتەڵۆكەی هووەیدا
- نووسەر: عەبباسی میلانی
- وەرگێڕانی لە فارسییەوە: عەبدوڵڵا حەسەن زادە
- بابەت: یادەوەری
- پیتچنین: عەبدوڵڵا حەسەن زادە
- هەڵەبڕی: عەبدوڵڵا حەسەن زادە
- دیزاینی ناوەڕۆك: نزار نوری
- بەرگ : ئارام عەلی
- تیراژ: ٧٥٠
- زنجیرە: ٣٠١
- چاپخانە: شڤان
- چاپ: چاپی دووەم ٢٠١١
- ژمارەی سپاردن: (١٩٨٥) ساڵی (٢٠١٠)

# پێرست


کورتە پێشەکییەک ........................................ ٩

فەسڵی یەکەم... پردی مەراق ........................ ١٣

فەسڵی دووەم... بەرزەخی بەیرووت ................... ٤٥

فەسڵی سێیەم... عەودالی پاریس ........................ ٨٣

فەسڵی چوارەم... سەرزەمینی سەمەرەکان ............ ١١١

فەسڵی پێنجەم... گەڕانەوە بۆ پاریس ................... ١٣٥

فەسڵی شەشەم... ساڵانی سەرگەردانی .................. ١٦٥

فەسڵی حەوتەم... شۆڕشی سپی ............................ ٢٠٣

فەسڵی هەشتەم... کۆمەڵی پێشکەوتنخواز ............ ٢٣٥

فەسڵی نۆیەم... زستانی نەقابلییەکان ................. ٢٦٥

فەسڵی دەیەم... یادداشتەکانی سەردەمی شەڕ ........ ٢٩٧

فەسڵی یازدەیەم... سیاسەت لە پۆمپەیی نەوتەلاَندا ..... ٣٣٩

فەسڵی دوازدەیەم... دۆڵی جندۆکان ..................... ٣٩٩

فەسڵی سێزدەیەم... ڕووخانی پۆمپەیی ................... ٤٣٣

فەسڵی چاردەیەم... قوربانی .............................. ٤٧٧

فەسڵی پازدەیەم... قازیی شۆڕش ......................... ٥٢٥

فەسڵی شازدەیەم... گۆلی سەهۆڵبەستووی کاکیتووس ...... ٥٥٣

# کورتە پێشەکییەک

**خوێنەرە بەڕێزەکان!**

کتێبی بەر دەستتان وەرگێڕاوی کتێبی "معمای هویدا" نووسینی نووسەرو لێکۆڵەری دوورەوڵاتی ئێرانی دوکتۆر "عباس میلانی"یە کە باس لە بەشێکی گرنگی ڕووداوەکانی دوامانگەکانی تەمەنی سیستمی پادشایەتیی بنەماڵەی پەهلەوی لە ئێران و مانگەکانی سەرەتای هاتنەسەرکاری کۆماری ئیسلامی لەم وڵاتەدا دەکا. هەر وەک نووسەر لە پێشەکیی چاپی فارسیی کتێبەکەدا دەڵێ ئەم کتێبە لە سەرەتادا بە زمانی ئینگلیسی نووسراوەو دوایە دەگەڵ ئەوەی دۆستانی پێشنیاریان پێ کردوە بیکەنە فارسی ، بە سێ هۆ بە باشی زانیوە هەر بۆخۆی ئەرکی وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی فارسییش وەئەستۆ بگرێ. سێ هۆیەکە ئەمانە بوون:

١- بەشی زۆری ئەو بەڵگەنامە فارسییانەی کەلکی لێ-وەرگرتوون وەدەستهێنانیان بۆ وەرگێڕەکان ئاسان نەبووەو لەوحاڵەدا ناچار دەبوون لە ئینگلیسییەوە بیانکەنەوە فارسی کە ئەوکارە تارادەیەک زیانی بە ڕەسەنایەتیی بەڵگەنامەکان دەگەیاند.

٢- لە ماوەی نێوان بڵاوبوونەوەی چاپی ئینگلیسیی کتێبەکەو ئامادە بوونی وەرگێڕاوە فارسییەکەدا هێندێ بەڵگەی تازەی دەست

کەوتوون، کە لێی زیادکردوون و، جگە لەوەش هێندێ لە خاوەن نەزەران ڕێزە تێبینییەکیان لەسەر دەقە ئینگلیسییەکە داوەتێ کە لە چاپی فارسیدا لەبەر چاوی گرتوون.

٣- لە چاپی ئینگلیسیدا هێندێ ڕوونکردنەوەی هێناون کە بۆ خوێنەری ئێرانی و بەگشتی فارسیزمانان و فارسیزانان بە پێویست نەزانراون، و هەربۆیە لە وەرگێڕاوە فارسییەکەدا لای بردوون. ئەمەشیان زیاتر هەقی نووسەر خۆی بووە نەک هی وەرگێڕێکی دیکە.

دەگەڵ هەموو ئەو تێبینیانەی نووسەر، کتێبەکە لە لایەن کەسانی دیکەوە کراوەتە فارسی، بەڵام لەبەر ئەوهۆیانەی سەرەوە چاپی کوردی لە ڕووی وەرگێڕراوی نووسەر واتە دوکتۆر میلانییەوە کراوەتە کوردی.

ئەوەی منی هێنایە سەر بڕیاری وەرگێڕانی ئەم کتێبە بۆ سەرزمانی کوردی پێش هەموو شتێک ئەوە بوو کە نووسەری بەڕێز بە شێوەیەکی زانستی و بە بەڵگەوە فەسڵێکی گرنگ لە ڕووداوەکانی ئەو قۆناغەی مێژووی ئێرانی نووسیوەتەوەو بە تایبەتی نموونەیەکی ڕوونی لە بێ ئەخلاقی و بێ پرەنسیپی هەردوو ڕێژیمی پادشایەتی و کۆماری ئیسلامی بەدەستەوە داوە.

هاندەری دیکە بۆ ئەوکارە بێلایەنی و واقیعیبوونی نووسەری بەڕێز لە گێڕانەوەی ڕووداوەکان و تۆمارکردنی ڕاستییەکاندایە، بەجۆرێک کە لەماوەی خوێندنەوەو وەرگێڕان و چەند جار پێداچوونەوەی ئەم کتێبەدا نەمتوانی حوکم بدەم کە بەڕاستی دوکتۆر عەبباسی میلانی دژبەری ئەمیر عەبباسی هووەیدا سەرۆکوەزیری پێشووتری ڕێژیمی پەهلەوی بووە یان دۆستو لایەنگری. هەرچەند ئەوە ئاشکرایە کە ناوبراو لە ڕیزی دژبەرانی بنەماڵەی پەهلەویدا بووە.

داوەریی کۆتایی لەسەر بایەخو گرنگیی ئەوکارەی نووسەرو ڕادەی سەرکەوتوویی وەرگێڕ لە گوازتنەوەی نێوەرۆکەکە بۆ نێو زمانی کوردی بۆ ئێوەی خوێنەرانی وردبین بەجێ دێڵم. بەڵام لە کۆتاییدا ئەوەندە زیاد دەکەم کە چوونکە سەرچاوەکان هەموویان بە فارسی یان بە زمانە بێگانەکان بوون، بە باش یان بە پێویستم نەزانی بیانکەمە کوردیو لە ئاکامدا بۆ ئەوەی خۆم لە هەڵەو پەڵەش پاراستبێ هەر لە ڕووی چاپی فارسییەوە سەرچاوەکانم کۆپی کردو کردمنە تەواوکەری وەرگێڕاوە کوردییەکە. بە ئاواتی پەسندکردنو ڕەزامەندیی ئێوەی خوێنەرانی ئەم بابەتە.

**کۆتایی مانگی مەی (ئایار)ی ٢٠١٠**

**وەرگێڕ**

# فەسڵی یەکەم

## پردی مەراق

**لەسەر پردی مەراق کۆشکێک لە لایەکەو بەندیخانەیەک لەلایەکی دیکە**

**بایرۆن**

# پردی مەراق

بە درێژایی تەمەنی، کتێب جێحەوانەوەو پەناگەی بوو؛ جێیەک کە بەدوور لە گرفتارییەکانی ژیانی ڕۆژانە ڕووی تێ دەکرد. لە ڕۆژگاری ئازادیدا مێژوو نەخشەیەک بوو کە بۆ تێپەڕین لە ئاوە پڕمەترسییەکانی ئەو شتەی ناوی نابوو دنیای "بێزانسی"ی[1] سیاسەت کەلکی لێ وەردەگرت. بەڵام لە بەندیخانە، بە تایبەتی لەو ڕۆژەوە کە ببووە بەندیی شۆرشی ئیسلامی، ڕابردوو ببووە چرای ڕێگای دوارۆژی.

هەشتی خاکەلێوەی ١٣٥٨(١٩٧٩)بوو. نیزیکەی شەش مانگ لە سەردەمی بەندیخانەی هووەیدا تێپەڕیبوو. حەڤدەی خەزەڵوەری ١٣٥٧(١٩٧٨)، شا بەو هیوایە کە تەماعی وەبەر شەپۆلی ڕوولەهەستانی شۆرش نابێ، فەرمانی گرتنی هووەیدای دەرکرد. بەڵام ئەم شەپۆلە تەماعی وەبەر نەدەنرا. زۆری پێ نەچوو کە لە بەفرانباری ١٣٥٧(١٩٧٨)دا شاو بنەماڵەی پاشایەتی لە ئێران هەڵاتن و هیوایەکی واقیعبینانەش بۆ گەڕانەوە لەگۆڕێدا نەبوو. لەکاتێکدا بەشێکی زۆر لە سامانی خۆیان و بۆ وێنە سەگەکەشیان بە فڕۆکە دەگەڵ خۆیان برد، هووەیدایان کە ماوەی سێزدە ساڵ سەرۆک وەزیری جێی متمانەی شا بوو، لە ئێران بەجێ هێشت.

بەیانیی ڕۆژی۲۲ی ڕێبەندان سەرەنجام شەپۆلی شۆرش گەیشتە لێواری سەرکەوتن. لە بێسەرەوبەرەیی هەوەڵین ساتەکانی شۆرشدا، هووەیدا لە بەندیخانەی شادا بە تەنیا مایەوە. بەندییەوانەکانی تێکڕا ئەندامی ڕێکخراوی بێزراوی ساواک بوون و لەترسی گیانی خۆیان هەڵاتن. بەڵام هووەیدا ڕای نەکرد. بەڵکوو لەجیاتی لەخۆگرتنی مەترسییەکانی ڕاکردن، بڕیاری دا خۆ بداتە دەستی سەرکەوتووانی شۆرش. کاتێک کەف وکوڵ دامرکا، دەرکەوت کە هووەیدا بۆ نەگبەتی، بەرزترین کاربەدەستی ڕێژیمی پێشوویە کە کەوتۆتە دەستی شۆرشگێڕە ئیسلامییەکان. پێنج سەرۆک وەزیری دیکە ـ عەلیی ئەمینی، جەعفەری شەریف ئیمامی، جەمشیدی ئاموزگار، غولام ڕەزای ئەزهاری و شاپووری بەختیارـ هەموویان لە سەروبەندی سەرکەوتنی شۆرشدا لە ئێران هەڵاتبوون.

هووەیدا زۆربەی ڕۆژەکانی بەندیخانەی بەخوێندنەوە دەگوزەراند، بەڵام لەو ڕۆژە ساردە پاییزییەی وتوویژدا تەنیا نوسخەیەکی زێرکفتی قورئان لە پەنا دۆشەکی قاوشەکەی بەرچاو دەکەوت.[۲] قورئانی بۆ ڕێنوێنیی مەعنەوی و ڕەفتاری ڕووحی نەدەویست، بەڵکوو بۆ ئامادەکردنی بەرگریی خۆی لە دادگادا کاری پێی بوو. پێی وابوو لە دادگایەکی ئاشکراو دیارە بەپێی ڕێ و شوێنە ئیسلامییەکان دادگایی دەکرێ.[۳]

لە بەندیخانە هێندێ جار ڕۆمانی پۆلیسیی دەخوێندەوە. لە سەردەمی لاوێتییەوە خوێنەرێکی بەردەوام و تامەزرۆی ئەو جۆرە نووسراوانە بوو. زۆرتر ئۆگری ئەو بەرهەمانە بوو کە بە شێوازی داشیل هامێت و ڕیمۆند چاندلێر نووسرابوون و لە فەڕانسە لەژێر کۆمەڵە نووسراوێک بەناوی"سێری نوار" Serie Noirدا چاپ دەکران.[٤] هەر لەو کاتەدا هێندێ کتێبی دەربارەی شۆرشی فەڕانسەو چین لە دوکتۆر فریشتەی ئینشای پوورزای داوا کردبوون. ئێستا ئیدی ئەو "تێرۆرە شۆرشگێڕانە" ترسناکەی لەو کتێبانەدا خوێندبوونیەوە، تێرۆرێک کە

هەمیشە لەسەر هەق و قین لەزگ و بێ بەزەیی بوو، تەنیا چەمکێکی رووتی مێژوویی نەبوو. لەوساتە چارەنووس سازەوە کە خۆی دابووە دەستی بەرپرسانی شۆرشی ئیسلامی، ئەو رقەو دیارە ئەمجارە لە بەرگێکی ئیسلامیدا ژیانی رۆژانەی وی پێک دێناو سێبەرێکی بەترس‌ولەرزی خستبووە سەر.

لە رۆژانی خۆشی رابردوودا هووەیدا هەمیشە گوڵێکی ئۆرکیدەی لە یەخەی چاکەتەکەی دەدا."فرانچیسکۆ ئیسمالتۆ"ی ئیتالیایی جلەکانی بۆ دەدروو. ئەو هەر لەوکاتەدا خەیاتی شاش بوو. بەڵام دیارە هووەیدا دەی زانی کە شا"دوچاری نەخۆشیی خۆبەزلزانینە".[5] ئەو دەیزانی کە شا دەگەڵ سەرۆک وەزیرێک هەڵناکا کە پێ لەبەرەی خۆی زیاتر راکێشێ. بۆیە لەبارەی ئاشکراکردنی ناوی خەیاتەکەیەوە بە پارێزەوە رەفتاری دەکردو ناوی نەدەبرد.[6] لە بەرامبەردا بۆ هەڵبژاردنی کراواتە رەنگاورەنگەکانی بە تەواوی پارێزی وەلا دەناو زۆرجار رەنگی هەرکامێکیان دەگەڵ رەنگی ئەو ئۆرکیدەیە کە ئەو رۆژە لە بەرۆکی چاکەتەکەی دەدا، یەکی دەگرتەوە.

بەڵام ئەو رۆژەی مانگی خاکەلێوە خەبەرێک لە نازو نیعمەتەکانی رابردوو نەبوو. سەری بەرەو رووتانەوە دەچوو، کڵاوێکی گەرگەرێی رەنگ تاریکی لەسەر بوو، و لسپێک لە قژە سپی و ئاڵۆزەکەی لەملاوئەولای کڵاوەکەی سەری وەدەر نابوو. کراسێکی بە گنج ولۆنجی رەنگ تاریکی دەبەردا بوو، و شەڵوارێکی هەر لەو جسن و رەنگەی دەپێدا بوو، و کاتێک دادەنیشت، ئێسکی گوێزینگی لاقی بەتەواوی دەردەکەوت. وەکازەکەی لە تەنیشت دۆشنەگەکەی بوو. کەڵکوەرگرتن لە وەکازی دەگەڕایەوە ساڵی١٣٤٣(١٨٦٤). ئەو ساڵە لە رووداوێکی ترومبیلدا ئێسکی ئەژنۆو لەگەنی ئازاری پێ گەیشتبوو[7]، بەڵام دوای چاکبوونەوەش وەکازەکەی دانەنا. لە جیهانی زۆرجار بەگومان و رەشبینیی سیاسیی ئێراندا [8] هێندێک کەس دەیانگوت کەڵکوەرگرتنی هووەیدا لە وەکاز هەر بۆ خۆرانانەو پێویستیی پێی نیە، [9] بەڵام

پزیشکان باوەڕیان وابوو کە هووەیدا پاش ئەو ڕووداوە هەمیشە دەترسێ خۆی بە پێوە ڕانەگرێ و هەربۆیە وەکاز بەکار دێنێ.
ڕەخنەگرانی دەیانگوت هووەیدا هەمیشە لە پلەوپایەی خۆی لە مێژوودا نیگەران بووە. دەیزانی کە لە مێژووی هاوچەرخی ئێراندا، هەرکام لە سەرۆک وەزیرە بەناوبانگەکان بە نیشانەیەک ناسراونەتەوە. یەکێک کڵاوێ سیلەندەری لەسەر ناوە، ئەوی دیکە بە چاویلکە باریکەکەی ناسراوەتەوە، سێیەمین پەتووو پێژامەکەی کردبووە نیشانەی سەرۆک وەزیرییەکەی. وەکازو گوڵی ئۆرکیدەو پیپیش نیشانەی تایبەتیی هووەیدا بوون.[10] بەڵام لە بەندیخانەی کۆماری ئیسلامیدا هیچکام لەو نیشانانە جێگایەکیان نەبوو. ئەو کە لاوازو دڵ-شکاو بوو، پێوستیی بە وەکاز نەبوو تا بەهۆیەوە هەمیشە بەژنی خۆی بە بەرزی و جاروبار بە سەرکێشییش ڕابگرێ.
هووەیدا دوو حەوتووی کۆتایی ڕەشمەو سەرەتای خاکەلێوەی لە بەندیخانەی قەسرێ بردبووە سەر. پێش ئەودەم چەند ڕۆژێک لە مەدرەسەی "رفاه" ڕاگیرابوو. پاش سەرکەوتنی شۆرش ئەو مەدرەسەیە بۆ ماوەیەک جێی مانەوەی ئایەتوڵڵا خومەینی بوو، و هەر لەبەر ئەوەش ببووە ناوەندی شۆرش. ئەو مەدرەسەیە لە نێوەڕاستی دەیەی ٤٠دا دامەزرابوو، وەک پێگەیەک بۆ ئامۆژگارییە مەزهەبییەکان و قەڵایەک بەرامبەر بە فێرکردن وبارهێنانی نوێ کەلکی لێوەردەگیرا. عەلی ئەکبەری هاشمیی ڕەفسەنجانی و [ئایەتوڵڵا] عەلیی خامەنەیی لە دامەزرێنەرانی ئەو مەدرەسەیە بوون و کاری ئەم داموودەزگایە ڕاست لە ساڵی١٣٤٧(١٩٦٨)دا، واتە سێ ساڵ دوای ئەو ڕۆژە کە شا بۆ یەکەم جار هووەیدای کردە سەرۆک وەزیر دەستی پێکرد.[11]
مەدرەسەکە دراوسێی دوو خانووبەرەی گرنگی دیکە بوو کە هەرکامەی بایەخێکی تایبەتیی مێژوویی و سیمبولیکیان هەبوو. دەکرێ بڵێین ئەو دراوسێیەتییە هێماو جەفەنگێکی مێژووییشی تێدا بوو. لەلایەک مەجلیسی شووراو لەلای دیکە مزگەوتی سوپاسالار. یەکیان نوێنگەی شۆرشی مەشرووتە بووو ڕەوتی عورفی و قانوونی لە مەیدانی

سیاسەتدا دەسکەوتی ئەم شۆڕشە بوو. ساڵی ١٣٤٤(١٩٦٥) دۆستی نیزیکی هووەیدا حەسەنعەلیی مەنسوور، راست ڕووبەڕووی دەرگای ئەم مزگەوتە کەوتە بەر گوللەی چەکدارە موسوڵمانەکان و کوژرا. مەنسوور لەوکاتەدا سەرۆکوەزیری ئێران بووو بەمردنی وی سەردەمی سەرۆک وەزیریی هووەیدا دەستی پێکرد. ئەو دەمانچەیەی بۆ کوشتنی مەنسوور بەکار برا لەلایەن هاشمیی ڕەفسەنجانییەوە ئامادە کرابوو.[١٢]

لەولایەوە ، مزگەوتی سوپاسالار هەبوو، کە بە یەکێک لە گرنگترین شوێنە مەزهەبییەکانی تاران دەژمێردرا. پەنجا ساڵێک دەبوو کە گرنگترین ڕێوڕەسمەکانی تازیەو مەجلیسی پرسەی گەورە بەرپرسانی سیاسیو نیزامی و هێندێ جار زانستی و ئەدەبیی وڵات لەو مزگەوتەدا بەڕێوە دەچوون. مزگەوتەکە بەشێک لە مەوقووفەکانی سوپاسالار، خاڵی دایکی هووەیدا واتە ئەفسەرولملووک بوو. هەر بۆیە، ئەفسەرولملووک وەک یەکێک لە سەرپەرشتانی ئەو مەوقووفەیە مانگانە دەوری سەد تمەنی لە داهاتی مزگەوت وەردەگرت.[١٣]

بە ڕووخانی ڕێژیمی پەهلەوی، خانووبەرەی مەجلیسیش چۆڵ و هۆڵ دەهاتە بەرچاو. دیارە بە پێچەوانەی قانوونی بنەڕەتیی ئێران لە دوو دەیەی کۆتایی دەسەڵاتی شادا، مەجلیس ببووە داردەستێکی بێدەسەڵاتی فەرمانەکانی پاشایەتی. بەجۆرێکی دیکە بڵێین، جەوهەرو نێوەرۆکی مەجلیس، لە توێکڵێکی بەتاڵ بەولاوە شتێکی لێ نەمابۆوە. لەسەروبەندی شۆڕشدا، ناوەندی قورسایی سیاسیی وڵات گوازرایەوە مەدرەسەی "رفاە". بیست ساڵێک بوو کە ئەم مەدرەسەیە، ئارامو بێدەنگ، لەسایەی دراوسێ بەشان وشکۆیەکانیدا خەریکی چالاکی بووو قوتابییە بژاردەکانی بەدەرس و ئامۆژگاریی مەزهەبی پەروەردە دەکرد. لە یەکەم ساتەکانی سەرکەوتنی شۆڕشدا، خەڵک ڕێبەرە پایەبەزەکانی ڕێژیمی پێشوویان، لە کەلێن و قوژبنەکانی شاردا دەگرت و وەک دیارییەک دەیان دانە دەستی ڕێبەرانی تازە. لە دوورەدیمەنی گوشادی مێژووییدا، ئەم لاپەڕەیە نەخش ونیگارەکانی دووهەزارو پێنج سەد

ساڵەی سەر دیوارەکانی تەختی جەمشیدی وەبیر دێنایەوە. لەوێدا ڕەعیەتەکان هەرکامەی دیاری‌و سەوقاتێک پێشکێشی پادشاکان دەکەن. بەهەرحاڵ، بوونی ئەو بەندییانە لە مەدرەسەی "رفاه" و لە تەنیشت ئایەتوڵڵا خومەینی، دراوسێیەتییەکی سەیری لەنێوان تێشکاوو سەرکەوتوودا دروست کردبوو.

ئایەتوڵڵا خومەینی لە ژوورێکی تەنیشت حەوشەی مەدرەسەکە دەژیا. بەندییەکانیشیان لە بەشێکی دیکەی مەدرەسە، ڕاست ڕووبەڕووی شوێنی ژیانی ئایەتوڵڵادا زیندانی دەکرد. لەحەوتووە پڕکەف‌وکوڵەکانی سەرەتای شۆڕشدا، حەوشەی مەدرەسە هەمیشە پڕ لەئاپۆرای خەڵک بوو. دەستەدەستە دەهاتنە ژووری حەوشە؛ بەدەنگی بەرزو بەڕەوانی هێندێ دروشمیان لە پەسنی ڕێژیمی تازەو زەممی ڕێژیمی پێشوودا دەدان، و پاش وەستانێکی کورت، جێیەکەیان دەدا بەتاقمی دوای خۆیان. دیارە نابێ گومانمان هەبێ کە ئەو شانۆ هەمیشەییەو ئەودروشمە پڕهەڕەشەو قیناوییانە هەموو ئەندامی بەندییەکانیان وەلەرزە خستوە.

هەر لەوساتە پڕئاڵۆزی‌و ترسهێنانەی سەرەتای شۆڕشدا، هووەیدا چاوی بە دوو کەسایەتیی گرنگی ڕێژیمی تازە کەوت. چەند ساتێک پێش ئەو دیدارە، ئایەتوڵڵا خومەینی ئەحمەدی کوڕی‌و یەکێک لە ڕاوێژکارەکانی، ئەبولحەسەنی بەنیسەدری بانگ کردبوو، پێی گوتبوون: "بیستوومە خەڵک هێندێک لەو بەندییانەیان دارکاری کردوە. "ئەمجار داوای لێ کردبوون لەجیاتی وی، سەردانی بەندییەکان بکەن‌و لەزمانوییەوە بڵێن "ئیسلام ئەو جۆرە وەحشیگەرییانە بە ڕەوا نازانێ. لەمەودوا بە دادپەروەرییەوە ڕەفتارتان دەگەڵ دەکرێ. دڵنیابن بەپێی ڕێ‌وشوێنی ئیسلام دادگایی دەکرێن." [١٤]

دوو نوێنەری هەڵبژاردەی ئایەتوڵڵا خومەینی، لەپێشدا چوونە ژوورێک کە تا ماوەیەک پێشتر پۆلی دەرس خوێندن بووو دوای شۆڕش کرابووە بەندیخانەی هێندێک لە فەرماندەرانی سوپای شاهەنشاهی. هێندێک لە بەندییەکان حەمیەتێکیان وە بەڵێنەکانی

بەنیسەدرو سەیدئەحمەدی خومەینی نەدا. تەنانەت جۆرێکیش سەرکێشی لە ڕەفتاریاندا بەر چاو دەکەوت. هێندێکی دیکەیان کەوتنە گریان و پاڕانەوە. سالاری جافیش یەکێک لە بەندییەکانی ئەو ژوورە بوو. ئەو بەهاوکاری دەگەڵ ساواک بەناوبانگ بوو. تەنانەت دەیانگوت کورسیی نوێنەرایەتیی پارلەمانیشی هەر لەڕێگای ئەو هاوکارییەوە، بەتایبەتی لەناوچەی کوردستاندا، بەدەست هێناوە. بەڵام ئەمجارە بەڕاویژێکی پرسووکایەتییەوە لەوەڵامی نوێنەرانی ڕێبەری شۆرشدا گوتی: " زۆر لەمێژ بوو نۆرە ڕاووڕووتی ئێمە بوو ئێستا نۆرەی چەپ-وگووپی ئەمانەیە".[١٥]

پاش وتوویژێکی کورت لەگەڵ ئەم بەندییانە، بەنیسەدرو سەیدئەحمەدی خومەینی چوونە ژوورێک لەوسەری دالانەکە. ئەمیر عەبباسی هووەیدا تەنیا بەندیی ئەم ژوورە بوو، ئەو بێگومان گرنگترین بەندیی ڕێژیمی تازە بوو، و ژووره تاقەکەسییەکەشی نیشانەیەکی ئەم پلەوپایە نەخوازراوە بوو. تەختێکی سەربازی لە سووچێکی ژوورەکە، و مێزێکی چووکەڵەی کانزایی بەڕەنگی شینەوە لە سووچێکی دیکە دەبینران. لەسەر مێزەکە ئاڵای سێ ڕەنگی ئێران بەرچاو دەکەوت، بەڵام نیشانەی"شیرو خورشید"یان کە نوێنگەی مەزنیی ئێرانی پێش ئیسلام، و لەنێوەڕاستی سەدەی سێزدەی هەتاوییشەوە نوێنگەی پادشایەتیی ئێران بوو، لە نێوەڕاستی ئاڵاکە هەڵ گرتبوو.[١٦] تەنیا پەنجەرە کە بە دیوی حەوشەیدا دەکرایەوە، داخرابوو، و شووشەکانیشی بە کۆنە ڕۆژنامە ئەویش بە شێوەیەکی ناڕێک وپێک داپۆشرابوون.[١٧]

کاتێک بەنیسەدرو ئەحمەدی خومەینی وەژوور کەوتن، هووەیدا خەریکی خوێندنەوە بوو. بەباوەڕی بەنیسەدر، حاڵەتێکی زۆر سەنگین و لەسەرەخۆی هەبوو.[١٨] تەنانەت بێخەمیش دەهاتە بەرچاو. هووەیدا هەمیشە مرۆڤێکی زۆر بەئەدەبو سەنگین بوو، و ئەمجارەش، هەروەک عادەتی بوو، زۆر بەڕێزەوە دەگەڵ ئەو دوو میوانە

بەرەورووو بوو. هەردووکیانی لەو وەختەوە دەناسی کە بۆخۆی لە دەسەلاتدا بووو ئەو دووانە کەسانێکی دوورەپەرێز لە بزووتنەوەی ئۆپۆزیسیۆندا بوون. ساڵی ١٣٤٤ (١٩٦٥)، ماوەیەک دوای دەست پێکردنی سەرۆک وەزیرییەکەی، یارمەتیی ئەحمەدی خومەینیی لاوی دابوو تا پاسپۆرتێک وەربگرێ و پێی بچێتە لای باوکی دوورخراوەی. پێوەندیی دەگەڵ بەنیسەدر لەوەش کۆنتر بووو دەگەڕایەوە ساڵی ١٣٣٨(١٩٥٩). لەو ڕۆژانەدا هوەیدا لە شیرکەتی نەوت کاری دەکردو بەنیسەدر یەکێک لە ڕێبەرانی بزووتنەوەی خوێندکاریی دژی شا بوو.[19]

یەکێک لە نهێنییەکانی مانەوەی هوەیدا، ئامادەیی بۆ یارمەتیی خەڵکی دیکە بوو. چاکەی بەسەر زۆر کەسەوە هەبووو زۆر لەوانە خۆیان بە قەرزداری وی دەزانی.[20] هێندێک لە ئەندامانی بنەماڵەی پاشایەتییش لەنێو ئەم قەرزدارانەدا بوون. تەنانەت هێندێ لە موخالیفانیش پێشتر بەشێکیان لە سفرەی پیاوەتیی هوەیدا پێ بڕابوو. داخوا پیاوەتییەکانی دوێنێ دەیان توانی ئەمڕۆ گیانی ڕزگار بکەن؟ داخوا ئەو ڕاستییە کە بە قسەی برایەکەی "ساڵێ نیزیکەی ١١میلیون دۆلاری "لە بوودجەی نهێنیی دەوڵەت تەنیا دابووە بەشێک لە موخالیفان، ئەمڕۆ دەبووە دەستەبەری بەسلامەت دەرچوونی؟[21]

بەنیسەدر کە زۆریش پیاوی پێهەڵگوتنی خەڵکی دیکە نیە زۆر بە چاکە باسی هوەیداو کەسایەتیی وی لە یەکەم دیداریاندا دەکا. دەڵی پێم وایە پیاوێکی شەریف بوو؛ نیازی چاکەی هەبوو؛ ڕەخنەشی باش وەردەگرت. بەپێی عادەت لە ڕەخنەگرتن لەوو لە ڕێژیمی شادا بێ پەروا هەموو قسەکانی خۆم دەکردن. بە زەردەخەنەوە گوێی بۆ قسەکانم ڕادەگرت. وردە وردە خۆشم دەویست. مەسەلەی بنەڕەتیی ئەوە بوو کە دینی نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا، وەختێکی بۆ درێژەدانی خوێندن دەچوومە دەرێ، تەنیا کاربەدەستی ڕێژیمی پەهلەوی کە بۆ ماڵئاوایی چوومە لای. هەر ئەو بوو[22]

تۆزێک کەمتر لە بیست ساڵ دواتر، ئێستا دیدارێکی تازە، بەڵام ئەمجار لە بەندیخانە، پێک هاتبوو. قسەکانیان لەپێشدا بە پلارو گاڵتە لەبارەی کتێبێکەوە دەستی پێکرد کە هووەیدا، لەکاتی وەڕوورکەوتنی بەنیسەدردا، بە دەستیەوە بوو. بەرهەمێک بوو بەناوی ڕووح، دیاردەیەکی نەناسراو، لەنووسینی "ژان شارپوون". ڕۆمانێک لەجۆرێکی نوێ لەبارەی هەژاریی مەعنەویی مرۆڤی نوێخوازەوە. هەر لەوکاتەدا، کتێبەکە مزگێنیی دەدا کە هەزارەی نوێ مەعنەوییەتێکی نوێ بەدیاری دێنێ. بەنیسەدر بە گاڵتەیەکی تاڵەوە پرسی: "داخوا بۆ خوێندنەوەی ئەو جۆرە کتێبانە درەنگ نەبووە؟ "هووەیدا لە وەڵامدا گوتی: "هیچ کاتێک بۆخوێندنەوەی هیچ شتێک درەنگ نییە. "ئەمجارقسەکانیان جیدیتر بوون و ئەو دووانە بەڵێنە ئارامبەخشەکانی خومەینییان دووپاتکردەوە.[٢٣]

بۆ زۆرکەس لە بەندییەکان، ئەو وشە ئارامبەخشانە، زۆر زووتێپەڕو ناپایەدار دەرچوون. لەماوەی کەمتر لە حەوتوویەکدا، بیست و پێنج کەس لە بەندییەکان، کە زۆرتریشیان لە فەرماندەرەکانی سوپا بوون، لە بنەبانی مەدرەسەی ڕفاه" درانە دەستی تاقمی ئیعدام. دەوری یەکەمی ئیعدامەکان تەنیا چەند سەعات دوای دیداری ئەحمەدی خومەینی و بەنیسەدر دەگەڵ بەندییەکان ڕووی داو لەودا چوار فەرماندەری سوپا ـ نیعمەتوڵڵای نەسیری، ڕەزای ناجی، مەهدی ڕەحیمی و مەنووچێهری خوسرەوداد ـ گیانیان دانا. دادگای هەرکام لەوانە چەند دەقیقە زیاتری نەخایاندو هەر چوار کەسیان بە "مفسد في الارض" ناسین. شەوی ئەم دەورەی ئیعدامەکان، سەردێری گەورەو وێنەی خوێناوی لە لەشە گوللەبارانکراوەکان، بە ڕوومایەکی بەتاڵ لە ژیانەوە لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەی "کەیهان" یان پڕ کرد. ڕۆژی دواتر بیست و یەک کەسی دیکە بوونە خۆراکی تاقمەکانی ئیعدام و شەپۆلێکی نوێ لە وێنەی ڕاتڵەکێن، دەم وچاوی نێو ئەڵقەی مەرگ و لەشی خواروخێچ، بەشی زۆری لاپەڕەکانی ڕۆژنامەکانیان داگرت.[٢٤] کاتێک لە ڕوانگەی ئەمڕۆوە سەیری ئەو وێنە دزێوە مەرگ لێدراوانە دەکەین، وەختێک دەبینین چاپی ئەوانە لە ڕۆژنامەکاندانا چ رادەیەک ئەوڕۆژانە

برەوی پەیدا کردبوو، ئەودەم پێم وایە تێ دەگەین کە بوونیان لەڕاستیدا نوێنگەیەکی ڕوون و خەفەت بزوێنی ئەو شەپۆلە بوو کە ڕقی شۆڕشگێڕانە" وەرێی خستبوو. ئەوڕۆژانە، بەداخەوە کەم و زۆر هەموو هێزە مەزهەبی و نامەزهەبییەکانی کۆمەڵ و تەنانەت زۆر لەکەسایەتی و ڕێکخراوە "میانەرو"ەکانیش ئەو ئیعدامانەیان بە نیشانەی دادپەروەریی بەهەق و بەبڕشتی شۆڕشگێڕانە داناو پێیان هەڵلا گوت. دیارە زۆری پێ نەچوو کە بۆخۆشیان بوونە قوربانیی شەپۆلی تازەی ئەو ڕق و قینە.

لەو دادگایانەدا نە"هیأت منصفە"یەک هەبوو، نەپارێزەرێک. مافی داوای پێداچوونەوەش لەگۆڕێدا نەبوو. دەیانگوت دادگای شۆڕش هەڵە ناکا. ئەوانەی بە "مفسد في الأرض" یان دەناسین بێ ڕاوەستان دەیان-دانە دەستی تاقمی مەرگ. کاتێک چاپەمەنیی ڕۆژئاوا ڕەخنەی لە کاری ئەو دادگایانەو شەپۆلی ئیعدامەکان گرت، ئایەتوڵلا خومەینی وەڵامێکی دایەوە کە لە یەک کاتدا هەم سەرکێشانە بوو، هەم نیشانی دەدا کە ئەوەی کەم‌وزۆر لە هەموو وڵاتانی جیهاندا وەک قۆناخە باوەکانی پێڕاگەیشتنی قانوونیی تاوانەکان دەناسرێ، لەلای وی گوێی پێ نادرێ. دەیگوت سەرکەوتنی شۆڕشەکەمان بۆخۆی گەورەترین بەڵگەی تاوانی ئەو بەندییانەیە. دەیگوت تەنیا هەنگاوی پێویست بۆ دادگا ناسینی تۆمەتبارەکانە. دەیگوت گوناحێکی گەورەیە ئەگەر ڕێگا بدەین ئەمانە تەنانەت لەحزەیەکیش درێژە بە ژیانی پڕگوناحی خۆیان بدەن.[٢٥]

بەنیسەدر کە ئەودەم لە بڵاوکراوە جۆراوجۆرەکاندا، لەبارەی"دادپەروەریی ئیسلامییەوە" زۆری دەنووسی، هەواڵی ئیعدامەکانی یەکەمجار لە ڕادیۆ بیست. هووەیداش لەوڕۆژانەدا لە مەدرەسەی "رفاه" بوو و بێگومان گوێی لە دەنگی ترسناکی تاقمەکانی ئیعدام دەبوو.[٢٦] بەنیسەدر دەڵێ هەر بە بیستنی خەبەری ئیعدامەکان، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی مورتشیدو موڕادی خۆی گەڕاوەتەوە مەدرەسەی "رفاه". لە چەند ساڵ پێشترەوە پێوەندییەکی پڕخۆشەویستیی دەگەڵ ئایەتوڵلا خومەینی هەبوو و ئەمە یەکەمین بەرەوڕووبوونەوەی توندیان

بوو. بەنیسەدر، کە پاش بیست ساڵ ئێستاش تامی تاڵی نارەحەتی لەڕاوێژی قسەکردنیدا مابوو، دەیگوت: "باوەڕم نەدەکرد پیرەپیاو بەو ئاسانییە پێچەوانەی ڕاستیم پێ بڵێ."[٢٧] لەماوەی کەمتر لەساڵێک دوای دەست پێکردنی ئیعدامەکاندا پێوەندیی ئەم دووانە زیاتریش تێک چوو. سەرەنجام ڕێبەری حەفتاساڵەی شۆڕش بەنیسەدری لاوی لە پۆستەکەی خۆی وەک یەکەمین سەرکۆماری هەڵبژێراوی خەڵکی ئێران، دەرکرد. بەنیسەدر لەترسی گیانی خۆی لەئێران ڕای کرد[*]

هووەیدا کوڕی پیاوێکی.بەدەسەڵات بوو کە"باوک"ی بەدژی هەستا."باوک"ی هووەیدا شا بوو. هووەیدا چەندین جار شای بە "باوکی تاجدار" بانگ کردبوو.لە ئەفسانەی ئەدیبی ڕۆژئاوادا کوڕ سەرەنجام باوکی خۆی دەکوژێ.ڕەنگە باب کوشتن، نوێنگەی مێژوویی نرخێک بێ

---

[*] بەنیسەدر هەروا لە غەریبایەتییە. دەگەڵ خێزانەکەی لە خانووێکی تاڕادەیەک چووکەڵەدا، لە شاری ڤێرسای، لە دەوروبەری پاریس دەژی. ماڵەکەی لەژێر کۆنترۆڵی توندی ژاندارمە فەڕانسەییەکاندایە. پێش ئەوەی ڕێگای چوونەژوورم پێ بدرێ،ژاندارمێکی تیرباریەدەستی لەجلوبەرگی شەڕدا،بەدەن و دەفتەری یادداشتەکانمی بە وردی پشکنی. ژاندارمێکی چەکداری دیکە،دوو هەنگاو دوورتر وریای ئێمە بوو. ئەو ژوورەی بەنیسەدرم لێ دی، لەنهۆمی یەکەمی خانووەکە بوو، و دەفتەری کاری بەنیسەدریش هەر ئەوێ بوو. نهۆمی دووەم شوێنی ژیانی خۆی و خێزانی بوو. بەنیسەدر چاکەتوشاڵوارێکی خاکی ڕەنگی دەبەردا بوو. وەک هەمیشە لە وێنەکانیدا دەبینین، چاکەتەکەی کەمێک فرەوان دیار بوو. بلووزێکی زەردی دەبەردابوو، و گۆرەوییەکەشی لە ڕەنگی بلووزەکەی بوو. زەردەخەنە ناسراوەکەی کە دەتگوت لەسەر گۆشەی لێوانی هەڵ کەندراوە،وەک جاران لەسەر لێوان بوو. ژووری دیدارەکە زۆر سادەو ساکار بوو. کاناپەیەک و سێ مۆبلی چووک و دەکارکراو، تەنیا کەلوپەلی ژوورەکە بوون. فەرشێکی ماشێنیی ڕایەڵ دەرکەوتوو کە لەسەر شێوەی فەرشی ئێرانی تەنرابوو عەرزەکەی داپۆشیبوو. دیوارەکان هەموو ڕووت بوون. بەڵام دەرگای کوورەخانەکە بە شێعرێکی حافز بەخەتێکی جوان ڕازابۆوەو مزگێنیی دەدا کە "ڕۆژگاری غەم نامێنێ"

کە کۆمەڵەکان بۆ سەرکەوتن دەبێ بیدەن.بەرامبەر بەوە لە داستانی نەمری گرنگترین ئەفسانەی ئێرانیدا، ئەمە باوک، واتە ڕۆستەمە کە زۆرابی کوڕی دەکوژێ. زۆر لە ڕەخنەگرە ئەدەبی و فەرهەنگییەکان، داستانی ڕۆستەم و زۆرابیان بە کلیلی ڕەمزی مێژووی ئێران زانیوە.دەڵێن ئەم داستانە نوێنگەیەکە لە سەرکەوتنی باوک سالاری، لە باڵادەستیی ڕێژیمێک کە لەودا باوکان، بۆ سەقامگیرکردنی دەسەڵاتی خۆیان کوڕەکانیان لەنێو دەبەن[28] دیک دیویس لە باسێکی بەنرخ لەسەر شانامەدا نیشانی داوە کە کوڕکوشتن یەکێک لە هەوێنە دووپات بووەوەکانی ئەم شاکارەی ئەدەبی فارسییە.[29] بەم جۆرە شا کە پێیان دەگوت "باوکی تاجدار"ی میللەت حازر بوو هووەیدای [کوڕی] بکاتە قوربانی.

بەڵام لەو یەکەمین ڕۆژەی ئیعدامەکان لە مەدرەسەی "رفاه"دا، بەنیسەدر چووە ڕووبەڕووی باوکی شۆرش و لە چەندو چۆنی ئیعدامەکان و چۆنیەتیی کاری دادگای ئەو چوار فەرماندە کوژراوەی پرسی. بە وتەی بەنیسەدر، وەڵامی ئایەتوڵڵا خومەینی سەرسوڕهێن بوو. گوتی ئیعدامەکان پێویستن، چوونکە تاقمە دەستەچەپییەکان لە شاردا هێندێ بەیاننامەیان بڵاو کردوونەوەو ئیددیعایان کردوە کە ڕێککەوتنێکی نهێنی لەنێوان دەوڵەتی ئیسلامی و دەوڵەتی ئەمریکادا هەیە کە نیشان دەدا دەوڵەتی ئەمریکا لە بەرامبەر بەڕەسمی ناسینی ڕێژیمی نوێدا داوای کردوە کە دەوڵەتی ئیسلامی ئەمنیەت و سەلامەتیی سەدکەس لە سەرانی ڕێژیمی پەهلەوی دەستەبەر بکا.[30] بەڕێکەوت لەو بەڵگەنامانەدا کە ئەم دواییانە لەلایەن دەوڵەتی ئەمریکاوە بڵاو کراونەوە، هێندێ نیشانەی ناڕاستەوخۆ لە بوونی جۆرە ڕێککەوتننامەیەکی لەوچەشنە دەکرێ وەبینین. لە یەکێک لەو بەڵگەنامانەدا هاتوە کە "لە٢٧ی ژانویەی١٩٧٩دا خومەینی پەیامێکی نهێنیی بۆ دەوڵەتی ئەمریکا ناردو پێشنیاری کرد کە بۆ پێشگیری لەکارەسات، ئەمریکا داوا لە سوپای ئێران و بەختیار بکا واز لە دەستتێوەردانی کاروباری سیاسیی

ئێران بێنن. خومەینی نەک هەر دەستتێوەردانی ئەم دووانەی بە ناڕەوا دانـابوو، بەڵکـە هەردووکیانیشـی لەسـەر داخسـتنی فرۆکەخانـە کـە لە ئاکامدا گەڕانەوەی خومەینی بۆ ئێران سـەری نەگرتبوو، سـەرکۆنە کردبوو. خومەینی پەیامی خۆی بەوە تەواو کردبوو کە پێی باشترە ڕێگاچارەیەکی ئاشتیخوازانە بۆ مەسەلەکە بدۆزێتەوە* هەرچۆنێک بێ، بەقسـەی ئایـەتوڵڵا، ئیعدامـەکان بـۆ بەدرۆخسـتنەوەی ئـەو دەنگۆیانـە پێویسـت بـوون. جگـە لـەوە ئایـەتوڵڵا خومـەینی گوتبـووی کـە شـەوی پێشتر، وەختێک تیمسار نەسیری یان لـە تەلـەڤیزیۆن نیشـان دابـوو، ئـەو بە جووڵاندنی دەست پەیامی نهێنیی بۆ بەکرێگیراوانی ساواک ناردبووو دەسـتووری دەسـت پێکردنـی تێکۆشـانی تێرۆریسـتی بـە دژی ڕێژیمـی تازەی دەرکردبوو.[٣١]

کەمێک دوای ئـەم وتـووێژە، لـە ئاکامی پاڵەپەسـتۆی نێونەتـەوەیی و هەروەها هەوڵ و تەقەلای مەهدیی بازرگان، سەرۆک وەزیـری دەوڵـەتی کاتیـدا کـاری دادگاکـانی شـۆرش ڕاوەسـتا. دەوڵـەت مزگێنیـی دا کـە لەمـەودوا، چالاکییـەکانی دادگـا لەسـەر بناغـەی هێنـدێ ڕێنـوێنیی تـازە بەڕێوە دەچن.[٣٢] بەم جۆرە دادگای هووەیداش وەدوا کەوت. وا دەهاتە بەرچاو کە بەختی هەستاوەتەوەو گیانی هەرنەبێ بۆ ماوەیەک، ڕزگاری بووە.

کاتێک دوای چەند ڕۆژ ئەویان لە مەدرەسەی ڕیفاهەوە گواستەوە بـۆ زینـدانی قەسـر، بنەماڵەکـەی ئـەو ئاڵوگۆڕەیـان بـە خێـر وەرگـرت.[٣٣] تەنانەت دڵیان خۆش بوو کە ڕەنگە ئەو گیانی سلامەت لەو تەنگانەیە بەرێتە دەر.

هێنـدێ ڕیشـەی سـەیری مێژوویـی هووەیـدایان بـە زیندانـە تازەکەیـەوە گـرێ دەداو ئـەو هەرنـەبێ لـە هێنـدێ لایـەنی ئـەو زیندانـە ئاگـادار بـوو. نـاوی زینـدانی قەسـر، بـە پێچەوانـەی ڕواڵـەت بـە کافکـا

---

* بۆ دیتنی ئەم بەڵگەیە بڕوانە:
Us Deq of State "the evolution of Us- Iranian Rellation",NSA,No3556,63

قەرزدار نەبوو. هۆی ئەو ناولێنرانەی ڕاستییەکی مێژوویی هەیە. شاکانی قاجار لە سەدەی سێزدەدا ئەویان وەک سەیرانگایەکی هاوینی دروست کردبوو. قاجارییەکان ماوەی ١٢٨ ساڵ فەرمانڕەوای ئێران بوون و سەرەنجام لە خەرمانانی ١٣٠٤(١٩٢٥)دا، ئەفسەرێکی لێوەشاوە لە ڕیزی قازاخەکاندا کە ناوی ڕەزاخان بوو، دامودەزگای بنەماڵەکەیانی تێکەوە پێچا. ڕەزاخان پاش ماوەیەک خۆی وەک پادشا ڕاگەیاندو بنەماڵەی پەهلەویی دامەزراند. وەک لە کتێبی بەنرخی سیرووسی غەنی دەردەکەوێ، لەم کارەدا ئینگلیسییەکان زۆر بە بێ مەیلییەوە، بوونە هاوپەیمان و یاریدەری.

لە سەرەتای پادشایەتیی ڕەزاشادا، قەسر بوو بەزیندان. زۆری پێ نەچوو کە بە دروستکردنی هێندێ خانووبەرەی تازە، قەسر بوو بە نوێنگەیەکی باش بۆ بیناسازییەکی نارێک و ناڵەبار. سەردەرانە جوانەکان و گێچکارییە زێڕکفتکراوەکانیان لە ئاکامی چەندین ساڵ گوێ- پێنەداندا لە ڕەنگ وڕوو کەوتبوون. ڕێڕەوە لەمێژینەکانی، خشتی سوورەوەکراوی ڕەنگاوڕەنگیان تێگیرابوو. حەوزێکی زۆر جوانی وەک دەنکە گەوهەر، لە نێوەڕاستی باغەکەدا جێی گرتبوو، و ئەمانە هەموو داستانی ڕۆژانی پڕعەیش و نۆشی ڕابردوویان دەگێڕایەوە. لە بەرامبەردا، بەشە تازەکانی بەتەواوی لە جوانی بێ بەش بوون و تەنیا بۆ جێکردنەوەی شەپۆلی تازەی تاوانباران و دژبەرانی ڕێژیمی ڕەزاشا دروست کرابوون. ئەم دوو ڕووە جیاوازەی خانووبەرەکانی کۆشک دژایەتی و ناتەباییەکی بەرچاویان دەگەڵ یەکتر هەبوو. جگە لەوە، هێندێک لە بەندییەوانەکانی ئەمڕۆی هووەیدا تا دوێنێ بۆخۆیان زیندانیی قەسر بوون.

ئێوارەی ڕۆژێکی ساردی سەرەتای خاکەلێوەی ١٣٥٨(١٩٧٩) بوو. حەوتوویەک لە نەورۆز ڕابردبوو. لە نەکاو دەرگای ژووری تاکەکەسیی هووەیدا لە زیندانی قەسر کرایەوە. شەش کەس لە شیپانەی دەرگادا ڕاوەستابوون. دوو کەسیان ڕۆژنامەنووسانی فەڕانسەیی بوون؛

یەکیان ناوی ژان لوو ڕیڤێریە* بووو ئەوی دیکەیان کریستیەن ئۆکران** کاری دووربین و فیلم گرتنیش لە ئەستۆی فەرانسەییەکی دیکە بوو بە ناوی ژان کلۆدلۆیا***. ژنێکی گەنجی ئێرانییش بە ناوی لادەنی بڕوومەند دیلمانجی گرووپەکە بوو. جگە لەوان سەرۆکی بەندیخانەو دادئەستێنی شۆرشیش دەگەڵ گرووپەکە بوون. ئۆکران هەوڵی دابوو نەهێڵێ ئەو دوو کارمەندە دەوڵەتییە بەشداری وتووێژەکە بن. گوتبووی بەشداریی وان بەپێچەوانەی دەقی پەیماننامەی ژێنێڤە. بەڵام قسەکانی ئۆکران ئەو دوو کارمەندەی قانیع نەکرد. هەر لەوکاتەدا ئەنجامدانی ئەو وتووێژە بۆ ئۆکران حوکمی گەورەترین سەرکەوتنی پیشەی ڕۆژنامەنووسییەکەی هەبوو، و پێی خۆش نەبوو وردەکاریی دەستوپێگری قانوونی پێشی ئەو سەرکەوتنەی لێ بگرێ.[٢٤]

لەڕاستیدا، هەوڵی ئەوو هاوکارەکانی بۆ ئەنجامدانی ئەو وتویژە نیزیک سێ حەوتوو پێشتر دەستی پێ کردبوو. هاتبوونە تاران بۆ ئەوەی فیلمێکی دیکۆمێنتاری لەبارەی شۆڕشەوە ساز بکەن. بەقسەی ئۆکران دەیانەویست فیلمێک ساز بکەن کە لەودا نیشانەیەک لە "بیروبۆچوونی قالب کراوو داوەریی پێشوەختی ڕۆژئاوا" نەیەتە بەرچاو.[٢٥] قەرار وابوو فیلمەکە لەسەر بناخەی وتوویژ دەگەڵ هووەیدا ئامادە بکەن. بەڵام هەموو هەوڵەکانیان لەو ڕێگایەدا بێ ئاکام مانەوە.[٢٦] پیاوانی دەسەڵات یەکجێ پێیان وابوو ئەنجامی وتووێژێکی وا ناموکینە. گۆیا تەنیا کەسێک کە بەڵێنی هاوکاریی دابوو بەنیسەدر بووە.[٢٧]

بە پشت ئەستووریی بەڵێنەکەی وی، ڕۆژنامەنووسانی فەرانسەیی چوونە زیندانی قەسر. بەسەرکەوتنەوە لە یەکەم پشکنینی بەدەنی کە لە نیزیک دەرگای چوونەژووری بەندیخانە لێیان کرا، تێپەڕ بوون. تازە لە حەوشەی بەندیخانە وەژوور کەوتبوون کە لەنەکاو چەند نیگابانی

---

* Jean-Loup Reverier.
** Christine Ockrent.
*** Jea- Claud Loyat.

کڵاشینکۆف بەدەست، بەڕاویژێکی پڕ لە هەڕەشەوە گەیشتنە سەریان؛ گوتیان هەقی وتوویژیان نیەو لە دەوروبەری بەندیخانە دەریان کردن. لەو ڕۆژانەدا تاران شارێکی شۆرشلێدراو بووو وەک هەموو شارە شۆرشگێڕەکانی دیکە، دەسەڵاتێکی ناوەندیی تێدا نەبوو و هەرکەس تیربارێکی پێبایە دەی توانی سەرپێچی لە فەرمانی بەرزترین کاربەدەستانی سیاسیی وڵاتیش بکا.

تەنانەت ڕۆژی هەشتی خاکەلێوەش، واتە دووەمین جار کە هەواڵنووسە فەڕانسەییەکان سەردانی زیندانیان کرد، هەروەک جاران لەپێشدا دەگەڵ دژایەتی و بەرگریی هێندێک لە نیگابانەکان بەرەوڕوو بوون. ئەم دەستەیە دژی هەرچەشنە وتوویژێک دەگەڵ هوەیدا بوون. ئەم جارە لەسەر پێداگرتنی هەواڵنووسەکان، سەرەنجام پێوەندی بە دەفتەری کاری بەنیسەدرەوە کراو دوای باس و وتوویژێکی دوورو درێژ، و پاش پشکنینی سەرلەنوێ، تاقمە فەڕانسەییەکە، دەگەڵ دادئەستێن و سەرۆکی زیندان چوونە ژوورەکەی هوەیدا.

سەرۆکی بەندیخانە حاجی مەهدیی عێراقی بوو. لەسەر ئەوەی دەستی لە تیرۆری مەنسوور لە ساڵی ١٣٤٤(١٩٦٥)دا هەبوو، چاردە ساڵ لە زینداندا ببوو. زۆرجار وەبیر ڕۆژنامە نووسانی دێنایەوە کە ئەویش ڕۆژێک زیندانیی سیاسی بووە. دادئەستێنی ئەو وەختی دادگای شۆرش کە دەگەڵ گرووپەکە چووە ژووری، ناوی حاجی ئاغا هادی هادەوی بوو. وادیار بوو نەخۆشییەکی ترسناکی پێستی دەم وچاوی پەڵەپەڵە کردبوو.[28] و لەبەر چاوی دژبەرانی قەڵافەتێکی سامناکی پێ بەخشیبوو. پاش چوونەدەر لە زیندان هەواڵنووسە فەڕانسەییەکان دەیانگوت هادەوی وەک فووکیە تانویل دەچێ کە یەکێک لە بەسامترین دادئەستێنەکانی دادگا توندوخوێناوییەکانی شۆرشی فەڕانسە بوو.[29]

هوەیدا کە لە بەندیخانەش پیاوێکی بەئەدەب بوو، بەزمانەکانی فەڕانسەیی و فارسی سڵاوو چاکوخۆشیی دەگەڵ یەک یەکی ئەندامانی تاقمە شەش کەسییەکە کرد. ئۆکران وەک دەسپێک گوتی: ئێمە هەواڵنووسانی فەڕانسەییین. ڕێگامان پێ دراوە وتوویژتان دەگەڵ

بکەین. لە فەڕانسە زۆر کەس نیگەرانی وەزعی ئێوەن. زەردەخەنەیەکی تاڵ کەوتە سەر لێوی هووەیداو گوتی: "فەڕانسە...کەوایە لە فەڕانسە هێشتا منیان لەبیر ماوە."[40]

زۆری نەخایاند کە هەموویان لەسەر عەرزی ژوورە چووکەڵە لاکێشییەکەی هووەیدا، لە بەندی نەخۆشخانەی زیندانی قەسر، جێگیر بوون. بەڵام پێش دەست پێکردنی وتوویژەکە، باسی شێوەی کارەکە کرا. دادئەستێن و بەندییەوان حەزیان نەدەکرد زیندانییەکەو ڕۆژنامەنووسەکان ڕاستەوخۆو بە زمانی فەڕانسەیی وتوویژ بکەن. ئەوان لەجێدا متمانەیان بە ڕۆژنامەنووسانی بێگانە نەبوو. چاپەمەنیی ڕۆژئاوایان بە بەشێک لە دەوڵەتانی ڕۆژئاواو نۆکەری پلانە شەیتانی و ترسناکەکانی ئەو دەوڵەتانە دەزانی. نیگەران بوون کە نەکا لە وتوویژێک بە زمانی فەڕانسەییدا، هێندێ پەیامی نهێنی لەنێوان هووەیداو لایەنگرە ڕۆژئاواییەکانیدا ئاڵوگۆڕ بکرێن. هیچ کامێکیان وشەیەک فەڕانسەیی یان نەدەزانی و ئەمەش نیگەرانییەکەیانی زیاتر دەکرد. جگە لەوە ئەوان هەر لە سەرەتاوە دژی وتوویژەکە بوون. پێیان وابوو ئەو ماستە بێ موو نیە، ئەگینا بۆچی هیچ ڕۆژنامەنووسێکی بێگانە ڕۆژگاری پێشوو کاتێک ئەوان زیندانی بوون، ئۆگرییەکیان بە دیداری وان نیشان نەداوە.[41]

دیارە گیروگرفتەکە هەر ئەوە نەبوو کە دادئەستێن و بەندییەوان زمانی فەڕانسەیی‌یان نەدەزانی. ئەو دوو هەواڵنووسەش کە لە ساتەوەختێکی مێژوویی زۆر گرنگدا لەلایەن تەلەڤیزیۆنی فەڕانسەوە نێردرابوونە ئێران، هیچ کامێکیان وشەیەکی فارسی‌یان نەدەزانی.[42] دەکرێ نەریتی ناردنی ئەوجۆرە ڕۆژنامەنووسانە بۆ وڵاتانی دنیای سێهەمیش بە نیشانەی جۆرێک لووتبەرزیی ئیستیعماری بزانین. بۆ قەرەبووی زمان نەزانینی هەواڵنووسان و لابردنی بەدگومانیی کاربەدەستانی کۆماری ئیسلامی، بڕیار درا وتوویژەکە بە زمانی فارسی بکرێ. هەر لەوکاتەدا دوو ڕۆژنامەنووسەکەش هەقیان هەبوو

پرسیارەکانیان بە زمانی فەڕانسەیی بێننە گۆڕێ. لە شریتی ڤیدیۆیی ئەم وتووێژەدا، دەکرێ هەمیشە گوێت لە سرتەسرتی دایمی و زیاتریش ناڕوونی وەرگێڕەکە بێ. هەر ئەو دەنگە ناڕوونەش حاڵەتێکی پڕنهێنی و تەنانەت ترس‌بزوێنی بە شریتەکە بەخشیوە*.

بەلام وادەو بەڵێنەکان هیچیان جێبەجێ نەبوون. لادەنی بڕوومەند وەرگێڕێکی پیشەیی نەبوو. شەش مانگ پێشتر ژان لوو ڕێڤیریەی ناسیبوو و ڕۆژی هەشتی خاکەلێوە کاتێک هەواڵنووسە فەڕانسەییەکان نەیان توانی وەرگێڕێکی پیشەیی بۆ وتووێژ دەگەڵ هووەیدا پەیدا بکەن،

---

* چەندین مانگ بە دوای شریتی ئەو وتووێژەدا گەڕام. سەرەنجام دۆستێک بەڕێکەوت ئەوی لە کۆتایی شریتێک بە ناوی "بڵێسەکانی ئێران" دا دیتەوە .لەسەربەرگی شریتەکە وا دەردەکەوت کە فیلمێکی دیکۆمینتارییە کە بە دەستووری دەوڵەتی ئێران ساز کراوەو گوڵبژێرێکە لە ڕێ ورەسمی جێژنی ٢٥٠٠ ساڵەی پادشایەتیی ئێران...پاش تەواوبوونی دیمەنەکانی ئەو جێژنانە چەند لەحزە بێدەنگی و تاریکییەو ئەمجار یەکێک لە وێژەرانی تەلەڤیزیۆنی فەڕانسە دەست پێکردنی ڕاپۆرتی تایبەتیی تۆکران و وتوێژ دەگەڵ هووەیدا ڕادەگەیەنێ. لە دراوسێیەتیی ئەودوو فیلمە لێک دوورە،کە یەکیان شا لە لووتکەی دەسەلاتدا نیشان دەداو ئەوی دیکەیان سەرۆک وەزیرەکەی لەوپەڕی زەبوونیدا،سەرم سوڕ ما. زەنگێکم بۆ کومپانیای بەرهەمهێنی فیلمەکە لێدا. دەمەویست بپرسم داخوا لە سازکردنی ئەو شریتەدا نەخشەیەکی زیرەکانە لەکاردا بووەو بەڕاستی ویستوویانە گاڵتەیەکی تاڵ نیشان بدەن؟ ژنێک کە وەلامی تەلەفونەکەی دایەوە دەسبەجێ لە پرسیارەکەم وە شک کەوت و پرسی"بۆچی دەتەوێ بزانی؟ " گوتم دەمەوێ کتێبێک بنووسم. وا دیار بوو ئەمە شک و گومانەکەی زیاتر کرد. ناوو ژمارە تەلەفونی لێوەرگرتم و گوتی بەرپرسی ئەو کارە پێوەندیت پێوە دەگرێ. حەوتوویەک ڕابرد خەبەر نەبوو. دووبارە زەنگم لێ- دایەوە. ئەم جارە پیاوێک وەلامی دایەوە. گوتی: " لێرە ئەمن بەرپرسم" پرسیارەکەمم دووپاتە کردەوە. بێ ڕاوەستان گوتی: "نا،کاکە بەرنامەیەک لەگۆڕێدا نەبوو.لە ئاخری شریتی جێژنەکاندا هێندێکمان جێی بەتاڵ هەبوو. یەکێک پێشنیاری کرد ئەو جێ بەتاڵە بەشریتی وتووێژەکە پڕ بکەینەوە." وادیارە لەو بارەیەشەوە هووەیدا بە شیاوی بایەخ پێدان دانەنراوە.

داوای یارمەتی‌یان لە لادەن کرد. کەچی گرنگیی وتوویژەکە، سێبەری تیربارەکان، لافاوی ئەو بەندییانەی لە حەوشەدا دەخولانەوە، هەوڵی بەشێک لەوان بۆ ئەوەی ڕێگای چوونەناودەستیان پێ بدرێ و سەرەنجام بۆنی قورسی ئارەق کە لە هەوادا شەپۆلی دەدا، دەستیان وێک داو دڵەخورپەی وەرگێڕەکەیان زیاتر کرد.[43] هێشتا ڕستەی یەکەمی وتوویژەکەی وەرنەگێڕابوو کە هووەیدا ڕەخنەی لە شێوەکارەکەی گرت و گوتی: "ئەمە مەسەلەیەکی گرنگە. وەرگێڕانەکە دەبێ زۆر ورد بێ." [44] ئەمجار ڕای گەیاند کە تەنیا بە مەرجێک ئامادەیە درێژە بە وتوویژ بدا کە بۆخۆی بتوانێ بە فەرانسەیی قسە بکا.

داخوا بەئومێد بوو کە لەو ڕێگایەوە ئورووپاییەکان بخاتە ژێر کاریگەریی ڕەوانی و جوانیی فەرانسەییەکەی و هاودڵیی وان بەدەست بێنی؟ ئایا دەیەویست بە کەڵکوەرگرتن لە وردەکاریی زمان پەیامێک بۆ دۆستانی لە دەرەوەی وڵات بنێرێ؟ یان بەڕاست نیگەرانی وردنەبوونی وەرگێڕانی ئەو ژنە گەنجە بوو؟ بە پێی قاعیدە ئێدی هیچ کاتێک وەڵامی ئەم پرسیارانە نازانین. بەڵام گومان لە شتێکدا نییە: بە دیتنی هەواڵنووسانی بێگانە، تیشکێکی هیوا لە چاوەکانیدا دەرکەوت. [45] ڕەنگە لەدڵی خۆیدا گوتبیتی کە هەمیشە هەقی بووە، کە پێی وا بووە دۆستە بەنفووزەکانی لە ئەمریکاو ئورووپا بەتەنیای ناهێڵنەوەو چارەنووسی وی نادەنە دەستی ڕزگاریدەرێکی تازە لە ئێران.

بەڵام بەرلەوەی دووربینی هەواڵنووسان وەکار کەوێ، ئەو تیشکە هیوایە یەکسەر لەنێو چووبوو. وا دیار بوو دووبارە خەم و ناهومێدی ڕوویان تێ کردوە. ڕاوێژی یەکەمین پرسیاری ئۆکراو و لەوێبوونی کاربەدەستانی کۆماری ئیسلامی کە یەکێکیان لەوانە بوو کە تەقەیان لە دۆستی هووەیدا، حەسەنعەلیی مەنسوور کردبوو، گیانی ئەویان پتر خەمبار دەکرد. لە یەکەمین وێنەی دووربین لە ڕوخساری هووەیدادا تەنانەت پێش ئەوەی قسەیەک بکا، وەزع وحاڵ و ڕوانینی، هەموو باسیان لە پەرێشانی و نیگەرانیی وی دەکرد.

لە شریتی وتوویژەکەدا، دەبینین کە ئەو لەسەر دۆشەگەکەی لەنێوان دیوارو هەواڵنووسان و کاربەدەستانی ڕێژیمی تازەدا، لە قوژبنێک چەماوەتەوە. سەری بردۆتەوە نێو شانەکانی و دەستەکانیی لەسەر ئەژنۆیانی داناون و قامکی هەردوو دەستانی تێک ئاڵقاندوون. تەنانەت بەگەنجییش، لە چاوە دەقووڵکەوتووەکانیدا حاڵەتێکی خەمۆکی و تێکەڵاوێک لەگاڵتەو تەسلیم بوون بەدی دەکرا. لەو کەسانە بوو کە شکڵ و شێوەی دەموچاویان چەندو چۆنیی باری دەروونییان نیشان دەدا. بەڵام لەوڕۆژە ساردە بەهارییەدا، ئێسکی دەموچاوی، نێوچاوانی، برۆ پڕپشتەکانی و چاوە مژگرتووەکانی هەموویان تووشی پیری‌یەکی پێش‌وەخت ببوون. هەم شەڵوارە گنج هەڵاتووەکەی و هەم چاکەتێکی کوڵکن کە دەبەریدا بوو تەنگ دەهاتنە بەر چاو. ئەگەر جاران کۆت وشەڵوارە جوان‌دووراوەکەی، قەڵەوییەکەیان کە ئاکامی گرفتاریی بەردەوامی ژیانی بوو، دەشاردەوە، ئێستا، جلکە تەنگ و پڕگنج ولۆنجەکانی ئەو قەڵەوییەیان زەقتر نیشان دەدا.

هووەیدا کە هەمیشەلایەنی ئەدەبی دەپاراست، ئەمجارە، بە درێژایی وتوویژ دەگەڵ ئۆکرپان نەک هەر بە بێ موبالاتی کڵاوە "کێپی"یەکەی لەسەر بوو، بەڵکوو هەردوو لاقیشی بە بێ‌حورمەتی و سەرکێشی ڕاکێشابوو. دەموچاوی کە جاران وەک دەموچاوی پۆکەربازێکی بەتوانا دەچوو، ئەم جارە حاڵەتی پەرێشان و یاخیی نێچیرێکی بەتەڵەوەبووی هەبوو. زۆرجار لەوەڵامی پرسیارەکانی ئۆکرپاندا، بە نیشانەی ناڕەزایی و سەرسوڕمان سەری ڕادەوەشاند. دەتگوت هەر چەند دەقیقە دوای هاتنی ئۆکرپان بۆ زیندان، هووەیدا زانیویەتی کە ئەو ڕۆژنامەنووسە فەڕانسەییە بە مەبەستی کۆمەک بەو نەهاتۆتە سەردانی.

باری بەدەنیی هووەیداو بزووتنی دەموچاوی، هەموو دواتر بوونە بابەتی باس و جارو جەنجاڵ. تەنانەت وەزعی دەستەکانیشی مەتەڵۆکە بوو. لە شریتی وتوویژەکەدا دەبینین کە ئەو هەشت قامکی دەستەکانی تێک ئاڵقاندوون و دوو قامکە گەورەشی لە حەوادا دەسووڕێنێ. وا باوە کە ئەم حاڵەتە بە نیشانەی پەرێشانی دەزانن. بەڵام گۆیا لە زمانی شێوە

نهێنیی ماسۆنیدا، ئەم جۆرە جووڵاندنەی قامکە گەورە، نیشانەی حاڵەتی تەنگاوی و جۆرێک یارمەتی خواستنە.[41] گومان لەوەدا نیە کە هووەیدا ئەندامی گرووپێکی ماسۆنی بووو لە ئێرانیش ماسۆنییەکان بە تابووری پێنجەمی ئیستیعماری ئینگلستان دەزانن. پێوەندیی هووەیدا بەو گرووپەوە، وەک لەمەودوا دەبینین، بووە بابەتی هەراوهۆریایەکی زۆر. ڕەنگە هەرگیز بۆمان ساغ نەبێتەوە کە داخوا هووەیدا بەڕاستی بە بزاوتنی قامکەکانی، ویستوویەتی داوای یارمەتی لە برا ماسۆنییەکانی خۆی بکا یان نا. بەڵام نابێ گومانمان لەوەدا هەبێ کە هووەیدا لە ماوەی وتوویژەکەدا لە هەموو دەرفەتێک کەلکی وەرگرت بۆئەوەی دڵئێشی و بێزاریی خۆی لەو هەواڵنووسە فەڕانسەییە کە هاتبووە ژوورەکەی ئاشکرا بکا.

هەر کە دووربین کاری فیلمگرتنی دەست پێ کرد، ئۆکڕان ڕەوتی وتوویژەکەی خستە پاوانی خۆیەوە. زۆر هێرشی توندی کردنە سەر ڕێژیمی پێشوو، و تەنانەت نەیهێشت هەواڵنووسەکەی دیکە یەک پرسیاریش بکا. لەتەواوی شریتەکەدا نیشانەیەک لەو هاوکارە چارەڕەشە نابینرێ. ئۆکڕان وتوویژەکەی بەم پرسیارە دەست پێکرد کە "داخوا پێت وا نیە، دەبێ چارەنووسی تۆ بە نموونەیەک لە ڕێژیمی پێشوو بزانرێ؟" هووەیدا بە مۆڕەیەکی قیناوییەوە سەری ڕاوەشاندو ماوەیەک بێدەنگ بوو. ئەو چاوەڕوان بوو لە وەڵامی پرسیارێکی گونجاوتردا، باسی بارودۆخی خۆی لە زینداندا بکا. تاوێکی دیکە بێدەنگییەکەی درێژە داو گوتی: "چما وەزعی من نابینی؟ ئەمە چ پرسیارێکە؟" دیارە ڕاوێژی پرسیاری ئۆکڕان زیاتر وەک هی لێکۆڵەرێک دەچوو تا ڕۆژنامەنووسێک. ئەم ڕاوێژە نەک هەر ئەوڕۆژە هووەیدای هەژاند، بەڵکوو سێ حەوتوو دواتر، کاتێک سەرەنجام شریتی وتوویژەکە لە فەڕانسە نیشان درا، هەرایەکی لێ ساز بوو.

لەماوەی سێزدە ساڵ سەرۆک وەزیریی خۆیدا، هووەیدا پێوەندییەکی بە گرێوگۆڵی دەگەڵ ڕاگەیەنە گشتییەکانی ڕۆژئاوا دامەزراندبوو. هەرچەند شا زۆرجار بەڕواڵەت و بە قسە هێرشی

دەکردە سەر ڕۆژئاوا، بەڵام ئەوو ڕێژیمەکەی بەرامبەر بە هەر هێماو قسەیەکی چاپەمەنیی ڕۆژئاوا زۆر سەیر لەسەر هەست بوون.[٤٧] هوەیدا جۆرێک کۆسمۆپۆلیتی (جهان وطنی)ی تێدا هەبوو؛ چەند زمانی جۆراوجۆری دەزانین؛ بە بوونی بیروباوەڕی لیبراڵی بەناوبانگ بووو تیژهۆشی و ڕەفتاری نەرمی ناوی دەرکردبوو. جگە لەوانە، کەیفی بە کەین و بەینی زیرەکانە دەگەڵ هەواڵنووسان دەهات. زۆرجار ناچار بوو دیفاع لە کارنامەی ڕێژیم لە بواری مافی مرۆڤدا بکا، هەرچەند کارێکی هێندە خۆش نەبوو، بەڵام ئەو لەوبوارەدا "ڕازینەرەوەی ویترین"ی ڕێژیم بوو.[٤٨] ئەرکەکەی زۆر بە ئیشتیاوە بەجێ دەگەیاند. زۆرجار بە کۆمەگی هێندێک حوکمی گشتی و بێ نێوەرۆک لەبارەی نەبوونی دێموکراسیی ڕاستەقینە لە ڕۆژئاوادا وەڵامی ئەو پرسیارانەی دەدایەوە کە لە پێوەندی دەگەڵ ئازادیی بەیان و زەبروزەنگ لە ئێراندا لێی دەکران. زۆروەخت ئەو قسە یەکجار سواوەی شای دووپاتە دەکردەوە کە ڕێژیمی سیاسیی ئێران سروشتێکی تایبەتیی هەیە. شا چەندین جار گوتبووی پێوانە ناسراوەکانی مافی مرۆڤ بەرامبەر بە نەریتی لەمێژینەی ئەوین و ئەمەگناسیی خەڵکی ئێران دەرهەق بە ڕێژیمی پادشایەتی کاڵ دەبنەوە. هوەیداش بە چاولێکەریی شا، زۆرجار بەپێچەوانەی ئەوەی بەنهێنی دەیگوت و دەیزانی، بەئاشکرا حاشای لە نەبوونی مافی مرۆڤ لە ئێراندا دەکرد. بەڵام لەو ڕۆژە ساردە بەهارییەدا کارەکان جۆرێکی دیکە بوون. ئەم جارە ئەو بۆخۆی بەڕاستی ببووە قوربانیی پێشێلکرانی مافی مرۆڤ لەلایەن ڕێژیمی ئیسلامییەوە. بەهەق دەی توانی باسی مافی پێشێلکراوی خۆی بکا. بەڵام، وا دیار بوو ئۆکرِان بڕیاری داوە ئەو دەرفەتە بە هوەیدا نەدا. لەجیاتی پرسیارکردن، سەودای هێرش بۆسەر گەندەڵیی ڕێژیمی پێشووی لەسەردا بوو. زیاتر پێی خۆش بوو حاڵەتەکانی پێشێلکردنی مافی مرۆڤ بژمێرێ و لایەنەکانی ملهوڕیی شای لێکەوتوو باس بکا.

کەمێک دڵڕەشی و جۆرێک توندوتیژی، هەردووکیان بەشێکی جیاییهەڵنەگر لە نێوەرۆکی کاری ڕۆژنامەنووسێک و

(ژیاننامەنووسێک)ن. بەڵام ئەورۆژە ئۆکران بەئاشکرا سنوورێکی پیرۆزی خەوشدار کردبوو. ڕەخنەگرەکانی دەیانگوت ئەو لەجیاتی گێڕانەوەی هەواڵ بۆخۆی بۆتە سەرچاوەو بابەتی هەواڵ؛ دەیانگوت ئەو بۆتە ئامرازی پاساودانی تیرۆری شۆرشگێڕانە؛ فیگارۆی پاریس تەنانەت ئەوی بە هاودەستی دەگەڵ پیاوکوژەکانیش تۆمەتبار کرد.[49]

هووەیدا بەرامبەر بە هێرشەکانی ئۆکران هێندێ جار بێدەنگییەکی مانادراری هەڵ دەبژاردو جاری واش بوو بە ڕاوەشاندنی دەستوسەر دلگرانیی خۆی نیشان دەدا. دەیگوت وەک سەرۆک وەزیر، دەسەڵاتێکی ڕاستەقینەی زۆری نەبووەو بۆیە بەشێکی کەم لەباری هەڵەکانی ڕێژیمی ڕابردوو لەسەر شانی وییە. ئۆکران پرسی داخوا لە سەردەمی سەرۆکوەزیریی خۆیدا ئاگایەکی لە چالاکییەکانی ساواک هەبووەو ئاگاداری بوونی ئەشکەنجە لە زیندانەکان و ژمارەی بەندییەکان بووە. هووەیدا وەڵامی دایەوە کە ساواک بە تەواوی بەدەر لە دەسەڵاتی وی بووە. ئۆکران نەچووە ژێر بارو پرسی: "مەبەستت ئەوەیە کە سەرۆکوەزیر بەرپرسی پۆلیسی ئەمنیەتی نەبوو؟" هووەیدا دووبارە چەند لەحزەیەک بێدەنگ بوو. سەرەنجام گوتی: "ئەتۆ ئاگات لە وەزعی ڕاستەقینەی سیاسەت لە ئێراندا نیە." ئەمجار بە ڕاوێژێکی توندترەوە لێی زیاد کرد: "هێندێ بووار، تایبەت بە شا بوون و ئەمن نەخشێکم تێیاندا نەبوو. ساواکیش یەکێک لەو بووارانە بوو."[50]

لە درێژەی وتووێژەکەدا، ئۆکران چەندین جار هەوڵی دا هووەیدا هان بدا کە ڕەخنە لە شا بگرێ. بەڵام هووەیدا هەرچەند باش دەیزانی کاربەدەستانی تازە زۆریان ئەو ڕەخنەگرتنە پێ خۆش دەبێ، هەرگیز ملی نەدا. ئۆکران پرسی: "پێت وایە شا بۆچی دەستووری گرتنی تۆی دا؟" هووەیدا بەساردی و بێ موبالاتی گوتی: "لەخۆی بپرسە."

ئۆکران دەسبەردار نەبوو: "ئەتۆ پێت وایە یەکێک لە قوربانییانی ڕێژیمی پێشووی؟" پاش ڕاوەستانێکی درێژو دوای ئەوەی ماوەیەک ڕووی لە کامێراکە وەرگێڕاو دە دیواری بەندیخانەوە ڕاما، زیندانی وەدەنگ هات وگوتی: "ئەمن لەبارەی خۆمەوە بە هیچ جۆر وا بیر

ناکەمەوە. ئەمن تەنیا زیندانی نیم. ئەم بەندە پڕە لە هاوکارانی پێشووی من."

ئۆکران جارێکی دیکە هێرشی هێنا: "بەلام چما کەسێک جگە لە شا دەستووری گرتنی تۆی داوە؟" تەنیا لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا بوو کە هوەیدا قسەیەکی وای کرد بۆنی ڕەخنە لە ڕێژیمی پێشووی لێ بێ. گوتی: "ڕەنگە ویستبێتیان وەک قوربانی کەڵک لە من وەربگرن."

وا دیار بوو هەر پرسیارێکی تازە کە دڵشکاوی و نائومێدیی هوەیدای پێ زیاد دەبوو، گیانێکی تازەی بەبەر ئۆکراندا دەکرد. پرسی دلخوا لە ڕێژیمێکدا کە ئەو خزمەتی کردوە، هەواڵنووسان دەستیان بە زیندانییانی سیاسی ڕادەگەیشت؟ دەیەویست بزانێ داخوا ئەو ڕۆژگارە، لە قاوشەکانی بەندیخانەدا تەلەڤیزیۆن هەبووە؟ هوەیدا لە وەڵامدا گوتی کە خاچی سوورو لێبووردنی نێونەتەوەیی بە هەوڵی وی سەری بەندیخانەکانی ئێرانیان داوە. گوتی هەر ئەویش ڕەزامەندیی شای بۆ وەدیهاتنی ئەم کارە بەدەست هێناوە.[51] بەلام ئۆکران لەنەکاو هاتە نێو قسەی هوەیداو پێش ئەوەی زیندانییەکە بتوانێ وەڵامی بەپارێزی خۆی تەواو بکا، پرسیارێکی تازەی هێنایە گۆڕێ. سەرەنجام هوەیدا بەجارێک جاڕز بوو. وا دیار بوو لەپڕرا تێگەیشتوە کە هەموو ئەو ململانەو تەون‌وبەستانەی ڕێی ئەم وتوویژەیان خۆش کردوە، تەواوی ئەو هێزانەی بەدژی وی ڕیز بوون، و سەرەنجام بێ پەروایی ئەو ڕۆژنامەنووسە فەڕانسەییە کە دەڵێی دەگەڵ دوژمنانی وی بۆتە هاودەست و هاوپەیمان، هەموویان یەکسەر لە دەسەڵاتی وی بەدەرن. دووبارە تاوێک بێدەنگ بوو، ئەمجار بە ڕاوێژێکی پڕ لە تووڕەیی و پەرێشانییەوە گوتی: "پێم وایە قوربانی باشتر وایە بێدەنگی هەڵ بژێرێ."

# سەرچاوەکان

۱. راجی، پرویز، خدمتگزار تخت طاووس: خاطرات آخرین سفیر شاه در لندن، انتشارات اطلاعات،

2. Christine Ockrent. *La Memoire du Coeur* (Paris, 1998). 15.

۳. فرشته انشاء، گفتگو با مؤلف، پاریس، فرانسه، ۴ ژوئن ۱۹۹۸. در میان اسنادی که وی در ضمن گفتگویمان به من ارائه داد، نسخه‌هایی از آخرین نامه‌های امیر عباس هویدا یافت می‌شوند که تاکنون منتشر نشده‌اند و فرشته انشاء آنها را مخفیانه از زندان خارج کرده بود.

۴. علاقه و تمایل هویدا به داستانهای پلیسی را از برادرش، فریدون هویدا، شنیدم که او خود از صاحب‌نظران این نوع داستانها است. ر.ک.

Fereydoun Hoveyda, *Petite Histoire du Roman Policier* (parics, 1956);
Fereydoun Hoveyda, *L' Histoire du Roman Policies* (Paris, 1969)

5. Marvin Zonis, *Majestic Failure: The Fall of the Shah* (Chicago, 1991).

۶. احتیاط و رازداری هویدا در مورد این خیاط در گفتگو با وجیهه معرفت در ژانویه ۱۹۹۸ بر من روشن شد. وجیهه معرفت به مدّت دوازده سال منشی خصوصی مورد اعتماد هویدا بود.

۷. دکتر عبدالحسین سمیعی، گفتگو با مؤلف، ۷ فوریه ۱۹۹۸. وقتی هویدا در روز سانحه‌ی اتومبیل به بیمارستان منتقل شد، دکتر سمیعی از پزشکان حاضر در بیمارستان بود. در طی سالهای بعد، وی کماکان یکی از پزشکان خاص هویدا باقی ماند، و سرانجام در مقام وزیر علوم و آموزش عالی، به کابینه‌ی وی پیوست.

۸. برای دستیابی به گزارشی بسیار منفی و بدبینانه از زندگی هویدا که آمیزه‌ای از شایعات و کنایه با گزینه‌ای از خاطرات انتشار یافته‌ی هویدا ست، به زندگی و خاطرات امیر عباس هویدا، تألیف اسکندر دلدوم، تهران، ۱۳۷۲)، مراجعه کنید. این حقیقت که این کار تخریب کننده و سراسر غیرقابل اعتماد به چاپ چهارم رسیده است، حاکی از کنجکاوی رو به تزاید نسبت به زندگی هویداست.

۹. سمیعی، گفتگو با نویسنده.

۱۰. هویدا حدود ۳۱۰ پیپ و ۱۵۰ عصا گرد آورده بود. نگاه کنید به: دکتر مصطفی الموتی، ایران در عصر پهلوی، جلد دوازدهم، [لندن، ۱۹۹۲]، ۱۲٦. فریدون هویدا به من [نگارنده] گفت که خود امیر عباس هویدا در پی جمع‌آوری مجموعه‌های پیپ و عصا نبود، بلکه آنها عمدتاً هدیه‌ی همکارانش بودند. فریدون هویدا، گفتگو با نگارنده، سوم اوت ۱۹۹۸.

۱۱. برای دستیابی به شرح تأسیس این مدرسه و نقش این دو روحانی در ایجاد آن،

بنگرید به: محسن هاشمی، هاشمی رفسنجانی: دوران مبارزه، تهران ۱۳۷۶، ص ۳۷.

۱۲. برای شرحی درخصوص نقش رفسنجانی در این ماجرا، ر.ک.: هاشمی رفسنجانی: دوران مبارزه، ص ۳۳. (این مطلب در نامه‌ای به ناشر از طرف دفتر آقای رفسنجانی تکذیب شد.ـ ناشر)

۱۳. فریدون هویدا، گفتگو با نگارنده، ۱۷ ژانویه ۱۹۹۸.

۱۴. بنی صدر، گفتگو با نگارنده، دوم ژوئن ۱۹۹۸ و کلمات آیت الله مطابق آن‌چه که بنی صدر به خاطر می‌آورد، نقل شده است.

۱۵. بنی صدر، گفتگو با نگارنده. حرفهای سالار جاف مطابق آن چیزی نقل شده که در خاطر بنی صدر مانده است.

۱۶. جمهوری اسلامی رنگهای قرمز، سبز و سفید پرچم را نگه‌داشت، اما شیر و خورشید آن را حذف کرد و به جایش آیه‌های قرآن را به عربی بر روی پرچم حک کرد. برای تاریخچه‌ی نماد شیر و خورشید، بنگرید به: احمد کسروی، "تاریخ شیر و خورشید" در کتاب کاروند کسروی، تهران، ۱۳۵۳، ص ۹۴ ـ ۱۰۹.

۱۷. فرشته انشاء، گفتگو با نگارنده، پاریس، فرانسه، ۴ ژوئن ۱۹۹۸. دکتر فرشته انشاء در همان اتاق با هویدا ملاقات کرد و آرایش آن را برای من توضیح داد.

۱۸. بنی صدر، گفتگو با نگارنده، رفتار کلّی هویدا، ظاهر موقر و آرام وی، آشکارا بنی صدر را تحت تأثیر قرار داده بود.

۱۹. احسان نراقی، گفتگو با نگارنده، پاریس، فرانسه، ۲ ژوئن ۱۹۹۸. نراقی، که از چهره‌های بارز رژیم پهلوی و از دوستان هویدا بود، بنی صدر را به هویدا معرفی کرده بود.

۲۰. اسداله علم، که سالهای متمادی وزیر دربار مورد اعتماد شاه و از دشمنان هویدا بود، در خاطراتش می‌نویسد که در فروردین ۱۳۵۲ این موضوع را محرمانه با شاه در میان نهاد که بقای هویدا قسماً نتیجه‌ی «پول دادن» به اعضای خانوادهٔ سلطنتی، به‌خصوص منسوبین ملکه است. بنا به گفته علم، شاه در این مورد دستور رسیدگی داد. در خاطرات علم هیچ نشانه‌ای از این رسیدگی و نتایج آن یافت نشد؛ در هیچ منبع دیگری هم اثری از آن نیافتم. بنگرید به: اسداله علم، یادداشتهای علم، جلد سوم، ص ۲۳.

۲۱. در مورد مبلغ دقیقی که هویدا به روحانیون پرداخت می‌کرد، توافقی وجود ندارد. بعضی‌ها حدس زده‌اند این مبلغ حدود هشت میلیون دلار در سال بوده است. ر.ک.:
David Shumer, An Important Document Exposing Big Conspiracies, (Washington, D.C., 1982), 55.

۲۲. بنی صدر، گفتگو با نگارنده.

۲۳. دکتر فرشته انشاء، گفتگو با نگارنده، ۴ ژوئن ۱۹۹۸. هویدا اصل موضوع این مکالمه را در خلال آخرین ملاقاتش با دکتر انشاء در زندان، برای وی تکرار کرد.

۲۴. کیهان، ۲۷ بهمن ۱۳۵۷، و ۲۸ بهمن ۱۳۵۷.

۲۵. ن. ک. کیهان، ۱۴ فروردین ۱۳۵۸.

۲۶. در آن روزها، بنی صدر درباره‌ی مزایا و محسنات حکومت اسلامی و نوع جدید قدرت و عدالت آن مطالب زیادی می‌نوشت و سخنرانی‌های زیادی ایراد می‌کرد. ن. ک.: «حکومت اسلامی حکومت عقیده است»، کیهان، ۳۰ بهمن ۱۳۵۷.

۲۷. بنی صدر، گفتگو با نگارنده.

۲۸. برای بحثی سخت هوشمندانه در باب فرزندکشی در شاهنامهٔ فردوسی، ر. ک.:
Dick Davis, *Epic and Sedition: The case of Ferdowsi's Shahnameh* (Fayetteville, Ar. 1992; Washington, D.C., 1998), 97 - 166.

۲۹. فریدون هویدا، در عرصه‌های فرهنگی و فیلم منتقدی برجسته است. سالها پیش از انتصاب برادرش به مقام نخست وزیری، در یکی از مقالات خود، در مورد اهمیت پدرسالاری در فرهنگ و اساطیر ایران نوشته بود. به گمان او میان هویدا و شاه رابطه‌ای از جنم همان رابطه‌ی پدر/پسر داستان‌های اسطوره‌ای ایران سراغ می‌توان کرد. برای نظراتش در این زمینه ر. ک. به: فریدون هویدا، «جمهوری اسلامی در پرتو اسطوره‌شناسی ایران»، اختر، ۱۹۹۱، شماره‌ی ۱۰، صص ۴۲ - ۵۵.

وی در این مقاله درباره‌ی آن چیزی می‌نویسد که در تقابل با عقده‌ی ادیپ، «عقده‌ی رستم» می‌نامد و آن را کلید تاریخ فرهنگ و سیاست ایرانی می‌داند. وی دیدگاههایش راجع به این موضوع را نخستین بار در سال ۱۹۵۹، در خلال کنفرانسی مربوط به روانکاوی در پاریس، بیان داشت.

۳۰. درباره‌ی این توافق مطالب خیلی زیادی نوشته شده است. بنی صدر با قطعیت اعلام کرد که چنین لیستی وجود داشته است. او گفت که از این لیست در چندین جلسه‌ی شورای انقلاب، که وی یکی از اعضای آن بوده، یاد شده است. گفتگوی بنی صدر با نگارنده، ۲ ژوئن ۱۹۹۸.

ویلیام سولیوان، سفیر وقت امریکا در ایران، در خاطراتش می‌نویسد که، پیش از عزیمت شاه، وی با مهدی بازرگان که پس از کوتاه زمانی نخست‌وزیر دولت موقت انقلابی ایران شد، و آیت الله موسوی، که «از جانب رکن مذهبی انقلاب صحبت می‌کرد»، دیدار و گفتگو کرد. سولیوان، با بهره‌گیری از زبان احتیاط‌آمیز یک دیپلمات، در تشریح این ملاقات می‌نویسد، «بازرگان و من به فرانسه صحبت کردیم، و آن گاه وی محترمانه جان کلام گفتگو را برای استفاده‌ی آیت‌الله، که در تمام مدت بسیار کم صحبت کرد، ترجمه می‌کرد. بازرگان آن چیزهایی را که همفکرانش از مدت‌ها پیش به کارمندان سفارت گفته بودند، برای من تکرار کرد. آنان می‌خواستند که نیروهای مسلح بی‌طرف بمانند و با دولت جدید همکاری کنند. آنان لیستی از افسران ارتش دراختیار داشتند و می‌خواستند آنان همراه با اموالشان کشور را ترک کنند و از کیفر بگریزند.» ر. ک.

William Sullivan, *Mission to Iran* (New York, 1981), 236 - 37.

۳۱. بنی صدر، گفتگو با نگارنده. وقتی ارتشبد نعمت‌الله نصیری در تلویزیون نشان داده شد، مورد ضرب و شتم قرار گرفته بود و به سختی می‌توانست صحبت کند.

۳۲. کیهان، ۲۶ اسفند ۱۳۵۷.

۳۳. دکتر فرشته انشاء، گفتگو با نگارنده، پاریس، فرانسه، ۴ ژوئن ۱۹۹۸. خانواده معتقد شده بود که این تأخیر و انتقال به معنی گذشتن خطر اعدام است.

34. Ockrent, *La memoire*, 30.

لادن برومند، که در آن روز نقش مترجم را بر عهده داشت به یاد ندارد که اُکرانت، بر خلاف ادعایش در خاطرات خود، سختی از قرارداد ژنو به میان آورده باشد. برومند می‌گفت اُکرانت آن چنان وسوسه‌ی انجام این مصاحبه را داشت، چنان مصر بود که این «پیروزی مطبوعاتی»ی خود را جامه‌ی تحقق بپوشاند که مسایل اخلاقی را یکسره وا گذاشته بود. لادن برومند، گفتگو با نگارنده، ۲۰ مه ۱۹۹۹.

۳۵. تمام نقل قولها از مصاحبه اُکرانت با هویدا است، مگر آن‌که خلاف آن ذکر شده باشد؛ این مصاحبه از نوار کانال سه فرانسه برگرفته شده است. ر. ک.:

Amir Abbas Hoveyda, Interview by Christine Ockrent, canal 3, France.

۳۶. برای شرحی از برخوردهای روزنامه‌نگاران با این سیاستمردان، ر. ک.:

Ockrent, *La Memoire*, 17 - 27.

۳۷. برخی منتقدانِ کریستین اُکرانت روایت وی را از رویدادهای منجر به مصاحبه [با هویدا] مورد تردید قرار داده‌اند. آنان ادعا می‌کنند که وی به توافقی پنهانی، و بسی غیراخلاقی، با صادق قطب زاده، یکی دیگر از کارگزاران با نفوذ آن زمان، تن داده است. صادق قطب‌زاده تا مقام وزارت خارجه‌ی ایران هم ارتقاء یافت، ولی بعد به جرم خیانت اعدام شد. این منتقدان، که برخی روزنامه‌نگاران برجسته‌ی فرانسه، چون ادوارد سابلیه، نیز در میان آنان یافت می‌شود، بر این گمان‌اند که قطب‌زاده، در عوض کمک در کار امکان بخشیدن به این مصاحبه، می‌خواست که در انتخاب پرسشها از هویدا، خود وی تصمیم بگیرد. به گفته‌ی این منتقدان، این تنها توضیح و توجیه لحن پرخاشگر مصاحبه‌ی اوکرنت می‌تواند بود. احسان نراقی، خاطرات، متن دست‌نویس انتشار نیافته (پاریس، ۱۹۹۸)، صص ۳۱۳ - ۳۳۲.

۳۸. لادن برومند، گفتگو با نگارنده، ۶ ژانویه‌ی ۱۹۹۸.

۳۹. ظاهراً در آن روزها در تهران، بیش از یک نفر شبیه فوکیه ـ تانویل یافت می‌شد. اُکرانت، در وصف سفرش به تهران از شباهت خلخالی به فوکیه تانویل می‌نویسد. ص ۲۵.

40. Ockrent, *La Memoire*, 15–16.

۴۱. برومند، گفتگو با نویسنده.

۴۲. عادت فرستادن خبرنگارانی به جهان سوم که نسبت به فرهنگ محلی بی‌اطلاع‌اند

و زبان بومی را نمی‌دانند و گاه حتی خفیف‌اش می‌شمارند، به گمان من، مصداق بارز نخوت استعماری است. اُکرانت به هیچ یک از مذاکراتی که درباره‌ی مترجمان صورت گرفته بود اشاره‌ای نمی‌کند. مضمون این مذاکرات را از لادن برومند شنیدم. لادن برومند، گفتگو با نگارنده، ۶ ژانویه‌ی ۱۹۹۸.

۴۳. اُکرانت درباره‌ی «دل آشوب»شدنش به دیدن آن همه رنج انسانها نیز می‌نویسد:
Ockrent, *La Memoire*, 15.

۴۴. گفتگو با برومند.

۴۵. برومند و اوکرنت هر دو به این شادمانی اولیه اشاره کرده‌اند.

46. Ockrent, *La Memoire*, 31.

۴۷. اسدالله علم، که معتمد شاه بود، بارها در خاطرات خود به این واقعیت اشاره می‌کند که شاه نسبت به مقالات مجله‌ها و روزنامه‌های غربی حساسیت عجیبی داشت و از هرگونه انتقادی که در آنها طرح می‌شد بر می‌آشفت. به‌علاوه، شاه در پس هر مقاله و نوشته‌ای یک توطئه می‌دید. ر.ک.: یادداشتهای علم.

۴۸. مسعود بهنود، از سید ضیاء تا بختیار، تهران، ۱۳۶۹، ص ۵۱۰.

۴۹. اوکرنت درباره‌ی برخی از این انتقادها نوشته است. ر.ک.:
Ockrent, *La Memoire*, 33–40

۵۰. اگر خاطرات اُکرانت را که به لطف بازنگری و به کمک ویراستاران نوشته شده، بتوان معیاری از شناخت وی از سیاست در ایران و توجه روزنامه‌نگارانه‌ی وی به جزئیات تلقی کرد، پس اتهام هویدا را باید درست دانست. آن فصل از خاطرات اُکرانت که به سافرتش به تهران اختصاص دارد سرشار از اشتباهات فاحش است. نه‌تنها در مورد جزئیاتی چون مکان تحصیلات عالی هویدا اطلاعات غلط داده ـ به جای بروکسل، فرانسه را محل تحصیلات وی بیان کرده ـ، حتی برای محل زندان هویدا هم نامی از خودش در آورده است. وی این زندان را «اِروان، Erevan» می‌نامد. طبعاً چنین زندانی در تهران وجود ندارد. به نظر می‌رسد که زندانهای «اوین» و «قصر» را که هویدا در آن جا زندانی بود، با هم اشتباه کرده و نامشان را به نحوی در هم آمیخته است. برخلاف نوشته‌های وی، بنی‌صدر هرگز «استاد الهیات» نبوده است. قطب‌زاده هم در آن زمان وزیر اطلاعات نبود، اصولاً در آن زمان وزارت اطلاعاتی در کار نبود.

۵۱. راجی درباره‌ی نقش هویدا در فراهم آوردن امکان دیدار صلیب سرخ از زندانها به تفصیل می‌نویسد. به نوشته‌ی وی، این هویدا بود که امکان تحقق دیداری مهم مابین شاه و مارتین انالز، دبیر کل عفو بین‌الملل، را فراهم آورد. (ر.ک. خدمتگزار تخت طاووس. ص ۵۵). اسناد سفارت امریکا در ایران حاکی از آن است که هویدا همچنین در ترتیب دادن مذاکراتی مابین شاه و ویلیام باتلر، رئیس کمیته‌ی اجرایی کمیسیون بین‌المللی حقوقدانان، نقش داشت. هویدا در شیراز در یازدهم اردیبهشت ۱۳۵۷ با باتلر دیدار کرد. وقتی بازدید عفو بین‌الملل از زندانهای ایران تحقق یافت، من زندانی سیاسی بودم. شرایط زندانیان پس از آن بازرسی به نحو بارزی بهبود یافت.

# فەسڵی دووەم

## بەرزەخی بەیڕووت

**وشتر گرانترین بار هەڵ دەگرێ**
**گورگ بە بێدەنگی دەمرێ**

**بایرۆن**

# بەرزەخی بەیڕووت

ئەمیر عەبباسی هووەیدا لەتاران لە دایک بوو. ئەگەرچی تاران لەو ڕۆژگارەدا خۆی بە شار دەزانیو لە ساڵی ١١٦٥ (١٧٨٦)یشەوە ببووە پیتەختی ئێران، بەڵام لەڕاستیدا گوندێکی هەڵمساو زیاتر نەبوو. ئەمیر عەبباس زستانی ساڵی١٢٩٨(١٩١٩)، [١] "پێش تاوهەڵاتی ڕۆژێکی ساردی زستانی کە بەفر هەموو جێیەکی گرتبوو"هاتە سەر دنیا. بنەماڵەکەی لە سەرێکەوە دەچوونەوە سەر خانەدانێکی لێکەوتوو، و لەسەرێکی دیکەوە لە چینێکی مامناوەندیی تاڕادەیەک دەستڕۆیشتوو بوون. ڕۆژی لەدایکبوونی ئەمیر عەبباس، "بەفر هەموو جێیەکی گرتبوو."[٢] دیارە بۆ هیچکام لەو بابەتانە، بەڵگەیەکی ڕەسمیو باوەڕپێکراومان لەدەستدا نیە. ئەوەی دەیزانین قەرزداری ئەوڕاستییەین کە دایە گەورەی هووەیدا ساڵو فەسڵو ـ نۆ ڕۆژ ـ ی لەدایکبوونی وی "لەسەر بەرگی قورئان لاپەڕەی سپیی پێش سوورەی ألفاتحە" نوسیبوو. لە ئێرانی ئەو سەردەمەدا، هێشتا کەس ناسنامەی نەبوو. تەنیا بەڵگەی لەدایکبوونی هەرکەس هەر ئەو چەند دێڕە بوون کە بە هەوڵی بنەماڵەی ساوایەکە لەسەر بەرگی قورئانێک دەنووسران. جگە لەوە، ئەو ڕۆژگارە کەم کەسیش ناوی بنەماڵە (شۆرەت)ی هەبوو. خەڵکیان زۆرتر هەر بەناوی خۆیان دەناسی. جاری واش بوو لەقەبێکی دەگەڵ دەکەوت. لەقەبی خانەدان، پیشە، لەقەبی بەخشراو یان کڕراو، شوێنی لەدایکبوونو،

هێندێ جار تەنانەت باری کەمئەندامیی کەسێک وەک لەقەب بەکار دەبرا.[حەمە کەت، سەعە شەل، عەبە کوێر...] شەش ساڵ دوای لەدایکبوونی هووەیدا، قانوونی سەبتی ئەحواڵ لە ئێران پەسند کرا.[٢] باوکی هووەیدا، کە ئەودەم بە عەینولمولک بەناوبانگ بوو، ناوی "هووەیدا"ی بۆ بنەماڵەکەی هەڵ بژارد. هەرنەبێ لەبارێکەوە ناوێکی بێ نێوەرۆک بوو. بەجۆرێکی دیکە بڵێین هەرچەند کەسایەتی و بیرو بۆچوونی وی ـ وەهەروەها دواتر هی کوڕەکەی ، ئەمیرعەبباس ـ بە پێچەڵپووچ و پڕنهێنی دەناسرا، بەڵام بەهەرحاڵ ئەو ناوێکی هەڵ بژارد کە دەرخەری ئاشکرایی و بێ پێچوپەنایی بوو.

لەدایکبوونی هووەیدا دەگەڵ ساڵێکی قەیرانیی مێژووی ئێران هاوکات بوو. شۆرشی مەشرووتە بانگەوازی نوێخوازیی دەکرد. بەڵام دوای ماوەیەک سەری کێشایە شەڕی نێوخۆو بێسەرەوبەرەیی کۆمەڵایەتی. دەوڵەتی ناوەندی زۆر لاواز بووو هێزە ناوەندنەویستەکان کە وا دیارە بوونیان هەمیشە بەشێک لە نێوەرۆکی مێژووی ئێران بووەو دوای شۆرشی ١٩١٧ی ڕووسیەش بە پشتیوانی و هاندانی دەوڵەتی شووڕەوی پشت قایم بوون، تەواوەتیی خاکی ئێرانیان دەمەترسی خستبوو.

تەنانەت وا دەهاتە بەرچاو کە سروشتیش دەگەڵ ئێران و پێتەختەکەی نارێکە. سی ساڵ بوو کە نەخۆشیی کۆلێرا بەربووە گیانی دانیشتووانی تاران. جارێک ساڵی کۆلێراو ڕشانەوە بووو جارێک نەخۆشییەکی خەتەرناک کە پێیان دەگوت ئانفلۆنزای ئیسپانیایی گاڵەی دەکرد. لە ساڵەکانی دوای شەڕی یەکەمی جیهانیدا ئەو نەخۆشییە لە جیهاندا بڵاو بۆوە کە نیزیکەی بیست میلیۆن ئینسانی کوشت. لە تارانیش سی هەزار کەس بوونە قوربانیی ئەونەخۆشییە کوشەندەو سەمەرەیە.

دەوڵەتی ئیستیعمارگەری ئینگلیستان کە لەسەدەکانی نۆزدەیەم و بیستەمدا هەمیشە بەڵای گیانی مێژووی ئێران بوو، شۆرشی ئۆکتۆبری کردە بیانوو و بڕیاری دا دەسەڵاتی خۆی بەسەر ئێراندا پتەوتر بکا. بۆ

جێبەجێکردنی ئەو سیاسەتە پیاوەکانی ئینگلیس بەرتیلیان دا بە سێ کەس لە بەنفووزترین سیاسەتمەدارانی ئێران و هانیان دان بۆ ئیمزاکردنی ڕێککەوتننامەی پڕشووورەیی ١٩١٩.* بە پێی ئەو ڕێککەوتننامەیە ئێران بەکردەوە دەبووە یەکێک لەکۆلۆنییەکانی ئینگلیس. تەنیا لە ئاکامی خەباتی بەشێکی بەربڵاو لە هێزە نیشتمانییەکانی ئێراندا بوو، کە هەوڵەکانی ئینگلیس سەریان نەگرت و ڕێککەوتننامەکە هەڵ-وەشایەوە.

ساڵی ١٢٩٨ (١٩١٩) ئەحمەد شای قاجار هەروا لەسەر تەختی پادشایەتی پاڵی دابۆوە. ئەو بوو بە دوا پادشای بنەماڵەی قاجار لە ئێراندا. وا دیار بوو هەر لە سەرەتاوە بە نابەدڵی پلەی پادشایەتیی وەرگرتبوو. ڕەنگە زەنازەنای کازینۆکانی ئورووپاو جوانییەکانی هۆتێل مۆنترۆی سویسی پێ لە حکوومەت بەسەر وڵاتێکی پەرێشان و لەبەریەک ترازاو باشتر بووبێ. پاش داستانی ڕێککەوتننامەی ١٩١٩، بیرۆکەی دامەزراندنی ڕێژیمی کۆماری لە ئێران لەنەکاو برەوی پەیدا کرد. ڕەزاخان کە ئەودەم وەزیری شەڕ بوو و پاش ماوەیەک بوو بە سەرۆکوەزیرێکی بەتواناو خۆشەویست، کاندیدای سەرەکیی پۆستی سەرکۆماری بوو.**

---

* یەکێک لەو سێ بەرتیلخۆرە باپیری هاوسەری دواتری ئەمیر عەبباسی هووەیدا بوو.

** ڕەزاخان ماوەیەک بەرلەوەی زنجیرەی قاجار بڕووخێنێ و خۆی وەک شا ڕابگەیەنێ،کەوتە فکری دامەزراندنی ڕێژیمی کۆماری لە ئێراندا. سەیر ئەوە بوو ئەودەم،ئاخوندەکان لەهەمووان زیاتر دژی ئەو بیرۆکەیە بوون. لەنامەیەکدا کە ساڵی١٣٠٢ (١٩٢٣)و بەخەتی ڕەزاخان نووسراوە، بەئاشکرا ئۆگری بە ڕێژیمی کۆماری هەست پێ دەکرێ. لەوێدا داوا لە فەرماندە سوپاییەکانی ژێرحوکمی خۆی دەکا تا بۆیان دەکرێ پارلمان بخەنە ژێر پاڵەپەستۆو داوای لێ بکەن ئێران بکاتە کۆماری. هەرلەوکاتەدا لە نامەکە دەردەکەوێ کە خۆی بە کاندیدای سەرەکی بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرکۆماری دەزانێ. بڕوانە پهلوی ها،ویرایش وگردآوری فرهاد رستمی،تهران ١٣٧٨ ص ٤ -١٠٣

هەر لەوساڵەدا (١٢٩٨)، ڕەزاخان بوو بە خاوەنی کوڕێک کە ناوی نـرا موحەممـەد ڕەزا. چارەنووسـی هووەیـدا سـەرەنجام دەگـەڵ کەسایەتی و چارەنووسی ئەو کوڕەی ڕەزاخان لێک گرێ درا.

ساڵی١٢٩٨ جەشـیمەتی تاران دەوروبەری دووسەد هەزار کەس بوو. شار دوازدە دەروازەی هەبوون. هێندێکیان زۆر جوان و زێڕکفت و هێندێکی دیکە سادەو ساکار بوون. باپیری هووەیدا خانوویکی لە نیزیک یەکێک لەو دەروازانە هەبوو.[٤] لەو ڕۆژانەدا، تاران خەندەکیشـی هـەبوو و ئەو شیرینکارییە بەرهەمی یەکێک لە سەفەرە پڕخەرجەکانی ناسرەددین شا بۆ ئورووپا بوو. لەوێ "سولتانی ساحەب قران" سەری شارێکی دا کە سەدەکانی نێوەڕاست دروست کرابوو و بەپێی دابوشوێنی ئەوکات، دیوارو خەندەکی هەبوو.[٥] "قیبلەی عالەم" ئەو دیمەنەی پێ جوان بوو و هەرکە گەڕایەوە وڵات فەرمانی دا دیوارو خەندەکێکی وەک ئەوەی دیتبووی بەدەوری پێتەختی ئێراندا بۆ دروست بکەن.[٦] بەڵام تاران شارێکی بێ ئاوە. پشتی دە چیا بەرزەکان و ڕووی دە دەشتێکی پان و بەرینی وشک و دیمەکارە. ئاکامەکە ئەوە بوو کە خەندەک هیچ کاتێک ئاوی دەخۆیدا نەدی. کاتێک هووەیدا هاتە سەر دنیا، خەندەکی شاهانە ببوو بە شوێنی بەنگکێش و چەرسکێش و لاتولۆتیو گەجەرگوجەران.[٧]

ساڵی١٣٠٥(١٩٢٦) ڤیتا ساکڤیل وێست* هاتە تاران. ئەو یەکێک لە ئەنـدامانی گرووپـی بـەناوبانگی بلـووم بـووری** بـووو کـەین و بەینێکیشی دەگەڵ ڤێرجینا ۆڵف هەبوو. کە گەیشتە تاران سەری لە دەروازەکانی شار سوڕما. تێگەیشت کە هاتنەنێوشار پێویستیی بە ئیزنی دەروازەوانان هەیە. بیرەوەریی سەفەری خۆی بۆ ئێرانی لە کتێبێکی زۆر جواندا نووسی. لەوێدا شوێنەواری ڕۆمانتیسم و ڕوانینی تایبەتیی وی بۆ ڕۆژهەڵات زۆر دیارە. بەئیشق و سۆزێکی سەرسوڕهێنەوە لە ئێران و سروشتەکەی دەدوێ. بەڵام کـە دێتـە سـەر تـاران هـیچ

* Vita Sackville-west
** Bloo Mb Burry

پێهەڵگوتنێکی نیە. دەڵێ: "تاران، بازاڕەکەی لێ دەرچێ هیچ جۆرە جوانییەکی نیە. شارێکی پیسە بە شەقامگەلێکی پیس و پڕزبڵ و زاڵ و سەگە بەرەڵڵاو فایتوونگەلێکی کۆن بە ئەسپی مردەلۆخەوە، چەند خانووبەرەی بەڕواڵەت ڕازاوەو کۆمەڵێکی زۆر خانووی نیوە وێران.[٨]

هەمووشەوێ دەگەڵ خۆرئاوابوون شەقامەکانی تاران دەکەونە پاوانی لات ولووت و بەرەڵڵاکانی شار. خەڵکیش لەترسی ئەو لات-ولووتانەو هەر وەها لەترسی ڕاووڕووتی فەرمانبەرانی دەوڵەت دەماڵەکانیان دەخزێن و پێ دە شەقامەکان نانێن.

ساڵی١٢٩٨ (١٩١٩) تاران زانکۆیەکی نەبوو. ماڵی هونەر (دارالفنون) کە لەسەردەمی سەرۆک وەزیریی ئەمیر کەبیردا دامەزرابوو، و خوێندنگەی بەرزی زانستە سیاسییەکان (مدرسە عالی علوم سیاسی)، کە لە دەروازەی سەدەی تازەی زایینیدا دامەزرابوو، تەنیا ناوەندی فێرکردنی بەرزی پێتەخت بوون.[٩] ماڵی هونەر لەڕاستیدا جۆرێک پۆلی تێکنیک بوو کە لەوێدا سەرەتاکانی پزیشکی، ئەندازیاری، زانستە بناغەییەکان و زمانە بێگانەکان دەخوێندران. خوێندنگەی بەرزی زانستە سیاسییەکانیش بناغەی یەکەمین کۆلێژی ماف و زانستە سیاسییەکانی وڵات بوو. زۆر لە مەلاکانی ئەو ڕۆژگارە دژی دامەزرانی ئەو دوو بنیاتە عورفییە بوون. دەیانزانی دامەزرانی ئەوجۆرە ناوەندانە، دەسەڵاتی پاوانخوازانەی مەلاکان لەبواری فێرکردن و دادوەریدا دەخاتە مەترسییەوە.

ساڵی١٢٩٨ ئەو پێتەختنشینانە کە تاقەجارێکیش سواری ترومبێل بوون، بە قامکی دەست دەژمێردران. ئامرازی سەرەکیی هاتوچووی خەڵک، ئەسپ، گوێدرێژ، ئێسترو فایتوون بوون. ڕاست لەو ساڵەدا پۆلیسی شاری تاران بەیاننامەیەکی دەرکرد کە لەودا بۆ یەکەمین جار، بڕیار درابوو کە لەوە بەدوا تەنیا ئەو کەسانە دەتوانن لەنێو شاردا ترومبێل لێخوڕن کە پێشتر بەڵگەنامەیەکیان لە پۆلیس وەرگرتبێ. لەو بەیاننامەیەدا هەروەها هێندێک ڕێوشوێنیش دەربارەی مافی پێشکەوتنی پیادەکان، فایتوونەکان، ئێسترەکان وترومبێلەکان دیاری کرابوون.[١٠] قەتار

(ترین)یش لەو رۆژگارەدا شتێکی دەگمەن بوو. هێڵێکی کورتی نێوان تاران و شاعەبدولعەزیم (شاری ڕەی) کە ئەویش یەکێک لە دیارییەکانی سەفەری ناسرەددین شا بۆ فەرەنگ بوو، بەتەنیا خەتی ڕێگای ئاسن لە وڵاتدا دەژمێردرا.

خەڵکی تاران حەزیان لە قەتار نەدەکرد پێیان دەگوت ماشێنی دووکەڵدار (ماشین دودی) و ئەگەرچی لە چۆنیەتیی هاتوچوویەکەی سەریان سوڕمابوو، بەڵام جاروباریش زۆر بەتوندی دەگەڵی دەبزووتنەوە. کاتێک بەڕێکەوت ڕێبوارێک کەوتە بەر چەرخی یەکێک لەو قەتارانە، دەوڵەت ناچار بوو هەموو قەتارەکان پەک بخا. تەنانەت پێش ئەم ڕووداوەش سندەگڵبارانی ئەو قەتارانە کە هاتوچوویان دەکرد یەکێک لە سەرگەرمییە سەرەکییەکانی منداڵانی شاری تاران بوو. ٢٢ساڵی خایاند تا سەرەنجام ڕێگائاسنی سەرانسەریی ئێران دامەزراو ئاوەکانی خەلیجی فارس دەگەڵ کەنارەکانی دەریای خەزەر پێکەوە گرێ دران.

لەو ڕۆژانەدا تەنانەت دووچەرخەش بە سەیروسەمەرەی ڕۆژگار دەژمێردرا. گۆیا یەک دووساڵ پێش لەدایکبوونی هووەیدا ڕۆژێک دوو منداڵە ئینگلیسی، لە مەیدانێکی شاری تاراندا دووچەرخە لێدەخوڕن. لەنەکاو ئاپۆرایەکی زۆری خەڵک بۆ دیتنی ئەو دیمەنە سەرسوڕهێنە کۆدەبنەوە.[11] هێندێک لە بەساڵداچووان دەیانگوت کوڕانی سواری دووچەرخە یەکێک لە نیشانەکانی ئاخرزەمانن. دەیانگوت مزگێنیی دەرکەوتنی ئیمامی زەمانیان پێیە. هەر لەو ساڵانەدا بوو کە هووەیدا لەباغی ماڵی نەنکی لەنیزیک یەکێک لە دەروازەکانی شار فێری سواربوونی سێ چەرخە دەبوو. دەیگوت: "سێ چەرخەش تازە لە تاران پەیدا ببوو."[12]

ئەمیر عەبباس کوڕە گەورەی ماڵێ بوو. دایک و بابی دەوری ساڵێک پێش لەدایکبوونی ببوونە هاوسەر. بڕیاری ئەو زەماوەندە بنەماڵەی بووک و زاوا دابوویان. دایکی، ئەفسەرولملووک لە منداڵانی خانەدانی قاجار بوو. لە میراتی بنەماڵە تەنیا ناوەکەی پێ بڕابوو. ماقوولزادەیەکی

دەست تەنگ، شازادەیەکی هەژار، یەک لە دەیان هەزار تۆووتۆرەمەی قاجار.

ئەفسەرولملووک نەوەی عیززەتوددەولە، تەنیا زڕخوشکی ناسرەددین شا بوو. کاتێک عیززەتوددەوله سێزدەساڵە بوو، بەفەرمانی ناسرەددین شا مێردی بە ئەمیرکەبیر کرد. ئەمیر ئەوکاتە پەنجا ساڵە بووو بە فەرمانی شا، خێزانی خۆی تەلاق داو زەماوەندی دەگەڵ بووکە تازەپێگەیشتووەکەی کرد.[13] دیارە نە سەرۆک وەزیری نوێخوازو تاڕادەیەک بەدەسەلات و نە عیززەتوددەولەی سێزدە ساڵە، نەیان وێرا سەرپێچی لە فەرمانی شای ملهوڕ بکەن.

ماوەیەکی زۆر لەو مەرحەمەتە شایانەیە نەگوزەرابوو کە ئەمیرکەبیر بەفەرمانی شا کوژرا. جگە لە ئەمیرکەبیر، عیززەتوددەوله چوار مێردی دیکەی کردن. دایکی هووەیدا لە سێیەمین مێردی بوو. ئەمجارەیان مێردەکەی ناوی یەحیاخانی موشیرووددەوله بوو کە ماوەیەک بوو بە سەرۆکوەزیری ئێران. عیززەتوددەوله پێی وابوو مێردی سێیەمیشی هەر بەفەرمانی شا کوژراوە. تەنیا جیاوازیی دەگەڵ داستانی ئەمیرکەبیر جۆری کوشتنەکە بوو. میرزا تەقی خان ڕەگی ملیان هەڵبڕی، یەحیاخان "قاوەی قەجەر"یان دەخوارد دا کە یەکێک لەو ئامرازانەی کوشتن بوو، کە بنەماڵەی "شەریف"ی قاجار حەزیان پێ-دەکرد.[14]

باوکی ئەفسەرولملووک لە بنەماڵەیەک بوو کە بە ڕووناکبیر بەناوبانگ بوون. باپیری، ناسروسسەلتەنە، لە پیاوانی دەربار بووو لەبەر ئەوەی بیروباوەڕی عورفیی [بەرامبەری شەرعی] هەبوو، پێیان دەگوت "کوفری". باوکی، سولەیمان خانی ئەدیبوسسەلتەنە، پیاوێک بوو خۆشفکرو لە لایەنگرانی سەرسەختی نوێخوازی و زۆریش لایەنگری فەڕانسە بوو. ئەویش وەک بەشی زۆری ئێرانییانی ڕووناکبیری ئەو نەوەیە، پێی وا بوو شۆرشی فەڕانسە نوێنگەی پێشکەوتن و تیشکی هیوای ڕزگاریی مرۆڤایەتییە. دیارە ئۆگریی سولەیمان خان بە فەڕانسە زیاتر لە هاوتەمەنەکانیشی بووو کەموزۆر وەک ئەفسانە دەچوو.

لەلایەک مکوڕ بوو کە هەر سێ کچەکەی بخوێنن و پێی دادەگرت کە هەر کامەیان لێدانی ئامرازێکی مۆسیقاش فێر بن. ئەفسەرولملووک گیتاری لێ دەداو خوشکەکەی، مەلەکە سەبا، پیانۆ. جگە لەوە، سولەیمان خان داوای لە منداڵەکانی دەکرد هەموو شەوێ پێش خەوتن، بە دەنگی بەرز سروودی نیشتمانیی فەڕانسە (واتە مارسیز) بخوێنن.[15]

دیارە بە پێچەوانەی ڕووناکبیربوونی بنەماڵەی باوکیی ئەفسەرولملووک، کاتێک وەختی بەشوودانی کچان هات، نەریت بەسەر نوێخوازیدا زاڵ بووو هەر سێ کچەکە ڕێوشوێنی دایەگەورەی خۆیان، عیززتوددەولەیان ڕەچاو کرد. ئەفسەرولملووک پازدە ساڵە بوو کە بنەماڵەکەی ناچاری کرد مێرد بە پیاوێکی چل ساڵە بکا. بەپێی دابونەریتی ئەو سەردەمە، ئەویش پێش شەوی زەماوەند، تەنیا یەک جار چاوی بە هاوسەری دواڕۆژی خۆی کەوتبوو. هیچ کاتێکیش گومانی لە ڕاست ودروستیی بڕیارەکەی خۆی نەکرد. هەر لەوکاتەدا هێندێ نیشانە هەن کە ئەو دوای زەماوەند نەکهەر ڕێزێکی زۆری بۆ مێردەکەی دادەنا، بەڵکوو دەگێڕنەوە کە خۆشیشی دەویست. دیارە هیچ وەخت ناتوانین پەی بە هەستی ڕاستەقینەی وی بەرامبەر بە مێردەکەی بەرین. بۆ ژنانی سەردەمی وی، باس و تووێژ لەبارەی مەسەلەی ژن و مێردایەتییەوە جڵف و ناشیرن دەهاتە بەرچاو. هەرچەند ئەفسەرولملووک وەختێک مێردەکەی مرد تەنیا سی‌وشەش ساڵ تەمەنی بووو ئەگەرچی بۆخۆی هەشتا ساڵ ژیا، بەڵام هەرگیز مێردی نەکردەوە. جگە لەوەش، ئەوەندەی ئێمە بزانین، هیچ وەخت بەچاکە نەبێ باسی مێردەکەی نەدەکرد.[16]

عەینولمولک پیاوێکی توندەتەبیات بوو. هەست و سۆزی خۆی بە ئاسانی دەرنەدەبڕی. هەر لەوکاتەدا پیاوێکی خۆخۆرەوەو لەخۆبایی بوو. هێندێ جاریش تووشی خەمۆکی دەهات. ڕەفتارو ئەخلاقی کارمەندێکی بەدئەخلاقی ئەڵمانیی هەبوو. زۆروکەم لە تەواوی ئەو وێنانەدا کە لەپاشی بەجێ ماون، ڕوانینە توندو سەختگیرانەکەی لەپشت چاویلکە کانزاییە باریکەکەیەوە دەبینین. شێوەی کەسێکی زۆر جیددیی

هەبوو کە دەتگوت لەحزەیەک گاڵتەو بێ موبالاتیی پێ قبووڵ ناکرێ. ئەمیر عەبباس ئەوی بە پیاوێک دەزانی کە هەم کەمدوێ بوو، هەم بەکەمی هەست و سۆزی خۆی نیشان دەدا. بەڵام بەباوەڕی کوڕەکەی دیکەی، فەرەیدوون، عەینولمولک نوێنگەی تەواوی کەسایەتیی باوک سالارییە کە لە ئەفسانە ئێرانییەکاندا نەخشێکی گەورەی بەئەستۆوەیە. بە وتەی فەرەیدوون، هەروەخت عەینولمولک لەماڵ بایە، ترس و لەرزیش لە حەوادا شەپۆلی دەدا. ڕەفتاری وەک ئاغایەکی سەختگیر وا بوو.

لەوەختی ژنهێناندا عەینولمولک ڕووناکبیرێکی بێ کەم وکەسری بوو. فەرهەنگی میزۆپۆتامیای، کە بەیرووت نموونەو نوێنگەیەکی بوو، باش دەناسی. وەک زۆر لە سیاسەتمەدارانی بەنفووزی سەدەی بیستەمی ئێران، ئەویش لە مەدرەسەی ئەمریکاییەکانی بەیرووت پێ-گەیشتبوو. هەر لەوێ زمانەکانی عەرەبی، ئینگلیسی و فەڕانسەیی فێرببوو. تێکەڵاوێکی سەیر لە بەرهەمە جۆراوجۆرەکان- لە نووسینەکانی خەلیل جوبرانەوە بگرە تا ڕۆمانەکانی میشێل زواگۆ-ی وەرگێڕابوونە سەر فارسی.

ئەگەرچی عەینولمولک بۆخۆی لە چینی مامناوەندی بوو، بەڵام بەهۆی تێگەیشتن و بەهۆشیی خۆی توانی ڕێی خۆی بخاتە بنەماڵە ماقووڵەکانی ئێران. دوای ئەوەی لە بەیرووت خوێندنی تەواو کرد، چووە پاریس. لەوێ چاوی بە جەعفەر قولی سەردار ئەسعەد کەوت کە یەکێک لە ڕووما ناسراوەکانی شۆڕشی مەشرووتە بوو. پاش ماوەیەک بوو بە مامۆستای منداڵەکانی ئەسعەد. ئەویش ئۆگریی بە عەینولمولکەوە پەیدا کردو هەر بە نیشانەی ئەو ئۆگرییەش داوای لە ئەحمەد شا کرد لەقەبی عەینولمولک بدا بەو مامۆستا گەنجە. سەردار ئەسعەد پیاوێکی ئەدیب بوو. هەر بە ڕاسپاردەی ویش بوو کە عەینولمولک هێندێک لە ڕۆمانە درێژو پڕخوێنەرەکانی پانسن دو

تــارێلی* کــە کەســـایەتیی ئەفســـووناویی ڕۆکـــامبوول قارەمانـــە سەرەکییەکەیان بوو، کردنە فارسی.[17] ئەم وەرگێڕانانە بەقەبەدەر ئەسڵە فەڕانسەییەکەیان لایەنگر و خوێنەریان هەبوو.

بەڕواڵەت سەفەری عەینولمولک بۆ پاریس ئاکامی ناکۆکییەک بوو کـە دەگـەڵ میـرزا ڕەزای بـابی بـۆی پێـک هـاتبوو. میـرزا ڕەزا لـە هاودەسـتانی عـەبباس ئەفەنـدی بـوو. لەوکاتـەوە کـە ڕۆژی سـێی جـۆزەردانی ١٢٢٣ (١٨٤٤) موحەممـەد عـەلی بـاب خـۆی بـە "مەهـدیی مونتەزەر" ناو برد، پەیڕەوەکانی لە ئێراندا زۆربەی وەخت لەژێر ڕاونان وئازاردا بوون.[18] لە ئاکامدا ئەم ئایینـە نوێیەو کەسایەتیی پـەیڕەوەکانی، بوونـە هـەزار لۆنەیـەکی پڕ ڕەمزو نهێنی.[19] هەڵوێستی هەمیشـە تونـدی ئاخوندە شیعەکان بەدژی ئەو ئایینە نوێیە، پێداگرتنیان لەسـەر ئەوە کە باب و مەزهەبەکەی شتێک نین جگە لە ئامرازێکی دەستی ئیستیعماری ئینگلیس و پیلانـەکانی زایـۆنیزم، هـەموو دەسـتیان دایـە دەسـتی یـەک و بەهاییەکانی کـردە قـەومی سـەرگەردانی سیاسـەتی هاوچـەرخی ئێـران. بێجگـە لەمـە بـەهایی بـوون بـوو بـە تۆمـەتێکی سیاسـی کـە هـەم سـابیت کردنـی و هـەم حاشـالێکردنی هـەردووکیان زۆر دژوار بـوون و هـەر بۆیەش جاروبار وەک چەکێکی سیاسی لە دژی ئەم یان ئەو کەسایەتیی سیاسی بەکار دەبرا.

گومـانی تێـدا نیـە کـە بـاپیری هووەیـدا (لـە باوکـەوە)، میـرزا ڕەزا، بەهایی بوو. هێندێ نیشـانە وا دەردەخـەن کە عـەینولمولکیش، هەرنـەبێ بەگـەنجی، لـە پـەیڕەوانی عـەبباس ئەفەنـدی بـووە. یادداشـتێکی کـورتی ئەفەنـدی بـۆ پـەیڕەوەکانی کـە وێنەیـەکی هـەر لـەم کتێبـەدا دەسـت دەکـەوێ، بەڵگەیـەکی جێـی بـاوەڕو متمانەیـە لەسـەر چەنـدو چـۆنی پێوەنـدیی عـەینولمولک بـە بەهاییزمـەوە.[20] لـەم یادداشـتەدا ئەفەنـدی کـە ئەودەم دوور خرابۆوەو لـە ئاکرا دەژیا، داوا لـە دۆسـتەکانی لـە تـاران دەکا کارێـک بـۆ عـەینولمولک پەیدا بکـەن. دەنووسـێ: "لـەبارەی جـەنابی

---

* Poson Du (Terrail

میرزا حەبیبوڵڵاوە، ئەمە لە تورەمەی بەڕێز ئاغا ڕەزایە. هەرجۆرێک بێ، دەگەڵ یارانی دیکە هیممەت بکەن کە بەڵکوو خوا بکا بەر پرسیایەتییەک بۆ وی ئەگەر لە ویلایەتەکانی دیکە یان لە دەرەوەی وڵاتیش بووە، ئامادە بکرێ. ئەم بابەتە لەلای من زۆر گرنگە لەبەر خۆشەویستیم بۆ ئاغا ڕەزا"❋



ئەمیر عەبباسی هووەیدا دووساڵە بوو کە باوکی کرا بە سەرکونسوولی ئێران لە دیمەشق. ئەمڕۆ مەودای نێوان تاران و دیمەشق بە فڕۆکە بە دوو سەعات دەتوانین ببڕین. بەڵام ساڵی ۱۳۰۰ (۱۹۲۱) عەینولمولک و بنەماڵەکەی ئەو مەودایەیان بە سێ مانگ بڕی. بە وتەی هووەیدا، داستانی ئەو سەفەرە "زۆر وەک داستانەکانی هەزارویەک شەو دەچوو."[۲۱۰]

بنەماڵەی هووەیدا بە کەلوپەلی نێو ماڵەوە، بە عارەبانەیەک لە تارانەوە چوونە کەنارەکانی خەلیجی فارس. لەوێوە بە کەشتی پێشان خۆیان گەیاندە بۆمبەیی و پاشان چوونە یەکێک لە بەندەرەکانی دەریای سپیی نێوەڕاست. بەرێکەوت سەریان لە قاهیرە وەدەرنا. دوای مانەوەیەکی کورت لەو شارەو، پاش پەڕینەوە لە کانالی سوویێز، ترومبێلێکیان بەکرێ گرت کە بیان باتە دیمەشق.[۱۱] بیابان لەو ڕۆژگارەدا جادەو نیشانەی هاتوچووی لێ نەبوو. تی. ئەی. لۆرێنس. ناسراو بە

---

❋ کاتێک جەنابی فوئادی میساقی بیستی کە کتێبێکم لەبارەی ژیانی هووەیداوە بەدەستەوەیە، پێوەندیی پێوەگرتم و لەڕووی لوتفەوە وێنەیەکی لەو نامەیە دامێ. هەرلەوکاتەدا بەڵێنی دا کە دوایە سەرچاوەی بەڵگەکەشم،کە دەیگوت یەکێک لەگرنگترین کتێبەکانی بەهاییزمە،بداتێ. بەداخەوە ماوەیەک پاش ناردنی ئەم نامەیە بە نەخۆشیی شێرپەنجە مرد. چوونکە سەرچاوەی نامەکەم دەست نەکەوت، دەقی دەستخەتەکەم داناوە.

لۆرێنسی عەرەبستانیش کە هەر لەورۆژانەدا بەو بیابانەدا سەفەری دەکرد، ئەوێی ناو نابوو "دەریایەکی نەناسراو لە ڕەمڵ". شۆفێرە عەرەب زمانەکەی بنەماڵەی هووەیدا، جارجار لەنێو ڕەمڵەکە ڕادەوەستا، لە ترومبێلەکە دەهاتە خوار، گوێی بە ڕەمڵی بیابانەوە دەناو بە کۆمەگی ئەو دەنگانە کە گوێی لێ دەبوون، ڕێی خۆی لەو دەشتە پان و بەرین و سامناکەدا دەدیتەوە.[34]

لەکاتی ئەو سەفەرەدا هووەیدا دووساڵە بوو. وردەکاریی سەفەرەکە لە مێشکیدا لە بیرەوەرییەکی لێڵ وتاریک بەولاوە نەبوو. بۆیە ناچار پشتی بە بیرەوەرییەکانی دایکی دەبەست. ئەو دەنووسێ: "دیمەنەکانی ژیانی یەکەمین ساڵەکانی منداڵیم لەبیر نین. هێندێ جار ئەو دیمەنانە دەگەڵ داستانەکانی دایکم لەبارەی سەردەمی منداڵیمەوە تێکەڵ دەبن و ئەمن ناتوانم بەچاکی لێکیان جوێ بکەمەوەو بیرەوەرییەکانی خۆمیان لێ دەرکێشم."[40] ئەو بیرەوەری تێکەڵبوونەی هووەیداو دایکی دەتوانین بە نوێنگەی پێوەندیی هاوسۆزی، یان بەستراوەیی قووڵی هووەیدا بە دایکی بزانین. هەر لەوکاتەدا دیمەنی ئەو بەستراوەییە دەتوانین لە وێنەیەکدا ببینین کە لە تەمەنی دوازدە ساڵیی هووەیدادا گیراوە. لە وێنەکەدا هووەیداو فەرەیدوونی برای لە تەنیشت دایکیان دەبینین. لە حاڵێکدا فەرەیدوون تەواو جیاو سەربەخۆ لە دایکی ڕاوەستاوە، ئەمیر عەبباس دەڵێی پاڵی بەدایکیەوە داوەو؛ تەنانەت دەتوانین بڵێین خۆی پێ هەڵواسیوە.

قووڵایی ئەو پێوەندییە، عاتیفییە لەلایەک ئاکامی ڕەفتاری ساردو بێ موبالاتی عەینولمولک و، لەلایەکی دیکە بەرهەمی نەخوازراوی دیاردەی کۆچبەری بوو. ئەو ڕاستییەش کە دایکی گەنج و بەڕاپەڕو کوڕەکەی تەنیا نۆزدە ساڵ جیاوازیی تەمەنیان هەبوو، ئەو پێوەندییەی پتەو ترو تۆکمەتر دەکرد. جگە لەوە لەو بەشەی یادی ڕۆژانی لاوەتیدا کە باسی ژیانی هووەیدا لە بەیرووت و دیمەشقە، ئەو زمانێکی زۆر سەرسوڕهێن بەکار دەبا؛ جارێک ڕاوێژێکی خەماویی هەیەو وەختێکیش وەک ڕاپۆرتی پزیشکی، وردو ساردو دوور لە پێوەندیی عاتیفییە. دەردی دڵی

لە "نەبوونی پێوەندیی عاتیفی هەبوو، باسی سروشتی زووتێپەڕو ناسەقامگیری عێلاتییانەی ژیانی دیپلۆماتیکی دەکرد، یادی دەردو ژانی دەورانی سەردەمی منداڵیی دەکردەوە کە وادیار بوو هەمیشە ماڵ بەکۆڵە. دەیگوت: "کەسێک هەمیشە بارگەوبنەی لەم وڵاتەوە بردبێتە ئەو وڵات و، قوژبنە خاکێکی بۆ وێستان و حەسانەوە شک نەبردبێ و، شتێک یان چەند شتی نەبووبن کە ببنە بەشێک لە بیرەوەرییەکانی، ئەو کەسە بەڕاستی خۆی بە هەتیو دەزانێ." پێی لەوە دەنا کە "لە تەواوی ژیانی دەرەوەمدا هەمیشە ئەو خەفەتەم لەدڵدا بووە کە تەنانەت مێزێک، کورسییەک، یان شتێکی دیکەم بەدەستەوە نەبووە کە هی خۆم بێ."[25]
دەیگوت لە دیمەشق هەرجارێک ئەو یان فەرەیدوونی برای دەیانەویست: "لەسەر کورسییەک خۆمان بەملاو لادا دەین، یان لەسەر مێزێک کە پێمان خۆش بوو دانیشین، دەنگی دایک و بابم ئێستاش لە گوێمدا دەزرینگێتەوە کە دەیانگوت لەسەرەخۆ، لەسەرەخۆ. ئەم مێزە، یان ئەو کورسییە هی ئێمە نیە، هی دەوڵەتە."[26]

لە ڕاستیدا تاڵایی ئەزموونی کۆچبەری لە سەردەمی منداڵیداو، حاڵەتی ماڵ بەکۆڵی شوێنەواریکی بەردەوام و گرنگی لەسەر هووەیدا داناوە. بەڵێنی بەخۆی دا کە ئیدی هەرگیز نیشتمانەکەی بەجێ نەهێڵێ. دەیگوت: "ئەوانەی بۆ ماوەیەکی دووروودرێژ لە دەرەوە نەژیاون، ڕەنگە باش تێنەگەن کە ئەمن بەڕاستی حەز ناکەم بۆ ماوەیەکی کورتیش، وڵاتەکەم بەجێ بێڵم."[27] وەختێکی دیکە کەم وزۆر هەر ئەم قسانەی بە براکەی گوتبوون. پێی داگرتبوو کە "ئیدی ئامادە نیم دووبارە لە ئاوارەییدا بژیم."[28] گرنگیی و بایەخی ئەم قسانە لە سەروبەندی شۆڕشی ئیسلامیی ئێراندا دووچەندان بۆوە. لەو کاتەدا هووەیدا چەندین جار دەرفەتی پەیدا کرد کە لە ئێران ڕابکاو هەرگیز کەڵکی لەو دەرفەتانە وەرنەگرت.

ساڵەکانی سەرەتای قوتابخانە لە مەدرەسەی فەڕانسەییەکان لە دیمەشق بۆ هووەیدا زۆر ناخۆش گوزەران. دەیگوت، لەو سەردەمەدا

"ئەمن دۆستم زۆر نەبوون و، لە ڕاستیدا تەنیا بووم."[29] توندلێگرتنی بابی و ئەو ڕاستییە کە زۆرتر لە سەفەر بوو و ئاگای لە ژیانی کوڕەکەی نەبوو، تەنیایی و دژوارییی ئەو ساڵانەی زیاتر دەکرد. بابی بە مرۆڤێکی "ڕەق" ناو دەبا. دەڵێ: "دەگەڵ ئەوەی زۆری ئێمە خۆش دەویست، هەمیشە ئەو خۆشەویستییەی لە دڵی خۆیدا ڕادەگرت و چەند مانگی دەویست تا جارێک خۆشەویستیی وی ئەگەر بە ڕواڵەتیش بووە ببینین."[30] لەجێیەکی دیکەدا ، لێی زیاد دەکاو دەڵێ: "بابم حەزی لە دڵڕەقی دەکردو نەیدەویست خۆشەویستیی خۆی نیشان بدا."[31]

لەو ساڵانەدا، عەرەبستانی سعوودی کە لۆرێنس دەستی لە دروستکردنیدا هەبوو، لە ئاگری شەڕی عەشیرەتی و ئیدئۆلۆژیدا دەسووتا. لەوێ جۆرێکی تازە لە سیاسەتی تێکەڵ بە توندوتیژی سەری هەڵدابوو. هێندێ کەس ڕیشەی ئەو توندوتیژییە دەبەنەوە سەر "ڕەفتاری بیابانی". وەهابییەکان برەوپێدەری سەرەکیی ئەو گیانە توندوتیژە بوون؛ ڕیوایەتێکی تازەو زۆر بنئاژۆیانەیان لە ئیسلام بڵاو دەکردەوە.[32] دەوڵەتی ئێران زۆری هەوڵ دەدا خۆی لە تێهەڵچوونی ڕاستەوخۆ دەگەڵ حاکمە تازەکانی عەرەبستان بپارێزێ. هەربۆیە چەندجار عەینولمولکی بۆ ئەنجامی کاروباری دیپلۆماتی ناردە ئەو وڵاتە.

بەم جۆرە عەینولمولک زۆرتر لەسەفەردا بوو. ئەگەر لە ماڵێش بوو، تەواوی وەختەکەی بەکاروباری ئیدارییەوە دەگوزەراو دەرفەتێکی بۆ ڕاگەیشتن بە کاروباری بنەماڵە بەدەستەوە نەبوو. هەربۆیە، مشووری خوێندن و پێگەیاندنی منداڵەکان یەکسەر لە ئەستۆی ئەفسەرولملووک بوو. هووەیدا بە دەردی دڵەوە لەبارەی بابیدا دەیگوت: ئەو "لە وەزعی خوێندنی ئێمەی نەدەپرسی... ماوەیەکی زۆر هاودەمی بابم نەبووم... لەو ساڵانەی تەمەندا کە منداڵان هەست دەکەن دەبێ پتر دەگەڵ باوکیان بن و لێی نیزیکترن، ئێمە باوکمانمان تەنیا هاوینان دەدیت و بڕایەوە."[33]

عەینولمولک پیاوێکی زۆر بەسام بوو. هەروەخت ئەو لەماڵ بایە، فەزا جیددیترو شادیو دڵخۆشی کەمتر دەبوو. تەنانەت ڕەفتاری خزمەتکارەکانیش دەگۆڕا. ئەوان دەگەڵ دایکی هووەیدا بێ شەرمو شکۆو تەنانەت سەرکێش بوون، بەڵام هەرکە سەروسیمای عەینولمولک دەردەکەوت، گوێلەمستو خزمەتکار دەبوون . ئەو سەرکێشیو بێ-نەزمیی قبووڵ نەدەکرد.

باس لە بیروباوەڕی مەزهەبیی کۆنو نوێی بابیش لەبنەماڵەدا قەدەغە بوو. وا دیار بوو پاش مردنیشی ئەو قەدەغەو قۆرغە هەر درێژەی هەبوو، چوونکە ڕەنگدانەوەی لەوبەشانەی بیرەوەریی هووەیداشدا کە بڵاو بوونەوە بەرچاو ناکەوێ. لەوێدا بە هیچ جۆر باسێک لە چەندو چۆنی دین وئیمانی بابی نیە. بە وتەی فەرەیدوون، لە وتوێژەکانی بنەماڵەدا، هەرگیز باسێک لە بەهاییزم نەدەکرا. دەڵێ: "چاردە ساڵە بووم کە بۆ یەکەمجار وشەی "بەهایی"م بیست. ماناکەیم لە دۆستێک پرسی."[٢٤]

هەر لەو کاتەدا ڕێوڕەسمی مەزهەبی جێیەکی لە ژیانی ڕۆژانەی هووەیداکاندا نەبوو. لە ڕاستیدا ، یەکێک لە سروشتە بەرچاوەکانی بیرەوەریی هووەیداو، هەروەها بیرەوەریی براکەشی، ئەوەیە کە لە هیچکامیاندا شتێک بەناوی خۆنواندن بە دینداریەوە نابینرێ.[٢٥]



ئەو دیمەشقەی بنەماڵەی هووەیدای چوونێ شارێک بوو دارماڵ لە ئاڵۆزییەکانی دوای شەڕو پیلانە ئیستیعمارییەکان. لە نیزیکەی چوارسەد ساڵ لەوە پێشەوە دیمەشقیش و هەموو ناوچەکانی سووریە، لوبنان، ئیسرائیلو فەلەستینی ئەمڕۆش هەموو لەژێر نیری پادشاکانی عوسمانیدا بوون. بەڵام بە شکانی تورکیە لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا، ئیمپەراتۆریی عوسمانییش هەڵوەشاو ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست بوو بە مەیدانی ململانەی سیاسیی هێزە گەورەکان. دیمەشقیش لەو قاعیدەیە

بەدەر نەبوو. کۆمەڵەی نەتەوەکان، کە بەڕێکەوت ڕاست لەساڵی لەدایکبوونی هووەیدادا دامەزرابوو، سووریەو لوبنانی خستنە ژێر سەرپەرستیی فەڕانسەوە. ئاکامەکە ئەوە بوو کە کاتێک بنەماڵەی هووەیدا گەیشتنە دیمەشق، لەلایەک هێزە نیشتمانییەکانی سووریە بەدژی فەڕانسە دەشەڕدا بوون و لەلایەکی دیکە، هێندێ شەڕ لە نێوان کەمایەتییە مەزهەبی و نەتەوەییەکانی سووریە، بە تایبەتی درووزییەکان و عەلەوییەکاندا لە ئارادا بوون. عەینولمولک بۆخۆی زۆرتر لە سەفەرێ، دوور لە دیمەشقی شەڕلێدراو بوو. هووەیداو دایکی، ئەفسەرولملووک و هەروەها نەنکی، بەپێی توانا خۆیان لە شەقامە پڕ مەترسییەکانی شار دەپاراست. تەنیا پەناگەی وان چوار دیواری ماڵەکەیان بوو.

ئەمیر عەبباس چوارساڵە بوو کە فەرەیدوونی برای لەدایک بوو. ئەگەر تەماشای ڕەفتاری سیاسی و ئیدئۆلۆژیی ئەو دوو برایە بکەین دەبینین کە هەردووکیان نموونەی بەرچاوی لێکۆڵینەوەیەکی بەردرێژن کە ئەو ساڵانەی دوایی لەبارەی کاریگەریی پێش و پاشکەوتنی لەدایکبوونی منداڵانی بنەماڵەیەک لەسەر کرداری سیاسی و کۆمەڵایەتیی هەرکامێکیان ئەنجام دراوە. گرنگترین لێکۆڵینەوە لەوبارەیەوە لەلایەن فرانک سالۆوەی* ئەنجام دراوە. بەباوەڕی وی یەکەم منداڵبوون یان پاشەبەرەبوون، پتر لەهەر شتێکی دیکە - لە هەڵوێستی چینایەتییەوە بگرە تا ڕادەی خوێندەواری - ڕەفتاری سیاسیی مرۆڤەکان دیاری دەکا.[٢٦] بە شێوەیەکی کۆنکرێت، بەپێی لێکدانەوەکانی وی، یەکەم منداڵەکان، وەک ئەمیر عەبباس "پتر دەگەڵ دایک و بابی خۆیان، و هەروەها دەگەڵ دەسەڵاتی فەرمانڕەوا هەست بە وەک یەکی دەکەن...بەرزەفڕو ڕێک و پێکن و دەسکەوتەکانی ژیانیان بەلاوە گرنگە." بە بەراورد دەگەڵ برا چووکە، ئەوان زیاتر حەز "لە هاودەنگی دەکەن، نەریتخوازن و بەئاسانی دەکەونە حاڵەتی بەرگرییەوە." فەرەیدوونیش، بەپێی پێشبینییەکانی

* Frank Sulloway

سالۆوەی، بوو بە پیرمەندێکی ئازاو بنیاتنەرو لە برایەکەی زیاتر ئامادەی ڕووبەڕووبوونەوە دەگەڵ دەسەلات بوو.

ئەمیر عەبباس پێنج ساڵە بوو کە عەینولمولکی بابی بانگ کرایەوە تاران. لەماوەی ئەو ساڵانەدا کە بنەماڵەی هووەیدا لە ئێران دوور بوون، وڵات گۆڕانێکی زۆری بەسەردا هاتبوو. ڕەزاخان ببوو بە شا. دەوڵەتە بەدەسەڵاتەکەی نەک هەر پێتەخت، بگرە سەرانسەری وڵاتی هێنابووە ژێر دەسەڵاتی خۆی. ڕەزاشا سەودای نوێکردنەوەی کۆمەڵی لەسەردا بوو. باکیشی لەوە نەبوو ئەو ئالوگۆڕە لە سەرەوەڕاو بەزۆر داسەپێنێ.[٢٧] دەتگوت هەوڵەکانی لەسەر تێکەڵێک لەبەرنامەکانی بیسمارک لە ئەڵمان، میجی لە ژاپۆن و ئەتاتورک لە تورکیە دامەزراون.

بنەماڵەی هووەیدا بۆئەوەی بگەڕێنەوە ئێران ڕێگای دووورودرێژی سێ ساڵ پێشیان نەگرتە بەر. لەجیاتی ئەوە دوو ترومبێلی فۆردیان، کە هەردووکیان تازە هاتبوونە دیمەشق و خەڵک زۆر ئۆگریان بوون، بەکرێ گرت و ڕاستەڕێ گەڕانەوە ئێران.

هووەیدا لە باسی تارانی سەردەمی منداڵیی خۆیدا سەرنجێکی تایبەتی دەداتە دوو ڕووداو. یەکیان سەفەر بۆ سەر گڵکۆی حەزرەتی عەبدولعەزیمە. دەیگوت دەگەڵ دایکی چوو بۆ زیارەت و سواری ماشێنی دووکەڵدار بوو.[٢٨] ڕوون نیە باسی ئەو ڕووداوە چەندە بەڕێکەوتەو چەندەی لێکدانەوەی سیاسییش تێدا هەبووە. بەجۆرێکی دیکە بڵێین داخوا وەبیرهێنانەوەی سەرلەنوێی بیروباوەڕی مەزهەبیی دایکی بەرپەرچدانەوەی کەسانێک بوو کە ئەودەم هووەیدایان بە بەهایی بوون تۆمەتبار دەکرد؟ ڕووداوی دیکە جۆرێک داستانی ونبوونی خۆیەتی. دەیگوت زیاتر لە سێ سەعات لە شەقامەکانی شاردا سەرگەردان بووە. باسی خەیاڵاتی خۆی دەکردو ئەوە کە ڕێگاو ناوونیشانی ماڵی نەنکی لێ گۆڕابوو. کاتێک سەرەنجام بە کۆمەگی پاسەوانێک چۆوە ماڵێ، ئەو منداڵە چووکەڵە کە هووەیدا بوو، لەدڵی خۆیدا پەیمانی دا: "لەوە بەدوا بڕیارم دا قسەی گەورەکان لەگوێ بگرم و ئیدی سەربەخۆ لە ماڵێ دەرنەکەوم."[٢٩]

عـەینولمولک هەشـت مانـگ لـە تـاران مایـەوەو دووبـارە کرایـەوە سـەرکونسـوولی دیمەشـق. ئـەمجارە مەڵبەنـدی کارەکـەی، هـەموو سـەرزەمینی فەلەسـتین و دەفتـەری کونسـوولیی ئێران لـە بەیرووتیشـی دەگرتەوە. تا ئەودەم کونسوولی ئێران لە بـەیرووت بازرگانێکی یۆنـانی بوو. دەیانگوت کابرایـەکی ئارەقخۆرو ئـەهلی ڕابواردن بـووە، ڕەفتـاری وی زۆری بەکەسـایەتییەکی یـەکێک لـە ڕۆمانـەکانی گراهـام گـرین دەچوواند. بۆ سـەفەری دیمەشق ئـەمجارە بنەماڵـەی هووەیدا لە جیاتی عارەبانە، لۆرییەکیان بە کرێ گرت. کەلوپـەلی نێومـاڵ نیـوەی ڕووبـەری لۆرییەکـەی گـرت و نیوەکـەی دیکەشـیان بـە کۆمـەگی قاڵیچەیـەک و دۆشـەگێک و پەردەکوللەیـەک کـردە شـوێنی حەوانـەوەی ئەفسـەرولملووک و دوو کوڕەکـەی و پەرسـتارێک. عـەینولمولکیش لـە پێشی لۆرییەکە، لە تەنیشت شۆفێرەوە سوار بوو.[٤٠]

پاش چوار مانگ لەدیمەشق دەرکەوت کە کاری دەفتەری بـەیرووت زۆر قورسـەو لـە دوورەوە بـەڕێوە نـاچێ. بـەناچار سـاڵی١٣٠٧(١٩٢٨) وەختێک ئـەمیر عـەبباس هەشـت نۆسـاڵە بـوو، بنەماڵەکەیان سـەرلەنوێ باریان کردو ئـەمجارە لە خانوویەکی دوونهۆمدا، لـە گـەڕەکی موسـوڵمان نشـینی بـەیرووت نیشـتەجێ بـوون. نهـۆمی یەکـەم هـی دەفتـەری کونسـوولخانە بـوو و نهۆمی دووەمیش بـوو بـە شـوێنی ژیـانی بنەماڵـە. ئەمیرعەبباسـیش لـە مەدرەسـەی فەڕانسـەیی لـە بـەیرووت ناونووسـی کـرد؛ بـەڕێوەبردنی مەدرەسـەکە لـە ئەسـتۆی ڕێکخراوێـک بـوو کـە بەشـێوەیەکی نارەسـمی سـەر بـە دەوڵـەتی فەڕانسـە بـوو و بـەخۆی دەگوت"میسیۆنی لائیک"، هەر ئەو میسیۆنە لە تارانیش مەدرەسـەیەکی وەڕێ خستبوو کە دواتر فـەرەحی دیبا [شاژنی دواتری ئێران] لـەوێ دەستی بە خوێندن کرد.

ئەمیر عـەبباس یـازدە سـاڵی گرنـگ و چارەنووسسـازی ژیـانی خـۆی لـەم مەدرەسـەیە لە بەیرووت تێپەڕ کرد. هـەروەک لـە نـاوی میسـیۆن دەردەکـەوێ، بەرنامـە دەرسـییەکانی مەدرەسـەی فەڕانسـەییەکان سـەرانسـەر عورفی بوون. لەوەش زیاتر قوتابییـەکانی نـوقمی فەرهـەنگ و

زمانی فەڕانسەیی دەکرد. بەڵام عەینولمولک لەسەر ئەوە مکوڕ بوو کە منداڵەکانی عەرەبییش بزانن و هەر بۆیە مامۆستایەکی تایبەتیی بۆگرتن. جگە لەوە، فارسی، زمانی قسەکردنی ماڵی هووەیدا بوو. ئەفسەرولملووک ئۆگرییەکی تایبەتیی بە وردبوونەوەی منداڵەکانی لە زمان و فەرهەنگی فارسی هەبوو. بۆ هەر تاکە بەیتێکی شیعرِی فارسی کە کوڕەکانی لەبەریان کردبا، خەڵاتێکی دەدانێ. گۆڤارە فارسییەکان و مووسیقاو خواردنی ئێرانییش بەشێکی هەمیشەیی لە ژیلنی بنەماڵەیی هووەیدا بوون."[٤١]

هووەیدا بۆخۆی قبووڵی بوو کە لە قوتابخانە هەمیشە قوتابییەکی مامناوەندی بووە. لە هیچ پۆلێک ڕەت نەبۆوە؛ هەرلەوکاتەدا لە هیچکامێکیشیاندا هەڵکەوتوو نەبوو. ئۆگریی بە دوو دەرسی ئینشاو مێژووەوە هەبوو. مامۆستاکانی زۆرجار لە کارنامەی ساڵانەیدا وەک گلەیی دەیاننووسی کە ئەو تەنیا لەو دەرسانەدا خۆی ماندوو دەکا کە بۆخۆی پێی خۆشن.

لە قوتابخانە جاروبار تەمبێکردنیش لەکاردا بوو. هووەیدا پێی وابوو، زۆرتر مامۆستا عەرەبەکان، نەک فەڕانسەییەکان ئەو جۆرە تەمبێیەیان بەکار دێنا. دەتوانین هێندێ نیشانەی فەڕانسەخوایی لە گێڕانەوەی ئەم ڕووداوەدا ببینین. دەیگوت: "مەدرەسەی فەڕانسەییەکانی بەیرووت بەپێی سیستمی دروستی فەڕانسە بەڕێوە دەچوو و مامۆستا فەڕانسەییەکان دۆستانە دەگەڵ قوتابییەکان دەجووڵانەوە، بەڵام بەداخەوە مامۆستا عەرەبەکان جۆرە توندوتیژییەکی تایبەتییان لەخۆیان نیشان دەدا."[٤٢] ئەو باسی ڕۆژێک دەنووسێ کە بانگ کراوەتە دەفتەری یەکێک لە چاوەدێرە عەرەبەکانی مەدرەسە. دەیگوت چاوەدێر بە خەتکێش لە بەری دەستی ڕاکێشاوەو هەرلەوکاتەدا حوکمی کردوە کە هووەیدا لاقێکی هەڵێنێ و ڕوو بەدیوار بە پێوە ڕاوەستێ[*]

[*] لە گێڕانەوەی ئەم ڕووداوە لەزمان هووەیدادا،نیشانەیەکی زۆر لەتاڵی نابینین. لەڕاستیدا خاڵی سەرنجڕاکێشی داستانەکە دەبێ لە ئاماژەی وی بە"سیستمی

ساڵی ١٣١٠(١٩٣١) عەبدولمولک دوای سێ ساڵ خزمەت لە بەیرووت کرا بە وەزیرموختاری ئێران لە عەرەبستانی سعوودی و هەتا ساڵی ١٣١٤(١٩٣٥) لەو پۆستەدا مایەوە. بەڵام لەنەکاو لەوساڵەدا ناچاریان کرد خانەنشین بێ. هێشتا نەگەیبووە تەمەنی خانەنشینی و بۆیە نابێ گومان هەبێ کە ئەو داوایە زۆرییەکی تێدا هەبووە. بە وتەی ئەمیرعەبباس، داوای بابی ئاکامی چاکسازییەک بوو کە ئەودەم لە وەزارەتی دەرەوە لە ئارادا بوو. دەیگوت ئامانجی سەرەکیی ئەو چاکسازییە هەڵکێشانی لاوانی کادری دیپلۆماتی بوو.[٤٣] بەڵام فەرەیدوونی هوەیدا بۆچوونێکی دیکەی هەیە. ئەو دەڵێ لابردنی بابی ئاکامی ڕاستەوخۆی وەفاداریی وی بە سەردار ئەسعەد بوو. دەڵێ وەختێک سەردار ئەسعەد کەوتە بەر تووڕەیی ڕەزاشاو خرایە زیندان، عەبدولمولک هەرچەند دۆستەکانی پێشیان گوت، بەحورمەتی دۆستایەتیی خۆی دەگەڵ سەردار لە بەندیخانە سەری داو هەر ئەو ئازایەتییەش بۆ لادانی بەس بوو.[٤٤]

ڕەخنەگرانی هوەیدا خانەنشینبوونی بابی بەجۆرێکی دیکە لێک دەدەنەوە. دەڵێن عەرەبستانی سعوودی نارەزایەتیی لە چالاکیی پڕوپاگەندەی عەبدولمولک بۆ ئایینی بەهایی دەربڕیوەو لادانەکەی ئاکامی ئەو نارەزایەتییە بووە. خانەنشینبوونەکە بەهەر هۆیەک بووبێ شوێنەوارێکی رووحیی توندی لەسەر عەبدولمولک هەبوو. بێجگە لەوە، چەند ساڵێک بوو لەباری لەش ساغییشەوە هێندێ گیروگرفتی بۆ پەیدا ببوو. سەرباری ئەو نەخۆشییە، ئەو کاتەی لە عەرەبستان بوو ڕۆژێک لە وشتر بەربۆوەو چارەسەرەکەی پێویستیی بە چەند جار نەشتەرگەری هەبوو. ئەم هۆیانە هەموو دەستیان وەدەستی یەک داو عەبدولمولکیان، لەدوا ڕۆژەکانی ژیانیدا زۆر دڵشکاو کرد. ئەو ڕۆژی

---

دروستی فەرانسە" دا ببینین. بەپێچەوانەی ئیددیعای وی لە دەیەی سیی چەرخی بیستەمدا،واتە ڕاست ئەو کاتە کە ئەویان بانگکردۆتە دەفتەری چاوەدێری عەرەب، تەمبێکردن لە قوتابخانەکانی فەرانسەدا زۆر باو بوو.

بیست و پێنجی ڕەشەمەی ١٣١٤(١٩٣٦) کۆچی دوایی کرد. لەوکاتەدا ئەمیرعەبباس شازدەحەڤدە ساڵە بوو.

مەرگی باوک لەنەکاو باری دارایی بنەماڵەی گۆڕی. ناچار بوون لەو خانووە سێ ژوورییە کە لە گەڕەکی موسوڵماننشینی بەیرووت بە کرێیان گرتبوو بگوازنەوە ئاپارتمانێکی دوو ژووریی چووکەڵە هەر لەو گەڕەکە.[٤٥] جگە لەوە ناچار بوون ئەو سێ خزمەتکارەش کە لە ماڵێ کاریان بۆ دەکردن ئیزن بدەن. سەرچاوەی سەرەکیی داهاتی بنەماڵە هەر مووچەی خانەنشینیی عەینولمولک بوو. زۆر لە دۆستانی بابیان لە سەرەمەرگی ویدا هێندێ بەڵێنیی یارمەتیی ماڵی و بوورسی خوێندنیان پێ دان. بەڵام بەکردەوە هیچ کامێکیان هەنگاوێکیان بۆ کۆمەگ بە بنەماڵەی هووەیدا هەڵنەهێنایەوە.[٤٦] ئەفسەرولملووک بە لێزانیی تەواوەوە هەموو کاروباری بەڕێوەبردنی بنەماڵەی لە هەلومەرجی قەیرانیی تازەدا وەئەستۆ گرت. جاروبار شتێکی لە حیسابی پاشەکەوتی خۆی ڕادەکێشا، بەڵام هەمیشە ئامانجی ئەوە بوو کە دوو کوڕەکەی لە شوێنەوازی باری دارایی تازەیان بپارێزێ. سەرباری هەوڵ و تەقەلای دایک، ئەوئاڵوگۆڕەی بەسەر باری دارایی بنەماڵەدا هات، شوێنەوارێکی قووڵی لەسەر ورەی ئەمیر عەبباس دانا. بەوئاکامە گەیشت کە، لەژیاندا" پیاو دەبێ هەمیشە ئامادەی ڕووبەڕووبوونەوە دەگەڵ هەر پێشهاتێک و قبووڵ کردنی تەنگانەو ناخۆشییەکان بێ و ژیان بە سادەیی بگرێ و هیچ کاتێک نەبێتە کۆیلە یان شێت و شەیدای ژیان."[٤٧]

مەرگی بابی وەزعی مەدرەسەی ئەمیر عەبباسی نەگۆڕی. بەرەبەرە بووە یەکێک لە قوتابییە خۆشەویستەکانی مەدرەسە. دۆستەکانی دەیانگوت زۆر ئۆگریی ڕووناکبیرانەی هەن و زۆر بەئەدەب و ئەخلاقە. هێندێ جاریش چالاکیی سینفیی خوێندکاریی دەکرد، چەند ساڵێک کۆمۆنیستێکی بەڕابردووی فەرانسەیی بە ناوی گران ژۆن* بووە بەڕێوەبەری مەدرەسەکە. بوونی ئەو بەڕێوەبەرە

* Grand Jouan

ئۆگری بە مەسەلە کۆمەڵایەتییەکان و داخوازەکانی بزووتنەوەی چەپی لە قوتابییەکاندا بەهێزتر کرد. هەر ئەویش بووە هۆی ئەوە کە شەڕی نێوخۆی ئیسپانیا، کە لەوڕۆژانەدا نوقڵی مەجلیسی کۆڕوکۆمەڵە چەپییەکانی جیهان بوو، ببێتە یەکێک لە مەسەلە گەرمەکانی قوتابخانە. جگە لەوە، یەکێک لە هاوپۆلەکانی هووەیداش لە برەوپێدانی ئەو باسانەدا زۆر کاریگەر بوو. ئەو ئەندامی ڕێکخراوی لاوانی حیزبی کۆمۆنیستی فەرانسە و سەر بەبنەماڵەیەکی ماقووڵ و بەناوبانگ بەناوی داندوورێن[*] بوو. هێندێک لە ئەندامانی ئەو بنەماڵەیە دواتر بە تاوانی سیاسی ناوبانگێکی خراپیان دەرکرد.[48]

ئەمیر عەبباس و فەرەیدوون تەنیا ئێرانییانی ئەو مەدرەسەیە نەبوون. ئەوسەردەمە بەیرووت یەکێک لە ناوەندە سەرەکییەکانی چالاکیی چەپییە ئاوارە ئێرانییەکان بوو. هووەیدا دەگەڵ هێندێ لەو ئاوارانە بوو بە دۆست. ئەگەرچی لەو سەردەمەدا هووەیدا بەرهەمەکانی مارکسی دەخوێندنەوە و، هەرچەند بەشێک لەو هاوڕێیەتییانە بوونە هۆی ئەوەی تا مابوو لەلای هێندێ کەس بە "ڕووناکبیری کافەنشینی چەپ"[49] ناوبانگ دەربکا، بەڵام هووەیدا مارکسیزم، یان تەنانەت سۆسیال دێموکڕاسییشی وەک جیهانبینی یان کۆمەڵێک بیروڕای دۆگم قبووڵ نەکرد. هاندەری سەرەکیی بۆ خوێندنەوەی نووسینەکانی مارکس، نەک ئۆگری بە دۆگم بیرکردنەوە، بەڵکوو تینوویتیی هەمیشەیی بۆ زانینی بیروبۆچوونی جۆراوجۆر و تامەزرۆیی بێ سنووری بۆ کتێب بوو.

ساڵەکانی دواتر، بێجگە لەو ناوبانگەی وەک "ڕووناکبیری کافەنشینی چەپ" تەنیا شت کە لەو خوێندنەوە مارکسیستییە لە مێشک و زمانیدا مابوو، زرینگانەوەیەکی زۆر سووکی بیروبۆچوونی سۆسیالیستی بوو.

هەر ئەو تامەزرۆییە بێ سنوورە ئەوی ناردە سینەماکانی

---

[*] D,Andurains

بەیرووت* لەوکاتەوە ئۆگرییەکی تایبەتیی بە سینەما پەیدا کردو ئەو ئۆگرییە تا کۆتایی تەمەنی بەردەوام بوو. جگە لەوە، زۆر لەو کتێبانەی مامۆستاکان پەسندیان دەکردن، بەتایبەتی بەرهەمی نووسەرە فەڕانسەییەکانی زۆر بە ئیشتیاوە دەخوێندنەوە. خوانە زەمینییەکانی ئاندرەژید، کە وەرگێڕاوە فارسییەکەی دواتر بە قەڵەمی دوکتۆر حوسێنی هونەرمەندی و جەلالی ئالی ئەحمەد لە ئێران بڵاو بۆوە، لە کتێبە خۆشەویستەکانی ئەو سەردەمەی بوو . لەو کتێبەدا بوو کە ژید بە زمانێکی زۆر یاخییانە ڕێزی لە بوونی مرۆڤ دەگرت ، چێژخوازی (لذت طلبی)ی پەسند دەکردو بێ پەروا ڕای دەگەیاند کە "ئیدی باوەڕم بە گوناح نیە." لەسەردەمی لاوەتیدا ئەم کتێبە هاودەمی هەمیشەیی هوەیدا بوو.[50] کاتێک دواتر لە بەیرووتەوە بە مەبەستی چوون بۆ ئورووپا، سواری کەشتی بوو، تەنیا کتێب کە دەگەڵ خۆی برد کتێبی "خوانە زەمینییەکان" بوو.[51]

نیچە، ئەرنێست ڕەنان و دی. ئێچ. لارێنس هێندێ نووسەری دیکە بوون کە مامۆستا فەڕانسەییەکان ئامۆژگاریی قوتابییانیان دەکرد بەرهەمەکانیان بخوێننەوە. زۆربەی شەوان، هوەیداو دۆستەکانی لە ئاپارتمانی بنەماڵەی وی کۆ دەبوونەوەو بە لێبڕاوی و تین و تاوی تایبەت بە باسەکانی سەردەمی لاوەتی، ئەو کتێبانەی خوێندبوویاننەوە، دەیان خستنە بەر باس و لەژیانی خۆیاندا بۆ ماناو ئاکامەکانیان دەگەڕان. جاری واش بوو باسی مەسەلە سیاسییەکانی ڕۆژیان دەکرد. دەیانەویست ئێران لە هەژاری و نەزانی بێننە دەر. نوێخواز بوون و شارەزووی ڕۆژێکیان دەکرد کە ئێرانیش ببێتە کۆمەڵێکی نوێ و پێشکەوتنخواز. باسی ئەگەری دامەزرانی دەوڵەتێکی یەهوودی لەسەر خاکی

---

* فەرەیدوونی هوەیدا دیسامبری ۱۹۹۷ لە وتوێژێکدا باسی کرد کە لە بەیرووت فیلم یەکێک لە کارە جێ ئۆگرییەکانی ئەوو براکەی بووە. فەرەیدوون دواتر بوو بە یەکێک لە جێ متمانەترین ڕەخنەگرانی سینەماو یەکێک بوو لە دامەزرێنەران و هاوکارانی گۆڤاری بەناوبانگی کایە دو سینەما Cahiers dU Cinema.

فەلەستینیش لەو سەردەمەدا زۆر باو بوو. هووەیدا یەکێک لەو کەمایەتییە چووکەڵە بوو کە لایەنگری پێکهاتنی دەوڵەتێکی لەوچەشنە بوون. دەیگوت ئەمە تەنیا بەرپەرچدانەوەیە بۆ دژایەتیی مێژوویی دەگەڵ سامییەکان.[52]

ئاندرە مالرۆ یەکی دیکە لە باسە گەرمەکانی قوتابییانی مەدرەسەی فەڕانسەییەکانی بەیرووت بوو. لەو سەردەمەدا، مالرۆ بە یەکێک لە بەناوبانگترین ڕووناکبیرانی فەڕانسە دەژمێردرا. چەندوچۆنی ژیانی لە هیندوچین زۆری باس لەسەر بوو. لەو کێشەو باسانەدا کە ڕۆژانە لە مەدرەسەو ئێواران لە ماڵی هووەیدا لە ئارادا بوون، ئەو ئۆگرییەکی تایبەتیی بە بارۆن کلاپیک،[53] یەکێک لە کەسایەتییە سەرەکییەکانی کتێبی چارەنووسی مرۆڤ نیشان دەدا*.

---

* نووسینی ژیاننامە وەک هەوڵدان بۆ پەیداکردنی پرۆژەو بابەتێک دەچن کە زۆرجار،بێ ئاگاداریی ئەو کەسەی ژیاننامەکەی لەسەر دەنووسرێ،لە پشتەوەی بوونی وی خۆی دەنوێنێ. پێشمەرجی ئەو گێڕانەوەیە قبووڵکردنی ئەو گریمانەیەیە کە هەر ڕووداوێکی ژیان، هەرچەندیش کەم بایەخ دیار بێ،بایەخ و مانای خۆی هەیە. کاتێک لە وتووێژە سەرسەرەکییەکانی مەدرەسەدا،هووەیدا ئۆگریی خۆی بە ئاندرە ژید یان بارۆن کلاپیک دەردەبڕی،بۆخۆی نەی دەزانی کە پەنجا ساڵ دواتر، هەرئەو ئۆگری دەربڕینە سادەیە،لە دەستی ژیاننامەنووسەکەیدا، دەبێتە سیمبولی سروشت و چارەنووسی وی. لەڕاستیدا یەکێک لە مەترسییەکانی ژیاننامەنووسین،وەک شێوەیەکی ئەدەبی، ڕاست لەمەدا شاردراوەتەوە. هەر لێرەدایە کە دەکرێ تووشی ئەو فکرە بین کە هیچ ڕووداوێک و هیچ وتەیەک بە شتێکی ڕێکەوت نەزانین و هەموو شتێک بە مانادار بزانین . لەڕاستیدا ژیاننامەنووسین بەشێک لەو مەقوولەیەیە کە نیچە پێی دەڵێ "نەخۆشیی تیئۆری"،واتە هەوڵی بێ ئاکامی مرۆڤەکان بۆ کەمکردنەوەی ڕەوتی بەربڵاوو زۆر ئاڵۆزی بوونی مرۆڤ تا ڕادەی هێندێ نموونەو دروستکراوی ئاشنای مێشکی خۆمان. هەرچەند ئەم هەوڵانە وەک کارەکانی دۆنکیشۆت دەچن، بەڵام بۆ تێگەیشتنی ـ هەرنەبێ ـ بەشێک لە ئاڵۆزییەکانی ئەو بووارە بێگانەیە کە "مرۆڤی دیکە"یە، لەولێکدانەوەو لێکەمکردنەوەیە زیاتر چارەیەکمان نیە .

"چارەنووسی مرۆڤ"ی مالرۆ یەکەم قۆناخەکانی شۆرشی چین لە ڕوانگەی ئیگزیستانسیالیستییەوە هەڵ دەسەنگێنی. بارۆن کلاپیکیش یەکێک لە ئاڵۆزترین و پڕناتەباییترین کەسایەتییەکانی داستانە. بنەچەکەی دەچێتەوە سەر نەجیب زادەیەکی لێکەوتوو. نەک هەر جیهان، بەڵکوو خۆشی لە ڕوانگەیەکەوە لە یەک کاتدا بە تاڵ و گاڵتە دەزانی و هەڵ دەسەنگاند. دەی زانی ڕۆژێک "دەبێتە نجوومگەری دەربار" و "لە ساتێکدا دەمرێ کە دەیەوێ مانگ لەنێو باتلاغێک دەرکێشێ."[٥٤] سەخاوەتەکەی ئەندازەی نەبوو. دوا سەد دۆلاری گیرفانی، وەک بەخشیش دا بە خزمەتچیی ڕێستوورانێک. دەگەڵ ژنان بەڕێزەوە ڕەفتاری دەکرد. هەر لەوکاتەدا نەی دەتوانی پێوەندییەکی بەردەوامیان دەگەڵ دامەزرێنێ.

کردەوەکانی نەک لەسەر بناغەی ڕێوشوێنە ئەخلاقییەکان ، بەڵکە لەخۆوە (غەریزی) بوون. لەگەرمەی ئەو ململانەیەی لە شانگەهای لە ئارادا بوو، ـ تەوەری سەرەکیی چارەنووسی مرۆڤیش هەر ئەو ململانەیەیە ـ هاودڵیی وی زیاتر دەگەڵ شۆرشگێڕە کۆمۆنیستەکاندا بوو.هەر لەوکاتەدا دەگەڵ کاربەدەستانی پۆلیس، دەگەڵ یاخییە چەکدارەکان و دەگەڵ باڵێوزخانەی جۆراوجۆر کە لایەنگری کوشتاری کۆمۆنیستەکان بە دەستی چان کایچیک بوون، پێوەندیی هەبوو. دەلاڵی شتوومەکی دێرینە بوو. تەنانەت هێندێک کەس پێیان وا بوو قاچاغی تریاکیش دەکا. بەلام بە باوەڕی ژیسۆر* کە بۆخۆی ئاقڵترین کەسایەتیی ڕۆمانەکەیە، بارۆن لە دنیای خەیاڵیی تایبەت بە خۆیدا دەژیا؛ دنیایەکی پڕ لە خەون و درۆ؛ لە یەک قسەدا، "ئەو بەدەست نەخۆشیی خەیاڵپەروەرییەوە گرفتار بوو...خەیاڵپەروەری بۆ وی ڕێگایەک بوو بۆ نکوولی لەژیان."[٥٥]

دەتوانین هەرلەوکاتەدا بڵێین کلاپیک نەبوونبینە (نیست انگار، لاوجودی). لەلای وی "هیچ شتێک بەڕاستی نیە. هەموو شتێک تەنیا خەونێکە."[٥٦] لەلایەک هەوای خۆشگوزەرانیی لەسەردایەو لە لایەکی

* Gissor

دیکـە، حـەزو توانـای وەسـەریەک نـانی سـامانی نیـە. حـەزی بـە خۆشگوزەرانی زیاتر لایەنی ئیپیکووریی هەیەو پیوەندییەکی بە ئایینی ملکداریی ڕۆژگاری تازەوە نیە. هێندێ ڕەگی بەگومانیی نەبوون بینیی تێدا هـەن و هەربۆیـەش حـەز بـە مـەرگ... سـەودای خـۆویران کـردن" لـەودا زۆرن.[٥٧] کـاتێکی شـازادەی بەئەسـڵ لەهیسـتانی و جێـی گومـان، وشیاری کردەوە کە ئەگەر تا سبەینێ شانگەهای بەجێ نەهێڵێ مردن چاوەڕییەتی، ئەو هەموو دراوی نەغدو بەشی زۆری وەختی خـۆی لـە کازینۆیەکدا خەرجی قومار کرد.

بە وتەی ژیسۆر، کلاپیک پیاوێکە کە "دلێکی زیڕین، بەلام بەتالی هەیە...بەپێچەوانـەی خـەڵکی دیکـە، پوختـەی کەسـایەتیی کلاپیـک نـە ئۆگرییە، نە تەنیایی، هەموو گیانی وی هەست وسۆزەو هیچی دی." ئەو لـە دەگمـەن کەسـانێکە کـە "نـاوکی هـەناوی یـان نیـە."[٥٨] سـەرەنجامیش، هـەزارو دەسـت تـەنگ، بەجلوبـەرگی دەریاوانییـەوە، لـە چـین ڕای کرد، ئەوەش لەحاڵێکدا بوو کە هێندێک لە دۆستانی لە "هـاڵێکی گـەورەدا کـە پێشـتر هـی قوتابخانەیـەک بـوو" چـاوەڕێ بـوون "بیـان بەنـە حەوشەیەک و لەوێڕا بە تاقمی ئیعدامیان بسپێرن."[٥٩]

بێگومـان لـە نێوەرۆکی هـەر مرۆڤێکدا دەتوانین هێنـدێک ناتـەبایی بەدی بکەین. بەلام کلاپیک، وەک هووەیدا لەومرۆڤە دەگمەنانە بوو کە کەسایەتییەکەیان ئەو ناتەباییە دیاری دەکا. هـەم سواڵکەر بوو، هـەم ئەبلەخەرج. ماقوولزادەیەکی هەژار. بەچاوی ڕەشبینییەوە سەیری دنیای دەکـردو لـە یـەک کاتـدا، زۆریـش خۆشـگوزەران بـوو. مـالرۆ گوتـەنی "کلاپیک لـە دو کەسـایەتیی جیـاواز دروسـت ببـوو. یـەکیان ئـارەزووی ژیانی هەبوو، ئەوی دیکەیان خولیای مردن."[٦٠]

لەبارەی هووەیداشەوە، دەلێی هـەم لەسـەردەمی لاوەتی و هـەم لـە دەورانـی ژیـانی یەکسـەر سیاسـیی ویـدا، دەگـەڵ دوو کەسـایەتیی زۆر جیاواز ڕووبەڕووین. لـە بەیرووت هـەر لەوکاتـەدا کـە ئۆگری کلاپیک و نەبوون بینییەکەی بوو، لایەنگری سـەن ژووسیتیش بوو، واتە هەر ئەو کەسەی بە "بەدئەخلاقی و خۆپەرستی و خۆبەزلزانی" ناوبانگی هـەبوو، و

یەکێک لە سیما ترسناکەکانی شۆڕشی فەڕانسە بوو.[61] هەر ئەویش بوو کە دژی پێکهێنانی دادگایەک بۆ موحاکەمەکردنی شا بوو. چوونکە دەیگوت "دامەزراندنی ئەو دادگایە بۆخۆی گریمانەی بێگوناحبوونی شای تێدایە." ئەو بوو کە دەیگوت "بۆ سەقامگیربوونی نیزامی کۆماری، کوشتنی شا پێویستە."[62]

جگە لەوە، هووەیدا لە وتوویژ دەگەڵ هێندێک لە دۆستە ئێرانییەکانیدا، پشتیوانیی لە ترۆتسکییش دەکرد.[63] لەو کاتەدا تازە دادگا پڕشووورەییەکانی مۆسکۆ دامەزرابوون. زۆر دلە دۆستە کۆمۆنیستەکانی هووەیدا، و لەڕاستیدا کەم و زۆر هەموو کۆمۆنیستە ئێرانییەکان، لایەنی ستالینیان گرتبوو. بەلای وانەوە ترۆتسکی نوێنگەی شەیتان بوو.

کلاپیک و ڕەشبینییە سەمەرەکەی، سەن ژووسێت و باوەڕی پتەوی بەتواناى شیفابەخشی توندوتیژی، ئاندرەژیدو هەوەسە جیسمانییەکانی، و تەنانەت ترۆتسکی و بیری شۆرشە هەمیشەییەکەی هەموو لە خاڵێکدا هاوبەشن. هەموویان ڕۆمانتیکن. تەنانەت ئەڵقەی دۆستانی نیزیکی هووەیدا لە مەدرەسەش ناوێکیان بۆخۆیان هەڵ بژاردبوو کە ئاوازی ڕۆمانتیزمی مێژوویی شەپۆلی تێدا دەدا. ئەوان خۆیان بە بژاردە ڕووناکبیرییەکانی قوتابخانە دەزانی و ناوی "تەمپلەرەکان"* یان هەڵ بژاردبوو.[64] هەڵبژاردنەکەیان زۆر سەیر بوو چوونکە تەمپلەرەکانی سەدەی دوازدەهەم، شەرکەرانێکی بەناوبانگ بوون کە لە شەڕی خاچپەرستەکاندا بەدژی موسوڵمانان شەڕیان دەکرد. بە بۆچوونی هێندێک لە لێکۆڵەران دەبێ هەر ئەو تەمپلەرانە بە یەکەم شانەی ماسۆنییەکان بزانین. بەشێکی دیکە پێیان وایە دەبێ ئەوانە بە هەوێنێکی گرنگی "مێشکی ئەدەبیی دەورانی ڕۆمانتیک دانێین."[65] دیارە تەمپلەرەکانی بەیرووت تەنیا لە ئاڵۆزبڵۆزییەکانی سەردەمی لاوەتیدا هاودین و هاوپەیمان بوون.

---

* Templars

لــە دنیــای هاورێیەتیــدا هووەیــدا هەمیشــە بــەوەفا بــوو. زۆر لەوکەسانەی لە بەیرووت چاوی پێیان کەوت تامردن بەدۆست و هاورێی مانەوە. باکیشی لەوە نەبوو کە ئەو دۆستایەتییانە هێندێ جار بە زیانی خۆی تـەواو بن. جگە لـەوە بەشێک لـە قوتابییـە عەرەبەکانی مەدرەسـە دواتر چوونە ڕیزی بژاردە سیاسییەکانی جیهانی عـەرەبەوە. بە وتـەی هووەیـدا: "لــە کابینەیــەکی لوبنانــدا لــە دوازدە وەزیــر، حــەوتیان لــە هاوقوتابییەکانی من بوون."[٦٦]

لەنێو دۆستانی ئەڵقەی "تەمپلەر"دا، هووەیدا ئۆگرییەکی تایبـەتیی بە کچێکـی جـوان و گـەنج بـەناوی ڕێنـە دۆمـان* هـەبوو. هـەردووکیان لـە نواندنی شـانۆنامەیەکی ڕاسـیندا بـەناوی Les Plaideurs بەشـدار بـوون. ڕێنــە نەخشــی "کــۆنتس پیمپــۆش"**ی لــە ئەســتۆ بــوو، و نەخشــی سـەرەکی، واتە "داندەن"***یش هووەیدا یاریی دەکرد. ئـەو قازییـەکی پڕکـارە کـە "پـێچ و مۆرەکـانی لـە ئاکـامی کـاری زۆردا نـەختێک شـل ببوونـەوە".[٦٧] لـە یـەکێک لـە شـەوانی پێشـاندانی ئـەو شـانۆیەدا بـوو کـە هووەیدا قسەخۆشی و تیژهۆشی و حازرجوابیی کە دواتر بوو بە بەشێک لە کەسایەتیی سیاسیی وی، لەخۆی نیشان دا. کاتێک بینـەران بـە دەنگـی بـەرز بـە قسـەیەکی دانـدەن پێکـەنین، هووەیـدا کـە جلوبـەرگی جـوان وڕازاوەی قـازیی دەبـەردا بـوو، چـەکوچی سـەرۆکایەتیی لەمێزەکـەی خۆی داو ڕای گەیاند کە "ئەگەر ئامادەبووان بێدەنگی نەپارێزن، جگە لـە دەرکردنیان چارەیەکمان نیە."[٦٨]

مامۆسـاتای شـانۆ کـە باوەڕێکی پتـەوی بـە پیرۆزیی دەقە کۆنـەکان هەبوو، ئەو گۆڕینـە کتوپڕەی لـە دەقی شـانۆنامەی ڕاسـیندا پێ خـەراپ بوو. بەڵام بینەرەکان بە پێکەنینی بەرزو سـەرلەنوێی خۆیان نیشانیان دا کە ئەو شیرنکارییەی هووەیدایان پێ خۆش بووە.[٦٩]

---

* Rene Domont
** Countess of Pimposh
*** Danden

هووەیدا تا مابوو نامەگۆڕینەوەی دەگەڵ ڕێنە بەردەوام بوو. جارجار یادی شانۆنامەی ڕاسینی دەکردەوەو تەنانەت جاری وابوو بە ڕێنەی دەگوت کۆنتس.[70] پێوەندیی ئەم دووانە لەبارێکەوە زۆر جوان بوو. دەتوانین لەودا نیشانەی ئەوینێک ببینین کە هەرگیز ئاشکرا نەکراو دەرفەتی وەدیهاتنی دەست نەکەوت. کاتێک هاوینی ساڵی١٣٧٧(١٩٩٨) لە بڕوکسێل چوومە سەردانی ڕێنە، چاکەت و داوێنێکی جوانی ئاسمانیی دەبەردا بوون. سەروچاوی زۆر بەسەلیقەوە ڕازاندبۆوە. زۆر بەتامەزرۆیی، داستانی دۆستایەتیی خۆی دەگەڵ ئەمیر'ی شی دەکردەوە. هەموو سەنگینیی خانمێکی بۆرژوای بەفەرهەنگی ئورووپایی لەودا بەرچاو دەکەوت. لە ڕوخساریدا هێشتا جوانی و نازەنینیی زەمانی گەنجی دەگەڵ نیشانەکانی پیری لە ململانەدا بوون. دیار بوو کە بە جحێڵی لەوانە بووە هەموو کەس گیرۆدەی بێ.

قسەکانمان جارێک بە فەڕانسەو جارێک بە ئینگلیسی بوون. زۆرتر وابوو بە ئینگلیسی دەستی پێ دەکردو ئەمجار هەژانی گێرانەوەکە وەکەیفی دەخست ولەنەکاو بێ ئەوەی بە خۆی بزانێ قسەکانی بەزمانی زگماکیی خۆی، فەڕانسەیی درێژە دەدا.

دەیگوت یەکەم جار وەختێک چاوی بە هووەیدا کەوت ، کە هەردووکیان سەرگەرمی مانگرتنێکی قوتابییان بوون. بەڕێوەبەری قوتابخانە یەکێک لەقوتابییە عێراقییەکانی دەرکردبوو و هووەیداو هاوخەباتەکانیشی خوازیاری گەڕانەوەی بوون. سەرەنجام بەرپرسانی مەدرەسە تەسلیمی ویستی قوتابییەکان بوون. ڕێنە دەیگوت: "ئەمیر زۆر میهرەبان و بەگوزەشت و زانا بوو" بەیگوت ڕەفتاری "سەنگین و ڕەسمی" بوو. دە ساڵی پێ چوو تا سەرەنجام هووەیدا لە نامەیەکدا کە لە لەندەنەوە بۆی نارد، بۆ یەکەمجار لە جیاتی "ئێوە" "تۆ"ی بۆ بەکار هێنا. هەر لەو نامەیەدا هێندێ نیشانەی ئەو خۆشەویستییە شاراوەیەشیان دەتوانین ببینین.[71] دیارە بە وتەی ڕێنە: "بۆ من و ئەمیر، هاوڕێیەتی لە عیشق گرنگتر بوو. عیشق زوو دەڕواو هەرگیز تەمەنێک نابا. هاوڕێیەتی تا مردن دەمێنێ."[72]

دەیگوت وتووێژەکانیان زۆرتر لەبارەی مەسەلە ئەدەبییەکانەوە بوون. بەخەفەتەوە وەبیری دێنایەوە کە "ئەمیر بەئاسانی دەی توانی لەبەرڕا قسەکانی موولیێر، بوودلێر یان ئاپوولینێر بگێڕێتەوە. باسی لە سەلیقەی هەمیشەیی هوەیدا لە جلوبەرگ پۆشیندا دەکرد. کراسی سپی و کراواتی سوور و شاڵواری شینی باس دەکرد کە یۆنیفۆرمی مەدرەسە بوون. باوەڕی وا بوو "کاتێک ئەو بەرگەشی دەبەر دەکرد، هەر شۆخ و شەنگییەکی تایبەتیی هەبوو" پاشان، لەنەکاو، وەک بڵێی بەڕێکەوت، چەند وشەی شێعرێکی وەبیر هاتنەوە کە هوەیدا پێش ئەوەی لە بەیرووت بڕوا لەسەر بەرگی دەفتەرەکەی ویی نووسیبوون. دەیگوت شێعرێکی ئالفرێد دو ڤینی* بوو. بەڵێنی دا ئەگەر دەستخەتەکەی هوەیدای دیتەوە کۆپییەکیم بۆ بنێرێ.

کاتێک هوەیدا بەیرووتی بەجێ هێشت، فەرهەنگ و زمانێک کە لە مێشکیدا دەزرینگایەوە، سەرچاوەی سەرەکیی سەرمایە سیمبوولیکەکانی، ئەو شێعرانەی باسی ئەوین وئاوات و نائومێدییەکانییان دەکرد، ئەو شیرنکارییە زمانییانە کە بناغەی قسەو نووسینەکانی ئەویان پێک دێنا، هەموو لەجێدا ئورووپایی بوون. کەم وزۆر هەموو ئەو کتێبانەی دەی خوێندنەوە، بە فەڕانسە، ئینگلیسی یان عەرەبی بوون. تەنیا لەماڵێ، ئەویش بەپێداگریی دایکی، هێندێ شێعری فارسیی دەخوێندنەوە تا زاڵبوونی بەسەر زمانی فارسیدا بپارێزێ.

لە دەورانی مانەوەی لە ئورووپادا، بێگومان نەریتە ڕۆژئاواییەکانی مایەی ئاسانیی کاروباری بوون. بەڵام کاتێک گەڕایەوە ئێران، ئەگەرچی هەر ئەو نەریتانە یارمەتییان دا بۆ ئەوەی بە خێراییەکی سەرسوڕهێن بگاتە لووتکەی دەسەڵات، هەرلەو کاتەدا، خاڵی لاوازیشی بوون. دژوارە بتوانی حکوومەت بەسەر وڵاتێکدا بکەی کە زمان و فەرهەنگەکەی[بۆ تۆ] بوونە مەڵبەندێکی بێگانە. هاوسەری هوەیدا بە تاڵی و زۆر بەکورتی ئاوای باس دەکا: "هوەیدا بۆ ئێرانییەکان لەڕادەبەدەر ئورووپایی بوو."[٢٣٠]

---

* Alfred de Vigny

سێ مانگ چاوەڕێ بووم و سەرەنجام نامەی ڕێنە دەگەڵ کۆپییەکی دەستخەتەکەی هووەیدا گەیشت. ئەو چوار دێڕەی وەک یادگار لەسەر دەفتەری ڕێنەی نووسیبوون بەڕاستی لەباری ویکچوونی دەگەڵ ژیانی هووەیدا خۆیەوە هەژێنەر بوون. ئەو چوار دێڕە بەشێکن لە بەناوبانگترین شیعری دوڤینی بەناوی "مەرگی گورگ":[٧٤]

**ناڵین، شیوەن و گریان کاری دەستەوستانانە**[*]
**بە وەرەی بەرزەوە پێ بنێ نێو جادەی چارەنووس**
**کۆڵێک کە بە پشک کەوتۆتە سەر شانت هەڵگرەو**
**ئەمجار وەک من ئازار بچێژەو بە بێدەنگی بمرە.**



**ناڵەوو گریان و شیوەن کاری بێچارانەیە**
**دڵ قەوی پێ هەڵبڕە. جا بگرە جادەی چارەنووس**
**هەڵگرە ئەو کۆڵە وا کەوتۆتە سەر شانت بە پشک**
**چەشنی من مەینەت بچێژەو فڕکە بادەی چارەنووس**

---

[*] شێعری دوڤینی بەڕواڵەت بە پێشوازی شێعرێکی بایڕۆن بەناوی چایلد هارۆڵد"ەوە چووە. دوو دێر لەم شێعرە سەرەتای ئەم فەسڵەن.

# سەرچاوەکان

۱. خطه‌ای که تهران در آن جای گرفته، برای نزدیک به هشت هزار سال مسکون انسان‌ها بوده است. در آغاز تهران روستایی بیش نبود. برای نزدیک به پانصد سال، در سایه‌ی شهر ری می‌زیست که از مراکز عمده‌ی فرهنگی و سیاسی و تجاری ایران قرون وسطی بود. با سقوط و ویرانی‌ی تدریجی ری، با حملات قبایل آسیایی که ویرانگری پیشه کرده بودند و هر آن چه در راه می‌دیدند نابود می‌ساختند، تهران هم به‌تدریج رونق و شهرتی نو یافت. برخی حتی می‌گویند نام تهران هم به معنی شهرت تحویل‌پذیر است. می‌گفتند تهرانیان خانه‌های خود را در زیر زمین باغستان‌های خود بنا می‌کردند و از دبد و گزند مهاجمان در امان می‌ماندند. برای بررسی تاریخ اجمالی شهر تهران ر.ک. به: تهران، پایتخت دویست ساله.

۲. امیر عباس هویدا، «یاد ایام جوانی»، سالنامه‌ی دنیا، دوره‌ی بیست و دوم، ص ۳۲۸.

۳. تاریخ معاصر ایران، تهران ۱۳۶۸، صص ۱۷۱ - ۱۷۲؛ هویدا، «یاد ایام جوانی»، ص ۳۲۸.

۴. هویدا، «یاد ایام جوانی»، ص ۳۲۸.

۵. برای بحثی در باب این سفر، خاطرات شاه از سفرهایش، و عُلقه‌ی وی به تجدد، ر.ک.:

A. Milani, "Narratives of Moderinty: Perspectives of an Oriental Despot" in *Challenging Boundaries*, ed. Michael Shapiro (Minneapolis, 1996, 219–32.

برای ترجمه‌ی فارسی این مقاله ر.ک. به: عباس میرانی، «ناصرالدین شاه و مسئله‌ی تجدد»، در تجدد و تجددستیزی در ایران، نشر آتیه، تهران، ۱۳۷۸.

۶. برای بحثی پیرامون جنبه‌های تاریخی تهران، و نفوذ و تأثیر نقشه‌های اروپایی بر رشد این شهر، ر.ک.:

John D. Gurney, "The Transformation of Tehran in Late Ninetecth century" in Adle, *Tehran: Capitale Bicentenaire*, 53–71

۷. برای دستیابی به تصویری جامع از تهران در دو دهه‌ی نخست قرن بیستم، ر.ک.: جعفر شهری، تاریخ اجتماعی تهران، ٦ ج، تهران، ۱۳٦۹، صص ۸۹ - ۱۱۰.

۸. برای دستیابی به تشریح و توصیف دروازه ر.ک.: جعفر شهری، تاریخ اجتماعی تهران، ج ۱، صص ۸۹ - ۱۱۰.

۹. برای دستیابی به گزارشی از ایجاد این مدرسه، ر.ک.: باستانی پاریزی، تلاش آزادی، تهران، ۱۳۴۱، صص ۷۸ ـ ۸۴.

10. Willem Floor, "Les Premiere Regles de Police Urbaine à Tehran," in Adle, *Tehran: Capitale Bicentenaire*, 173 – 98.

۱۱. شهری گزارشی عالی از این رویداد در کتاب یک جلدی خود، تهران قدیم، ارائه می‌دهد. ر.ک. تهران قدیم، تهران، ۱۳۵۶، ص ۲۴.

۱۲. هویدا، «یاد ایام جوانی»، ص ۳۲۸.

۱۳. برای دستیابی به گزارشی درخشان از زندگی ناصرالدین شاه و رابطه‌ی نابسامان وی با امیرکبیر، ر.ک.:

Abbas Amanat, *Pivot of the Universe: Nasir al Din Shah Qajar and the Iranian Monarchy, 1831–1896* (Berley, 1997), 106 – 67.

تاریخ‌نگاران دیگر هم اشاره کرده‌اند که این شاهزاده وقتی به وی امر شد با صدراعظم ازدواج کند، شانزده ساله بود. ر.ک.: فریدون آدمیت، امیرکبیر و ایران، تهران، خوارزمی، ۱۳۴۸، ص ۲۴.

۱۴. برای دستیابی به تاریخچه‌ی «قهوه‌ی قجر» معروف، ر.ک. باستانی پاریزی، تلاش آزادی، ص ۱۱۸.

۱۵. دکتر فرشته انشاء، گفتگو با نگارنده، ۲۷ ژوئیه‌ی ۱۹۹۸. قسمت اعظم اطلاعات درباره‌ی خانواده‌ی مادر هویدا از مصاحبه‌ای با خواهرزاده‌ی افسرالملوک، دکتر فرشته انشاء، به دست آمده است.

۱۶. هویدا، «یاد ایام جوانی»، صص ۳۳۳ ـ ۳۳۰. فریدون هویدا، گفتگو با نگارنده، ششم دسامبر ۱۹۹۷.

۱۷. برای دستیابی به شرح زندگی وی، و فهرست کتابهایی که او برای ترجمه یا انتشار آنها در ایران کمک کرد، ر.ک.: سردار اسعد، خاطرات سردار اسعد بختیاری، به کوشش ایرج افشار، انتشارات اساطیر، تهران، ۱۳۷۲، صص ۳ ـ ۷.

18. E. G. Browns, *Material for the study of the Babi Religion* (Cambridge, 1918), 4.

براون که از طرفداران جنبش بابی، یکی از موثق‌ترین گزارشهای اولیه درباره‌ی ظهور باب و مذهب بابی را به زبان انگلیسی ارائه داده است. نیز بنگرید به: یک سال در میان ایرانیان، دیگر اثر ادوارد براون.

19. E. G. Browne, Materials.

نیز ر.ک. یک سال در میان ایرانیان، برای دستیابی به بررسی جدیدتر و اندیشمندانه‌ای از این مبحث، ر.ک.:

Abbas Amanat, *Resurrection and Renewal: The Making of the Babi*

*Movement in Iran, 1840–1850.* (Ithaca, 1989).

۲۰. ادعای نقش عین الملک به‌عنوان کاتب را می‌توان در: بهرام افراسیابی. تاریخ جامع بهائیت نوماسونی، تهران، ۱۳۶۱، ص ۲۷ یافت. چنان که از عنوان کتاب بر می‌آید، روایت آن بر پایه‌ی نظریه‌ی توطئه‌ی ظهور آیین بهایی از ایده‌های فراماسونی، استوار است. در قسمت اعظم ادعاهای این کتاب، از جمله ماهیت پیوندهای مابین عین‌الملک و افندی، سند و مدرک قابل اعتنایی ارائه نشده است.

۲۱. هویدا، «یاد ایام جوانی»، ص ۳۲.

۲۲. پیشین، ص ۳۲۹.

23. T. E. Lawrence, *Seven Pillars of Wisdom* (New York, 1927), 34.

۲۴. هویدا، «یاد ایام جوانی»، ص ۳۲۸.

۲۵. پیشین، ص ۳۳۲.

۲۶. پیشین، ص ۳۲۸.

۲۷. پیشین.

28. Fereydoun Hoveyda, *Les Nuits Feodales: Tribulations d'un Persan au Moyen-Orient* (Paris, 1954), 23.

۲۹. هویدا، «یاد ایام جوانی»، ص ۳۳۱.

۳۰. پیشین، ص ۳۲۴.

۳۱. پیشین، ص ۳۳۷.

۳۲. برای دستیابی به گزارشی موجز درخصوص ایدئولوژی و ساختار سیاسی وهابی، ر.ک.:

Aziz Al Azmeh, "Wahhabi Polity", in *Islam and Modernities* (London, 1993), 104 – 22.

۳۳. پیشین، ص ۳۳۷.

۳۴. فریدون هویدا، گفتگو با نگارنده، ۳ سپتامبر ۱۹۹۸.

35. Hoveyda, *Les Nuits Feodale*.

36. Frank J. Sulloway, *Born to Rebel: Birth Order, Family Dynamics, and Creative Lives* (New York, 1997), 22.

۳۷. برای دستیابی به شرح جامعی درباره‌ی به قدرت رسیدن رضاشاه، ر.ک. سیروس غنی، ایران، برآمدن رضاخان، برافتادن قاجاریه و نقش انگلیسی‌ها، تهران ۱۳۷۸.

۳۸. هویدا، «یاد ایام جوانی»، ص ۳۳۰.

۳۹. پیشین.

۴۰. پیشین، ص ۳۳۱.

۴۱. پیشین، ص ۳۳۲.

۴۲. پیشین.

۴۳. پیشین، ص ۳۳٦.

۴۴. فریدون هویدا، گفتگو با نگارنده، ٢٦ ژوئن ١٩٩٨. امیرعباس، در «یاد ایام جوانی»، محتاطانه به همین نکته اشاره‌ای ضمنی می‌کند و به وفاداری راسخ پدرش نسبت به دوستان خود اشاره دارد.

۴۵. فریدون هویدا، گفتگو با نگارنده، ٢٦ ژوئن ١٩٩٨.

۴٦. هویدا، «یاد ایام جوانی»، ص ۳۳٦.

۴۷. پیشین.

۴۸. فریدون هویدا، گفتگو با نگارنده، ٢٦ ژوئن ١٩٩٨.

۴۹. احمد قریشی، گفتگو با نگارنده، ١۴ اوت ١٩٩٨.

۵۰. امیر عباس هویدا، «یاد ایام تحصیل در اروپا»، سالنامه‌ی دنیا، دوره‌ی بیست و سوم، تهران، ١٣۴٧، ص ٣٣٧.

51. Fereydoun Hoveyda, *Les Nuits*, 171.

۵٢. فریدون هویدا، در بیش از یک مورد از علاقه‌ی برادرش به بارون دوکلاپیک با من صحبت کرد. در خاطرات مالرو که (با اداهای خاص فرانسوی) ضد خاطرات نام گرفته، بارون دوکلاپیک در روایت به‌عنوان شخصی ظاهر می‌شود که مالرو وی را در دنیای واقعی ملاقات می‌کند. ر.ک. آندره مالرو، ضد خاطرات، تهران، خوارزمی، ١٣٦۴.

۵٣. آندره مالرو، سرنوشت بشر، تهران، خوارزمی، ١٣٦۵.

۵۴. پیشین.

۵۵. پیشین، ص ٣٦.

۵٦. پیشین، ص ٢۵٩.

۵٧. پیشین، ص ٢٧٩.

۵٨. پیشین، ص ٣١۴.

۵٩. پیشین، ص ٢۵٧.

60. Sulloway, *Born to Rebel*, 316.

61. Simon Schama, *Citizens: A Chronicle of the French Revolution* (New York, 1980), 651.

٦٢. فریدون هویدا، گفتگو با نگارنده، ٩ سپتامبر ١٩٩٨.

٦٣. رنه دومان، گفتگو با نویسنده، بلژیک، بروکسل، اول ژوئن ١٩٩٨.

64. Peter Partner, *The Murdered Magicians: The Templars and Their Myth* (Rochester, 1987), XIV – XVII.

٦۵. هویدا، «یاد ایام جوانی»، ص ٣٣٢.

66. Jean Baptiste Racine, *The Complete Plays of Jean Racine,* Vol. 1, trans. Samuel Solomon (New York, 1967), 220.

۶۷. فریدون هویدا، گفتگو با نگارنده، ۲۶ ژوئن ۱۹۹۷.

۶۸. هم رنه دومان و هم فریدون هویدا ماجرای بداهه‌گویی امیر عباس را در نقش داندن به یاد داشتند.

۶۹. امیر عباس هویدا، مکاتبه‌ی خصوصی با رنه دومان.

۷۰. پیشین.

۷۱. رنه دومان، گفتگو با نگارنده، بلژیک، بروکسل، اول ژوئن ۱۹۹۸.

۷۲. لیلا امامی، گفتگو با نگارنده، فرانسه، پاریس، ۱۲ مارس ۱۹۹۹.

73. William Rees, ed. *French Poetry 1820 –1950* (New York, 1990), 20.

74. Percy Mansell Jones, and Geoffrey Richardson, *A Book of French Verse* (London, 1964), 73–74.

# فەسڵی سێیەم

## عەوداڵی پاریس

**لە کووچەو کۆڵانی پێتەختە کۆنەکاندا**
**هەموو شتێک، تەنانەت ترسیش، سەرسوڕهێنە**

**بوودلێر**

# عەودالّی پاریس

ئەمیر عەبباسی نۆزدەساڵە، لە کاتێکدا نوسخەیەکی لەکتێبی خوانە زەمینییەکانی ئاندرەژید بەدەستەوە بوو، ئێوارەیەکی شێداری خەرمانانی١٣١٧(١٩٣٨)، لە بەیرووت سواری کەشتییەک بوو کە دەی-بردە ئوورووپای دنیای خەیاڵی.

ئەفسەرولملووکی دایکی، بەناچار هەر لەماڵێ خواحافزیی لێ کرد. لەورۆژانەدا بەندەری بەیرووت یەکێک لە گەڕەکە نائەمنەکانی شار بوو و ژنان هەتا بۆیان کرابایە لە چوون بۆ وێ خۆیان دەپاراست. ڕێ و ڕەسمی باوی خواحافزی بەوجۆرەی دابی بنەماڵە موسوڵمانەکان بوو، لەسەر داوای دایکی ئەمیر عەبباس بەڕێوە چوو. ئەفسەرولملووک لە شیپانەی دەرگادا ڕاوەستا، قورئانێکی بەدەستەوە گرت و کوڕەکەی سێ جار، لەحاڵێکدا هەموو جارێ بۆتەعزیم سەری دادەنواند، بە بن ئەو کتێبە پیرۆزەدا تێپەڕاندو جاری سێیەم موسافیرە لاوەکەی هان دا قورئانەکە ماچ بکاو بە نیشانەی ڕێزدانان لەسەر چاوی خۆی دابنێ.[1]

هووەیدا دەنووسێ: "ئەمن بەچاوی پڕفرمێسک و کۆڵەگرووەوە دەگەڵ براکەم بە مەبەستی چوونەبەندەر سواری تاکسی بووین. دایکم ئارامیی خۆی پاراستبوو و ئامۆژگاریی منی دەکرد کە بە ئەقڵ ڕەفتار بکەم. دەمزانی کە هەر نەبێ خەم و خەفەتەکەی بەقەرا منە."[2] بەمجۆرە، فەرەیدوون و ئەمیر عەبباس چوونە بەندەرێک کە ڕۆژانە پڕ بوو لە

موسافیری ئورووپایی و عەرەب و کۆمەڵێکی زۆر دەستفرۆش و کەشتییەوان و تەنانەت لات ولووت. جانتایەکەی هوەیدا تەنیا دوو دەست چاکەت و شاڵوار، چەند کراس ، چەند پارچە جلی بنەوەو کەرەسەی ڕیش تاشینی تێدا بوو. دەڵێ دەچوومە ئورووپایەک کە هەموو شتێک لەوێ دەستی پێ دەکردو لەوێش تەواو دەبوو...دەچوومە سەرزەمینێک کە لە ماوەی دوازدە ساڵدا کە لەسەر لاتەختەکانی مەدرەسەیەکی فەڕانسەیی دانیشتبووم، خۆراکی ژیانی فکریی من بوو."[20]

تەنانەت ئەو کەشتییەش کە هووەیدای دەبردە ئورووپا، بوو بە مایەی سەرسوڕمان و ئافەرینی. دەیگوت: "ئەو کەشتییەی چاوەڕێم بوو، هی کومپانیای موسافیرگوازتنەوەی ماریتیمی فەڕانسە بوو بەناوی شامپۆلیۆن. ئەمە ناوی زانایەکی فەڕانسەییە کە بۆ یەکەم جار توانی خەتی کووفی کە بە فەڕانسەیی پێی دەڵێنCuneiforme ، بەچاکی بخوێنێتەوە*... لە دەرسەکانی قوتابخانەدا، وەدوای ژیان و ڕێزلێنانی وی کەوتبووم... داخوا ئەمە بۆخۆی نیشانەیەک و شوێنەوارێک لە ڕێزلێنان نەبوو؟ سەفەر بۆ ئورووپا، سەرچاوەی هەموو زانستەکان، بە کەشتییەک کە ناوەکەی دەگەڵ زانست و مێژوو لێک گرێ دراوە."[40] لە پەنا ئەو هەموو پێهەڵلاگوتنەی ئورووپا، تەنیا جاروبار دەتوانین سووکەڕەخنەیەکیش ببینین.دەیگوت: "پێم وا بوو دەچمە ئورووپایەک کە بە دایک و دایەنی مرۆڤایەتیم دەزانی، بەلام پێم دەخاکێکی مردوو

---

* هووەیدا لێرەدا تووشی هەڵەیەکی مێژوویی بووە. شامپۆلیۆن (١٨٣٢-١٧٩٠) لەڕاستیدا میسرناسی فەڕانسەیی بوو کە لە کاتی خوێندنەوەی بەردەکانی ڕۆسێتاRosetta ڕەمزی هیرۆگلیفی میسری دۆزییەوە. خەتی کووفی سوومەرییەکان دەوری شەش هەزار ساڵ لەمەوبەر نووسییانەوە. کەسانی وەک ئێچ.سی.ڕالینسۆنH.C.Rawlinson و جی.ئێف.گرۆتەفەن G.F.Grotefen ڕەمزی خەتی کووفی یان کردەوە.گرنگترین دەسکەوتیان وەرگێڕانی دەقە کووفییە ئێرانییەکان بوو.

دەنا، ئوروپایەک کە بەهۆی کینە ، تێکنەگەیشتن و خۆبەزلزانییەکەی دەسەرەمەرگدا بوو.[50]

ئەگەر نەخشەی جوغرافیا بە پێوانە دانێین ، سەفەری هووەیدا دوورودرێژ بووو ئەوی لە قاڕڕەیەکەوە بردە قاڕڕەیەکی دیکە. بەڵام ئەگەر ڕاهاتنی فکری بکەینە پێوانە، و ئەگەر قسەکەی کلۆدلۆوی شتراوس قبوول بکەین، ئەودەم دەتوانین سەفەرەکەی بە گەشت و گوزارێک لە سەرزەمینێکی ئاشنادا بزانین. لۆوی شتراوس دەیگوت موسوڵمانان و فەرانسەییەکان لە شتێکدا زۆر وەک یەک دەچن. دەیگوت لەهەر دووکیاندا "دەتوانی جۆرێک بۆچوونی کتێبی و جۆرێک ڕووحیەی نەناسراو ببینی. هەردووکیان پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە چارەسەری تیئۆریی گیروگرفتێک وەک چارەسەری[بەکردەوەی] ئەو گیروگرفتە وایە... هەردووکیان وێنەی وەک یەک لەجیهان دەکێشنەوە کە لەودا دەکرێ بە بەکارهێنانی زیرەکانەی ئەقڵ و مەنتیق هەر گیروگرفتێک چارەسەر بکرێ."[60] ڕەنگە بەپێرووت پتر لە هەر شارێکی دیکە، نوێنگەی ئاشقی تێکەڵاویی ڕۆژهەلات وڕۆژئاواو فەرانسەو جیهانی ئیسلام بووبێ. بەمجۆرە، هووەیدا کە ڕۆڵەی بەرهەقی بەپێرووتی جیهان وەتەن بوو، وەک فەرانسەییەک دەچوو کە لانی کەم بە نەزەری شتراوس، تەنیا دەی توانی بۆچوونە کتێبییەکەی، و بیروباوەڕە نەناسراوو دۆزراوەوەکەی، و هەروەها ئەو مەیلەی کە چارەسەری تیئۆریی هەر مەسەلەیەک بەمانای چارەسەری ئەو مەسەلەیە لەجیهانی واقیعدا بزانێ، دووچەندانە بکاتەوە.[70]

ڕۆژی دووەم ئارەزووی دیتنی فەرانسە بەسەر ئەو دڵەخورپەیەدا کە لەکاتی سەفەردا تووشی مرۆڤ دەبێ، سەر کەوت و لەجێی وی، جۆرێک حاڵەتی دۆزینەوەو چاوەڕوانی و چەشنێک هیوا بە پێک گەیشتنی فکری بەسەریدا زاڵ بوو. بۆنی "بیفتەک و پەتاتە" دەهەموو جێیەکی کەشتییەکە گەڕابوو. بەفکری هووەیدا "بەمجۆرە، بوونی وڵاتی فەرانسە بەباشی هەست پێ دەکرا."[80]

دەربڕینە ڕاستوێژانەکەی هوەیدا لەبارەی فەرهەنگی فەڕانسەو ئورووپاوە نەک هەر دوورەدیمەنی فکریی خۆی، بەڵکوو وتوویرەی بەرەیەک لە ڕووناکبیران و سیاسەتمەدارانی ئێران و ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستیشی نیشان دەدا. جگە لەوە، دەبێ بەشێک لە بایەخی وشەکانی هوەیدا لەو ڕاستییەدا ببینین کە ئەو لەسەردەمێکدا نووسیونی کە سەرۆک‌وەزیری ئێران بووە. لەبەرچاوی زۆر لە ڕووناکبیران و سیاسەتمەدارانی هاودەورەی هوەیدا، فەڕانسە، بەتایبەتی لە ساڵەکانی پێش شەڕی دووەمی جیهانیدا، نوێنگەی نوێبوونەوەو گۆڕان بوو.[٩] بەتەنیا ئامرازی بەربەرەکانی دەگەڵ بێهۆشیی مێژوویی ئەو وڵاتانەش دەژمێردرا کە دڵیان بەڕابردووی پڕ لەسەروەریی خەیاڵیی بەستراوە بە نەریتە مەزهەبییەکان خۆش بوو.[١٠] لەڕاستیدا باپیری دایکیی هوەیدا بۆخۆی نوێنگەو نموونەی تەواوی ئەوجۆرە مەیلە فڕانکۆفیلە (فەڕانسەدۆستی) بوو. بیرەوەرییەکانی هوەیدا ئەو ڕاستییە دەردەخەن کە ئەویش، وەک باپیری، ئۆگرییەکی تایبەتیی بە فەڕەنگ هەبوو. هەربۆیە، وەختێک سواری کەشتیی شامپۆلیۆن بوو، تامەزرۆیی دیتنی ئورووپایەک کە چەندین ساڵ بەئیشتیاوە شتی لەسەر خوێندبۆوە، سەرانسەری مێشکیی بەخۆیەوە خەریک کردبوو.

هوەیدا دەگەڵ حەوت موسافیری دیکە، لە کووپەیەکی چووکەڵەی بەشی "پلە سێ"ی کەشتییەکە سوار ببوون. دەیگوت ژوورێکی چووکەڵە بوو کە "هەشت تەختیان تێدا دانابوون. چوار تەختی لەسەر یەک، واتە یەک لەسەر یەکی دیکە."[١١] لە بەشێکی دیکەی یادداشتەکانیدا لەم بارەیەوە دەنووسێ: "ئەم کووپەیە لە بەشی بنەوەی کەشتییەکە بوو. بۆیە دەلاقەیەکی بەرەو دەریا نەبوو، دیارە بنیادەم لەو فەزا داخراوە بێ پەنجەرەیەدا دەسبەجێ هەستی بە نارەحەتی دەکرد." دەی پرسی: "بنیادەم بۆ دەبێ خۆی بە شتی سەر زەوییەوە ببەستێتەوە؟" پێی لێ دەنا کە "ئەمن لەژیانمدا، لە پلە سێ بەولاوەم نەناسیبوو." دنیای پلە سێ "لەمن نیزیکتر بوو، و ئەمن خووم پێ گرتبوو. لە زمانی حاڵی دەبووم. ئەمە زمانی دڵە کە هەمیشە بۆمن ئاشنا بوو." ئەگەر ئەم قسانە

بەچاوی قبووڵەوە سەیر بكەین، دەتوانین ئەوان بە پاشماوەیەک لە بۆچوونە ماركسیستییەكانی سەردەمی لاوەتیی وی بزانین. ئەگەر بشمانەوێ بەچاوی رەخنەگرانەوە لێیان بڕوانین، ئەودەم دەبێ ئەو قسانە بەجۆرێک خۆنواندن و ڕیابازیی دەورانی سەرۆک وەزیرییەكەی دابنێین.[12]

لەم بیرەوەرییانەدا، ناتەباییەكی زۆر ئاشكرا لەنێوان دوا تێگەیشتنی لە ڕۆژهەڵات و یەكەم ڕوانینی بۆ ڕۆژئاوا دا دەبینین. یەكەمیان زۆر واقیعبینانەو دووەمیان یەكجار خەیاڵییە. دوادیمەن كە لە ڕۆژهەڵات نیشانی دەدا، پێوەندیی بە ئەسكەندەرییەوە هەیە. باسی ئەو منداڵە هەژارانە دەنووسێ كە "بەكۆمەڵ بۆ هەڵگرتنەوەی سكە دراوێک كە موسافیرە دەوڵەمەندەكان بۆ خۆشی فڕێیان دەدانە نێو ئاو، دەچوونە بن ئاوەكە." دەیگوت ئەو دیمەنە ئەوی "دەخستەوە یادی فیلمەكانی باخچەی ئاژەڵان كە لەوێدا فەرمانبەری پارێزەر، هێندێ خواردنی فڕێ دەدایە نێو ئاوی حەوزی ماسییەكانەوەو ماسییەكان بۆ ڕفاندنی خواردنەكە لەنێو ئاوەكە دەردەپەڕین." بەباوەڕی هووەیدا ئەو هەموو هەژارییە شیاوی هیچ مرۆڤێک نییە؛ دەیگوت ئەمە مرۆڤایەتی یەكسەر لەنێو دەبا. گەیبووە ئەو ئاكامە كە: "مردن لە هێندێ جۆرە ژیان باشترە."[120]

ئەودەم، ڕۆژی شەشەم، لای بەیانی ، هووەیدا چووە سەربانی كەشتی "تا هەوای تازە باشتر هەڵمژێ" لێرەدایە باسی یەكەمین دیمەن دەنووسێ كە لە ڕۆژئاوا كەوتۆتە بەرچاوی: "وردەوردە كەنارەكانم دێنە بەرچاو كە گەورەو گەورەتر دەبن...لەدوورەوە بە دووربین دەتوانی بەباشی دورگەی ئیف بناسییەوە. لە كتێبی كۆنت مۆنت كریستۆدا زۆر باسی ئەم دورگەیە كراوە...و ئەمن بە جحێڵی ئەو داستانەم چەند پێ خۆش بوو."[140] بەمجۆرە دەبینین كە جۆرێک واقیعبینیی یەک لایەنە فۆڕمی دەدا بە تێگەیشتنی لەڕۆژهەڵات* و لە

* وێنەكێشانەوەی هووەیدا لە ئەسكەندەرییە، بۆ وێنە زۆر لە ڕوانینی لۆرێنس

بەرامبەردا، رۆمانتیزمێکی کتێبی ڕوانینی بۆ ڕۆژئاوا دەنەخشاند.

لەدوا سەعاتەکانی ئەو سەفەرە حەوت ڕۆژییەدا، هووەیدا لەوە کە "بە زوویەکی زوو بۆ یەکەم جار پێ دەنێتە خاکی ئورووپا" کەوتە هەژان. دەیەویست دەگەڵ کۆمەڵێک لوبنانی و سوودانی و میسری، و دوو دۆستی ئێرانیی خۆی، "بەخت و ئیقباڵی خۆی لە بەهرەوەرگرتن لە سەرچاوەکانی زانستی ئورووپادا" تاقی بکاتەوە.[١٥]

بۆ هووەیدا دەروازەی ئەو خاکە بەڵێندراوە (أرض موعود) شاری مارسەی بوو، واتە کۆنترین شاری فەرانسە کە شەشسەد ساڵ پێش لەدایکبوونی مەسیح بە دەستی فەینەقییەکان دامەزرابوو. شەوی یەکەمی لە هوتێلێکی هەرزان بەسەر بردو ڕۆژی دوایی گەشتێکی بە نێو شاردا کرد. خواردنێکی ئەو ناوچەیەی بەناوی "بوویی ئابس" خواردو زۆری پێ خۆش بوو. بەڵام ئەو زیاتر لە هەرشتێک لە خوتخوتەی پاریسدا بوو. لە یەک دەرفەتدا قەڵەباڵغی و پیس و پۆخڵیی مارسەی بۆ لای شان و شکۆی پاریس بەجێ هێشت. پاریسی بەرلەوەی بی بینێ پێ خۆش بوو. پێی لێ دەنا کە لەسەردەمی لاوەتیدا ئەوەندەی لەبارەی پاریسەوە بیستبوو و بیرکردبۆوە کە وا بزانە ئەفسانە و واقیعییەتی ئەو شارە وا تێکەڵ ببوون لێک جیاکردنەوەیان نەدەگونجا.[١٦]

پاریسیش نائومێدی نەکرد. تەنانەت بەرلەوەی قەتارەکەی بگاتە ئێزگەی گاردولیۆن❁، ماڵە ڕووناکەکانی شار، ئاپۆرای ئەو ترومبێلانەی لە شەقامەکاندا دەهاتن و دەچوون، کۆڵانە پڕ جموجوڵەکانی و مەزنیی دوکانە گەورەکانی هووەیدایان سەرسام کرد. تەنانەت ئێزگەی قەتاریش

---

دووریێل Lawrennce Durrell بۆ ئەو شارە جیاوازە. ئەو لە چوار ڕۆمانی پێکەوەبەستراوی زۆر جوان و پڕ هەستدا جوانی و سەرسوڕهێنییەکانی ئەو شارە پڕ ڕەمزو ڕازەی نەمر کردوە. بۆ ئەم بابەتە باشە چاو لە کتێبی ئەلیکساندریا کوارتێت Alexandria Quartet بکرێ کە هەرنەبێ بەرگێکی بە قەڵەمە جوانەکەی ئەحمەدی میرعەلایی کراوەتە فارسی.

❁ Gare de lyon.

لـەوەی بەبیریـدا هـاتبوو، ڕازاوەتـر دیـار بـوو. هووەیـدا دەیگـوت بـۆ کەسێکی وەک وی، "کە لە شارێکی نیوە لادێی وەک بەیرووتەوە دێ... ئەو ئێزگەیەی گاردولیۆن زۆر گەورە دەهاتە بەرچاو."[١٧٠]

لە سەرەتای سەدەی حەڤدەیەمەوە، سەفەری ئێرانییان بۆ ئورووپا دەستی پێ کرد. زۆر لـەو موسـافیرانە بیـرەوەری و سـەفەرنامەیەکیان لـەدوای خۆیـان بـەجێ هێشـتوە. لـەو گێڕانەوانـەدا نـەک هـەر دەتـوانین زلنیارییـەکی بـێ جێگـرەوە لـەبارەی پێوەندییـەکانی ئێـران و ڕۆژئـاواوە بەدەسـت بێنـین، بـەڵکوو هەرلەوکاتـەدا دەکـرێ لەوانـدا گەشـەکردنی کەسایەتیی نیشتمانییش بدۆزینەوە، دەتوانین پەی بە چۆنیەتیی پێکهاتنی "خۆ"ی ئێرانی و ڕووبەڕووبوونەوەی وی دەگەڵ مانـای "ئـەوی دیکـە"ی ڕۆژئـاوایی، بـەرین. لـە بیـرەوەری و سـەفەرنامەکانی بـەرەی یەکەمـدا، بەتایبـەتی لـە یادداشـتەکانی بـاڵیۆزانی دەورەی سـەفەوییەدا، دەتـوانین جۆرێـک متمانەبـەخۆبوون یـان تەنانـەت بـە زمـانێکی وردتـر، جۆرێـک خۆبـەزلزانین ببینـین. لەسـەردەمی قاجـاردا، ئـەو ڕووحییەیـە بەرەبـەرە لەنێو چوو. لەبەرامبەردا تێکەڵاوێک لە سەرسامی و تـرس جێـی گرتـەوە. لە سـەدەی بیستەمدا جۆرە بیرکردنەوەیەکی تازە دەرکەوت.

وەک ڕەخنـەلێگرتن بـە پـەیڕەوانی ئـەو شـێوە بۆچوونـە نوێیـەیان دەگوت" فۆکۆلی"[١٨٠] فۆکۆلییەکان هەر کە تۆزێک دەگەڵ فـەزای ئورووپا ئاشـنا دەبـوون، بـەجارێک بێزیـان لـە هـەموو شـتێکی ئێرانـی دەکـردەوە. دەیـانگوت تـەنیا ڕێگـای ڕزگـاری وەلانـانی کەسـایەتیی ئێرانـی و زمـانی فارسی و وەرگرتنی فەرهەنگی فەڕەنگە. لەڕاستیدا دەکرێ ئـەم تاقمـە بـە نوێنگەی تەواوو کـەماڵی ئـەو ڕووحییە بەچکـە ئیسـتیعمارییە بـزانین کـە تـاریفی وردو پڕبەپێسـتی دەتـوانین لـە بەرهەمـەکانی فـرانتس فـانوون و ئێمە سێزێرو ڕۆمانە جوانەکانی پاتریک شاموازەدا* پەیدا بکەین.

لەباری مێژووییەوە، بیرەوەرییـەکانی هووەیدا لـە ئورووپا لـە زۆر بـارەوە تاقانـەن. بـە پێچەوانـەی فۆکۆلییـەکان و ئۆگریی سـەرسـەرەکی و

---

* Patrick Chakoiceau.

هەڵنەسەنگاویان بەرۆژئاوا، هووەیدا فەرهەنگی ئورووپای باش دەناسی و پێیدا چووبووە خوار. بەڵام هەر لەوکاتەدا، لەبارەی بایەخی مێژوویی فەرهەنگی رۆژئاواو هەروەها چەندوچۆنی بەکاربردنی ئەزموونی ئورووپا لە ئێراندا تووشی گومان ببوو، و هەر ئەو گومانەش جاری وابوو ئەوی وەک هاوبیری فۆکۆلییەکان نیشان دەدا. لەلایەکی دیکەوە، هووەیدا بە پێچەوانەی فۆکۆلییەکان، لەبیرەوەری‌و وتارەکانی سەردەمی سەرۆک وەزیریی خۆیدا، هیچ کاتێک سووکایەتیی بە فەرهەنگی ئێران و زمانی فارسی نەکرد. لەڕاستیدا، لە دواساڵەکانی ژیانیدا، لەلایەک، بانگەوازی بۆ جۆرێک ناسیۆنالیزمی سەرسەخت دەکردو زۆرجار بە لایەنە زەق‌و بەرچاوەکانی فەرهەنگی ئێرانی هەڵ دەگوت، و لەلایەکی دیکە، هەر وەک جاران سەودای ئەو ئورووپایەی لەسەردا بوو کە سەردەمی خوێندن لە مەدرەسەی فەڕانسەییەکان لە بەیرووت لە مێشکی چەسپابوو.

ڕەنگە هەر ئەو ئۆگری‌و سەودایەی پاریس بووبێتە هۆی ئەوە کە سێپتامبری١٩٣٨، بلیتی قەتاری خۆی لێ ون بوو. ئەگەر شانسی نەهێناباو برادەرە ئێرانییەکانی بلیتە ونبووەکەیان لە کووپەی قەتارەکەدا نەدیتبایەوە، پۆلیس هووەیدای بەتاوانی نەبوونی بلیت جەریمە (غرامە) دەکرد. سەرەنجام هووەیداو دوو هاوڕێ ئێرانییەکەی بەتاکسی خۆیان گەیاندە گەڕەکی لاتین (کارتیە لاتەن) کە لەو ڕۆژگارەدا کابەی ئاواتی ڕووناکبیرە فەرانسەدۆستەکان بوو. ئەو سێ هاوڕێ بەیرووتییە ژوورێکیان،لە هوتێلێکی شەقامە فەرعییەکانی ئەو گەڕەکە بەکرێ گرت، و هێشتا جانتاکانیان نەکردبوونەوە کە هووەیدا خۆی بە شەقامەکانی شاردا کرد. دەیەویست پاریس‌و گەورەیی پاریس لەنیزیکەوە بناسێ. دەیگوت: "هەر گەڕەکێکی پاریس کەسایەتیی جیاوازی خۆی، مێژووی خۆی، و مێژوولکەی تایبەت بە خۆی هەیە."[١٩٠] هەرلەو حاڵەدا دەتگوت لەو گەڕەکانە ئەوەندەش غەریبە نیە. دەیگوت: "لەسەر لاتەختەکانی مەدرەسەی ناوەندیی فەڕانسەیی بەیرووت، پاریس و فەڕانسەیان بەتەواوی هێنابووە مێشکی ئێمەوە."[٢٠٠]

خۆشـــییەكانی پـــاریس زووتێپـــەڕ بـــوون. تـــەنیا دوای دوو ڕۆژ، هووەیدا ناچار بوو ئەوشارە بەجێ بێڵێ و بچێتە لەندەن. بەڕواڵەت لە شیكردنەوەی هۆیەكانی دەرچوونی خێرای خۆی لە پاریس، هووەیدا دەیەویست هێندێ لایەنی ڕاستییەكە بشارێتەوە. دەیگوت: "ساڵێكی پێ دەچێ تا ئەمن دەچمە زانكۆ. دەمەوێ ساڵێك وەختی خۆم سەرفی شارەزابوون لە زمانی ئینگلیسی بكەم."[۱۰] هۆ ڕاستەقینەكانی سەفەری بۆ لەندەن ئاڵۆزتر بوون و زۆرتر دەچوونەوە سەر پەلەی وی بۆ گەیشتن بە ئوروپا. لەوڕۆژانەدا، چوون بۆ زانكۆكانی فەڕانسە پێویستیی بە تێپەڕاندنی دیپلۆمێكی دووقۆناخی هەبوو. هووەیدا كە بۆ دەرچوون لە بەیرووت زۆر بەپەلە بوو و هەرلەوكاتەدا نیگەران بوو كە هەڵگیرسانی شەڕ سەفەرەكەی بۆ پاریس تێك بداتەوە، پێش تەواوبوونی قۆناخی دووەمی دیپلۆمەكەی، بەیرووتی بەجێ هێشت. بەجۆرێكی دیكە بڵێین، چوونی بۆلەندەن نەك بۆ بەهێزكردنی زمانی ئینگلیسی، بەڵكوو بۆ تەواوكردنی قۆناخی دووەمی دیپلۆمەكەی بوو.[۱۱]

ئەمیر عەبباس بە قەتار لە پاریسەوە چووە كەنارەكانی فەڕانسە. كەشتییەكی چووكەڵەی فەڕانسەیی ئەوی گەیاندە كەناری ئینگلیستان و لەوێشەوە چووە لەندەن. لە لەندەن لە پانسیۆنێك نیشتەجێ بوو، و لە ئەنستیتووی فەڕانسەیی ئینگلیستان، هەڵكەوتوو لە گەڕەكی كەنزینگتۆن ناوی خۆی نووسی. جگە لە فێربوونی زمانی ئینگلیسی و دۆستایەتی دەگەڵ ڕێنە ماهوو* كە ئەودەم مامۆستای خۆشەویستی هووەیدا بوو و دواتر بوو بە یەكێك لە دۆستە نیزیكەكانی و ماوەیەكیش سەرۆكایەتیی یۆنیسكۆی لە ئەستۆ بوو، هیچ شتێكی لەندەنی پێ خۆش نەبوو. نۆ مانگی ناخۆشی ڕابواردن. دیارە لە لەندەنیش هەروەك بەیرووت، بە پیاوێكی تەڕپۆش دەژمێردرا. لەو وێنانەی ئەودەمیدا كە وەدەست ئێمە كەوتوون، دەبینین كە هەمیشە جلوبەرگێكی لێوەشاوەی دەبەردایە. جارێك شاپۆی لەسەر بوو و ڕۆژگارێك پاپیۆنی لێ دەدا. لە هەموو

* Rene Maheu.

تەمەنیدا ئۆگرییەکی سەیری بەکراسی سپی هەبوو. هەر بۆیە بوو کە تەنانەت لەدەورانی سەرۆک وەزیرییشیدا هەرجارێک دەچووە ئورووپا، دووجینێک (دەرزەن) کراسی سپیی "لانڤەن"* ی دەکڕی.[23] دووکەڵ و تۆزوخۆڵی شاری لەندەن هووەیدایان ئازار دەدا. بەگاڵتەیەکی تاڵەوە دەیگوت: "ئەگەر کراسی سپی دەبەر کەی، پاش چەند سەعات ڕەش دەبێ."[240]

هووەیدا بیست و هەشتی ئاوریلی١٩٣٩، نامەیەکی بۆ ڕێنە دوومان یەکێک لەدۆستانی لە گرووپی تەمپلەرەکاندا نووسی. بەگلەیی نووسیبووی کە: "لە ئینگلیستان هەوا هەمیشە خەراپ...و لە لەندەن هەمیشە ساردە. خۆشی لەخۆتان کە هێشتا هەتاوی لوبنانتان هەیە..."[250] لەبەشێکی دیکەی هەر ئەو نامەیەدا ، هووەیدا هێندێک غەیبەتی دۆستە بەیرووتییەکانی دەکا. لەڕاستیدا هەموو ژیانی ئۆگرییەکی تایبەتیی بە غەیبەت هەبوو. سەرەنجام هووەیدا لەم نامەیەدا بە ڕاوێژێکی شیرین، هێندێ شتی لەبارەی نەخشی ژنان لە ژیانی پیاواندا نووسیبوو. دەیگوت: "ناپلیۆن گوتوویە "لە هەموو مەسەلەیەکدا شوێنی ژنان هەڵگرە". ئەمن دەڵێم لەهەر مەسەلەیەکدا شوێنی کچان هەڵگرە. هەمیشە گوتوومە کچانی جحێڵ سەرێکی یەکجار ملهوڕانەیان هەیە."[26] ڕاوێژی ئەم نامەیەو هەروەها سروشتی پێوەندیی هووەیدا دەگەڵ ڕێنە دەتوانین بە نموونەیەک بزانین کە لە درێژایی ژیانی هووەیدادا دووپاتە دەبۆوە. ئەو دەگەڵ ژنان زیاتر حەزی لە دۆستایەتی دەکردو کەمتر ئەهلی عیشق بوو.٠زۆر لە ژنان ئەویان لە ڕیزی دۆستانی خۆیاندا دادەنا. لەبەرامبەردا ئەوانەی دەکرێ هووەیدا بە مەعشووقی خۆیان بزانن، کەمن.

هووەیدا لەماوەی نۆ مانگدا هەموو ئەو پۆلانەی گوزەراند کە بۆ چوونی زانکۆ لە فەڕانسە پێویست بوون. ئاواتی لەمێژینەی بۆ ژیان لە پاریس خەریک بوو وەدی دەهات . بەڵام لەنەکاو قەیرانێک لە

---

* Lanvin.

پێوەندییەکانی ئێران و فەڕانسەدا پەیدا بوو. یەکێک لە بڵاوکراوە گاڵتەنووسەکانی پاریس ناوی فەڕانسەیی پشیلە "شاای دەگەڵ شای فارسی تێکەڵ کردبوو و قسەیەکی خۆشی لێ ساز کردبوو. ڕەزاشا پیاوی ئەو جۆرە گاڵتەیە نەبوو، و بە نیشانەی نارەزایی لەو کارە باڵیۆزی ئێران لە فەڕانسەی بانگ کردەوە. دیارە ئەو قەیرانە زۆری نەخایاند، بەڵام لە ئاکامی ئەودا هووەیدا لە وەرگرتنی ڤیزای خوێندن لە فەڕانسە بێبەش کرا. لێرەدا بڕۆکسێل و زانکۆ ئازادەکەی تەنیا ڕێگەی نەجات بوون. هووەیدا نێوەڕاستەکانی مانگی ژوئەنی١٩٣٩ بلیتێکی قەتاری بۆ بڕۆکسێل وەرگرت و هەرلەوکاتەشدا دڵی خۆی بەوە خۆش دەکرد کە هەر دەگەڵ چاکبوونەوەی پێوەندییە دیپلۆماتییەکان، ئەویش دەچێتەوە پاریس.[٤٧]

لە سنووری بێلژیک، بۆی دەرکەوت کە پاسپۆرتەکەی لێ ون بووە. هەرچەند ناباکۆف بەهەق دەڵێ ژیاننامەنووسان نابێ لێکدانەوەی دەروونناسانە بکەن،[٤٨] بەوحاڵە ناتوانین نەڵێین داستانی "ونبوونی" پاسپۆرت، نوێنگەیەکی بەرچاوی ئەوجۆرە "هەڵخلیسکان و لەبیرچوونەوانە"یە کە فرۆید باسی کردوون و ئەوانی بە بەرهەمی هەستی ناوشیاری مرۆڤ زانیوە.[٤٩] بەهەرحاڵ ئەمیر عەبباسیان بەپێچەوانەی ویستە ناوشیارەکەی خۆی، لەشاری سنووریی بێلژیک لە قەتار دابەزاند. چارەیەکی نەبوو جگە لە گەڕانەوە بۆ پاریس. باڵیۆزخانەی ئێران لە پاریسیش لە ئاکامی قەیرانەکەدا داخرابوو. لەوانە بوو هووەیدا چەند مانگێک لە پاریس سەرگەردان بێ. دەیگوت تەنیا دڵخۆشیی لەو ڕۆژەدا ڕۆمانێکی ئاگاتا کریستی بوو کە لە ئێزگەی سنووریی قەتار کڕیبووی.[٣٠]

بەڵام لە پاریس شانسی هێناو پاسپۆرتەکەی لەبەشی "شتە ونبووەکان"ی ئێزگەی قەتار دۆزیەوەو بێ دواکەوتن وەڕێ کەوت بۆ بڕۆکسێل.

ڕۆژی شەشی مانگی ژووئیەی١٩٣٩ لە کۆلێژی زانستە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی زانکۆی ئازادی بڕۆکسێل ناونووسیی کرد.

ژووریکیشی لە خەوگەی خوێندکاری بەکرێ گرت. بەشی زانستە سیاسییەکان‌و ئابووریی بۆ خوێندن دیاری کردبوو. جگەلەوە، لە نامەیەکدا بۆ یەکێک لە دۆستانی نووسیبووی کە دەیەوێ دەورەیەکیش لە بەشی ڕۆژنامەنووسیدا بگوزەرێنێ.[21] وا دیارە هەرگیز وەدوای ئەم فکرەی نەکەوت. چوونکە لە کارنامە زانکۆییەکەیدا نیشانەیەک لە دەرسی ڕۆژنامەنووسی نیە.

هووەیدا، هەرچەند توانیبووی بە ئاسانی لە زانکۆ ناونووسی بکاو بەسانایش جێیەکی گونجاوی بۆ ژیان دەست کەوتبوو، دڵی بە بڕۆکسێل خۆش نەبوو. ئەوێی بە شارێکی غەمبارو دڵتەنگ دەزانی. بە سکاڵا دەیگوت: "بە بەراورد دەگەڵ پاریس، بڕۆکسێل بۆنی لادێی لێ دێ."[22] پێم وایە، هووەیدا ئەوڕۆژانە ئەوەندە نوقمی فەرهەنگ‌و زمانی فەڕانسەیی بوو کە تەنانەت ڕەخنەکانی لە بڕۆکسێلیش وەک بۆچوونی پڕتانەو تەشەری فەڕانسەییەکان لەوبارەیەوە دەچوون. نەک هەر پێی وا بوو بڕۆکسێل گوندێک زیاتر نیە، بەڵکوو بە باوەڕی وی خەڵک "قەڵافەتێکی خەماوییان [هەیە]... لێرە شکڵ‌و شێوەی مرۆڤەکان فەرقی هەیە، دەکرێ بڵێین خەڵکی ئێرە زۆرتر وەک شیمالییەکان دەچن. پیاو دەبێ زۆر خۆی ماندوو بکا تا لێیان حاڵی بێ... بەسەرداکەوتوو و "بۆرژوا"ن... [هیچ شتێک] کاریان تێ ناکاو ڕوونیان ناکاتەوە."[23]

لە زانکۆش هووەیدا، وەک سەردەمی ناوەندی قوتابییەکی مامناوەندی بوو، بیرەوەرییەکانی‌و کارنامەی زانکۆشی هەردووکیان ئەوڕاستییە پشتڕاست دەکەنەوە. ئەو تەنیا سێ ساڵ لە زانکۆی ئازاد دەرسی خوێند. تاکۆتایی ساڵی یەکەم، بەهیوا بوو کە هەم بەشی زانستە سیاسییەکان‌و هەم بەشی ئابووری بخوێنێ. لە ساڵی دووەمدا فکری بەشی ئابووریی وەلانا. لەوەودوا، هەموو هەوڵی خۆی بۆ بەشی زانستە سیاسییەکان تەرخان کرد. ساڵی یەکەمی بە پلەی "قبووڵ" گوزەراند، واتە شتێکی وەک جیم لە سیستمی فێرکاریی ئێراندا. نمرەکانی ساڵی دووەمی باشتر بوون‌و بە پلەی مومتاز واتە دەوروبەری "ب" دەرچوو. ساڵی سێیەمیشی، کە دواساڵی خوێندنی

بوو، هەر بەنمرەی "قبوول" تەواو كرد.[24] (هووەیدا كاتێك لە لووتكەی دەسەلاتی سیاسیدا بوو سەفەری بێلژیكی كردو سەرێكی زانكۆی ئازادیشی دا. دەوڵەتی ئێران كۆمەگێكی زۆری بەو فێرگەیە كردبووو كاربەدەستانی زانكۆش لەبەرامبەردا كۆبوونەوەیەكی سوپاس و رێزدانانیان بۆ هووەیدا پێك هێنابوو. سەرۆكی زانكۆ هووەیدای بە یەكێك لە خوێندكارە درەوشاوەكان ناو برد. ئەمجار نۆرە قسەی هووەیدا هات. بە راوێژێكی پڕلە قسەی خۆش و هێندێ جار بەژان یادی رۆژانی خوێندكاریی خۆی كردەوەو باسی كرد كە چۆن لەو رۆژانەدا، بۆ وەرگرتنی نمرەی قبوولی، دایم بە شوێن مامۆستاكانیدا رای كردوە.)[25]

لە زانكۆش، هەروەك سەردەمی ناوەندی، ئەدەبیات ومێژوو بە دەرسی خۆشەویستی هووەیدا دەژمێردران. بەشی زۆری دەرسەكانی لەبارەی ماف و مێژووی رۆژگاری كۆن و سەدەكانی نێوەراست و رۆژگاری نوێدا بوون. چەند بابەتێكیشی لە بەشی "زانستی موستەعمەرەكان" هەڵ بژاردن كە بابەتی سەرەكییان حكوومەتی بێلژیك لە كۆنگۆ بوو.

هووەیدا لەم دەورەیەدا هێندێ دۆستی تازەی پەیدا كردن و پاش ماوەیەك خەوگەی زانكۆی بەجێ هێشت و ژوورێكی لە ماڵی پیرەژنێكی مێهرەبان و قرنیسی بێلژیكی بەكرێ گرت. خاوەن ماڵ ئامادەكردنی سێ ژەم خواردنیشی وەئەستۆ گرتبوو. ئەو سەردەمە فیلم وكتێب بەشی بنەڕەتیی ژیانی هووەیدایان پێك دەهێنا. ئەو حەزی بە داهێنان و فەرهەنگ دەكرد. هەرلەوكاتەدا هونەری پەیداكردن و ڕاگرتنی دۆستانیشی باش دەزانی. بەشێكی گرنگی بیرو هۆشی تیژی خۆی بۆ دیتنەوەی لقە گوڵ و دیاریی گونجاوو وشەی جوانی ئەوتۆ بەكار دەبرد كە بتوانێ ئەم دۆستەی دڵخۆش بكاو ئەوی دیكە وەتەماع بخا. لەئەڵقەی بەربەرینی دۆستەكانیدا، هەمیشە چەند نووسەرو ڕووناكبیریش دەبینران. بەكۆمەگی ئاڵوگۆڕی فكری دەگەڵ ئەودۆستە ڕووناكبیرانە برەوو جووڵانی دەدا بە ژیانی فكریی خۆی. ئەگەرچی

لاوەتیی خۆی لە جەرگەی ئاڵوگۆڕێکی مەزنی مێژووییدا دەگوزەراند، بەڵام لێ بڕابوو وەک ئاوارەیەک ژیانێکی خۆش و بنیاتنەر بۆخۆی پێک بێنێ.

مانگی مەی(ئەیار)ی ۱۹٤۰ ئەڵمان هێرشی کردە سەر بێلژیک و برۆکسێلی داگیر کرد. زانکۆ پەکی کەوت و زۆربەی دانیشتووانی شار هەڵاتن. تەنانەت خاوەن ماڵەکەی هووەیداش شاری بەجێ هێشت و بەم جۆرە هەموو ماڵەکە کەوتە بەر دەستی خۆی. خزمەتی پۆستەش ماوەیەک تووشی وەستان بوو. هەم پێوەندیی هووەیدا دەگەڵ بنەماڵەکەی و هەم ئەو مانگانەیە کە دایکی بۆی دەنارد پچڕا. لەوجەنگەیەدا، هەرچەند بێ دراوو دەست تەنگ بوو، بەڵام پاریس هەروەک جاران ختووکەی دەدا.[36] دەگەڵ باڵیۆزخانەی ئێران لە برۆکسێل پێوەندیی گرت. هەم داوای کۆمەگی ماڵیی لێ کردن و هەم داوای کۆمەگ بۆ وەرگرتنی ڤیزای فەڕانسە. کاربەدەستانی ئێران لە هیچ کام لەو بوارانەدا سوودێکیان بۆی نەبوو. هووەیداش بەناچاری "بەتەواوی لە باڵیۆزخانەی خۆمان" نائومێد بوو.[37] لەجیاتیان پەنای بۆ ڕێگە چارەیەکی دیکە برد کە زۆر پڕمەترسی بووو دەگەڵ ڕووحییەی خۆپارێزیی وی ڕێک نەدەهاتەوە.

ڕۆژی سێزدەی مەی(ئەیار)ی ۱۹٤۰، یەکێک لەدۆستە ئێرانییەکانی، دەگەڵ خێزانی دەچووە فەڕانسە. خەبەری بە هووەیدا دا کە دەتوانێ ئەویش دەگەڵ خۆی بەرێ. هووەیدا گوتی: "قبوولمە... دەوروبەری سەعات دووی پاش نیوەڕۆیە بەدوامدا هات... چەند شتی کە زۆرم ئۆگری پێیانە هەڵم گرتن و دەستم لە کەلوپەلەکانی دیکەم نەدا. بۆدواجار بەخەفەتەوە ئاوڕێکم لە کتێبەکانم دایەوە کە ئەوەندەم خۆش دەوێن. ئەمە کتێبی بیرەوەرییەکانی ئاندرەژیدە. سەرەنجام ئەوم هەڵ گرت."[38]

شێواوی و بێ سەرەوبەرەیی شەڕ جادەکانی خەتەرناک کردبوون. چەند گوندی بۆمباراانکراو، ڕیزێکی درێژی لۆرییە سوپاییەکان و کاروانێکی بێبڕانەوە لەو ترومبێلانەیان بەجێ هێشت کە لەبەر ستوونی

سەرکەوتووی سوپای نازی هەڵ دەهاتن. لە یەکێک لە گوندەکان قەڵەباڵغییەکی زۆری خەڵک لە پەنای ترومبێلێک ئەوانیشی ناچار کرد ڕاوەستن. تەرمی سووتاوی لاوێک لەگۆشەیەک کەوتبوو. هووەیدا دەڵێ: "یەکەمجار بوو دەگەڵ مەرگ بەرەوڕوو دەبووم... ڕشانەوەو دڵشێوانێکی سەیرم تووش بووو دەربڕینە پڕژانەکەی بوودلێر لەبارەی لەشی ڕزیوی مرۆڤەوەم زۆر بە زەقی هاتە بەر چاو."[٣٩]

ڕۆژی سێ شەممە ١٤ی مانگی مەی ، دوای شەوێکی پڕنیگەرانی، لە ماڵی دۆستێک لە شاری مانتز*، هەڵکەوتوو لە سنووری بێلژیک و فەڕانسە، هووەیداو هاوڕێیەکانی بۆ گەڕان لەماڵ وەدەرکەوتن. شەقامەکان پڕلە سەربازی ئینگلیسی، فەڕانسەیی و بێلژیکی بوون. کاربەدەستانی پۆلیسی شار لە هووەیداو دۆستەکانی وەشک کەوتن و ئەوانیان بردە کەلانتەری. هووەیدا نەک هەر کارتی پێناس و پاسپۆرتی بە ئەفسەری نیگابان نیشان دا، بەڵکوو هەوڵی دا پێشی نیشان بدا کە چەندە لەمافی نێونەتەوەیی، مافی شارستانی و مافەکانی تاک شارەزایە. تەنانەت لەبارەی ڕیشەکانی شۆڕشی فەڕانسەشەوە زۆری قسە بۆ کرد. بەتازەیی چەند دەورەیەکی لەبارەی مافی نێونەتەوەیی، مافی گشتی و مافی شارستانییەوە گوزەراندبوو. بەڵام ئەفسەری نیگابان گوێی نەدایە زانیارییەکانی هووەیداو ئەوو هاوڕێیەکانیی ناردە زیندان. هەرچەند گیرانی هووەیدا چەند سەعاتێکی زیاتر نەکێشا، بەڵام ئەمە یەکەمین ئەزموونی وی لە بەندیخانە بوو.[٤٠] لەماوەی ٢٤ سەعاتدا بۆ کاربەدەستانی پۆلیس دەرکەوت کە بەڵگەنامەکانی کەسایەتیی هووەیدا ساختە نین و ئەویان دەگەڵ هاوڕێیەکانی لە زیندان ئازاد کرد.

ئەزموونی زیندان هاوڕێیەکانی هووەیدای لە چوونی فەڕانسە پەژیوان کردەوە. بەڵام هووەیدا بڕیاری خۆی دابووو ڕۆژی دواتر دەگەڵ دۆستێکی دیکەی ئێرانی، بە پێیان بەرەو پاریس وەڕێ کەوت دەڵێ: جادەی چۆڵی مانتز بۆ سنووری فەڕانسە ئێستا وەک شەقامێکی

---

* Manz.

شاری لێ هاتبوو، بەڵام شەقامێک کە لەوێدا هەموو خەڵکەکە هەر بۆلایەک دەڕۆن."[٤١] مەودای نێوان شارو پێگەی سنووری دەوری حەفتا کیلۆمیتر دەبوو. جارجار چەند فڕۆکەی بۆمباهاوێژی ئەڵمانی لە ئاسمان دەردەکەوتن. هووەیدا دەگەڵ ئاپۆرای بێلژیکییە ترساوەکان، لەمبەرئەوبەری جادە لەنێو دەوەنە سەوزەکاندا، جێ حەشارگەو پەناگەیەکی دەدۆزیەوە.

کاتێک سەرەنجام گەیشتنە پاسگای سنوور، چاوەڕوانییەکەیان زۆری نەخایاند. ئەفسەری فەڕانسەیی خێسەیەکی لە پاسپۆرتی هووەیدا کردو هەرکە دیتی ڤیزای چوونی فەڕانسەی وەرنەگرتوە، لێبڕاوانە فەرمانی دا کە ڕێگایەکی نیە جگە لە گەڕانەوە بۆ برۆکسێل. ڕوونکردنەوەی هووەیدا لەبارەی سەختیی وەرگرتنی ڤیزا لە برۆکسێل سوودێکی نەدا. ناچار بە ڕێگایەکی دیکەدا بۆی چوو. ئەمجار هەوڵی دا دڵی ئەفسەرەکە بەدەست بێنێ. بۆی باس کرد کە "لە هەموو خوێندن و پێگەیشتنمدا خۆم بەقەرزداری فەڕانسەییان دەزانم." دەیگوت: "میللەت و دەوڵەتی فەڕانسە هەمیشە دەگەڵ ئێرانییان بە لوتفەوە جووڵاونەوە."[٤٢] بەڵام ئەفسەری فەڕانسەیی بایەخێکی بە هیچکام لەو ڕوونکردنەوانە نەدا؛ بەڕاشکاوی گوتی تەنیا ڕێگای چارەسەری گیروگرفتی هووەیدا گەڕانەوە بۆ برۆکسێل و وەرگرتنی ڤیزایە.

لە گەڕانەوە بەولاوە چارەیەک نەبوو. هووەیدا شەوێ لە مانتز مایەوەو لەوێ بۆیەکەمجار بۆمبارانێکی شەڕی دووەمی جیهانیی بە چاوی خۆی دی. دەڵێ: "ئەمن دەلەرزیم و ئارەقێکی ساردم لەسەر نێوچاوانم هەست پێ دەکرد."[٤٣] ڕۆژی دواتر گەڕایەوە برۆکسێل. دووبارە بڕیاری دا هەرچی زووە ڤیزای فەڕانسە وەربگرێ. چۆوە ژوورە بەکرێیەکەی، لەو ماڵە کە هێشتا بێ خاوەن بوو. بەڵام هیچی لەگیرفاندا نەبوو. بۆخۆی دەیگوت: "لاوێکی بیست و دووساڵە بەخۆی و چوار فرانکەوە لە شارێکی بێگانە." وەسبەینێڕا داوای یارمەتیی لە کاربەدەستانی زانکۆ کرد. پۆلەکان هەموو بە فەرمانی سوپای ئەڵمان داخرابوون.[٤٤] حەوشەی زانکۆش کرابوو بە ناوەندی عەمەلیاتی خاچی

سوور. هووەیدا، ۱۹ی مانگی مەی (ئەیار) وەک شۆفێری ئامبۆلانس لەلای خاچی سوور دامەزرا.

تازە مەسەلە ماڵییەکەی بەوجۆرە چارەسەر ببوو کە قەیرانێکی دیکە ڕووی دا. لە یەک قسەدا، هووەیدا دەگەڵ مەترسیی لەدەست چوونی ماڵە گەورەو ڕەحەت و خۆڕاییەکەی بەرەوڕوو بوو. دووبارە پەنای بۆ باڵیۆزخانەی ئێران بردو ئەمجارە بە پێچەوانەی جاری پێشوو، کاربەدەستانی ئێرانی خێریان بە نێوچاوانەوە بوو. بەڵگەیەکی ڕەسمییان بە دوو زمانی فەڕانسەیی و ئەڵمانی دایە کە لەودا بەڕاشکاوی گوتیان ماڵی جێگای دانیشتنی هووەیدا بەشێک لە باڵیۆزخانەی ئێرانە. بەکۆمەگی ئەم بەڵگەیە، ماڵەکە لە مەترسیی زەوتکردنی ئەڵمانییان پارێزرا.[٥٩]

دوای ماوەیەک پۆلەکانی زانکۆ لەژێر چاوەدێریی گەشتاپۆدا کرانەوە. ژیانی هووەیداش بەرەبەرە باری ئاسایی بەخۆوە گرت. ڕۆژانە هەم دەچووە زانکۆو هەم لە خاچی سوور کاری دەکرد. پاش ماوەیەکی کورت لە جیاتی لێخوڕینی ئامبۆلانس کارێکیان لە ئیدارەی پەنابەرانی شەڕ پێ سپارد. جگە لەوە، لەبەر هۆیەک کە زۆر ڕوون نیە، ماڵی گوازتەوە خەوگەی زانکۆ. نانی لە کافەتێریای زانکۆ دەخواردو کاتەکانی دیکەی لە ئەڵقەی بەرینی دۆستە کانیدا بەسەر دەبرد.

بەڵام لەنەکاو پێشهاتێکی چاوەڕواننەکراو ڕووی دا. ڕۆژی چاردەی ژوئەن (حوزەیران)ی ۱۹٤۰ پاریس گیراو کەوتە دەستی نازییەکان. ئەمە دڵی هووەیدای زۆر شکاند. "نا، ئیدی باوەڕ بەم خەبەرە ناکەم. ناوێرم باوەڕبکەم. نا، ئەم خەبەرە بۆ باوەڕپێکردن نابێ." گوتی: "فەڕانسە! خاکی ئازادی، پەنادەری ڕاکردووەکان! ئەتۆ تەسلیم دەبی؟ دەست لەشەڕ هەڵ دەگری؟ ئەوشەوە وێڕای هەموو دۆستە فەڕانسەییەکانم بۆ بەدبختیی تۆ گریام، چوونکە ئەمن هەمیشە تۆم خۆش ویستوە. فەڕانسەی خۆشەویست، فکرم بەرەو تۆ دەفڕێ. ئەتۆ بەچۆکدا هاتی، بەڵام هێشتا ناوی تۆ لە مێشکی مندا دەگەڵ جوانترین دیمەنەکان و شارەکان دەستەملانە."[٦٠]

هەر لەو بیرەوەرییانەدا، هوەیدا باسی ئەودەمەش دەکا کە بیستوویەتی ئێران لەلایەن هاوپەیمانەکانەوە داگیر کراوە. دەڵێ: "ئێران، ئێرانی خۆشەویست، هەموو زەینم ئێستا لەلای تۆیە..."[47] ئەگەرچی راوێژی گێڕانەوەی هوەیدا لەبارەی لەحزەی بیستنی خەبەری داگیرکرانی ئێران و فەرانسە هەردووکیانەوە پڕە لە هەست و سۆز، بەڵام، پێم وایە لەجۆری ئەو هەستەدا کە لەهەرکامێکیاندا دەری بڕیوە هێندێ جیاوازی دەکرێ وەبینین. هوەیدا بەئاشکرا لە بیستنی خەبەری شکانی فەرانسە، ئەو قەلا پتەوەی ئازادی و ئەو سەرچاوەی شارستانەتییە دوچاری غەم و نائومێدییەکی زۆر بووە. هەرلەوکاتەدا بەڵێنی ئەمەگداریی ئەبەدی بەو وڵاتە تێنشکاوە دەدا کە کابەی ئاواتە رووناکبیرییەکانی بووە. بەرامبەر بەوە، کاتێک ئاماژە بە داگیرکرانی ئێران دەکا، نوختەی حەرەکەتی ئەو هەستەیە کە میللەتی هەژارو بێلایەنی ئێرانیش بە ئاگری شەڕێکی ئورووپاییەوە سووتاوە. ئەمجار نیگەرانی لەوەزعی بنەماڵەکەی دەردەبڕێ و دەڵێ بەتایبەتی پەرۆشی دایکی بووە. لەیەک قسەدا، هاوپێوەندیی دوولایەنەی هوەیدا بە ئێران و فەرانسەوە دەکرێ لە جۆری ئەو دەربڕینەدا وەبینین کە لە هەرکامێکاندا بەکاری هێناوە. یەکیان بەستراوەییەکی فکری و خەماوی و ئەوی دیکە هەست و سۆزێکی پڕ لە بەزەیی.

هاوینی ساڵی ١٩٤١ سەرەنجام دوای هەوڵوتەقەلایەکی زۆر ڤیزای پێویست بۆ چوونەپاریسی وەرگرت. لەجێدا نازییەکان رووی خۆشیان بە هاتوچووی بێگانەکان لە وڵاتە داگیرکراوەکاندا نیشان نەدەدا. بەڵام بە وتەی هوەیدا، تەنیا هەڵاواردن لەو حوکمە لەبارەی ئەو کەسانەدا بوو کە لە ڕەگەزی "ئاریایی" بوون.[48] دەڵێ ئیدی لە برۆکسێل هەڵی نەدەکرد. هەموو شتێک، تەنانەت چێژوەرگرتن لە سەماش جیرەبەندی بوو. سانسۆری کاربەدەستە ئەڵمانییەکان گاڵەی دەکرد. پاکەتە پۆستییەکانیان دەکردنەوەو نامەکانیان دەخوێندنەوە. دەڵێ لەم هەلومەرجەدا "پەنام بۆ پاریس برد". دیارە جگە لە هەموو ئەوهۆیانە، جگە لە ئۆگریی لەمێژینەی بە پاریس، هۆیەکی تازە هەڵپەی پاریسی

دووچەندان کردوە. هووەیدا لە گێڕانەوەی سەفەری پڕکارەساتی خۆی بۆ پاریسدا –گێڕانەوەیەک کە زۆرتر وەک ستایش و سەردوولکەی شارێکی داگیرکراو دەچێ- باسێکی ئەو هۆ تازەیە ناکا. بە بێدەنگییەکەی بە ڕواڵەت دەیەوێ خۆی لەکردنەوەی ئەو نهێنییە سەربەمۆرە کە پاریس بوو ببوێرێ. تەنیا ئاماژەی بەو هۆ تازەیە دەتوانین لەو دوو وشەیەی "ڕەگەزی ئاریایی"دا ببینین.

کاتێک نازییەکان فەڕانسەیان داگیر کرد، هێندێ وڵاتی وەک ئێران نەک هەر پێوەندیی خۆیان دەگەڵ فەڕانسەی داگیرکراو پچڕی، بەڵکوو دەفتەرەکانی باڵیۆزخانەی خۆیان لە شاری پاریسیشیان داخست. خانووبەرەی باڵیۆزخانەی ئێران کەوتە دەستی ئەبولحەسەنی سەرداری* کە جحێڵترین برای ئەفسەرولملووک بوو. ئەو پیاوێکی بەتوانا بەڵام بە چاوڕاو بوو، هەرلەوکاتەدا زۆریش بەئەدەبو ئەخلاق بوو، و پیاوێکی شارەزاو دنیادیتووش بوو. دیپلۆماتیکی پیشەیی بووو پێش هێرشی نازییەکان، بەرپرسایەتیی کاروباری کونسوولیی باڵیۆزخانەی ئێران لە پاریسی بەئەستۆوە بوو. بە زاراوەی باوی ئەمڕۆ، بە پیاوێکی زرینگ دەژمێردرا. دۆستگرو ڕەفیقباز بوو. دەگەڵ هێندێک لە سەرانی سوپای داگیرکەری ئەڵمان لە پاریس بوو بە دۆست. لە باڵیۆزخانەی ئێران لە پاریس میوانداریی ڕازاوەی لێ دەکردن و خاویارو شامپاینی خۆڕایی دەدانێ و بۆ کەیف و نەهەنگی وان کچی

---

* دەڵێن لەئێرانی سەدەی بیستەمدا"هەزار بنەماڵە" هەموو سامانو دەسەڵاتیان دەدەستی خۆیان گرتوە. دەتوانین گۆشەیەکی ئەو ڕاستییە لەو نوکتەیەدا ببینین کە نەک هەر سەرداری خاڵی هووەیدا بوو،بەڵکوو باڵیۆزی ئەودەمی ئێران لە فەڕانسەش ناوی ئەنەوشیرەوانی سوپەهبودی بوو کە دەبووە مێردی پووری هووەیدا. دیارە بە پێچەوانەی ئەوەی لەبارەی "هەزار بنەماڵە"وە باوە،ڕاپۆرتێکی سیا لەساڵی١٩٧٧دا ئیددیعا دەکا کە "لە ئێرانی سەدەی بیستەمدا، دەوری چل بنەماڵە لەڕادەی سەرتاسەری و ١٥٠ تا ٢٠٠ بنەماڵە لە پلەی ناوچەییدا هەموو جمگەکانی دەسەڵاتیان لەدەستی خۆیاندا قۆرغ کردوە" بڕوانە:.Cia "Iran in The 1980s"NSA. No1210

جوانیشی بۆ بانگ دەکردن. دەلاڵی وی بۆ ئەوکارە یەکێک لە ژنە جوانەکانی پاریس بەناوی ئەلکساندریا بوو.[49] ئەو میوانداریيانەی سەرداری هەم بۆخۆی سەرچاوەی قازانجێکی زۆری ماڵی بوون، و هەم ژیانی هێندێک لە یەهوودییانی پاریسیان ڕزگار کرد.

لەسەردەمی شەڕدا ژمارەیەکی بەرچاو لە یەهوودییانی ئێرانی لە ئەڵمان و وڵاتانی داگیرکراوی دەستی نازییەکان دەژیان. ژمارەیەک لەو یەهوودییانە لە پاریس بوون. هەرکە یەکەمین نیشانەکانی کوشتاری یەهوودییانی ئورووپا دەرکەوتن، دەوڵەتی ئێران هەوڵی دا بە نازییەکان بسەلمێنێ کە یەهوودییە ئێرانییەکان بەشێک لە قەومی یەهوود نین، چوونکە دووهەزارو پێنسەد ساڵ لە ئێران ژیاون و بەتەواوی تێکەڵ بە فەرهەنگ و زمانی ئێران بوون و یەکسەر بوونە ئێرانی. ئەو ڕاستییە کە زۆر لە یەهوودییەکانی ئێران لە پاسپۆرتەکانیاندا باسێکی ئایینی خۆیان نەکردبوو، و ئەگەر کردبووشیان لەجیاتی وشەی یەهوودی، وشەی مووسەوییان بەکاربردبوو، کۆمەگی بەو ئیددیعایەی ئێران دەکرد.[50] سەرەنجام نازییەکان سەلماندیان کە یەهوودییانی ئێران "یەهوودی" نین، بەڵکوو "بەشێک لە فیرقەیەکی موسوڵمانن و ڕیشەی ئێرانییان هەیە، نەک سامی"[51] بەم جۆرە کەم و زۆر، گیانی هەموو یەهوودییانی ئێرانیی نیشتەجێی ئورووپا ڕزگاری بوو.

ڕاست لەوکاتەدا کە لە بەرلین "بەرپرسان و پسپۆڕانی کاروباری ڕەگەزی" خەریکی ڕاگەیشتن بە ئیددیعاکەی ئێران بوون، لە پاریس سەرداری "بە کەلکوەرگرتن لە پێوەندیی نیزیکی دەگەڵ ئەڵمانییەکان، گیانی بنەماڵە یەهوودییە ئێرانییەکانی نیشتەجێی پاریسی لە مەرگی مسۆگەر ڕزگار کرد. ئەویش بەنۆرەی خۆی بە کاربەدەستە ئەڵمانییەکانی سەلماندبوو کە هەرکەس پاسپۆرتی ئێرانیی هەبێ، بەستراوەیی ئایینیی هەرچییەک بێ ئێرانییەو هەموو مافێکی هاونیشتمانانی هەیە. ئەو لە نامەیەکدا بۆ ئاتۆ ئابێتز* لە کاربەدەستە

* Otto Abetz.

پایەبەرزەکانی ئەڵمان لە فەڕانسە پێی لەسەر ئەوە داگرت کە یەهوودییە ئێرانییەکان ماوەی نیزیک بە دووهەزارو پێنسەد ساڵ، هاونیشتمانی تەواو هەقی ئێران بوون.[52] جگە لەوە ئاماژەی بە ڕیشەی ئاریایی هاوبەشی ئێران‌و ئەڵمان کرد. ئابێتز لە وەڵامدا بەڵێنی دا کە یەهوودییە ئێرانییەکانی دانیشتووی پاریس "وەبەر قانوونی تایبەتیی نازییەکان ناکەون."

جگە لەوە، سەرداری دەستی بە هەزارو پێنسەد پاسپۆرتی ئێرانی ڕادەگەیشت. کاتێک ساڵی ١٩٤٢ نازییەکان دەستیان بەگرتنی یەهوودییەکانی پاریس کرد، سەرداری بڕیاری دا ئەو پاسپۆرتانە بەناوی بەشێک لە یەهوودییانی غەیرەئێرانی دەربکا. یەک دووساڵ دواتر، بڵاکراوە ئێرانییەکان لەو بەسەرهاتە ئاگادار بوون‌و بەڕاوێژێکی توندو ڕەخنەگرانە، پرسییان بۆچی سەرداریان دەگەڵ فرۆشتنی پاسپۆرت بە "جەهوودان"یش لەسەر کار لانەبردوە. گومانێک نیە کە سەرداری گیانی ژمارەیەک لە یەهوودییانی نەجات داوە. هەرلەوکاتەدا، وا دێتە بەرچاو کە لەم کارەدا قازانجی خۆشی مەبەست بووە. دیارە یەهوودییە ئێرانییەکانی دانیشتووی پاریس، بایەخێکیان بەو بەشەی چالاکییەکانی وی نەدەدا. بە وتەی فەرەیدوونی هووەیدا، "ساڵی ١٩٤٨ ئەمن لە پاریس بووم وەختێک ئەندامانی کۆمەڵەی یەهوودییە ئێرانییەکانی دانیشتووی پاریس(دەگەڵ"هاونیشتمان" تازە ئێرانییەکان) هاتنە سەردانی خاڵم، [سەرداری]، بەنیشانەی ڕێزو سوپاس سینییەکی زیویان بۆ هێنابوو کە ئیمزای سەرۆکانی کۆمەڵەی یەهوودییانی لەسەر هەڵ کەندرابوو."[53]

هەرچەند هووەیدا کاتێک موعامەلەی ئەو پاسپۆرتانە* لە ئارادا بوو

---

* بەڕواڵەت تەنیا لە باڵیۆزخانەی ئێران لەپاریس نەبوو کە دیپلۆماتە ئێرانییەکان پاسپۆرتی ئێرانییان بەشێوەی سەرداری بەکار هێنان. ئەحمەدی تەوەککولی کە بۆخۆی یەکێک لە دیپلۆماتە بەرچاوەکانی ئێران بوو، دەیگوت دەوری ١٥٠٠ یەهوودیی سووریەیی و لوبنانییش بە پاسپۆرتی ئێرانی گیانی خۆیان ڕزگار کرد. (ئەحمەدی

چەندین جار سەردانی پاریسی کردبوو، لەبیرەوەریی دووروودرێژی خۆی لەبارەی دەورانی شەڕدا هیچ ئاماژەیەک بەو بابەتە ناکا. لەبەرامبەردا باسی وەزعی پڕاپەڕی تیئاتر لە پاریس‌و نەخشی حیزبی کۆمۆنیستی فەڕانسە لە خەبات دژی نازییەکان‌و ئەو ڕاستییە دەکا کە ئەو "زۆربەی کاتەکان بەتەنیا لە شەقام‌و کۆڵانەکانی ئەو شارەدا کە لە هەموو شتێکیدا جوانییەکی شاعیرانە هەیە"، خەریکی گەڕان بووە.[٥٤]

هووەیدا، بێجگە لە پشووی هاوینان لە هەر دەرفەتێکی دیکەش بۆ سەردانی پاریس کەلکی وەردەگرت. سەرەڕای ئۆگریی سۆزو فکریی ناوبراو بەوشارە، لەوکاتەدا هۆیەکی سادەی دیکەش بۆ سەفەر بەپاریس پەیدا ببوو. لە بڕۆکسێل، ژیانی هووەیدا بەرتەسک‌و فەقیرانەو خوێندکاری بوو؛ بەڵام لە پاریس ڕۆژگاری بە ڕازاوەیی دەگوزەراو هەمووجۆرە خواردن‌و خواردنەوەیەکی زۆرباشی لەبەر دەم بوو. دوای هەر سەفەرێکی پاریس، ڕوخساری کزو داتەپیوی خڕوپڕیی خۆی وەردەگرتەوە.[٥٥]

ساڵی ١٩٤١ هووەیدا خوێندنەکەی لە زانکۆی ئازادی بڕۆکسێل تەواو کردو لیسانسێکی لە بەشی زانستە سیاسییەکاندا وەرگرت. وەک نامە (تز)ی دەورەی لیسانس، وتارێکی درێژی لە بارەی بەرهەمەکانی پانائیت ئیستراتییەوە* (١٨٨٤-١٩٣٥) نووسی. ئیستراتی نووسەرێکی بەئەسڵ ڕوومانی بوو. لە زۆر بارەوە ژیانی وەک ژیانی هووەیدا دەچوو.[٥٦] وەک هووەیدا فەڕانسەدۆست بوو؛ لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست و ناوچەکانی باڵکان زۆر گەڕابوو. ڕۆژگارێک هەوای مارکسیزمی لەسەردا بووو سەفەری یەکیەتیی سۆڤیەتی کرد. کاتێک گەڕایەوە، هەروەک ئاندرە ژید، کە یەکی دیکە لە ئوولگووە فکرییەکانی هووەیدا

---

تەوەککولی،وتووێژ دەگەڵ نووسەر،تامپا،فلۆریدا،١٥ی نووتی ١٩٩٩)  داستانی نەخشی ئێران لە نەجاتی یەهوودییانی ئێرانی‌و کۆمەگی دیپلۆماتەکانی وەک سەرداری، پێویستیی بەلێکۆڵینەوەیەکی وردو بەردەوام هەیە.

* Panait Istrati.

بــوو، ڕەخنەیــەکی تونــدی لــەدژی سیاســەت و ژیــانی ئــەو ویرانــە تازەکوورەیــە نووســی.[٥٧] هووەیــداش بــەجیێلی زۆر لــە بەرهەمــە مارکسیستییەکانی خوێندبوونەوەو دەگەڵ زۆر لە مارکسیستە ئێرانی و عەرەب و فەڕانسەییەکان دۆست بوو. هەر لەبەر ئەو دوو شتەش زۆر لە لایەنگرانی سەرسەختی شا هەمیشە ئەویان بە ڕووناکبیرێکی چەپ دەزانی کە ناتوانێ ئیسلاح بێ. لە بەرامبەردا، بە باوەڕی زۆر کەس لە ڕووناکبیرانی ئێران کە پتر لە ژێر کاریگەریی بیروبۆچوونی شۆڕشگێڕانەی ڕووسیدا بوون، کتێبخوێندنەوەی بێ بەرنامەی هووەیداو ئۆگریی بە کەسانی وەک مالرۆ، ئیستراتی، نیچەو ژیدەوە، حەزی لە خۆشییەکانی ژیانی بۆرژوایی، بێزاریی لە شۆڕش و سەرەنجام ئامادەیی ناوبراو بۆ سازان، ئەویان کردبوو بە ڕووناکبیرێکی فریودەرو ڕواڵەتباز.

هووەیدا پاش تەواوکردنی خوێندنەکەی، سەرەتای ساڵی١٩٤٢، جارێکی دیکە سەفەری پاریسی کرد. لەوێ دوای ماڵئاوایی لە "شاری ڕووناکی بە "دڵێکی غەمبارەوە"، لە حاڵێکدا "لەلایەک ئێران و لەلایەک پاریس" خوتخوتەیان دەدا، چووە بەیرووت. هاوینی لەوێ دەگەڵ دایکی و براکەی بەسەر برد.[٥٨] خەرمانانی ١٣٢١ (١٩٤٢) گەڕایەوە ئێران- و داستانە پڕهەراوهۆریایەکەی خاڵی بەجێ هێشت. بەڵام پێنج ساڵ دواتر، پاریس دووبارە بۆوە ناوەندی هەراوهۆریای دیپلۆماتی و بوو بە خۆراکی بڵاوکراوە هەنگامەسازەکانی ئێران. ساڵی١٣٢١ (١٩٤٢) هووەیدا بە ئاسانی دەیتوانی ئەو دەنگۆیانە کە بەدوای سەرداریێوە بوون پشت گوێ بخا، بەڵام لەسەفەری دوایەی بۆ پاریسدا بوو بە یەکێک لە مۆرە زۆر جیددی و سەرەکییەکانی قەیرانێکی تازە. ئاکامەکانی ئەو قەیرانە هەتا مرد بەدوایەوە بوون.

# سەرچاوەکان

۱. فریدون هویدا، گفتگو با نگارنده، ۷ فوریه ۱۹۹۹.
۲. هویدا، «یاد ایام تحصیل در اروپا»، ص ۳۳۶.
۳. پیشین، ص ۳۳۶.
۴. پیشین، ص ۳۳۷.
۵. پیشین.
6. Claude Levi-Strauss, *Tristes Tropiques* (Paris, 1983), 405.
۷. برای دستیابی به بحثی جامع‌تر در خصوص همین نگرش‌ها و گرایش‌های سنت نوین روشنفکری فرانسوی، یا به قول یکی از منتقدان «بی‌حسی‌ی معنوی‌ی جمعی، و شیفتگی با ایده‌ها به زیان واقعیت» ر.ک.
Tony Judt, *The Burden of Responsibility: Blum, Camus, Aron and the French Twentieth Century* (Chicago, 1999).
هویدا خواننده‌ی حریص آثار آرون و کامو بود.
۸. هویدا، «یاد ایام جوانی»، ص ۳۳۷.
۹. برای بحثی درباره‌ی این مباحثه مابین روشنفکران عرب، ر.ک.
Fouad Ajami, *The Arab Predicament* (New York, 1992).
۱۰. برای دستیابی به بحثی درخصوص نقش خاص فرانسه در چشم‌انداز روشنفکری ایران در نیمه‌ی نخست قرن بیستم، ر.ک. کریستف بالای، پیدایش رمان جدید فارسی، تهران، ۳۷۷.

۱۱. هویدا، «یاد ایام تحصیل در اروپا»، ص ۳۳۷.
۱۲. پیشین.
۱۳. پیشین، ص ۳۳۸.
۱۴. پیشین.
۱۵. پیشین.
۱۶. پیشین.
۱۷. پیشین.
۱۸. برای دستیابی به بحثی پیشگام و روشن در باب فکلی‌ها، ر.ک.: سیّد فخرالدین شادمان، تسخیر تمدن فرنگ، تهران، ۱۳۲۶.
۱۹. هویدا، «یاد ایام تحصیل در اروپا»، ص ۳۴۴.
۲۰. پیشین، ص ۳۴۶.

۲۱. امیر عباس هویدا، «یاد ایام خدمت وظیفه‌ی افسری در دانشکده‌ی افسری»، در سالنامه‌ی دنیا، دوره‌ی بیست و پنجم، ص ۳۷۲.
۲۲. فریدون هویدا، گفتگو با نگارنده، دوم فوریه ۱۹۹۹.
۲۳. اطلاعات درباره‌ی علاقه‌ی او به پیراهن‌های سفید در گفتگوی نگارنده با همسرش، لیلا، در پاریس به تاریخ دوازدهم مارس ۱۹۹۹ کسب شد.
۲۴. هویدا، «یاد ایام تحصیل در اروپا»، ص ۳۴۴.
۲۵. امیر عباس هویدا، مکاتبه‌ی خصوصی با رنه دومان، ۲۸ آوریل ۱۹۳۹.
۲۶. پیشین.
۲۷. هویدا، «یاد ایام تحصیل در اروپا»، ص ۳۴۵.
۲۸. برای دستیابی به مروری مختصر بر برخی مباحثه‌های اخیر در باب ماهیت زندگی‌نامه‌نویسی به‌عنوان یک نوع ادبی و دیدگاه‌های ناباکف، ر.ک.:
Allison Light, "The Mighty Mongrel: Biography as a Literary Form," *New Statesmen and society*, 17 December 1993, 65.
29. Sigmund Freud, *The Psychopathology of Everyday Life*, trans. James Strachy (New York, 1997).
۳۰. هویدا، «یاد ایام تحصیل در اروپا»، ص ۳۴۵.
۳۱. امیر عباس هویدا، نامه‌های خصوصی به رنه دومان، ۱۳۱۸.
۳۲. برای شرحی در باب دیدگاههای فرانسه نسبت به فرهنگ بلژیک، ر.ک.:
Luc Sante, *The Factory of Facts* (New York, 1998).
۳۳. هویدا، «یاد ایام تحصیل در اروپا»، ص ۴۹ - ۳۴۵.
۳۴. در بلژیک، فقط دانشجویان و بستگان نزدیک آنها به کارنامه‌های دانشجو می‌توانند دست پیدا کنند. اما با یاری‌های مهربانانه پی‌یر مورلت، وکیل دعاوی ناحیه‌ی بروکسل، و برادرم دکتر حسین میلانی، که در دانشکده‌ی پزشکی آن دانشگاه درس خوانده است، رئیس دانشگاه با مهربانی موافقت کرد که من از مدارک تحصیلی هویدا رونوشت بردارم.
۳۵. برای دستیابی به شرحی درباره‌ی سخنرانی هویدا در این مراسم، من به صحبتهای محمد صفا، یکی از کارکنان دفتر وی و از معتمدانش که وی را در سفر بلژیک همراهی می‌کرد، استناد کردم. محمد صفا، گفتگو با نگارنده، ۲۱ نوامبر ۱۹۹۷.
۳۶. امیر عباس هویدا، «یادداشتهای زمان جنگ»، سالنامه‌ی دنیا، دوره‌ی بیست و یکم، صص ۳۳-۳۲.
۳۷. پیشین، ص ۳۶.
۳۸. پیشین.

۴۹. فریدون هویدا، گفتگو با نگارنده، هشتم فوریه ۱۹۹۸.

50. Ahmad Mahrad, "Iranian Jews in Europe during W.W.II," in *The History of Contemporary Iranian Jews,* Center for Iranian Jewish Oral History, vol. 3 (Beverly Hills, 1999), 59–109.

از سالها پیش، احمد مهراد به انجام کارهایی ابتکاری و نو، با بهره‌برداری از آرشیوهای نازی، برای تهیه‌ی گزارشهایی مستند از سرنوشت یهودیان ایرانی در اروپا مشغول است. وی چندین کتاب و رساله نیز در این باب در آلمان منتشر کرده، که از آن جمله است:

Ahmad Mahrad, *Das Schiksal Jüdischer Iraner im orient* (Hamburg, 1987).

51. Mahrad, "Iranian Jews," 34.

۵۲. فریدون هویدا، نامه به کمیته‌ی ملّی سیاست خارجی امریکا، ۱۹۹۷.

۵۳. فریدون هویدا، نامه به کمیته‌ی ملّی، ۱۹۹۷.

۵۴. هویدا، «یادداشتهای زمان جنگ»، ص ۵۰.

۵۵. فریدون هویدا، گفتگو با نگارنده، ششم دسامبر ۱۹۹۷.

۵۶. فریدون هویدا، گفتگو با نگارنده، ۱۷ فوریه ۱۹۹۸.

57. *Le Robert*, vol. 3 (Paris, 1984).

۵۸. هویدا، «یادداشتهای زمان جنگ»، ص ۵۷.

# سەرزەمینی سەمەرەکان

هووەیدا ساڵی ١٣٢١ (١٩٤٢) پاش بیست ساڵ دووری گەڕایەوە ئێران. تاران شارێکی داگیرکراو بوو. دیارە نە تاران ئیدی گوندە هەڵمساوەکەی بیست ساڵ پێشتر بوو، نە هووەیداش ئیدی ئەو منداڵە دووساڵەیە بوو کە شاری بە سواری عارەبانە بەجێ هێشتبوو. بەڵام تارانی وەختی ڕۆیشتنی هووەیدا لانی کەم لە شتێکدا وەک تارانی ١٣٢١ دەچوو. هەردووک جار شارو [وڵات] خەریکی ئاڵو گۆڕ بوون.

٢٤ی گەلاوێژی ١٣٢٠ (١٩٤١)، ساڵێک پێش گەڕانەوەی هووەیدا، ئێران کەوتە بەر پەلاماری هێزەکانی ڕووس وئینگلیس. (٣٥) هەزار سەربازی ئینگلیسی، لەوانە تفەنگدارانی هیندیو چەرکا لە جنووب و (١٢٠) هەزار سەربازی سوپای سوور لە شیمالەوە هێرشیان کردە سەر ئێران. سوپای ئێران هەم لەباری ژمارەی نەفەرەکانو، هەم لەبابەت چەندو چۆنی ئیمکاناتەوە، چەند جار لە دوو هێزی پەلاماردەر لاوازتر بوو. بۆیە بەرگرییەکی وای نەکردو لەماوەی چل و هەشت سەعاتدا لەبەریەک هەڵوەشاو تەسلیم بوو.

گەلاڵەی هێرش بۆسەر ئێران یەکەمجار دەیەی دووەمی پووشپەڕی ساڵی ١٣٢٠ (١٩٤١) لە کۆبوونەوەی ئەنجومەنی وەزیرانی ئینگلستاندا کەوتە بەر باس و لێکدانەوە.[1] هاوپەیمانان کە وا دیارە لە بیانوویەک بۆ پەلاماردانی ئێران دەگەڕان، بوونی ژمارەیەک هاونیشتمانی ئەڵمانی لە ئێرانیان کردە بیانوو، و بێئەوەی گوێ بدەنە ڕاگەیاندنی بێلایەنیی ئێران، وڵاتیان داگیر کرد. دەیانگوت، داگیرکردنی ئێران بۆ سەرکەوتن

پێویستە. لەلایەک دەیانەویست زاڵبوونی ئینگلستان بەسەر بیرە نەوتەکانی خەلیجی فارسدا مسۆگەر بکەن‌و لەلایەکی دیکە، دوای هێرشی ئەڵمان بۆ سۆڤیەت، ئێرانیان بە شارێگای کۆمەگی سەربازی بە شووڕەوی دەزانی. دیارە ژمارەی ئەڵمانییەکان لە ئێران نەدەگەیشتە هەزار کەسیش. جگە لەوە هەمووشیان لەژێر چاوەدێریی توندی پۆلیسی ئێراندا بوون. یەکێک لە ئاکامەکانی داگیرکردنی ئێران، و ڕەنگە یەکێک لە هۆ بنەڕەتییەکانیشی، لادانی ڕەزاشا لە پادشایەتی بوو. ناسیۆنالیزمی وی دەگەڵ پڕۆژەکانی دەوڵەتی "فەخیمە"ی ئینگلستان لە ئێران‌و لە خەلیجی فارس نەدەگونجا. بۆیە ئینگلستانیش لە دەرفەتێک دەگەڕا بۆ ڕووخاندنی ڕەزاشا، و شەڕ بووە بیانوویەکی باش بۆ ئەوکارە.

ئینگلستان لە هەر دەرفەتێک بۆ سووکایەتی‌کردن بە ڕەزاشا، کە پیاوێکی لەخۆبایی‌و ڕێبەرێکی ملهوڕو نوێخواز بوو، کەلکی وەرگرت. تەنانەت باس لەوە دەکرا کە ڕۆژگاری بنەماڵەی پەهلەوی بەسەر چووە.[٢] بەڵام سەرەنجام هاوپەیمانان بەتایبەتی ڕووس‌و ئینگلیس ڕێگەیان دا حەمەڕەزای لاو لەسەر تەختی پادشایەتیی بابی دانیشێ. دیارە لە تەواوی دەورانی شەڕدا، هاوپەیمانان بەکردەوە شایان بە نەبوو دادەنا. لەهەموو بوارەکاندا جۆرێکیان ڕەفتار دەکرد کە وابزانە ئەو هەر نیە. بۆ وێنە، کۆنفرانسی تاران بێ پرس‌وڕاو تەنانەت بێ ئاگاداریی شا پێک هات. ئەویش تا مابوو ئەو بێ ڕێزییەی لەبیر نەچوو، و خەتابارانی هەرگیز نەبەخشی. لە هەمووی خەراپتر ئەوە بوو کە وەختێک ڕۆزڤێڵت‌و چەرچیل‌و ستالین گەیشتنە تاران، تەنیا ستالین چووە سەردانی شا. لە یەک قسەدا، هاوپەیمانان دەسەڵاتی تەواو بوون‌و شا تەنیا داوەڵێک بوو.

سەردەمی داگیرکرانی ئێران، سەردەمی نوێخوازیی هونەری‌و باسێکی بەسوودی سیاسی بوو. زۆر هۆی جۆراوجۆر کۆمەگیان بە پەیدابوونی ئەو دەورانە دەوڵەمەندە فەرهەنگی‌و دیموکراسییە کرد. سانسۆرو زەبروزەنگی سەردەمی دیکتاتۆریی ڕەزاشا، و بەدەسەڵاتیی ناوبراو، پشووی لە هێزە داهێنەرەکانی کۆمەڵ بڕیبوو. لەتەواوی ئەو ساڵانەدا، ویستی هاوبەشیی سیاسیی حەشیمەتی ڕۆژلەڕۆژ زیاتری

شارەکانی ئێران پشت گوێ دەخراو سەرکوت دەکرا. بە ڕووخانی ڕەزاشا، ئەو هێزە سەرکوتکراوانە گیانێکی تازەیان هاتەوە بەرو چالاکیی فکریو سیاسیو فەرهەنگی برەوێکی بێوێنەی پەیدا کرد.[۳]

شەڕ نفووزی ئەمریکا لە ئێرانیشی بردە سەرێ. لە دوو دەیەی هەوەڵی سەدەی بیستەمدا، ئینگلستان بەهەموو هێزیەوە پێشی هاتنی کۆمپانیە ئەمریکاییەکان بۆ ئێرانی دەگرت. بەڵام لەساڵەکانی دوای شەڕدا، نفووزی ڕوولەزیادبوونی ئەمریکا لەجیهان و ئێراندا، چەرچیلی نیگەران کرد. ڕەنگدانەوەی ئەو نیگەرانییە لە هێندێک نامەی وی بۆ ڕۆزڤێڵتدا دەتوانین ببینین. لە یەکێک لەو نامانەدا کە بۆگەنی خۆبەفیرعەونزانینی ئیستیعماریی لێ دێ، ئاماژە بە نیگەرانیی چەرچیل لەبارەی ئێرانەوە دەکاو دەنووسێ[٤] : "داوام لە وەزارەتی دەرەوەو پسپۆڕانی نەوتی خۆم کردوە کە مەسەلەی نەوتی [ئێران] لێک بدەنەوە، بەڵام دڵنیابن ئێمە بەچاوی کڕیار تەماشای مەیدانە نەوتییەکانی ئێوە ناکەین. وەڵامی چەرچیلیش بەقەدەر نامەی ڕۆزڤێڵت، پڕ لە خۆبەزلزانیو لووتبەرزی بوو: "زۆر سوپاس کە بەچاوی کڕیار تەماشای مەیدانە نەوتییەکانی ئێمە ناکەن. ڕێگا بدەن منیش لەبەرانبەردا ئێوە دڵنیا بکەم کە بەهیچ جۆر نیازمان نیە دەست بۆ قازانجو مڵکەکانی ئێوە لە عەرەبستانی سعوودی درێژ بکەین."[٥]

لەحاڵێکدا ڕۆزڤێڵتو چەرچیل خەریکی دابەشکردنی مەیدانە نەوتییەکانی خەلیجی فارس بوون*، ستالینیش کە هەوای دەسەڵات-سەپاندن لەسەری دابوو، لە داگیرکردنی ئێران بۆ دامەزراندنی حیزبێکی

---

* نامەکانی چەرچیلو ڕۆزڤێڵت لە بارێکی دیکەشەوە سەرنجڕاکێشن. لە کۆتایی شەڕی یەکەمدا، ئینگلیستان نیگەران بوو ئێران پێوەندی دەگەڵ ئەمریکاو وڵاتانی دیکەی ڕۆژئاوا دامەزرێنێ. بۆیە لە هەموو توانای خۆی کەلکی وەرگرت تا نەهێڵێ ئێران لە کۆنفرانسی ڤێرسایدا بەشدار بێ. لە نێوەرۆکی نامەکانی چەرچیلو ڕۆزڤێلتدا بەئاسانی دەتوانین ئەوە بخوێنینەوە کە بە تەواوبوونی شەڕی دووەم تای تەرازوو بەلای ئەمریکادا قورستر بووە.

کۆمۆنیستی گوێلەمستو بەرفەرمانی خۆی کەلکی وەرگرت. هەر لەوکاتەدا، حیزبی تازە نیگەرانی دژکردەوەی توندی هێزە مەزهەبیو خۆپارێزەکان بوو، و هەربۆیەش خۆی لە دانانی ناوی حیزبی کۆمۆنیست پاراست، و لەجیاتی وی ناوی بەڕواڵەت بێ خەتەری حیزبی توودەی هەڵ بژارد. حیزبی توودە بەهۆی دیسیپلینە ڕێکخراوەییەکەی، و هەروەها بەهۆی ئەوە کە پشتی بە "برا گەورە"ی قایم بوو، خێرا پەرەی ئەستاندو لە سیاسەتی دە ساڵی دواتری ئێراندا ڕۆڵێکی بنەڕەتیی گێڕا..بەشێک لە دۆستانی سەردەمی بەیرووتی هووەیدا، یەک لەوان جەلالی میری، چوونە ڕیزی ئەندامان یان لایەنگرانی حیزبەوە. ساڵەکانی دواتر ، هێندێک لە ڕێبەرانی حیزبی توودە تەنانەت ئیددیعایان کرد کە هووەیداش ماوەیەک لەنێو لایەنگرانی حیزبدا بووە.[٦] دیارە ڕێبەرانی حیزب تائێستا بەڵگەیەکیان بۆ پشتڕاستکردنەوەی ئیددیعای خۆیان نیشان نەداوە. بەهەر حاڵ، پاش دامەزرانی حیزبی توودە، بیروباوەڕی مارکسیستی بەخێرایی لە ئێراندا برەوی پەیدا کردو بەسەر مێشکو زمانی ڕووناکبیراندا زاڵ بوو.

لەوڕۆژانەدا، بەشێکی گرنگ لە پیاوە ئایینییەکانیش لایەنگری خوێندنەوەیەکی تازە لە ئیسلام بوون، دەیانگوت دەبێ بارە دوورلەئەقڵو لەباوکەوتووەکانی شیعەگەری وەلا بنرێن. ئەوان ئایینی گریانپەرستیونەریتی لەسنگدانو هەوای مۆجیزەیان بە بارە لەباوکەوتووەکانی ئیسلام دەزانی. زۆر لەو باوەڕانە لەژێر کاریگەریی بیرمەندو مێژوونووسی عورفیمەسلەکی بەناوبانگ ئەحمەدی کەسرەویدا بوونو لە بیروڕاکانی وی وەرگیرابوون.[٧] بەڵام هەر لەوساڵانەدا، ئاخوندێکی تاڕادەیەک نەناسراو کەوتە بەربەرەکانیی ئەو خوێندنەوە تازەیە. ناوی ڕووحوڵڵا خومەینیو ئامانجی بەرگری لە بایەخە نەریتییەکانی شیعەگەری بوو. هەرلەوکاتەدا بۆ یەکەمجار بناخە تیئۆرییەکانی ویلایەتی فەقیهی دامەزراند. بۆچوونەکانی ڕووحانییە نوێخوازەکانی بە خەتەرناک دەزانینو ڕاست سیوحەوت ساڵ پێش ئەو کاتەی دادگاکانی شۆرش، هووەیداو هەزاران کەسی دیکەیان بەناوی

"مفسد في الأرض" دادگایی کرد، ئەو لە "دەوڵەتی ئیسلام"ی دەویست کە "هەمیشە دەگەڵ ڕێوشوێنە ئایینیو مەزهەبییەکاندا بێو پێشی ئەو بڵاوکراوانە بگرێ کە پێچەوانەی قانوونو دینو کەسانێک کە ئەو قسە پڕوپووچانە دەکەن لەبەر چاوی لایەنگرانی دین ئیعدام بکاو ئەو فیتنەگەرانە کە"مفسد في الأرض"ن لەسەر زەوی لابەرێ تا فیتنەهەڵایسێنان ئیدی فیتنەو دووبەرەکی نەنێنەوەو دەستی خەیانەت بۆ لای پیرۆزییە دینییەکان درێژ نەکەن والسلام."[80]

ڕەفتاری حەمەڕەزاشاش هێندێ جار بێ ئەوەی بیەوێ بانگەوازی بۆ گۆڕین دەکرد. پادشای لاو مرۆڤێکی شەرمێونو لەخۆبەگومان بوو. توانای پڕکردنەوەی جێگای بابی لەخۆیدا شک نەدەبرد. نموونەی زەقی ئەو پێوەندییە دژوارە دەتوانین لە وێنەیەکدا ببینین کە دەگەڕێتەوە ساڵی ١٣٠٥ (١٩٢٦). ئەوکاتە، "باوک چلوهەشت ساڵەو کوڕەکەی حەوت ساڵە بوو. شا بابایەکی بەخۆوەو بەهێز بە ڕوویەکی گرژەوە، دەستی لەبەر پشتێنی نابوو و قنج ڕاوەستابوو. لە پەنا وی منداڵێکی ڕیوەڵەی ڕەنگ پەڕیوو بێ حەوسەلە دەبینرا. حاڵەتێکی ڕەسمیو گوێ-لەمستی هەبوو. بەژنی نەدەگەیشتە پشتێنی بابیشی."[90] جلوبەرگی کوڕەکە، بێ کەموزیاد، لەجلوبەرگی بابی بوو. ڕاست شازدە ساڵ دوای ئەو وێنەیە، کوڕ لەنەکاو لەسەر تەختی بابی دانیشتو کوڕی ئەو مەیدانەش نەبوو.

ڕەزاشا نوختە لاوازەکانی کوڕی خۆی باش دەناسین. وەختێک حەمەڕەزا، وەک جێ نشین لە بابی پرسیبوو کە ئامانجی بنەڕەتیی حکوومەتەکەی چییە، ئەو لە وەڵامدا گوتبووی دەیەوێ حکوومەتێک دامەزرێنێ کە بتوانێ پاش خۆشی بم بمێنێو کاروباری وڵات بەڕێوە بەرێ. حەمەڕەزاشا قسەکانی بابی بە نیشانەی بێمتمانەیی ناوبراو بەخۆی دەزانێ. قسەکانی ڕەزاشای بەجۆرێک بێڕێزیو بێ متمانەیی دادەنا. دەیگوت زۆرم لێ گران هات کە بابم تا ئەوڕادەیە دەرهەق بەمن بێمتمانە بوو."[10]

شای لاو تینووی ئەوە بوو کە نەک هەر هاوپەیمانان، بەڵکوو سیاسەتمەدارانی ئێرانیش ئەو بە هێند بگرن. لەو ڕۆژگارەدا شا، لەباری سیاسییەوە کەموزۆر پەراوێز خرابوو. قەواموسسەڵتەنە سەرۆک وەزیری بەتوانای ساڵەکانی دوای شەڕ، ڕۆڵێکی گرنگی لە پەراوێزخستنی شادا یاری کردبوو. شا دەیەوست لە پەراوێزەوە بگاتە ناوەند. دەیەویست جڵەوی دەسەڵات بەدەستەوە بگرێ. هەربۆیە لەوڕۆژانەدا، بۆ پەیداکردنی هێزو هاوپەیمان هێندێ قسەی کردن کە سێبەرەکەیان دواتر قورسایی دەخستە سەرپادشایەتییەکەی. ساڵی١٣٢٥ (١٩٤٦)، ڕوو بە کۆمەڵێک لە پیاوانی ئایینیی موسوڵمان گوتی:

ئەمن خۆشحاڵم کە دەبینم ئەم دواییانە گیانێکی یەکیەتی لەنێو خەڵکدا پەیدا بووەو بەرەبەرە شارەزای مافەکانیان دەبن. قسەکانی بەڕێزانیش ئەوەیان پێوە دیارە.

بەڕێزان باشتر دەزانن کە ئێران دوو دەستە پادشای هەبوون. پادشا باشەکان‌و پادشا خەراپەکان. دەستەی دووەمیش دوو تیرە بوون. ئەوانە کە خەراپەیان کردو ئەوانە کە نەیانتوانی خەراپە بکەن.

بە باوەڕی من بەرپرسایەتیی ئەو دەستەیە کە خەراپەیان کردوە دەکەوێتە سەر شانی میللەت‌و خەڵک کە ڕێگەی خەراپەکردنیان بە دەسەڵاتداران داوە، چوونکە میللەت نابێ بەرامبەر بە ڕەفتاری کاربەدەستان بێ لایەن‌و بێدەنگ دانیشێ. بەڵکوو ئەگەر دیتی دەوڵەتەکان مافەکانی پێشێل دەکەن‌و قانوون بەڕێوە نابەن دەبێ ڕاپەڕێ‌و ڕێگە نەدا دەسەڵاتداران دەستدرێژی بکەنە سەر مافەکانی.

بەڵێ میللەت دەبێ شارەزای مافەکانی خۆی بێ تا ئەگەر دەستدرێژی‌یان کرایە سەر بتوانێ بەرگری‌یان لێ بکا.

یەکێک لە ئەرکە گرنگەکانی بەڕێزان حوججەتولئیسلامەکانیش ئەوەیە خەڵک وشیار بکەنەوەو دەگەڵ مافەکانیان ئاشنایان بکەن تا لەئاکامدا دەوڵەتان‌و کاربەدەستان نەتوانن کاری بێ‌جێ‌و پێچەوانەی قانوون بکەن.

سەرکەوتنی بەڕێزان لەو ئەرکە نیشتمانییەداو بەختیاریی میللەتی ئێران ئاواتەخوازم."[11]

ڕەنگە هیچ وتەیەکی دیکە بەم ڕادەیە لە ساڵەکانی دواتردا نەبووبێتە مایەی نارەحەتیی شا. جگە لەوە، شا جۆرێک هەستی خۆبەکەمزانینی تێدا هەبوو. هەر لەوکاتەدا، سووکایەتی پێکرانی لەلایەن هاوپەیمانانو هێندێک لە سەرۆک وەزیرەکانی پازدە ساڵی هەوەڵی حکوومەتەکەی بووە سەربارو کاریگەرییەکی قووڵی لەسەر جۆری پێوەندیی وی دەگەڵ هووەیدا لە نیوەی دووەمی پادشایەتییەکەیدا دانا.

ئەگەر هەموو ئەو هۆیانە بۆ برەوپەیداکردنی فەزای فکری وسیاسیی وڵات بەس نەبوون، هۆیەکی دیکەش لەئارادا بوو، کە ناوی نیل کرام کووک* بوو.[12] ئەو ژنێکی زبروزرینگی ئەمریکایی بووو ئۆگرییەکی تایبەتیی بە ئەدەبیاتی ئێران پەیدا کردبوو، و بەتایبەتی زۆر حەزی لە دەقەکانی سۆفیگەری دەکرد. ئەو بەکردەوە لەلایەن هاوپەیمانانەوە، کرابووە وەزیری فەرهەنگی ئێرانو چاوەدێری ئاکاری گشتیی وڵات.[13] لەسەردەمی دەسەڵاتی ئەودا، نەک هەر ژمارەی گۆڤارو ڕۆژنامەکانی ئێران زیادی کرد، بەڵکوو ئەو بڵاوکراوانە ئازادییەکی تاڕادەیەک بێوێنەشیان هەبوو. لەو ڕۆژانەدا، لە تاران نیزیک بە دووسەد ڕۆژنامە بڵاو دەکرانەوە[14]و. ڕاست لە لووتکەی ئەو ئاڵوگۆڕانەدا بوو کە ئەمیر عەبباسی هووەیدا گەڕایەوە ئێران. دەیەویست لە نوختەی پێکگەیشتنی ئەو ئۆگرییە فەرهەنگییە جیاوازو ناتەبایانەدا کە هەیبوون، کەسایەتییەکی بەردەوام بۆخۆی پێکەوە بنێ.

پێش گەڕانەوەی هووەیدا بۆ تاران بۆسەردانی دایکیو برایەکەی چووە بەیرووت. لەوێوە هاتە بەسرەو لە بەسرە بەلەم (قایق)ێکی چووکەڵەی بەکرێ گرتو پێی هاتەوە خاکی ئێران. ئەمجار ترومبێلێکی کۆن بردیە ئەهواز. داوای لە شۆفێرەکە کرد کە هەرێمی سنووریی ئێرانی نیشان بدا. دەیەویست بزانێ چ لەحزەیەک دەگاتەوە خاکی ئێران.

---

* Nil Cram Cook.

بە زمانێک کە نوسەرە ڕۆمانتیکە فەڕانسەییە خۆشەویستەکانیی وەبیر دێنایەوە، دەیگوت: "دەمەویست لەسەر سنوور دەمێک ڕاوەستم‌و فرمێسکی شادی‌و فرمێسکی غەم‌ودەردی خۆم پێشکێش بکەم. شادی لەوەی ئێستا وڵاتەکەی خۆم دەبینمەوە، وڵاتێک کە لەودا لاپەڕەکانی شانامەم لە زمانی فیردەوسییەوە ناسی‌و خۆشم‌ویستن‌و شێعرەکانی لەنێو باوەشی دایکمدا فێر بووم...و فرمێسکەکانیشمی لەبەر پێ دەڕێژم. وڵاتەکەم کە لە سنوورەکانیدا هێزە بێگانەکان نیشتەجێن؛ ئەو هێزە دەرەکییانە کە وەک سەرکەوتووی شەڕ لە ڕەمڵە ئارامەکانی ئێراندا ماندوویی خۆیان دەحەسێننەوە."[150] بەڵام هوەیدا تێگەیشت کە هیچ نیشانەیەکی سنوور لەئارادا نیە. ئەو ئینگلیسییەکانی بە بەرپرسی ئەو کارە دەزانی. دەڵێ ئەوانە "وەک ئاغا بەسەر عێراق‌و جنووبی وڵاتەکەمدا زاڵ بوون" و "ئاسەواری دەسەڵاتداریی ئێمەیان لەنێو بردبوو."[160]

هەربەوپێیە، باسی لەبارەی ئەهوازیشەوە، کە یەکەم شار بوو هاتە سەر ڕێگای زۆر خەفەتاوییە. نیشان دەدا کە چەندە لەبارەی وەزعی ئێرانەوە نائومێد بووە. دەنووسێ: "ئەهواز لەڕاستیدا شار نەبوو، بەڵکوو بریتی بوو لە وێرانەیەکی تاوەسووت لە تەنیشت ڕووبارێکی وشک... ڕیزەکۆڵانێکی تەنگ‌وپیس، خەڵکێکی ڕووت‌وپێخواس‌و لەهەر گۆشەیەکیش کۆمەڵێک سواڵکەر کە هەر کەسی تازەیان دەدی شاڵاویان بۆ دەبرد."[170]

بەڵام هوەیدا ئێرانی ئەودەمی هێندە نەدەناسی. وەک ونبوویەکی سەرگەردان بە شارەکانیدا دەگەڕاو تەنانەت لە تارانیش کە لێی لەدایک ببوو، ون بوو. بیست ساڵ پێشتریش لە تاران ون ببوو. ئەوجارە منداڵ بووو تازەش دەگەڵ بنەماڵەکەی لە دیمەشقەوە گەڕابۆوە تاران. جاری یەکەم ڕێگای ماڵی نەنکیی لێ ون بووو بەیارمەتیی پۆلیسێک گەیشتەوە ماڵێ. ئەم جارەش پێویستیی بە ڕێنوێنێک هەبوو. سەرەنجام بە کۆمەگی فایتوونێک کە ئەسپێکی لەڕو لاواز ڕای دەکێشا، چۆوە ئەو هوتێلەی دەیەویست بچێتەوە. لە یەک قسەدا، هوەیدا لەتاران سەرگەردان‌و ونبوو بوو. بەڵام پاریسی پێش ئەوەی ببینێ، زۆر چاک شارەزا بوو.

هووەیدا ڕۆژی دوای گەیشتنەوەی بۆ تاران پێوەندیی دەگەڵ خزمەکانی گرت. دوای چەند ڕۆژ سەرەنجام گوازتیەوە ماڵی ناسرقوڵیی سەرداریی خاڵی. ناسرقوڵی برای ئەو سەردارییەی دانیشتووی پاریس بوو. هووەیدا لەتاران دووساڵ میوانی ماڵی خاڵی بوو. مانەوەی درێژخایەنی لەوماڵە دەتوانین بە یەکێک لە نوێنگەکانی شێوەی تایبەتیی ژیانی وی بزانین. ئەو پاش گەڕانەوە بۆ ئێران لەساڵی ١٣٢١ (١٩٤٢)دا، بەدەگمەن لە ماڵێک نیشتەجێ بوو کە ئی خۆی بێ. هەرچەند لە دواساڵەکانی ژیانیدا ئاپارتمانێکی چووکەڵەی لە ساختومانی ساسانی تاران کڕیبوو، و ئەگەرچی ڤیلایەکی چووکەڵەشی لە نیزیک دەریای خەزەر هەبوو، بەڵام بەدرێژایی ساڵانی ژیانی لە تاران بەشی زۆری لەماڵی دایکی دەژیا.

دوای حەوتوویەک حەسانەوە، هووەیدا ناوی خۆی بۆ خزمەتی سەربازی نووسی. هەرلەوکاتەدا، ٢٢ی بەفرانباری ١٣٢١(١٩٤٣)، پێش چوونەسەربازی، لە وەزارەتی دەرەوەش داوای کاری کرد. ئامانجی لەوکارە وەبیرهێنانەوەی دووربینیی کەسایەتیی داستانو شانۆنامەکانی چیخۆف بوو. دەیەویست لەوڕێگایەوە دووساڵ خزمەتی سەربازییەکەی وەک خزمەتی دەوڵەتی بۆ حیساب بکرێ. دەقی داخوازی کارەکەی بەم جۆرە بوو: "ئەمن ئەمیرعەبباسی هووەیدا خاوەنی ناسنامەی ژمارە٣٥٤٢، کوڕی حەبیبوڵڵا (عەینولمولک) وەزیرموختاری پێشووی ئێران لە شانشینی عەرەبیی سعوودی، دوای تەواوکردنی خوێندنی ناوەندی لە بەیرووتو فێربوونی هەردوو زمانی فەڕانسەیی و عەرەبی بەتەواوی و ئاشنابوون دەگەڵ زمانی ئینگلیسی چوومە لەندەنو ماوەی ساڵێک ئینگلیسییەکەم تەواو کردوەو لەوێڕا چوومە بڕۆکسێلو دوای سێ ساڵ لیسانسی زانستە سیاسییەکانم لە زانستگەی بڕۆکسێل وەرگرتوەو لەونێوەدا دەگەڵ هەردوو زمانی ئیتالیایی و ئەڵمانییش ئاشنا بووم. بۆیە سەرنجی ئەو وەزارەتە بۆلای پێشینەی دووروردرێژی خوالێخۆشبووی بابمو ئەوە کە خوێندنی بەرزم لە بەشی دیپلۆماسیدا تەواوکردوە، ڕادەکێشمو داوا دەکەم

شانازیی کارمەندیی ئەو وەزارەتخانەیە بە نۆکەری خۆتان ببەخشن."[180]

وەک لە دەقی ئەم نامەیە دەردەکەوێ، هووەیدا شارەزایی خۆی لە چەند زمانی بیگانەی بە یەکێک لە گرنگترین و بەبایەخترین تایبەتمەندییەکانی خۆی زانیوە. لەوکاتەوە، زمان هەمیشە یەکێک لە ئامرازەکانی نیزیکبوونەوەی لە خاوەن دەسەلاتان بووە. جگە لەوە، ئاماژەی هووەیدا بە "ڕابردووی دووروودرێژی خزمەت"ی بابی، بەپێی قاعیدە ئیددیعای ئەو کەسانە بەرپەرچ دەداتەوە کە دەڵێن عەینولمولک لەسەر چالاکیی پڕوپاگەندەیی بەقازانجی مەزهەبی بەهایی لە عەرەبستانی سعوودیو لە وەزارەتی کاروباری دەرەوە دەرکراوە. بەجۆرێکی دیکە بڵێین، لەبەر ئەوەی ساعید، وەزیری دەرەوەی ئەو وەخت بەهایی نەبووە، ئاماژەی هووەیدا بەخزمەتەکانی بابی ئەوڕاستییە دەردەخا کە خانەنشین کرانی عەینولمولک پێوەندییەکی بە چالاکیی مەزهەبییەوە نەبووە.

هەر لەوکاتەدا دەتوانین دەقی دلخوازی کاری هووەیدا بە یەکەمین نیشانەی چاوڕاو لەبارەی پلەی خوێندەوارییەکەیەوە بزانین. ئەم بابەتە لە سەردەمی سەرۆک وەزیرییەکەیدا زیاتر پەرەی گرت. ئیددیعای هووەیدا دەربارەی "خوێندنی بەرز" لە "بەشی دیپلۆماسیدا"، تەنیا پاڵی بەوڕاستییەوە دابوو کە لە دەورانی لیسانسەکەیدا چەند دەرسێکی لەو بوارەدا خوێندبوو. بێجگە لە دوو تێرم دەرسی مافی نێونەتەوەییو پێوەندییە نێونەتەوەییەکان، چەند دەرسێکیشی لەمێژووی ئابووریو سیاسیی ئیستیعماری بێلژیک لەکۆنگۆ وەرگرتبوو.

جگە لەوە، هەرچەند لە ساڵەکانی دواتردا سەرچاوەی جۆراوجۆر- لە کتێبی بژاردەکانی ئێرانەوە بگرە تا کۆمەڵە ژیاننامە تازەکانو بەڵگەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا- ئیددیعایان کرد کە هووەیدا دوکتۆرای لە سۆربۆن وەرگرتوە، دەقی نامەکەی هووەیدا خۆی جێی گومان ناهێڵێتەوە کە لیسانسی زانکۆی برۆکسێل بەرزترین بڕوانامەی

خوێندنی بووه* [19] (دیاره ساڵەکانی دواتر لە سەردەمێکدا کە ئێران دارایی‌و سامانێکی پێکەوه نابوو، هووەیدا چەندین ماجستەرو دوکتۆرای شانازیی وەرگرتن.) لەڕاستیدا چاپی ساڵی ١٣٤٤ (١٩٦٥)ی کتێبی بژاردەکانی ئێران ئیددیعا دەکا هووەیدا پلەی ماجستەری "لە زانستە سیاسییەکان‌و ئابووریدا" لە زانکۆی برۆکسێل‌و "دوکتۆرای مێژووی لە زانکۆی پاریس" [20] وەرگرتوە. کاتێک پرسیارم لە جیهانگیری بێهرووز، دەبیرو دیزاینەری کتێبی بژاردەکانی ئێران کرد کە سەرچاوەی زانیارییەکانی لەبارەی خوێندنی هووەیداوە کامە بووه، گوتی وردەکاریی بابەتەکەو چەندوچۆنی نووسینی ئەوبابەتەی لەبیر نەماوه کە لەبارەی هووەیداوە نووسراوە. [21] دیاره هووەیدا خۆشی لەو چاوورِاوانەدا کە لەبارەی بڕوانامەکانیەوه دەکران، نەخشێکی هەبوو. ئەوسەردەمەی سەرۆک وەزیر بوو، بە سەعیدەی پاکرەوان، یەکێک لە سکرتێرەکانی خۆی گوتبوو کە: "نامە (تز)ی دوکتۆرای خۆی لەسەر پانایت ستراتی نووسیوه." [22]

سەرەنجام، دەقی داخوازی کاری هووەیدا چەندوچۆنی شارەزایی ناوبراو لەشێوەی کاری ئیداره دەوڵەتییەکانی ئەو سەردەمەی ئێران نیشان دەدا. وا دیاره ئەو نەی‌زانیوه کە وەدەستهێنانی کاروباری دەوڵەتی، بەتایبەتی لە وەزارەتی کاروباری دەرەوەدا، پێویستیی بە

---

* لە نێوەڕاستەکانی سەرۆک وەزیرییەکەیدا، دەوڵەتی هووەیدا فەرمانێکی دەرکرد کە کەلکوەرگرتن لە لەقەبی دوکتۆری لە پزیشکان و پزیشکانی ددان‌و پزیشکانی ئاژەڵدا بەرتەسک دەکردەوه. گومان لەوەدا نیە کە ئەودەم زۆرکەس هەبوون کە لە دوکانەکانی بڕوانامە فرۆشیی ئورووپاو ئەمریکا دوکتۆرایەکیان کڕیبوو و هاتبوونەوه ئێران‌و زۆر کەلکی خەراپیان لێ وەردەگرتن. بەوحاڵە هێندێک لە ڕەخنەگرانی هووەیدا، دەرکردنی ئەو فەرمانەیان بە نیشانەی حەسوودیی هووەیدا دەزانی. دەیان‌گوت هووەیدا چوون بۆخۆی دوکتۆرای نەبوو،ئەم لەقەبەی بە خەڵکی دیکەش ڕەوا نەدەدی. بائەوەش بگوترێ کە فەرمانەکەی دەوڵەت زۆریشی گوێ پێ نەدرا. (وتووێژ دەگەڵ ئەحمەدی قورەیشی،١٩ی ئۆکتۆبری ١٩٩٧).

پشتیوانی زۆر بەهێز هەیە. دیارە هوەیدا زۆر زیرەک بوو. ئەوەی نەیدەزانی زوو فێری دەبوو. زۆری پێنەچوو کە تێگەیشت پێشکەوتنی لە ئێراندا بەستراوەتەوە بە بوونی پشتیوان و "پارتی"یەکی بەهێز. سێ ساڵی پێچوو هەتا ئەو پشتیوانەی لە عەبدوڵڵای ئینتیزامدا دیتەوە. بەکۆمەگی وی، خێرا هەموو پلیکانەکانی سەرکەوتنی ئیداریی بڕین. بەڵام بۆ ئاسانکردنی کاری وەرگیران لە وەزارەتی دەرەوەدا، پەنای بۆ ئەنەوشیرەوانی سوپەهبودی برد کە لە پایەبەرزانی ئەو سەردەمەی وەزارەتی دەرەوەو مێردی پووری بوو. سوپەهبودی نامەیەکی بۆ پشتیوانی لەدامەزرانی هوەیدا نووسی.[43] هەرلەوکاتەدا هوەیدا پەنای بۆ یەکێک لە دۆستانی بابی بەناوی ئەبولحەسەنی بێهنامیش برد کە پۆستێکی گرنگی لە وەزارەتی دەرەوەدا هەبوو. بەکۆمەگی بێهنام و سوپەهبودی، هوەیدا وەک فێرکار-کارئەموز-لەدەفتەری وەزیر وەرگیرا.[44]

هەرچەند لەوڕۆژەوە کە هوەیدا داوای کاری کرد تاڕۆژیکی حوکمی دامەزرانەکەی دەرچوو، هەشت مانگی خایاند، بەوحاڵە هێندێ لە ڕەخنەگرانی هوەیدا، دامەزرانی وییان بە گوماناوی زانیوە. هێندێک لەو دژبەرانە تەنانەت ئیدیعا دەکەن کە "هێندێ دەستی ئەفسووناوی بە قازانجی هوەیدا وەکار کەوتن."[45] بەڵام بەباوەڕی من، مەسەلەی گرنگتر ئەوەیە کە بپرسین بۆچی ساڵی ١٣٢١، واتە کاتێک ژمارەی خوێندکارانی ئێرانیی زانکۆکانی ڕۆژئاوا زۆر بەرتەسک بوو، کەسێک بە پێشینەی خوێندەواریی هوەیداوە بۆ وەرگرتنی کارێک لە وەزارەتی دەرەوە ناچار بوو پاڵ بە "پشتیوان" و "پارتی"یەوە بدا. بەهەر حاڵ، حوکمی کاتیی هوەیدا وەختێک کرایە یەکجاری کە ئەو ئەزموونەی بە سەرکەوتنەوە تێپەڕاند کە بۆ وەرگیران لە وەزارەتخانە پێویست بوو.

هوەیدا هەرلەوکاتەدا هەنگاوی پێویستی بۆ دەستپێکردنی خزمەتی سەربازییەکەشی هەڵێنانەوە. لەو سەردەمەداو هەروەها لەساڵەکانی دواتریشدا، کوڕانی هەزار بنەماڵەی ئێران هەزارویەک فێڵیان بەکار دێنا بۆئەوی بەهەر جۆر بووە لەخزمەتی سەربازی ڕابکەن.

هووەیدا ئەو جیاوازییەی هەبوو کە پێموایە، تەنیا سەرۆک وەزیری سەردەمی مەشرووتە بوو کە خزمەتی سەربازیی کردبوو. بە وتەی هووەیدا لە کاتێکدا هەموو دۆستەکانی لە بیری ڕاکردن لە خزمەتی سەربازیدا بوون، ئەو خەریک بوو خۆی بۆ خزمەت ئامادە دەکرد.[26] هەرلەوکاتەدا، توانی لە وەزارەتی کاروباری دەرەوەش دابمەزرێ. کارەکەی لەوێ زۆر ناخۆش‌و لەشانان گران بوو. ئەونامانەی بۆ وەزارەتخانە دەهاتن دەی خوێندنەوە، پوختەیەکی لێ ئامادە دەکردن‌و لە دەفتەری وەزارەتدا تۆماری دەکردن. دیارە هەروەک بۆخۆی دەیەویست دەورانی خزمەتی سەربازییەکەی دوای دامەزرانی لە وەزارەت دەستی پێکردو بەمجۆرە دەورانی دووساڵەی سەربازییەکەی بوو بە بەشێک لە پێشینەی کارمەندییەکەی.[27]

وەک دەرچوویەکی زانکۆ، هووەیدا دەورانی مەشقی سەربازیی لەسەر هەڵگیراو خزمەتەکەی لە کۆلێژی ئەفسەریدا دەست پێکرد. دووبارە زانینی زمانێکی بێگانەو ئەمجارەیان ئینگلیسی، کۆمەگی کردو کرا بە وەرگێڕی دەستەیەک لەو ئەفسەرە ئەمریکایی‌یانە کە لە ئێران بوون.

لە یەکەم مانگەکانی مانەوەی لە تاراندا، هووەیدا هەم دەگەڵ دۆستە کۆنەکانی ئاشنا بۆوەو هەم هێندێ هاوەڵی تازەی پەیدا کردن. لەنێو دۆستە کۆنەکانیدا، ئەوماوەیە زیاتر دەگەڵ حەمیدی ڕەهنەما تێکەڵاو بوو کە لەو سەردەمەدا سەرنووسەری ڕۆژنامەی"ایران" بوو.[28] حەمیدو مەجیدی برای، و هەروەها بابیان زەینولعابیدینی ڕەهنەما، دواتر نەخشێکی گرنگیان لە ژیانی هووەیدادا گێڕا. دەبێ ئەم خاڵەش وەبیر بێنینەوە کە هووەیدا یەکەمین نووسینە فارسییەکانی خۆی هەر لە لاپەڕەکانی ئەم ڕۆژنامەیەدا چاپ کردن. هەر نەبێ ڕەخنە لەسەر کتێبێک‌و چیرۆکێکی کورتی بڵاو کردنەوە. هەرچەند کورتە چیرۆکەکەیم نەخوێندۆتەوە، بەڵام وەک ئیبراهیمی گولستان دەیگوت نووسراوێکی بێ ڕووح‌و کەمخوێن بووە.[29]

هووەیدا لە وەزارەتی دەرەوە دەگەڵ کەسێک بەناوی جەمشیدی میفتاح ئاشنا بوو و لەرێگای ویەوە، چاوی بە پەرویزی ناتلی خانلەری کەوت. گۆڤاری سوخەن"سخن" لەورۆژگارەدا یەکێک لە ناوەندەکانی قورسایی فەرهەنگی لە ئێراندا بوو. زۆر لە شاعیران و نووسەران- وفەیلەسووفە گەورەکانی ئێران لە هاوکارانی ئەو گۆڤارە بوون. هووەیدا، لەرێگای خانلەرییەوە دەگەڵ بەشێک لە گرنگترین ڕووناکبیرە ئێرانییەکانی ئەو سەردەمە ئاشنا بوو.

فەرانسەیی‌زانینی هووەیدا، دەستڕاگەیشتنی بە زۆر شاکاری ئەدەبیی ئورووپا، و سەرەنجام، ئۆگریی بێ‌سنووری بە کتێب هەموویان دەستیان دایە دەستی یەکو هووەیدایان هێنایە نێو کۆڕی دۆستانی هیدایەتیش هیدایەت مرۆڤێکی کەم‌وزۆر گۆشەگیر بوو. ئاکارو کرداری وەک ژیان‌و ڕەفتاری کافکا دەچوو. ڕێگای بە هەموو کەس نەدەدا بێتە نێو ئەڵقەی دۆستەکانیەوە. خەڵکی نەزان‌و ماستاوکەران و ئەوانەی دەیانەویست لەرێگای هاونشینیی گەورەپیاوانەوە ناوبانگێک بۆخۆیان پەیدا بکەن لەلای وی جێیان نەبوو. هیدایەت‌و دۆستەکانی بەوجۆرە کە دابی ڕووناکبیرانی ئەو سەردەمە بوو، ئێواران لە کافەیەک (کە عادەتەن هەر کافە فیردەوس بوو) کۆ دەبوونەوەو قسەیان دەکردن‌و باسی هەموو شتێکیان دەکرد. ساڵەکانی دواتر، ئەو کاتانە کە هیدایەت‌و هووەیدا یەکیان لەسەفەردا بوون، لە ڕێگای نامەوە دەگەڵ یەکتر لە پەیوەندیدا دەمان. جگە لەوە، هووەیدا بەزۆری لە دەرەوەڕا کتێبی بۆ هیدایەت دەناردن. هێندێ جار ڕۆمانی تازەی بۆ دەناردن‌و جاری وابوو هێندێ بەرهەمی لەبواری دەروونناسیدا بۆ دەناردن کە لە ساڵەکانی دوای شەڕدا لە فەرانسە برەوێکی بێ‌وێنەیان هەبوو.[20] ئەمریکای کافکاو چەند نووسینێکی ژان پۆل سارتەرو هێنری میلێر لەو بەرهەمانە بوون کە هووەیدا لەو ساڵانەدا بۆ هیدایەتی ناردن.[21] ساڵی١٣٣٨ (١٩٥٩) هووەیدا هاتە سەر ئەو باوەڕە کە ئەنجۆی شیرازی کە یەکێک لە دۆستانی هیدایەت بوو، بۆ کاری ئامادەکردن‌و چاپی نامەکانی هیدایەت بۆ هووەیدا هان بدا.[22]

لەبەر هێندێ هۆی ناڕوون، ئەم کارە هەرگیز نەکرا. لە هەمووش خەراپتر ئەوەیە کە زۆربەی نامەکان سەروسۆراغێکیان نیە.

لەنێو دۆستایەتییە ئەدەبییەکاندا پەیوەندیی هووەیدا، دەگەڵ چووبەک لە هەمووان بەردرێژتر بوو، و هەتا کۆتایی تەمەنیش بەردەوام بوو. چووبەکیش یەکێک لە ئەندامانی ئەڵقەی هیدایەت بوو، کە دەبێ بە یەکێک لە ڕووما گرنگەکانی داستان‌نووسیی هاوچەرخی فارسیی بزانین. ئەو هاوکات دەگەڵ هووەیدا، لە کۆلێژی سەربازی خزمەتی دەکرد. زۆر ئێواران دوای تەواوبوونی سەعاتەکانی خزمەت، ئەو دوانە پێکەوەو بە پێیان دەچوونەوە ماڵێ. لەڕێگادا لە دوکانێکی چووکەڵە لایان دەدا، داوای نیو قاپ ڤۆدکایان دەکرد. ئەو ڕۆژانە هیچ کامێکیان شتێکی وایان شک نەدەبرد. کەمێک تەماتەو خەیار، یان پاکەتێکی چووکەڵە پستە، تەنیا مەزەی ئەو خواردنەوەیە بوو. هووەیدا بەدرێژایی تەمەنی ئۆگری خواردنەوە ئەلکهولییەکان بوو. ساڵەکانی دواتر کە باری دارایی ڕێگای پێ‌دەدا، لە جیاتی ڤۆدکا سکاجی دەخواردەوە. بەرەبەرە ئۆگری شەڕابی باشی فەڕانسەش بوو. دیارە هیچ کاتێک زۆری نەدەخواردەوە. لەڕاستیدا، زۆرکەمی پێ‌دەخورایەوە. یەک دوو پێکی بەس بوون. ڕەنگی ڕوخساری دەگۆڕاو حاڵەتێکی دەم بەپێکەنین یان وەک ڕەخنەگرەکانی دەیانگوت گاڵتەجاڕی پەیدا دەکرد.[22] لەودەورانی پاک وبێگەردی لاویدا، هووەیدا هاودەمێکی زۆربەوەج بوو. گوێی بۆ قسەی خەڵکی دیکە ڕادەگرت‌و بەرامبەر بەهەرقسەیەکیان بەپرسیار بوو. بەئاسانی خەڵکی دیکە، و تەنانەت لاوەییەکانیشی، وەقسە دێناو زۆری نەدەخایاند کە متمانەی وانی بەدەست دێنا. بەئاسانی تووڕە نەدەبوو. لە ڕەفتاریدا جۆرێک بێ فیزی‌و گوێ‌نەدان بە هێندێ ڕێوشوێنی دەست‌وپێگر هەبوو. هەرلەوکاتەدا، گوت هەمیشە کەیفی سازە. هەرچەند ناحەزانی ئەمەیان بەجۆرێک بێ‌کیفایەتی‌و، تەنانەت جلفی دەزانی، بەڵام کەسانی وەک چووبەک، ڕاست ئەم جۆرە تایبەتمەندییانەیان پەسند دەکرد. چەندین ساڵ دواتر، کاتێک هووەیدا بوو بە سیاسەتمەدارێکی بەدەسەڵات، ئەم ڕەفتارەی بووە بابەتی باس‌و

ناکۆکییەکی زۆری بیروبۆچوون. هێندێ کەس ئەمەیان بە نوێنگەی ڕیابازیی هووەیداو جۆرێک خۆڕانان بە ڕەفتاری خەڵکییەوە لێک دەدایەوە. دەیانگوت هووەیدا دەیەوێ لەم ڕێگایەوە نۆکەریی خۆی بۆ دەسەڵاتدارێکی زۆردار بشارێتەوە. لەبەرامبەردا دۆستەکانی ئەم حاڵەتەیان بە نیشانەی نیهادی پاکو بێگەردی وی دادەنا. دەیانگووت ڕیشەی ڕەفتاری وی لە خۆبەکەمگریبیە سروشتییەکەیدا بووە.

چووبەک دەیگوت هووەیدا هەمیشە گوێگرێکی باش بوو. زۆری ئۆگری هەم بە باسو وتووێژی ئاسایی هەبوو، هەم بە باسە زانستیو فەلسەفییەکان. لەو دەورانی مەستییەی لاوەتیدا، مەزهەب یەکێک لە بابەتە هەمیشەییەکانی جێگای باس بوو. هووەیدا لە قوتابخانەی عورفیی فەڕانسەییەکاندا دەرسی خوێندبوو. ڕۆڵەی ڕاستەقینەی سەردەمی وشیاربوونەوە بوو. ئۆگرییەکی تایبەتیی بە ڤۆڵتێر هەبوو، و بەرهەمەکانیی بەوردی دەخوێندنەوە. کاتێک ڤۆڵتێر دەیگوت: "دەبێ ئەم پەڵەی شەرمە لەنێو ببرێ"، مەبەستی شتێک بێجگە لە مەزهەبە ڕەسمییەکان نەبوو. هووەیداش لە خۆبەخۆیایەتیدا کاتێک باسی مەزهەبی دەکرد، زۆر قسەی لە ڤۆڵتێرو نیچە دەگێڕانەوە. چووبەک ئەوی بە "خوانەناسێکی بێ ئەملاو ئەولا" دەزانی. زۆر لە دۆستو خزمانی هووەیدا لەبارەی چەندوچۆنی بیروباوەڕی مەزهەبییەوە پرسیاریان لێکردبوو. کەموزۆر جوابی هەمووانی وەک یەک دابۆوە. دەیگوت ڕقم لە مەزهەبی ڕەسمی دەبێتەوە.[٢٤] لەنێو کۆمەڵو فەرهەنگێکدا کە بە قووڵی مەزهەبی بوو، ئەو بە ڕادەیەکی بەڕاستی سەرسوڕهێن بەدوور لە هەرچەشنە ئۆگرییەکی مەزهەبی بوو. هەرچەند لە سەردەمی سەرۆک وەزیرییەکەیدا، خۆی بە دیندار نیشان دەدا، و هەر نەبێ بەڕواڵەت، ڕێ و شوێنە مەزهەبییەکانی بەجێ دێنا، بەڵام لە دەورانی کۆلێژی سەربازیدا دیار بوو بەتەواوی پەیڕەوی ڤۆڵتێرە. هووەیدا پێی وابوو مەزهەبەکان بە درێژایی مێژوو نەخشێکی نالەباریان یاری کردوە. پڕوپووچو نەزانیو دەمارگرژی تەنیا دیاریی وان بۆ مرۆڤایەتی بوون. لەو پەلامارانەدا کە لە خۆبەخۆیایەتیدا دەی-

کردنـە سـەر مەزهـەب، بەهاییگـەری‌و شـیعەگەری، ئـاییـنی مەسـیح‌و یەهوودیگـەریی وەک یـەک دەدیـتن. دیـارە لـەو دەورانـی مەسـتییەی لاوەتیدا، ئەو حوکمە لەمێژینەیە کە دەڵی مەستی‌و ڕاستی بە دروست دەزانراو ئەمەش وای کردبوو کە هێرشەکانی توندوتیژتر بن.

نـەریتی مـەی‌خواردنـەوە دەگـەڵ چووبـەک تـا کۆتـایی دەورانـی حکوومـەتی هووەیـدا درێـژەی هـەبوو. هـەموو چوارشـەممەیەک پێش ئـەوەی بـۆ شـێوخواردن بچێتـەوە مـاڵی دایکـی، هووەیـدا دەچـووە سەردانی قودسی و سادق چووبەک. پێکێکی سکاچ دەخواردەوەو جاری وابوو بابۆڵەیەکیشـی پـەنیری هولەندی کە بەتایبەتی بۆ وی کڕابوو، بەدمـەوە دەگـرت. لـە هەربابـەتێک دەدوان‌و هێنـدێ جـار باسـی ئەدەبییشیان دەکرد. بەڵام هیچ وەخت قسـەیان لـە سیاسـەت نـەدەکرد. هـەر وابزانـە لـەژێرەوە ڕێک کـەوتبوون کـە باسـی سیاسـی لەبەرنامەی کاری ئەو دیدارانەدا جێگای نیە.[٢٥]

هووەیـدا لەوڕۆژانـەدا خـەریکی خزمـەتی سـەربازی بـوو. هـەر لەوکاتەدا دەیەویست ئەو سـەرزەمینە نەناسـراوە کـە لێی لـەدایک ببوو، باشتر بناسێ. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا کاری دڵی یەکسـەر وەلا نـەنابوو. ئاشنایەتیی دەگـەڵ خاتوونێک بـەناوی پـەروین پەیدا کرد. زانیارییەکی زۆرمـان لەسـەر چەنـدوچۆنی پێوەندییەکـەی دەگـەڵ پـەروین نیـە. لـەو سـەردەمەدا، پێوەنـدیی نێـوان ژنـان‌و پیاوانێـک کـە مـارەبڕاوی یـەکتر نەبوون، زۆرتر بە نهێنی بوو. (لە دەیەی چل و پـەنجای [هـەتاوی]دا، بۆ یەکـەمجار لـە ئێـران ئـەو پێوەندییانـە کـەمێک ئاشـکراتر بـوون. دیـارە شۆڕشـی ئیسـلامی کۆتـایی بـەو فـەزا کراوەیـە هێنـا.) هووەیدا پـەروینی هەم دەگەڵ چووبـەک و هـەم دەگـەڵ فەرەیدوونی بـرای ئاشنا کـرد. بـە وتـەی چووبـەک: "ژنێکـی زۆر سـەربەخۆو جـوان بـوو، لـە جلوبـەرگ- پۆشـیندا بەسـەلیقەو لـە ڕەفتـاردا دنیادیدە بـوو." پێوەنـدیی ئـەم دووانـە دووسـاڵێک زیـاتری نەخایانـد. کاتێـک هووەیـدا چـووە یەکـەمین مەئموورییـەتی خـۆی لـە وەزارەتـی دەرەوەدا، دۆسـتایەتی دەگـەڵ پەروینیش زۆر بە هێمنی‌و دڵخۆشی کۆتایی هات.

ئەو دۆستانەی هووەیدا لەو سەردەمەدا هەڵیبژاردن، بەتایبەتی هاوڕێیەتی دەگەڵ چووبەک و هیدایەت، لە چەند بارەوە جێی سەرنجن. دەیەی بیستو بەتایبەتی ساڵانی(١٣٢١) تا ( ١٣٢٤) (١٩٤٢)تا (١٩٤٦)، یەکێک لە پڕچالاکیترین سەردەمە سیاسییەکانی مێژووی هاوچەرخی ئێران بوون. دەگمەن بوون ئەو ڕووناکبیرانە کە لەوساڵانەدا هەوای چالاکیی سیاسی لەسەری نەدابنو تەسلیم نەبووبن. کەچی ڕاست لەوکاتەدا، وا دیار بوو هووەیدا زیاتر حەز لە مەسەلە ئەدەبیو فەرهەنگییەکان دەکا. بەڕواڵەت هیچ حەزی لە ململانەی سیاسی نەدەکرد. جگە لەوەش، چووبەکو هیدایەت هەردووک دوژمنی بێ-ئەملاو ئەولای زۆرداری بوون؛ هەر دووکیان بەئاشکرا باوەڕیان بەخودا نەبوو و ڕەخنەگری جیددیی ئایینی ئیسلام بوون. سەرەڕای ئەوە، هەردووکیان لەو کەمە ڕووناکبیرانە بوون کە دەگەڵ بوونی بیروبۆچوونی دژیمەزهەبیو دژیزۆرداری، بەرەو حیزبی توودەش نەکشانو هەرگیز ڕەگەڵی نەکەوتن. لەوساڵانەدا، هووەیدا بێگومان پێش هەموو شتێک خۆی بە ڕووناکبیر دەزانی. نەخشێکی لاوەکیی لە چاپی یەکێک لە ئازایانەترین شانۆنامە دژی مەزهەبییەکانی هیدایەتدا، واتە ئەفسانەی ئافراندن، یاری کرد. لە یەک قسەدا، دۆستانی ئەو سەردەمەی هووەیدا دەبێ بەلایەنگری بایەخە فکریو فەلسەفییە دڵخوازەکانی وی بزانین.[٢٦]

کاتێک هووەیدا گەیشتە ڕیزی پێشەوەی سەکۆی سیاسەت، ڕووناکبیرانێکی وەک جەلالی ئالیئەحمەد لێکدانەوەیەکی جیاوازیان بۆ دۆستایەتییە ڕووناکبیرییەکانی وی دەخستە بەرچاو. ئالیئەحمەد دەیگوت هووەیدا ئەو دۆستایەتییانەی کردۆتە پلیکانی سەرکەوتنی خۆی. دەیگوت ئەو هاوڕێیەتییانە لەڕاستیدا هەموو بۆ ئەوە بوون کە ڕووناکبیران ڕابکێشرێنە نێو ڕێژیمی پەهلەوی. دیارە ئەگەر قسەی ئالی-ئەحمەد قبووڵ بکەین، نەک هەر دەبێ جۆرێکی سەرسوڕهێن لە ئامانجداریو بەبەرنامەیی بۆ هووەیدا قایل بین، بەڵکوو دەبێ لە توانای لێکدانەوەو پیاوناسینی کەسانی وەک هیدایەتو چووبەکیش بکەوینە

گومانەوە.[٢٧] جگە لەمانە، ئەمەش دەزانین کە هوەیدا هیچ وەخت هەوڵی نەدا بیروبۆچوونی چووبەک بگۆڕێ، یان هانی بدا دەگەڵ یەکێک لە حیزبە سیاسییەکانی ئەو ڕۆژگارە بکەوێ.[٢٨]

یەکەمین نیشانەی کەلکوەرگرتنی هوەیدا لە ڕایەڵکەی بەربڵاوی دۆستو خزمە بەنفووزەکانی دەبێ لە دامەزرانی وەک سکرتێری دووەمی باڵیۆزخانەی ئێران لە فەڕانسەدا بۆی بگەڕێین. ئەگەرچی تازە چووبووە نێو کادری وەزارەتی کاروباری دەرەوە، و هەرچەند لەتەواوی ماوەی خزمەتی لەو وەزارەتخانەیەدا ، لەکۆلێژی ئەفسەری خەریکی خزمەت بوو، بەوحاڵە یەکەمین مەئمووریەتی وەک دیپلۆمات، پۆستی زۆر دڵخوازی سکرتێریی باڵیۆزخانەی ئێران لە فەڕانسە بوو. سەیر ئەوە بوو کە لەنێو هەموو ئەو پێشنیارانەدا کە پێی کرابوون، ئەمەیان دەبوو ڕەت بکاتەوە.

# سه‌رچاوه‌کان

۱. غنی، ایران، برآمدن رضاخان...، صص ۳۹۵ ـ ۴۰۷.

۲. اسدالله علم، در یادداشتهایش، به بحث شاه در مورد این تحقیر، در حدود سی سال بعد از آن رویداد، اشاره می‌کند. ر.ک. اسدالله علم، یادداشتهای علم، جلد ۲.

۳. برای بحثی بیشتر در این باره، ر.ک.:

Isaiah Berlin, *The Crooked Timber of Humanity: Chapters in the History of Ideas* (New York, 1993), 133.

۴. برای دستیابی به بحثی پیرامون دسیسه‌های بریتانیا برای حفظ موقعیت انحصاری خود در ایران، ر.ک. غنی، ایران، برآمدن رضاخان...، فصلهای ۱ تا ۵.

5. James A. Bill, *The Eagle and the Lion: The Tragedy of American-Iranian Relations* (New Haven, 1988), 28.

۶. نورالدین کیانوری و احسان طبری، هر دو، و در زمانهای متفاوت، این ادعا را طرح کرده‌اند. ر.ک.: نورالدین کیانوری، خاطرات نورالدین کیانوری، تهران، ۱۳۷۱، ص ۱۴۴. وی مدّعی است که یکی از رهبران حزب با هویدا «روابط خیلی نزدیکی» داشت. انور خامه‌ای، که برای مدت کوتاهی از اعضای حزب توده بود و سپس سالیان متمادی از منتقدان سرسخت و جدّی آن حزب به‌شمار می‌آمد، در خاطرات خود می‌نویسد که هویدا در بیروت به یک «محفل چپگرا» پیوست. ر.ک. انور خامه‌ای، پنجاه نفر و سه نفر، تهران، ۱۳۷۱، ص ۱۱۲.

۷. برای دستیابی به بحثی درباره‌ی برخی از این جنبش‌ها و تأثیر و نفوذ افکار کسروی، ر.ک.:

Ali Rahnama, *An Islamic Utopian: A Political Biography of Ali Shariati* (London, 1999), 1–23.

۸. [آیت‌الله] روح الله خمینی، کشف‌الاسرار، تهران، ۱۳۲۰، صص ۱۱۰-۱۰۴.

9. Ryszard Kapuscinski, *Shah of Shahs*. trans. William R. Brand and Katarzyna Mroczkowska-Brand (New York, 1992).

۱۰. برای دستیابی به شرحی پر بار درباره‌ی منش شاه، و نیز قیاسی روشنگر مابین رفتار وی در واپسین روزهای قدرتش، با رفتار پدرش در آخرین روزهای قدرت، ر.ک.:

Kaveh Safa, "Melting Like Snow in Water: Patterns in the collapse of a consequential life".

این مقاله در کنفرانس "Writing Lives in South Asia and Middle East" که در دانشگاه ویرجینیا در ۲۲ و ۲۳ آوریل ۱۹۹۹ برگزار شد، ارائه شده است. نگارنده نیز در این کنفرانس مقاله‌ای تحت عنوان «مخاطرات زندگی‌نامه‌نویسی در ایران: سیاحتی در منظومه‌های فرهنگ» ارائه کردم، که روایت کاملاً تجدیدنظر شده و مختصر شده‌ی آن مقاله به صورت پیشگفتار کتاب حاضر در آمد.

۱۱. خواندنیها، شماره ۲۸، ۱۳۲۸.

۱۲. برای بحث ایام اقامت کوک در ایران، ر. ک. به:

Nesta Ramezani, "The Dance of the Rose and the Nightingale,".

13. Stephen Lee McFarland, "The Crisis In Iran, 1941–1947: A Society in Change and the peripheral Origins of the Cold War" (Ph.D. diss., University of Texas, 1988).

۱۴. ابراهیم گلستان، مکاتبات شخصی، ۲۲ ژانویه ۲۰۰۱.

۱۵. هویدا، «یاد از ایام خدمت وظیفه»، ۳۷۴.

۱۶. پیشین.

۱۷. پیشین.

۱۸. دلدم، زندگی و خاطرات هویدا، ص ۷۷.

19. Current Biography Year book, 1971 (New York, 1971), 200.

این کتاب مدعی است که هویدا از دانشگاه آزاد بروکسل «لیسانس علوم سیاسی» و «دکترای تاریخ از سوربن» گرفته است.

۲۰. کتاب سال ایران، تهران، ۱۳۴۵، ص ۷۶۲.

۲۱. جهانگیر بهروز، گفتگو با نگارنده، ۲ آوریل ۱۹۹۹.

۲۲. داشتن دکترای هویدا در داستان کوتاه پاکروان، بازداشت هویدا، ذکر شده است. وقتی من از وی درباره‌ی منبع این ادعا پرسیدم، وی اظهار داشت که هویدا، صراحتاً، درباره‌ی این «رساله‌ی دکترا» با وی صحبت کرده است. سعیده پاکروان، گفتگو با نگارنده، ۱۵ فوریه ۱۹۹۸.

۲۳. دلدم، زندگی و خاطرات، ص ۷۷.

۲۴. هویدا، «یاد از ایام»، ص ۳۷۵.

۲۵. دلدم، «زندگی و خاطرات»، ص ۷۷.

۲۶. هویدا، «یاد از ایام»، ص ۳۷۵.

۲۷. پیشین، ص ۳۷۴.

۲۸. پیشین، ص ۳۷۵.

۲۹. ابراهیم گلستان، مکاتبات شخصی، ۲۲ ژانویه‌ی ۲۰۰۰.

۳۰. فریدون هویدا، گفتگو با نگارنده، ۵ ژوئن ۱۹۹۹.

۳۱. هدایت، در نامه‌ای به دوستش حسن شهید نورایی ظاهراً اشاره می‌کند که امریکا را هویدا از طریق یک رابط فرستاده است. ر.ک. صادق هدایت، نامه‌ها، گردآوری محمد بهارلو، تهران، ۱۳۵۸، ص ۳۵۸. هدایت در نامه‌ی دیگری به تاریخ ۱۷ نوامبر ۱۹۴۶، می‌نویسد که دو کتاب که هویدا فرستاده دریافت کرده است؛ یکی از آنها اثری از سارتر، و دیگری اثری از هنری میلر است. ناصر پاکدامن که در آن زمان در کار ویرایش مجموعه‌ای از نامه‌های هدایت بود، با محبت تمام همه‌ی آنها را از نظر گذراند و نسخه‌هایی از تمام نامه‌هایی که در آنها از هویدا یاد شده بود، برایم فرستاد. این نامه‌ها، تحت عنوان: صادق هدایت، هشتاد و یک نامه به حسن شهید نورایی، گردآوری ناصر پاکدامن، در پاریس منتشر شده است.

۳۲. در سال ۱۳۳۸ که هویدا در شرکت ملّی نفت ایران به کار مشغول بود، یکی از دوستانش، منوچهر پیروز، از وی خواست که برای کمک مالی مورد نیاز انجوی شیرازی راهی بجوید. هویدا، به کمک عبدالله انتظام، که در رأس شرکت نفت قرار داشت، ترتیبی داد که مقرری منظمی به انجوی پرداخت شود. در ضمن یک ملاقات، هویدا به انجوی پیشنهاد کرد که وی نامه‌های هدایت را که ادعا می‌کرد در صندوق امانات امنی در سویس گذاشته است، ویرایش کند. منوچهر پیروز، گفتگو با نگارنده، پاریس، فرانسه، ۱۴ مارس ۱۹۹۹. (هر چند که پیروز سالیان متمادی استاندار فارس بوده است، زندگی و معاشش از یک خواربار فروشی کوچک در پاریس می‌گذرد. ما در فروشگاه وی با هم دیدار کردیم.)

۳۳. کمتر کسی به اندازه‌ی اردشیر زاهدی از هویدا انتقاد داشت. او این روزها با صداقتی دلپذیر در مورد نظرات اغلب قاطع و تند و انتقادی او سخن می‌گوید. با من از باده‌گساری‌های اغلب شرم‌آور هویدا صحبت می‌کرد و از «رقص‌های دلقک‌وارش» و این که در این گونه موارد، عصایش را به آرنجش می‌آویخت. اردشیر زاهدی، گفتگو با نگارنده، مونترو، سوئیس، ۵ ژوئن ۱۹۹۸.

۳۴. در نوبتهای مختلف، من با همسر هویدا، رئیس دفترش محمد صفا، برادرش فریدون، دوستش چوبک، صحبت کردم و جملگی درباره‌ی نظرات مذهبی وی مطالب یکسانی اظهار داشتند.

۳۵. صادق چوبک، گفتگو با نگارنده، ۱۵ فوریه ۱۹۹۸.

۳۶. بنگرید به: صادق هدایت، هشتاد و یک نامه به حسن شهید نورایی. از ناصر پاکدامن بابت کمکش به من برای یافتن این اطلاعات در آن نامه‌ها، بسیار سپاسگزارم.

۳۷. جلال آل احمد، کارنامه‌ی سه ساله، تهران، ۱۳۵۹.

۳۸. چوبک، گفتگو.

# فەسڵی پێنجەم

## گەڕانەوە بۆ پاریس

ناوی باشی ژنان و پیاوان
زینەتبەخشی گیانـــی وانە

شکسپێر - ئۆتیللۆ

# گەڕانەوە بۆ پاریس

گــەلاویژی ســاڵی١٣٢٣(١٩٤٤) ، زەینولعابیــدینی ڕەهنــەما بــە وەزیرموختاری ئێران لە فەڕانسە دیاری کرا.[1] سەردەمێک کە فەڕانسە لەلایەن نازییەکانەوە داگیر کرابوو، ئێران دەفتەری سـەفارەتی خۆی لە پـاریس داخسـتو تـەنیا پاش کۆتـایی شـەڕ کردیەوەو لەوسـەردەمەدا، ڕەهنەماش بە وەزیرموختـار دیاری کرا. ئەو بە یەکێک لـە کەسایەتییە سەرنجڕاکێشەکانی ئەو سەردەمە دەژمێردرا. سـەرۆکی بنەماڵەیەک لـە ڕووناکبیران‌و نووسـەرێکی نـاودار بـوو. پێش مردنیشـی هـەم قورئانی وەرگێڕایە سـەر فارسـی‌و هـەم ژیاننامەیەکیشـی بۆ پێغەمبـەری ئیسـلام نووسـی. لـە هـەمووی گرنگتـر، ڕۆژنامەنووسـێکی بـەناوبانگ‌و هـەر لەوکاتـەدا سـەرکێش بـوو. هوودیـدا یەکـەمجار لـە بـەیرووت دەگـەڵ بنەماڵەی ڕەهنەما ئاشنا بوو. دەگەڵ دوو کوڕی بنەماڵـە دۆستایەتییەکی نیزیکی هەبوو، و کاتێک بابیان بۆ پۆستەکەی پاریس دیاری کرا، کارێکی وای کرد کە هوودیداشی دەگەڵ بێ.[2]

لـە پاریسـی شـەڕلێدراو، هوودیـدا ژیـانێکی تاڕادەیـەک خـۆش‌و ئاسوودەی هەبوو. لەکاتێکدا بۆ زۆربەی پاریسییەکان، کەلک‌وەرگرتن لە کەرەسـەی هـاتوچووی گشـتی کـارێکی دژوارو پڕزانەسـەر بـوو، باڵیۆزخانەی ئێران بیووکێکی گەورەی ئەمریکایی‌و ڕێنۆیەکی هـەبوون.[3] هەرنەبێ یەکێک لەو دوو ترومبێلە دواتر بـوو بـە شاهیدی ڕووداوێکی

پڕهەراوهۆریا کە سەرەنجام پێی هووەیداشی گرتەوە.

کاری دەفتەری باڵیۆزخانەی پاریس بەتایبەتی لەوڕۆژانەدا زۆر قورس بوو. نەک هەر بەرپرسی هەموو کاروباری کۆنسوولیو دیپلۆماتیی ئێران لەفەڕەنسە بوو، بەڵکوو ڕاگەیشتن بە پێوەندیی نێوان ئێرانو ئەڵمانی داگیرکراویشی لەئەستۆ بوو. لە هەوەڵمانگەکانی دوای شەڕدا، ئێران چەند ڕێککەوتنی ئابووریی دەگەڵ ئەو وڵاتە بەستبوونو دەبوو چەندی بکرێ زووتر چارەنووسی ئەم ڕێککەوتنانە ڕوون بکرێتەوە. جگە لەوە، ژمارەیەک ئێرانی کەوتبوونە ئۆردووگای کاری زۆرەملیی نازییەکانەوە. بۆ ئاسانکردنی کاری ڕزگاریو گوازتنەوەی ئەمدەستەیە، نوێنەرانی ئێران لەپاریس، بەتایبەتی هووەیداو ڕەهنەما، چەندین جار چوونە ئەڵمان.[٤]

یەکێک لەئەرکەکانی هووەیدا لە باڵیۆزخانە دروستکردنی پێوەندیی دۆستانە دەگەڵ کۆمەڵەی ڕووناکبیریی فەڕەنسە بوو. بەیارمەتیی ئەو پێوەندییانە کە ڕەهنەما دایمەزراندبوون، هووەیدا توانی چاوی بە بەشێک لەو نووسەرە فەڕەنسەییانە بکەوێ کە خۆشی دەویستن، لەوانە ئاندرە مالرۆ، پۆل والێریو فرانسوا مووریاک.[٥] لە ڕۆژگارێکدا کە هەژاری لەپاریس گاڵەی دەکرد، میوانداریی‌ە ڕازاوەکانی باڵیۆزخانە ئەوێی کردبووە شوێنی پێکگەیشتنی هێندێک لە ڕووناکبیرە ناودارەکانی ئەو سەردەمەی فەڕەنسە.[٦] هووەیدا کە هەموو ژیانی ئاواتی بۆ پەیداکردنی دۆستانی سەرنجڕاکێشو بەسوود هەڵدەخواست، لەوساڵانەدا، بناخەی بەشێک لە گرنگترینو بەردەوامترین هاوڕێیەتییەکانی ژیانی دارشت.

کەمێک دوای دامەزرانی هووەیدا لە پۆستەکەی پاریسیدا، حەسەنعەلیی مەنسووریش کە تازە ڕەگەڵ کارمەندانی وەزارەتی کاروباری دەرەوە کەوتبوو، هاتە پاریس. ئەو کوڕی یەکێک لەو "هەزار بنەماڵە"یە بوو کە بە باوەڕی هێندێ کەس هەمیشە سیاسەتی ئێرانی سەدەی بیستەمیان لەدەستدا بوو. حەسەنعەلی لاوێکی لەخۆبایی بوو. هەرلەوکاتەدا، زۆروەخت جۆرێک خۆبەکەمگرتنی ڕواڵەتیی لەخۆی

نیشان دەدا. پیاوێکی جوانچاک بوو. پاش ماوەیەک بە ژنبازی ناوبانگی دەرکرد.[٧] هەستوسۆزێکی وەک بلێی بێسنووری هەبوو. جۆرێک سەرنجڕاکێشیو شکۆمەندیی سیاسیی هەبوو. بەرزەفڕییە سیاسییەکەشی سنووری نەبوو. زەینێکی بەپرسیاری هەبوو، و ڕێزێکی زۆری بۆ پسپۆڕیی تەکنۆکراتی دادەنا. هاونشینیی دەگەڵ خۆش بوو، و بە مودیرێکی بەتوانا دەژمێردرا. ئەهلی ڕێکخستن بوو. لە دامەزراندنو پاراستنی پێوەندییە گشتییەکاندا وەستا بوو. دەیتوانی بیروڕای جیاواز ببیسێو خاڵە هاوبەشەکانیان بدۆزێتەوە. زۆربەی سیاسەتمەدارانی پێش خۆی سەرکۆنە دەکردن. زۆر جار پاشملە دەیگوت: "مرۆڤی مێشکوشکو نەزانن".[٨] بەڵام بەرەوڕوو دەگەڵ هەمووان بەڕێزەوە ڕەفتاری دەکرد. بابی خۆشی یەکێک لە بەناوبانگترین سیاسەتمەدارانی بەرەی پێش خۆی بوو. دەورانی سەرۆکوەزیریی بابی زۆر پڕدەنگوهەرا ببوو. بەوحاڵە، لە بنەماڵەی مەنسووردا دەتگوت پۆستی حکوومەتو وەزارەت ملکی حەڵاڵی بنەماڵەیە.[٩] ئەمیر عەبباس یەکەمجار لەتاران دەگەڵ مەنسوور ئاشنا ببوو. هەردووکیان کارمەندی وەزارەتی کاروباری دەرەوە بوونو هاتوچوویەکی بەرتەسکیان، لەڕادەی دوو هاوکاری ئیداریدا لەنێواندا بوو. لەپاریس ئەو پێوەندییە بوو بە شتێکی دیکەو شێوەی هاوڕێیەتییەکی ڕیشەداری بەخۆوە گرتو هەتا ئاخری تەمەنی مەنسوور درێژەی هەبوو. هاندەرو بزوێنەری ئەو ئاڵوگۆڕە فەرەیدوونی هوەیدا بوو.

فەرەیدوونی هوەیدا، خەزەڵوەری ١٣٢٣ (١٩٤٤) لە زانکۆی فەڕانسەیی بەیرووت -سەر بە زانکۆی لیۆنی فەڕانسە- لە بەشی قانوونو ئابووریدا خوێندنی تەواو کرد. دەسبەجێ گەڕایەوە ئێرانو دوای گوزەراندنی ئەزموونی پێویست، چووە پاڵ کادری وەزارەتی کاروباری دەرەوە. یەکەم بەرپرسایەتیی بەڕێوەبردنی کتێبخانەی تایبەتیی وەزارەتی کاروباری دەرەوە بوو.[١٠] پاش ماوەیەک ئەویش، وەک ئەمیر عەبباسی برای، لەبەر ئەوەی فەڕانسەیی باش دەزانی، لەنێو کارمەندانی وەزارەتی کاروباری دەرەوەدا ناوبانگێکی پەیدا کرد.

هەربەهۆی ئەو زمانزانینەوە، هەر لە مانگەکانی هەوەڵی دامەزرانی لە وەزارەتی کاروباری دەرەوەدا کاری نووسینی نامە فەڕانسەییەکانی قەوام، سەرۆکوەزیری ئەودەمی وڵاتی پێ سپێردرا.

مەنسوور کە ئەودەم فێرکاری وەزارەتی دەرەوە بوو-و لە ئێرانیش، بۆ منداڵانی "هەزار بنەماڵە" ئەو جۆرە فێرکارییە عادەتەن یەکەم هەنگاو بۆ چوونی نێو کاری دیپلۆماتیک بوو- لە ڕۆژانی نێوەڕاستی خاکەلێوەی ١٣٢٤ (١٩٤٥)دا چووە کتێبخانەی وەزارەتو دەگەڵ فەرەیدوون ئاشنا بوو. ئەو ئاشنایەتییە دوای ماوەیەک بوو بە دۆستایەتی. لەو ڕۆژگارەدا حەسەنعەلی خەریکی ئامادەکردنی نامە "تز"ی خۆی لە کۆلێژی مافی زانکۆی تاران بوو، و فەرەیدوون لە نووسینو تەواوکردنی ئەو نووسینەدا یارمەتیی مەنسووری دا.[11]

گەلاوێژی ١٣٢٥ (١٩٤٦) هەردووکیان سەریان لە پاریس وەدەر نا. فەرەیدوون بوو بە سکرتێری دەستەی نوێنەرایەتیی ئێران لە کۆنفڕانسی ئاشتیی پاریس. مەنسووریش بۆ وەرگرتنی یەکەمین مەئمووریەتی خۆی لە وەزارەتی دەرەوە هاتبووە وێ. نەزەری باشی فەرەیدوون دەرهەقی مەنسوور هەستی ئەمیر عەبباسیشی بەرامبەر بەو بزواند. زۆری پێنەچوو کە دۆستایەتییەکی بەردرێژیان لەنێودا پەیدا بوو. زۆر لەو کەسانەی هووەیدایان لەنیزیکەوە دەناسی، لەوەدا یەکدەنگ بوون کە لەنێو هەڤاڵانی هووەیدادا، کە بۆخۆی بە ڕەفیقباز ناوبانگی هەبوو، مەنسوور جێگایەکی تایبەتیی هەبوو. بە تێپەڕینی ڕۆژگار، نیزیکیو هاوڕێیەتیی ئەم دووانە قایمترو ڕیشەدارتر دەبوو. لەماوەی کەمتر لە دەساڵدا، نەکهەر چارەنووسی سیاسیyan بە جۆرێک تێکەڵ بوو کە لێکجیاکردنەوەیان دژوار بوو، بەڵکوو ژیانی سۆزو ئەڤینیشیان بوو بە رایەڵکەیەکی پێچەڵپووچ لە پێوەندیی بەرامبەربەیەکو هاوبەش. فاتمەی سوودئاوەری فەرمانفەرمائیان کە هەردووکیانی دەناسی، پێی وایە: "هووەیدا پێوەندییەکی تاقانەی دەگەڵ مەنسوور هەبوو دەڵێ پێنج ساڵ دوای مەرگی مەنسوور، شەوێکیان هووەیدا میوانی وی بوو. "گۆرانیبێژی خۆشەویستی هووەیدا،

هایدەشم، بانگهێشتن کردبوو." هووەیدا لەسەر زەوی، ڕووبەڕووی هایدە، پاڵی بە پشتییەکەوە دابوو. داوای لێکرد کە"صورتگر نقاش چین"ی بۆ بڵێ. چەند لەحزە دوای دەستپێکردنی ئەم گۆرانییە هووەیدا، بەچاوێکی خەمناکەوە ڕووی کردە منو گوتی: "عەلی ئەم گۆرانییەی پێخۆش بوو."[120]

ئۆگری بە مەنسوور تەنیا بەرهەمی سۆزداریی ئەو ساڵانە نەبوو. هەر لەوڕۆژانەدا هووەیدا دەگەڵ ئێدوارد سابلیە* ئاشنا بوو کە هەواڵنووسی لۆمۆند بوو، و زیاتریش بە مەسەلەکانی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستەوە خەریک بوو. ماوەیەک دوای ئەوەی گەیشتە پاریس، هووەیدا وەک بەرپرسی کاروباری فەرهەنگیی باڵیۆزخانە، بە پێی پێداویستیی کارەکەی، سابلیەی بۆ نانی نیوەڕۆ بانگهێشتن کرد. لەوڕۆژانەدا قەیرانی ئازەربایجان ببووە مەسەلەیەکی جیهانی. لەڕاستیدا لە ڕوانگەی مێژووی دەیەکانی دوای شەڕەوە، دەتوانین مەسەلەی ئازەربایجان بە یەکێک لە ڕووبەڕووبوونەوە گرنگەکانی شەڕی سارد بزانین. هووەیدا پێشنیاری بە سابلیە کرد سەفەری ئێران بکا. پێی گوت تەنانەت دەتوانێ چاوی بە شۆرشگێڕەکانی ئازەربایجانیش بکەوێ. هەرلەوکاتەدا، بەڵێنی پێدا کە دەوڵەتی خانەخوێ هەموو خەرجی سەفەرەکەشی وەئەستۆ دەگرێ. گوتی دەوڵەت ئامادەیە: "فڕۆکەیەکی تایبەتیو وەرگێڕێکی جوانو جحێڵیش" بخاتە بەردەستی سابلیە."[121] هەرلەوکاتەدا دەستڕاگەیشتنی سابلیە بە "هەموو ناوچەکانی وڵات" دەستەبەر دەکا. دیارە سابلیە پێشنیارەکانی هووەیدای زۆر بەدڵ بوون، بەڵام گوتی ڕێبازی ڕۆژنامەی لۆمۆند ڕێگای ئەو جۆرە سەفەرانە نادا. گوتی لۆمۆند پێی خۆش نیە هیچ دەوڵەتێک خەرجی سەفەری هەواڵنووسەکانی بدا. سەرنووسەری سەختگیری ڕۆژنامەکە، هووبیرت بووڤ مری**، ئەم سیاسەتەی بێ ئەملاوئەولا جێبەجێ دەکرد.

---

* Eduard Sablier.

** Hubbert Beuve mery.

هووەیدا نائومێد نەبوو. لەوەڵامی سابلیەدا گوتی: "سەرنووسەر بۆمن دانێ."

ڕۆژی دواتر هووەیدا چووە سەردانی سەرنووسەری لۆمۆندو هەرچۆنێک بوو ڕازیی کرد ڕێگا بەسەفەری سابلیە بدا. چەند ڕۆژ پاشتر، سابلیە چووە تاران. لەماوەی ئامادەکردنی ئەو سەفەرەدا، ئەم دووانە بوونە دوو دۆستی نیزیکو لێکجیانەکراو"[14] لەساڵەکانی دواتردا، چەندین جار سەردانی یەکتریان دەکرد. جاری وابوو پشووی ساڵانەیان پێکەوە دەگوزەراند. لە هەر سەفەرێکی هووەیدا بۆ پاریسدا، سەردانی سابلیە لەو بەشانەی کاری سەفەر بوو کە خۆلێبواردنی نەدەکراو هەموو جارێ دەبوو ببێ. هەر دووکیان ئۆگرییەکی زۆریان بە مۆسیقای کلاسیکو فەرهەنگو ئەدەبی فەڕانسەو دنیای سیاسەت هەبوو. دۆستایەتیی هووەیدا دەگەڵ سابلیە یەکێک لە هەرماوترینو درێژمەوداترین پێوەندییە سۆزدارییەکانی ژیانی وی بوو. دوانامەی هووەیدا لەژیانیدا بۆ سابلیە بوو.

ئەم دۆستایەتییە تەنیا هەر باری سۆزداریی نەبوو، بەڵکوو بۆ هەردوولا هێندێ قازانجی پیشەییشی هەبوون. هەر لەڕۆژەکانی بەرێوە کە هووەیدا چووە نێو دنیای سیاسەتەوە، نەخشی ئامرازەکانی پێوەندیی بەکۆمەڵی لەو قۆناخەی سیاسەتی جیهانیدا باش دەناسی. (تەنانەت دەتوانین بڵێین لەوبارەیەوە تووشی زێدەڕۆییش ببوو. بەتایبەتی لە دەورەکانی دوایی حکوومەتەکەیدا، هەروا بزانە گەیشتبۆ ئەو ئاکامە کە بۆ چارەسەری هەر مەسەلەیەک، ئەوەندە بەسە لە مەیدانی چاپەمەنیو بیروڕای گشتیدا چارەسەر بکرێ.) هووەیدا چەندو چۆنی کاری چاپەمەنی پێشان لە مەکتەبی سابلیە فێر بوو. بەپێچەوانەی زۆربەی سیاسەتمەدارانی ئێران، ئەوکات کە ئەوان ڕێگای ئیدارەی چاپەمەنییان لە زێڕو زۆردا دەدی، هووەیدا لە سووچێکی پێچەڵپووچترو مۆدێرنەوە سەیری مەسەلەکەی دەکرد. دەیزانی کە چۆن دەکرێ ڕاگەیەنە گشتییەکان ڕازی ڕابگیرێن. گۆشەیەکی ئەو بۆچوونە هەڵسەنگاوو ئاڵۆزە تەنانەت لە پەیوەندیی وی دەگەڵ سابلیەشدا دەتوانین ببینین. لە

سروشتی پێوەندی دەگەڵ ویدا دەتوانین نیشانەیەک لەو ڕاستییەش ببینین کە هووەیدا تەنانەت لە هەڵبژاردنی دۆستە نیزیکەکانیشیدا هەرگیز قازانجە کەسییەکانی خۆی وەلا نەدەنا. لە زۆر حاڵەتدا، هووەیدا زانیاریی وردی لەبارەی مەسەلەو ڕوانگە سیاسییەکانی ئێرانەوە دەدا بە سابلیە. سابلیە بۆخۆی پێی لەوە دەنا کە: "بەشێک لە وتارەکانی من لەڕاستیدا هەمووی بیروباوەڕی هووەیدا بوون کە بەقەڵەمی من ببوونە وتار."[15] بەم جۆرە هووەیدا نەکهەر جۆرێک پاداشی دەدا بە سابلیەی دۆستی، بەڵکوو لەڕێگای ئەوەوە هەڵوێستە سیاسییەکانی خۆشی بەهێز دەکردو جاری وابوو شەڕوکێشە سیاسییەکانی خۆشی لەو ڕێگایەوە دەبردە پێش.

لەڕاستیدا کاری سابلیە وەک ڕۆژنامەنووس لەوکاتەوە گوڵی کرد کە هووەیدا سەرەداوێکی گرنگی دایە دەست. خەرمانانی ١٣٣٦ (١٩٥٧)، هووەیدا لە باڵیۆزخانەی ئێران لە تورکیە کاری دەکرد. بەڕێکەوت ئاگادار بوو کە مەئموورە ئەمنیەتییەکانی شووروەوی (ک گ ب) کەشتییەکی بارهەڵگری پۆستی تورکیەیان نوقم کردوەو لەو ڕێگایەوە هێندێ نامەی نهێنیی دیپلۆماتیکی ئەمریکایان دەست کەوتوە. وا ڕێکەوتبوولەوکاتەدا سابلیەش بۆ ئەنجامدانی چەند وتوێژێک دەگەڵ کاربەدەستانی تورکیە هاتبووە ئەنکەرە. ڕۆژێک کە قەرار بوو دەگەڵ سەرۆکوەزیری تورکیە وتوویژ بکا، هووەیدا بێ ئەوەی بەدرێژی دەگەڵی باس بکا، ئامۆژگاریی کرد سابلیە لەبارەی نغرۆبوونی کەشتییە پۆستییەکەوە پرسیار بکا. هەر ئەو ئاماژە کورتەی هووەیدا، بۆ سابلیە بەس بووو بەکۆمەگی ئەوە پاش هەوڵێکی زۆر توانی پەردە لەسەر ئەو شتە لابدا کە سەرەنجام بە "داستانی هەندرسن" ناسرا.[16]

بەڵام لەپاریس، چەند ساڵ پێش ئەو ڕووداوە، و چەند مانگێک دوای یەکەم دیداری هووەیداو سابلیە، ڕۆژێک هەردووکیان لەسەر پلیکانەکانی کلیسای ساکرە کوور* دانیشتبوون. دیمەنێکی جوانی

---

* Sacre Coeur.

شاریان لەبەر چاو بوو. ئەمیرعەبباس باسی بەرنامەکانی داهاتووی ژیانی دەکرد، لەو نێوەدا بەڵێنێکی داو گوتی: "ڕۆژێک دەبمە سەرۆکوەزیری ئێران‌و هەر لە یەکەم‌ڕۆژدا، بۆ سەردانی وڵاتەکەم بانگهێشتنت دەکەم."[170]



بەڵام لەسەرەتای هاوینی ساڵی١٣٣٤ (١٩٥٥)دا خەونە بەرزەفڕانە سیاسییەکانی هووەیدا لەنەکاو بوونە مۆتەیەک کە تا دواساتەکانی ژیان، سێبەری خستە سەر ژیانی. باڵیۆزخانەی ئێران لە فەڕانسە تووشی کێشەیەکی زۆر ئاڵۆز بوو. تەماع‌و چاوچنۆکی بزوێنەری ڕاستەقینەی کێشەکە بوو. وێرانییەکانی دوای شەڕ زۆر لە دانیشتووانی پاریسیان تووشی خاکەساری کردبوو. لەبەرامبەردا، ژمارەیەک لەفەڕانسەییە دووربینەکان توانیبوویان دوور لەچاوی کاربەدەستانی دەوڵەت، بەشێکی بەرچاو لە دارایی خۆیان بەرنە بانکەکانی سویس. بەتەواوبوونی شەڕ زۆر لەوانە ویستیان داراییەکانیان بێ دانی گومرگ‌و باج کە زۆرجار قورس بوو، بێننەوە فەڕانسە. لەو هەلومەرجەدا، دیارە ئەوکەسانەی دەیان‌توانی جانتاو ترومبێلەکانیان بێ‌پشکنین لە سنوور تێپەڕێنن، جێگەو پێگەیەکی جیاوازو دڵخوازیان هەبوو. ئاشکرایە کە ئەم جێگەو پێگە مومتازە پێش هەمووان هی دیپلۆماتەکانە. وا بوو کە زۆر لە دیپلۆماتەکانی وڵاتانی جۆراوجۆر کەوتنە داوی ئەم وتوویرەیەوە. دیپلۆماتە ئێرانییەکانیش لەم قاعیدەیە بەدەر نەبوون‌و بەشێکیان چوونە ڕیزی سوودپەرستانەوە. بەڵام بۆ بەدبەختیی هووەیدا سزای سەوداگەری‌و هەڵخلیسکانی هاوکارەکانی زیاتر لە هەمووان ئەو دایەوە. "داستانی پاریس" کە سەرەتایەکەی نامەیەکی بێ‌ئیمزا بوو، بوو بەپەڵەیەک بەداوێنی سیاسیی هووەیداوە. کاتێک ئەو لە دادگای شۆرشی ئیسلامیدا لەهەوڵی ڕزگارکردنی گیانی خۆیدا بوو، تۆمەتی پەیوەندیدار بەو داستانەوە نەخشێکی گرنگی لە دادنامەکەدا یاری کرد.

ئەمن هەر لە هەوەڵەوە دەمزانی کە لەو بارەیەوە، تەنیا بە پشتبەستن بە ئارشیڤی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی فەڕانسە دەکرێ پاکوپیس، و دەنگوو ڕاستی لێک جیا بکرێتەوەو چەندوچۆنی یەکێک لەو تۆمەتانەی دادگا دابوونیە پاڵ هووەیدا لە مەحەک بدرێ. هەربۆیە دوازدەی مارسی۱۹۹۹ چوومە ناوەندی ئارشیڤی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی فەڕانسە. دوای کەمێک لێکۆڵینەوە، تێگەیشتم کە گرنگترین بەڵگەکانی پەیوەندیدار بەو مەسەلەیەوە هەموو لە دۆسیەیەکی تایبەتیدا هەڵگیراون‌و لەهەمووی خەراپتر ئەو دۆسیەیەش، "بۆ ماوەی شەست ساڵ بەستراوەو تەنیا ساڵی۲۰۰۷ دەکرێتەوە."

داوای یارمەتیم لە ئیزابێل ناتان*، بەرپرسی بەشی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستی ئارشیڤ کرد. بابەتی لێکۆڵینەوەکەم بۆ شی کردەوە. جەختم لەسەر ئەوە کرد کە مەتەڵۆکەی تۆمەتی قاچاغی هیرۆئین دژی هووەیدا بەبێ دیتن‌و لێکۆڵینەوەی وردی ئەم "دۆسیە داخراوە" هەڵنایە. گوێی بۆ قسەکانم ڕاگرت‌و پاش چەند سەعاتێک، دووبارە لە "ساڵۆنی خوێندنەوە"ی ئارشیڤ هاتە سەردانم. گوتی نێوەڕۆکی "دۆسیە داخراوەکەی" خوێندۆتەوەو بە لێبڕاوییەوە دەتوانێ بڵێ هووەیدا ڕۆڵێکی لەوداستانەدا نەبووە. سوپاسم لە لوتف‌و مێهرەبانییەکەی کرد. بەڵام لێم زیاد کرد کە لەدادنامەی دادگای شۆڕش‌و هەروەها لە کارنامەی ژیانی ئەمیر عەبباسی هووەیدادا، داستانی پاریس بایەخێکی تایبەتیی هەیە. گوتم لە فەزای سیاسیی ئێراندا، کە زۆرتر گومان‌و فکری پیلان سێبەر دەخاتە سەر ئەندێشەو لێکۆڵینەوە، قسەی وی، وەک کاربەدەستێکی ڕەسمیی دەوڵەتی فەڕانسە، ئەوندە گرنگی‌و بایەخی پێ نادرێ. گوتم داوەریی کۆتایی تەنیا وەختێک مەیسەر دەبێ کە بتوانم بێ دەستتێوەردان‌و سنووربۆدانان، چاو لە هەموو بەڵگەکانی ئەو دۆسیەیە بکەم. ئامۆژگاریی کردم نامەیەک بۆ وەزیری کاروباری

---

* Izabelle Nathan.

دەرەوەی فەڕانسە بنووسم. ئاماژەی بە قانوونێک کرد کە ڕێگای دەدا لە هەلومەرجی "استثنایی"دا دۆسیەی داخراو بەشێوەی کاتی بکاتەوەو ماناو نێوەرۆکەکەی بخاتە بەردەستی لێکۆڵەران.

بەپشتیوانیی ڕێنوێنییەکانی ئیزابێل ئاتان نامەیەکم بۆ وەزارەتی کاروباری دەرەوەی فەڕانسە نووسی. ١٥ی ژوئەنی١٩٩٩ وەڵامێکم لە لوویی ئامێگ، سەرپەرستی ئارشیڤی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی فەڕانسە پێگەیشت. لەنامەکەدا نووسرابوو کە "بەپێی قانوونی تایبەتیی ئارشیڤ، پەسندکراوی سێی ژانویەی١٩٧١" ڕێگام دەدرێ کە "بەرگی چوارەم، نهێنی، ئاسیا١٩٤٥-٥١، ئاسیا، ئێران" ببینم. بەجۆرێکی دیکە بڵێم، مافی ئەوەم وەرگرت دۆسیەیەک کە هەموو بەڵگەنامەکانی داستانی پاریسی تێدا خڕ کراونەوە بخوێنمەوە. لەنامەکەدا تەنیا سنوورو مەرجێک کە بۆم دانرابوو ئەوەبوو کە هەقم نابێ لە هیچ کام لەو بەڵگەنامانە وێنە هەڵبگرم.

ئەوەی لێرەدا دەیگێڕمەوە یەکسەر پشتی بە بەڵگەنامەکانی ئارشیڤی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی فەڕانسە بەستوە. دەکرێ بڵێین لە هەموو بوارە سەرەکییەکاندا، داستانە ڕاستەقینەکە دەگەڵ ئەوەی تا ئێستا لەو بارەیەوە گوترابوو، بیسترابوو، و قبووڵ کرابوو جیاوازیی بنەڕەتیی هەبوو. تەنانەت ئەوانە کە باوەڕیان بە دروستکاریی هووەیدا هەبوو، و هەروەها ئەوانەش کە دەیانگوت هووەیدا بەپارێزتر، دروستکارترو حیسابگەرتر لەوە بوو کە تووشی هەوای قاچاغچیگەری بێ، لەو باوەڕەدا بوون کە "دیارە لەپاریس مەسەلەیەک ڕووی داوە."

پێموایە باسی خاڵێکی دیکەش لێرەدا پێویستە. بەڵگەکانی وەزارەتی دەرەوەی فەڕانسە باسی لایەنی جۆراوجۆری پێوەندییەکانی ئێران‌و فەڕانسە، و هەروەها کەسایەتیی دیپلۆماتە ئێرانییەکان، بەتایبەتی زەینولعابیدینی ڕەهنەما دەکا. دەبینین کە بۆنموونە زۆرجار ئاڵۆزی دەکەوێتە نێوان ڕەهنەماو کاربەدەستە فەڕانسەییەکان. جگە لەوە، کارمەندانی باڵیۆزخانەش یەکپارچەو یەکگرتوو نەبوون‌و زۆرجار دژی یەکتر پەنایان بۆ پیلانگێڕان‌و قسەهێنان‌وبردن دەبرد. مەبەستی من

لێرەدا لێکۆڵینەوەیەکی تەواوی باروودۆخی باڵیۆزخانەی ئێران، یان چەندوچۆنی پێوەندییەکانی ئێران و فەڕانسە نیە. ئەمن تەنیا لە یەکبارەوە سەرنجم داوەتە بەڵگەنامەکانی ئەو دۆسیەیە. دەمەویست بزانم داخوا لەووەختەدا ئەمیر عەبباسی هووەیدا دەستی دەکاری قاچاغی دراو، یان کەرەسە هۆشبەرەکاندا هەبووە یان نا. داوەری و گێڕانەوەکانی ئەم بەشە تەنیا لەم بووارەدا جێی بایەخ و پشتپێبەستنن. داوەری لەبارەی کەسایەتییەکی وەک ڕەهنەماوە، کە دیارە ڕاکێشراونە نێو باسەکەوە لە سەلاحییەتی من و ئەم بەشەی کتێبەکە بەدەرەو لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتیی پێویستە. هەرلەو کاتەدا، لەبەر ئەوەی هەرچی لەبارەی ڕەهنەماو خەڵکی دیکەوە، لە دۆسیەکاندا هاتوە یان تۆمەتی کاربەدەستە فەڕانسەییەکانە یان دەنگۆیەو لە دادگایەکدا نەکەوتۆتە بەر هەڵسەنگاندن و داوەری، تەنیا باسی ئەو تۆمەتانە لێرەدا نابێ بە نیشانەی گوناحباریی ئەوکەسانە بزانرێ. گوناحباری یان بێگوناحی تەنیا لە دادگایەکی دادپەروەرانەدا دەتوانرێ دیاری بکرێ و بەکردەوە هیچکام لەو کەسانە نەچوونە دادگایەکی لەو بابەتە.

هەرچۆنێک بێ، داستانەکە بەنامەیەکی بێ ئیمزا دەستی پێکرد. پازدەی جۆزەردانی ساڵی ١٣٢٤ (١٩٤٥) وەزارەتی کاروباری دەرەوەی فەڕانسە نامەیەکی تایپکراوی بێئیمزای لە چوار لاپەڕەدا پێ-گەیشت. هەڵەی ڕێنووسیی و ڕێزمانیی زۆر تێدا هەبوون. هەرلەوکاتەدا بەزمانێکی ناڕەوان نووسرابوو. هەمووی ئەمانەش بەپێی قاعیدە نیشانەی ناشارەزایی نووسەر دەگەڵ زمانی فەڕانسەیی بوون. نووسەر بە وردەکارییەکی تاڕادەیەک جێی باوەڕەوە ئیددیعای کردبوو کە کۆمەڵێک لە دیپلۆماتە ئێرانییەکان لە پاریس و بێرن، لەسێبەری پارێزراویی دیپلۆماتیی خۆیانداو بە کەلکوەرگرتن لە "پۆستی سیاسی" و ئەو ترومبێلانە کە پلاکی دیپلۆماتییان هەیە، خەریکی قاچاغی دراوو زێڕن. نووسەری نەناسراوی نامەکە هەرلەوکاتەدا لیستەیەکیشی لەو کەسانە کە پێی وابوو ئەندامان و هاودەستانی ئەو باندە بوون هێنابوو. نەک هەر زەینولعابیدینی ڕەهنەمای وەک یەکێک لەو ئەندامانە ناو

بردبوو، بەڵکوو داوای لە وەزارەتی کاروباری دەرەوەی فەڕانسەش کردبوو کە لەبارەی چەندوچۆن‌و سەرچاوەی داهات‌و دەرکەوتی ڕەهنەما لەپاریس لێکۆڵینەوەیەک ئەنجام بدا. دەیگوت مووچەی مانگانەی ڕەهنەما بەشی خەرجی مانگانەی* ناکا.[18] هەرچەند لەنامەکەدا دەتوانین لیستێکی تارادەیەک درێژ لە تۆمەتبارکراوەکانی قاچاغچیەتی ببینین، بەڵام لەوێدا هیچ ئاماژەیەک بە هووەیدا نابینین. ناسنامەی نووسەرەکەش نە لەنامەکەدا، و نە لە بەشەکانی دیکەی دۆسیەکەدا، ڕوون نیە. سەرنجڕاکێش ئەوەیە کە نووسەر داوای لە کاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوەی فەڕانسە کردبوو کە ئەگەر بەڕاستی دەیانەوێ ڕاستییەکەی داستانی قاچاغی باڵیۆزخانە بزانن، دەبێ پێوەندی بە سەرداریيەوە بگرن.

بەڕواڵەت پێش وەرگرتنی ئەم نامەیەش وەزارەتی کاروباری دەرەوەی فەڕانسە هێندێ ڕاپۆرتی لەسەر چالاکیی ناقانوونیی بەشێک لە دیپلۆماتە ئێرانییەکان لە ئیدارەی پۆلیسەوە پێگەیشتبوون. دژکردەوەی دەوڵەت بەم ئاڵوگۆڕانە چەند لایەنێکی هەبوو. وەزیری کاروباری دەرەوەی ئەوکاتی فەڕانسە ژۆرژ بیدۆ** لەنامەیەکدا چەندوچۆنی ئەو دژکردەوەیەی بۆ باڵیۆزی ئێران لەو وڵاتە ڕوون کردەوە. گوتی دەوڵەتی فەڕانسە خوازیاری دانانی کەسێکی دیکە وەک باڵیۆزی ئێران لەپاریسەو دوایە، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم داخوازییە، بە شێوەیەکی خۆبەخۆیی‌و نهێنی ڕوونی کردەوە کە: "دەبێ پشتڕاست

---

* لەدەقی ئینگلیسیی ئەم کتێبەدا،وەختی گێڕانەوەی ئەم بەشەی نامەکە، تەنیا بە باسی "چەند میلیۆن فرانکی فەڕانسەیی"، واتە دەقی فەڕانسەییەکە وازم هێنابوو. دیارە چەند میلیۆن" بۆخۆی بە ڕەقەمێکی گەورە دادەنرێ. بەڵام ئەگەر نرخی بەرامبەریی ئەوکاتی دۆلارو فرانک لەبەرچاو بگرین،ئەو چەند میلیۆن فرانکە" دەی‌کردە دەورووبەری ٣یان٤هەزار دۆلار. لە ڕاستکردنەوەی ئەم خاڵەدا قەرزداری ڕوونکردنەوەکانی جەنابی دوکتۆر عەلی ڕەهنەمام.

** Geirge Bidaut.

بکەمەوە کە جەنابی ڕەهنەما، بەهۆی هێندێ چالاکییەوە کە بە ڕواڵەت بە ئامانجی کەسی دەکرێن، ئیدی هەم بۆدەوڵەتی فەڕانسەو هەم لەبەر چاوی کۆمەڵگەی ئێرانی لەپاریس بە کەسێکی دڵخواز ناژمێردری."[190]
جگە لەوە، ڕۆژی دوازدەی گەلاوێژی ١٣٢٤ (١٩٤٥)، وەزارەتی کاروباری دەرەوە داوای لە سەرۆکی پۆلیسی پاریس کرد لێکۆڵینەوەیەک لەسەر ئەو چالاکییانەی کادری باڵیۆزخانەی ئێران لەپاریس کە گومانی ناقانوونیبوونیان لێبکرێ، ئەنجام بدا. هەر لەونامەیەدا، وەزیری کاروباری دەرەوە پێی لەسەر ئەوە داگرتبوو کە تەنانەت پێش وەرگرتنی نامە بێئیمزایەکەی گۆرین، "هاتو چووێ هێندێک لەدیپلۆماتە ئێرانییەکان "لەنێوان سویس و فەڕانسەدا کاربەدەستانی پۆلیسی خستبووە گومانەوە."[20]

لەڕاستیدا دەکرێ بڵێین ئەو ئاڵوگۆڕانە بوونە هۆی دروستبوونی قەیرانێک لە پێوەندییەکانی نێوان ئێران وفەڕانسەدا. لەلایەک فەڕانسە داوای گۆڕینی ڕەهنەمای کردبوو، و لەلایەکی دیکەش، ئێران بە هێدیک هۆ کە بۆ فەڕانسە ڕوون نەبوون، لەسەر هێشتنەوەی ڕەهنەما لەوپۆستەدا مکوڕ بوو. دیارە هەردوولا لەسەر یەک نوختە هاوڕا بوون. دیارە هەردوولا دەیانەویست مەسەلەکانی نێوانیان بە نهێنی بمێننەوە. دەیانەویست لەم ڕێگایەوە لە ئاکامە زیانبارەکانی ئەم قەیرانە کەم بکەنەوە.

باڵیۆزی فەڕانسە لە تاران، ڕۆژی سیی گەلاوێژی١٣٢٤ (١٩٤٥) ڕاپۆرتی بە دەوڵەتی فەڕانسە دا کە لە دوومەسەلەی گرنگدا دەگەڵ ئێران ڕێک کەوتوە. گوتبووی هەردوولا ڕێک کەوتوون کە پێوەندیی ئێران و فەڕانسە لە ڕادەی وەزیرموختارەوە هەڵکێشن بۆ پلەی باڵیۆز. جگە لەوە، دەوڵەتی ئێران بەڵێنی دابوو کە: "بەڕێز ڕەهنەما لەپاریس ناهێڵێتەوە. چەند کاندیدی بۆ پۆستەکەی وی هەبوون. وا دیتە بەرچاو کە بەڕێز سوپەهبودی ئەو پۆستەی بۆخۆی ڕاگرتبوو."[210]

چاردەی خەرمانانی ١٣٢٤ (١٩٤٥) لەکاتێکدا ئەم وتوویژانە لەئارادا بوون، سەرۆکی پۆلیسی پاریس ئاکامی لێکۆڵینەوەی خۆی لەڕێگای

نامەیەکی نهێنییەوە دایە وەزیری کاروباری دەرەوەی فەڕانسە. بەڕوونی، بەقسەی ئەو، ترومبێلی باڵیۆزخانە "بە ژمارەی6200RU6" بەهۆی کەسانێکەوە کە کاری قاچاغی دراوو زێڕیان کردوە بەکار براوە* هەرلەوکاتەدا، گوتبووی لەوجۆرە ڕووداوانەدا، وەدەستهێنانی بەڵگەو نیشانە ئاسان نیە، چوون 'ئێمە هەقی پشکنینی جانتاو ترومبێلی وانمان نیە." گوتبووی، هێندێک لەو کەسانە، بە نیشاندانی پاسپۆرتی دیپلۆماتیی خۆیان نایەڵن پۆلیس بیانپشکنێ."[٢١] بە وتەی سەرۆکی پۆلیس، نابێ گومانمان هەبێ کە چەند کەس لە باڵیۆزخانەی ئێران لە بێرن و پاریس خەریکی قاچاغی دراون و "بەپێی ڕاپۆرتی سەرچاوە باوەڕپێکراوەکان" جگە لەوکەسانە، "کەسێکی هەورازتری باڵیۆزخانە"ش لەو چالاکییانە ئاگادار بووەو سوودی لێ بردوون**.[٢٢]

---

* لەدەقی ئینگلیسیی ئەم کتێبەدا،نوسیبووم کە ترومبێلی باڵیۆزخانە زۆرجار بۆ گوازتنەوەی دراو بەکار براوەو لەپاوێژی باسەکەشم وا وەردەگیرا کە ئەو وشەی "زۆرجار"ە لە دەقی ڕاپۆرتی پۆلیسدا هاتوە کە وا نیە بۆ ڕاستکردنەوەی ئەم هەڵەیە منەتباری جەنابی دوکتۆر عەلیی ڕەهنەمام.

** بەداخەوە لە دەقی ئینگلیسیدا لەجیاتی هێنانی دەقی دەستەوشەی ڕاپۆرتەکە، واتە باسی ئەوە کە "کەسێکی هەورازتری باڵیۆزخانە" لەو چالاکییانە ئاگادار بووەو سوودی لێ بردوە، نووسیبووم "وەزیر موختار، ڕەهنەما ئاگای لەو چالاکییانە هەبوو..." لەنێوەرۆکی قسەو داڕشتنی نووسینەکەی من وا وەردەگیرا کە لەڕاپۆرتەکەی پۆلیس خۆشیدا ڕەهنەما وەک "کەسی هەورازتر ناوی هاتوە،کە وانیە. لەبەر ئەوەی دەوڵەتی فەڕانسە ڕەهنەمای، "بەهۆی هێندێ چالاکییەوە کە وا دیارە "بۆ قازانجی خۆی ئەنجامی داون" بەکردەوە بە کەسێکی نەخوازراو ناسیبوو، ئەمنیش ئەو "کەسە هەورازترە"م بە ڕەهنەما دانا. عەیبی کاری من لەوەدا بوو کە لەدەقی ئینگلیسییەکەدا، ئەو بۆچوونەم بەجۆرێک ڕێکخستبوو کە خوێنەر ئەوەش بە بەشێک لەڕاپۆرتی پۆلیس دابنێ،و ئەم جۆرە ڕێکخستنە کارێکی ناڕاست بوو. هەروەک پێشتریش نووسیم مەبەستی من لێرەدا بە هیچ جۆر ڕادەربڕین و داوەری لەسەر کەسایەتیی زەینولعابیدینی ڕەهنەما، یان بڕیاردان لەبارەی ڕاستی و ناڕاستیی

ڕاپۆرتی چوار لاپەڕەیی پۆلیس شیکردنەوەیەکی وردە لە چالاکیی تاوانبارانی سەرەکیی ڕووداوەکە. بێجگە لەو کەسانە کە ناویان لەنامە بێ ئیمزایەکەدا هاتبوو، پۆلیسی فەڕانسە چەندکەسی دیکە لە کاربەدەستان و هاونیشتمانانی ئێران، "بەتایبەتی بەڕێز میلانچی، دۆستی

---

ئەو تۆمەتانەوە نەبوو کە لەنامە بێ ئیمزایەکە،و هەروەها لەنامەی وەزیری کاروباری دەرەوەی فەڕانسەدا هاتبوون. لەڕاستیدا بەباوەڕی من، بەخوێندنەوەی هەموو دۆسیەکە،تەنیا دەتوانین بگەینە دوو ئاکامی یەکلاکەرەوە: هووەیدا بێتاوان بوو،و ڕەهنەما لانی کەم بە ئیدیعای وەزیری کاروباری دەرەوە، بەهۆی هێندێ چالاکییەوە کە بەڕواڵەت بۆقازانجی "خۆی" ئەنجامی داون بە کەسێکی نەخوازراو ناسراوە. نە دەتوانین بە لێبڕاوی چەندوچۆنی ئەوچالاکییانە دیاری بکەین،و نە دەتوانین ڕادەی دەستتێدابوونی هۆکارە سیاسییەکانی دیکە لە دیاریکردنی چارەنووسی ڕەهنەمادا بەوردی هەڵسەنگێنین. لەهەردوو بواردا، تەنیا دەتوانین پشت بە بەڵگەی ناڕاستەوخۆ ببەستین.

لەدۆسیەی ئەو مەسەلەیەدا لە وەزارەتی کاروباری دەرەوەی فەڕانسە زۆر ناوی دیکە باس کراون. خۆم لە باسی زۆریەیان بواردوە. بەڵام مەسەلەی ناوی زەینولعابیدینی ڕەهنەما بایەخو ئاڵۆزییەکی تایبەتیی هەبوو. لەلایەک دڵم لەوە کرمێ بوو کەناوی ڕووناکبیرێکی قەڵەمجوانی وەک زەینولعابیدینی ڕەهنەمام دێنایە نێو ئەم داستانە. لەلایەکی دیکەش، لەوباوەڕەدا بووم‌و هەم،کە چارەنووسی وی — واتە هاتنی بۆ پاریس‌و ناسرانی وەک کەسێکی نەخوازراو— هەموویان خاڵی مێژوویی گرنگ بوون کە شاردنەوەیان ڕەوا نەبوو. هەرلەوکاتەدا،داڕشتنەکەی من بۆ ڕاپۆرتی پۆلیس‌و بەڵگەکانی دیکەی ئەو دۆسیەیە وای دەنواند کە نەکهەر پۆلیس ئەوی بە تاوانبار دەزانی، بەڵکوو ئێمەش وەک خوێنەر دەتوانین گومان لە تاوانباربوونیدا بە ڕەوا نەزانین. ئەم ڕاوێژەو ئەو داڕشتنە ڕەوا نەبوو. بەڕێزان دوکتۆر مەجیدو عەلیی ڕەهنەما لە بابەتەکانی ئەم بەشە سەریان سوڕ مابوو و دڵیان ئێشابوو. چوون ئەم دۆسیەیەیان لە وەزارەتی کاروباری دەرەوە دیتو لێکدانەوەی ناوردو نادروستی من لە ڕاپۆرتی پۆلیسیان بە گوێدا دام. لە چەند جێگای دیکەشدا لێکدانەوەی من لە نێوەرۆکی دۆسیەکەیان وردتر کرد. لەهەردووکیان بەتوندی سوپاس دەکەم. هەرلەوکاتەدا گومانم نیە کە هێشتا چەند جێگای ئەم گێڕانەوەیە عەیبی هەیە.

باڵیۆزو هەروەهابەڕێز عەزود، سکرتێر'ی ئەوی بەهاوکاری لەوبوارەدا تۆمەتبار دەکرد.[24] لە هیچ جێیەکی ئەم ڕاپۆرتەدا ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ باسێک لە ئەمیر عەبباسی هووەیدا نیە. هەرلەوکاتەدا، لە هیچ کوێیەکی نامەکەدا ناوی زەینولعابیدینی ڕەهنەما نەبراوە. لەبەرامبەردا، ئاماژە بە کەسایەتییەکی گومانـاوی کـراوە کـە دواتـر، بـۆ بەدبـەختی ناڕاستەوخۆ ڕێـی کەوتـە نێـو ژیـانی سیاسـیی هووەیـداوەو لانـی کـەم جارێک، بۆی بوو بە مایەی ژانەسەر.

ناوی ئەو کەسایەتییە هووشەنگی دەوەللوو بوو. بەپێی ڕاپۆرتی پۆلیس، ئەو لە ساڵانی شەڕدا بەردەستی ژەنڕاڵ ژێسێر*، یەکێک لەفەرماندەرانی سوپای داگیرکەری ئەڵمان لە فەڕانسە بوو، و یەکێک لە ئەرکەکانی، پەیداکردنی کچانی جوان بۆ ژەنڕاڵ بوو. دەگەڵ هەمووی ئەمانە، پۆلیسی ئەڵمان ئەوی بەتاوانی قاچاغو دەرکردنی چەکی بێجێ گرتبوو. هەرئەویش یەکێک لە هەڵسووڕێنەرانی باندی قاچاغی پاریس – بێڕن بوو.[25]

بیستوپێنج ساڵ دوای ئەو ڕووداوە، ساڵی ١٣٥٠ (١٩٧١)، کاتێک هووەیدا سەرۆکوەزیر بوو، هەر ئەو دەوەللوویە کە ئیدی گەندەڵیی ماڵیو سامانەکەی لە دنیادا دەنگی دابۆوەو گۆیا یەکێک لە بەرپرسایەتییەکانیشی دابینکردنی کچانی جوان بۆ شا بووە، لە سویس بەتاوانی هەڵگرتنی تریاک گیرا. شا لەجیاتی ئەوەی لێبگەڕێ دادگاکانی سویس، لە ڕێگای قانوونییەوە بە تۆمەتەکانی دەوەللوو ڕابگەن، ئەوی بەفڕۆکەی تایبەتیی پادشایەتی لە سویس هەڵهێنا. کاتێک هووەیدا داستانەکەی بەدرێژی بیست، غیرەتی وەبەر خۆی نا بە شا بڵێ باشتر بوو دەوەللوو لە سویس مابایەوەو دادگایی کرابایە. وا دیارە بە گومانی شا هووەیدا بەو پێشنیارە پێی لە بەرەی خۆی زیاتر ڕاکێشابوو. بەسزای ئەو سەرپێچییە، سەرۆکوەزیر بۆ ماوەی دوو حەوتوو لە بەخزمەتگەیشتن بێبەش کرا.[26] دیارە دەوەللوو نە لەئێران و، نە

* Geser.

لە سویس سزایەکی نەدی. بڕێکی زۆر لەو سامانەی بەتازەیی لە نەوتی ئێران بەدەست هاتبوو بۆمەسرەفی قانوونیو ناقانوونیی دیفاع لەوی خەرج کرا.[47] لە مووچەی بێئەندازی پارێزەرەکانەوە بگرە تادەگاتە سەفەری گەشتوسەیرانی کاربەدەستە جۆراوجۆرەکانی سویس بۆ ئێران، هەمووی لە خەزێنەی دەوڵەتی ئێران دەدرا. شا، ئەسەدوڵڵای عەلەمی کردبووە بەرپرسی ئەوکارەو ئەویش بەهەر جۆر بۆی کرا وەرگێڕەکەی بنەماڵەی ئاغا خۆشەویستەکەی خۆی لە سزای دادگاکانی سویس ڕزگار کرد. تەنانەت ساڵی١٣٤٦ (١٩٦٧)یش هەرچەند دەوەللوو، بەپێی ڕاپۆرتی پۆلیس، یەکێک لە سەرکردەکانی باندی قاچاغ بوو، شانسی هێناو نەک هەر سزایەکی نەدی، بەڵکوو لە هەراوهۆریای چاپەمەنیی ڕۆژنامەکانی ئێران دەربارەی "داستانی پاریس"یشدا، ناوێکی لێ نەبرا.

ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی ئێران بەئیشتیایەکی تەواوەوە بەدوای داستانەکەی پاریسدا دەگەڕانو زۆرجار زیادیشیان پێوە دەنا. لەوڕۆژانەدا ئازادیی چاپەمەنی لە ئێران دیاردەیەکی تازەبابەت بوو. لە٤٦٤ ڕۆژنامەو گۆڤار کە ساڵی ١٣٢٦ (١٩٤٧) لەتاران دەردەچوون، تەنیا ٤٢ بڵاوکراوەیان ساڵی١٣٢١یش هەبوون. بێجگە لەوە، "زۆربەی ئەو بڵاوکراوانە تەنیا وەک بەرزەوێژی ئەم یان ئەو هێزی سیاسی دەبزووتنەوەو جگە لە پروپاگەندەکردن بۆ ڕێبازی ئەم ڕێکخراوانە یان بەهەڵەدانانی سیاسەتو ڕێکخراوەی بەرابەرەکانیان کارێکیان نەبوو."[48] ڕێوشوێنی بەرپرسایەتیی ڕۆژنامەنووسی هێشتا ڕیشەی دانەکوتابوو ودەرەتانی جێبەجێکردنی نەبوو. سنووری نێوان کەندوکۆژی ڕۆژنامەنووسانەو هەراوهۆریا سازکردنو چەقەبازی زۆر ڕوون نەبووو لەهەرحاڵدا جێبەجێیش نەدەکرا. هێندێک لە ڕۆژنامەنووسە هەلپەرستەکان دەسەڵاتی چاپەمەنییان کردبووە ئامرازێک بۆ باجوەرگرتن. ئەگەر کەسێک سمێڵی چەور نەکردبایەن، دەکەوتە بەر هێرشی وێرانکەرو زۆرجار تێکەڵ بە درۆو بوختانی ئەو جۆرە ڕۆژنامەنووسانە. لەبەرامبەردا، دانی هەقوحیسابی پێویست بەئاسانی

دەیتوانی بێدەنگیی ئەو قەڵەمبەدەستە بەکرێگیراوانە دابین بکا. هەر ڕۆژنامەیەک یان گۆڤارێک بێپەرواترو بەهەراوهۆریاتر بایە، وادیار بوو خوێنەریشی پتر دەبوون.[29]

گومان لەوەدا نیە کە "داستانی پاریس" بابەتێکی لەبار بۆکاری ئەوجۆرە چاپەمەنییە بوو. تەنانەت بەشێک لە ڕۆژنامە موعتەبەرەکانی وڵاتیش هێندێ جار سەروتاری توندو ئازاردەریان لەبارەی ڕووداوی باڵیۆزخانەی ئێران لە فەڕانسەوە دەنووسی. بەڕاوێژێکی پڕتانووتەوە دەیانپرسی چما لە باڵیۆزخانەکانی ئێمە لە ئورووپادا چ دەگوزەرێ؟ هێندێکی دیکە لە بڵاوکراوەکان نیگەران بوون کە داخوا بەڕاستی لە فرۆکەخانەکانی فەڕانسە، کاربەدەستانی گومرگ جانتای ئێرانییەکان وردتر دەپشکنن؟ دەیانگوت داخوا ڕاستە کە پاسپۆرتە دیپلۆماتییەکانی ئێران ئیدی جێگەی متمانەو بڕوا نین؟[30] باسی چاپەمەنی ڕۆژبەڕۆژ گەرمتر دەبوو. هەرڕۆژ زیاترو زیاتر ڕاستیوخەیاڵ، خەبەرو دەنگۆ، تێکەڵ دەبوون. بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو شەپۆلە ڕوولەزیادبوونە، دەوڵەتی ئێران بەڕەسمی داوای لە کاربەدەستانی فەڕانسە کرد کە بە بەیاننامەیەک ڕابگەیەنن کە "هیچ کام لە دیپلۆماتە ئێرانییەکان لە فەڕانسە زیندانی نین." بەیاننامەیەکی ئەوتۆ هەرگیز دەرنەچوو، بەڵام ئەگەر دەریش چووبا، دیسان لە ڕواڵەتدا دروستو لە ڕاستیدا ڕیابازانە دەبوو. بێگومان لەوکاتەدا هیچ دیپلۆماتێکی ئێرانی لە فەڕانسە زیندانی نەبوو.[31] چوونکە لەجێدا گرتنی دیپلۆماتێک پێچەوانەی قانوونە نێونەتەوەییەکانو عورفی کارپێکراوە. ڕاستییەکەی ئەوە بوو کە دروست لە کاتێکدا ئێران داوای دەرکردنی بەیاننامەیەکی وای کردبوو، بەشێک لە کارمەندانی باڵیۆزخانەی ئێران لەژێر چاوەدێریی تایبەتیی پۆلیسدا بوونو باڵیۆزی ئێرانیش، بەهەر هۆیەک بوو بەکردەوە بە کەسێکی نەخوازراو ناسرابوو. لەونێوەدا هوووەیدا بێخەبەر لە هەرایەک کە سەرەنجام دواڕۆژی سیاسیی وی خستە مەترسییەوە، کاری خۆی لە باڵیۆزخانەدا درێژە پێدەدا، زۆربەی کاتی بێکاریی خۆی دەگەڵ فەرەیدوونی برایو دۆستەکانی، حەسەنعەلیی مەنسوورو عەبدوڵڵای ئینتیزام دەگوزەراند.

هەرلەوکاتەدا دەگەڵ سادقی هیدایەتیش نامەی دەگۆڕینەوەو هێندێ جاریش ئەو کتێبانەی بۆ هیدایەت دەنارد کە تازە لە پاریس چاپ کرابوون. بەهیوا بوو دەگەڵ گەڕانەوەی بۆ تاران هەڵلاو هەنگامەی "داستانی پاریس"یش بخەوێ.[٢٢]

کەچی گەڕانەوەی ڕەهنەما بۆ تاران باسەکەی تەواو نەکرد. دەگەڵ ئەو ڕاستییە کە کاربەدستە فەڕانسەییەکان لەبارەی گۆڕینی ڕەهنەماوە دەگەڵ دەوڵەتی ئێران ڕێککەوتبوون و، لەڕاستیدا گەڕانەوەی ڕەهنەما بۆ تاران هەنگاوێک لەو ڕێگایەدا بوو، بەڵام لە بەفرانباری ١٣٢٤دا ئەو بە یەکەمین هەڵفڕینی ڕاستەوخۆی تاران بۆ پاریس چۆوە فەڕانسە. نامەیەکو دیارییەکی لەلایەن قەوامەوە بۆ سەرۆکوەزیری فەڕانسە پێ-بوو. قەوام لەونامەیەدا داوای لە هاوتا فەڕانسەییەکەی کردبوو کە ڕەهنەما وەک باڵیۆزی تازەی ئێران لە فەڕانسە قبووڵ بکا. تەختە فەڕشێکی گرانقیمەتی ئێرانییش، بە نیشانەی سوپاس دەگەڵ نامەکەدا بوو.[٢٣] ئەم ئاڵوگۆڕانە کاربەدەستانی فەڕانسەیان تووڕەو سەرسوڕماو کرد. تەنیا شتی بەفکریاندا هات ئەوە بوو کە ڕەنگە ڕەهنەما بەرتیلی دابێتە ڕێبەرانی ئێران. لە یادداشتێکدا کە ٢٤ی ژووئیەی ١٩٤٦ وەزارەتی کاروباری دەرەوەی فەڕانسە بۆ هەیئەتی دەوڵەتی نووسیبوو، هاتبوو کە گۆیا شاو قەوام هەردووکیان شتێکیان وەک بەرتیل لە ڕەهنەما وەرگرتوە. هەم لەو ڕاپۆرتەو هەم لە ڕاپۆرتێکی دیکەدا، فەڕانسەییەکان ئیددیعایان کردبوو کە ڕەهنەما بەڵێتی فرۆکەیەکی تایبەتیی بە شا داوەو قەوامیش چەندین "دیاری"ی جۆراوجۆری وەرگرتوە.[٢٤] بە باوەڕی من هەردوو تۆمەتەکە ناڕاستن. بەدوور دەزانرێ کە شاو قەوام لە مەسەلەیەکی وادا بەرتیلیان وەرگرتبێ.

بەڵام بە پێچەوانەی نامەو فەڕشی قیمەتی، دەوڵەتی فەڕانسە نەزەری خۆی نەگۆڕی و ئامادە نەبوو ڕەهنەما وەک باڵیۆز قبووڵ بکاو داوای لە ئێران کرد کەسێکی دیکە بۆ ئەوپۆستە هەڵبژێرێ. سەرەنجام قەوام تەسلیمی ویستی فەڕانسەییەکان بووو پێی لەسەر ئەوە داگرت کە هەموو داستانەکە بە نهێنی وەمێنێ، و هەر واش کرا.[٢٥] ڕەنگە هەر بۆیە

بێ کە لە هەموو شیکردنەوەکانی چاپەمەنیی ئێران لەبارەی ڕووداوەکانی پاریسدا، لە هیچ کوێ ئاماژەیەک بەچارەنووسی ڕەهنەما نابینین. دیارە لەو ڕۆژانەدا کە ڕەهنەما چاوەڕێی هاتنی باڵیۆزی تازە بوو، چەند جار چووە سویس و ئەڵمان و کاربەدەستە فەڕانسەییەکانی تووڕە کرد*[٢٦]

یەک لە لایەنە سەرنجڕاکێشەکانی دۆسیەیەکی نیزیک بە شەشسەد لاپەڕەیی کە یەکێک لە کاربەدەستە فەڕانسەییەکان خوێندبوویەوە، ئەو جیاوازییە بوو کە لەنێوان نێوەرۆکی ئەم دۆسیەیەو گێڕانەوەی چاپەمەنیی ئێران لەو ڕووداوە دەهاتە بەرچاو. لە دۆسیەکەدا لە هیچ کوێ، ناوی هووەیدا نابرێ. ناوی، تەنیا لەوجێیانەی دۆسیەکەدا هاتوە کە بۆ وەرگێڕانی وتاری چاپەمەنیی ئێران بۆسەر زمانی فەڕانسەیی تەرخان کراون. ناوی فەرەیدوونی براشی تەنیا یەکجار هاتوە، ئەویش لە نامەیەکی باڵیۆزخانەی ئێران بۆ ئارشیڤی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی فەڕانسەدا. لە نامەکەدا گوتراوە کە فەرەیدوون خەریکی نووسینی مێژوولکەیەک لە پێوەندییەکانی ئێران و فەڕانسەیەو بۆ ئەوکارە پێویستیی بە بەڵگەنامەکانی ئارشیڤ هەیە. ئەگەر هووەیدا ڕۆڵێکی لە داستانی قاچاغی دراودا هەبووایە، ئەگەر یەکێک لە ئەندامانی باندی قاچاغ بووایە، دیارە جێگەوپێگەکەی وەک دیپلۆمات پێویستیی بەوە دەکرد کە ناوی لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەو ڕاپۆرتی پۆلیسدا دەرکەوێ. بەوحاڵە، کاتێک چاپەمەنیی ئێران هاتنە سەر باسی داستانی پاریس، هەرلەوکاتەدا کە هەرگیز ئاماژەیان بە مەسەلەی لادانی ڕەهنەما لە باڵیۆزخانە نەدەکرد، چەندین جار ناوی هووەیدایان دەبرد. هێندێک لە کاربەدەستانی باڵیۆزخانەی فەڕانسە پێیان وا بوو کە چاپەمەنیی تاران لەلایەن کەسانێکەوە هان دەدرێن کە بازاڕیان لە پاریس لە بڕەو

---

* دەبێ ئەوەمان لەبەر چاو بێ کە لە خەرمانانی ١٣٢٤ (١٩٤٥)ەوە تا نیزیکەی ساڵێک دواتر،مەجیدی ڕەهنەما، کوڕی زەینولعابیدین لە سویس دەبوو. زۆر وێدەچێ سەفەرەکانی بابی بۆ سەردانی وی بووبن. وتووێژ دەگەڵ مەجیدی ڕەهنەما،ژانویەی ٢٠٠١.

کەوتوەو خوازیاری "گەڕانەوەی کەسێکی وەک ڕەهنەما" بۆ پاریسن[*][٢٧]
تەنانەت ئەگەر ئەم تۆمەتەش قبووڵ بکەین دیسان خاڵێکی گرنگی دیکە
بە ناڕوونی دەمێنێتەوە. بۆچی لەنەکاو ناوی هووەیدا لەو ڕووداوەدا
کەوتە سەر زاروزمانان.

یەکەمجار کە ناوی هووەیدا کێشرایە نێو ڕووداوەکە لە وتارێکی
ژمارەی ڕۆژی١٤ی ڕێبەندانی ١٣٢٥ (١٩٤٧)ی ڕۆژنامەی "مردم"
ئۆرگانی حیزبی توودەی ئێراندا بوو. "مردم" ئیددیعای کردبوو کە لە
پاریس پەنجاکەس لە ئێرانییان بەتاوانی قاچاغ زیندانی کراون. لە نێو
لیستی گیراوەکاندا ناوی هووەیداو "حەسەنعەلیی مەنسوور، کوڕی
ئوستانداری ئازەربایجان" دەهاتە بەرچاو. بە وتەی "مردم"،
کاربەدەستانی فەڕانسە داوایان لە دەوڵەتی ئێران کردوە کە لەبارەی
وەزعی ماڵیی ئەمیر عەبباسی هووەیداوە لێکۆڵینەوەیەک بکەن‌و بزانن
ئەو چۆن توانیویەتی خانوویەکی هاوینی لە دەوروبەری پاریس بکڕێ.
ئەم قسەیەی وتاری "مردم" گرنگییەکی تایبەتیی هەیە، چوونکە وەک
چەندبەشی ئەو نامە بێئیمزایە دەچێ کە بۆ وەزارەتی کاروباری
دەرەوەی فەڕانسە نووسرابوو. لەو نامەیەدا نووسەر لەبارەی
چەندوچۆنی وەزعی ماڵیی ڕەهنەماوە پرسیاری لە وەزارەتی کاروباری
دەرەوەی فەڕانسە کردبوو، و ڕۆژنامەی "مردم"یش نووسیبووی
دەوڵەتی فەڕانسە سەرچاوەی داهات‌و مڵکەکانی هووەیدای خستۆتە ژێر
لێکۆڵینەوە. ئەو وێکچوونە ئەم پرسیارە دێنێتە پێش کە داخوا حیزبی
توودە ئاگای لە نێوەرۆکی ئەم نامەیە هەبوو، و ئەگەر هەیبوو ئەم
خەبەرەی چۆن دەست کەوتبوو؟ داخوا حیزب بۆخۆی نەخشێکی
لە نووسینی نامەکەدا هەبوو؟ لەوە گرنگتر ئەوەیە کە بۆچی "مردم"
دەگەڵ ئاماژە بە مەسەلەی لێکۆڵینەوە دەربارەی وەزعی ئابووریی

---

[*] لە دەقی ئینگلیسیدا نووسیبووم کە باڵیۆزخانەی فەڕانسە پێی وا بوو ڕەهنەماو
دۆستەکانی لەپشت پەردەوە چاپەمەنییان هان دەدا. وەرگێڕاوی وردتری نامەی
٣٠ی ژانویەی ١٩٤٧ هەر ئەوەیە کە لێرەدا هێناومە.

دیپلۆماتە ئێرانییەکان ناوی زۆرکەسی دیکەی لابردوەو ناوی هووەیدای لەجێ داناون. ڕەنگە هیچ کات وەڵامێکی جێی باوەڕمان بۆ ئەمپرسیارە دەست نەکەوێ. بەلأم ناتوانین لە خاڵێک بەگومان بین: ڕێبەندانی ١٣٢٥ (١٩٤٧)، واتە کاتێک ناوی هووەیدا لە وتاری مردم"دا دەرکەوت، ئەم بڵاوکراوەیە زیاتر لەلای هاوڕێیانی حیزبی بەجیددی وەردەگیراو لەنێو زۆربەی خەڵکدا تەنیا وەک ئۆرگانی حیزبێکی ستالینیستی بەناوبانگ بوو.

بەلأم گۆڤاری "خواندنیها" وتارەکەی "مردم"ی چاپ کردەوە. ساڵەکانی دواتر، وەختێک دەنگۆی کۆنی "ڕابردووی گوماناویی هووەیدا" کەوتەوە سەر زاران، ئیدی کەس ئاماژەی بە سەرچاوەی بنەڕەتی، بەلأم گوماناویی وتارەکە، واتە "مردم"، نەدەکردو ئەوەی زۆربەی نووسەرانی دواتر بە بەڵگەیان دێنایەوە هەرگۆڤاری بەنیسبەت موعتەبەرتری "خواندنیها" بوو. بەجۆرێکی دیکە بڵێین، بەرەبەرە سەرچاوەی بنەڕەتیی وتارەکە لەبیر خەڵک چۆوە.

هۆی ڕاستەقینەی دژایەتیی خەڵک دەگەڵ هووەیداو مەنسوور نازانین. لەوبارەیەوە چارەیەک جگە لە بۆچوون و گومان نیە. ڕەنگە پێویست بێ لە ڕیزبەندیی هێزە سیاسییەکانی ئەودەمی ئێراندا بۆ کلیلی ڕەمزی داستانەکە بگەڕێین. ساڵی١٣٢٦ (١٨٤٧) قەوامو سوپەهبودی، کە لە وەزیرانی کابینەکەی بوو، هەردووکیان بە لووتکەی دوژمنانی حیزبی توودە دەژمێردران. هاوپەیمانیی حیزبی توودەو قەوام زۆری نەکێشاو بە ڕقو دوژمنایەتی کۆتایی هات. جگە لەوە، شووڕەوییەکانیش بیرەوەریی خۆشیان لە قەوام نەبووو دیارە دوژمنی شووڕەوییش هەمیشە بە دژبەری حیزبی توودە دەژمێردرا. سەرباری ئەوە، لەوڕۆژانەدا، پێوەندیی خزمایەتیی هووەیداو سوپەهبودی لە کەس شاراوە نەبوو. داخوا هێرش بۆسەر هووەیدا لەڕاستیدا هەوڵێک بۆ زەبروەشاندن لە قەوامو سوپەهبودی بوو؟ تەنیا وەختێک دەتوانین بەلێبڕاوی وەڵامی ئەم پرسیارە بزانین کە دەستمان بە ئارشیڤەکانی حیزبی توودەو ڕێکخراوە جاسووسییەکانی شووڕەوی ڕابگا.

دیارە سادقی هیدایەت کە لە تاران ئاگای لەم کارەساتە هەبوو

وەڵامێکی دیکەی بۆ ئەم مەتەڵۆکەیە هەبوو. لە نامەیەکیدا بۆ دۆستی خۆی حەسەنی شەهیدنوورایی، کە ئەودەم لە پاریس دەژیا، نووسیبووی: "سەیر ئەوە بوو ڕۆژنامەی "مردم" خەبەری گیرانی چەندکەس و یەک لەوان هووەیدای نووسیبوو. دیار بوو کەسێکی ئەو خەبەرەی داوە وردەحیسابێکی دەگەڵ هووەیدا هەیە، یان چاوەڕوانە جێی بگرێتەوە، چوونکە ڕوونکردنەوەیەکی گەوجانەی دابوو کە تەنیا مرۆڤێکی ساویلکە دەتوانێ وا بیر بکاتەوە. بەڵام لە ژمارەی ئەمڕۆدا ئەو خەبەرەی وەدرۆ خستبۆوە.[38] هیدایەت کە لەو ڕۆژگارەدا زۆر کەوتبووە بەر سێرەی حیزبی توودە، لە نامەیەکی دیکەدا دووبارە توورەیی خۆی لە نەخشی حیزب لەو ڕووداوەدا دەربڕی و بەزمانێک کە تایبەت بەخۆی بوو، باسی هاتنەخواری سەنگی ڕۆژنامەی "مردم"ی کردو نووسی: " دەنگی نووساوەو قاووقیژی وەڕێ خستوە، و ئەمنیش لە تەواوی ئەو داستانانە بێزارم. وا دیارە ژیانی ئێمە بۆتە هەمبانەیەک پیسایی، کە دەبێ کەچکەچک بێخۆین و پێشی هەڵڵا بڵێین."[39]

لەڕاوێژی نامەی هیدایەت‌ڕا بە ئاسانی دەتوانین تێبگەین کە بۆچی حیزبی توودە دەسبەجێ وتارەکانی پێشووی لەبارەی هووەیداوە بەدرۆ خستنەوەو وەریگرتنەوە. وەختێکی شەهیدنوورایی یادداشتی هیدایەتی دەربارەی هەراوهۆریای چاپەمەنی لە تاران وەرگرت، دەسبەجێ برووسکەیەکی بۆ هیدایەت لێداو پێی لەسەر ئەوە داگرت کە هووەیدا بێتاوانە. هیدایەت لە نامەی ٢٥ی ڕێبەندانی ١٣٢٥ (١٩٤٧)ی خۆیدا، لەپێشدا باسی وەرگرتنی برووسکەکەی کردو دوایە بەرگرییەکی جانانەی لە هووەیدا کردو نووسی: "دەمزانی کە [ هووەیدا] لەوێ کرێنشینەو لە هەمووی گرنگتر شارەزای ڕەوشتی بووم، دەمزانی قاچاغچی و شیعە نیە... پاش گەیشتنی برووسکەکە گومانم نەما کە هەموو ئەو دەنگۆیانەی بۆی ساز کراون درۆ بوون. چوومە ئیدارەی ڕۆژنامەی "مردم"و زۆریان بەسەر ڕۆیشتم.. ئەمڕۆ دووبارە خەبەرەکەیان بەدرۆ خستەوە، برووسکەکەم دا بە تەفەززولییش و دوێنێ ئەویش لەڕۆژنامەی "ارس"دا ئەو خەبەرەی بەدرۆ خستبۆوە."[40]

ساڵی ١٣٤٥ (١٩٦٦)، هووەیدا بەشێک لە بیرەوەرییەکانی ڕۆژانەی سەردەمی پاریسی دایە چاپ. لەوێدا هیچ ئاماژەیەک بە هەڵلایەکەی پاریس نابینرێ. وا دیارە دڵی بەوە خۆش بووە کە ڕۆژگار ئەو شتانە دەسڕێتەوە. ویستبووی بە بێدەنگیی خۆی بەربەستێک لە پێش هەرەسی دەنگۆی سەرزاراندا دروست بکا. ڕەهنەمای وەک مرۆڤێکی زاناو خوێندەوار ناو بردبووو باسی کردبوو کە چەندە لە شێعری حافز شارەزایەو هەروا ئەوە کە ژنانی پاریس وەک پەپوولە بە دەوری مۆمی ڕوخساریدا دەسووڕان.[٤١]

کەچی لێکدانەوەی هووەیدا بەهەڵە دەرچوو. بێدەنگییەکەی دەنگۆکانی لەنێو نەبرد؛ لەڕاستیدا، ئەگەرچی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئێران ئاخروئۆخری ساڵی ١٣٢٥ (١٩٤٧) بەڕاشکاویی و پێداگرتنەوە ڕایگەیاند کە ئەوەی لەسەر هووەیدا بڵاو بۆتەوە هیچی ڕاست نیە، و دەگەڵ چەندجار بەدرۆخستنەوەی "مردم"، و هەرچەند ڕۆژنامەی "ئێتش" نووسی هەواڵنووسێکی تایبەتیی بۆ لێکۆڵینەوەی داستانی پاریس ناردۆتە ئەوشارەو ڕاپۆرتی داوەتەوە کە هووەیداو براکەی هیچ کامیان نەگیراون، و سەرەنجام دەگەڵ هەوڵو تەقەلای سادقی هیدایەت بۆ کڕینەوەی ئابڕووی هووەیدا، داستانی پاریس هەتا مردن وەک پەڵە هەورێکی ڕەش بەری ئاسۆی ناوبانگی هووەیدای بەرنەدا.[٤٢] ئەگەر ساڵی ١٣٢٥، ئەو دەنگۆیە تەنیا دەبووە مایەی خەفەتو دڵڕەنجانی، ساڵی ١٣٥٨ (١٩٧٩) لە دادگای شێخ سادقی خەڵخاڵیدا، هەر ئەودەنگۆ درۆیەی قاچاغی دراوو زێڕ بە مۆجیزە بوو بەماددەی پازدەی دادنامەی دژی ئەمیر عەبباسی هووەیداو ئەوی تۆمەتبار کرد کە "دەگەڵ حەسەنعەلیی مەنسوور ڕاستەوخۆ لە فەڕانسە بەشداری قاچاغی هیرۆیین بوون."[٤٣] پێداگرتنی دادگا لەسەر ئەو دەنگۆ بێبناخەیە لەلایەک نیشانەی گوێنەدانی بە ڕێوشوێنە ئاشکراو سەرەتاییەکانی دادپەروەریی و دادوەری بوو؛ لەلایەکی دیکەش، ئەو بنەڕەتە دێرینەیەی پشتڕاست دەکردەوە کە لە دنیای سیاسەتدا زۆرجار دەنگۆو گومانی خەڵکو ئەوەی بە مێشکیاندا ڕادەبرێ بە ئەندازەی ڕاستییەکان گرنگن.

# سەرچاوەکان


1. AD, "Rhanema," Télégramme. Document 2.

2. Hoveyda (Fereydoun), *Les Nuits Feodales*, 270.

3. AD Carton 24, le Préfet de Police à Monsieur, no. 6511–4.

۴. تلگرامهای زیادی در پرونده‌های وزارت خارجه‌ی فرانسه گواه بر اقدامات کارمندان سفارت برای مسافرت به آلمان‌اند. هر یک از این سفرها در درجه‌ی اول باید با موافقت مقامات دول اشغالگر آلمان انجام می‌شد.

۵. هویدا، «یاد از ایام خدمت وظیفه»، ص ۳۷۵.

۶. فریدون هویدا، گفتگو با نگارنده، ۵ فوریه ۱۹۹۸.

۷. فاطمه‌ی سودآور فرمانفرمائیان، گفتگو با نگارنده، ۱۱ مه ۱۹۹۹.

۸. فریدون هویدا، گفتگو با نگارنده، ۱۰ مه ۱۹۹۹.

۹. برای شرح شخصیت حسنعلی منصور، به گفتگوهایم با فریدون هویدا، نصیر عصار، ضیاء شادمان، فاطمه‌ی سودآور فرمانفرمائیان و احسان نراقی استناد کردم. منابع فارسی درباره‌ی زندگی و افکار وی اندک‌اند.

۱۰. فریدون هویدا، گفتگو با نگارنده، ۲۵ ژوئیه ۱۹۹۹.

۱۱. فریدون هویدا، گفتگو با نگارنده، ۲۴ مه ۱۹۹۹.

۱۲. فاطمه سودآور فرمانفرمائیان، گفتگو با نگارنده، ۱۰ مه ۱۹۹۹.

۱۳. ادوارد سابلیه، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۱۴ مارس ۱۹۹۹.

14. Edouard Sablier, *Iran. La Poudrière: Les Secrets de la Revolution Islamique* (Paris, 1980), 146.

۱۵. سابلیه، گفتگو.

۱۶. پیشین.

17. Sablier, *Iran*, 146.

18. AD Carton 24, 94.

19. Ibid., 287–88.

20. AD Carton 24, "Le Ministre des Affaires Etrangères à Monsieur le Préfet de Police," 2 Aout, 1945.

21. AD Carton 24, "Télégramme a l'Arrivée," 254–255. Docummcnt 73.

22. AD Carton 24, "Le Préfet de Police à Monsieur le Ministre des Affaires Etrangères: Direction d'Asie-Oceanie," No. 6511–4.

23. Ibid., 2.

24. AD Carton 24, "Le Ministre des Affairs Etrangères à Monsieur le Préfet de Police," 2 August 1945.

25. Ibid., 3.

۲۶. احمد قریشی، گفتگو با نگارنده، ۱۵ فوریه ۱۹۹۸. فریدون هویدا نیز این ماجرا را تأیید کرد و اضافه کرد که، در این زمان، امیر عباس استعفا داد، که شاه نپذیرفت. فریدون هویدا، گفتگو با نگارنده، ۲۳ ژوئیه ۱۹۹۹.

۲۷. جمهوری اسلامی قسمت اعظم مکاتبات رسمی مابین مقامات ایرانی و سوئیسی و وکلای مدافع آن‌ها را منتشر کرده است. تصویری که از خلال این مکاتبات به‌دست می‌آید پای افراد زیادی از دو کشور را به میان می‌کشد. ر.ک. حسین کوچکیان فرد، «رسوایی در سویس: اسنادی از دربار شاهنشاهی درباره‌ی قاچاق مواد مخدر»، فصلنامه‌ی تاریخ معاصر ایران، سال اول، شماره ۴، زمستان ۱۳۷۶، صص ۱۳۵ - ۲۰۸.

28. McFarland, "The Crisis in Iran," 159–60.

29. Ibid.

۳۰. خواندنیها، شماره ۲۰۷ (۱۲ شهریور ۱۳۲۵)، ص ۲ و شماره ۲۵۲ (۱۹ بهمن ۱۳۲۵) صص ۳-۲.

31. AD Carton 24, "Télégramme a l'Arrivée," 22–25. Document 129.

۳۲. فریدون هویدا، گفتگو با نگارنده، ۲۴ مه ۱۹۹۹.

33. AD Carton 24, "Télégramme 00135," 26 Juillet 1946

34. AD Carton 24, "Note pour le Cabinet du Ministre," 24 Juillet 1946.

همین اتهامات در دست‌کم در دو تلگرام دیگر تکرار شده است.

35. AD Carton 24, "Télégramme a l'Arrivée," 00144. 9 Aout 1946.

36. AD Carton 24, "Note pour le Secrétaire Générale," 24 Juillet 1947.

۳۷. در تلگرامی از سفارت فرانسه در تهران، شارژ دافر سفارت اعلام کرد، «وجود شخصیتهای مرموزی به‌عنوان طراح و مغز متفکر توطئه برای ما آشکار است. آنان می‌دانند که دیگر در پاریس امکاناتی که زمانی از آن بهره‌مند بودند، دراختیار ندارند. آنان آشکارا میل دارند شخصی چون آقای رهنما که از شمّ لازم داد و ستد برخوردار است، جانشین آقاس سپهبدی شود. منشأ واقعی فعالیت اخیر مطبوعات همین موضوع بوده است.»

.D. Carton 24, "Télégramme a l'Arrivée," 30 Janvire 1947. Ambassade e France en Iran. Document 128.

۳۸. صادق هدایت، نامه‌ها، گردآورنده محمد بهارلو، تهران، ۱۳۵۸، صص ۳۸۳-۳۸۴.

۳۹. پیشین، ص ۳۸۹.

۴۰. پیشین، ص ۳۹۰.

۴۱. هویدا، «یاد از ایام خدمت وظیفه»، ص ۳۷۵.

۴۲. آتش، ۲٦ اسفند ۱۳۲۵.

۴۳. فریدون هویدا، گفتگو با نگارنده، ۱۹ مه ۱۹۹۹.

# فەسڵی شەشەم

## ساڵانی سەرگەردانی

**هاوار بە حاڵی ئەوەی نیشتمانی نیە**

**نیچە**

# ساڵانی سەرگەردانی

ژیانی پڕژانەسەری هووەیدا لە پاریس ئاخروئۆخری ساڵی ١٣٢٥ (١٩٤٧) کۆتایی هات. ئەوکاتە گوازرایەوە بۆ دەفتەری کۆنسوولخانەی ئێران لە شتووتگارت کە تازە دامەزرابوو. لە سەردەمی کارکردنی لە پاریسدا، زۆرجار لەلایەن دەوڵەتی ئێرانەوە سەفەری ئەڵمانی کردبوو. ئامانجی لەو سەفەرانە وتوویژ بۆ ڕێگەدانی ئەو ماکینانە بوو کە ئێران لە سەردەمی حکوومەتی نازییەکاندا کڕیبوونی. ڕەزاشا دەیەویست کارخانەیەکی ئاسن‌تواندنەوە لە ئێران دامەزرێنێ‌و ئەڵمانی نازییش، کە سەودای پەیداکردنی جێ‌پێیەک لە خەلیجی فارس‌و ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستی لەسەردا بوو، حازر بوو بە پێچەوانەی وڵاتە سەنعەتییەکانی دیکە، دەزگاو ماکینە پێویستەکان بە ئێران بفرۆشێ. دەستپێکرانی شەڕی دووەمی جیهانی پێشی ناردنی ئەو ماکینانەی گرت. مەئمووریەتی هووەیدا دووفاقە بوو: هەم دەبوو ئەو ماکینانە کە ئێران پێشتر کڕیبوونی بدۆزێتەوەو هەم دەبوو ڕێگای بەڕێکردنیان خۆش بکا.

لەدرێژەی ئەو سەفەرانەدا هووەیدا ئۆگریی بە بەرنامەی ئەتۆمیی نازییەکان پەیدا کرد. پاش لێکۆڵینەوەیەکی کەم، و دوای چەند وتوویژێک دەگەڵ کاربەدەستانی ئەڵمان، دلخوازانە ڕاپۆرتێکی لەوبارەیەوە بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئێران ئامادەو بەڕێ کردو بەکورتی چەندوچۆنی هەوڵی بێ‌ئاکامی ئەڵمان بۆ وەدەستهێنانی "گەورەچەک"ی تازەی شی کردەوە. ڕاپۆرتەکە کە گەیشتە تاران

هەنگامەیەکی لێ ساز بووو ناوبانگی هووەیدای، وەک دیپلۆماتێکی بەرزەفڕو لێزان بردە سەر.[1]

بەسەرکەوتنی هاوپەیمانان لە شەڕدا، دەوڵەتی ئێران هاتە سەر ئەوە کە دەفتەرێکی تازەی کۆنسوولخانە لە ئەڵمانی داگیرکراو بکاتەوە. هەتا ئەودەم ئەو مەسەلانەی پێوەندییان بە ئەڵمانەوە هەبوو هەموو لەژێر چاوەدێریی باڵیۆزخانەی ئێران لە پاریسدا بوون. عەبدوڵڵای ئینتیزام کە دیپلۆماتێکی کارامە بوو بە سەرپەرستی دەفتەری تازەی ئێران دیاری کرا. لەسەر داوای وی، ئەمیر عەبباسی هووەیداشیان ناردە ئەو دەفتەرە تازەیە.[2] هووەیدا لەپێشدا بە خەبەری بەجێهێشتنی شاری پاریس زۆر تێکچوو. دەیگوت: "حوکمی گوازرانەوە لە پاریس بۆ ئەڵمانی وێرانی شەڕیان دایە دەستم. بەڕادەیەک لەوحوکمە نارەحەت بووم کە شەو خەوم لێنەکەوت." هەر لەوکاتەدا خۆشحاڵ بوو کە لەپۆستی تازەیدا لەبەردەستی ئینتیزامدا کار دەکا.[3]

ئینتیزام پیاوێکی بەفکر بوو. ئۆگریی بە بواری جۆراوجۆرەوە هەبوو. دەگەڵ نوسرەتوڵڵای برای، لە دیپلۆماتە کۆنەکارەکانی ئێران بوون. هەردوو برا خۆشناو بوون. عەبدوڵڵا بابی هووەیدای لە وەزارەتی دەرەوە ناسیبوو.[4] ئینتیزام بەرلەوەی بکرێتە سەرۆکی دەفتەری ئێران لە شتووتگارت، لە زۆر پۆستی گرنگی وەزارەتی دەرەوەی ئێراندا خزمەتی کردبوو. سەرەتای دەیەی بیستی زایینی، ماوەیەک سکرتێری یەکەمی باڵیۆزخانەی ئێران لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوو. لەباری فەرهەنگییەوە ئینتیزام وەک هووەیدا فرانکۆفیل بوو. ئیشتیای هەردووکیان لە کتێبی جۆراوجۆر تێربوونی نەدەناسی. لەو بارەیەوە، سەلیقەی ئینتیزام تەنانەت لە هووەیداش جۆراوجۆرتر بوو. هەموو جۆرە کتێبێکی دەخوێندەوە. هێندێ جار لە دەقە دژوارەکانی سۆفیگەری ورد دەبۆوە، و سەردەمێک وەرگێڕراوی فەڕانسەیی گۆڤاری زۆر ساکاری ڕێدێرز دایجێستی* بەوردی

---

* Reader,s Digest.

دەخوێندەوە. وەک هووەیدا زۆری حەز لە مۆسیقای کلاسیکی ڕۆژئاوا دەکرد. ئەو ماوەیەی لە شتووتگارت بوون، هەردووکیان حەزیان لە بەرهەمەکانی بیتهۆڤن بوو.[5] بەڵام ئینتیزام، بەپێچەوانەی هووەیدا، لە شیعرو ئەدەبی فارسییش تەواو شارەزا بوو. وا قاو بوو کە دەگەڵ دەروێشان کەوتوەو گۆیا تا ئاخری عومریشی هەر دەروێش بووە.

ئۆگری‌و حەزە سیاسییەکانی ئینتیزام تەنانەت لە ئۆگرییە فکرییەکانیشی ئاڵۆزبڵۆزتر بوون. بە دروستکار بەناوبانگ بوو. زۆر سەربەخۆو قسەلەڕوو بوو. وەختێک لە سەرەتای دەیەی سیی هەتاویدا، شا وردەوردە داوای لە هەموان کرد ملکەچی بێ‌ئەملاوئەولای فەرمانەکانی بن، و بە نیشانەی ئەو ملکەچییە، بە ئەرکی هەمووانی دانا لە ڕێوڕەسمەکاندا دەستی ماچ بکەن، ئینتیزام یەکێک لەو چەند سیاسەتمەدارە بوو کە نەچوونە ژێر باری ئەو داوایە.[6] هەر لەوکاتەدا ماسۆنییش بووو بەڕواڵەت هەر بەهاندانی ویش بوو کە هووەیداش ساڵی١٣٣٩ (١٩٦٠) چووە لۆژی تازەدامەزراوی فرووغییەوە. ئینتیزام "گراند ماستەر" مامۆستای گەورەی ئەم لۆژە بوو.[7] وەک دەزانین ماسۆنییەکان سەد ساڵێک دەبێ ڕۆڵێکی گرنگ‌و جێی باسیان لە سیاسەتی ئێراندا بەئەستۆوەیە. لەلایەک کۆمەڵانی خەڵک ئەم ڕێکخراوە بە دوژمنی خۆیان دەزانن. دەڵێن ئەندامانی ئەو ئەنجومەنی برایەتیی نهێنییە، جاسووسی هێزە ئیستیعمارییەکان، بەتایبەتی ئینگلیستانن. لەبەرامبەردا، بەباوەڕی زۆر لە سیاسەتمەدارانی ئێران، چوون بۆ نێو ئەو ڕێکخراوە دەستەبەری سەرکەوتنی خێرا بە پلیکانەکانی دەسەڵات‌و مەزنیدایە.[8]

دیار نیە هووەیدا بە چ هۆیەک دەگەڵ ئەو ڕێکخراوە کەوت. داخوا هەوای دەسەڵات لە سیاسەتدا ئەوی بەولایەدا برد، یان هەر دەیەویست شوێنی ڕێبەرە سیاسییەکەی خۆی، ئینتیزام هەڵگرێ. دەبێ ئەوەی زانیبێ کە چوونی بۆ نێو ئەو ڕێکخراوە، بەتایبەتی کە بابیشی بە ئەنگلۆفیل بەناوبانگ بوو، ڕوومای سیاسیی وی خەوشدار دەکا. دەی-زانی کە لە ئێران، زۆرجار گوناحی باوکان دەخەنە ئەستۆی کوڕانەوە.

دەیزانی کە لە مێشکی ئێرانییاندا، ئەندامەتیی ماسۆنییەکان دەگەڵ سەربەخۆیی سیاسیی و نوێخوازیی ڕاستەقینە ناتەبایە.

هەرچەند هێندێ بەڵگە نیشان دەدەن کە هووەیدا پاش ئەوەی بۆتە سەرۆکوەزیر هەرگیز لە کۆبوونەوەی ماسۆنییەکاندا بەشدار نەبووە، بەڵام هەر تێکەڵبوون دەگەڵ ئەم ڕێکخراوەی لەباری سیاسییەوە زۆر گران لەسەر کەوت.[9] ساڵی١٣٤٧(١٩٦٨)، هێندێک لە دوژمنانی هووەیدا، بەتایبەتی عەلەم، وەزیری دەربار، و نەسیری، سەرۆکی ساواک، کەلکیان لە دەسەڵاتی خۆیان وەرگرت و دەرەتانی چاپی کتێبی هەنگامەسازی ڕائین لەبارەی مێژووی بزووتنەوەی ماسۆنییان پێک هێنا.[10] لەم کتێبەدا، لیستەیەک لە ئەندامانی ماسۆنی لە ئێرانیش چاپ کرا. لەڕاستیدا، بەڕاسپاردەی ڕائین، دەزگای ساواک وتوویژە تەلەفونییەکان و نامەگۆڕینەوە پۆستییەکانی یەکێک لە ئەندامانی ماسۆنی لە ئێرانی خستبووە ژێر چاوەدێریی و لەوڕێگایەوە، زانیارییەکی زۆری لەسەر چەندوچۆنی چالاکیی ماسۆنییەکان لە ئێران بەدەست هێنابوو. عەلەم بەتوندی لایەنگری چاپی کتێبەکە بوو. دەیزانی کە بەکۆمەگی وی دەتوانێ ناوبانگی سیاسیی دوژمنەکانی بزڕێنێ. گۆیا تەنانەت ڕای سپاردبوو ئەو کتێبە لە زانکۆش بخوێندرێ.[11] لەکتێبی ڕائین، ماسۆنی لە ئێراندا، هووەیدا وەک ماسۆنییەک و ئینتیزام وەک "گراند ماستەر" ناو برابوون.[12] دۆستان و لایەنگرانی هووەیدا لە ساواکدا، بەتایبەتی پەرویزی سابیتی، لە سەرەتاوە دژی چاپی کتێبەکە بوون. بەوحاڵە، نە سابیتی و نەکەسی دیکە هووەیدایان لە نیزیکبوونەوەی چاپی کتێبەکە ئاگادار نەکردو هووەیدا ئەمەی زۆر پێناخۆش بوو. لایەنگرانی چاپی کتێبەکە نیگەران بوون کە ماسۆنییەکان، بە کەلکوەرگرتن لە دەسەڵاتی بەربڵاوی خۆیان، پێشی چاپکردنی بگرن.[13] بۆ بەرگری لەومەترسییە چاپەکەیان دایە چاپخانەیەک کە جێمتمانەی ساواک بوو. بڵاوبوونەوەی ماسۆنی لە ئێران هەڵلایەکی لێساز بوو. هەرچەند لەکتێبەکەدا ڕائین کەموزۆر، لە هەموو جێیەک، ناوو شۆرەتی ئەندامانی لۆژەکانی هێنابوو

لەبارەی هووەیداوە تەنیا شۆرەتەکەی هێنابوو. ئەگەر مەبەستی لەوکارە شاردنەوەی کەسایەتیی هووەیدا بووبێ، هەوڵەکەی زۆر ناسەرکەوتوو بوو. لەڕاستیدا، نەبوونی ناوی چووک، سەرنجی خوێنەرانی زیاتر بۆلای ناوی هووەیدا وەک هەڵاواردنێکی بەرچاو ڕاکێشا.

جگەلەوە، لە کتێبی ڕائیندا ئیددیعا کرابوو کە حەسەنعەلیی مەنسووریش حەزی کردوە بچێتە گەڵ ماسۆنییەکان، بەڵام داوای ئەندامەتییەکەی لە لۆژی هومایوون ڕەت کراوەتەوە. گۆیا ئەو ڕەتکردنەوەیە بۆتە هۆی ئەوە کە دواتر مەنسوور زۆرجار بە زمانێکی یەکجار توند هێرش بکاتە سەر ماسۆنییەکان.[١٤] داستانی قاچاغی دراو لە باڵیۆزخانەی ئێران لە پاریس هووەیدای دەگەڵ "جیهانی بیزانسی"ی سیاسەت لە ئێران ئاشنا کرد. لەبەرامبەردا، تێکەڵبوونی دەگەڵ ماسۆنییەکان ئەوی تووشی یەکێک لە سەرسوڕهێنترین کێشەکانی نێوان تاقمەکانی دەسەڵاتی دەورانی شا کرد. لەڕاستیدا دەتوانین کێشەی هەمیشەیی‌و توندی نێو ئەوتاقمانە بە یەکێک لە سروشتە بەرچاوەکانی سیاسەت لەدەورانی شادا دابنێین.

عەلەم لە بیرەوەرییەکانیدا زۆر بەئێشتیاوە لە ئاکامەکانی بڵاوبوونەوەی کتێبی ڕائین دەدوێ‌و دەنووسێ لەدەربار هەمووکەس، لەوانە شاو شاژنیش، خەریکی خوێندنەوەی کتێبەکە بوون. گۆیا هەردووکیان پێیان سەیر بووە کە نیزیک بەتەواوی سیاسەتمەدارانی ئێران بە ماسۆنی دەرچوون. شا کە بەقسەی عەلەم، هەمیشە لە ئینگلیس دڕدۆنگ‌و بێ‌متمانە بوو، کتێبی ڕائینی بە بەڵگەیەکی ئیددیعاکەی خۆی دەزانی.[١٥] بێجگە لەوە، بەقسەی عەلەم، شا ئەوی ڕاسپارد کە بزانێ داخوا بەڕاست ڕائین بە دەستووری هووەیدا گیراوە یان‌نا. تەنانەت باڵیۆزخانەی ئەمریکاش کەمکەم لەبارەی چاپی کتێبی ڕائینەوە پرسیاری بۆ دروست بووو نەک‌هەر ڕاپۆرتێکی لەسەر ئامادە کرد، بەڵکوو ئاماژەی بە ڕۆڵی عەلەمیش لەو داستانەدا هەبوو.[١٦] هەر بەپێی ئەو ڕاپۆرتە، "گۆیا لەبەرامبەر کتێبەکەدا، لیستێک لە مەئموورانی

سیا لە ئێرانیش وەک تۆڵەئەستاندنەوە بڵاو کراوەتەوە."[170]

بەڵام لە پاریسی دوای شەڕ، چەندساڵ پێش ئەو داستانە پڕ هەنگامەیە،ماڵی ئینتیزام ببووە شوێنی کۆبوونەوەی فەرهەنگیی هێندێک لە ئێرانییانی دانیشتووی پاریس. لەلای ژمارەیەک لەو لاوانە، یەک لەوان ئەمیر عەبباسی هووەیدا، ئینتیزام نموونەی سیاسەتمەدارێکی کارامەو بەئەزموون بوو، لایەنگرانی لە ماڵەکەی کۆ دەبوونەوەو ئەویش لە هەرشتێ شتێکی بۆ باس دەکردن. جارێک باسی دەرمانی تازەی هەلامەتی دەکردو جاری وابوو وردەکاریی زمانەوانیی دەقەکانی سۆفیگەریی لێک دەدایەوە. بەربڵاویی ئۆگری‌و زانیارییەکانی بەڕاستی گوێگرە لاوەکانی سەرسوڕماو دەکرد. ئەمیر عەبباسی هووەیداش کەوتبووە ژێر کاریگەریی زانست‌و ئەزموونی ئینتیزام. ئینتیزامیش بەنۆرەی خۆی هووەیدای بەلاوێکی پڕهەست دەزانی‌و دەیگوت دواڕۆژێکی درەوشاوەی لەپێشدایە. لەو ڕۆژانەدا ئینتیزام دەورووبەری پەنجا ساڵ دەبوو و دەتگوت هووەیدای کردۆتە کوڕی خۆی.[18] بەمجۆرە هووەیدا ئەو ڕێبەرو پشتیوانە بەتوانایەی دۆزیەوە کە لە ساڵی ١٣٢١ (١٩٤٢)ەوە بۆی دەگەڕا. لە پاریس چووزەرەی پێوەندیی خۆشویستن لەنێوان ئەمدووانەدا گوورا. لە شتووتگارت ئەو چووزەرەیە بوو بە نەمامێکی ئەستوورو هاوڕێیەتییەکی درێژماوە. تەنانەت ئەو کاتەش کە ئینتیزام کەوتبووە بەر ڕقی شاو لە خانەنشینی بەولاوە چارەیەکی نەبوو، هووەیدا هەروەک جاران ئەوی بە "ئاغا" بانگ دەکرد. لە سەردەمی سەرۆکوەزیرییەکەیدا، هەمیشە ئینتیزامی بۆ ئەندامەتیی کۆمیتە گرنگە دەوڵەتییەکان بانگهێشتن دەکرد. بەڵام تەنانەت لە لووتکەی بەرەوپێشچوونی ئابووریی ئێرانیشدا ئینتیزام ئۆگرییەکی بە ماڵوەسە-ریەکنان نەبوو. ژیانی سادەو بێ ئازار بوو، و ئەمەش ئەوی لە ماڵی دنیا بێنیاز دەکرد. لە ئاپارتمانێکی چووکەڵەی دووژووریدا دەژیاو گوزەرانی لە مووچەی خانەنشینی دابین دەکردو ساڵی ١٣٦٤ (١٩٨٥) هەرلەوێدا مرد." ڕۆژنامەی تایمزی لەندەن لە تازیەکەیدا نووسی ئینتیزام "بە زیرەکی‌و تیژهۆشی‌و دروستکاریی بێئەملاوئەولا بەناوبانگ بوو."[190]

دیارە سادەژیانەکەی لە ڕۆژەکانی شتووتگارتیشدا بەناوبانگ بوو. بایەخێکی ئەوتۆی بە ماڵو سامان نەدەدا. لەبەرامبەردا، هوومەیداو مەنسوور- کە بە ڕاسپاردەی هوومەیدا هاتبووە شتووتگارت- خۆشگوزەران بوون.[20] لەوڕۆژانەدا بەشی زۆری شاری شتووتگارت لە ئاکامی شەڕدا تەنیا وێرانەیەکی لێمابۆوە. خانووی بەکرێ بە دژواری دەست دەکەوت. هاوپەیمانان هەموو خانووە چۆڵەکانیان بەدەستەوە بوون. لەڕاستیدا نەک هەر بۆ دروستکردنی دەفتەرێکی تازەی کونسوولی ڕەزامەندیی هاوپەیمانان پێویست بوو، بەڵکوو هەر ئەوانیش دەیانتوانی خانووبەرە بۆ دەفتەرو ماڵی دیپلۆماتەکان دابین بکەن. فەڕانسەو ئینگلیستان دەسبەجێ خەبەریان بە ئێران دا کە لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی واندا، خانووی چۆڵ دەست ناکەوێ. لە بەرامبەردا ، ئەمریکاییەکان بەڵێنیان دا کە لە ناوچەی ژێر حوکمی خۆیاندا، شوێنێکی گونجاو بۆ دەفتەری کونسوولخانە دەبیننەوە. پاش ماوەیەک، دوو خانووبەرەی تاڕادەیەک گەورەیان لە شاری شتووتگارت بۆ ئەوکارە دیاری کرد. یەکیان خانوویەکی سێ نهۆم بوو کە کرایە دەفتەری کونسوولو شوێنی ژیانی ئینتیزام. ئەوی دیکەش خانوویەک بوو بە چوار ژووری خەوەوە کە بوو بە جێگەی ژیانی کارمەندەکانی دیکە. هەردوو خانووەکە کەلوپەلی نێوماڵیان تێدا بوو. شتی عەنتیکە لە هەردووکیاندا زۆر بوو. لە ڕازاندنەوەی هەردووکیاندا نیشانەی زەوقو سەلیقە دەبینرا. هەردووکیان هی کاربەدەستانی پایەبەرزی حیزبی نازی بوونو هەردووکیان لە کۆتایی شەڕدا لەلایەن هێزەکانی هاوپەیمانانەوە زەوت کرابوون.[21]

بەمجۆرە، هوومەیداو مەنسوور بوونە هاوماڵ. چێشتلێنان و پاکوخاوێنیی ماڵەکە لە ئەستۆی ژنێکی ئەڵمانی بوو. زۆری پێنەچوو کە هوومەیدا شۆڤەرلێتێکی شینی ئەمریکایی کڕیو هەربەوترومبێلە، لەشاردا دەگەڕاو گەشتوگوزارەکانی بۆ ئینتیزامی گۆشەنشینیش بوون بە مایەی گۆڕانێک. بوونی ئاشپەزو ترومبێلو لە هەمووی گرنگتر ئەوڕاستییە کە هوومەیداو مەنسوور هەقی شت کڕین لە کۆمیسارییای

سوپای ئەمریکایان هەبوو، دەستیان وەدستی یەک داو باریکی خۆشگوزەرانییان دا بەژیانیان. جگەلەوە، بەشیکی بەرچاو لە پیاوانی ئەڵمانی لەشەڕدا کوژرابوون‌و ئەمەش جیگەوپیگەیەکی سەرتۆپی بە مەنسوورو هووەیدا بەخشیبوو.

هەرچەند لەوسالأنەدا کە هووەیدا سەرۆکوەزیر بوو، یەکێک لە یاریدرەکانی لە بارەیەوە گوتبووی: "نە نێربازە...نە ئیشتیای سیکسیی زۆرە"، و ئەگەرچی مەنسوور، پیش مردنی بە ژنباز ناوبانگی دەرکردبوو، بەڵام وابزانە لە سەردەمی شتووتگارتدا ڕۆڵی ئەم دووانە پیچەوانە بوو.[٢٢] لەلایەک هووەیدا، بە کەلکوەرگرتن لە ژیانی ئاسوودەو ڕازاوەی خۆی، دەگەڵ چەند ژنی ئەڵمانی پیوەندیی دامەزراندبوو، لەلای دیکە مەنسوور لە هەموو ماوەی مەئموورییەتی خۆیدا تەنیا دەگەڵ کچیکی جحیڵی ئەڵمانی پیوەندیی نیزیکی هەبوو. دۆستایەتی‌و پیوەندییەکانی هووەیدا لەو دەورانەدا هیچ کامیکیان زۆری نەکیشا. وینەی یەکیک لەو ژنانە بەشیک لە ئالبۆمی تایبەتیی مەنسوور بوو کە دەکرێ بەتەنیا شوینەواری ئەوپیوەندییەی بزانین. مەنسوور دوای ژنهینانی، لە ترسی ئیرەیی خیزانی، ئەوئالبۆمەی لەماڵی هووەیدا دانابوو. وینەی دۆستی هووەیدا کە بەگاڵتە پییان‌دەگوت "قوون‌دەهۆڵ" لەوئالبۆمەدا، زۆرجار دەبووە بابەتی گاڵتەی دۆستانەی نیوان لەیلاو هووەیدا.[٢٣] بارۆون کلاپیکیش، کە کەسایەتیی خۆشەویستی ئەدەبیی دەورانی لاوەتیی هووەیدا بوو وەک هووەیدا ڕەفتاریکی زۆر ڕیزدارانەی دەگەڵ ژنان هەبوو. هەرلەوکاتەدا، نەی‌دەتوانی پیوەندیی دریژخایەنیان مەگەر وەک هاوڕێ، دەگەڵ دامەزرینێ.

دەتوانین بڵیین سەردەمی شتووتگارت، لەباری چەندوچۆنی پیوەندیی سیکسییەوە، چالاکترین دەورانی ژیانی هووەیدا بووە. وا دیارە هەتا دەسەلأتە سیاسییەکەی زیاتر دەبوو، ئیشتیا سیکسییەکەی کەم دەبووە. گۆڤاری "توفیق"، لە سەردەمی سەرۆکوەزیری (صدارت)ی هووەیدادا ئەو نهینییەی بۆ دەرکەوتبوو. ساڵی چوارەمی سەرۆکوەزیرییەکەی، لەسەر بەرگی حەوتوونامەی "توفیق" وینەیەکی

هووەیدا چاپ کرا. وەک هەموو ئەوجۆرە وێنانە، هووەیدا ئەمجاریش زۆر قەڵەو بوو. پیپە ناسراوەکەی بە لالێویەوە بووو ئاوی بەدەمدا دەهاتە خوار. لەجیاتی شمشێر، وەکازێکی لە قەدە ئەستوورو قەڵەوەکەی بەستبوو؛ شۆخێکی جوان و ڕێکوپێکی دەباوەش گرتبوو. کچەکە سنگێکی دەرپەڕیوو نێوقەدێکی باریکی هەبووو داوێنێکی کورتیشی دەبەردا بوو. گۆرەویی نایلۆنیو کەوشی پاژنەبڵندی دەپێدا بوون و حەوت دەست سووراوو سپیاوی لەخۆی دابوون. کچەکە ناوی "خاتو صدارت" بوو. هووەیدا جلوبەرگی گوڵدۆزیکراوی تایبەتیی "صدارت"و سەلامی دەرباریی دەبەر کردبووو بە پاڕانەوە داوای لە مارەبڕێک - کە ئەویش، وەک هووەیدا ئاوی بەدەمدا دەهاتە خوار، - دەکرد کە "خاتو صدارت"ی بەیەکجاری لێ مارە بکا.

دیارە لە شتووتگارت مەنسوور، لەچاو هووەیدا، ئەندامێکی تازەکارتر بووو بۆیە لەبەر دەستی هووەیدادا کاری دەکرد. دەگەڵ ئەو جیاوازییە لە پلەی ئیداریدا هووەیداو مەنسوور وەک دوو دۆستی هاوشان پێکەوە ڕەفتاریان دەکرد. بەرەبەرە، لەماوەی دە ساڵی دواتردا، سروشتی ئەو دۆستایەتییەش گۆڕا. هووەیدا هەرنەبێ بەڕواڵەت، نەک هاوشانی مەنسوور، بەڵکوو ژێردەستی وی بوو. زۆر لە دۆستانی هووەیدا، و هێندێک لەو دیپلۆماتانە کە هەردووکیان دەناسین، دەیانگوت هووەیدا هەم لە مەنسوور بەهۆشتر بوو، هەم توانای سیاسیی و کارامەییەکی زیاتری هەبوو. ستوارت ڕاکوێل[*] کە لەسەرەتای دەیەی پەنجادا وەزیرموختاری ئەمریکا لە ئێران بوو، و بەبۆچوونی عەلەم هۆی بنەڕەتیی سەرۆکوەزیریی مەنسوور بوو[**] ئەمڕۆ پێداگرە کە:

---

[*] Stuart Rockwel.

[**] عەلەم لەبیرەوەرییەکانیدا ئیدیعای کردوە کە مەنسوور شەوی هەڵبژاردنی ۱۳٤۲ (۱۹٦۳)،لەماڵی ڕاکوێلەوە زەنگی بۆ عەلەم لێداو لەبەری پاڕایەوە بەهەرجۆر بووە ئەوی وەک نوێنەری یەکەمی تاران ڕابگەیەنن. بەگومانی عەلەم، مەنسوور بێگومان "نۆکەری ئەمریکاییەکان" بوو. دیارە عەلەم ڕاکوێلیشی خۆش نەدەویستو لانی کەم

"هەرگیز نەزەریکی زۆرباشم لەسەر مەنسوور نەبوو، لە هیچ باریکەوە لێوەشاوەیی‌و درەوشانەوەی نیشان نەدەدا. خەڵکی زۆر دەناسی، بەلاّم لە هیچ بواریکدا پسپۆڕ نەبوو." لەلایەکی دیکە، پێی‌وابوو، هوەیدا "پیاویکی لەبەردڵان‌و هەمەلایەنە بوو دەتگوت هەمیشە پرشنگێک لە چاوەکانیدا دەدرەوشێتەوە."[٤٠]

ڕاکوێل لەمداوەرییەیدا تەنیا نەبووو هەربۆیەش، زۆر لەدۆستانی هوەیدا، لە چەندوچۆنی دۆستایەتیی وی دەگەڵ مەنسوور حاڵی نەدەبوون. نەیان‌دەزانی چۆن لەو دۆستایەتییەدا مەنسوور حاڵەتی باڵادەستی‌و سەرۆکایەتیی وەرگرتوە.[٤٥] ڕەنگە بتوانین کلیلی ئەو نهێنییە لەوەدا بدۆزینەوە کە لە شتووتگارت، مەنسوور دەگەڵ جان جەی‌مەک‌کلۆی* ئاشنا بوو. مەک‌کلۆی لە ساڵانی دوای شەڕدا بە یەکێک لە پیاوانی بەدەسەلاّتی ئەمریکا دەژمێردرا. ماوەیەک یارمەتیدەری وەزارەتی بەرگری بوو. دەگەڵ شکانی ئەڵمان، کرا بە سەرۆکی حکوومەتی داگیرکراوی ئەڵمان. زۆر لە لێکۆڵەران نوێ‌کردنەوەی ئەڵمان بە بەرهەمی سیاسەتەکانی وی دەزانن. پاش گەڕانەوە بۆ ئەمریکا، بوو بە سەرۆکی دەستەی بەڕێوەبەریی بانکی چیس مانهاتەن** مەنسوور دوای ناسینی مەک‌کلۆی، زۆرجار تەنانەت دەگەڵ ئەمیر عەبباس‌و فەرەیدوونی هوەیداش لافی "پێوەندی" دەگەڵ ئەمریکاییانی لێ‌دەدا. زۆرجار باسی "پێوەندییەکانی دەگەڵ کاربەدەستانی ئەمریکای دەکرد. ئیددیعای دەکرد کە "ئەوانی لە وەزعی

---

جارێک بە "سەگباب" ناوی بردبوو. (ئەسەدوڵڵای عەلەم، بیرەوەرییەکان،بەرگی دووەم١١٧). بە وتەی ڕاکوێل، داستانی عەلەم لەبارەی تەلەفونی مەنسوورەوە "سەرانسەر بێ بناخەیە." (وتووێژ دەگەڵ ڕاکوێل،٢٣ی مای١٩٩٩). ڕاکوێل هەرلەوکاتەدا دەیگوت پێی وایە عەلەم کەسێکی زۆر ڕپاکارو دووڕوو بوو. تەواوی ئەوماوەیەی دەمناسی‌و یەکترمان دەدی،وای دەنواند کە لەدۆستانی منە."

* John J. McCloy

** Chasc manhatian.

ئێران ئاگادار کردوە".[٢٦] تەنانەت ئەورۆژانە کە کارمەندێکی چووکی کۆنسوولخانەی ئێران لە شتووتگارت بوو بەرزەفرییە سیاسییەکەی سنووری نەبوو. وا دیار بوو بە شتێک جگە لە کورسیی سەرۆکوەزیری ڕازی نابێ.[٢٧]

لە سەردەمی مەئمووریەتی شتووتگارتدا، مەنسوورو هوەیدا بێجگە لە ڕاگەیشتن بە کاروباری دەفتەری کۆنسوولی، جاروبار بۆ خۆشی دەچوونە پاریسیش. ماوەیەک بوو فەرەیدوونی هوەیدا لە باڵیۆزخانەی ئێران لە پاریس دەستی بەکار کردبوو. هەرلەوکاتەدا، ئاشقی نووری، خوشکی مەنسووریش ببوو. ساڵی١٣٢٨ (١٩٤٩) ئەم دووانە لە ڕێوڕەسمێکی سادەدا زەماوەندیان کرد.[٢٨] ئەمیرعەبباس و مەنسووریش هەردووک لە ڕێوڕەسمەکەدا بەشدار بوون. لەوەودوا پێوەندیی بنەماڵەییش کەوتە سەر پێوەندیی دۆستانەی ئەمدووانە. هەروا بزانە چەرخی زەمانە هەر دەرفەتێکی دەقۆزتەوە بۆئەوەی ژیانی ئەڤینداری و سیاسیی ئەم دووکەسە ڕۆژلەڕۆژ زیاتر لێک گرێ بدا.

هەرچەند هوەیدا دەیەویست بە یارمەتیی ئێنتیزام بەخێرایی پلیکانەکانی سەرکەوتن ببڕی، بەڵام لە ساڵی١٣٢٧ (١٩٤٨)ەوە باروودۆخی تاران و پاریس بەرەبەرە گۆڕاو ئیدی زۆر بەمەیلی وی نەبوو. لە سەرەتای ئەوساڵەدا، سوپەهبودی لە پۆستی باڵیۆزی ئێران لە پاریس وەلا نرا. ساڵی١٣٢٩ (١٩٥٠)یش دەورەی مەئمووریەتی هوەیدا لە ئەڵمان تەواو بوو. ئەو دەسبەجێ گەڕایەوە ئێران. وڵات جارێکی دیکە بەرەو قەیرانێکی قووڵ دەڕۆیشت و لەبەردەم ئاڵوگۆڕێکی گەورەدا بوو. بۆ چەند حەوتوو ڕەجەبعەلیی مەنسوور دووبارە کرایەوە سەرۆکوەزیر. بەڵام دەوڵەتەکەی زۆرکەمتەمەن بوو. لەوکاتەدا تەنیا یەک کەس، واتە موسەددیق، پیاوی مەیدانی سیاسەتی ئێران بوو. ئەو بێباکانە بۆ ئینگلیسییەکان چووە مەیدان و بە میللیکردنی سەنعەتی نەوت، مەیدانی سیاسەتی ئێرانی گۆڕی. بەڵام موسەددیق لە ڕێکخراوی حیزبی بێزار بوو. جگەلەوە، حەزی لە جۆرێک سیاسەتی خەڵکی، یان پۆپۆلیستی، دەکردو لەئاکامدا

ڕێکخراوێکی لە حیزب‌و ڕێکخراووکەسایەتییە جۆراوجۆرەکان پێک هێنا، بەناوی "جبهە ملی ایران"، بەرەی نیشتمانیی ئێران. هەرچەند لەڕاستیدا تەنیا دەسمایەی بەرەی نیشتمانی هەر ناوو میراتی موسەددیق بوو، بەوحاڵە، ئەم ڕێکخراوە لە سیاسەتی چل ساڵی دواتری ئێراندا هەمیشە حزوورێکی بەرچاوی هەبوو و لەزۆر بڕگەی گرنگی مێژووی تازەی ئێراندا نەخشێکی گرنگی یاری کرد.

لە سیاسەتی قەیراناویی ئەو ساڵانەدا، جگە لە موسەددیق، ئایەتوڵڵا کاشانییش ڕۆڵێکی زۆر گرنگی هەبوو. وەختێک هاوپەیمانی موسەددیق بووو پاش ماوەیەک، یەکیەتییەکەیان لە ئاکامی ناکۆکیی شەخسی‌و سیاسیدا لەبەریەک هەڵوەشا. جگەلەوە، کاشانی هەرلەوکاتەدا مەرجەعی تەقلیدی تاقمێکی نیزامیکاری ئیسلامی بوو بەناوی فیدائیانی ئیسلام. لە ئاخروئۆخری دەیەی بیستی [هەتاوی]دا ئەم تاقمە بزووتنەوەیەکی بەربڵاویان دژی ڕووناکبیران‌و سیاسەتمەدارانی عورفیی ئێران دەست پێکرد. هەر پاشماوەکانی ئەم تاقمەش پازدە ساڵ دواتر حەسەنعەلیی مەنسووریان کوشت. لەوکاتەدا مەرجەعی تەقلیدی تازەیان ئایەتوڵڵا خومەینی بوو. شێخ سادقی خەڵخاڵی، کە دواتر هەروەک بۆخۆی لە بیرەوەرییەکانیدا دەنووسی بە "قازیی پیاوکوژ" ناوبانگی دەرکرد، یەکێک لە لایەنگرە بەناوبانگەکانی ئەو فیدائیانی ئیسلامە بوو. دیارە هەروەک لە بیرەوەرییەکانی ئەم دوایییەی ئایەتوڵڵا مونتەزیری دەردەکەوێ، فیدائیانی ئیسلام، هەرلەسەرەتای دەستپێکردنی چالاکییەکانی خۆشیانەوە، هێندێ پێوەندییان بە ئایەتوڵڵا خومەینییەوە هەبووە. ئایەتوڵڵا برووجوردی کە حەزی لە چارەی ئەو ڕێکخراوەو ڕێبەرەکانی نەبوو، ئایەتوڵڵا خومەینیی بە یەکێک لە پشتیوانانی فیدائیان دەزانی‌و هەربۆیەش دڵی لێی ئێشا. ساڵی١٣٢٩ (١٩٥٠)، واتە کاتی گەڕانەوەی هووەیدا بۆ ئێران، حیزبی توودە لەوپەڕی دەسەڵاتی خۆیدا بووو زۆر لە ڕووناکبیرانی وڵاتی بۆلای ڕیزەکانی ڕاکێشابوو. لە ساڵەکانی سەرەتای دەیەی بیستی[هەتاوی]دا ئەم حیزبە لە هەڵبژاردنی مەجلیسدا بەشدار بووو توانی هەشت کەس لە ئەندامانی خۆی لە چەند شاری

جۆراوجۆر بنێرێتە مەجلیس. بەڵام وەختێک تەقە لە شا کرا، حیزبی توودە بە تۆمەتی بەشداری لەو پیلانەدا، بە ناقانوونی ڕاگەیەندرا* کەچی حوکمی ناقانوونیبوونی ئەم حیزبە هێندە بەجیددی وەرنەگیراو لەئاکامدا زیاتر کۆمەگی بەحیزبی توودە کردو خەرمانەیەکی قارەمانەتیی بەدەوردا کێشا. نفووزی حیزب لە یەکیەتییە کرێکارییەکانیشدا ڕووی لە چوونەسەر بوو. لە هەمووی گرنگتر، حیزبی توودە توانیبووی ڕایەڵکەیەکی بەهێز لە ئەفسەرانی لایەنگری خۆی لەنێو هێزە چەکدارەکاندا دروست بکا.

لەو هەلومەرجە پرجۆشوخرۆشەدا بوو کە ساڵی١٣٢٩ هووەیدا گەڕایەوە ئێران. یەکەمکاری لە وەزارەتی کاروباری دەرەوەدا جێنشینی پێوەندییە گشتییەکان بوو. کارێکی زۆر لەشانانگران بوو. نە لەباری فکرییەوە سەرنجڕاکێش بوو، نە لەباری سیاسییەوە گرنگ بوو. بەڵام کۆتایی ساڵی١٣٣٠ (سەرەتای ساڵی١٩٥٢) وا دیار بوو بەختی هەستاوەتەوە. عەبدوڵڵای ئینتیزامی پشتیوانی، کرا بە وەزیری کاروباری دەرەوەو ئەویش هووەیدای وەک سەرۆکی دەفتەری خۆی دیاری کرد. دیارە چوون ئەوکاتە دەفتەری وەزیر کارمەندی دیکەی نەبوون، لەڕاستیدا سەرۆکی دەفتەر شتێک نەبوو جگە لە سکرتێری وەزیر. ئەم جارە وەزیرییەکەی ئینتیزام مانگێکیشی خۆ ڕانەگرت. دەوڵەتێک کە ئەو وەزیری بوو نەیتوانی دەگەڵ شەپۆلی ڕوولەهەڵچوونی ناسیۆنالیزم لە وڵاتدا بەڕێدا بڕوا. موسەددیق سیمبولی ئەم بزووتنەوەیە بوو. سەرەنجام لە بانەمەڕی ١٣٣٠ (١٩٥١)دا شا

---

* هەرچەند لەوکاتەدا هێزەکانی ئۆپۆزیسیۆنی ڕێژیم ئەو تۆمەتەیان تەواو بە بێبناخە لەقەڵەم دەدا، بەڵام لە چەند ساڵی دواییدا، بەڵگەکانو بیرەوەرییەکانی سەرانی حیزبی توودە گومانێکیان نەهێشتۆتەوە کە نوورەددینی کیانووری، یەکێک لە ڕێبەرانی حیزب دەستی دەکاری ئەو تێرۆرەدا هەبووە. بۆ دەستکەوتنی پوختەی ئەو داستانەو نەخشی کیانووری بڕوانە: بابک امیر خسروی، نظری از درون بەنقش حزب توده ایران (نقدی برخاطرات نورالدین کیانوری)، تهران، ١٣٧٥، ص ٢٠٥-٢٠٠.

ڵ ئەوەی پێی خۆش نەبوو ئەوی کردە سەرۆکوەزیر.
ەڵام هێشتا مەرەکەبی حوکمەکەی موسەددیق وشک نەببۆوە کە
ەوری ڕەش لە ئاسۆی سیاسیی ئێراندا دەرکەوتن. وا دیار بوو
دانی قەیرانەکە خۆڵیلادانی ناکرێ. لەلایەک موسەددیق
ەسەتمەدارێکی توندو ملهوڕ بوو، لەلای دیکەش شا توانای بڕیاردانی
او لیبراوانەی نەبوو. هێزە نێوەندئاژۆ (میانەڕو) کانی لایەنگری
سەددیق توانای یەکگرتنیان نەبوو. لە بەرامبەردا، حیزبی توودە
ڕ بەرۆژ بەهێزترو بەدیسیپلینتر دەبوو. جگەلەوە، ئینگلیستان
دەویست مۆنۆپۆڵی پڕخێروبێری نەوتی ئێرانی لەدەست بچێ.
مەنیش مەیلێکی بۆ هاودەستیی ئینگلیستان بەدژی ئێران نیشان
ەدا. ئەم هۆیانە هەموو دەستیان دابووە دەستی یەکو چارەسەری
ستیخوازانەی قەیرانەکە نەگونجاو دەهاتە بەرچاو. گەردەلوولێکی
یاسی بەڕێوە بوو. وەزعی هووەیداش هەر ڕۆژ خەراپتر دەبوو. کار
وەزارەتی کاروباری دەرەوە ئیدی بەدڵەوە نەدەنووسا. کەڵکەڵەی
ڕووپا دیسان لەسەری دایەوە.

زۆر هۆکار وایان کرد هووەیدا، پاش دووساڵ مانەوە لە ئێران
ارێکی دیکە لەسەر ڕۆیشتن ساغ بێتەوە. باقری کازمی کە هووەیدای
خۆش نەدەویست لەجێی ئینتیزام ببوو بە وەزیری کاروباری دەرەوە.[29]
جگەلەوە، حوسێنی فاتیمی یەکێک لە گرنگترین ڕووماکانی دەوڵەتی
موسەددیق بووو لە سەردەمی خوێندکاریی خۆیدا لە پاریس، وتاری
توندوتیژی دەربارەی داستانی پاریس نووسیبوون. ئەویش چارەی
هووەیدای نەدەویست.

سەرباری هەموو ئەو مەسەلە ئیداریو سیاسییانە، دۆخی میزاجیی
ئەفسەرولملووکیش باش نەبوو. تووشی گیرانی شادەماری دڵ ببووو
نەخۆشخانەکانی تاران لەو سەردەمەدا نەیاندەتوانی ئەونەخۆشییە
چارەسەر بکەن. زیاد لەوەش، لەو ڕۆژانەدا، ئینگلیستان بەتۆڵەی
میللیکردنی نەوت لەلایەن موسەددیقەوە، گەمارۆی ئابووریی
خستبووە سەر ئێران. تەنانەت پێچانەوەی نوسخەیەکی سادەی

پزیشکییش دژوار بوو. ئەم هۆیانە هەموو دەستیان دایە دەستی یەکو هووەیدایان ڕازی کرد وڵات بەجێ بێڵێ. داوای کارێکی لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان کردو بەکۆمەگی دۆستانی، پۆستێکی لە کۆمیسیۆنی پەنابەران لە ژنێف پێ سپێردرا. بەم جۆرە هاوینی ۱۳۳۱ (۱۹۵۲)، لەحاڵێکدا ئێران دەگەڵ یەکێک لە گەورەترین قەیرانە سیاسییەکانی مێژووی تازەی بەرەوڕوو بوو، هووەیدا چووە ژنێف.

سەفەری هووەیدا هەرنەبێ لەبارێکەوە بەقازانجی بوو. دەرچوونی لە ئێران کێشەی هەڵویستگرتن بەرامبەر بە قەیرانی سیاسیی ئەوکاتی ئێرانی لەکۆڵ کردەوە. بە دەستپێکردنی سەردەمی حکوومەتی موسەددیق، ئاشکرا بوو کە دەگەڵ شا دانوویان پێکەوە ناکوڵێ. هەرکە قەیرانەکە توند بوو، شا لە ئێران هەڵاتو تەنیا بە کۆمەگی کۆدیتایەک کە هەوسارەکەی بەدەست دەزگا پۆلیسییەکانی ئینگلیسو ئەمریکاوە بوو، ۲۸ی گەلاوێژی۱۳۳۲ (۱۹ی ئووتی۱۹۵۳) گەڕایەوە سەر دەسەڵات. لە جەرگەی ئەو ململانە سیاسییانەدا، واتە ڕۆژگارێک کە هێشتا ڕوون نەبوو کێ دەیباتەوە، ئەهلی سیاسەت لە ئێران زۆربەیان ناچار بوون بەقازانجی یەکێک لەو دووقۆڵە هەڵوێست بگرن. شا کە دوودڵیی لایەنگرانی خۆی پێ قبووڵ نەدەکرا، کاتێک هاتەوە سەر تەختی پادشایەتی، ئەوانەی بەتوندی تەمبێ کرد کە لایەنی موسەددقیان گرتبوو. لەلایەکی دیکەوە، ئەوانەی لە ساتەکانی ڕۆژڕەشیی شادا پێی وەفادار مابوونەوە، تا مابوون بەشیان لە بەخششو بەزەیی شایانە نەبڕا. سیاسەتمەدارانی ئەودەم هەموویان دەلیلی جێگەو پێگەی مومتازی یارانی شایان دەزانی. داستانی مەئموورێکی باڵیۆزخانە کە لە ئیتالیا بەڕێزەوە پێشوازیی لە شا کردو هەروەها داستانی ئەودەستەیە لە نوێنەرانی مەجلیس کە بێپەروا، و لەحاڵێکدا گیانیان لە مەترسیدا بوو، بەرگرییان لە شا کرد، لە هەموو جێیەک بەناوبانگ بوو.

هووەیدا بە چوونەدەر لە ئێران، نە وەک دەستەی یەکەم سزایەکی توندی وەرگرتو نە وەک دەستەی دووەم جێگەوپێگەی مومتازی پێ بڕا. دیارە ڕەفتاری لە ژنێف، خۆبواردنی لە هەربۆچوونێکی توند،

دۆستایەتیی دەگەڵ ڕووناکبیران‌و تێکەڵاویی دەگەڵ موافیقان‌و موخالیفانی ڕێژیمی شا هەمووی بەومانایە بوو کە پێکهاتەیەکی سەیر لە ئێرانییە جۆراوجۆرەکان- لە دوکتۆر غولامحوسێنی موسەددیقەوە بگرە تا ئەردەشێری زاهیدی- هاتوچوویان دەکرد. دیارە ئەفسەرولملووک پاش هەشت مانگ مانەوەی نابەدڵ لە نەخۆشخانەیەکی شاری ژنێڤ، دەگەڵ هووەیدا بوو بە هاوەزل.[٣٠] حەسەنعەلیی مەنسوورو فەرەیدوونی هووەیداش لە میوانانی هەمیشەیی هووەیدا لە ژنێڤ بوون.

لە ژنێڤ هووەیدا بەرپرسی پێوەندیی کۆمیسیۆنی بەرزی پەنابەرانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بوو. بەپێی کارەکەی زۆرتر لەسەفەردا بوو. سەری زۆر لە وڵاتانی ئاسیا، ئەفریقاو ئەمریکای داو دەگەڵ بەشێک لەڕێبەرانی ئەو وڵاتانە ئاشنا بوو، زانست‌و دۆستپەیداکردنێک کە ئاکامی ئەو سەفەرانە بوون، بوونە هۆی ئەوە کە دوای گەڕانەوە بۆ ئێران بچێتە گەڵ کۆمیتەیەک کە ئامانجی باشترکردنی پێوەندیی ئێران دەگەڵ وڵاتانی ئاسیایی‌و ئەفریقایی برو. سەرۆکی کۆمیسیۆنی پەنابەران چەند جار خۆشحاڵی‌و ڕەزامەندیی لە کاری هووەیدا دەربڕیبوو. بۆوێنە ١٧ی دیسامبری١٩٥٣، ئەو هووەیدای وەک یەکێک لە بەنرخترین کارمەندانی کۆمیسیۆن ناو برد.[٣١] دیارە ڕەخنەگرانی هووەیدا بەچاوی گومان‌و ڕەشبینییەوە چاو لە کاری وی لەم کۆمیسیۆنەدا دەکەن. دەڵێن سەرۆکی کۆمیسیۆن ماسۆنی بووەو هەربۆیەش لە نامەکەیدا تاریفی هووەیدای کردوە. دەڵێن کاری کۆمیسیۆن جۆرێک ڕواڵەتبازی بووە. ئامانجی سەرەکیی شاردنەوەی پێوەندیی هووەیدا دەگەڵ ڕێکخراوێکی زایۆنیستی بەناویAZL بووە. هەرچی گەڕام نیشانەیەکم لەو ڕێکخراوە نەدۆزیەوە. پێم وایە دەسکردی مێشکی ڕەخنەگرانی هووەیدایەو لە هیچ کوێ نیە. هەر ئەو ڕەخنەگرانە دەڵێن کاری هووەیدا لە کۆمیسیۆن پتر لەخزمەت "دروستکردنی دەوڵەتی زایۆنیستی"دا بووە.[٣٢] دیارە بۆ هیچکام لەو تۆمەتانەش دەلیل‌و بەڵگەیەک ناخەنە ڕوو.

ئەوسالأنەی هوەیدا لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بوو، مەنسوور هەروا لە وەزارەتی کاروباری دەرەوە مایەوە. ساڵی ١٣٣٤ (١٩٥٥) بۆ ڕاوێژکاری باڵیۆزخانەی ئێران لە ڤاتیکان دیاری کرا. هوەیدا لە هەردەرفەتێک بۆ سەردانی دۆستەکەی لە ڕۆم کەلکی وەردەگرت. پاش داستانی تەلأقی مەنسوور، ئەو سەردانانە بایەخێکی دووچەندانیان پەیدا کرد. زەماوەندی مەنسوور دەگەڵ یەکێک لە کچەکانی تەیموورتاش شەش مانگ پتری خۆ نەگرتو سەری کێشایە تەلأق. ئەم مەسەلەیە بۆ مەنسوور زۆر ناخۆش بوو. پێویستیی بە دڵدانەوەو هاودەردیی دۆستانی هەبوو. هەربۆیە هوەیدا زۆرجار دەچووە سەردانی دۆستەکەی. لەوسەفەرانەدا، مەنسوور چەند جار بە پێداگرتنەوە داوای لە هوەیدا کرد لە کاری خۆی لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بکشێتەوە. دەیگوت دەبێ بگەڕێتەوە سەر پۆستی خۆی لە وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئێراندا. زۆرجار بەڕاشکاوی پێی دەگوت کە "دۆستەکانی" لەنێو ئەمریکاییەکاندا بەڵێنیان داوە کە "بەم زووانە نۆرەی ئێمە دێ".[٢٢] بەڕواڵەت هوەیدا سەرەنجام ڕازی بوو. لە نامەیەکدا بۆ وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئێران داوای گەڕانەوە بۆ کاری دیپلۆماتیی کرد. بە ڕواڵەت بەکۆمەگی بابی مەنسوور، ڕەجەبعەلی، کە ئەودەم باڵیۆزی ئێران لە تورکیە بوو، داواکەی هوەیدا قبووڵ کراو بەمجۆرە کرا بە سکرتێری یەکەمی باڵیۆزخانەی ئێران لە ئەنکەرە *

---

* دوڵدوم لە کتێبەکەیدا ئیددیعا دەکا کە هوەیدایان لەسەر پڕوپاگەندە بۆ مەزهەبی بەهایی لە تورکیە دەرکردوە. ئەو، شاهیدو بەڵگەیەکیش بۆ سابیتکردنی قسەکانی ناهێنێتەوە. کتێبی وی هەموو ڕێوشوێنەکانی لێکۆڵینەوە بە نەبوو دادەنێو پارێز "احتیا×"ی زانایانە پشت گوێ دەخا. گێڕانەوەکەی یەکسەر تێکەڵ بە ڕقو کینەیەو تەنانەت ئەو ڕاستییەش کە نامەیەکی پڕ لە ستایشی جەمالزادەی لە جیاتی پێشەکی لەچاپی تازەی کتێبەکەدا بڵاو کردۆتەوە، شتێک لە بێنرخیی کتێبەکە کەم ناکاتەوە. کتێبی دوڵدوم نوێنگەیەکی بەزەییبزوێنو شەرمهێنی ئەو بەرهەمانەیە کە ئەم ڕۆژانە

دەورانی باڵیۆزییەکەی ڕەجەبعەلی کورت بوو. دوای ماوەیەکی کورت، ژەنراڵ ئەرفەع جێی گرتەوە. ئەرفەع یەکێک لە نیزامییە توندەکان بوو. دەیەویست باڵیۆزخانەش وەک سەربازخانە ئیدارە بکا. هەموو بەیانییەک کارمەندەکانی ناچار دەکرد بەپێی بەرزو نزمیی بەژنوبالآیان بەڕیز ڕاوەستن.[٢٤] تەنانەت دەنگۆ هەبوو کە لەو پشکنینە بەیانییەدا نەکهەر جلوبەرگی کارمەندەکان بگرە نینۆکیشیان تەماشا دەکرێن. تەنیا کەس کە نەچووە ژێر باری ئەو دیسیپلینە سەربازییە هووەیدا بوو.

لەو دەمەدا، عەبدوڵڵای ئینتیزام بەڕێوەبەری کومپانیی نیشتمانیی نەوتی ئێران بوو. هووەیدا بۆ ڕاکردن لە دیسیپلینی سەربازخانەیی ژەنراڵ ئەرفەع پەنای بۆ ئینتیزام بردو ئەویش پاش ماوەیەک هووەیدای وەک ڕاوێژکاری تایبەتی، گوازتەوە کومپانیی نەوتو دوای ماوەیەکی کورت کردیە سەرپەرستی کاروباری ئیداریی کومپانیی نەوت. بەلآم فەزای ئیداریی کومپانیی نەوت پەیڕەوی نەریتی ئینگلیسییەکان بوو، کە لەودا زنجیرەی پلە ئیدارییەکان بەتوندی لەبەرچاو دەگیرا. هەربۆیە، بەرزبوونەوەی لەنەکاوی هووەیدا بۆ لووتکەی ئەو هیرەمە ڕقو ئێرەیی کارمەندانی کۆنەکاری کومپانیی نەوتی هەڵگیرساندو بەوهۆیەوە، لە سەرەتادا ڕەفتارێکی زۆر ساردو بێموبالاتانەیان دەگەڵی هەبوو.[٢٥] هووەیدا هەروەک شێوەی کارکردنی بوو، لە بەرامبەر ئەوبەرهەڵستیانەدا سەبرو حەوسەلەی نیشان داو بۆ تێپەڕین لە کۆسپە ئیدارییەکان، کەلکی لە پێوەندییە ئینسانییەکانو ڕایەڵکەی دۆستەکانی وەرگرت. لە سەردەمی سەرۆکوەزیرییشدا هەر ئەم شێوەکارەی ڕەچاو دەکرد. لە سیاسەتدا پێوەندیی دۆستانەی بە ڕێگەچارەی هەموو گیروگرفتەکان دەزانی.[٢٦] لە جیاتی ئەوەی لەلای ئینتیزام گلەیی و

---

بەناوی ژیاننامە لە ئێران بلاو دەبنەوە،بەلآم لەڕاستیدا شتێک نین جگە لە جنێوفرۆشیو نووسەرانیشیان زۆرتر کەسانێکن کە نان بەنرخی ڕۆژ دەخۆنو لەوانەیە تادوێنێ پەسنبێژی ئەو کەسایەتییە بووبن کە ئەمڕۆقسەی پێ دەڵێن.

شکایەت بکا، پەنای بۆ دۆستی دێرینی خۆی سادقی چووبەک برد. چووبەک لە کارمەندە بەناوبانگەکانی کومپانیی نەوت بوو. چەند ڕۆژ دوای دەستبەکارکردن لە کومپانیی نەوتدا، هووەیدا ڕۆژێک چووبەکی بانگ کردە دەفتەری کاری خۆیو پۆستێکی تازەی پێ پێشنیار کرد. گوتی "دەمەوێ سکرتێری تایبەتیی نامە نهێنییەکانم بی."[37] ئەگەرچی هووەیدا متمانەی تەواوی بە چووبەک هەبوو، بەڵام هۆی بنەڕەتیی ئەم پێشنیارەی شتێکی دیکە بوو. هووەیدا بۆخۆی پێی لێدەنا کە نایەوێ نامە ئیدارییەکانی هەڵەی زمانیو ڕێزمانییان تێبکەوێ[38]. توانای زمانناسیی وی، زاڵبوونی بەسەر فەرانسەیی، ئینگلیسیو ئەڵمانیداو "ئەو تۆزە تورکییە"ی دەیزانی، هەموو تا ئەودەم بەهۆی پێشکەوتنی لە دنیای سیاسەتدا دەژمێردران. وا دیار بوو هەربەهۆی ئەو زمانزانییەشەوە ڕێگای سەدساڵەی خەڵکی دیکەی بەشەوێک بڕیوە. بەڵام لە کومپانیی نەوتدا، زمانو بەتایبەتی زمانی فارسی، ببووە خاڵی لاوازی وی. هووەیدا بە زیرەکی ئەوخاڵە لاوازەی خۆی دۆزیەوەو بەخێرایی کەوتە هەوڵی کەمکردنەوەی بەرهەمە زیانبارەکانی. بەرەی کۆنتری سیاسەتمەدارانی ئێران، کەسانی وەک ئێنتیزام، زۆربەیان دەسەڵاتی تەواویان بەسەر زمانو ئەدەبیاتی فارسیدا هەبوو. پێش شۆرشی مەشرووتە، لە دەرباری پادشایانی ئێراندا، پێشکەوتنی سیاسی زۆرتر هی کەسانێک بوو کە پەخشانێکی ڕەوانو قایمیان دەنووسیو دەیانتوانی، بەپێی بابەت، شێعرێکی گونجاو لەبەررا بخوێننەوە[39] هووەیدا لە بەرەی نوێی ئەو سیاسەتمەدارانە بوو کە زمانی هونەریی تەکنۆکراتی لە زمانی سەعدیو حافز باشتر حاڵی دەبوونو ڕێزیان بۆ دادەنا. کاری هێندێک لەو سیاسەتمەدارانە گەیشتبووە جێیەک کە شانازییان بە ڕاوێژی سەیری خۆیانو ناشارەزایی لە ئەدەبیاتی فارسییەوە دەکرد. بەڵام هووەیدا دەیزانی ڕێگایەکی نیە جگە لەوە کە فارسییەکەی بەهێزتر بکا.[40]

پێوەندیی نێوان ساواکو هێندێک لە موخالیفان کاری دەکرد. لە زۆر حاڵەتدا، نەراقی بۆ ڕزگارکردنی ڕووناکبیرێکی بەندی، یان هەرنەبێ وەدەستهێنانی خەبەرێک لە حاڵوئەحواڵی پەنای بۆ هووەیدا دەبرد. ساڵی ١٣٤٢ (١٩٦٣) ، باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە هەڵسەنگاندنی کۆمەڵی ڕووناکبیریی ئێراندا، نەراقیی وەک کەسایەتییەک ناساندبوو کە "هەم دەگەڵ ڕێژیم پەیوەندیی هەیەو هەم لە خۆبەخۆیایەتیدا ڕەخنەی لێ دەگرێ." بەشێکی دیکەی ئەو ڕاپۆرتە، بۆ باسی نەخشی نەراقی لە "دروستکردنی پێوەندی" لە نێوان ڕێژیمو موخالیفاندا تەرخان کراوە.[٤٤]

نەراقی سەرەنجام پاش هەوڵێکی زۆر توانی ناوەندێکی لێکۆڵینەوەی زانستە کۆمەڵایەتییەکان لە ئێران دامەزرێنێ. ئەم ناوەندە پێوەندیی ئیداریی دەگەڵ کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکۆی تاران هەبوو. باڵیۆزخانەی ئەمریکا ناوەندی لێکۆڵینەوەی بە "ناوەندێکی چالاک" دەزانی کە لەودا "هێندێ باسی جێی سەرنج دێنە گۆڕێو هێندێ پرۆژەی گرنگی لێکۆڵینەوە لەبارەی چینی نێونجیی [کۆمەڵی] ئێران، لێکدانەوەی نەخشی بازاڕ-چەند لایەنێکی چاکسازیی زەوی...و لێکۆڵینەوەیەک بۆ ساواک لە بواری ڕیشە کۆمەڵایەتییەکانی ڕاپەڕینی ١٥ی جۆزەردانی[١٣٤٢]دا لە حاڵی جێبەجێکردندان."[٤٥]

دامەزراندنی ئەم ناوەندە ئاکامی لێکۆڵینەوەیەک بوو کە پێشتر نەراقی بۆ کومپانیی نەوتی ئەنجام دابوو. ساڵی ١٣٣٦ (١٩٥٧)، لێکۆڵینەوەی هێزی کاری کومپانیی نەوت بە نەراقی سپێردرا. ورەی کرێکارانو کارمەندان خەراپ بووو چەندوچۆنی کاریگەریی ئابووریی ئەوان تەوەری بنەڕەتیی لێکۆڵینەوەکەی بوو. کۆنسێرسیۆم گەیشتبووە ئەو ئاکامە کە هەزاران کرێکارو کارمەندی کومپانی زیادنو کومپانیی نەوتی بۆدەرکردنی ئەو دەستەیە هەڵپێچابوو. یەکێک لە ئامانجەکانی نەراقی نیشاندانی ئەو ڕاستیە بوو کە ئەو کرێکارو کارمەندانە زیادی نین. دوای لێکۆڵینەوەیەکی دوورودرێژ نەراقی گەیشتە ئەو ئاکامە کە خۆنەناسین لە ڕیزی کرێکارانو کارمەندانی کومپانیی نەوتدا یەکجار زۆرە. بە هووەیدای گوت یەکێک لە ڕێگاکانی بەربەرەکانی دەگەڵ

خۆنەناسین پێکهێنانی بەرنامەی فەرهەنگی بۆ کرێکارانە. بەرهەمەکەی ئەوە بوو کە کومپانیی نەوت، بە هیممەتی هووەیدا، بەشێک لە گەورەترین ڕووناکبیرانی ئێران، یەک لەوان جەلالی ئالی ئەحمەدی بانگهێشتن کرد تا بچنە باشووری ئێران‌و لەبارەی مەسەلە فەرهەنگی‌و ئەدەبییەکانەوە دەگەڵ کرێکاران‌و کارمەندانی کومپانیی نەوت باس‌و وتوویژ بکەن. جگەلەوە، بە پێشنیاری نەراقی، کومپانیی نەوت لە باکووری وڵات هێندێ ئۆردووگای بۆ منداڵانی کرێکاران‌و کارمەندانی کومپانی دامەزراند.[46]

هووەیدا بۆ بەڕێوەبردنی ئەم ناوەندانەش، ڕێگایەکی تازەی گرتە پێش. مەنووچێهری پیرووزی کردە بەرپرسی ئەوکارە. ئەو لە کارمەندانی کۆنەکاری کومپانی بوو. پاش کۆدیتای ٢٨ی گەلاوێژ، بەهۆی لایەنگری لە حیزبی توودەوە، ماوەیەک لە کار دەرکرا. کاتێک دووبارە گەڕایەوە ڕیزی کارمەندانی کومپانی، بەکردەوە "کەسێکی نەخوازراو" بووو کارێکی زۆری پێ‌نەدەسپێردرا. هووەیدا بەکۆمەگی ئینتیزام‌و بە پێچەوانەی بەرهەڵستیی سەرەتایی ساواک، کاری دروستکردن‌و بەڕێوەبردنی ئۆردووگاکانی بەپیرووز سپارد. شەهبازییش لە کاری دروستکردنی ئەو ئۆردووگایانەدا نەخشێکی بنەڕەتیی هەبوو. پیرووز لە مەحموودئاباد، لە نیزیک لێوارەکانی دەریای خەزەر، ئۆردوویەکی بۆ منداڵان دامەزراند. کاری ئۆردووەکان یەکجار سەرکەوتوو بوو. هەر لە یەکەمین هاویندا، نیزیکەی چوارهەزارو پێنسەد منداڵی کرێکاران‌و کارمەندانی کومپانی میوانی ئۆردووگا هاوینییەکان بوون. بۆ زۆر لەومنداڵانە، کە زۆرتر لە ناوچەی باشووری وڵات لە دایک ببوون‌و پێ‌گەیشتبوون، چیا بەبەفرەکانی ئەلبورز لە دیمەنە سەرسوڕهێنەکانی ئەو سەفەرە بوون.[47]

سەرەڕای سەرکەوتنی سەرەتایی پیرووز، دەورانی سەرۆکایەتییەکەی زۆری نەخایاند. لابردنەکەی ئاکامی ڕاپۆرتێکی ساواک بوو. گۆیا ئۆردووگا وێنەی شای لێ‌نەبووە. لە ئاخروئۆخری دەیەی ٣٠ دا، خۆپەرستیی شا لە پەرەسەندندا بوو. شا لە هەمووکەس

گوێلەمستیی بێئەملاوئەولای دەویستو ژێردەستانی سەرکێشو سەرپێچیکەری نەدەویستن. وێنەکانی لە کەلێنو قوژبنی وڵات لە هەموو جێیەک دەبینران. نیازی شایانە لە پێشەوەی هەموو بەرنامە رادیۆییەکاندا بوو. هەر لەوسەردەمەدا، دەفتەری زانیاریو لێکۆڵینەوەکانی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئەمریکا دەربارەی رادەو ئاکامەکانی خۆپەرستیی شاوە نووسی: "وینەی شا لە هەموو جێیەک هەیە. بەرنامەکانی سینەما هەمیشە بە بڵاوکردنەوەی سروودی شاهەنشاهیو نیشاندانی چەند وێنەی شا لە حاڵەتی جۆراوجۆردا، دەست پێدەکەن. ڕۆژی لەدایکبوونی شاو شاژنیش بە تۆقتۆقەتەقاندنو ڕێژە دەکەنە جێژن. حزووری پادشایەتی لە هەموو بووارە کۆمەڵایەتییەکاندا بەرچاوە."[48]

نیشانەکانی ئەو خۆپەرستییە هەرلەوکاتەدا دەتوانین لە لاپەڕەکانی گۆڤارێکدا ببینین کە هووەیدا لە کومپانیی نەوت وەرێی خستبوو. یەکەم ژمارەی "کاوش" گەلاوێژی ١٣٣٩ (١٩٦٠) دەرچوو. ناوی هووەیدا لە لاپەڕەی یەکەمدا، وەکو سەرنووسەری گۆڤارەکە هاتبوو. سادقی چووبەکیش لە دەرکردنی گۆڤارەکەدا کاریگەر بوو. هەر لە ساڵی یەکەمدا، ئەم گۆڤارە توانی بەشێک لە ناودارترین ڕووناکبیرانی ئێران بۆ هاوکاری بانگهێشتن بکا. نادری نادرپوور، موحەممەدی قازی، مەسعوودی فەرزاد، مەحموودی سیناعی، فەرڕوخی غەففاری، سەعیدی نەفیسیو ئیبراهیمی پووررداود لە یەکەم هاوکارانی گۆڤارەکە بوون.

گۆڤارەکە هەرلەوکاتەدا ڕێگایەکیش بوو بۆئەوەی هووەیداو ئینتیزام بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆو بەڕێزەوە، یارمەتیی ماڵی بەهێندێک ڕووناکبیری دەستکورت بکەن. "کاوش" بۆهەر وتارێک هەقدەستێکی تاڕادەیەک بەرچاوی دەداو لە هەموو ژمارەیەکیشدا، ئەو وتارانەی لە نووسەرانی دەخواستن زۆر زیاتر لەو وتارانە بوون کە چاپ دەکران. ژمارەی یەکەمی گۆڤارەکە نامەیەکی ئینتیزامی تێدابوو کە لەودا باسی ئەرکەکانی "کاوش"ی کردبوو. لەوێدا ئینتیزام باسی سەرچاوە سروشتیە دەرنەهاتووەکانی ئێرانی نووسیبوو. هەرلەوکاتەدا، گوتبووی،

سەرمایە ئینسانییەکانی کۆمەڵی ئێرانیش تاڕادەیەکی زۆر بە مۆری ماونەوە. دەیگوت هەرچەند بەکارهێنانی تەکنۆلۆژیی مۆدێرن کاری دیتنەوەو بەکارهێنانی ئەوسەرچاوە سروشتییانەی ئاسانتر کردوە، بەڵام ئەرکی دۆزینەوەو پێگەیاندنی هێزی کاری لێزان ئاڵۆزترەو ئەرکی بنەڕەتیی گۆڤاری "کاوش"یش دیتنەوەو پەروەردەکردنی ئەو هێزی کارە لێزانەیە. ئینتیزام وتارەکەی بە دوعایەک تەواو کردبوو کە سروشتی نامۆو ناباوی بیروباوەڕی ئەوی نیشان دەدا. نووسیبووی: "مرۆڤ ماشێنی دروست کردوەو خوای گەورەش مرۆڤەکانو جیهان. لێرەدا کۆمەگ لەو دەخوازین تا هەنگاوە ئەزموونییەکانی ئێمە بکاتە بناخەدانەری سەرکەوتنی یەکجاریمان."[49]

کورتە پێشەکییەکیش کە هوەیدا بۆ ژمارەی یەکەمی "کاوش"ی نوسیبوو لە زۆربارەوە سەرنج‌ڕاکێش بوو. بەشێکی گرنگی وتارەکە بۆ داستانێکی خەفەتاویو دوورودرێژ تەرخان کرابوو کە لەودا هوەیدا باسی ڕۆژێک دەکا کە ئاگادار کرا دەبێ پاریسی خۆشەویستی بەجێ بێڵێو بچێتە ئەڵمانی شەڕلێدراو. دەڵێ دۆستێک لەڕووی دڵسۆزییەوە بردمی بۆ گۆڕستانی پێرلاشێزی پاریس (کە سادقی هیدایەتیش لەوێ نێژراوە). لەوێ دۆستەکەم لەحاڵێکدا ئاماژەی بە ڕیزی بێبڕانەوەی بەردی گڵکۆکان دەکرد، گوتی: "دەزانی، هەموو ئەوانەی لێرە خەوتوون زۆر لە منوتۆ زیاتر خۆیان بۆ کارەکەیان بە "پێویست" زانیوە. بەڵام دوای وانیشو ئێمەش چەرخەکانی دنیا تۆزێک خێراتر یان تۆزێک سەبرتر گەڕاونو دەگەڕێن، و یەکێک لە بەدبەختییەکانی مرۆڤ ئەوەیە کە ئەوانەی دێنە جێی ئەو نوستووانە پێیان وایە بوونیان بۆ ئەوکارەی بەدەستیانەوەیە لەسەداسەد "پێویستە". لەحاڵێکدا نە ئەمنو نە ئەتۆو نە هیچ کەس لەکاری خۆماندا پێویست نیین."[50] جگە لە باسی ئەو داستانە، هوەیدا لە پێشەکییەکەدا بەڵێنی دا کە "ئەم گۆڤارە بکاتە تریبوونێک بۆ بەرەی لاوی وڵاتەکەمان کە لە دواڕۆژدا بە کلیلی زانستو چاوکراوەیی قفڵە داخراوەکان بکەنەوەو گیروگرفتەکان چارەسەر بکەن، و ویستەکانیان بخەنە بەر چاوی خەڵک."[51]

جێی سەرنج ئەوەیە کە نە لە نامەی ئینتیزام، نە لە پێشەکیی هووەیدادا، لە هیچ کوێ ناوی شا نەهاتوە. لەڕاستیدا گۆڤارەکە بەڕواڵەت دەیەویست بە ئاشکرا خۆی لەو دابە باوەی پێهەڵگوتنی شا، کە ئەودەم ساواک و وەزارەتی دەربار دایانهێنابوو، بپارێزێ. بەڵام ساڵی دووەم "کاوش" یش سەرەنجام تەسلیم بوو و لەوەبەدوا پەسن و تاریفی شا بەشێک لە بابەتەکانی هەر ژمارەیەکی بوو.

دیارە لە ساڵی١٣٣٩ (١٩٦٠)دا مەسەلەی ئۆردووگا هاوینییەکان و هەورازو نشێوی چاپی گۆڤارەکە تەنیا غەمی هووەیدا نەبوون. کەموزۆر هەموو ئەوکەسانەی هووەیدایان لە نیزیکەوە دەناسی هەرنەبێ لە شتێکدا یەکدەنگن. هەموویان دەڵێن لەیلای ئیمامی گەورەترین ئەڤینی ژیانی هووەیدا بووە. وا دیارە هەر لەیەکەم دیداردا دڵی داوەتێ. هەرلەوکاتەدا هەمووکەس دەیگوت لەیلا ژنێکی جیاوازە. هێندێک کەس مەبەستیان لە وشەی "جیاواز" جۆرێک ڕەخنەگرتن بوو. وەک ئەوە بیانەوێ بەوناوە تایبەتییە، وەک ژنێکی سەرکێش و سەرەڕۆی دابنێن. هێندێکی دیکە بەڕاستی ئاشقی کەسایەتی و ناوبانگی وی بوون. دەیانگوت تەنانەت لە بنەماڵەی پاشایەتییش بێمنەتە. دەستەیەکی سێیەم دەیانگوت ئەو ژنێکی بەدئەخلاق بوو. دەیانگوت زوو قەڵس دەبوو و بەئاسانییش هێور نەدەبۆوە. دەیانگوت زۆرجار جنێوی بە هووەیدا دەدا. تەنانەت چەندجار پێیدەگوت "نجس‌وزیر". ماقووڵزادەیەکی ساردو بێڕووح و خۆبەزلزان بوو. دەیانگوت لە ڕێورەسمی دەوڵەتی بێزار بوو و بەدەگمەن تێیاندا بەشدار دەبوو. وەختێک دەهاتیش، زۆرجار زۆری دەخواردەوەو دەبووە مایەی شەرمەزاریی مێردەکەی. لە فەرهەنگێکدا کە کەمدوێیی لە پیاواندا پەسند دەکاو بێدەنگی بۆ ژنان بە شانازی دەزانێ، لەیلا بێپەروا قسەی خۆی دەکردو هەرگیز لە ڕادەربڕین نەدەترسا. هەمووان وشیاریان دەکردمەوە کە لەوانەیە پرسیارێکی نابەجێ زۆر توورەی بکا. لە یەک قسەدا، لەسەر ئەویش بە ئەندازەی مێردەکەی دەنگۆ ساز دەکرا.

تەنانەت چاوپێکەوتنیشی دژوارو هێندێ جار هەر نامومکین بوو.

هەوڵی هەموو ئەودۆستانەی تێدەکۆشان ڕازیی بکەن وتووێژم دەگەڵ بکا، بێئاکام بوو. سەرەنجام دوای چەند مانگ تەقەلا، ڕۆژێک ئاگادار بووم کە لەیلا ئامادە بووە وتوویژم دەگەڵ بکا. پێنجی ژوئەنی١٩٩٨ بەپێی قەراری پێشوو، بۆ دیتنی چوومە ئاپارتمانێک لە گەڕەکێکی دەوڵەمەندنشینی ژنێڤ. سەری سەعاتی ١٠ لە دەرگام دا. جەمشیدی دەفتەری، کە کۆت‌وشاڵوارێکی شینی جوانی دەبەردا بوون و کراواتێکی سووری جوانی لێدابوو، دەرگای کردەوە. بە ڕووخۆشی‌و ڕێزەوە فەرمووی کردم بۆ ژووریێ. قاوەی بۆ بانگ کردم. ئەمجار دەستی کرد بە گێڕانەوەی داستانی زۆر خۆش لە بارەی گەندەڵیی ماڵیی سەردەمی شاو پیلانە پاشملانەکانی عەلەمەوە. باسی کومپانییەکی ئەڵمانیی کرد کە چەند ملیۆن مارکی بەرتیل دابوو بە کاربەدەستێکی ئێرانی‌و چوونکە لە ئاکامی بەرپابوونی شۆرشدا پەیمانەکە هەڵوەشابۆوە، کومپانییەکە هەوڵی دەدا بەرتیلەکە وەرگرێتەوە. بەڵگەنامەکانی دادگایەکی لاهەی نیشان دام کە وردەکاریی ئەو داستانەی بە درێژی تێدا هاتبوو. هەر لەوکاتەدا باسی هێندێ قسەی خۆی لە دادگادا بۆ گێڕامەوە کە لەواندا بە چاکە باسی هووەیدای کردبوو و گوتبووی ئەو وەک سەرۆک‌وەزیر تێدەکۆشا بەپێی توانا، پێشی ئەو سەرپێچی‌یانە بگرێ.

پاش نیزیکەی سەعاتێک قسەکردن لەوبارەیەوە، غیرەتم وەبەر خۆم نا پێی بڵێم کە هەرچەند قسەو بەڵگەکانی زۆر سەرنجڕاکێشن، بەڵام ئامانجی من لە سەفەر بۆ ژنێڤ دیتنی لەیلا بووە. گوتم دەرفەتێکی زۆرم بۆمانەوە لە ژنێڤ نیەو حەز دەکەم لەیلا ببینم. ئارام‌و بێ شلوێبوون گوتی: "داوای لێبووردن دەکەم. لەیلا وەزعی باش نیەو هەربۆیەش ناتوانێ بتانبینێ." ئەمجار بێئەوەی گوێ بداتە تووڕەیی‌و داماویی من، دەستی بە گێڕانەوەی داستانەکانی کردەوە. ئەمجار باسی دوکتۆر موسەددیقی خزمیی بۆکردم. وێنەیەکی ئیمزاکراوی ئەو، سووچێکی ژووری دانیشتنەکەی ڕازاندبۆوە. هەرجۆرێک بوو قسەکەیم پێبڕی. بە دڵشکاوی لە ئاپارتمانەکە هاتمە دەر. لە دڵی خۆمدا گوتم پێم وایە هەق بەو کەسانە بوو کە دەیانگوت

دەبێ واز لە دیداری لەیلا بێنم. هەر لەوکاتەدا دەمزانی ئەگەر لە زمان خۆیەوە باسی ژیانی دەگەڵ هوەیدا نەگێڕمەوە، بەتالاّییەکی گرنگ لەم بەسەرهاتەدا دەمێنێ.

دوای ماوەیەک، هەوڵی دیداری لەیلام دەست پێکردەوە. ساڵێکی پێچوو. سەرەنجام ئەو نەزەری گۆڕیو ئامادەی وتوویژ بوو. ئەووەخت لە ماڵی پووری لە پاریس دەژیا. بەیانیی ئەو ڕۆژەی گەیشتمە پاریس زەنگم بۆ لێداو هەربۆ ئەوڕۆژە وەختێکمان دانا. نیگەران بووم کە نەکا جارێکی دیکە ڕای خۆی بگۆڕێ.

سەری سەعاتی ٣ هات. لە سووچێکی تاریکو پڕدووکەڵی کافەیەکی پاریس دانیشتین. چاکەتێکی چەرمی ڕەشی جوانی دەبەرداو شاڵوارێکی تاریکی دەپێدا بوو. کەوشە ڕەشەکانی جوانو ڕەحەت دیار بوون. چاوە کاریگەرو خەماوییەکانی بە چاویلکەیەکی قاوەیی داپۆشرابوون. دیمەنی مرۆڤێکی باوەڕبەخۆو سەنگینی هەبوو. نە تووڕەیی پێوە دیار بوو، نە ماندوویی. قاوەیەکی داوا کردو سەری قسەی داگیرساند.

لەیلا ئیمامی یازدەی ڕەشەمەی١٣١١ (١٩٣٣) لە شاری ئابادان لە دایک بوو. مەلەک خانمی دایکی کچی وسووقودەولە بوو، کە بە یەکێک لە سێ بناخەدانەری قەراردادی شوومی ١٩١٩ دەژمێردرا. بابی ناوی نیزاموددینی ئیمامی بوو. ئەویش لە بنەماڵەیەکی بەدەسەلاّتو بەناوبانگ بوو. نیزامودین کارمەندی دەوڵەت بووو زۆرووەخت کاری گرنگی هەبوون. لە جەرگەی قەیرانی نەوتدا، نوێنەری ئێران لە دەفتەری کومپانیی نەوت لە لەندەن بوو. لەیلا دەیگوت: "بابم پیاوێکی لەسەرەخۆ بووو خۆی لە کێشەو ئاڵۆزی دەپاراست." بەشی زۆرتری سامانی بنەماڵە هی دایکی لەیلا بوو. بەتایبەتی کە پاش مردنی بابی، ملکوماڵێکی زۆری بۆ بەمیرات مابوو. بابی بابی لەیلا لە ڕووحانییە ناسراوو ڕووناکبیرەکان بوو. پێی دادەگرت کە کچەکانیو نەوە کچەکانی هەموویان بخوێنن. لەیلا منداڵی گەورەی بنەماڵە بوو. چوار خوشکو برای هەبوون. خوشکە جحێڵەکەی، فەریدە، منداڵێکی یەکجار

جوان بوو. بە پێچەوانەی لەیلا کە بەمنداڵی حەزی لە خوێندن دەکرد، فەریدە زیاتر لە غەمی پەیدا کردنی مێردێکی باش‌و پێکەوەنانی بنەماڵەدا بوو.[51]

لەیلا دوازدە ساڵە بوو کە ئێرانی بەجێ هێشت. بابی لە ئینگلیستان کاری پێدراو خێزانەکەشی دەگەڵ خۆی برد. لەیلا لە مەدرەسەیەکی شەووڕۆژیی بەناوبانگی ئینگلیس لە شاری(Surrey) ناونووسیی کرد. دواناوەندیی لە ئینگلیستان تەواو کرد. دوایە گەڕایەوە ئێران‌و دووساڵێک وەک سکرتێر کاری بۆ ئەسلی چوار کرد.[52] بیست‌ودووساڵە بوو کە بەهۆی میراتی بابی دایکی لەیلاوە بنەماڵەکەی توانیان بۆ درێژەدانی خوێندن بینێرنە ئەمریکا. ئەویش ساڵی١٣٣٤(١٩٥٥) ئێرانی بەجێ هێشت‌و لە زانکۆی کالیفۆڕنیا، لە بەرکلەی، ناونووسیی کرد. پاش ساڵێک، هاوینی١٣٣٥ (١٩٥٦) چووە زانکۆی کالیفۆڕنیا لە لۆس‌ئەنجلیس. لەوێ دەگەڵ کچێکی ئەمریکایی بە ناوی جین بوو بە هاومزڵ. جین لە ڕۆژنامەیەکدا بۆ پەیداکردنی هاوژوورێک ڕێکلامی کردبوو، لەیلاش هەر لەو ڕێگایەوە دەگەڵی ئاشنا بوو. ئاپارتمانە هاوبەشەکەیان لە ناوچەی وێست‌ڤوودی لۆس‌ئەنجلیس لە نیزیک زانکۆ بوو.

لەیلا توانایيەکی ئەوەندە بەربڵاوی دارایی نەبوو. دەیگوت: "مانگانە سەدوشەست دۆلارم لە ماڵێرا بۆ دەهات". دۆستەکەی، جین کە ئێستا دەگەڵ مێردەکەی، لایل بێکەر، فڕۆکەوانی خانەنشینی هێزی ئاسمانیی ئەمریکا، لەشاری چووک‌و جوانی ناپا دەژی، بەخۆشی یادی ئەو ڕۆژانە دەکاتەوە. دەیگوت: "لەیلا هەمیشە نیگەرانی قورسیی خەرجی خوێندنەکەی بوو. بەردەوام لە غەمی ئەوەدا بوو کە چەندی بکرێ زووتر خوێندنەکەی تەواو کاو ئەو بارە قورسە لەسەر شانی بنەماڵەکەی هەڵگرێ."[54] لەیلا خوێندکارێکی جیددی بوو. حەزی لەو بێموبالاتییە کە بۆتە بەشێک لە ژیانی خوێندکاری، نەدەکرد. چەند دەرسێکی لە بەشی هونەرو ئارشیتێکتدا گوزەراند. جاری واش بوو ئۆگریی بە کۆمەڵناسی نیشان دەدا. ڕۆژێک کە لە ماڵە ڕازاوەکەی جین چوومە سەردانی، دوو تابلۆی دەستکری لەیلا دیوارەکانیانی ڕازاندبۆوە. یەکیان بە دیواری

ژووری نانخواردنەوە بوو، کە سروشتێکی زەردی بێگیان بوو.تابلۆکەی دیکە بە دیواری حەمامی ژووری خەوی ماڵەوە هەڵواسرابوو.لەودا ژنێکی ڕووت دەبینرا، کە هێڵەکانی دەموچاوی زەقو ڕەنگیشی سوورێکی ئاشقانە بوو.

لە لۆس ئەنجلێس، لەیلا پاش ماوەیەک ئاشقی لاوێک بوو کە لە دراوسێیەتیی خۆیدا دەژیا. جینی دۆستی بیرەوەریی خۆشی لەو دۆستە تازەیە نەبوو. بەوحاڵە، پێیگوتم: "پێم وایە تەنیا ئەڤینی ڕاستەقینەی لەیلا هەر ئەولاوە بوو." تاوێک ڕاوەستاو ئەمجار بۆ تەواوکردنی قسەکەی گوتی: "دیارە مەبەستم ئەوە نیە کە دواتر ئاشقی ئەمیری نازەنین نەبوو. بەڵام ئەڤینی بۆ ئەو لەجۆرێکی دیکە بوو."[550]

بەفرانباری١٣٣٨ لەیلا لە زانکۆی کالیفۆرنیای لۆسئەنجلێس لیسانسی بەشی هونەری وەرگرت. دەسبەجێ گەڕایەوە ئێران. هێشتا ئاشق بووو هیوادار بوو ڕۆژێک دووبارە بە یارەکەی بگاتەوە. لەوماوەیەدا، فەریدەی خوشکی ، ئاشقی حەسەنعەلیی مەنسوور ببوو. دەورانی خزمەتی مەنسوور لە ڤاتیکان ساڵی١٩٥٧ بەسەر چووو ئەو دەسبەجێ گەڕایەوە ئێران. لە چەند مانگی هەوەڵی مانەوەی لە تاراندا دەگەڵ دوو ژنی جیاواز سەروسرپێکی پەیدا کرد. یەکەمیان ئارتیستێکی بەناوبانگو ئەوی دیکەیان ژنی پزیشکێکی ددانی خەڵکی چیکۆسلۆڤاکی بوو. بەڵام بەرەبەرە کەوتە بیری ژنهێنانو دەگەڵ فەریدە ئاشنا بوو. هەر لە شەوی زەماوەندی مەنسوورو فەریدەدا بوو کە هووەیداش ئاشقی لەیلا بوو* و بەشی زۆری ئەو شەوەی لە پەنا لەیلا بەسەر برد. لەیلا بەڕاوێژێکی کەمێک

---

* شەوی زەماوەندی مەنسوور لەبارێکی دیکەشەوە جێی سەرنجە. سێ سەرۆکوەزیری دواتر،ئەو شەوە لە نێو میوانەکاندا بوون. بێجگە لە مەنسوورو هووەیدا زولفەقار عەلی بۆتۆش لەو میواندارییەدا بەشدار بوو. هەرسێکیان لاو بوونو هەر سێکیان بە پشتیوانیی ئەمریکا دڵگەرم بوون. هەرسێکیان چاکسازیخوازو عورفیڕەوشت بوون. هەرسێکیشیان بەدەستی هێزە ئیسلامییەکان کوژران. سەیر ئەوەیە هووەیداو بۆتۆ لەماوەی حەوتوویەکدا ئیعدام کران.

خەفەتاوی دەیگوت: "ئەمیر بنیادەمێکی زۆر لەبەردڵان بوو. داستانی زۆر خۆشی دەگێڕانەوە."[٥٦] ئەو ڕۆژانە هووەیدا تازە لە سەفەری ئەمریکا هاتبۆوە. لەوێ چەند دەورەیەکی یووگای دیبوون. لەیلا دەیگوت: "ئەمیرزۆر ئۆگری ئەو دەورانە ببوو. ئەوشەوە باسی ڕێژیمی خۆراکیی جۆراوجۆری یووگایی بۆ کردم."[٥٧] لەیلاش بەشبەحاڵی خۆی حەزی لە ڕازاندنەوەی نێومالّ دەکردو دەیەویست هەر بەوەش بژی. هووەیدا یەکەمین کاری گرنگی لەوبارەدا پێسپارد. بڕیار درا لەیلا ڕازاندنەوەی ژووری ئێران لە پێشانگای نێونەتەوەیی ئێزمیردا وەئەستۆ بگرێ.

دوای چەند جار یەکتردیتن کە لە زۆربەیاندا مەنسوورو فەریدەش ئامادە بوون، هووەیدا سەرەنجام ڕۆژێک لەیلای بانگ کردە دەفتەری کاری خۆی لە کومپانیی نەوت. لەیلا پێی وابوو هووەیدا "کارێکی دیکەی بۆ پەیدا کردوە." تا ئەو وەختە پێوەندییەکەیان جیددیو ڕەسمی بوو. لەیلا دەیگوت "مکوڕ بووم کە بە ئاغای هووەیدا ناوی بەرم." بەڵام ئەو ڕۆژە لە دەفتەری هووەیدا خێرا تێگەیشت کە سەردانەکەی پێوەندییەکی بەکاری ڕازاندنەوەی نێومالّەوە نیە. لە جیاتی ئەوە هووەیدا باسی ئەڤینی خۆیو مەیلی بە زەماوەندی بۆ لەیلا کرد. لەیلا پێشنیاری هووەیدای ڕەت کردەوە. گوتی: "حازر نیم مێرد بکەمو جگە لەوە منداڵەبەربوونیشم بۆ سەختە."[٥٨] هووەیدا دەسبەجێ وەڵامی دایەوە کە منداڵداربوون بۆ ئەو جێگایەکی نیە. بێئەوەش کە حاڵەتێکی جیددی وەرگرێ ڕوونی کردەوە کە لەڕابردوودا، بە تاقیکردنەوەی پزیشکی، بۆی دەرکەوتوە کە هەرگیز ناتوانێ ببێتە باب. لەیلا سەرەنجام چارەیەکی نەما جگە لەوە کە ڕاستییەکەی بۆ بدرکێنێ. "ئەمن ئامادەی زەماوەند نیم. جگەلەوەش، ئەمن ئاشقی پیاوێکم کە لە ئەمریکا دەژی." بەڵام سەرەڕای ئەو ڕوونکردنەوەیە، هووەیدا وازی لە داخوازەکەی نەهێنا. نەکهەر لەیلای لە زۆر میوانداریباندا دەدی، بەڵکوو هەروا سەوداسەری بوو. بەڵام هەرلەوکاتەدا سیاسەتێکی دیکە مێشکی وی بەخۆیەوە خەریک کردبوو. ئێران بەرەو ئاڵوگۆڕێکی مەزن دەڕۆیشتو هووەیداش بڕیاری دابوو لەو ئاڵوگۆڕەدا نەخشێکی گرنگ یاری بکا.

# سەرچاوەکان

۱. نصیر عصار، گفتگو با نگارنده، واشنگتن دی سی، ۱۲ مه ۱۹۹۹.

۲. اطلاعات من دربارەی روابط هویدا با انتظام عمدتاً از فریدون هویدا اخذ شده است. نصیر عصار نیز برخی جزئیات را در اختیارم نهاد. مراجع مربوط به روابط هویدا با انتظام را می‌توان در بسیاری کتابها و مقالات یافت. مثلاً، پرویز راجی، یکی از کسانی که سالها زیردست هویدا کار کرده، می‌نویسد که هویدا «دست پروردەی سرشناس» انتظام بود. ر.ک. راجی، در خدمت تخت طاووس، ص ۴.

۳. امیر عباس هویدا، «یادداشت سردبیر» در کاوش، جلد ۱، شماره ۱، شهریور ۱۳۳۹.

۴. فریدون هویدا، گفتگو با نگارنده، ۱۲ مه ۱۹۹۹.

۵. قسمت اعظم اطلاعاتم دربارەی زندگی هویدا در ایام اقامتش در اشتوتگارت از نصیر عصار اخذ شده است. وی نیز که در آن هنگام دیپلماتی جوان بود مسئولیت کنسولگری ایران در آلمان را به عهده داشت. در خلال این دوران، وی با هویدا دوست شد و در بقیەی عمر هویدا همکار و دوست وی باقی ماند. نصیر عصار، گفتگو با نگارنده، واشنگتن دی سی، ۱۵ فوریه ۱۹۹۹.

۶. سیروس غنی، گفتگو با نگارنده، ۹ ژوئن ۱۹۹۹.

۷. اسماعیل رائین، فراموشخانه و فراماسونری در ایران، جلد ۳، تهران، ۱۳۵۷، ص۳۵۷. عضویت هویدا در لژ را هم احمد قریشی و هم «مقام امنیتی عالی‌رتبه» تأیید کردند. احمد قریشی، گفتگو با نگارنده، ۲۸ فوریه ۱۹۹۷. «مقام امنیتی عالی‌رتبه»، گفتگو با نگارنده، ۲۳ نوامبر ۱۹۹۷.

۸. البته ایرانیان تنها مردمی نبوده‌اند که فراماسون‌ها را به دیدەی شک می‌نگریستند و آنان را بخشی از یک توطئەی همه‌جانبه می‌دانستند. چنین سوءظنی در میان آمریکایی‌ها، به‌عنوان مثال، سخت رایج بود و یکی از مورخان پرآوازەی این دیار، ریچارد هافستدر، برای وصف این حالت به این گمان مفهوم «سبک بدگمانی بیمارگونه در سیاست آمریکا» را سکه زده است. به گمان او، منادیان این سبک، «در همەی کارها میل به اغراق دارند، به همه چیز به‌دیدەی شک می‌نگرند و خیالات وهم‌انگیز می‌بافند.» به گفتەی هافستدر، در آمریکا، تا اواخر سدەی نوزدهم، فراماسون‌ها عاملین اصلی‌ی این دسیسه‌ها دانسته

می‌شدند. پس از چندی کاتولیک‌ها، تنویرگرایان (Illuminati)، یهودیان و کمونیست‌ها جانشین ماسون‌ها شدند. برای بحث مفصل در این باره، ر.ک.:
*Richard Hofstadter, The Paranoid style in American Polities and Other Essays*, (Cambridge, 1996) 3–14.

۹. ساواک ظاهراً فعالیتهای ماسونها را از نزدیک تعقیب می‌کرد. بنابر اظهارات «مقام امنیتی عالی‌رتبه» هویدا هرگز پس از انتصابش به نخست وزیری در هیچ جلسه‌ای از فرماسونها شرکت نکرد. «مقام امنیتی عالی‌رتبه»، گفتگو با نگارنده، ۲۳ نوامبر ۱۹۹۷.

۱۰. برای دستیابی به شرحی از نقش ساواک در جمع‌آوری اطلاعات ر.ک.: سپهبد منوچهر هاشمی، داوری: سخنی درباره‌ی کارنامه‌ی ساواک، لندن، ۱۹۹۴، صص ۲۶۴ - ۲۶۱.

۱۱. «مقام امنیتی عالی‌رتبه»، گفتگو با نگارنده، ۲۰ مارس ۱۹۹۹.

۱۲. رائین، فراموشخانه، ص ۵۰۵؛ این کتاب ادعا می‌کند که انتظام استاد بزرگ «لژ بزرگ مستقل ایران» بود. در این کتاب اضافه می‌شود که وی «مرشد شاخه‌ی صفی علیشاهی دراویش» بود.

۱۳. ضیاء شادمان، گفتگو با نگارنده، مونترال، کانادا، ۳۰ مه ۱۹۹۹.

۱۴. رائین، فراموشخانه، ص ٦۷۴.

۱۵. برای بحثی درباره‌ی گرایش شاه به نظرات توطئه، ر.ک.:
Ahmad Ashraf, "The Appeal of Conspiracy Theories to Persians," in *Princeton Papers: Interdisciplinary Jornal of Middle Eeastern Studies*, vol. 5 (1996), 65–70.

16. U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Discussion of Censorship and Former Prime Minister Ali Amini: Confidential Memorandum of Conversation," NSA, no. 710.

17. U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Semi-annual Assessment of the Political Situation in Iran, February 20, 1969," NSA, no. 724, 19.

۱۸. احسان نراقی، که هر دو را به‌خوبی می‌شناخت، درباره‌ی این رابطه‌ی پدر - پسری صحبت کرد. احسان نراقی، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۱۱ مارس ۱۹۹۹.

19. Kaplan, *The Arabists*, 202.

۲۰. نصیر عصار، گفتگو با نگارنده، ۱۲ مه ۱۹۹۹.

۲۱. پیشین.

۲۲. راجی، در خدمت تخت طاووس، ص ۴۰.

۲۳. لیلا امامی، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۱۰ مارس ۱۹۹۹.

۲۴. استوارت راکول، گفتگو با نگارنده، ۲۳ مه ۱۹۹۹.

۲۵. فاطمه سودآور فرمانفرمائیان، گفتگو با نگارنده، ۱۲ مه ۱۹۹۹.
۲۶. فریدون هویدا، گفتگو با نگارنده، ۸ ژوئن ۱۹۹۹.
۲۷. پیشین.
۲۸. فریدون هویدا، گفتگو با نگارنده، ۱۰ مه ۱۹۹۹.
۲۹. بنا به اظهار فریدون هویدا، کاظمی عمدتاً به دو دلیل به امیر عباس علاقمند نبود. از سویی، کاظمی هویدا را از دست پروردگان سهیدی می‌دانست و از سویی دیگر خود رقیب سهیدی بود. به‌علاوه، کاظمی ظاهراً از پدر هویدا هم دل خوشی نداشت. فریدون هویدا، گفتگو با نگارنده، ۱۱ مه ۱۹۹۹.
۳۰. فاطمه‌ی سودآور فرمانفرمائیان، گفتگو با نگارنده، ۱۱ مه ۱۹۹۹.
۳۱. برای دستیابی به متن نامه، ر.ک. دلدم، زندگی و خاطرات، صص ۸۵ ـ ۸۴.
۳۲. پیشین، صص ۹۰ ـ ۶۴.
۳۳. فریدون هویدا، گفتگو با نگارنده، ۱۰ ژوئن ۱۹۹۹.
34. Cyrus Ghani, *Iran and the West* (London, 1987), 20.
۳۵. شرح روز اول کار هویدا در شرکت نفت را صادق چوبک در گفتگو با نگارنده، در ۲۲ نوامبر ۱۹۹۷، بیان کرد.
۳۶. صادق چوبک، گفتگو با نگارنده، ۱۵ فوریه ۱۹۹۸.
۳۷. صادق چوبک، گفتگو با نگارنده، ۱۵ نوامبر ۱۹۹۷.
۳۸. صادق چوبک، گفتگو با نگارنده، ۱۰ اکتبر ۱۹۹۷.
۳۹. راجی، در خدمت تخت طاووس، ص ۶.
۴۰. وجیهه معرفت، گفتگو با نگارنده، ۲۷ ژانویه ۱۹۹۸.
۴۱. «مقام عالی‌رتبه‌ی امنیتی»، گفتگو با نگارنده، ۵ ژانویه ۲۰۰۰.
۴۲. یکی از چنین مشاورانی ضیاء شادمان بود. گفتگو با نگارنده، مونترال، ۲۹ مه ۱۹۹۹.
۴۳. قدسی چوبک، گفتگو با نگارنده، ۲۷ مارس ۱۹۹۹.
44. U.S. Embassy in Tehran, "The Iranian Intellectual Community: Problems and Recommendations for U.S. Action, "Confidential Airgram, U.S. Embassy in Tehran, NSA, no. 494.
45. U.S. Embassy in Tehran, "The Iranian Intellectual Community," 8.
۴۶. احسان نراقی، خاطرات، صص ۳۳۰ ـ ۳۱۳.
۴۷. منوچهر پیروز، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۱۴ مارس ۱۹۹۹.
48. U.S. Department of State, Bureau of Intelligence and Research, "Studies in Political Dynamics in Iran," NSA, no. 603
۴۹. عبدالله انتظام، "نامه"، کاوش، شماره ۱، شهریور ۱۳۳۹.

۵۰. امیر عباس هویدا، "پیشگفتار"، کاوش، شماره ۴، ۴.

۵۱. پێشین.

۵۲. لیلا امامی، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۸ مارس ۱۹۹۹.

۵۳. برای دستیابی به شرح جامعی از کار برنامەی اصل ۴ در ایران، ر.ک.:
William E. Warne, ***Mission for Peace: Point 4 in Iran*** (Bethesda, 1999).

۵۴. ژان بکر، گفتگو با نگارنده، کالیفرنیا، ۲۱ مارس ۱۹۹۹.

۵۵. پێشین.

۵۶. لیلا امامی، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۸ مارس ۱۹۹۹.

۵۷. پێشین.

۵۸. پێشین.

# فەسڵی حەوتەم

## شۆرشی سپی

**ئاڵۆزیو ناڕوونی هەر زیاد دەبێ**
**داخوا هەرگیز نات‌ناسین؟**

**مەلویل**

# شۆڕشی سپی[٧]

ئەو گومانە زۆر باوە کە دەوڵەتی ئەمریکا لە سەردەمی جان کەنەدییەوە شای بۆ هێندێک چاکسازیی ئابووری‌و سیاسی لە مەنگەنە داوە. بەڵام وابزانم بە پشتبەستن بە بەڵگە مێژووییەکان دەتوانین بڵێین ڕاستییە مێژووییەکە وا نیە. لە نیوەڕاستەکانی دەیەی ٣٠ی هەتاوییەوە، واتە ڕاست پێنج ساڵ پێش سەرۆکایەتیی کەنەدی، سیاسەتدانەرانی ئەمریکا نیگەرانی سەقامگیریی درێژخایەنی ئێران بوون. ساڵی١٣٣٧ (١٩٥٨)، سیا هەرنەبێ لە دوو ڕاپۆرتی جیادا، گەیشتە ئەو ئاکامە کە "حەمەڕەزای پەهلەوی توانای گرتن‌و جێبەجێکردنی بڕیاری پێویست‌و لیبراوانە بەرەو چاکسازیی کۆمەڵایەتیی نیە"[١٠] هەشتی ڕەشەمەی١٣٣٦ (١٩٥٨)، تیمسار وەلییوڵلای قەرەنی، دەگەڵ سی‌وهەشت کەسی دیکە، بەتۆمەتی پیلانی کۆدیتا دژی شا گیران.[٢] دەوڵەتی ئێران لە یەکەم بەیاننامەی خۆی لەو پێوەندییەدا "دەوڵەتێکی بێگانەی نەناسراو"ی وەک بەرپرسی کۆدیتا ناساند. ئەوکات، هەموو چاوەدێرە سیاسییەکان دەیانزانی کە ئەو "دەوڵەتە بێگانەیە" لە دەوڵەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەدەر نیە. دیارە چەندوچۆنی دەستبوونی دەوڵەتی ئەمریکا لە کۆدیتای قەرەنیدا هێشتا ڕوون نیە. بەڵام بە پشتبەستن بە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئەمریکا دەکرێ لیبراوانە ئیددیعا بکەین کە قەرەنی پێش کۆدیتا پێوەندیی دەگەڵ باڵیۆزخانەی

ئەمریکا لە ئێران هەبوو. بۆ وێنە، ئەو حەڤدەی ڕێبەندانی ئەوساڵە چووە باڵیۆزخانەو پێشنیاری کرد وەزیری دەرەوەی ئەوکاتی ئەمریکا، جان فاستەر دالێس، داوا لە شا بکا کە "پادشایەتی بکا، نە حکوومەت."[20]

لە هەوڵێکی بەربڵاوو پێکەوەبەستراودا، دەوڵەتی ئەمریکا، سندووقی نێونەتەوەیی دراو، بانکی جیهانی، بانکی نێونەتەوەیی نوێکردنەوەو پەرەپێدان، و زانکۆی هاروارد، بە کۆمەگی ماڵیی بنیاتی فۆرد، گەڵاڵەی سیاسەتێکی نوێیان لە ئێران دارشت. دەیانەویست قەوارەی شابووریی وڵات بگۆڕن. داوای بەرنامەی درێژخایەنی ئابووریيان دەکردو سیاسەتی خۆخڕکردنەوەی ئابووریيان پێشنیار دەکرد. هەر لەوکاتەدا، دەیانەویست نەختێکیش لە دەسەڵاتی شا کەم بکەنەوە. یەکێک لە ئاکامە ڕەنگە نەخوازراوەکانی ئەم هەوڵانە ئەوە بوو کە ساڵی١٣٤٤(١٩٦٥) ئەمیر عەبباسی هووەیدا بوو بە سەرۆکوەزیری ئێران. ئەو بیروبۆچوونانە کە ئەو لە ساڵانی دەسەڵاتی خۆیدا بە دوایانەوە بوو، هەموویان زۆر وەک ئەو سیاسەتە چەندلایەنەیەی ئەمریکا دەچوون.

دیارە لە ترسی ئەوەی نەکا دەسەڵاتی پشتی ئەو چاکسازییە بۆ سەقامگیریی سیاسیی ئێران بەس نەبێ، یان تەنانەت ئەو ئەمنیەتە بخاتە مەترسییەوەش، ڕێکخراوە ئەمنیەتییەکانی ئەمریکا ساڵی١٣٣٦(١٩٥٧) کۆمەگیان بە دامەزرانی ساواکیش کرد. لە ساڵەکانی دواتردا ساواک پشتی بە هاوکاریی هێندێ ڕێکخراوی ئەمنیەتیی وەک مووساد، ئێم ئای٦و هێندێ ڕێکخراوی پۆلیسیی ئورووپای ڕۆژهەڵاتیش قایم بووو بەرەبەرە مەودای چالاکییەکانی بەربڵاو بوو. بەهێزکردنی ساواک لەڕاستیدا بەرگێڕەوەیەک بوو دژی سەرهەڵدانی پشێوی یان کۆمۆنیزم لە ئێراندا.[4]

لە نێوەڕاستەکانی دەیەی ٣٠ی هەتاویو لە جەرگەی شەڕی سارددا، کەمتر وڵاتێک بەقەد ئێران بایەخی ستراتیژیو ئابووریی هەبوو. لەو بوارەدا، پێش هەموو شتێک مەسەلەی نەوت گرنگیی ژیانەکیی هەبوو. ٢٢ی ژوئەنی ١٩٥٣، برایانی دالێس، کە یەکیان

وەزیری دەرەوەو ئەوی دیکەیان سەرۆکی سیا بوو، لە دەفتەری وەزیری کاروباری دەرەوە کۆبوونەوەیەکیان کرد. بەرنامەی کاری کۆبوونەوەکە پەسندکردنی وردەکاریی ناردنی یەکێک لە مەئموورەکانی سیا بۆ ئێران بوو. ناوی ڕاستی ئەو مەئمووره کەرمیت ڕۆزڤێلتو ناوی عەمەلیاتییشی "باران‌ساز" بوو. ئەرکەکەشی ڕووخاندنی دەوڵەتی موسەددیقو گێڕانەوەی شا بۆ سەر دەسەلات بوو. ناوی عەمەلیاتیی شاش "پیشاهنگ" بوو.[٥] کۆدیتا بەسەرکەوتنەوە ئەنجام درا. شا گەڕایەوە سەر دەسەڵات. موسەددیق زیندانی کرا. لە گرنگترین ئاکامەکانی ئەم کۆدیتایە ئەوە بوو کە کۆنسێرسیۆمێک لە کومپانییە نەوتییەکان دەسەڵاتی بەسەر نەوتی ئێراندا پەیدا کرد. هێندێ بەڵگە کە ماوەیەک لەمەوبەر لەبارەی چەندوچۆنی کۆدیتاوە لە ڕۆژنامەی نیۆیۆرک تایمزدا بڵاو بوونەوە بە ئاشکرا نیشان دەدەن کە ئەمریکا پێش پەسندکرانی وردەکاریی نەخشەی کۆدیتا دەیەویست ئینگلیس ئەوە دەستەبەر بکا کە دوای تەواوبوونی عەمەلیاتەکە بەشێک لە نەوتی ئێران دەبێتە هی کومپانییە ئەمریکاییەکان. "مێژوولکەی پێوەندییەکانی ئێرانو ئەمریکا" کە وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئەمریکا دایناوە ئەم ڕاستییە بە زمانێکی دیکە دەردەبڕێو دەنووسێ: "شێرەکانی نەوتی ئێران کرانەوەو هاوکات دەگەڵ ئەوە ئەمریکاش بەرەو ئێران شۆڕ بۆوە."[٦٠]

شا تا دوایین لەحزەی ژیانی لەوباوەڕەدا بوو کە پاڵپەستۆی ئەمریکا بۆ چاکسازیی کۆمەڵایەتی لە ئاخروئۆخری دەیەی سیو سەرەتاکانی دەیەی چلداو هەروەها شۆڕشی ئیسلامی خۆشی، ئاکامی هەوڵەکانی وی بۆ کزکردنی دەسەڵاتی کومپانییە نەوتییەکان بوون. لە وەڵام بۆمێژوو "پاسخ بە تأریخ"دا کە دوا کتێبیەتیو ڕاویژەکەی هێندێ جار وەک دۆنکیشۆت دەچێ، دەنووسێ:

"مێژووی نەوت پڕکێشەترین فەسڵی ئاڵوگۆڕی ئابووریو سیاسیی زۆر لە گەلانی جیهانی ئێستایە. فەسڵێکە پڕ لە ئاژاوەسازی، پیلان، هەورازو نشێو، ئاڵوگۆڕی سیاسیوئابووری، تێرۆرو کۆدیتاو شۆڕشی خوێناوی. ئەو ڕووداوانەی لەوساڵانەی دواییدا بەسەر

ولاتــی مــن هــاتن‌و ئــەو مەســەلانەی ئــەمڕۆ ئێــران لەگــەڵیان بەرەوڕووویــە، هــەروەها ڕووداوەکــانی ناوچــەی ڕۆژهــەڵاتی نێوەڕاست بێ لێکدانەوەی وردی مەسەلەی نەوت تێگەیشتن‌و لێکدانەوەیان ناکرێ...

هەر دەگەڵ ئەوەی ئێران دەسەڵاتی تەواوی بەسەر سامانە ژێرزەوییەکانی خۆیدا بەدەست هێنا، هێندێک لە ڕاگەیەنە گشتییەکانی دنیا خەباتێکی بەرینیان دژی ولات دەست پێکردو منیان بە پادشایەکی ملهوڕ ناو برد. چالاکییە دژی ئێرانییەکانی ڕێکخراوە بەناو خوێندکارییەکان لە دەرەوەی ولات هان دران. ئەم خەباتە ساڵی ۱۳۳۷ (۱۹۵۸) دەستی پێکرد. ساڵی ۱۳٤۱ گەیشتە چڵەپۆپە، بەڵام هەرگیز لەنێو نەچوو. هەرچەند دوای شۆرشی شاو خەڵک لە ئێران لەوساڵەدا، بەرامبەر بە پێشکەوتن‌و ئاڵوگۆڕەکانی ئێران دوژمنانمان ناچار بوون بێدەنگ بن. بەڵام دووبارە خەباتی تەبلیغاتیی خۆیان ساڵی ۱۳٥٤(۱۹۷٥) دەست پێکردەوە.[٧]

(محمد رضا پهلوی، پاسخ به تأریخ، بەکوشش شهریار، تهران۱۳٥۷، ۱۱۸-۱۱۲)

دیارە ئەگەر بۆچوونی یەکسەر هەقبەدەستانەی شا لە مێژووش قبووڵ نەکەین، دیسان ناتوانین گومان لەوە بکەین کە یەکێک لە تەوەرەکانی سیاسەتی هاوچەرخی ئێران هەر ئەم مەسەلەی نەوتە بوو. ئێران یەکێک لەگرنگترین ولاتانی بەرهەمهێنی نەوتە. جگەلەوە، خەلیجی فارس بە شاڕەگی نەوتی جیهان‌و ئاوەڕێی سەرەکیی ناردنی نەوت بۆ ڕۆژئاوا دادەنرێ. لە یەک قسەدا، ئەمنیەتی لێوارەکانی ئێران، زامنی ئەمنیەتی چوونی نەوتی خەلیجی فارس بۆ شوێنەکانی دیکەی دنیایە.

هاوینی ساڵی ۱۳۳۷ (۱۹٥۸)، کۆدیتا خوێناوییەکەی عێراق "شای ئێرانی ترساندو غافڵگیر کرد.(بێ گومان بیری پێ لە وەزعیەتی خۆشی کردەوە.)"[٨] هەرلەوکاتەدا، لەو وەختەوە، شا زۆر نیگەرانی دەست-درێژیی عێراق بۆسەر ئێران بوو. هەروەک لە ڕاپۆرتێکی سیا، ڕێکەوتی

١٢ی مانگی مای١٩٦٦ دەردەکەوێ، شا ناسیۆنالیزمی عەرەبی، کە لە لایەن ناسر لە میسرەوەش پشتی دەگیرا، بە مەترسییەکی گەورە بۆسەر ئێران دەزانی.[٩] لە ئاخروئۆخری دەیەی سیو لە تەواوی ساڵانی دەیەی چلدا، ئەو گومانانەی شا، بەتایبەتی لە ڕوانگەی ناحەزانیەوەو تەنانەت بە بۆچوونی هێندێ لە پشتیوانانیشی لە ئەمریکا، نیشانەی ترسی شێتانەی ناوبراو بوون. بەڵام ئەمڕۆ کە ئەزموونی شەڕی ماڵوێرانکەری ئێران‌و عێراقمان بەجێ هێشتوە، چارە نیە دەبێ ئەوڕاستییە قبووڵ بکەین کە ئەو گومانانەی شا بێ‌جێ نەبوون‌و ڕاست لەسەر بناخەی پێش‌بینییەکی وردو دروست‌و تەنانەت پێغەمبەرانەی دواڕۆژ دانرابوون.

سەرباری مەترسیی دەست‌درێژیی عێراق، ئێران سنوورێکی هاوبەشی دوورودرێژی دەگەڵ شووڕەوییش هەبوو. شا هەمیشە نیگەرانی دەست‌تێوەردان‌و پیلانگێڕیی شووڕەوی لە ئێراندا بوو. لە ڕاستیدا یەکێک لە پایەکانی سیاسەتی دەرەوەی ئێران لەو سەردەمەدا ئەو گومانە بوو کە دەوڵەتی شووڕەوی، بە پەیڕەوی لە سیاسەتی لەمێژینەی تەزارەکان، لە دەرفەتێک دەگەڕێ بۆ ئەوەی دەوڵەتی ئێران بڕووخێنێ‌و حکوومەتێکی دەست‌نێژی خۆی تێدا دامەزرێنێ‌و سەرەنجام خەونی لەمێژینەی وەدەست‌هێنانی بەندەرێک لە ئاوە ئازادەکانی خەلیجی فارسدا وەدی بێنێ. جان فاستەر دالیس، لە کاتی ئامادەکردنی سەفەری نۆیەمی شا بۆ ئەمریکا لە پووشپەڕی ١٣٣٧ (١٩٥٨)دا، یادداشتێکی بۆ ئایزەنهاوێر نووسی. لەودا هاتبوو: "[شا] پێی وایە ئێران پێویستیی بە سوپایەکی بەهێزتر هەیە...تا بتوانێ خۆ لەبەر دەست‌درێژیی شووڕەوی ڕابگرێ. لە وتووێژێکدا کە مانگی ژانویە دەگەڵیم هەبوو، هەوڵم دا تێی‌بگەیەنم کە بەربەستی بنەڕەتی دژی هێرشی شووڕەوی لەو ناوچەیە توانای بەرگێڕەوەی ولاتە یەککگرتووەکانە."[١٠]

ئەم هەوڵە دوولایەنەی کاربەدەستە ئەمریکاییەکان، واتە کەم‌کردنەوەی خەرجی خۆچەکدارکردنی ڕێژیمی شا لەلایەکو

ملزەمکردنی شا بەوە کە لەجیاتی بەهێزکردنی سوپای ئێران، پشت بە دەسەڵاتی یەکلاکەرەوەی ئەمریکا ببەستێ، لەلایەکی دیکە، لە ماوەی دەساڵی دواتردا درێژەی هەبوو و هێندێ هەورازو نشێوو جاروبار ئاڵۆزیی دەگەڵ بوون. لەجێدا، شا هەرگیز نەچووە ژێر باری قسەی ئەمریکاییەکان و لە سەردەمی سەرکۆماریی کەنەدیو جانسۆندا، ئەم مەسەلەیە تەوەری ئەو ناکۆکییانە بوو کە جاروبار لە نێوان شاو دەوڵەتی ئەمریکادا ڕوویان دەدا. ئەم ئاڵۆزییانە لە سەردەمی نیکسۆندا تەواو بوون. ئەو سەرەنجام دەگەڵ شا بوو بە هاوڕا. گوتی لەمەودوا شا دەتوانێ چەندی پێی خۆشە چەک بکڕێ. وەک دەڵێن، ئەو بۆ کڕینی چەک "چەکی سپی"ی دا بە شاو دەستی ئاوەڵا کرد تا بە کەلکوەرگرتن لە داهاتی ڕوولەزیادبوونی نەوت، چەکی دڵخوازی خۆی لە ئەمریکا بکڕێ.[11]

دیارە لە ساڵی ١٣٣٧ (١٩٥٨)دا تەوەری سەرەکیی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا بەرامبەر بە شووروەوی، نێوەرۆکی ستراتیژیی "گەمارۆ" بوو پاش ماوەیەک ئەمریکا، بە ڕەزامەندیی ئینگلیستان، ئێرانی ئاگادار کردەوە کە: "پێشوازی لە بەستنی پەیمانێکی بەرگریی ناوچەیی دەگەڵ تورکیەو پاکستان و عێراق دەکاو ئەگەر پەیمانێکی وا دروست بێ، ئەمریکا ئامادەیە کۆمەگ بە بەهێزبوونی هێزەکانی بەرگریی ئێران بکا."[12] ئێران دوای وەرگرتنی پەنجا میلیۆن دۆلار کۆمەگ لە ئەمریکا، سەرەنجام تێکەڵ بەو شتە بوو کە ناوی نرا پەیمانی سەنتۆ* هووەیدا

* چەند مانگ دوای چاپی ئینگلیسیی ئەم کتێبە، هێندێ بەڵگەی گرنگ و جێی سەرنجم دەربارەی چوونی ئێران بۆ نێو ئەو پەیمانە دەست کەوتن. لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی کاروباری دەرەوەو بیرەوەرییەکانی سێردنیس ڕایت،باڵیۆزی ئینگلیس لە ئێراندا، دەبینین کە ئێران هەر لە سەرتای دروستبوونی ئەم پەیمانەوە زۆر تامەزرۆ بووە بچێتە نێوی، بەڵام ئینگلیس و تارادەیەکی کەمتر ئەمریکاش دژی ئەوکارە بوون. دەیانگوت ئێران دەبێ لە پێشدا بارودۆخی ئابووریو سیاسیی وڵات ڕێک بخاو سەقامگیر بکا. تەنیا پاش هەوڵی زۆری شاو دوای پەنابردن بۆ تورکیە،

ئەوکاتەی سکرتێری باڵیۆزخانەی ئێران لە تورکیە بوو، سەروکاری دەگەڵ کاروباری پەیمانی سەنتۆ پەیدا کرد. لە.ڕاستیدا چوون بۆ نێو ئەو پەیمانە بە هەنگاوێکی گرنگ لە سیاسەتی دەرەوەی ئێراندا دەژمێردرا. دووسەد ساڵێک دەبوو کە ئێران هەوڵی دابوو لە کێشەی ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵاتدا هەرنەبێ بەڕواڵەت بێلایەن وەمێنێ. بەلام بە چوونە نێو سەنتۆ ئێران بەکردەوە ئەو بێلایەنییەی وەلا ناو دەگەڵ بەرەی ڕۆژئاوا کەوت.[١٣]

ساڵی١٩٥٨ (١٣٣٧)، سەرەڕای پێوەندیی دۆستانەی نێوان شاو ئایزەنهاوێر، هێندێ نیشانەی ئاڵۆزییەکی ڕوولەزیادبوون لە پێوەندیی نێوان ئێران‌و ئەمریکادا دەرکەوتن. لە سێپتامبر(خەرمانان)ی ئەوساڵەدا ئەنجومەنی ئاسایشی نیشتمانیی ئەمریکا کۆبوونەوەیەکی بۆ ڕاگەیشتن بە "ڕاپۆرتی ئاسایشی تایبەتی"ی ڕێکخراوی سیا پێک هێنا. لەو ڕاپۆرتەدا گوترابوو کە: "ڕێژیمی ئێستا لە [ئێران] زۆر وێدەچێ دەوامێکی زۆری نەبێ." لە ئاکامدا، لە سێپتامبرەوە تا نۆڤامبر، "سیاسەتی ئەمریکا لە ئێران کەوتە بەر هەڵسەنگاندنەوەی سەرلەنوێ". ئامانجی بنەڕەتیی ئەو هەڵسەنگاندنەوەیە، لێکدانەوەی چۆنیەتیی پێکهێنانی چاکسازیی پێویست لە ئێراندا بوو. کاربەدەستە ئەمریکاییەکان دەیانەویست بزانن چۆن دەتوانن شای ڕازی بکەن کە بێئەوەی پشتیوانە خۆپارێزەکانی لەدەست بدا، هێندێک لە داخوازەکانی چینی نێونجی (کە ئەمریکا پێی وابوو گرنگترین هێزی موخالیفی ئەوە)، بێنێتە دی... ئەو کاربەدەستانە گەیشتنە ئەو ئاکامە کە ئەگەر شا حازر نەبوو ئەو پێشنیارانە قبووڵ بکا، ئەمریکا لەڕێگای دامەزراندن‌و پەرەپێدانی پێوەندیی گونجاو دەگەڵ تاقمە ڕووبەگەشنە ناکۆمۆنیستەکانەوە، لە هاوپێوەندیی خۆی دەگەڵ شا کەم بکاتەوە."[١٤] لە ڕاستیدا، سەرەتای دەیەی چلی [هەتاوی] ، ناوەندی

ئینگلیس‌و ئەمریکا،ئەوان ڕازی بوون کە ئێران بچێتە نێو پەیمانی بەغدا ( کە دواتر ناوی نرا پەیمانی سەنتۆ). بڕوانە:

Sir Denis Wricht, MEMOIRS. (Unpublished).PP.286-292.

قورسایی سیاسەتی ئەمریکا لە ئێران پێکهێنانی یەکیەتی لە نێوان شاو چینی نێونجیدا بوو. دەیانەویست حیزبو بنیاتی پێویست بۆ هێنانە مەیدانی بژاردە تازەکوورە تەکنۆکراتەکان دروست بکەن. لەم ڕێگایەوە، هەر لەو کاتەدا دەیانەویست ژێرپێی حیزبە نەریتییەکانی دژ بە شاش بەتاڵ بکەن. هەر لەو ساڵانەدا، مەنسوور، بەهاوکاریی نیزیکی هووەیدا، دەیەویست ئەمریکاییەکان حاڵی بکا کە ئەو لە هەمووکەس باشتر دەتوانێ ئەو ئاڵتەرناتیڤە دروست بکا.

شا لەبەرەوڕووبوونەوە دەگەڵ ئاڵوگۆڕە سیاسییەکانی دەیەی چلدا وەک سیاسەتمەدارێکی بەتواناو کارامە خۆی نیشان دا. لەلایەک بەرامبەر بەویستەکانی ئەمریکاو ئینگلیس نەرمیی نیشان دەداو لەلای دیکە ڕۆژبەڕۆژ دەسەڵاتی خۆی زیاد دەکرد. بۆنموونە، موافەقەتی دەگەڵ پرۆژەی دروستکردنی سازمانی بەرنامە نیشان دا. هەر لەوێش بوو کە "گرووپێکی بچووکی پێکهاتوو لە چەند ئابووریزانی ئێرانی" و "کۆمەڵێک ڕاوێژکار کە بنیاتی فۆرد خەرجی دەکێشان"، هەوڵیان دەدا سیاسەتی بەرنامەدانانی ئابووریی درێژخایەن لە ئێراندا جێبەجێ بکەن.[15] دەیانەویست لەو ڕێگەیەوە بەرنامەڕێژیی درێژخایەنی ئابووری لە ئێراندا سەقامگیر بکەن و لە دەستی تاکەکەسێکی دەربێنن. شا بەڕواڵەت ئەم سیاسەتەی قبووڵ کرد، بەڵام هەر لەو کاتەدا، لە چەند ساڵی دواتردا بەرنامە ئابوورییەکانی جۆرێک لە دەستی خۆیدا خڕ کردنەوە کە بۆ هەموو سەرمایەدانانێکی گەورەی بەشی نێوخۆییو دەرەوە ڕەزامەندیی خۆی پێویست بوو. جگەلەوە، بەرپرسانی بەرنامەڕێژیی وڵات دەستیان تەنانەت بە ڕەقەمەکانی داهاتی ساڵانەی دەوڵەتیش ڕانەدەگەیشت. بۆ وەدەستهێنانی ڕەقەمی "تقریبی"ی ئەو داهاتە، مودیری کارای سازمانی بەرنامە ناچار بوو کەلک لە پێوەندییە تایبەتییەکانی خۆی لە کومپانیی نەوت و کۆنسێرسیۆمدا وەربگرێ.[16]

بە زیادبوونی پاڵەپەستۆی ئەمریکاییەکان بۆ ئەنجامدانی چاکسازی، لە ساڵانی نیوەڕاستی دەیەی پەنجای[هەتاوی]دا شا ئۆگرییەکی زیاتری بە چالاکییەکانی ئەنجومەنی بەرزی ئابووری نیشان دا. شا،

سەرۆكوەزیر، مودیری كارای سازمانی بەرنامە، سەرۆكی بانكی ناوەندیو ژمارەیەك لە وەزیران ئەندامی ئەو ئەنجومەنە بوون. ساڵی١٣٣٧ (١٩٥٨) حەسەنعەلیی مەنسوور كرا بە سكرتێری ئەو ئەنجومەنە. ئامادەكردنی كۆنووسی دانیشتنەكانو چاوەدێریی جێبەجێبوونی بڕیارەكانی ئەنجومەنو هەروەها پێشنیاری ڕێگاچارە بۆ مسەلە ئابوورییەكانی وڵات لە ئەركەكانی ناوبراو بوون. سەرەنجام، مەنسوور لە ئەنجومەنی بەرزی ئابووری وەك ئامرازێك بۆ بەدەستهێنانی ناوو ناوبانگ كەلكی وەرگرت.

بەڵام مەنسوور بەوەندە دانەدەمركاو سكرتێریی ئەنجومەنی بەرزی ئابووری بۆ بەرزەفڕییەكانی وی بەس نەبوو. زۆری پێنەچوو بۆخۆی گرووپێكی لە تەكنۆكڕاتو مودیرە ئێرانییەكان پێكەوە نا. كاری ئەو گرووپە لێكۆڵینەوەی مەسەلە كۆمەڵایەتیو ئابوورییەكانی ئێران بوو. هەر لەو كاتەدا دەیانەویست هێندێ ڕێگەچارەش بۆ ئەو گیروگرفتانە پەیدا بكەن. مەنسوور بۆ دروستكردنی ئەو گرووپە داوای كۆمەگی لە هووەیدا كرد. لە ئێرانیش، هەروەك ئورووپا، ئەم دووە دۆستی نیزیكو بەئەمەگی یەكتر بوون. دیارە هووەیدا نەكهەر بەئیشتیاوە چووە پاڵ گرووپەكەی مەنسوور، بەڵكوو دەسبەجێ بوو بە بیرۆكەداڕێژیشی. بەپێی ڕاپۆرتی سیا، ڕیشەی ئەو گرووپە "دەورەیەك" بوو كە مەنسوور ساڵی١٣٣٨ (١٩٥٩) وەڕێی خستبوو. خاڵی هاوبەشی "نۆ ئەندامی یەكەمی گرووپەكە ئۆگرییە پیشەییو كۆمەڵایەتییەكانیان بوو. هەموویان لاو بوون. نێونجیی تەمەنیان سیوحەوت ساڵ بوو. چاكسازیخوازانێك بوون كە دەیانەویست لە چوارچێوەی ڕێژیمدا كار بكەن. هەرلەوكاتەدا، هەموویان بە دوای قازانجی خۆشیاندا دەگەڕان. هەشت كەسیان دەرسخوێندووی دەرەوە بوون. چواركەسیان خوێندنیان لە فەڕانسە تەواو كردبوو. پاش نیزیكەی دووساڵ، دەورەی مەنسوور بوو بە "كۆمەڵی پێشكەوتنخواز". ئامانجی، كەندوكۆژ لە بواری مەسەلە سیاسیو ئابوورییەكانی وڵاتدا بوو. ژمارەی ئەندامەكانی بەرەبەرە گەیشتە نیزیكەی دووسەد كەس. زۆربەی ئەوانە كەسانێك

بوون کە پێوەندیی پیشەیی یان کەسی‌یان دەگەڵ مەنسوور یان هوەیدا هەبوو.[170]

ئەڤین‌و ئۆگریی هوەیدا بە "دەورە"ی مەنسوور ریشەی کردەیی‌و تیئۆریی هەبوون. ئەستێرەی سیاسیی مەنسوور لە هەڵکشاندا بوو، هوەیداش هیوای دوارۆژی خۆی بەو ئەستێرەیەوە گرێ دابوو. هەر لەوکاتەدا، هوەیدا لە باری تیئۆرییەوە گرنگیی گرووپێکی وەک "کۆمەڵی پێشکەتنخواز"ی باش دەزانی. چاک تێگەیبوو کە ئەو گرووپە دەتوانێ لە درێژخایەندا نەخشێکی بنەڕەتی لە سیاسەتی ئێراندا یاری بکا. هەروەک، ئاگای لە پێویستیی زوودامەزرانیشی هەبوو. ئەو بۆخۆی کەمێک دوای ئەوەی چووە کومپانیی نەوت، ببووە یەکێک لە لایەنگرانی سەرەکیی تیئۆریی "بەئێرانی‌کردن"ی سەنعەتی نەوت. لە وتووێژ دەگەڵ کۆنسێرسیۆمدا زۆرجار پێی لەسەر پێویستیی کەلکوەرگرتن لە مودیرو تەکنیسیەنی ئێرانی لە جیاتی مودیرو تەکنیسیەنی بێگانە، دادەگرت. هەر لەو کاتەدا، دەگەڵ ئەوبەشە لە بەرەی لاوی مودیران‌و تەکنیسیەن‌و حیسابدارانی ئێرانی کە خوێندنیان لە رۆژئاوا تەواو کردبوو و لە کومپانیی نەوت کاریان دەکرد، ببووە هاودڵ‌و هاوسەنگەر. ئەوان بە ئومێدی پێکهێنانی ئاڵوگۆڕ لە ئێراندا گەڕابوونەوە وڵاتەکەیان. بەڵام مەیدانی ئیداری بۆ ئەو گرووپە بەرتەسک بوو. کۆنسێرسیۆم هەمیشە کۆسپی لەسەر ڕێی گەشەکردن‌و چوونەپێشیان دادەنا. هوویدا بەسەبرو سیکەدانەوە بوو بە پاڵپشتی ئەو تەکنۆکراتە نارازییانە. زۆرجار بانگی دەکردنە دەفتەرەکەی خۆی، گوێی بۆ سکاڵاکانیان ڕادەگرت‌و داوای لێ‌دەکردن بۆ بەهێزکردنی گیانی هاوپێوەندیی‌و کار لە کرێکارانی کومپانیی نەوتدا هێندێ ڕێگەچارە پێشنیار بکەن.[18]

لە سەرەتای دەیەی چلەوە، هوەیدا لە لاپەڕەکانی "کاوش"دا پێی لەسەر پێویستیی پێگەیاندنی بەرەیەکی تازە لە مودیرو تەکنیسیەنە ئێرانییەکان دادەگرت. ئاڵوگۆڕەکانی کۆمەڵی لە لاپەڕەکانی گۆڤاردا دەخستە بەر باس. تەوەری سەرەکیی سەروتارەکانی پێ‌داگرتن لەسەر ئەو ئەسڵە بووکە پرۆسەی نوێ‌کردنەوە لە کۆمەڵدا تەنیا

بە کۆمەگو هاوکاریی تویژی تەکنۆکرات دەتوانن سەر کەوێ. لە وتاریکدا بە ناوی "ئەمرۆ کار بەدوای کارزاندا دەگەڕێو کارزانیش بەڕادەی پێویست نیە"، نووسیبووی لە هەموو جێیەک، تەنانەت لە وڵاتانی پیشکەوتووش دەگەڵ کەمیی کارزان بەرەوڕووین. باوەڕی وابوو "هەموو لەخۆیان دەپرسن بۆچی ئەوکاتەی بڕیارمان دا کارخانە وەڕێ بخەین بیرمان لە ژمارەی ئەوکەسانە نەکردەوە کە دەبوو ئەو دەزگایانە دامەزرێننو دوایەش کاریان پێ بکەن." ئەم قسانەی هووەیدا ڕەخنە لە سیاسەتی نوێکردنەوەی ناهاوسەنگو نارێکوپێک بوون، مەبەستی سیاسەتێک بوو کە لەودا هەڵدانی سەنعەتی لە بەشێکدا هاوڕێ دەگەڵ پێشکەوتنی سەرخانی "ڕوبنایی"یەو لە بەشەکانی دیکەدا هاوڕێ نیە. سەیر ئەوە بوو دواتر هەر ئەو نوێکردنەوە ناهاوسەنگە بوو بە سروشتی جیاکەرەوەو ڕوونی دەورانی سەرۆکوەزیریی هووەیدا خۆی. لە کۆتایی هەر ئەو سەروتارەدا، هووەیدا نووسیبووی: "کەوایە هەرکەس ئەم ئاووخاکەی خۆش دەوێ دەبێ ئامانجی ئەوە بێ کە یەکەم، لە پیشەسازیو کشتوکاڵو هەرجێیەک کە لەوانەیە کارزانێکی بێگانە دابمەزرێندرێ، خەڵکی ئێرانییان لەجێگا دابنرێ. دووەم، ئەوەندە کارناسو کارزانی ئێرانی ئامادە بکەین کە بۆ ئەو سەنعەتو پیشە تازانەش کە دەبێ ڕۆژێک لە ئێران دابمەزرێن بە ڕادەی پێویست خەڵکی کارزانمان هەبێ."[190]

لە وتارێکی دیکەدا هەر لەو بارەیەوە، باسی پێوەندیی پێچەڵپووچو ناسکی مافو بەرپرسایەتیی مرۆڤەکانی کردبووو نووسیبووی "دەسەڵات بێ بەرپرسایەتی نابێ." پێی لەسەر گرنگیی بێجێنشینی تەکنۆکراتەکان لەو شۆڕشەدا دادەگرت کە پێی وابوو ئێران نیازمەندو تینوویەتی. دەیگوت تەکنۆکراتەکان دەبێ توانای نەزەریو نووستووی خۆیان وەخەبەر بێننو بەکاری بەرن. دەبێ قەوارە نەریتییەکان بڕووخێنینو لە جێگای وان "بەدەستی خەڵکی وڵاتەکەمان، خەڵکی بەرپرسو سەرپشکی وڵاتەکەمان خانووی نوێ دروست بکەین، ئیدی جێگای بڕوبیانوو نیە. چوونکە پڕۆژە هەیە، نەخشە هەیە. دەرەتانی کار

هەیە. تەنیا هێزی ئێرانیو هەستی بەرپرسایەتیی دەوێ تا دیواری خانووی نوێ بچێتە سەرێ."[20] تەنانەت کۆمەگی لە مێژووەکانی هیرۆدۆتیش وەردەگرت و ئاماژەی بەو ڕاستییە دەکرد کە ئێرانییان لە ڕۆژگاری داریووشەوە، واتە ٢٥٠٠ ساڵ لەمەوبەر، خەڵکێکی داهێنەرو بنیاتنەر بوونو دروستکردنی ئەو شتەیان دەست پێکرد کە دواتر بوو بە کاناڵی سوویێز.[21] یەکێک لەلایەنە سەرنجڕاکێشەکانی ئەم وتارانە ئەو ڕاستییەیە کە لەواندا هیچ جۆرە ئاماژەیەک بە شا نابینرێ. تەنانەت لەو جێیە کە هوەیدا یادی "شۆرشی سپی"یش دەکاتەوە ناوی شا ناهێنێ. بەجۆرێکی دیکە بڵێین، بە پێچەوانەی ساڵانی سەرۆکوەزیرییەکەی کە هوەیدا لە هەموو دەرفەتێک بۆ پەسنی شا کەلکی وەردەگرتو هێندێ جار لەو ڕێیەدا زێدەڕۆییشی دەکرد، لە لاپەڕەکانی ئەم سەردەمەی "کاوش"دا، نیشانەیەک لە پێهەڵلاگوتن نابینرێ.

لە ڕاستیدا یەکێک لە بۆچوونە بنەڕەتییەکانی هوەیدا لەو ساڵانەدا ئەو گومانە بوو کە کلیلی ڕەمزی هەڵدانی کۆمەڵایەتی لە ئێراندا، یەکیەتیی نێوان دەوڵەتو تەکنۆکراتەکانە. ئەم گومانە دەتوانین لە یادداشتێکیشدا کە لەبارەی "کۆمەڵی پێشکەوتنخواز"ەوە ئامادەی کردبوو ببینین. لەوێدا دەڵێ: " ئێمە لەو باوەڕەداین کە لە سیاسەتدا دەبێ واقیعبین بینو ئەوەی دەکرێ ئەنجامی بدەین... بە لەبەرچاوگرتنی بارودۆخی ئێرانو دنیا (ساڵی١٣٣٩) بە باوەڕی ئێمە باشترین ڕێگا "هاوکاریی مەرجدار" دەگەڵ پادشایەتی بوو... دروستکردنی گرووپی ڕێکخراو بە تاقە فەلسەفەیەکەوە نەکهەر دەرەتانی نەبوو، بەڵکوو دڵخوازیش نەبوو... بۆیە "کۆمەڵی پێشکەوتنخواز"مان دامەزراند کە ئەندامەکانی بیروباوەڕی خۆیان دەپاراستو جۆرێک پەیمانیان لەگەڵ یەکتر دەبەست. ئەم پەیمانە پێوەندیی بە چاکسازیو گەشەپێدانی ئابووریو کۆمەڵایەتییەوە هەبوو... لەم گرووپەدا هەموو "ڕەنگە" سیاسیو فەلسەفییەکان بەشدار بوون (لە کۆمۆنیستەوە تا ناسیۆنالیستی توندڕەوو لە خودانەناسەوە تا خەڵکی بەتوندی مەزهەبی."[22]

پێشینەی هێندێک لە ئەندامانی "کۆمەڵی پێشکەوتنخواز" ئیددیعای

هووەیدای پشتڕاست دەکردەوە. جگە لە هووەیداو مەنسوور، دەتوانین مەحەممەدعەلیی ڕەشتی ناو بەرین کە خوێندنی زانستە سیاسییەکانی لە زانکۆی کۆلۆمبیا تەواو کردبوو، و ماوەیەکی کورت لە دەورانی "١٤ساڵەی مانەوەی لە ئەمریکا.. نەخشی وتەبێژی حکوومەتی موسەددیقی لە ئەستۆ بوو."[٢٣] موحسینی خواجەنووری، یەکێ دیکە لە ئەندامانی کۆمەڵ، وەختێک ئەندامی بەرەی نیشتمانیی ئێران بوو. لە بەرامبەردا، سەید زیائوددینی شادمان بە موسوڵمانێکی ئیماندار دەژمێردرا.

یەکەمین کۆبوونەوەی کۆمەڵی پێشکەوتنخواز وەختێک پێکهات کە سەرۆکی دەفتەری سیا لە ئێران ئەمریکاییەکی بەڕەگەز یۆگۆسلاڤی بوو بەناوی گراتیان یاتسڤیچ*، پیاوێکی سەروڕووخۆش، بەئەخلاق‌و بەدیمەن بوو. کەمێکی فارسی دەزانی‌و لەزۆر شەونشینی‌و میوانداریی دەسەڵاتدارانی ئەودەمی تاراندا بەشدار دەبوو. بۆخۆشی کەمێک ئاشپەزی فێر ببووو ڕۆژانی هەینی زۆر وەخت خواردنی ئێرانیی بۆ میوانان لێ‌دەنا. هەرلەوکاتەدا، ئەو کرێنشینی حەسنعەلیی مەنسوور بوو. دیارە هەر لەو کاتەدا کە یاتسڤیچ لە ئێران خەریکی کۆکردنەوەی زانیاری بوو، ساواکیش بەنۆرەی خۆی ئەوی خستبوە ژێر چاوەدێری. لە ڕاپۆرتێکی ساواکدا، ئەو بە "پیاوێکی یەکجار زیرەک" ناو برابوو کە "دەگەڵ زۆربەی گەورەپیاوانی وڵات ئاشنایەو ئەو ئاشنایەتییە بۆتە هۆی ئەوە کە کومانییە ئەمریکاییەکان بۆ بەرەوپێش‌بردنی مەبەستە ئابوورییەکانی خۆیان کەلکی لێ‌وەرگرن." هەر لەو ڕاپۆرتەدا ساواک نووسیبووی کە یاتسڤیچ ژنبازەو مەئموورانی ساواک دەیانەویست "لەو هاندەرەش بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆیان" کەلک وەرگرن."[٢٤] جگەلەوە، دەیانگوت مەنسوور یەکێک لە نیزیکترین دۆستانی یاتسڤیچە. دۆستە نیزیکەکانی دیکەشیان ناو بردبوون‌و لەوکاتەدا بەهیچ جۆر ناوی

---

* 'Gratian Yatsevitca.

هووەیدا نەبرابوو. لە ڕاپۆرتێکی دیکەدا گوترابوو کە یاتسڤیچ"* پاش تەواوکردنی دەورانی مەئموورییەتی خۆی لە ئێران، هەوای ماڵو منداڵ لەسەری داوە. دەیان گوت دەیەوێ لەوبارەیەوە داوای کۆمەگ لە دۆستە ئێرانییەکانی بکا. ساواک بە دانی ئەوجۆرە ئیمتیازە ماڵییانە بەو ڕازی بوو. پێی وابوو لەو ڕێگایەوە دوای بەستنی قەرارداد دەکرێ بە دانانی چەند کارمەند لە تەنیشت کۆلۆنێل یاتسڤیچ هێندێک زانیاری لەسەر خۆیو کارەکەی بەدەست بهێنرێ."[٥٩]

مەنسوور بێپەروا خۆی بە پێوەندی دەگەڵ یاتسڤیچەوە ڕادەنا. بە ئاشکرا دەگەڵ تەکنۆکراتە ناودارەکانی ئێران باسی "پێوەندی دەگەڵ کاربەدەستانی ئەمریکا"ی دەکرد. باسی دۆستایەتی دەگەڵ جان جەی مەککلۆی دەکرد. دەیگوت "دۆستە ئەمریکاییەکانی بەڵێنیان داوە شای ناچار بە چاکسازی لە ئێراندا بکەن. دەیگوت بەڵێنی یەکجارەکییان بەخۆشم داوە "کە لە دوارۆژدا دەبمە سەرۆکوەزیری ئێران."[٦٠] هەرچەند لەجێدا مەنسوور لەباری سیاسییەوە پیاوێکی لەخۆڕازیو بەچاوڕاو بوو، بەڵام هەرنەبێ ئیددیعای دۆستایەتی دەگەڵ یاتسڤیچی بێبناخە نەبوو.

---

* دیارە لەم بارەیەوە یاتسڤیچ تەنیا نەبوو. زۆر لە سیاسەتمەدارانی دیکەی ئەمریکاش لەوڕێگایەوە سامانیان وەسەر یەک نا .کەرمیت ڕۆزڤێلت،یەکی دیکە لە پیاوە گرنگەکانی سیا لە ئێران، سپیرۆ ئەگینۆ (Spirow Yatsevtca)جێگری سەرکۆماری لادراو نیکسۆن،و ڕیچارد هێلمز، کەوەختێک سەرۆکی سیا بوو و دوایە بوو بە باڵیۆزی ئەمریکا لە ئێران، هەموو بەوڕێگایەدا ڕۆیشتن. یاتسڤیچو ڕۆزڤێلت هەردووکیان دەلاڵی کومپانییە گەورە ئەمریکاییەکان بوون. یاتسڤیچ کەم وزۆر پاوانی بازاڕی گەنمی بەدەست هێنابوو. بەڵام لەو بوارەدا کومپانییەک کە هێلمز دایمەزراندو ناوی "سەفیر" بوو لە هەمووان زیاتری هەڵلا لەسەر ساز بوو. ڕەخنەکانی گۆڤاری نەیشن لەو بارەیەوە لە هەمووان توندتر بوون. لەوێ نووسیبووی: "کارتی بانگهێشتن[بۆ جێژنی دەستبەکاربوونی کومپانیی تازە] هەموو شتێکی دەردەخست. لەوێدا هێلمز وەک سەرۆکی کومپانی بێپەروا گوتوویە کە دەکرێ خزمەتەکانی باڵیۆزی ئەمریکا لە ئێران بکڕی."Nation, Dcc.1977.p.56

هووەیداش لە ڕێگای مەنسوورەوە دەگەڵ یاتسڤیچ ئاشنا بوو[*] یاتسڤیچ لەبارەی دۆستایەتیی خۆی دەگەڵ مەنسوورو هووەیداوە دەنووسێ: "هووەیدام زۆر دەدی. هووەیداو مەنسوور چەندساڵ پێکەوە هاوکاریyan کرد تابتوانن جێنشینێکی جێگای پەسند بۆ بەرەی نیشتمانی کە [لەبەر چاوی شاو ئەمریکا] ئیدی باوی نەمابوو، پەیدا بکەن، دەیانەویست پشتیوانیی ئەو توێژە ڕووناکبیرو دەرسخوێندووانە بەدەست بێنن کە لایەنگری بەرەی نیشتمانی بوون... کۆبوونەوەکانیان لە ماڵێک دەگیران کە دراوسێی من بوو. جاروبار ئەمنیش وەختی نیوەڕۆیان لە کۆبوونەوەکاندا بەشدار دەبووم. پێم وایە هەرچەند بەڕواڵەت مەنسوور سەرۆکی گرووپەکە بوو، بەڵام مێشکی بیرکەرەوەی ئەو گرووپە هووەیدا بوو."[٢٧٠] کۆمەڵی پێشکەوتنخواز ئاکامی ئەو میوانداریيانە بوو.

---

[*] هەوڵم دا دەقی ڕاپۆرتەکانی یاتسڤیچ لە بارەی دیدارەکانی دەگەڵ مەنسوورو هووەیدا پەیدا بکەم.نۆی مارسی١٩٩٩ نامەیەکم بۆ دەزگای سیا نووسی؛ بە پشتبەستن بەقانوونی ئازادیی زانیارییەکان داوای کۆپییەکی ئەو ڕاپۆرتانەم کرد. نۆزدەی مارس،وەڵامم وەرگرتەوە. لە نامەی دەزگای سیادا هاتبوو: "ئەو بەڵگەنامانەی داوات کردوون، ئەگەر لەجێدا هەشبن، بەجۆرێک ڕێک نەخراون کە ئێمە دەستمان وێیان ڕابگا. بەپێی قانوونی ئازادیی زانیارییەکان، داواکاران تەنیا بە مەرجێک دەتوانن بەڵگەنامەکان وەربگرن کە بە "جۆرێکی ماقووڵ" تاریفیان کردبن. دیارە مەبەست لە تاریفی ماقووڵ ئەوەیە کە بەڵگەنامەی داواکراو بەپێی سیستەمی ڕێکخستنی ئێمە تاریف کرابێ."

دیارە ئاگایەکم لە "سیستەمی ڕێخکستن"ی بەڵگەنامەکانی سیا نەبوو. هەرلەوکاتەدا دەمزانی دەزگای سیا،دەگەڵ "سیستەمی ڕێکخستنەکەی"، چەند مانگ پێشتر ڕایگەیاندبوو کە هەموو بەڵگەکانی پێوەندیدار بە سەردەمی موسەددیقو ڕۆڵی ئەو دەزگایە لە کۆدیتای ٢٨ی گەلاوێژی [١٣٣٢ (١٩٥٣)]یدا لێ "ون" بووە. بەوحاڵە نامەیەکی دیکەم نووسیو داواکەمم ڕوونتر کردەوە. ئەمجار نووسیم "هەموو ئەو ڕاپۆرتە سیاسییانەم دەوێ کە دەفتەری سیاسی لە تاران لە سەرەتای دەیەی چلەوە ناردوونی." ئەم جارە نووسیبوویان کە دەبوو لەنامەی١٩ی مارسدا بۆمان نووسیبای کە قانوونی ئازادیی زانیارییەکان ڕاپۆرتەکانی سیا ناگرێتەوەو لەوە کە لەنامەی پێشوودا لەبیرمان چووە داوای لێبووردن دەکەین.

ساڵی ١٣٤٢ (١٩٦٣)، دەستەیەک بەڕێبەرایەتیی مەنسوورو هووەیدا، بەرەبەرە بەناوی "دەستەی دامەزرێنەر"ی کۆمەڵی پێشکەوتنخواز دروست بوون. سندووقداریک هەڵ بژێردرا. لەوە بەدوا هەر ئەندامێک دەبوو مانگانە بیست تمەن هەقی ئەندامەتی بدا کە بەشی زۆریان پێیان ناخۆش بوو. بە کەلکوەرگرتن لەو داهاتە، ئاپارتمانێکیان وەک ناوەندی کۆمەڵ بەکرێ گرت. پێشتر کۆبوونەوەکانی کۆمەڵ هەموو لە ماڵی مەنسوور دەگیران. هەموو ئەندامێکی تازە دەبوو بە تێکڕای دەنگ لەلایەن دەستەی دامەزرێنەرەوە پەسند بکرێ. دیارە تەنانەت لەو قۆناخە سەرەتاییەو دەڵەمەیەشدا کۆمەڵی پێشکەوتنخواز لەڕاستیدا وەک بەشێک لە ڕێکخراوی دەوڵەتی کاری دەکرد. قۆناخەکانی وەرگرتنی ئەندامانی تازە ئەم ڕاستییەیان پشتڕاست دەکردەوە. ناوی هەر کاندیدایەکی تازە پێشان لە دەستەی دامەزرێنەردا باسی لەسەر دەکرا. دوای مووافەقەتی ئەو دەستەیە، داواکە دەدرا بە ساواک. تەنیا پاش هەڵسەنگاندنو ڕەزامەندیی ساواک، پێشنیاری وەرگیرانی کاندیداکە لە کۆمەڵدا دەهاتە گۆڕێ. پێوەندیی کۆمەڵ دەگەڵ ساواک لە ئەستۆی مەنسوور بوو.

لە تەواوی کۆبوونەوەکاندا، هووەیدا ڕۆڵێکی زۆر چالاکی هەبوو، لە تەنیشت مەنسوور، بە ئاشکرا، ڕێبەری کۆمەڵ بوو. بە پەرەگرتنی کۆمەڵ، هووەیداش لە کۆبوونەوە گشتییەکاندا، زیاترو زیاتر نەخشی کەسی دووەمی وەردەگرتو ڕێبەریو سەرۆکایەتیی کۆبوونەوەکانی بۆ مەنسوور بەجێ دەهێشت. بەرامبەر بەوە، لە کۆبوونەوەکانی دەستەی دامەزرێنەردا، هووەیدا هەروەک جاران نەخشێکی چالاکی یاری دەکردو وەک پێشوو هاوسەنگی مەنسوور بوو. هەتا ژمارەی بەشدارانی کۆبوونەوەکان زورتر دەبوو، مەنسوور پتر حاڵەتی سەرۆکی بەخۆوە دەگرتو هووەیداش پترو پتر لە گۆشەیەک بێدەنگ دادەنیشتو زۆرجار لەسەر پەڕە کاغەزێک خۆی بە نیگارکێشانەوە خەریک دەکرد.[٤٨]

ڕاست لەو ساڵانەدا کە هووەیداو مەنسوور زەمینەیان بۆ بەدەسەڵاتگەیشتنی خۆیان دەڕەخساند، بارودۆخی ئێران، هەرنەبێ بە بۆچوونی لێکۆڵەرە ئەمریکاییەکان، شپرزە بووو لە حاڵەتێکی قەیرانی نیزیک دەبۆوە. پازدەی مانگی مای ١٩٦١، لە ڕاپۆرتی ئەنجومەنی هێمنیی نیشتمانیی ئەمریکادا هاتبوو کە وەزعی ئێران، "هەروا بەرەو شۆڕش‌و بێسەرەوبەرەیی دەچێتە پێش‌و پێویستە ئەمریکا بەپەلە هەنگاو بنێ."[٢٩] لە کاتی کۆدیتاوە هەتا ئەوڕۆژەی کەنەدی هاتە سەرکار، ئەمریکا نیزیکەی میلاردێک دۆلاری کۆمەگ بە ئێران کردبوو. بەوحاڵە، ساڵی ١٣٤٠ (١٩٦١) ئێران لەبەر دەمی نابووتیدا بوو؛ ئاوسانی دراوی گاڵەی دەکرد؛ بێکاری گشتگیر بوو. مووچەی کرێکاران‌و کارمەندان بەشی گوزەرانیانی نەدەکرد. گەندەڵی برەوی تەواوی هەبوو؛ دراوی بێگانە کەم بووو خەڵک پێیان وابوو، بەرپرسی هەمووی ئەمانە ئەمریکایە."[٣٠] لە تاران‌و شارستانەکان، خۆپێشاندانی کرێکاران‌و مامۆستایان دەستی پێکردبوو. باڵیۆزخانەی ئەمریکا بەوردی چاوەدێریی وەزعەکەی دەکرد. هەر دووحەوتوو جارێک ڕاپۆرتێکی درێژی لەبارەی وەزعی دارایی‌و سیاسیی وڵاتەوە ئامادە دەکردو نیگەرانیی لە قەیرانی نیزیکی ئێران دەردەبڕی.

ناکۆکیی سیاسی‌و کەسیی شا دەگەڵ کەنەدییەکان وەزعەکەی ئاڵۆزتر دەکرد. دەنگۆ بوو کە شا لە هەڵبژاردنی سەرکۆماریی ساڵی ١٩٦٠دا بەنهێنی یارمەتیی ماڵیی بە نیکسۆن کردوە. ئەسەدوڵڵای عەلەم لە بیرەوەرییەکانیدا ئاماژە بەم خاڵە دەکاو دەڵێ کە ئەمە لە هەڵبژاردنی ساڵی١٩٦٨ی نیکسۆنیشدا دووپاتە بۆوە.[٣١] جگەلەوە، جان‌و ڕابێرتی برای هەردووکیان شایان بە کەسایەتییەکی ملهوڕو گەندەڵ دەزانی کە چاکبوونیشی بۆ نیە. لە بەرامبەردا شاش ڕقی لە هەردوو براکە بوو* دەڵێن کاتێک خەبەری کوژرانی جان کەنەدیی بیست

---

* وا باو بوو کە هەردووک جارەکە یارمەتیی ماڵی بەڕێگای ئەردەشیری زاهیدیدا کراوە. کەچی ئەو یەکسەر حاشا لە قسەکەی عەلەم دەکا. وتوویژ دەگەڵ

ئەوەندە ناڕەحەت نەبوو.[٢١] لەڕاستیدا، دەکرێ بڵێین دەسبەجێ پاش مەرگی کەنەدی، شا نامەیەکی بۆ جانسۆن نووسی. پیرۆزبایی وەرگرتنی پۆستی سەرکۆماریی لێکردو هەر لەوکاتەدا بە زمانێکی زۆر بەئێش، کەنەدیی لەسەر دەستتێوەردانی کاروباری نێوخۆی ئێران پەلامار دابوو. عەلەم ئەوکاتە سەرۆکوەزیر بوو، ڕاوێژی نامەکەی بەتوندو کاتەکەی بە نەگونجاو دەزانی. هەربۆیە ناردنەکەی وەدوا خستو چەندڕۆژ دواتر شای لە کارەکەی خۆی ئاگادار کرد. شا یەکجار تووڕە بووو لە ڕقان چەند ڕۆژ عەلەمی نەدواند.[٢٢]

بە توندتربوونی قەیرانی ئابووری، دەوڵەتی شەریف‌ئیمامی ڕووخا. ئەو لەمێژ بوو بە یەکێک لە ئەنگلۆفیلە ناسراوەکان دەژمێردرا. ژنبرایەکەی، ئەحمەدی ئارامیشیش، کە لە سەردەمی حکوومەتی شەریف‌ئیمامیدا مودیری سازمانی بەرنامە بوو دژی پرۆژەکانی ئەمریکا بۆ "سەقامگیریی ئابووری"ی ئێران بوو. بێتوانایی شەریف‌ئیمامی لە چارەسەری گیروگرفتە ئابوورییەکانی کۆمەڵدا بوو بەهۆی ڕووخانی کابینەکەی‌و شا بەنابەدڵی‌و لەژێر پاڵەپەستۆی ئەمەیکادا ، عەلیی ئەمینیی کردە سەرۆکوەزیر. مانگرتنی مامۆستایانی تاران کۆمەگی بە خێرایی ئەو دانانە کرد. وەختێک لە چاردەی بانەمەڕی ١٣٤٠ (١٩٦١)دا، کرێکارانی تاران، بەپێی بەیاننامەیەک، ڕایانگەیاند کە لە سبەینێوە دەگەڵ مانگرتنەکە دەکەون، "شا یەکجار ناڕەحەت‌و ئامادەی بەجێهێشتنی وڵات بوو. هەر ئەوشەوە درەنگانێک پۆستی سەرۆکوەزیریی بە ئەمینی پێشنیار کرد."[٢٤] باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە ئێران باشی دەزانی کە شا "مەیلێکی بەلای دانانی ئەمینییەوە نەبووەو تەنیا لە ترسان ملی بۆ ئەوکارە ڕاکێشاوە."[٢٥] هەربۆیە، لە ساڵەکانی دواتردا، بە کەلکوەرگرتن لە هووەیدا تۆڵەی لە ئەمینی کردەوەو پاڵەپەستۆی ئەمریکا بۆ دیاریکردنی ئەمینیی"کەموزۆر بە کۆدیتایەک دژی خۆی ناو برد."[٢٦] ئەوەی گراتیان یاتسفیچیش لەوبارەیەوە دەیڵێ زۆر وەک بۆچوونەکەی

---

ئەردەشیری زاهیدی، ٤ی نووتی ١٩٩٩.

شا دەچێ. یاتسڤیچ ئیددیعا دەكا "پێم وایە [شا] تێگەیەندرا كە دانانی ئەمینی كارێكی زۆر ئاقڵانەیە... نازانم بۆ، بەڵام ئێمە هەمیشە پێمان وابوو كە ئەمینی پیاوی مەیە."[٢٧]

باڵیۆزخانەی ئەمریكا لە ئێران و زۆر لە كاربەدەستانی ئەمریكایی لە واشنگتون پێیان وابوو دانانی ئەمینی "دوا هەلی ئێران بۆ چارەسەری گیروگرفتە كۆمەڵایەتییەكانی بەدەستی حكوومەتێكی نێوەندڕۆی ناسەربازییە. پاڵەپەستۆ نێوخۆیی و دەرەكییەكان هەموو ئەو ڕاستییە دەردەخەن كە هەلێكی دیكە نەماوە. ئەگەر قەیرانە ئابوورییەكەی ئێستا خێرا چارەسەر نەكرێ، ئەگەر هەنگاوی خێرا بۆ خەبات دژی گەندەڵی، بێ كیفایەتی و نادادپەروەری، كە لەمێژساڵە بەرۆكی كۆمەڵی ئێرانی گرتوە، نەهاوێژرێ، ئەودەم ئیدی ناتوانرێ پێشی هاتنەسەركاری سوپا یان بەرەی نیشتمانی بگیرێ. پێویست بە گوتن نیە كە هەردووكی ئەم حاڵەتانە ئاكامی زۆر جیددییان بۆ ئەمریكا بەدواوە دەبێ."[٢٨] باڵیۆزخانەی ئەمریكا لەلایەك متمانەیەكی زۆری بە سەركەوتنی ئەمینی نەبوو، لەلای دیكەش، باش دەیزانی كە "بە بێ كۆمەگی ماڵیی زۆرو دەسبەجێی ئێمە ئەو دەوامێكی ئەوتۆی نابێ."[٢٩] لە ڕاستیدا ئەمینی تاڕادەیەكی زۆر، ڕاست بە یارمەتیی ئەو كۆمەگانە هاتبووە سەر كار.

ئێران لەوڕۆژانەدا بەتوندی پێویستیی بە قەرزێكی سی‌وسێ میلیۆن دۆلاری لە ئەمریكا هەبوو. وا دیار بوو ئەمریكاش دانی قەرزەكەی بە هاتنەسەركاری ئەمینییەوە بەستبۆوە. لەوكاتەدا كەنەدی كۆمیتەیەكی تایبەتیی بۆ هەڵسەنگاندنی سیاسەتی ئەمریكا لە ئێران پێك هێنابوو.[٤٠] نوێنەرانی ڕێكخراوو وەزارەتخانەی جۆراوجۆری ئەمریكا ئەندامی كۆمیتەكە بوون. سەرۆكایەتیی ئەو كۆمیتەیە لە ئەستۆی فیلیپ تالبۆت* بوو. ئەركی كۆمیتەش، لێكدانەوەی هەلومەرجی ئێران و هەڵسەنگاندنی سیاسەتی درێژخایەنی ئەمریكا بوو. كۆمیتە دەیزانی كە لە ئێران "دیكتاتۆریی شا" وڵاتی خستۆتە گێژاوێكی

---

* Philip Talbott.

مەترسیدارەوە کە لەودا "ڕۆژلەڕۆژ ئیمکانی بێسەرەوبەرەیی پترە. دوور نیە ئەو بێسەرەوبەرەییە سەر بکێشێتە ئاڵۆزی یان کۆدیتایەکی دەستەڕاستی یان دەستەچەپی یان تەنانەت هاتنەسەرکاری داورودەستەی سەربە شووروەوی. ئەمریکا دەتوانێ بەقیمەتێکی زۆر گران، دەسەلاتی شا ڕابگرێ... هەر لەوکاتەدا دەتوانێ دەگەڵ ڕەوتی مێژوو بکەوێو پشتیوانی لە نێوەندڕۆیەکانی لایەنگری موسەددیق بکا... ڕێگەچارەی سێیەم بەرگری لە ڕێبەرانی دەستەڕاستیی هەڵبژاردەی سوپاو پشتیوانی لە کۆدیتای سەربازیی وانە... هاتنەسەرکاری ئەمینی، تەنیا ڕێگەچارەی دیکەی ئەمریکایە. بەباوەڕی کۆمیتە باشترین سیاسەت بۆ ئەمریکا لایەنگری لەو سیاسەتە[ئەمینی]یە."[41] کۆمیتە لە یادداشتێکدا بۆ سەرکۆمار، ئامۆژگاریی کرد کە ئەمریکا نابێ "لە هیچ کارێک بۆ دەستەبەرکردنی سەرکەوتنی ئەزموونی ئەمینی" درێغی بکاو دەبێ "لە ئازارگەیاندنی هەوڵەکانی شاو هێزە چەپەکان بیپارێزێ."[42] لە کۆنووسی کۆبوونەوەکانی "کۆمیتەی تایبەتیی ئێران" وا وەردەگیرێ کە ئەندامەکانی لە بارەی ئەو سیاسەتەوە کە ئەمریکا دەبوو لە ئێراندا ڕەچاوی بکا بەهیچ جۆر یەکدەنگ نەبوون. هێندێک وەک ڕابێرت کرۆمێر* ناڕاستەوخۆ باسی پێویستیی لابردنی شایان دێنایە گۆڕێ. باوڕیان وابوو کە "هەتا سەر ناتوانینو نابێ چاوەڕوان بین. دەبێ بۆچوونێکی تەواو تازەمان هەبێ. لە هەلومەرجی قەیرانیدا دەبێ ریسک بکەین. دەبێ دەگەڵ بۆچوونو گومان بچینە پێش. دەبێ قبووڵ بکەین کە هەمیشە ناتوانین هەموو ئاکامەکان پێشبینی بکەین."[43] ئارمین مایەر** کە ئەودەم یارمەتیدەری بەڕێوەبەری گشتیی وەزارەتی کاروباری دەرەوە لەبارەی مەسەلەکانی ڕۆژهەلاتی نێوەڕاستەوە بوو، هەر بەوناوە جاروبار لە کۆبوونەوەکانی "کۆمیتەی تایبەتی"دا بەشدار دەبوو. ئەو بەڕاشکاوی دەڵێ کرۆمێر ئەووەخت پێی دادەگرت کە

---

* Robert Kromer.

** Armin Meyer.

ئەمریکا دەبێ لابردنی شا وەک ڕێگەچارەیەکی قەیرانی ئێران بناسێ."[44] ئەندامانی دیکەی کۆمیتە، بەتایبەتی ئەوانەی لەلایەن وەزارەتی کاروباری دەرەوە لەو کۆبوونەوانەدا بەشدار دەبوون، زۆرتر لایەنگری ڕێگەچارەی بەپارێزتر بوون. بەوحاڵە، هەموو لەوەدا یەکدەنگ بوون کە "لە ڕابردوودا، کەسانێک کە لەلایەن ئەمریکاوە دەگەڵ شا باسی پێویستیی چاکسازی‌یان دەکرد هەموو دەگەڵ گیروگرفتێک بەرەوڕوو بوون: ئەمریکا هەرگیز هەڵوێستێکی یەکپارچەو ڕێک‌وپێکی نەبوو."[45]

ڕاوێژی دواڕاپۆرتی کۆمیتەی تایبەتی بۆ سەرکۆمار زۆرزۆر بەپارێزتر لە ئامۆژگارییەکانی کرۆمێر بوو. کۆمیتە لە ڕاپۆرتی ١٨ی ژانویەی خۆیدا گەیشتبووە ئەم ئاکامە: "کەسایەتیی شا بەجۆرێکە کە ئەگەر هەموو دەسەلاتیشی لە دەستدا بێ، ئەوجار ساڵەکانی مانەوەی لەسەر تەخت بێگومان لە ژمێرەدا دەبن." بەلام لە دواڕاپۆرتی کۆمیتەدا، ڕاوێژێکی دیکەش دەبینین. لەوێدا دەبینین کە بە باوەڕی کۆمیتە، ئەمریکا دەبێ لە جیاتی لابردنی شا، "بەکردەوە، بەشێوەیەکی چالاک‌و دیارە ناڕاستەوخۆ [شای] بۆ ئەنجامدانی چاکسازیی سیاسی، ئابووری، کۆمەلایەتی‌و بنیاتی لە ئێراندا بخاتە مەنگەنەوە."[46] بە وتەی تالبۆت، "دەبێ ڕێگای جۆربەجۆر بەشێوەی کاریگەر"[47] بۆ باش‌کردنی بارودۆخی ئێران بگرینە پێش. هەر لەو ڕاپۆرتەدا، کۆمیتەی تایبەتی ئامانجە گرنگەکانی سیاسەتی ئەمریکا لە ئێرانی باس کردوە. لەوانە؛ "کێشانەوەی شا لەوکارانە کە دەی‌خەنە شوێنی ڕاستەوخۆی بەرپرسایەتییەوە... کێشانەوەی خزم‌و کەسەکانی لە چالاکییە[ئابوورییە]کانی کەرتی تایبەتی... کەمکردنەوەی بێ‌متمانەیی توندی شا بەرامبەر بە سیاسەتمەدارانی سەربەخۆو کەمکردنەوەی ئۆگریی وی بە جامەلووسکەیی‌و پەسن‌بێژی...و سەرەنجام کردنی چینی نێونجیی شاری بە هێزێکی بنیاتنەری سیاسی."[48]

جگە لەمەترسیی هەمیشە ئامادەی دەستتێوەردانی شووروەوی لە ئێران، ئەوەی بە ڕواڵەت لەو سەردەمەدا دەستی ئەمریکای دەبەست، کەسایەتیی شاو ورەی لاوازی ئەو بوو. پێنجی ڕەشەمەی ١٣٣٩ (١٩٦١) ئەنجومەنی هێمنیی [نیشتمانیی ئەمریکا] ڕاپۆرتی دا کە "شا لەبارێکی دەروونیی ناڕەحەت‌و ناڕووندایە."[٤٩] حەڤدەی ڕەشەمەی هەرئەوساڵە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا باسی ڕاپۆرتێکی کرد کە تێیدا هاتبوو: "شا دوچاری خەمۆکیی دەروونی بووەو لەفکری کشانەوە لە پادشایەتیدایە. کشانەوەی لە دەسەڵات بێگومان دەبێتە هۆی بێ-سەرەوبەرەیی لە ئێران‌و تەنیا شووروەوی لە درێژخایەندا لەو بێسەرەوبەرەییە قازانج دەکا."[٥٠] سەرەنجام لە ٢٣ی بانەمەڕی ١٣٤٠ (١٩٦١)دا شا بەڕاشکاوی بە باڵیۆزی ئەمریکا لە ئێرانی گوت: "لە ئێران هەمیشە دەسەڵات لە دەستی شادا بووەو ئەمە دەبێ لە داهدتووشدا درێژەی هەبێ. ئەو پێی لەسەر ئەوە داگرت کە ئامادە نیە نەخشی پادشایەکی بێدەسەڵات یاری بکاو کشانەوە لە پادشایەتیی لە گێڕانی نەخشێکی وا پێ باشترە."[٥١]

ساڵی١٣٤٣ (١٩٦٤) شا سەفەرێکی پێنج حەوتوویی دەرەوەی ئێرانی کرد. سەرچاوە ڕەسمییەکانی دەوڵەتی ئێران ڕایانگەیاند کە ئامانجی سەفەر "حەسانەوە"یە. بەڵام باڵیۆزخانەی ئەمریکا ڕایەکی دیکەی هەبوو. لە ڕاپۆرتی باڵیۆزخانەدا هاتوە کە بە پێچەوانەی ئیددیعای سەرچاوە ئێرانییەکان، ونبوونی شا لە ڕاستیدا هۆی پزیشکی‌و دەروونیی جیددیتری هەبوون. "سەرچاوەیەکی جێی باوەڕ" لە "کۆڕوکۆمەڵە باوەڕپێکراوە پزیشکییەکانی ڤییەن" ڕاپۆرتی دابوو کە شا "تووشی شێواویی دەروونی بووە."[٥٢] هەر ئەو شێواوییە دەروونییە، ئەو خەمۆکییە دەروونییە، ئەو ئامادەییەی بۆ کشانەوە لە پادشایەتی- ئەوە کە دەتوانین بە مەجاز ناوی بنێین گرێی لۆرد جیم-و سەرەنجام هەرئەو داماوییەی دەوڵەتی ئەمریکا لەگرتن‌و ڕاگەیاندنی هەڵوێستێکی یەکدەست بەرامبەر بە ئێران هەموو لە دەیەی پەنجای [هەتاوی]دا سەرلەنوێ دەرکەوتنەوەو نەکهەر لە دیاریکردنی چارەنووسی شا،

بەڵکوو لە دیاریکردنی ئاکامی کاری ئەمیر عەبباسی هووەیداشدا نەخشێکی زۆر گرنگیان یاری کرد.

لەڕاستیدا کاتێک "کۆمیتەی تایبەتی دواراپۆرتی خۆی ئامادە کرد، کۆمەڵێک هۆی جۆراوجۆر- لە مەترسیی دەستتێوەردانی شووڕەوییەوە بگرە تا بێهێزیی دەوڵەتی ئێران و ئۆپۆزیسیۆن- هەموو دەستیان ویک داو تای تەرازوویان بە قازانجی شا قورس کرد. ئەمریکا پاڵەپەستۆ لەسەر شای کەم کردەوەو لە ڕەشەمەی ئەوساڵەدا، وەزارەتی کاروباری دەرەوە ڕاپۆرتێکی دیکەی لە بارەی ئێرانەوە ئامادەکرد. ئەمجار کەسێک بەناوی جان بوولینگ* نووسەری ڕاپۆرتێک بوو کە پێیانگوت "بەستەی چاکسازییەکانی شا."[٥٢] پێشنیارەکانی بوولینگ چاردە ماددەیان هەبووو تەوەری هەموویان چەندو چۆنی کردەوەکانی شا بوو. بەشێک لە پێشنیارەکانی ئەوە بوون کە شا هەوڵ بدا:

- ڕووی موخالەفەتی خەڵکی لە جیاتی خۆی بکاتە وەزیرەکان.
- بنەماڵەی پادشایەتی، یان هەرنەبێ بەشی زۆریان بنێرێتە ئورووپا.
- بەرەبەرە ڕاوێژکارە ئەمریکاییەکان لە ئێران دەر بکا.
- بەئاشکرا هێرش بکاتە سەر چینی دەسەڵاتداری نەریتیی ئێران.
- لە هەڵوێستە بەئاشکرا ڕۆژئاواییەکانی خۆی دوور بکەوێتەوە.
- هەرنەبێ بەرنامەیەکی ڕواڵەتی بۆ چاکسازیی زەوی و دژی دەرەبەگەکان دەست پێبکا.
- هێندێ جموجۆڵی بەڕواڵەت تێکەڵ بە هەڕەشە دژی کۆنسێرسیۆم بکا تا هیچ نەبێ وا بێتە بەرچاو کە کۆنسێرسیۆم بە پێچەوانەی ویستی خۆی، لەبەر شا دایئوانوەو "ئیمتیاز"ی داوەتێ.
- هێندێ لە کاربەدەستان بکاتە قوربانی و بەناوی "گەندەڵ" بەئاشکرا سزایان بدا. گرنگ نیە ئەو گەندەڵییە ئیسبات بکرێ یان نا.[٥٤]

---

* John Bowling.

- هێندێک لە موسەددیقییە نێوەندڕۆو خۆشناوەکان لە هێندێک پۆستی وەک وەزارەتی دارایی‌و سەرۆکی سازمانی بەرنامەدا دابنێ.

شا دەیزانی چار نیە دەبێ هێندێ چاکسازیی لەوبابەتە بکا. هەر لەوکاتەدا "نیگەرانی پشتیوانیی زۆری ئەمریکا لە ئەمینی" [٥٥] بوو. هەربۆیە، "بێ‌پەردە بە ئەمریکای گوت کە لە ئێران سەرکەوتنی بەرنامەی هەر دەوڵەتێک بە پشتیوانیی شاوە بەستراوە." پاشان لە خاکەلێوەی ١٣٤١ (١٩٦٢)دا، بە سەردانێکی ڕەسمی چووە ئەمریکا. لەوێ ڕەزامەندیی خۆی بۆ بەڕێوەبردنی ئەو چاکسازییانە کە ئەمریکا پێی باشن ڕاگەیاند. دوای گەڕانەوە لە سەفەر، و پاش ڕێگەخۆشکردنی پێویست دەگەڵ باڵیۆزخانەی ئەمریکا، سەرەنجام لە پووشپەڕی١٣٤١دا ئەمینیی لەسەر کار لابردو دۆستو هاوڕازی خۆی، ئەسەدوڵڵای عەلەمی کردە سەرۆکوەزیر. هەروەک لە ڕاپۆرتی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئەمریکادا بە ڕاشکاوی هاتبوو، شا دەیەویست لەم ڕێگایەوە چاکسازییەک کە ویستی ئەمریکا"[٥٦] بوو بکاتە "هی خۆی."[٥٧]

دیارە بەوە کە شا چاکسازییەکانی ئەمریکای کردنە "هی خۆی" گیروگرفتەکانی دەگەڵ دەوڵەتی کەنەدی چارەسەر نەبوون. ویلیام داگلاس* قازیی دادگای بەرزی ئەمریکاو یەکێک لە ڕاوێژکارانی نیزیکی کەنەدی، دەیگوت مەسەلەی لابردنی شا کەمێک پێش کوژرانی کەنەدی دووبارە هاتەوە بەرباس. داگلاس دەیگوت: "زۆرجار لەبارەی گەندەڵیی گشتگیری ئێرانەوە دەگەڵ جەک[کەنەدی] قسەم کردبوو. شا لە سەفەرێکی ڕەسمیدا میوانی کەنەدی بوو. دوای ئەو سەفەرە، جەک گەیشتە ئەو ئاکامە کە شا پیاوێکی جێی متمانە نیە... بەرنامە ئەوە بوو کە ئەمریکا پشتیوانیی خۆی لە شا ببڕێ‌و ناچاری بکا تەختی پادشایەتی بەجێ بێڵێ، کوڕەکەی لە جێگا دابنێ‌و ئەنجومەنی پادشایەتی دابمەزرێ. (تەنانەت ئەندامانی ئەنجومەنیش دیاری کرابوون.)"[٥٨] قسەکانی داگلاس هەرنەبێ لە دوو بارەوە زۆر جێی سەرنجن. لەلایەک نیشان دەدا چ

---

* Wiliam Dooglas.

کەلێنێکی قووڵ لە نێوان شاو کەنەدیدا هەبووە. لەلای دیکەش قسەکانی نیشانەیەکی سەرسوڕهێن لە خۆبەزلزانیی دەسەڵاتن کە لێرەداو ئەمجارە لە نووسینی کەسێکدا دەردەکەون کە بە بوونی بیروباوەڕی پێشکەوتووانە بەناوبانگ بوو. دیارە هەر خوێنەرێکی بێلایەن لە خۆی دەپرسێ کە ئەمریکا بە چ هەقێک دەستی لە کاروباری ئێران وەردەداو لەسەر چ بناخەیەک "ئەندامانی ئەنجومەنی پادشایەتییشی دادەنا"و بۆچی کەسێکی وەک داگلاس، کە ئیددیعای پێشکەوتنخوازیی هەبوو، دژی ئەو دەستتێوەردانە بێجێیە ڕانەدەوەستا.

ئەو سیاسەتە کە عەلەم بەدوایدا دەڕۆیشت، لە ڕاستیدا جیاوازییەکی ئەوتۆی دەگەڵ گەڵاڵەی پێشنیارکراوی بوولینگ نەبوو. لەو نێوەدا، دژکردەوەی ئینگلستان بەرامبەر بەو ئاڵوگۆڕانە بە شێوەیەکی تایبەتی پێچەڵپووچ بوو. لەلایەک، لە نفووزی ڕوولەزیادبوونی ئەمریکا بێزار بوو. لەلایەکی دیکەش، پشتیوانیی لە هێندێک لایەنی ئەو سیاسەتە دەکرد. ئینگلستان بەتایبەتی لایەنگری چاکسازیی زەوی لە ئێراندا بوو. هێندێک تەنانەت دەڵێن گەڵاڵەی بنەڕەتیی ئەو چاکسازییە هەوەڵجار ئان لامبتن[*] دایڕشتبوو کە بە لێکۆڵەرێکی ناسراو دەژمێردراو پێوەندییەکی نیزیکی دەگەڵ ناوەندەکانی دەسەڵات لە ئینگلستان هەبوو. شا دەیەویست لە ڕێگەی ئەو چاکسازییەوە کە بە "شۆڕشی سپی" ناوبانگی دەرکرد، هەم لەنێو چینی نێونجیی ئێراندا پێگەیەکی پتەوی دەست کەوێ، هەم خەونە لەمێژینەکەی وەدی بێنێ‌و ئێران بکاتە کۆمەڵێکی نوێخواز، هەم دەسەڵاتی تاکەکەسیی خۆی قایمتر بکاو هەم بە پشتیوانی‌و خۆشەویستیی خەڵک پشتئەستوور بێ. بەڵام قەزاوقەدەر لە بۆسەدا بووو کاری خۆی دەکردو لەو نێوەدا، هووەیدا هەر ڕۆژە نەخشێکی گرنگتری لە ئاڵوگۆڕەکانی ئێراندا وەئەستۆ دەگرت.

---

[*] Ann Lambton.

# سەرچاوەکان

1. CIA, "Stability of the Present Regime in Iran: Secret Special National Intelligence Estimate," 1958/08/25, NSA, no. 362; see also "The Outlook for Iran: Secret National Intelligence Estimate NIE 34-60," NSA, no. 385.

۲. با کمال تعجب قرەنی را به سه سال زندان که رأی سبکی به‌شمار می‌آمد، محکوم کردند. بلافاصله پس از روی کار آمدن حکومت اسلامی، وی به‌عنوان رئیس ستاد نیروهای مسلح برگمارده شد، و فقط دو ماه بعد به دست تروریست‌ها کشته شد. برای دستیابی به شرح کوتاهی از تلاش قرەنی برای کودتا، ر. ک.: بیل، عقاب و شیر، صص ۱۲۷ - ۱۲۸.

۳. برای شرحی از ملاقات بهمن ماه در سفارت، و برای دستیابی به متنی از برخی مکاتبات رسمی مهم در این زمینه، ر. ک.:

*Foreign Relations*, 1958-1960, vol XII (Washington D.C., 1993), 537-543.

جیمز بیل، در کتاب عقاب و شیر اظهار می‌دارد که شایعات مربوط به برخورداری قرەنی از حمایت امریکا تا حدودی کار انگلیسی‌ها بود، و مهمتر از آن «آشکارا خیالات» بود. ر. ک.: بیل، عقاب و شیر، ص ۱۲۸. اسناد سفارت نه‌تنها آشکارا نشان می‌دهند که بحثهایی جدّی با قرەنی انجام شده، بلکه یکی از دستیاران وی، اسفندیار بزرگمهر، با ویلیام روندتری، معاون وزارت خارجه‌ی امریکا، در آتن دیدار کرده است. شاه از این دیدار مطلع شد و به مقامات امریکایی از این بابت شکوه کرد. دالس، وزیر خارجه، در تلگرامی به سفارت امریکا در تهران، نوشت که شاه را باید مطمئن کرد که روندتری از قبل چیزی راجع به این ملاقات نمی‌دانسته و بزرگمهر هم «از هیچ نقشه یا سازمانی یاد نکرده است».

ر.ک.:

Foreign Relations, 542.

۴. برای شرحی جانبدارانه و یک طرفه از درون ساواک، ر.ک.: هاشمی، داوری.

۵. دربارەی این کودتا مطالب زیادی نوشته شده است. برای دستیابی به شرحی مختصر از آن، ر.ک.:

David Halberstam, *The Fifties* (New York, 1993), 366 – 367.

6. U.S. Department of State, "Top Secret: A Survey of U.S.-Iranian Relations, 1941–1979," NSA, no. 3556, 23.

۷. محمدرضا پهلوی، پاسخ به تاریخ، تهران.

8. "Stability of the Present Regime in Iran," August 26, 1958, *Foreign Relations*, vol. XII, 586.

9. CIA, "Intelligence Memorandum, "in *Foreien Relations of the United States, Iran, 1964–68*, vol. XXII (Washington, D.C. 1999), 247.

10. Ibid., 564.

۱۱. دربارەی این تصمیم و پیامدهایش برای سیاست ایران و آیندەی روابط مابین ایالات متحده و ایران، مطالب زیادی نوشته شده است. هنری پرشت، که در اوایل دهەی هفتاد میلادی مسئولیت امور نظامی و فروش تسلیحات در سفارت امریکا در ایران را بر عهده داشت، در مورد اطلاعاتی که پیش از ترک واشنگتن به قصد ایران دریافت کرده بود، صحبت می‌کند. «به من گفته شد که ایران می‌تواند هر چیزی را که شاه بخواهد خریداری کند. در نتیجه، مخالفتی دربارەی فروش اسلحه از جانب ما در آن‌جا ابراز نشد. تنها اقدام برای محدود کردن فروش سلاح، از جانب ملوین لِرد، در وزارت دفاع به عمل آمد؛ وی می‌خواست تعداد مشاوران نظامی امریکایی را که می‌شد به ایران اعزام کرد، محدود کند؛ اما وی پیش از این که بتواند عملاً این سیاست را تحقق بخشد، از کارش کنار رفت.» هنری پرشت، گفتگو با نگارنده، ۱۲ ژانویه ۲۰۰۰.

12. U.S. Department of State, "The Evolution of the U.S.–Iranian Relationship," NSA, no.3556, 26.

13. "NSC Discussion of Our Policy Towards Iran, September 9, 1958," *Foreign Relations*, vol.XII, 588–89.

14. U.S. Department of State, "Top Secret: A Survey," *Foreign Relations*, vol. XII 29–30.

15. U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Economic Assessment of Iran: November 1960," NSA 448, 3.

16. Abdol-Madjid Madjidi, interviewed in *Ideology, Process and*

*Politics Iran's Development Planning*, ed. Gholam Reza Afkhami (Washington, D.C., 1999), 292.

17. CIA, "Research Study: Elites and the Distribution of Power in Iran," February 1976, facsimile reproduced in *Asnad-e Laneh-ye Jasusi* [Documents from the Den of Spies], vol. 7 (Tehran, n.d.), 37–40.

۱۸. فرخ نجم‌آبادی، گفتگو با نگارنده، واشنگتن دی سی، ۱۲ ژوئیه ۱۹۹۹.

۱۹. امیر عباس هویدا، «بحث روز»، کاوش، اسفند ۱۳۳۹.

۲۰. امیر عباس هویدا، «سالی که گذشت»، کاوش، نوروز ۱۳۴۲.

۲۱. پیشین.

۲۲. امیر عباس هویدا، یادداشتهای دست‌نویس. این یادداشتها به لطف فریدون هویدا در اختیارم قرار گرفت.

23. U.S. Department of State, "The Iranian Intellectual Community: Problems and Recommendations foe U.S. Action," 1963/12/21, NSA 494, 5.

۲۴. رونوشتی از گزارش ساواک در جستاری در تاریخ معاصر ایران، جلد ۲، تهران، ۱۳۷۰، پیوست آمده است. صفحات این پیوست فاقد شماره است.

۲۵. پیشین.

۲۶. خداداد فرمانفرمائیان، گفتگو با نگارنده، ۲۶ ژوئن ۱۹۹۹، فریدون هویدا نیز به تفصیل درباره‌ی این دعاوی منصور صحبت کرد.

27. Gratian Yatsevitch, "Interview," Foundation for Iranian Studies: Program of Oral History, Nov. 5, 1988, January 1989. 125–26.

۲۸. برای دستیابی به گزارشهایی درخصوص دیدارهای اولیه، به گفتگو و مصاحبه‌هایم با ضیاء شادمان و نصیر عصار تکیه کردم. ضیاء شادمان، گفتگو با نگارنده، مونترال، ۳۰ مه ۱۹۹۹. نصیر عصار، گفتگو با نگارنده، واشنگتن دی‌سی، ۱۲ مه ۱۹۹۹.

29. JFK Library, "A Review of the Problem in Iran and Recommendations for the National Security Council," May 15, 1961

30. T. Cutler Young, "Iran in Continuing Crisis," in *Foreign Affairs* (January 1962), 275 – 92.

برای شرح جامعی از این دوره و اوضاع روابط امریکا با ایران، نیز بنگرید به بیل، عقاب و شیر، صص ۹۸ ـ ۱۳۱.

۳۱. علم خاطر نشان می‌کند که در ۱۳۴۰، اردشیر زاهدی از پست سفیر ایران در امریکا از کار برکنار شد، زیرا کندی که به‌عنوان رئیس جمهور برگزیده شده بود، این امر را خواسته بود. کندی از دخالت بی‌جای زاهدی در انتخابات امریکا عصبانی و برآشفته

بود. ر.ک. علم، یادداشتهای علم، جلد ۱، ص ۲۱۹. اردشیر زاهدی هرگونه دخالت در انتخابات از طریق کمک مالی به مبارزات انتخاباتی نیکسون را انکار می‌کند. اردشیر زاهدی، گفتگو با نگارنده، ۳ اوت ۱۹۹۹.

۳۲. علم، یادداشتهای علم، جلد ۱، ص ۱۳۷.

۳۳. پیشین، ص ۴۱.

34. JFK Library, "Basic Facts in the Iranian Situation," n.d.

35. JFK Library, U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Confidential Cable," May 10, 1961.

36. Ibid., 137.

37. Gratian Yatsevitch, Interviews in the Foundation for Iranian Studies: Program of Oral History, Nov. 1988, January 1989. 63–64.

38. U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Economic Assessement for Iran, June 1961," NSA, no. 470, 13–14.

39. Ibid., 14.

۴۰. برای گزارشی در همان اوان ازکار و ایده‌های این کمیته، ر.ک.:

"Report of the chairman, Iran Task Force," National Security Archives, doc. 428.

بحثی مختصر راجع به یافته‌های آن را می‌توان یافت در:

*Iran: The Making of U.S. Policy*, 1977–1980, vol. 1 (Washington, D.C. 1990), 241.

41. JFK Library, A Review of the Problem in Iran, 1–3.

42. JFK Library, "Memoradum for the President," 18 May 1961.

43. "Summary of Proceedings of a Meeting of the Iran Task Force," Washington, September 7, 1961, in *Foreign Relations*, 1961–63, 252.

۴۴. آرمین مه‌یر، گفتگو با نگارنده، ۵ اوت ۱۹۹۹.

45. JFK Library, "Position Paper on Iran," 24 February 1961.

هیچ کسی به‌عنوان نویسنده‌ی این گزارش معرفی نشده است. در یادداشتی پیوستِ این پرونده، خاطر نشان شده است که «منشأ... این گزارش شناخته نشده» اما ادامه می‌دهد «دیدگاههای عنوان شده با دیدگاههای فروشگاه دیک بیل هم‌نوایند.» از منابع دیگر در کتابخانه‌ی JFK می‌بینیم که «فروشگاه بیل» در واقع سیا است.

46. Memorandum from Robert W. Komer, Ibid., 428.

47. Memorandum for the President, 1961/10/19, NSA, no. 428, 1–2.

48. Ibid., 4–5.

49. JFK Library, National Security Council, 24 February 1961.

50. Memorandum from the State Department, *Foreign Relations*, 516.

51. JFK Library, U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Confidential Cable," May 13, 1961.

52. NA, "Confidential Report, U.S. Embassy in Tehran," March 1964.

۵۳. بیل، عقاب و شیر، ۱۳۴.

۵۴. پیشین، ص ۱۳۴.

۵۵. پیشین، ص ۳۵.

۵۶. پیشین، ص ۳۷.

57. U.S. National Security Concil, "Memorandum from Robert W. Komer of the National Security Council Staff to President Johnson," in *Foreign Relations of the United States, 1984–1968*, vol. XXII (Washington, 1999), 139

58. Willian O. Douglas, *The Court Years: 1939–75* (New York, 1980), 303–4.

# فەسڵی هەشتەم

## کۆمەڵی پێشکەوتنخواز

**ئەگەر ڕێز لە مافی دەنگدانی خەڵك نەگرن، ئەگەر بیانەوێ لەوڕێگایەوە بێدەنگیان بکەن، گومانی تێدا نیە کە ئەم دەنگە، درەنگ یان زوو، لە ڕێی توندوتیژییەوە خۆی نیشان دەداو ئێمەش وەك وڵاتانی دیکە، تووشی دەورێکی بێهوودەی سەرکوتو شۆڕش، چاکسازیو سەرکوتی سەرلەنوێو شۆڕشی سەرلەنوێ دەبینو هەتاهەتایە لەو دەورە ڕزگار نابین.**

**تۆماس جافرسۆن**

# کۆمەڵی پێشکەوتنخواز

شا لەلایەک زەمینەی لادانی ئەمینیی دەڕەخساندو لەلای دیکە مەنسووری بۆوەرگرتنی پۆستی هەورازتر ئامادە دەکرد. لە ساڵی ۱۳٤۰ەوە ئەمریکا لە هەموو دەرفەتێک کەلکی وەردەگرەت بۆئەوەی شای حاڵی بکا کە پێویستە لاوانی جێی باوەر لە پۆستە گرنگە دەوڵەتییەکاندا دابنێ.[1] لەڕاستیدا یەکێک لە کۆڵەکە بنەڕەتییەکانی سیاسەتی ئەمریکا لایەنگری لە هێزو دەوڵەتە "پێشکەوتنخوازو نێوەندڕۆیەکان" بوو. دەیەویست لەو ڕێگایەوە "بن پێی بەرەی نیشتمانی بەتاڵ بکا".[2]* لەڕاستیدا ئەمریکاییەکان دەیانەویست حیزب

---

* فەرەیدوونی مەهدەوی کە وەختێک لە سەرانی بەرەی نیشتمانی بوو و دواتر چووە نێو کابینەی هووەیدا، دەڵێ: ساڵی۱۹٦۱ کەسێک کەخۆی وەک نوێنەری دەوڵەتی ئەمریکا دەناساند پێوەندیی پێوە گرتم پێشنیارێکی هەبوو کە دەیگوت قبووڵکردنی بەقازانجی بەرەیە. دەیگوت بەرە بەتوانێ بە قبووڵکردنی ڕێبەرایەتیی شا ببێتە ئەندامی دەوڵەتێکی ئیئتیلافی. گۆیا ئەو کاربەدەستە ئەمریکاییە ئیددیعای کردبوو کە ئەگەر ئەم پێشنیارە قبووڵ نەکرێ لەوانەیە سەرانی بەرە سەر لە بەندیخانە بێننە دەر. یەکدوو ساڵ دواتر، ئەم پێشنیارە جارێکی دیکە دووپاتە کرایەوە. ئەمجارەیان نوێنەری ئەمریکا ئێرانییەک بوو کە لەوکاتەدا سەرۆکی بنکەیەکی بڵاوکردنەوەی ئێرانی–ئەمریکایی بوو. لەوکاتەدا بەشی هەرە زۆری ڕێبەرانی بەرە لە زیندان بوون. کۆبوونەوەی ئەنجومەنی بەرە هەر لە زیندان گیرا.
ئەنجومەن بە۱۲دەنگی موافیقو هەشت دەنگی موخالیف پێشنیارە تازەکەی قبووڵ

یان بزووتنەوەیەک دروست بکەن کە بتوانێ چینە نێونجییەکانی شار، تەکنۆکراتەکان و ڕووناکبیران ڕابکێشێ و ڕێکیان بخا، دەیانەویست لەم ڕێگایەوە جێنشینێک بۆ بەرەی نیشتمانی پەیدا بکەن. کۆمەڵی پێشکەوتنخواز خۆی وەک ڕێکخراوێکی لەو بابەتە دەناساند، بەڵام جارێ وەختی سەرکەوتنی بۆ سەر کورسیی دەسەڵات نەهاتبوو.

لە ساڵی ١٣٤٢ (١٩٦٣) بەدواوە ئەم دەنگۆیە لە تاران زۆر بەربڵاو بوو کە مەنسوورو کۆمەڵی پێشکەوتنخوازەکەی هەرنەبێ هێندێک لە ئەندامانی باڵیۆزخانەی ئەمریکایان لەپشتە. بە وتەی ستوارت ڕاکوێل، وەزیرموختاری ئەوکاتی ئەمریکا لە ئێران "بێگومان لە باڵیۆزخانە هێندێک کەس هەبوون کە نەزەریان لەسەر مەنسوور باش بووو پشتیوانی‌یان لێ دەکرد."[٢٠] ساڵی ١٣٤٢ شا کارێکی چاوەڕواننەکراوی کرد. فەرمانێکی دەرکردو لەودا پشتیوانیی خۆی لە کۆمەڵی پێشکەوتنخواز دەربڕی*. ئەوکارەی شا بەئاشکرا نیشانی دەدا کە کاتی

---

کرد. بەڵام چالاکانی بەرە لە دەرەوەی زیندان دەنگی زۆربەیان قبووڵ نەکردو بەرەش نەچووە نێو هیچ دەوڵەتێکی ئیئتیلافی. (فەرەیدوونی مەهدەوی،وتووێژ دەگەڵ نووسەر، ١٩ی ئووتی ١٩٩٩.)

* تێگەیشتنی مەبەستی شا لەوکارە هێندە دژوار نەبوو. کۆمەڵی پێشکەوتنخواز لە هێندێ تەکنۆکراتی بەتوانا پێکهاتبوو کە بەڕواڵەت ئەمریکاشیان لەپشت بوو. جگەلەوە، بەپێچەوانەی ئەمینی هەوای سەربەخۆبوونیان لە شاشیان لەسەردا نەبوو. هەرلەوکاتەدا، هەرنەبێ وا دیار بوو دەتوانێ بۆ بەرەی نیشتمانییش بچێتە مەیدانو تەنانەت لە مۆدیشی بخا. بە باوەڕی من، یەکێک لە کلیلەکانی ڕەمزی شۆرشی ئیسلامییش دەبێ لەو ڕاستیەدا ببینین کە هووەیداو ڕێکخراوەکەی کە قەرار بوو بە وتەی یاتسفیچ "جێنشین"ی بەرەی نیشتمانی بێ،بەهیچ جۆر نەیتوانی مەیلی دیکتاتۆرانەی شا بەرتەسک بکاتەوە. جگەلەوە،بەرەی نیشتمانی خۆشی ساڵی ١٣٥٧ (١٩٧٩)، لە سەروبەندی شۆرشدا، ڕاست ئەوکاتە کە لەوپەڕی بەهێزیدا بوو،نەیتوانی بەرامبەر بە ئایەتوڵڵا خومەینیو ئەو وەزعەی لەڕێدا بوو ڕاوەستێ. بەجۆرێکی دیکە بڵێین، هەم بەرەی نیشتمانیو هەم جێنشینەکەی، ئامانجە

بەدەسەڵاتگەیشتنی مەنسوور نیزیکە، و دیارە ژمارەی ئەوکەسانەش کە دەیانەویست بچنە نێو کۆمەڵ بەرەو زیادبوون چوو. کاری نووسینی پێڕەوی نێوخۆی کۆمەڵ بە ناسری یەگانە* سپێردرا کە مافناسێکی بەئەزموون بوو و دواتر بوو بە یەکێک لە کەسانی جێگای متمانەی هووەیدا.

لە هەموو ئەوماوەیەدا، هووەیدا هەروا لە کومپانیی نەوت خەریکی کار بوو. ساڵی١٣٣٩ (١٩٦٠) دەگەڵ ئینتیزام چووە ئەمریکا. لەوێ بەتوندی کەوتە ژێر کاریگەریی نەخشی تەکنۆلۆژیی تازە لە سەنعەتی نەوتدا. لە سەروتارێکی گۆڤاری "کاوش"دا نووسی: "دەبێ پەیڕەوی لە دواشێوەکانی بەڕێوەبردنی کاروباری پیشەسازی بکەین...دەبێ بە پرۆژەی وردو حیسابکراو دوورەدیمەنی سەنعەتی نەوتی وڵات بێنینە بەرچاوو لاوانی ئەمڕۆ بۆ بەڕێوەبردنی سبەینێی ئەو سەنعەتە پێبگەیەنین تا ببنە مودیرانێکی لێوەشاوەو کارزان بۆ بەڕێوەبردنی ئەوکارە ژیانەکییە." جگەلەوە، هەرلەو نووسراوەدا، پشتی بە قسەکانی ئینتیزام بەستبوو کە لە نیۆیۆرک ڕوو بە خوێندکارانی ئێرانی گوتبووی: "ئێران وڵاتی ئێوەیە. دەبێ بگەڕێنەوە قۆڵی لێهەڵماڵن، کارەکان ڕێکوپێک بکەنو ئەم بارە قورسە بگەیەننە جێ."[٤٠]

دیارە لەساڵی١٣٤٢ بەدواوە، بەشی هەرەزۆری وەختی هووەیدا

---

دریژخایەنە دێموکڕاتییەکانیان فیدای قازانجی کورتخایەنی سیاسی کرد.

* دوای شۆرش، ناسری یەگانە پاش ماوەیەک دەربەدەری چووە ئەمریکا. دەگەڵ ئەوەی دەستکورت بوو، عیززەتی نەفس ڕێگەی نەدا وەزعی خۆی بۆ دۆستەکانی باس بکا. بەوحاڵەش کاروباری زیاتر بەکۆمەگی ئەوان هەڵدەسووڕا. ماوەیەکی کورت لە وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئەمریکا بوو بە ڕاوێژکاری حوقووقیو بە دراوێک کە لەو سەرچاوەیە دەستی کەوت بەلەمێکی چووکەڵەی کڕی. دوایڕۆژەکانی تەمەنی،بەخەمباریو ناهومێدی لەو بەلەمەدا بەسەر بردو سەرەنجامیش خۆی کوشت. بۆ بەشی زۆری زانیارییەکانم دەربارەی دوایڕۆژەکانی ژیانی یەگانە قەرزداری هۆرمونزی قەریبم. ( هۆرمونزی قەریب، وتووێژ دەگەڵ نووسەر، فێورییەی ١٩٩٨).

بۆکاری ڕێکخستنی "کۆمەڵی پێشکەوتنخواز" دەڕۆیشت. مەنسوور، لە ڕەزبەری ١٣٤٢دا، لە چاوپێکەوتنی جۆلیس هۆڵمز، باڵیۆزی ئەمریکا لە ئێران، ئیددیعای کرد کە "پێی وایە لە ماوەی سێ تا چوار مانگی ئایندەدا ئەرکی پێکهێنانی دەوڵەتی تازەی پێ دەسپێردرێ."[5] یەک دوو حەوتوو دواتر مەنسوور دووبارە چۆوە باڵیۆزخانەی ئەمریکاو ڕاپۆرتێکی لە بەرنامەی ئایندەی خۆی دا بە باڵیۆزی ئەمریکا. لە یادداشتی باڵیۆز لەسەر ئەم وتووێژانەدا، هاتوە کە "ئەمیر عەبباسی هوەیدا کە کاربەدەستێکی پایەبەرزی کومپانیی نەوتە هاوکاری سەرەکیی مەنسوور لە دامەزراندنی کۆمەڵی پێشکەوتنخوازدا بووە. [مەنسوور لێی زیاد کرد کە] هوەیدا جارێ لە کومپانیی نەوت دەمێنێتەوە، بەڵام لەوێ کارو بەرپەسایەتی و ئەرکێکی کەمتر وەئەستۆ دەگرێ تا بتوانێ وەختی خۆی زیاتر سەرفی دروستکردنی "حیزبێکی پێشکەوتنخواز" بکا. پێم وایە ئەوکارە بە ئیجازەی شا کراوە، هەرچەند مەنسوور بە ڕوونی ئاماژەی بەوە نەکرد." هۆڵمز یادداشتەکەی بەم ڕستەیە تەواو دەکا کە "بە دووری دەزانم مەنسوور بتوانێ ڕێبەریی سیاسیی [ئەوکارە] وەئەستۆ بگرێ چوونکە بەباوەڕی من خاوەنی لێزانیی پێویست نیە."[6]

لەحاڵێکدا مەنسوورو هوەیدا لە فکری ڕاکێشانی تەکنۆکراتەکانی کۆمەڵ بۆنێو "کۆمەڵی پێشکەوتنخواز"دا بوون، سیاسەتی ئێران دەکەوتە قۆناغێکی پڕتوندوتیژییەوە. حەسەنی ئەڕسەنجانی بە لێبڕاوییەوە لە فکری ڕیفۆڕمی زەویدا بوو، کە دیارە خاوەنملکە گەورەکانی تووڕەو ناڕازی دەکرد.[7] لە ٧٨٪ی جووتیاران کە پێشتر بێ زەوی بوون بوونە خاوەنزەوی[8] و بەرەبەرە دەسەڵاتی بێسنووری دەرەبەگەکان لەنێو چووو دەسەڵاتی دەوڵەتی جێی گرتەوە.[9] جگەلەوە، قانوونێکی تازە مافی دەنگدانی دا بەژنان و پێڕەوێکی تازەی هەڵبژاردن، مەرجی سوێند بە قورئانی کرد بە سوێند بە کتێبی پیرۆز. لە ئاکامی ئاڵوگۆڕەکانی شۆڕشی سپیدا، ژمارەی شارنشینان زیادی کردو ساڵی ١٣٤٥ (١٩٦٦) گەیشتە نیزیکەی سەدی چلی حەشیمەتی ئێران.[10]

گرنگتر ئەوە بوو کە دەوڵەتی ئێران تەسلیمی پاڵەپەستۆی ئەمریکا بوو و یەکەم هەنگاوەکانی بەرەو پەسندکردنی ڕێککەوتنێکی تایبەتی بۆ پاریزراویی قانوونیی ڕاوێژکارە نیزامییەکانی ئەمریکا لە ئێراندا هەڵێنانەوە. هەموو ئەوهۆیانە دەستیان ویک داو زەمینەیان بۆ ئاڵوگۆڕەکانی ڕۆژی پازدەی جۆزەردان خۆش کرد. لە ڕاستیدا دەبێ ۱٥ی جۆزەردان بەجۆرێک ڕاهێنان بۆ شۆرشی ئیسلامی بزانین. لەوساڵەدا گرتنی ئایەتوڵڵا خومەینی پریشکێک بوو بۆ هەڵگیرسانی شۆرشی خەڵک. هەر ئەو گرتنەو دوایەش دوورخستنەوەی بۆ تورکیەو بەغدا ئەویان کردە کەسایەتییەکی گرنگ و بەناوبانگی دنیای سیاسەتی ئێران. بێجگە لەوە، شا بەهیوا بوو بە ڕیفۆرمی زەوی پێگەیەک بۆ ڕێژیمەکەی لە نێو دێهاتییەکاندا پەیدا بکا. هەرچەند لە ساڵەکانی سەرەتای دەیەی چلدا خۆشەویستییەکی زۆری لە نێو دێهاتییەکاندا بەدەست هێنا، بەڵام لە سەروبەندی شۆرشی ئیسلامیدا، ئەم هێزە کۆمەڵایەتییەش بە هاواری شا نەگەیشت و کۆمەگی بە شکانی ڕێژیم کرد.[11]

سەرکوتی ڕاپەڕینەکەی پازدەی جۆزەردان بە ڕواڵەت کاری ئەسەدوڵڵای عەلەم بوو. ئەو لە بیرەوەرییەکانیدا کە زۆریان خۆهەڵکێشان تێدایە زۆرجار ئاماژە بەورۆژە دەکا. دەڵێ شا یەکجار نیگەران بوو. عەلەمیش بەناچار ڕێگاچارەیەکی بۆ مەسەلەکە پێشنیار کرد. بڕیار درا شا بۆ ۲٤ سەعات فەرماندەیی سوپا بە عەلەم بسپێرێ و ئەویش بەنۆرەی خۆی، بە کەلک وەرگرتن لە سوپا، هەرجۆرە هەڵگەڕانەوەیەک سەرکوت بکا. بەپێی ئەو پرۆژەیە، ئەگەر عەلەم لە کارەکەیدا سەر نەکەوتایە، ئەودەم شا لای دەبرد، و ئەگەر پێویست بایە سزاشی دەدا.[12] بەڵام وا هات کە پرۆژەکەی عەلەم کاریگەر بوو. عەلەم پێی وایە دەوڵەتی ئەمریکا لەبنەوە پشتیوانیی لەو خۆپێشاندانانە دەکرد.[13] لە ڕاوێژی بیرەوەرییەکانی عەلەم بەئاشکرا وەردەگیرێ کە ئەو، پێی وایە لەو ڕۆژە پڕمەترسییەدا، بە لێبڕاویی خۆی تاج و تەختی پەهلەویی نەجات داوە.

کەچی ڕاست حەوتوویەک دوای ئەوە، شا کەوتە فکری لەسەرکارلابردنی عەلەم، ڕۆژی دووی پووشپەڕ شا دەگەڵ کاربەدەستێکی ئەمریکایی دیدارو وتوویژی هەبوو. لەم دیدارەدا، شا لێکدانەوەی خۆی لە ڕووداوەکانی ۱٥ی جۆزەردان خستە ڕوو. هەر لەو کاتەدا، پڕۆژەکانی چەند مانگی دواتری خۆی دەگەڵ میوانە ئەمریکاییەکەی هێنانە گۆڕێ. کاربەدەستە ئەمریکاییەکان، بەڕواڵەت لەبەر هۆی ئەمنیەتی، ناوی ئەومیوانەیان لە دەقی ڕاپۆرتی وتوویژەکان دەرهاویشتوە. لەوێدا شا دەڵێ:

ئەگەر ساواک دروست جووڵابایەوە، ڕووداوەکان خۆڵیلادانیان دەکرا... هەموو ئەو ژانەسەرانە لەبن سەری ئاخوندو مڵکدارە کۆنەپەرستەکاندا بوون.

شا دەیەوێ ئاڵوگۆڕێکی جیددی لە پێکهاتەی دەوروبەرەکەیدا پێک بێنێ. دەڵێ وەزیری دەربار، عەلا، پیرو لاواز بووەو ئیدی کارێکی لەدەست نایە. ئەوو دۆستەکانی لە ساتە قەیرانییەکاندا چوونە سەردانی شاو زۆر بە دوودڵییەوە داوایان کرد چەندی زوویە دەوڵەت بگۆڕدرێ. دەیانگوت دەبێ چ زوویە دەگەڵ ئاخوندەکانو موخالیفەکانی دیکە بکەوینە وتوویژ. تاقمێکی بێبڕشتی دیکە لە کەسانی وەک شەریف‌ئیمامیو ئینتیزام دروست بووە.

لە هەلومەرجی ئێستادا، حیزبێکی سیاسیی تازە دروست نابێ. لە دوای هەڵبژاردن تاقە حیزبێکی سیاسی وەک هێزی سیاسیی دەرەکی پێک دێ.

حەسەنعەلیی مەنسوورو "کۆمەڵی پێشکەوتنخواز"ی وی هەرنەبێ لە سەرەتای کاردا، ناوکەی سەرەکیی ئەم حیزبە دەبن.[14]

لەماوەی یەک ساڵی دواتردا، تەواوی بەشەکانی ئەو پڕۆژەیە جێبەجێ کران. دیارە لە کاتی ئەم ڕاپۆرتەدا، ستوارت ڕاکویل، وەزیرموختاری ئەوکاتی ئەمریکا، پەراوێزێکی لەسەر پڕۆژەی شا نووسی. دەڵێ: 'ئێمە لێرە بەو ئاکامە گەیشتووین کە ناوکەی سەرەکیی سیاسەتەکانی ئایندەی شا، مەنسوورو "کۆمەڵی پێشکەوتنخواز"ی ئەون.

شا دەیەوێ پارلمانی ئایندە بە کۆمەگی ئەو گرووپەو بە تێکەڵاوێک لە کارزانان‌و خاوەن‌سەنعەت‌و سەرمایەکان پێک بێنێ. دیارە ئەگەر شا بەڕاستی حەسەنعەلیی مەنسوور بکاتە سەرۆکی ئەم حیزبە، و بیهەوێ ئەم حیزبە بکاتە ئاڵاهەڵگری سەرەکیی ڕیفۆرمخوازی لەکۆمەڵدا، ئەودەم ناچارە بەکردەوە بۆخۆی ڕێبەرایەتیی سیاسیی حیزبەکە بەدەستەوە بگرێ. مەنسوور پیاوی ئەو مەیدانەو ڕێبەرێکی لێزانی سیاسی نیە."[15]

لە هەڵسەنگاندنی ڕاکویل بۆ مەنسووردا نیشانەیەک لە ستایش‌و تاریف نابینین. ئەگەر لەبیرمان بێ کە عەلەم ئەم ڕاکویلەی بە بەرپرسی سەرەکیی بەرزبوونەوەی سیاسیی مەنسوور دەزانی، ئەودەم نێوەرۆکی قسەکانی ڕاکویل بایەخێکی دووچەندان پەیدا دەکا.

سێی خەزەڵوەری ۱۳٤۲ (۱۹٦۳)، شا دووبارە لەبارەی مەنسوورو دوارۆژیەوە قسەی دەگەڵ باڵیۆزی ئەمریکا کرد. ئەمجارەیان بەهۆڵمزی گوت کە ئومێدێکی زۆری "بە توانایی مەنسوور وەک ڕێبەرێکی سیاسی نیە." بەوحاڵە، پێی وایە "لە هەلومەرجی ئێستادا، لەو باشتر کەس بەدەستەوە نیە."[16] هۆڵمزیش، وەک ڕاکویل، لە پەراوێزی ڕاپۆرتەکەدا، نەزەری خۆی لەبارەی ئاڵوگۆڕە پێشنیارکراوەکانی شاوە دەربڕی‌و نووسی: "بە پێچەوانەی بۆچوونی شا، ئەمن پێم وانیە مەنسوور توانای دامەزراندنی حیزبی سیاسی‌و ڕێبەرایەتیی دەوڵەتی هەبێ. زۆر لە ئێرانییە خاوەن‌نەزەرەکان، بۆ نموونە هێندێک لە نوێنەرانی پارلمان‌و سەناتۆرەکان، نەزەریان لەسەری باش نیە."[17]

ماوەیەک دوای ئەو وتوویژە نهێنییانەی شا، "کۆمەڵی پێشکەوتنخواز" خۆی کردە حیزبی ئێرانی نوێ. بۆ یەکەمجار، ژنانیش بانگهێشتن کران بۆ ئەوەی تێکەڵی حیزب بن. فەڕڕوخڕووی پارسا یەکەمین ژن بوو کە بووە ئەندامی حیزب‌و یەکەمین ژنی مێژووی ئێرانیش بوو کە گەیشتە پۆستی وەزارەت. هەرلەوکاتەدا، دوای شۆرش یەکەمین ژن بوو کە درایە دەستی تاقمی ئیعدام. هەرئەوساڵە، مەنسوور بە هاوکاریی هووەیداو گرووپێکی چووکە لە یەکەم ئەندامەکانی

"کۆمەڵی پێشکەوتنخواز" لیستێکی کاندیداکانی حیزبی بۆ هەڵبژاردنی ئایندەی پارلمان ئامادە کرد. پاشان کۆمیتەیەکی پێکهاتوو لە عەلەم و مەنسوورو نوێنەرێکی ساواک پێکهاتەی پارلمانی ئایندەیان خستە بەرباس. لە لیستی کاندیداکانی حیزبی ئێرانی نوێیان کۆڵیەوەو لەسەر ئەوە کە چەند نوێنەر لەم حیزبە دەبێ بچنە پارلمان چەنەیان لێدا. لەم کۆبوونەوانەدا تەنانەت پێکهاتەی ڕێبەریی پارلمانیش هەر بەوشێوەیە دیاری کرا. سەرەنجام لیستی نوێنەرانی پارلمانی ئایندە ئامادەکراو بۆ پەسندی یەکجاری "بە عەرزی شا گەیشت". پاش پەسند کردنی شا، تەواوی ئەو کاندیدایانە لە "هەڵبژاردنی ئازاد"ی دواتردا وەک نوێنەری پارلمان هەڵبژێردران![18]

لە چەند مانگی دواتردا عەلەم و کابینەکەی لە بارودۆخێکی نەخوازراودا بوون. هەم لەسەر کار بوون و هەم نیوەلابراو.[19] مەنسوور، لە یەک مانگ پێش دیاریکرانی بە سەرۆکوەزیرەوە، بە ئاشکرا بەڵێنی پۆستەکانی کابینەی بە کەسانی جۆراوجۆر دابوو. بارودۆخی ئەو ڕۆژانە هەم لە ڕاپۆرتێکی باڵیۆزخانەی ئەمریکادا دەتوانین وەخوێنین و هەم لە کاریکاتۆرێکی گۆڤاری "تۆفیق"دا. لە ڕاپۆرتی باڵیۆزخانەی ئەمریکادا هاتبوو: "لەلایەک حەسەنعەلیی مەنسوورو "تیمەکەی" چاوەڕوانی ئەوڕۆژەن کە جڵەوی کارەکان بەدەستەوە دەگرن، و لەلای دیکە، عەلەم هەروا سەرۆکوەزیرەو بەڕواڵەت لەو وەزعە ئازار دەچێژێ... وەزعەکە وەک شانۆیەکی ناشیییانە دەچێ کە ڕاوەستانی بێ-جێی زۆر تێدان و هەموو چاوەڕوانن داخوا کەنگێ نۆرەیان دێ بچنە سەر شانۆ. هێندێ نیشانە هەن کە هەموو کارەکانی دەوڵەت ڕاگیراون و بڕیارەکان بۆ ئایندە هەڵگیراون."[20] گێڕانەوەی "تۆفیق" جوانتریشی وەزعەکە نیشان دەدا. ئەم بڵاوکراوەیە لە ژمارەیەکی ڕێبەندانی ١٣٤٢ی خۆیدا "کاریکاتۆرێکی لە حەسەنعەلیی مەنسوور کێشابۆوە. چواردەوری بە قونچکە سیگاری کەنت گیرابوو. ئەویش بە بێسەبری سەیری لاپەڕەکانی ڕۆژژمێری دەکرد کە یەک لەدوای یەک دەکەوتنە سەر زەوی. لەژێر کایکاتۆرەکە نووسرابوو: "ألإنتظار أشد من الموت."[21]

لەم سەردەمەدا ، هووەیدا ڕۆڵێکی بنەڕەتیی لە هەڵبژاردنی وەزیرەکانی کابینەی مەنسووردا بەدەستەوە بوو. پۆستی وەزارەتی دەرەوەی بۆخۆی دانابوو، بەلام شا ئەم پێشنیارەی ڕەت کردەوەو دەستووری دا عەبباسی ئارام وەک وەزیری دەرەوە ، لە پۆستی خۆیدا بمێنیتەوە. چەندرۆژ پێش ساڵنوێبوونەوە، شا مەنسووری لەو شوێنە کە لەکۆنەوە ئاواتی بۆ دەخواست دانا. ئەمیر عەبباسی هووەیدا وەزیری دارایی کابینەی تازە بوو.

بەلام عەلەم دەبوو، پێش ئەوەی جڵەوی کارەکان بداتە دەستی مەنسوورو کابینەکەی، کارێکی گرنگی ناتەواو بەئەنجام بگەیەنێ. ئەوکارەی نوێنگەی زەقی ئەو توێکڵە شووتییەیە کە دەیهاوێنە بەر پێی ناحەزانی خۆیان. باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە ئێران، لە وەلامی پێ-داگرتنی شا لەسەر کڕینی چەکو کەلکوەرگرتن لە ڕاوێژکارانی ئەمریکاییدا، ڕەشەمەی۱۳٤۰(۱۹٦۲) مەرجێکی تازەی بۆهاتنی ڕاوێژکارانی نیزامیی ئەمریکا دانا. باڵیۆزخانە دەیەویست نەکهەر نیزامییانی ئەمریکا، بەڵکوو ئەندامانی بنەماڵەکانیشیان، لە ئێران پاریزراویی دیپلۆماتییان هەبێ. ئەوجۆرە پاریزراوییە لە ئێراندا پێشینەیەکی کۆنو شوومی هەبوو؛ پێیان‌دەگوت "هەقی کاپیتولاسیۆن"و بە نوێنگەی هەرەزەقی کۆلۆنیالیزم دادەنرا. ۲۱ی بانەمەڕی۱۳۰۷ (۱۹۲۸) ڕەزاشا، لە ڕێوڕەسمێکی بەشکۆدا کاپیتولاسیۆن لە ئێرانی هەڵوەشاندەوە. عەلەم کە باشی ئاگا لەو پێشینە مێژووییە هەبوو، هەولی دەدا تابکرێ وتوویژەکانی دەگەڵ ئەمریکا لەوبارەیەوە وەدوا بخا. بەلام باڵیۆزخانەی ئەمریکا لەسەر ئەوە مکوڕ بوو. سەرەنجام، لە ئاخروئۆخری ساڵی۱۳٤۲دا، عەلەم بڕیاری دا داخوازی ئەمریکا وەک پڕۆژەبڕیارێک دەگەڵ ئەندامانی کابینەکەی بخاتە بەرباس. لە کۆبوونەوەیەکی کابینەدا عەلەم بێ پێشەکی داوای لە عەبباسی ئارام وەزیری کاروباری دەرەوە، کرد کە لەبارەی پڕۆژەبڕیاری تازە سەبارەت بە وەزعی ڕاوێژکارە ئەمریکاییەکانەوە ڕاپۆرتێک بدا بە هەیئەتی دەولەت. موحەممەدی باهیری کە ئەوکات وەزیری دادو لە

نیزیکانی عەلەم بوو، دەڵێ بەتوندی دژی پڕۆژەکە ڕاوەستاوە. ئیددیعا دەکا کە لەباسی دژایەتیی پڕۆژەکەدا پێی لەسەر ئەوە داگرتوە کە نێوەرۆکەکەی دەگەڵ دەق و نێوەرۆکی قانوونی بنەڕەتیی ئێران ناتەبایە، و لەهەمووش خەراپتر "بۆگەنیوی کۆلۆنیالیزمـی" لێ دێ.[22] عەلەم کە دیتی هەوایەکە تووشە، دەستبەجێ باسی پڕۆژە بڕیارەکەی ڕاگرت و وتوویژو لێکۆڵینەوەی زیاتری نێوەرۆکەکەی بۆ کۆبوونەوەکانی دواتری هەیئەتی دەوڵەت هەڵگرت.[23]

کابینەی عەلەم ئیدی هیچ کاتێک پڕۆژەبڕیاری تازەی نەخستە بەرباس، بەوحاڵە، عەلەم چەند ڕۆژ پێش تەواوبوونی دەورەی سەرۆکوەزیرییەکەی پڕۆژە بڕیارێکی لەبارەی پارێزراویی حوقووقیی ئەمریکاییەکانەوە لە ئێراندا ناردە مەجلیسی تازە. ئەو لە نامەیەکدا ئیددیعای کرد کە پڕۆژە بڕیارەکە لەلایەن هەیئەتی دەوڵەتەوە پەسند کراوەو دەیەویست بە پێی قانوون، لە ڕێگای ئەم نامەیەوە بۆ پەسندکردنی یەکجاری پێشکێشی مەجلیسی بکا.[24] نامەکە ئەسەدوڵڵای عەلەم، عەبباسی ئارام و ئەسەدوڵڵای سەنیعی، وەزیری شەڕی ئەودەم، ئیمزایان کردبوو. لەبەر ئەوەی پڕۆژەبڕیارەکە پێوەندیی بە مەسەلە حوقووقییەکانەوە هەبوو، بەپێی قاعیدە دەبوو موحەممەدی باهیریش وەک وەزیری داد ئیمزای بکا. بەڵام نامەکە ئیمزای باهیریی پێوە نیە. جگەلەوە، کۆبوونەوەیەکی هەیئەتی دەوڵەت کە بەقسەی نامەی عەلەم، پڕۆژەبڕیارەکەی پەسند کردبوو، لەڕاستیدا هیچوەخت پێک نەهاتبوو.[25] بە وتەی باهیری، عەلەم، ڕێبەرە سیاسییەکەی، بۆیە ئەوکارە بەئاشکرا ناقانوونییەی کرد چوونکە "شای زۆر خۆش دەویست و دەیەویست لەو شوورەییەدا شەریکی بێ. ئەوە شا بوو کە دەیەویست بڕیارەکە حەتمەن پەسند بکرێ."[26]

دیارە عەلەم لە دواڕۆژەکانی سەرۆکوەزیریی خۆیدا نامەکەی ناردە مەجلیس. ڕەزبەری ١٣٤٣، هەردوو مەجلیسی شووراو سەنا پڕۆژەبڕیارە پێشنیارکراوەکەیان خستە بەرباس و پەسندیان کرد.

ئەودەم ئیدی مەنسوور سەرۆکوەزیر بوو. هووەیداش بێگومان بە بەنفووزترین ئەندامی کابینەی تازە دەژمێردرا. کاری دیفاع لەو پرۆژەیەو بەشداری لە کۆبوونەوەکانی هەردوو مەجلیسی شووراو سەناداو وەڵامدانەوە بە پرسیاری نوێنەرانی مەجلیس هەمووی لە ئەستۆی دەوڵەتی تازە بوو. مەجلیسی سەنا کاری لێکۆڵینەوەی پرۆژەبڕیاری تازەی لای نیوەشەوێو لە کۆتایی دانیشتنێکدا کە نیزیکەی چاردە سەعاتی کێشابوو دەست پێکرد. ئەحمەدی میرفندرسکی، یاریدەری وەزیری کاروباری دەرەوە، بە نوێنەرایەتیی دەوڵەت لە دانیشتنەکەدا ئامادە بوو. قسەکانیی بە ئاماژە بە "مەسەلەی ڕێکخراوی ناوەندیی ئامار" دەست پێکردو ئەمجار، بێ پێشەکی لێی زیاد کرد کە "بۆ پرۆژەکەی دیکەش... داوای فەورییەت دەکەم. بەڵکوو هەر ئەمشەو بابەتێک کە تەواو سادەو ئاساییە پەسند بکرێ." دوای وتوویژێکی کورت دەربارەی قبووڵی فەوریبوونی پرۆژەکە، بێئەوەی نیوەرۆکی ئەو "بابەتە تەواو سادەو ئاساییە" باس بکرێ، دەنگوەرگرتن دەست پێکرا. سەناتۆر مەسعوودی سەناتۆرەکانی دیکەی دڵنیا کردەوە کە ئێمە لە کۆمیسیۆندا تەواو لە پرۆژەکەمان کۆڵیوەتەوەو گەیشتووینە ئەو ئاکامە کە "شتێکی گرنگ نیە". پاش ئەم وتوویژە زۆرکورتە "زۆربەی سەناتۆرەکان بە نیشانەی موافەقەت هەستانە سەر پێ." تەنانەت دەنگەکانیان نەشژمارد. پرۆژەکە بەمجۆرە پەسند کرا. جەعفەری شەریف‌ئیمامی سەرۆکی کۆبوونەوەکە بوو. هەرکە پرۆژەکە پەسند کرا کۆتایی کۆبوونەوەی سەنای ڕاگەیاند.[٢٧]

چارەنووسی پرۆژەکە لە مەجلیسی شوورای میللیدا کەمێک جیاواز بوو. لەوێ، وەک لە ڕاپۆرتی نهێنیی کاربەدەستە نیزامییەکانی ئەمریکا دەردەکەوێ، "شا نیگەران بوو کە خەڵک بڵێن پرۆژەکە بێ باسو لێکدانەوەی پێویست، و بەزۆر بە مەجلیس پەسند کراوە. بۆیە بەڕواڵەت ڕێگای دا هێندێ کەس دژی پرۆژەکە بوەستنو هەرئەو دژوەستانەش بەرەبەرە لە کۆنترۆڵ دەرچوو."[٢٨] جگە لەوەی لەو ڕاپۆرتەدا هاتوە، نەخشی شا لە هاندانی نوێنەران بۆ دژوەستاندا دەتوانین لەو ڕاستییەدا

ببینین کە ئازاترین ڕەخنەگرانی پرۆژەکە دواتر بۆ پۆستی گرنگی دەوڵەتی دیاری کران.[299] زۆر لە ناحەزانی پرۆژەکە لە ڕیزەکانی حیزبی کەمایەتیی خەڵک "مردم" و دیارە لە نیزیکانی عەلەم بوون. جگەلەوە، تەنانەت بەشێک لە ئەندامانی حیزبی مەنسووریش دەنگی موخالیفیان بە پرۆژەکە دا. بە ڕواڵەت ئەم " بێدیسیپلینییە کاتییە حیزبییە" ئاکامی ئەو ڕاستییە بوو کە دەنگوەرگرتن بۆ پرۆژەکە بەنهێنی ئەنجام درا."[300] لە درێژایی وتووێژەکاندا کە جاروبار گرژییان تێدەکەوت، مەنسوور لە مەجلیس ئامادە بوو. لە وەڵامی موخالیفانی پرۆژەکەدا ئاماژەی بەو نوکتەیە دەکرد کە گەڵاڵەداڕێژی بنەڕەتیی پرۆژەکەو یەکێک لە پشتیوانە بنەڕەتییەکانیشی عەلەم بوو. جگە لەوەش، کاتێک کۆبوونەوە ئاڵۆز بوو، مەنسوور، بۆ ئارامکردنەوەی فەزاکەو بێدەنگکردنی موخالیفان، بە ئاشکراو بە ئەنقەست لە بارەی نێوەرۆکی پرۆژەکەوە درۆی دەگەڵ دەکردن. لەو بارەیەوە ئەو درۆی دەگەڵ ئەو ڕۆژنامەنووسانەش دەکرد کە لەو پێوەندییەدا پرسیاریان دەکرد. کاتێک هەواڵنووسێک لێی- پرسی کە داخوا پرۆژەبڕیارەکە تەنیا بۆ ڕاوێژکارە نیزامییەکانە-وەک ڕەسمی ئەوجۆرە ڕێککەوتنانەی نێوان ئەمریکاو هاوپەیمانەکانیەتی- یان بنەماڵەی ڕاوێژکارەکانیش دەگرێتەوە، مەنسوور کە وای دەنواند زۆر تووڕە بووە، بە ڕاوێژێکی ڕەخنەگرانەو هەقبەدەست، پێی داگرت کە ئەم دەنگۆیانە هەموو کاری قینلەزگانو "تابووری پێنجەمی بێگانان"ن. هەرلەوکاتەدا لێی زیاد کرد کە "ڕاوێژکارانی ناتەکنیکییش وەبەر ئەو پارێزراوییە ناکەونو لەهەمووی گرنگتر ئەوەیە کە، ئەوپارێزراوییە تەنیا بۆ ئەو کارانەیە کە لە سەعاتەکانی کاری ئیداریدا ئەنجامی دەدەن."[310]

دیارە ئەگەر ئەم ئیددیعایانەی مەنسوور ڕاست بووایەن، قسەکەی دیکەشی ڕاست دەبوو کە پرۆژەبڕیارە پێشنیارکراوەکە ڕاست وەک ئەو قەراردادانەیە کە ئەمریکا دەگەڵ هەموو هاوپەیمانەکانیدا دەیانبەستێ. بەڵام لەڕاستیدا هیچکام لە ئیددیعاکانی ڕاست نەبوونو ئەو بۆخۆشی دەیزانی ناڕاستن. دەیەویست بە درۆیەکی مەسڵەحەتی وەزعی ئاڵۆزی

مـــەجلیس‌و وڵات ئـــارام کاتـــەوە. کـــەچی درۆ مەســـڵەحەتییەکانی، باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە ئێرانیان تەواو نیگەران کرد. لـەوە دەترسـان کـە دەوڵەتی ئێران نەزەری خـۆی لـەبارەی پرۆژەکەوە گـۆڕیبێ. بەڕواڵـەت باوەڕیان نەدەکرد کە سەرۆکوەزیری وڵات ئاوا بێ‌پەروا درۆ دەگەڵ مـەجلیس‌و خـەڵک بکـا. مەسـەلەکەیان لـە ڕێگـای ڕەسـمییەوە دەگـەڵ دەوڵـەتی ئێـران هێنایـە گـۆڕێ‌و ناسـری یەگانـە، کـە ئـەودەم وەزیـری ڕاوێژکار بوو، لە وەڵامدا لەلایەن دەوڵەتی مەنسوورەوە ڕای‌گەیاند کە، "دەوڵەت لەبارەی نێوەرۆکی پرۆژەکەوە هیچ شک‌و گومانێکی نیە، بەڵام سەرۆکوەزیر، بە هێندێک هۆی سیاسی، بە پێویستی زانی لە قسەکانیدا وا نیشان بدا کە ئەڵقەی پارێزراوییەکە بەرتەسکە."[٢٤٠]

نۆی خەزەڵوەر، مەنسوور هێندێ قسـەی لە مەجلیسـی سـەنا کـردن کە لـە چاپەمەنیدا بـە "وتـارێکی گشـتگیر لـە بـواری ئەسڵەکانی سیاسـەتی دەرەوەدا" دانـران. دووبـارە ئامـاژەی بـە پرۆژەبڕیـاری پێوەندیـدار بـە ڕاوێژکـارانی ئـەمریکایی کـردو جـارێکی دیکـە هێنـدێ درۆودەلەســەی لەبارەی نێوەرۆکی پرۆژە بڕیارەکەو بەربڵاویی قەراردادەکەوە تەحویلی سـەناتۆرەکان دا. باڵیۆزخانـەی ئـەمریکا دیسـان نیگـەران بـۆوە. ئـەمجارە ڕقی لە بەقەولی خۆی، "بێ‌کیفایەتیی دەوڵەتی ئێران" هەستابوو. دەیگوت کاربەدەسـتانی ئێران، "دەیانـەوێ بەڕواڵـەت بـەفێڵ‌وتەڵەکەی جۆراوجۆر قسـەی خۆیـان وەرگرنـەوە." ڕاکویل دەسبەجێ داوای"دیدارێکی بەپەلـە" دەگەڵ سەرۆکوەزیر، خۆی کرد. لەماوەی ئەم دیدارەدا، ڕاکویل باسـی یـەک‌بەیـەکی ئـەو شـتانەی کـرد کـە لـە قسـەکانی مەنسووردا هـاتبوون‌و دەگەڵ دەقی پەیمانەکە ناتـەبا بـوون، و لـەبارەی هـەر کامێکیانـەوە، داوای ڕوونکردنەوەی لە سـەرۆکوەزیر کـرد. ڕاکویل لـە ڕاپـۆرتی خۆیدا دەڵێ مەنسوور لە تەواوی بوارەکاندا "پاشەکشەی کردو چەقی. هـەموو جارێ پێی داگرت کە دەقی پەیمانامەکە جێبەجێ دەکرێ نەک قسـە ناوردەکـانی وی لـە چاپەمـەنی‌و مەجلیسـدا. لـە ڕاوێـژی پرتـەوس‌و پـلاری ڕاپـۆرتی ڕاکویـل بەئاشـکرا دەردەکـەوت کـە باڵیۆزخانـەی ئـەمریکا لـە فرت‌وفێڵـی فریودەرانەی مەنسوور نارەحەت‌و ناڕازییە.

ڕاکویل کە لە نێوان قسەکانی مەنسوور لە سەناو ئەوەی لە نهێنیدا دەیگوت، ناتەبایی دەدی، دوایە لە سەرۆکوەزیری پرسی کە داخوا "هەوڵ دەدا ئەو لێکحاڵینەبوونەی لەو بارەیەوە بۆ بیروڕای گشتی پێکهاتوە لەنێو بەرێ؟" وەڵامی مەنسوور هەژێنەرو نیشانەی بێ-ئەخلاقیی سەرسوڕهێنی ئەو بوو. گوتی: "بەهیچ جۆر، ئیدی نابێ لەو پێوەندییەدا قسەیەک بکرێ.. دەیگوت دەکرێ هەموو ناکۆکییەکان لە ڕێگای ڕاستکردنەوەی خودی دۆسیەکەوە چارەسەر بکرێن."[230] دیارە دەوڵەتی ئەمریکاش بەو ڕێگاچارەسەرە ڕازی بوو. هەوڵی نەدا مەنسوور ناچار بکا لەوبارەیەوە ڕاستی بڵێ. ڕاکویل لە وەڵامی پرسیاری مندا لەوبارەیەوە دەیگوت ئەوە ئەرکی من نەبوو کە ڕەفتاری وی ڕاست بکەمەوە. جگەلەوەش، ئەو جۆرە بۆچوونە بەشێک لە شێوەی کاری وی بوو."[240]

نەخشی هووەیدا لەوداستانەدا زۆر ڕوون نیە. بەڵام بەو پێوەندییە نیزیکە کە دەگەڵ مەنسووری هەبوو بەدوور دەزانرێ کە لەمەشدا نەخشی نەبووبێ. درۆیەکانی مەنسوور کاری خۆیان کردو کۆبوونەوە، پرۆژە پێشنیارکراوەکەی پەسند کرد. حەفتاوچوار کەس دەنگی موافیق-و شەستوهەشت کەس دەنگی مومتەنیعیان پێدا.[35] پەسندکرانی پرۆژەکە زیاتر لە هەر شتێک خزمەتی موخالیفانی ڕێژیمی کرد. لەونێوەدا کەس بەقەدەر ئایەتوڵڵا خومەینی بەهرەی سیاسیی لە دژایەتیی بێ-پەروای خۆی نەبرد. لە وتارێکی بەناوبانگدا گوتی، ئەم دەوڵەتە بەوکارەی خۆی خەڵکی ئێرانی تەنانەت لە سەگێکی ئەمریکاییش کەم-بایەختر کردوە."[36] هەرلەوکاتەدا دەوڵەتی ئینگلستانیش دەگەڵ ناحەزانی پرۆژەکە کەوت. کاتێک لە خەزەڵوەری١٣٤٣دا، ڕادیۆی بی.بی.سی، ئایەتوڵڵا خومەینیی بە"ڕێبەری شیعەکانی جیهان" ناو برد، شا دەسبەجێ گەیشتە ئەو ئاکامە کە، "ئینگلیسییەکان دەیانەوێ چەت دەکاری پرۆژە بڕیارەکە بخەن."[370] مەنسوورو هووەیدا هەردووکیان لەو داستانەدا نرخێکی قورسیان دا. دیارە هووەیدا نەخشێکی ڕاستەوخۆی لە کاری

پەسندکرانی پرۆژەکەدا نەبوو، بەلام قانوونی بنەڕەتیی ئێران لە بەرامبەر هەموو بڕیارەکانی دەولەتدا بەرپرسایەتیی هاوبەش بۆ وەزیرەکان دادەنێ. لە دادگای ئیسلامیی هووەیدادا، مەسەلەی پرۆژەی پاریزراویی ڕاوێژکارانی ئەمریکایی نەخشێکی گرنگی یاری کرد.

تەنانەت دەولەتی ئەمریکاش لەوکاتەدا دەیەویست پرۆژەکە بە کەم-بایەخ نیشان بدا. ئیددیعای دەکرد کە نێوەرۆکەکەی دەگەل قەراردادی دیکەی لەو چەشنە کە دەگەل هاوپەیمانانی ناتۆ ئیمزای کردوون جیاوازییەکی نیە. بەلام دەزانین کە ئەم ئیددیعایەش، وەک ئیددیعاکانی مەنسوور بێبناخە بوو. بەهەرحال، سالی١٣٤٣(١٩٦٤)، مەنسوورو هووەیدا هەردووکیان وەها مەستی بادەی سەرکەوتن بوون کە بیرکردنەوە لە ئاکامەکانی ئەو پرۆژەیە هەر بەمێشکیاندا نەدەهات. کابینەکەی مەنسوور هەرنەبێ لەبارێکەوە لە هەموو کابینەکانی پێشتر جیا بوو. نێونجیی تەمەنی ئەندامەکانی لە هی کابینەکانی پێشوو لاوتر بوو. جگەلەوە، زۆربەی وەزیرەکان تەکنۆکراتی دەرس‌خوێندووی دەرەوە بوون. هەروەک شا بە یەکێک لە کاربەدەستە ئەمریکاییەکانی گوتبوو، نۆرەی وەچەیەکی نوێ لە سیاسەتمەدارانی تازەپێگەیشتوو بوو. کۆنەکان زۆرتر نەجیب‌زادە بوون. زمان‌و فەرهەنگی ئێرانیان باش دەناسی. سەربەخۆیی نەزەردانیان هەبووو بەدەگمەن بە داردەستی شا دەژمێردران. بێجگە لەوەش، زۆریان شایان لەوپەڕی بێدەسەلاتیدا دیتبوو. بەلام سەردەمی دەسەلاتی کۆنەکان بەسەر چووبووو جێگاکانیان دەدران بەو بژاردە تەکنۆکراتە تازانە کە شایان هەر لە لووتکەی شان‌وشکۆدا دیتبوو. کابینەکەی مەنسوور نوێنگەی بەرچاوی ئەم جێگۆڕکەیە بوو.

دیارە دژکردەوەی ئەو وەچە کۆنە بەرامبەر بەو جێگۆڕکەیە جیاواز بوو. هێندێک بە ئاسانی ملیان پێ‌داو هێندێکی دیکە زۆری پێ تێک‌چوون. ئینتیزام نموونەی بەرچاوی دەستەی یەکەم بوو. خۆی گۆشەنشین کردو دوای ئەوە زۆرتری وەختی خۆی سەرفی خوێندنەوە دەکرد. زۆرتری ڕۆژەکان بۆ نیوڕۆژخواردن دەچووە کلووبی

فەڕانسەییەکان لە تاران و حەوتووی ڕۆژێکیش دۆستە دەرویشەکانی دەهاتنە سەردانی. هێندێجار هووەیداش لەم کۆبوونەوانەدا بەشدار دەبوو.[28] لە بەرامبەردا، هێندێکی دیکە، وەک سەید فەخرەددینی شادمان، بە شێوەی ناڕاستەوخۆو بە ئاماژە هێرشیان دەکردە سەر بژاردە تازە پێگەیشتووەکان. ئەزموونی شادمان هەرنەبێ لە بارێکەوە، تاقانە بوو. لەحاڵێکدا ڕۆژبەڕۆژ بۆخۆی پتر لەبرەو دەکەوت، لە بەرامبەردا، سەیدزیای برای کە لە دامەزرێنەرانی "کۆمەڵی پێشکەوتنخواز" بوو، هەردەهات و بەدەسەڵاتتر دەبوو* سەید فەخرەددین ساڵی ١٣٤٤ لە وتارێکدا نووسیبووی: "خوایە، دەتوانم بە کێ بڵێم کە لەم وڵاتەدا، ئەوەی بێبەشترە، پتر ئاشقی ئێران و فەرهەنگی ئێرانەو ئەوەی بەشی لە نیعمەتەکانی ئێران زیاترە، لەو دووانە بێگانەترە. خوایە چ بووە کە زۆربەی بژاردەکانمانی وا پەرێشانبیرو نادڵنیاو بێموبالات کردوە کە ئەوەی دەبێ لێی بترسن هیچ لێی ناترسن و لە چاولێکەری بەولاوە، ئەویش چاولێکەرییەکی ناتەواو لە بێگانە کارێک ناکەن. بەو گرووپە بێ-خەبەرە کە لە دەریای "فسق و فجور"دا نوقمن، هیچ ئومێدێک بە دروستکردنەوەی ئێران نیە."[290] ئەگەرچی سەید فەخرەددینی شادمان نائومێدو دڵشکاو بوو، هەواڵنووسی ڕۆژنامەی نیویۆرکتایمز، جەی والز**، بەزمانێکی پڕشۆرو گەشبینانەوە باسی دیاریکردنی مەنسووری دەکرد . لەبارەی یەکەمین ڕۆژانی حکوومەتەکەیەوە نووسیبووی: "تاران ژیانێکی تازەی دەست کەوتوە... جگە لە بای بەهار کە لە دەشتەکان هەڵیکردوە، شتێکی تازەی دیکەش لە فەزادا هەیە...لەماوەی چوار حەوتوودا حەسەنعەلیی مەنسوور باوەڕبەخۆبوونی داوەتەوە بە کۆمەڵێکی یەکجار دڵمردوو... دووڕۆژ دوای دیاریکرانی لە حەوتی مارسدا، کابینەی ئاغای مەنسوور کە لە ڕووناکبیران پێک هاتوە، بە تێکڕای دەنگ لەلایەن مەجلیسەوە پەسند کرا. هەر ئەو ڕووناکبیرانە

---

* خەراپ نیە بگوترێ کە برایانی شادمان خاڵی من بوون.

** Jay Walz.

پێشتر پرۆژەیەكی شەست لاپەڕەیی‌یان بۆ دەوڵەت ئامادە كردبوو. بۆ یەكەمجارلە مێژووی ئێراندا، دەوڵەتێك هاتۆتە سەر كار كە لە حیزبێكی سیاسییەوە هاتووەو خاوەنی بەرنامەیەكی وردە."[40]

یەكێك لە ئامانجە گرنگەكانی مەنسوور، لەچەند حەوتووی پێش دیاریكرانی بۆ پۆستی سەرۆكوەزیریدا، پێكهێنانی هاوپەیمانییەك هەرنەبێ دەگەڵ بەشێك لە مۆرەكانی بەرەی نیشتمانی بوو. بەرەی نیشتمانی كە دوای كۆدیتای ٢٨ی گەلاوێژ لە سیاسەتی ئێران كەوتبووە پەراوێز، لە سەرەتای دەیەی چلدا چالاكیی خۆی دەست پێكردەوە. وەچەیەكی لاو لە تێكۆشەرانی سیاسی، كە بەنی‌سەدریش یەكێكیان بوو، چوونە نێو ڕیزە تازەكانی بەرەی نیشتمانییەوەو برەوێكی تازەیان پێ-بەخشی. لە وتووێژەكانی مەنسوور دەگەڵ بەرەی نیشتمانیدا، هووەیدا نەخشێكی چالاكی لە ئەستۆ بوو. ژمارەیەك لە ڕێبەرانی بەرە، یەك لەوان دوكتۆر غولامحوسێنی موسەددیق بە دۆستی وی دەژمێردران. بە دەست‌پێشخەریی مەنسوورو هووەیدا، ڕاسپاردەی سەرەكیی ئەو وتووێژانە موحسینی خواجەنووری بوو كە هەم ئەندامێكی "كۆمەڵی پێشكەوتنخواز" بوو، هەم بە دۆستی بەرەی نیشتمانی دەژمێردرا. لەلایەن بەرەوەش، نەخشی سەرەكی لە وتوێژدا بە شاپووری بەختیار بوو. ئەو بەڵگەنامانەی لە دەستدان بەئاشكرا نیشان دەدەن كە بەختیار موافیقی بەشداری لە دەوڵەتێكی ئیئتیلافیدا بووە،[41] لەحاڵێكدا ڕێبەرانی دیكەی بەرەی نیشتمانی دژی بەشداری لە هەرجۆرە ئیئتیلافێكدا بوون. عەلیی ئەمینییش كە هێشتا لە وەرگرتنەوەی پۆستی سەرۆكوەزیری تەمابڕاو نەببوو، بەنۆرەی خۆی هەوڵی دەدا ڕێبەرایەتیی دەوڵەتی ئیئتیلافیی ئایندە بۆخۆی بە دەستەوە بگرێ. بەرەی نیشتمانی پێشنیارەكانی عەلیی ئەمینییشی ڕەت كردنەوە.[42] لێرەدا ناتوانین لە هێنانەگۆڕی پرسیارێك بگوزەرێین. ئەگەر ئەودەم بەرەی نیشتمانی یەكێك لەو پێشنیارانەی قبووڵ كردباو لەكابینەیەكی ئیئتیلافیدا بەشدار بووایە، ئاكامەكەی بۆ مێژووی هاوچەرخی ئێران چ دەبوو؟ دیارە دەزانین بەرە لەوسالانەدا ملی بە ئیئتیلاف نەدا. جگەلەوە،

ماوەیەک دوای ئەو وتووێژە بێئاکامە، ساواک بەشێک لە ئەندامانی بەرەی، بەهۆگەلێک کە بەڕوالەت پێوەندییان بە پێشنیاری ئیئتیلافەوە نەبوو، گرت و بەمجۆرە شانسی هەرجۆرە سازان و هاوکارییەک لەنێو چوو. بێگومان ئەوڕاستییە کە شا لە موسەددیق و دوایە لە بەرەی نیشتمانییش زۆر بێزار بوو، قەڵشتی نێوان ڕێژیمی پەهلەوی و بەرەی بەرفرەوانتر دەکرد. تەنیا لە دەروازەی شۆرشی ئیسلامیدا بوو کە شا نەزەری گۆڕی و لەڕووی داماوییەوە، خوازیاری یەکیەتی دەگەڵ بەرەی نیشتمانی بوو. دەیگوت ئایەتوڵڵا خومەینی دوژمنی هاوبەشی بەرەی نیشتمانی و پادشایەتییە. بەڵام تازە کار لەکار ترازابوو. لە هەمووی گرنگتر ئەوە بوو کە بێجگە لە دوکتۆر سەدیقی و شاپووری بەختیار، هەموو سەرانی دیکەی بەرە لەوکاتەدا هەوای شۆرش لە کەللەی دابوون. وا دیار بوو دەیانەویست بەسەرۆکایەتی دەوڵەتێکی شۆرشگێڕ جڵەوی دەسەڵات بگرنە دەست و یەکیەتی دەگەڵ شایان قبووڵ نەکرد.

دیارە کاتێک مەنسوور هاتە سەرکار، دەسبەجێ باسی ئیئتیلاف دەگەڵ بەرەی نیشتمانییش تەواو بوو. لەوڕۆژانەدا، هووەیدا زۆرتری وەختی خۆی لە وەزارەتی دارایی دەبردە سەر کە دەزگایەکی گەندەڵ و بێکیفایەت بوو و ماڵیاتوەرگرتن یەکێک لە گرنگترین ئەرکەکانی بوو. هەرلەوکاتەدا دەبێ لەبیرمان بێ کە لە پرۆژەی "سەقامگیرکردنی ئابووری"دا کە سندووقی نێونەتەوەیی دراوو هێندێک لە ڕاوێژکارە ئابوورییەکانی ئەمریکا پشتیوانییان لێدەکرد، کۆکردنەوەی ڕێکوپێکی ماڵیات نەخشێکی بنەڕەتیی هەبوو. یەکێک لە یەکەمهەنگاوەکانی هووەیدا لەوبووارەدا کامپیۆتێریکردنی زۆربەی کارەکانی وەزارەتی دارایی بوو. بە یارمەتیی جەمشیدی قەرەچەداغی، کە خوێندنی لە زانکۆی کالیفۆرنیا لە بەرکلەی تەواو کردبوو، و لەوکاتەدا لە کومپانیی (IBM) کاری دەکرد، سیستمێکی پێشکەوتووی کامپیۆتێریی لە وەزارەتی داراییدا وەڕێ خست. مەبەست لەوکارە "کۆتاییهێنان بە بێسەرەوبەرەییەکی ڕێکخراو بوو کە داورودەستە بەهێزەکان لە سێبەریدا کەموزۆر هەموو کاروباری وەزارەتخانەکەیان دەدەستی خۆیان گرتبوو."[٤٣٠]

یەکی دیکە لە ڕاسپاردەکانی "ئەڵقەی هاروارد" لە سازمانی بەرنامەدا، خڕکردنەوەی ڕەوتی دانان‌و ڕێکخستنی بوودجەی دەوڵەت بوو. هەتا ئەودەم، بەرپرسایەتیی نووسین‌و ڕێکخستن‌و چاوەدێری بەسەر جێبەجێ‌کردنی بوودجەی دەوڵەتدا لە ئەستۆی وەزارەتی دارایی بوو. لە بەرامبەردا، "اولویت"ەکانی ئەو بوودجە ساڵانەیە لەلایەن سازمانی بەرنامەوە دیاری دەکران. هەموو هەوڵەکانی پێشوو بۆ خڕکردنەوەی ئەو دوو ڕەوتە لێک‌جیایە ناکام مابوونەوە. وەزیرەکانی پێشوو هیچیان حازر نەبوون بەشێک لە دەسەڵاتی خۆیان بەوجۆرە لەدەست بدەن. بەڵام هووەیدا بەئاسانی ڕەوتی خڕکردنەوەی قبووڵ کردو لەڕاستیدا بەوکارە ڕق‌و سەرسوڕمانی زۆر لە هاوکارانی خۆی لە وەزارەتی داراییدا بزواند.[٤٩]

جگە لەوانە، بەپێی سیاسەتە ئابوورییەکانی دەوڵەت، هووەیدا پاوانی دەوڵەتی لەسەر بازاڕی قەندوشەکریش لابردو ڕێوشوێنێکی تازەی بەرەو ئاسانکردنی هێنانی چا لە دەرەوە ڕێک‌خست. زیاد لەمانە، هەرلە یەکەم ڕۆژەکانی وەزارەتەوە باسی پێویستیی نووسینەوەی قانوونە ماڵیاتییەکانی دەکرد. ئەو بەڕێوەبەریی وەزارەتی دارایی خستە بەر دەستی مودیرانی کارزان‌و بەئەزموون‌و ئەمین. فەرهەنگی میهری هەڵ-کێشا بۆ پۆستی جێگری وەزیر کە زەڕدەشتییەکی خۆشناو بووو بە وتەی باڵیۆزخانەی ئەمریکا "پیاوێکی بەتواناو بەکیفایەت‌و سەرتۆپی کارمەندانی وەزارەتی دارایی بوو کە زۆرتریان بێ‌کیفایەت بوون"[٥٠] لە-لایەکی دیکە، عەبدولمەجیدی مەجیدیی کە مودیرێکی خۆشناوو پسپۆڕی کاروباری بوودجە بووو هەروەها فەرپوخی نەجمابادیی کە لەبواری نەوتدا پسپۆڕ بوو، بۆ هاوکاری بانگهێشتن کرد. زۆری پێ‌نەچوو کە مەجیدی بوو بە یەکێک لە باوەڕپێکراوانی هووەیداو یەکێک لە وەزیرانی بەدەسەڵاتی کابینەکەی. لەوڕۆژانەدا کومپانیی نەوت هەرنەبێ بەڕواڵەت بەشێک لە وەزارەتی دارایی بووو بۆیە هووەیدا لە بەشێکی ئەو وتووێژانەدا کە دەگەڵ کۆنسێرسیۆم دەکران، نەخشێکی هەبوو، بەڕێکەوت، لەئاکامی ئەم وتووێژانەدا، نرخی نەوت‌و دەگەڵ ویش داهاتی

ئێران، زیادی کرد. بەهۆی هەموو ئەم گرفتارییە جۆراوجۆرانە، لەو ڕۆژانەدا هووەیدا سەری زۆر شلووق بوو. زۆربەی وەخت، ڕۆژێ ١٦سەعات کاری دەکرد. زۆرتر، ماندوو دەهاتە بەر چاو. هێندێک لە دۆستانی نیگەرانی بارودۆخی لەشساغیی وی بوون.[٤٦]

هووەیدا بەرەبەرە قەڵافەتێکی داتەپیوی پەیدا دەکرد. هاوینی ئەوساڵە، لە ئاکامی ڕووداوێکی ترومبێلدا، چەند ڕۆژێک لە نەخۆشخانە بوو. ڕووداوەکە لە جادەی شیمال بوو. هووەیدا، دەگەڵ لەیلاو مەنسوورو فەریدەی هاوسەری، بۆ حەسانەوە چووبوونە کەنارەکانی دەریای خەزەر. شەوێک کە تەواوی ڕۆژەکەی لە کۆشکی هاوینیی فاتمەی پەهلەویی کچی شادا خلیسکی سەر ئاویان کردبوو، بە ترومبێلە ئۆپێلەکەی لەیلا دەهاتنەوە ماڵێ. لەیلا لێی دەخوڕی. هووەیداو مەئمووری پارێزەری مەنسوور لە پێشەوە سوار ببوون. مەنسوورو فەریدەو دۆستێکیان بەناوی ڤیکتۆر خواجەنووریش لە پشتەوە دانیشتبوون. بارانێکی توند دەباریو ڕێگاش باریکو خلیسک بوو. لە پردێکی باریکترلە جادەکەش نیزیک دەبوونەوە کە لەنەکاو لۆرییەک لە ڕووبەڕوویان دەرکەوت. لەیلا سەری لێشێوا. کۆنترۆڵی ترومبێلەکەی لە دەست دەرچووو تاوێک دواتر ئۆپێلە چووکەڵەکە دەگەڵ لۆرییەک کە ڕووبەڕوویان دەهات لێکیان دا. چەند لەحزە دواتر پۆلیسو ئامبۆلانسو پزیشک گەیشتنە شوێنی ڕووداوەکە. چەندکەس لە موسافیرەکان ئازاریان دیتبوو. بڕیار درا چەندی زوویە هەموویان بە فڕۆکە ، بگەیەننە نەخۆشخانەی پارس لە تاران. ساواک نیگەرانی پیلان بوو. دەسبەجێ چەند مەئمووری بۆ لێکۆڵینەوەی ئەو لایەنە ناردە شوێنی ڕووداوەکە. سەرەنجام دەرکەوت پیلانێک لە ئارادا نەبووەو تەنیا ڕووداوێک بووە، کە لەودا سیپەلاکی لەیلاو ئەژنۆی هووەیدا ئازاریان پێگەیشتبوو. مەنسوور بێ ڕووشاڵ دەرچووبووو پارێزەرەکەشی تەنیا دەموچاوی کەمێک بریندا ببوون. پاش چەند ڕۆژ نەخۆشەکان هەموو لە نەخۆشخانە دەرچوون.

ئەو ماوەیەی هووەیدا لە نەخۆشخانەی گوزەراند، لە لایەنێکی

گرنگەوە زۆر بۆی بەسوود بوو. چەندین سەعات دەگەڵ لەیلا بووو ئەو ئەزموونە ئەوانی رموودەی یەکتر کرد. بە وتەی لەیلا: "بۆ یەکەمجار ئەوم لەجیاتی ئاغای هووەیدا، بە ئەمیر بانگ کرد."[47] هووەیدا نەکهەر رۆژانی نەخۆشخانە، بگرە لەڕاستیدا لەوە بەدوا هەموو کاتی بێکاریی خۆی دەگەڵ لەیلاو مەنسوورو فەریدەی خێزانی بەسەر دەبرد.

هەرچەند ژیانی تایبەتیی هووەیدا لەو رۆژانەدا خۆش بووو کرانەوەیەکی تێدا دەرکەوتبوو، بەڵام وەزعی لە وەزارەتی دارایی زۆر جێی رەزامەندی نەبوو. بەرنامەکانی وی "هێندێک لە کارمەندە بەرابردووەکانی وەزارەتیان تووڕە کردبوو...[چاکسازییەکەی وی] کەسبوکاری داورودەستەی جۆراوجۆری خستبۆ مەترسییەوە."[48] هەربۆیە چەند نامیلکەیەک بەدژی وی لەنێو کارمەندەکاندا بڵاو بوونەوە. دووی خەرمانانی ١٣٤٣ (١٩٦٤) مەنسوور چووە وەزارەتی داراییو "هێرشی کردە سەر ئەو کارمەندانە کە دژی هەوڵی چاکسازیی دەوڵەت بوون. بە وتەی یەکێک لە رۆژنامەکان، سەرۆکوەزیر ئەوجۆرە کارمەندانەی بە "خەراپکار"و "هەلپەرست" ناو برد."[49] حەوتوویەک دواتر، هووەیداش بەنۆرەی خۆی لە وتوویژێکی چاپەمەنیدا پێی داگرت کە: "کۆمیتەیەکی تایبەتی بۆ بەربەرەکانیی گەندەڵیو لابردنی کارمەندانی نالایق دامەزراوە... ئەو جەختی کردەوە کە چاکسازی لە وەزارەتی داراییدا درێژە دەداو بۆی گرنگ نیە چ کەسانێک دەگەڵ پڕۆژەکانی موخالیفن."[50]

پێکهێنانی ئەو کۆمیتە دیسیپلینییە تەنیا هەنگاوی دەوڵەتی مەنسوور بۆ بەربەرەکانی دەگەڵ ئەوانەی نامیلکەیان دژی هووەیدا دەرکردبوو، نەبوو. هەر لەوکاتەدا ساواکیشی هێنایە نێو مەسەلەکەوەو لەو نێوەدا هووەیدا دەگەڵ بەرپرسی لێکۆڵینەوەی ساواک ئاشنا بوو. ناوی پەرویزی سابیتی بوو. زۆری نەکێشا کە بەخێرایی پلیکانەکانی سەرکەوتنی بڕینو لەماوەی پێنج ساڵدا، سەرۆکایەتیی "ئیدارەی سێیەم"ی ساواکی کە بەرپرسی ئەمنیەتی نێوخۆ بوو، وەئەستۆ گرت. هەرلەو کاتەدا بوو بە دۆستی نیزیکو راوێژکارو باوەڕپێکراوی هووەیدا.

ساڵی ١٣٤٥ (١٩٦٦)، سابیتی لە ڕێگای بەرنامەیەکی تەلەڤیزیۆنییەوە، بوو بە کەسایەتییەکی ناودارو نەخشێکی هەرماوی لە مێشکی زۆر لە ئێرانییەکاندا بەجێ هێشت. خۆشمەجلیس بووو ئاگادار دەهاتە بەرچاوو مەسەلە ئەمنیەتییەکانی لەماوەی وتوویژدا بە وردبینیو نەزمێکی تایبەتەوە لێک دەدایەوە. وردەوردە دووراییی دەسەلاتەکەی زیادی کرد. بە ئاسانی دەتوانین بڵێین کە تاساڵی١٣٤٩(١٩٧٠)، سێبەری دەسەلاتەکەی کەوتبووە سەر هەموو مەیدانەکانی ژیانی ئێرانییان. دژبەرانی ڕێژیم ئەویان بە دوژمنی سەرەکیی خۆیان دەزانی. دەیانگوت دەزگای ئەشکەنجەو سانسۆرو داغو نیشانەی زەبروزەنگیش هەرئەو بەڕێوەی بردوە. لەبەرامبەردا لەلای سیاسەتمەدارانی ئەو سەردەمی ئێران، ئەو یەکێک لە بەدەسەلاتترین کەسایەتییەکانی وڵات بووو زۆربە لێی دەترسان. هەر لەوکاتەدا، وەرگرتنی هەموو پۆستە گرنگەکان -لە پۆستی وەزارەتەوە بگرە تا مامۆستایەتیی زانکۆو مامۆستاییو تەنانەت کارمەندیی دەوڵەت- بە وەرگرتنی مۆڵەتی ئەو ئیدارەیەوە بەند بوو کە ئەو سەرۆکایەتیی دەکرد.

باڵای بڵندو چاوەکانی کاریگەر بوونو پیاوێکی بەدیمەن بوو. کەمێک ڕەنگئەسمەر بوو. خۆی لە ڕەفتاری ناسراوی کارمەندانی ساواک، وەک دەبەرکردنی شاڵواری پۆلیئەستەرو چاکەتی چەرمی بەدەڵ، زمانی وشکو کردەوەی توندو ناشیرین دەپاراست. بە پێچەوانە، هەمیشە کۆتوشاڵواری جوانی دەبەر دەکرد، کراواتی گرانبایی دەبەستو مووەکانی هەمیشە بەوردی چاک کرابوون. ئەوانە هەموو دەستیان وێکدابوو، و دیمەنی بەڕێوەبەری کومپانییەکیان زیاتر پێ بەخشیبوو تا مەئموورێکی ساواک. پاش وتوویژە بەناوبانگەکەی ساڵی ١٣٤٥ (١٩٦٦)، هەرچی دەسەلاتی زیاتر دەبوو، دەرکەوتنی لەسەر لاپەڕەی چاپەمەنیو شاشەی تەلەڤیزیۆن کەمی دەکرد. دەتگوت بۆتە کەسایەتییەکی ڕۆمانەکانی لۆکار*. ناوێک بوو بێڕوخسارو بەسام.

---

* Lecarre.

پاش ماوەیەک لێکۆڵینەوە، سابیتی گەیشتە ئەو ئاکامە کە دەوری ۳۰کەس لە کارمەندانی ناڕازی، و هێندێ جار لابراو، نەخشی سەرەکیی نووسینو بڵاوکردنەوەی نامیلکەکانی دژ بە هووەیدایان لە ئەستۆ بووە. بەڵام لە درێژخایەندا، گرنگتر لەوە، هاوڕێیەتییەک بوو کە کەوتە نێوان هووەیداو سابیتییەوە. ڕاپۆرتێکی باڵیۆزخانەی ئەمریکا چەندوچۆنی بایەخی ئەم دۆستایەتییە باش ڕوون دەکاتەوە. دەڵێ: "لە هەڵسەگاندنی هۆیەکانی دەسەڵاتی هووەیدادا، زۆرجار ناوی پەرویزی سابیتی دێتە گۆڕێ. ئەو لە تەواوی دەورانی ژیانی [ئیداریی] هووەیدادا دۆستی نیزیکی هووەیدا بووە."[510]

دەگەڵ هێندێ کاری هەڵنەسەنگاو لە سەرەتای کاردا، زۆری پێ-نەچوو کە بەرنامەی ئابووریی مەنسوور هاتە سەربەر. لەباری سیاسییەوە، گرنگترین هەڵەی کابینەی نوێ زیادکردنی نرخی بەنزین بوو کە دەوری سێحەوتوو دوای هاتنەسەرکاری دەوڵەت جێبەجێ کرا. کۆمەڵانی خەڵک لە مەودایەکی بەریندا، کەوتنە بەربەرەکانیی ئەو نرخ-زیادکردنە لەنەکاوە. دەوڵەت جگە لە پاشەکشە چارەیەکی نەما. هەڵخلیسکانی دیکەی مەنسوور قسەیەک بوو کە ڕەزبەری۱۳٤۳ (۱۹٦٤) بەزمانیدا هات. ئەمجارە، لە وتووێژێکی چاپەمەنیدا، ئیددیعای کرد کە ئامانجی دەوڵەتەکەی "دابەشکردنی دادپەروەرانەی سامان لە کۆمەڵداو گوازتنەوەی لە دەوڵەمەندانەوە بۆ هەژارانە." دیارە ئەم قسەیە "لە چاپەمەنیی ئێراندا هەڵلاو هەنگامەیەکی زۆری نایەوە. هێندێک کەس بە چەشنێک سۆسیالیزمیان لێکدایەوە." مەنسوور ناچار بوو بەتوندی هەرجۆرە دەنگۆیەک لەبارەی نیازی دەوڵەت بۆ دابەزاندنی سیاسەتە سۆسیالیستییەکان وەدرۆ بخاتەوە. ئەو جەختی کردەوە کە لایەنگری نەخشی کەرتی تایبەتی لە ئابووریو وڵاتدایە. جگەلەوە، ڕوونی کردەوە کە ئەوقسەیە تەنیا ڕووی دە چاکسازییەک لە بوواری قانوونە ماڵیاتییەکاندا بووە. گوتی ئامانج لەو چاکسازییە شتێک نەبووە جگە لە زیادکردنی داهاتی دەوڵەت."[520]

لە ئاکامی سیاسەتەکانی دەوڵەتی تازەدا، بەرەبەرە قەیرانی ئابووریی

ساڵەکانی سەرەتای دەیەی چل دامرکا. لەلایەکی دیکە، داهاتی ئێران لە نەوتیش ڕۆژبەڕۆژ زیادی دەکرد. ئەمانە دەستیان وەدەستی یەک داو وردەوردە، متمانەبەخۆبوونی شایان زیادو زیاتر کردو ئەم بیرەیان لەودا پێکهێنا کە ڕێیەکی سەربەخۆ لە ڕۆژئاواو ئەمریکا بگرێتە پێش. ڕاپۆرتێکی ئارمەن مایەر، باڵیۆزی ئەودەمی ئەمریکا لە ئێران، چەندوچۆنی ئەو ئاڵوگۆڕە، بەتایبەتی لەبارەی پێوەندییەکانی ئێران‌و ئەمریکاوە، باش نیشان دەدا. ڕاپۆرتەکەی، ناوی "شاو ئەمریکا"یەو لەوێدا مایەر نەکهەر باسی تێفکرینی شا لەو ڕۆژگارەیدا کردوە، بەڵکوو بە وردبینییەکی شیاوی ئافەرینەوە، پێشبینیی کردوە کە لە ساڵەکانی دواتردا، هێندێ گرژی لە نێوان ئەمریکاو شادا دەردەکەون. هووەیداش لەڕاستیدا وەک سەرۆکوەزیر، کەوتە نێوجەرگەی ئەو گرژییانەوە. مایەر دەنووسێ: "شا ئەمڕۆ، ئیدی بە پێچەوانەی ساڵەکانی(١٩٤١تا١٩٤٥) لەژێر سەرپەرستیی ئەمریکادا نیە. جگەلەوەش، هیچ وەک ئەو لاوێژگە وازیوازییەی ساڵەکانی کۆتایی دەیەی ١٩٤٠ی زایینی ناچێ... ڕۆژلەڕۆژ پتر دەچێتەوە سەر بابی... سەربەخۆیی نەزەر پەیدا دەکاو بەشێوەیەکی سروشتی ملهوڕانە حکوومەت دەکا... شا دەیەوێ وڵاتەکەی هەڵوێستێکی سەربەخۆی هەبێ... ئەو باش دەزانێ کە چۆن لە داستانی ئازەربایجان‌و لە سەردەمی موسەددیقدا ئەمریکا تاج‌وتەختەکەی وی نەجات داوە... بەڵام ئەمڕۆ بەدایم تارمایی جۆراوجۆری بەمێشکدا دێن... دەتوانین بە درێژەدانی وتووێژ دەگەڵی لە بوواری چەک‌وچۆڵەدا، نفووزی خۆمان لە مەیدانە جۆراوجۆرەکانی پێوەندیی نێوانماندا بپارێزین. جگەلەوە، ئەگەر بتوانین بەشی هەرەزۆری [ئەو٢٠٠ میلیۆن دۆلارەی قەرارە ئێران بیدا بە چەک]، بەلای خۆماندا بێنین، دەتوانین کۆمەگێک بە مەسەلەی کەسریی بوودجە کە گۆیا هەروا مەسەلەیەکی گرنگی واشنگتۆنە، بکەین.. گومانم نیە کە ئیدی ناتوانین دەستوور بە شا بدەین‌و سیاسەتەکانیی بەسەردا بسەپێنین."[٥٢٠]

دوو ڕاپۆرتی دیکەی کاربەدەستە ئەمریکاییەکان لەمەش سەرسوڕهێنترن. بانەمەڕی١٣٤٣ (١٩٦٤)، ڕێکخراوی سیا، ڕاپۆرتێکی

لەسەر بارودۆخی ئێران نووسی، تێیدا هاتبوو: "دیار نیە ئاخۆ بەرنامەكانی نوێكردنەوەی ئێران بە شێوەیەكی كەموزۆر هێمنانە دەچنە پێش یان دەبێ لە دوارۆژدا چاوەڕێی شۆڕشو توندوتیژی بین. چاكسازییەكەی شا هێندێ هێزی كۆمەڵایەتیی تازەی وەڕێ خستوونو سەرەنجام هەر ئەو هێزانە، بەجۆرێک لە جۆران ئاڵوگۆڕێكی بنەڕەتی لە ئێراندا پێک دێنن."[54]

بەباوەڕی من سەرسوڕهێنترین پێشوێژی لەبارەی ئایندەی ئێرانەوە دەبێ لە ڕاپۆرتی ساڵی١٣٤٥(١٩٦٦)ی سەرۆكی دایرەی لێكۆڵینەوەو زانیاریی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریكادا ببینین. لەوێدا هاتوە كە:

لەبواری سیاسیدا، شا خاوەنملكو ڕووحانییەكانی لەخۆی دوور خستۆتەوە بێئەوەی توانیبێتی بەشی زۆری ڕووناكبیرانی چاكسازیخوازو ئەندامانی چینی نێونجی بۆلای خۆی ڕاكێشێ... تائێستا تۆگرییەكی بەهاوكاری دەگەڵ عونسورە چاكسازیخوازەكان نیشان نەداوەو بەمجۆرە خۆی لە پشتیوانیی كاریگەرترینی ئەو هێزانە كە دەتوانن ئەو چاكسازییانەی ئەو دەیەوێ جێبەجێ بكەن، بێبەش كردوە... سەرەنجام ڕۆژێک دەستەو تاقمە جۆراوجۆرەكانی دژی ڕێژیم، لەسەر ویستی هاوبەشی بەرتەسككردنەوەی دەسەڵاتی شا یەك دەگرن. ئەگەر شا نەتوانێ ئەو چاكسازییانەی دەستی پێكردوون تەواو بكا، ئەودەم دژبەرەكانی هەم دروشمی ئامادەو هەم پشتیوانیی پێویستی كۆمەڵانی خەڵكیان لە دەستدا دەبێ. پێش ئەوەی[ئێران] تووشی ئەو بنبەستە بێ، جۆرێک ڕێككەوتنو سازانی سیاسی باشتر دەبێ."[55]

لە دەیەی دواتردا، كاری سەختی وەدیهێنانی سازانێكی لەو چەشنە لەجێدا لە ئەستۆی هووەیدا بوو. لە ڕاستیدا ئایندەی ڕێژیمی پادشایەتی لە ئێران لە گرەوی سەركەوتنی هووەیدا لەو ئەركە قورسەدا بوو.

# سەرچاوەکان

1. JFK Library, "Confidential Memorandum, Iran," 3 April 1961, 3.

2. *Foreign Relations*, 1961-63, Vol. XVII (Washington, D.C. 1994), 429.

۳. استوارت راکول، گفتگو با نگارنده، ۲۳ مه ۱۹۹۹.

۴. امیر عباس هویدا، «سخن کوتاه»، کاوش، شماره ۲، دوره‌ی جدید، ۱ ـ ۲.

5. NA, "Confidential Telegram: U.S. Embassy in Tehran," 31 October 1963.

6. NA, "Confidential with Hassan Ali Mansur," 31 October 1963.

۷. برای بحثی جامع در باب تاریخچه و نتایج اصلاحات ارضی در ایران، ر.ک.:
Eric J. Hoogland, *Land and Revolution in Iran, 1960–1980* (Austin, 1982), 72.

۸. فیروز توفیق، ایران: حال و آینده، ۱۳۵۱، ص ۶۰.

9. Hoogland, *Land and Revolution*, 138.

10. Tofig, *Development in Iran*, 62.

11. Hoogland, *Land and Revolution*, 138–52.

۱۲. علم، یادداشتهای علم، جلد ۱، صص ۳۹ ـ ۳۸.

۱۳. برای دستیابی به نظر علم نسبت به دخالت امریکا، ر.ک.: علم، یادداشتهای علم، جلد ۲، ص ۶۹.

14. *Foreign Relations*, Vol. XVIII (Washington, D.C., 1995), 610–12.

15. Ibid., 602.

16. NA, "Confidential Telegram to the Secretary of State, "U.S. Embassy in Tehran, 25 October 1963.

17. Ibid., 2.

۱۸. ضیاء شادمان، گفتگو با نگارنده، مونترال، ۳۰ مه ۱۹۹۹.

۱۹. علینقی عالیخانی، مکاتبات شخصی، ۲۰ ژانویه ۲۰۰۰.

20. NA, "Confidential Cable, U.S. Embassy," Tehran, March 1964.

21. NA, "U.S. Department of Army: Confidential Message," February 1964.

۲۲. محمد باهری، گفتگو با نگارنده، واشنگتن دی سی، ۳۰ مه ۱۹۹۹.

۲۳. پیشین، ۱۵ فوریه ۱۹۹۹.

24. Letter no. 2157/229/18, dated 1342/11/25.

این نامه بر کاغذ رسمی وزارت امور خارجه نوشته شده. نسخه‌ی آن را به لطف محمد باهری دریافت کردم.

۲۵. باهری، گفتگو.

۲٦. باهری، گفتگو.

۲۷. مذاکرات مجلس سنا، جلسه‌ی ٦۷، شماره ۱۳۴۲/۵/۳/۷۲۹، صص ۲۳-۲۴. نسخه‌های این مذاکرات به لطف محمد باهری به دستم رسید.

28. NA, "Confidential Report, Department of the Army," 13 October 1964.

۲۹. باهری، گفتگو.

30. NA, "Confidential Report, Department of the Army," 13 October 1964.

31. NA, "Confidential Report, Department of the Army," 5 November 1964.

32. NA, "Confidential Report, Department of the Army," 3 November 1964.

33. U.S. Embassy in Tehran, Iran, "Telegram from the Embassy to the Department of State," in *Foreign Relations*, Vol. XXII, 109−110.

۳۴. استرارت راکول، گفتگو با نگارنده، ۹ فوریه ۲۰۰۰.

۳۵. مذاکرات مجلس شورای ملی، ۱۲ مهر ۱۳۴۳، صص ۲۸ - ۳۳. نسخه‌های این مذاکرات را محمد باهری در اختیارم نهاد.

۳٦. آیت الله خمینی، اسلام و انقلاب: نوشته‌ها و اعلامیه‌های امام خمینی، تهران.

37. NA, "Confidential Report, Department of the Army," 5 November 1964.

۳۸. نصیر عصار، گفتگو با نگارنده، واشنگتن، ۳ فوریه ۱۹۹۸.

۳۹. سیّد فخرالدین شادمان، «سیاستنامه‌ی ایران»، خواندنیها، ۲٦ تیر ۱۳۴۴.

40. Jay Walz, "New Premier Gives Iranians Fresh Confidence" in *The New York Times*, Tuesday, April 7, 1964, 4.

41. U.S. Embassy in Tehran, Iran, "Memorandum of Conversation: Dr. Hossein Mahdavi and William o. Miller," NSA, no. 503, 1.

42. Ibid.

۴۳. جمشید قره‌چه‌داغی، گفتگو با نگارنده، برکلی، ۳۰ ژوئن ۱۹۹۹.

۴۴. عبدالمجید مجیدی، مصاحبه درباره‌ی ایدئولوژی، فرایند و سیاست در برنامه‌ریزی توسعه‌ی ایران، ویرایش غلامرضا افخمی (واشنگتن دی سی ۱۹۹۹)، صص ۹۳ ـ ۲۸۸.

45. NA, "Confidential Cable: U.S. Embassy in Tehran," January 1964.

۴۶. جمشید قره‌چه داغی، گفتگو با نگارنده، برکلی، ۳۰ ژوئن ۱۹۹۹.

۴۷. لیلا امامی، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۱۲ مارس ۱۹۹۹.

48. U.S. Embassy in Tehran, Iran, "Bi-Weekly Economic Review: October 22-September 4, 1964," NSA, no. 45, 3.

49. Ibid., 2.

50. Ibid., 3.

51.U.S. Embassy in Tehran, Iran, "The Iranian One Party System," NSA, no. 975, 7.

52. U.S. Embassy in Tehran, Iran, "Quarterly Economic Summary for the Fourth Quarter: 6 March 1965," NSA, no. 67, 3.

53. U.S. Embassy in Tehran, Iran, "Shah and U.S.," NSA, no. 560, 1.

54. CIA, "National Intelligence Estimate, Iran," NSA, no. 520.

55. Director of Intelligence and Research, U.S. Department of State, "Land Reform in Iran: Implications for the Shah's 'White Revolution,'" 8 February 1965, NSA, no. 548.

# فەسڵی نۆیەم

## زستانی نەقایلییەکان

نا، شازادە هاملێت نیم! قەراریش نەبوو ئەو بم
تەنیا خزمەتکاریکم، کەسێک کە تەنیا
ئەم دیمەنە دەباتە پێشودووی دیکە وەڕێ دەخا
ئامۆژگاریی شازادە دەکا؛ بێگومان داردەستێکی سادە
شارەزاو بەپارێزو وردبین
پڕلەقسەی بەرزەفڕانە، کەمێکیش داخراو
جارجار بەڕاست جێی پێکەنین
تەنانەت هێندێ جار وەک کۆسەیەک

تی ئێس ئەلیووت، شیعری ئاشقانەی ئالفرێد پرووفراک

# زستانی نەقایلییەکان

زستانی ساڵی١٣٤٣ی تاران یەکجار سارد بوو. ڕۆژی پێنجشەممە، یەکی ڕێبەندان، بەفرو قوڕو چڵپاو شەقامەکانی شاری داگرتبوو. حەسەنعەلیی مەنسوور لە ترومبێلی تایبەتی سەرۆکوەزیر دابەزی. بەرەو دەرگای چوونەژووری مەجلیس وەڕێ کەوت. سەعات دەی بەیانی بوو. دەچووە مەجلیس تا دیفاع لە پرۆژەبڕیارێکی تازەی دەوڵەت بکا. ڕێک-کەوتننامەیەک بوو کە کومپانیی نەوت دەیەویست دەگەڵ چەند کومپانیی گەورەی ڕۆژئاوایی، وەک تاید واتێر، * ئەتلانتیک، فیلیپس، کومپانیی نیشتمانیی نەوتو گازی ئیتالیا، کومپانیی نەوتو گازی هیند، کۆمیسیۆنی گازی هیند، ڕوویاڵ داچ شێلی هولەندو کۆمەڵێک لە کومپانییە فەڕانسەییەکان ئیمزای بکا.[1] بەرلەوەی مەنسوور بتوانێ پێ بنێتە حەوشەی مەجلیس، لاوێک کە بۆسەی بۆ نابۆوە هێرشی کردە سەر. ناوی موحەممەدی بوخارایی بوو. تەمەنی حەڤدە ساڵو قوتابیی دواناوەندی بوو. "قورئانێکو وێنەیەکی [ئایەتوڵلا] ڕووحوڵلا خومەینیی لە گیرفاندا بوو."[2]

هۆی کوشتنەکە ڕوون بوو. مەنسوور سیمبولی شۆرشی سپی بوو. لەوەش گرنگتر ئەوە بوو کە لە سەردەمی حکوومەتی ویدا، دەوڵەت ئایەتوڵلا خومەینیی، پێشان بۆ تورکیەو دواتر بۆ عێراق دوور خستبۆوە. ئەوانەی لە مەنسووریان دابوو، لە دادگادا بێپەروا باسی هۆی

* Tidwater.

کوشتنەکەی‌یان دەکرد. ئیددیعایان دەکرد کە مەنسوور سزای بێ‌ڕێزی بە مەرجەعی تەقلیدی وان، ئایەتوڵڵا خومەینیی وەرگرتۆتەوە. ئەوان لەڕاستیدا لە پاشماوەکانی تاقمی فیدائیانی ئیسلام بوون کە لە ساڵی١٣٢٨تا١٣٣٢ (١٩٤٩تا١٩٥٣) دوو سەرۆکوەزیرو وەزیرێکی فەرهەنگیان کوشت‌و هێرشیان کردە سەر شاو وەزیری کاروباری دەرەوەو سەرۆکوەزیرێکی دیکەش.[3] هەرلەوکاتەدا، ئەحمەدی کیسرەوییش، کە خۆی بە دوژمنی وشکبیرکردنەوەی شیعەکان دەزانی، بە شێوەیەکی بێ‌بەزەیی‌یانە بەدەستی ئەندامانی ئەو تاقمە کوژرا.[4]

وەختێک ئایەتوڵڵا خومەینی بە دەسەڵات گەیشت، زۆر لە کەسانی دەوروبەری بە فیدائیانی ئیسلام دەرچوون. هێندێک لەوان بە سەربەرزییەوە شانازی‌یان بە نەخشی خۆیان لە کوشتنی مەنسووردا دەکرد. هاشمیی ڕەفسەنجانی ئیددیعای دەکرد کە ئەو دەمانچەیەی بۆ کوشتنی مەنسوور کەلکی لێ وەرگیراوە، ئەو پەیدای کردوە.[5] بەهەرحاڵ، لەوڕۆژە ساردە زستانییەدا، پێش ئەوەی پارێزەرانی مەنسوور ببزوون، بوخارایی پێنج فیشەکی بە مەنسوورەوە نان. لەماوەی یەک ساڵی دواتردا، دەوڵەت بوخارایی، دەگەڵ سێ هاودەستی دیکەی لە تاران گوللەباران کرد. دوو هاوکاری دیکەی بە ئیعدام مەحکووم بوون. تاوانیان هاودەستی لە کوشتنی مەنسووردا بوو. ئەوان لەبۆسەدا بوون تا ئەگەر بوخارایی لە ئەنجامدانی ئەرکەکەیدا سەرکەوتوو نەبوو، بۆخۆیان دەست‌بەکار بن‌و کاری مەنسوور یەکلا بکەنەوە. جگە لەوە، زۆری دیکەش لەو کەسانەی پێشتر لە ڕیزی لایەنگرانی فیدائیانی ئیسلامدا ببوون، گیران.[6] حاجی مەهدیی عێراقییش لەو ڕووداوەدا گیرا. دادگای یەکەم حوکمی ئیعدامی دایە. دادگای پێداچوونەوە بەڕواڵەت بە پاداشی ڕەفتاری باش لە زیندان حوکمی ئیعدامەکەی بۆ کەم کردەوەو کردیە بەندی هەتاهەتایی. چاردە ساڵی زیندان کێشاو کاتێک هەواڵنووسە فەڕانسەییەکان بۆ وتوویژ چوونە ژوورەکەی هوەیدا، حاجی مەهدیی عێراقییشیان دەگەڵ بوو. لەو ڕۆژانەدا ئیدی بۆخۆی سەرۆکی زیندان بوو.

بەڵگەی زۆر لەوکاتەدا نیشانیان دەدا کە کوشتنی مەنسوور کاری کۆڕوکۆمەڵە مەزهەبییەکانە. بەوحاڵە، زۆر لە نەیارانی ڕێژیمی شا، ئیددیعای دەوڵەتیان لەبارەی ناسنامەو بیروبۆچوونی قاتڵەکانی مەنسوورەوە قبوول نەدەکرد.[۷] نموونەی ئەو ڕاستییە دەتوانین لە بۆچوونەکانی هیدایەتوڵڵای مەتین‌دەفتەریدا ببینین. ئەو لە ڕووما ناسراوەکانی نەیاری ڕێژیمو نەوەی موسەددیق بوو. لە چاوپێکەوتنی کاربەدەستێکی باڵیۆزخانەی ئەمریکادا، گوتبووی: "دڵنیام ئەو لاوانەی مەنسووریان کوشتوە پێوەندیی‌یان بە هیچ گرووپێکی مەزهەبی یان سیاسییەوە نەبووە." هەرلەو کاتەدا پێی وابوو کە ڕێژیمی شا، "حەتمەن ئەو قەتڵە بەسەر گرووپێکدا هەر دێنێ."[۸] دەتوانین قسەکانی مەتین-دەفتەری بە نیشانەی ڕاستییەکی گرنگی مێژوویی بزانین: هێزە عورفییەکانی کۆمەڵی ئێران بە درێژایی ساڵانی حکوومەتی شا هەرگیز چەندوچۆنی دەسەڵاتی کردەیی‌و توانایی هێزە مەزهەبییەکانی کۆمەڵیان نەدەناسی. تەنانەت زۆرجار ئەوەشیان قبوول نەبوو کە ئەو هێزانە دەتوانن لە کۆمەڵێکی وەک ئێراندا ڕۆژێک دەسەڵات بەدەستەوە بگرن. ئاکامەکە ئەوە بوو کە هەرچی لایەنگرە عورفییەکانی دیموکراسی زیاتر دژی شا دەجەنگان، پتروپتر ڕێیان بۆ هاتنەسەری هێزە مەزهەبییەکان تەخت دەکرد. هەڵسەنگاندنی نادروست لە چەندوچۆنی دەسەڵاتی مەزهەب بەناچار بوو بە هۆی سەرکەوتنی مەزهەب.

بەهەرحاڵ، لەوڕۆژە پڕڕووداوەدا، بوخارایی گومانی نەبوو کە بە کوشتنی مەنسوور ئەرکی خودایی خۆی بەجێ دەگەیەنێ. دیفاعی لە دادگادا بەڵگەی ئەو ڕاستییەو نیشاندەری بیروبۆچوونی بێ‌شک‌وگومانی مەزهەبیی وی بوو. ئەو لەڕاستیدا نەی‌دەزانی پیاوێکی کوشتوە کە دژی زیندانی‌کردنی ئایەتوڵڵا خومەینی بووە. ڕۆژی دوای دیاریکرانی بە سەرۆک‌وەزیر، مەنسوور هاتە سەر ئەو باوەڕە کە ئایەتوڵڵا خومەینی ئازاد بکا. دەیگوت "دەمەوێ قەڵشتی نێوان شاو خەڵک پڕ بکەمەوە."[۹] دیارە هەوڵەکەی بەهۆی دژڕاوەستانی ساواکەوە بێ‌ئاکام مایەوە.[۱۰] لەلایەکەوە وەبیریان هێنایەوە کە شا بەهیچ جۆر پێی وا نیە لە نێوان

خۆیو خەڵکدا قەڵشتێک هەیە. گوتیان ئەگەر ببیستێتەوە کە سەرۆک-وەزیرەکەی قسەی وای بەدەمدا هاتوە بێگومان زۆر تووڕە دەبێ. جگەلەوەش، وەگوێی سەرۆکوەزیری تازەیان هەڵێنا کە لە مەسەلە ئەمنیەتییەکاندا زۆر تازەکارەو باشترە قسە لەو جۆرە مەسەلانە نەکاو ئەوانە بۆ شارەزایان بەجێ بێڵێ.[11]

کەچی حیسابی ئەو شارەزایانە هەڵە دەرچووو بەرهەمەکەی ئەوە بوو کە مەنسوور، شەلاڵی خوێنی خۆی ، بێحاڵو بێگیان، مەلاسی زەوی بوو. شۆفێرەکەی بەپەلە خستیە سەر کورسیی پشتەوەی ترومبێلو لەجیاتی ئەوەی بیباتە بەشی ئوورژانسی نیزیکترین نەخۆشخانە، بەوپەڕی خێرایی بەرەو نەخۆشخانەی پارس چوو. نەخۆشخانەی پارس تازە دەستی بەکار کردبوو. بە سەرتۆپی نەخۆشخانەکانی تاران دەژمێردرا. جگەلەوە، پاش ئەو ڕووداوە کە لە جادەی شیمال بۆیان هاتە پێشو هووەیداو لەیلا هەردووکیان برینداربوون، شۆفێری مەنسوور ئەوەندەی هاتوچووی نەخۆشخانەی پارس کردبوو کە ئەمجارەش هەروەک خووی پێگرتبێ ڕووی دەوێ کرد.[12]

دەسبەجێ مەنسووریان بردە ژووری نەشتەرگەری. سێ سەعات-ونیو لەژێر عەمەلدا بوو. پزیشکەکانی، لە بەیاننامەیەکدا ڕایانگەیاند کە: "بەشێک لە ڕیخۆڵەی چووکەی مەنسووریان هەڵگرتوەو میزڵدانیشیان عەمەل کردوە."[13] بەڵام دوای عەمەلیش خوێنڕێژیی نێوەوە درێژەی هەبوو. پێویستیی بە عەمەلێکی دیکە پەیدا کرد. لەحاڵێکدا مەنسوور دەگەڵ مەرگ دەستەویەخە بوو، شا فەرمانی بە هووەیدا دا کە بەشێوەی کاتی سەرۆکایەتیی دەوڵەت وەئەستۆ بگرێ. گرنگ بوو کە بارودۆخەکە زووتر بێتەوە حاڵی ئاسایی. دەوڵەت نەدەبوو دەستەوەستانو سەرلێشێواو دیاری بکا.هەرلەوکاتەدا، شا داوای لە هووەیدا کرد لە وەزعی مەنسوور ئاگاداری بکا. لەوساتەوە کە مەنسووریان هێنابووە نەخۆشخانە، هووەیداش شەووڕۆژ لەوێ بوو. ژوورێکی چووکەی لە تەنیشت ژووری عەمەل، کردبوو بە دەفتەری کاری خۆی. زۆری پێنەچوو کە نەخۆشخانەی پارس بوو بە ناوەندی

قورسایی سیاسەتی تاران. نەکهەر خزم‌و کەس‌وکاری مەنسوور، بەڵکوو زۆر لە سیاسەتپیشە بەناوبانگەکانی وڵات‌و ژمارەیەک لە رۆژنامەنووسە ناسراوەکانیش هەموو ساتەکانی شەووڕۆژ لە داڵان‌و ژوورەکانی نەخۆشخانەدا دەهاتن‌و دەچوون‌و چاوەڕێی خەبەر بوون.

لەو نێوەدا، هێورکردنەوەی فەریدە، هاوسەری مەنسوور، لە هەمووی دژوارتر بوو. هەواڵنووسێکی ئەمریکایی کە لەو رۆژانەدا هاتبۆ تاران، فەریدەی بە "ژنێکی جوانی ئێرانی‌و میراتگری سامانێکی یەکجار زۆر ناو بردبوو. بەڵام لە نەخۆشخانە، وەزعی میزاجیی مێردەکەی ئەوی زۆر تووڕەو تۆسن‌و بەدئەخلاق کردبوو. دەبوو دایم ئاگایان لێی بێ؛ لێکدالێکدا فەرمانی بەم‌و بەو دەدا. هەمووی تۆمەتبار دەکردن. یان دەیگوت تەنەخی‌یان لە دەرمانی مێردەکەیدا کردوە، یان پێی وابوو لە کوشتنەکەشیدا هاودەست بوون. یەکێک لە ئەرکە سەرەکی، و زۆر دژوارەکانی هووەیدا ئارامکردنەوەی فەریدە بوو.[14] هەرچەند زۆرتر لەوکارەدا ناسەرکەوتوو بوو، بەڵام سەبرو سیکەدانەیەکی بێ‌ئەندازی لەخۆی نیشان دەدا. بێ‌ڕێزییە دایمییەکانی فەریدەی قبووڵ دەکردن‌و بەرامبەریان بێدەنگ بوو. ملی بۆ ئەمرو نەهیەکانی ڕادەکێشا. بەڵام فەریدە ئارامگرتنی نەبوو. لەبەرچاوی وی هووەیداش گوناحکار بوو. کەمترین گوناحی هووەیدا ئەوە بوو کە هێشتا زیندووو ساغو سەلیمە، لە حاڵێکدا مێردە خۆشەویست‌و چل‌ودووساڵەکەی فەریدە لە سەرەمەرگدایە.[15]

مەنسوور زۆربەی وەخت بێ‌هۆش بوو. بەوحاڵە شا دووجار بە سەردانی هاتە نەخۆشخانە. دەیانگوت هەردووکجار شا زۆر خەفەتبار بوو. هەردووکجار بەرگی نەشتەرگەرانی دەبەر کردو دەمامکی نەشتەرگەریی لێ‌دا. هەردوو جارەکە مەنسوور نەی‌توانی قسە بکا. دوو گوللە لە ملی درابوون‌و ژێ‌دەنگەکانی‌یان لەبەریەک هەڵتەکاندبوو. سێ گوللەی دیکەش وەزگی کەوتبوون. پزیشکەکانی دەیانگوت ئەگەر نەش-مرێ، هیچ‌وەخت ناتوانێ قسە بکا. دەزانین کە مەنسوور بە قسەزان ناسرابوو. هەرلەو کاتەدا بەشێک لەو پزیشکانە دەیانگوت، دەگەڵ

ئەوەی حاڵی زۆر خەراپ بوو، مەنسوور هەردووکجار ئاگای لە هاتنی شا بوو. دەیانگوت وەک سوپاس ، هەرجارەی زەردەیەک لەسەر لێوەکانی نەخشا.[16]

دەوری سەعات دەی شەوی شەشی ڕێبەندان، لەنەکاو پاڵەپەستۆی خوێنی مەنسوور بەخێرایی دابەزی. دووبارە بێهۆش بۆوە. چڵک سەرانسەری لەشیی داگرتبوو. هەوڵی پزیشکان بۆ نەجاتدانی گیانی بێسوود بوو. سەعاتی یازدەو چارەگی ئەو شەوە، مەنسوور مرد. بەڕێکەوت، ڕۆژی مردنی، سێیەمین ساڵوەگەڕی شۆرشی شاو خەڵک بوو. سەیر ئەوە بوو سەرۆکوەزیرێک کە نوێنگەی ڕووحی ئەو شۆرشە بوو، لە ساڵوەگەڕی ئەو شۆرشەو بەدەستی چەند تیرۆریستی موسوڵمان کوژرا کە بە فتوا، یان هەرنەبێ بە دیفاع لە خومەینی کاریان دەکرد. ئەمڕۆ[١٩٩٩] کە بیست ساڵ لە دەستپێکردنی شۆرشی ئیسلامی تێدەپەڕێ، بەڕاستی دەتوانین ئیددیعا بکەین کە شەوی مەرگی مەنسوور، چارەنووسی ڕێژیمی پەهلەوی‌و هووەیداو شۆرشی ئیسلامییش بەشێوەیەکی بێگەڕانەوە پێکەوە گرێ دران.

چەند لەحزە دوای مەرگی مەنسوور، ئەندامانی تیمی پزیشکیی چارەسەری وی هاتنە ئەو ژوورە کە کرابووە دەفتەری کاری هووەیدا. دوکتۆر سەمیعی سەرپەرستی تیمەکە بوو. بە ڕاوێژێکی ئارام‌و پڕ لەڕێزەوە خەبەری مردنەکەی دا بە هووەیدا. گوتی چەند دەقیقە پێش، سەعاتی یازدەو چارەگی شەو، مرد. هەرچەند هووەیدا ئاگای لە شپرزەیی حاڵی مەنسوور هەبوو، ئەگەرچی بەپێی قاعیدە لەمێژ بوو دەیزانی هەرلەحزە لەوانەیە خەبەری مەرگی وی ببیسێ، بەڵام بەوحاڵە بە بیستنی ئەو خەبەرە بەئاشکرا ڕاچڵەکی. بەخۆی نەبوو دەستی کرد بەگریان. تاوێک هەروا مایەوە. ئەمجار وردەوردە دەسەڵاتی بەسەر خۆیدا پەیدا کردەوەو هاتەوە حاڵی ئاسایی. بڕیاری دا پێش هەر شتێک شا ئاگادار بکا. بەتەلەفونی تایبەتی پێوەندیی بە شاوە گرت. ئەندامانی تیمی پزیشکی هێشتا هەموویان لە ژوورەکەی بوون. وتووێژی هووەیدا دەگەڵ شا یەکجار کورت بوو. پێنج وشە زیاتری

نەگوت بە ئینگلیسی قسەی دەکرد. گوتی:"Your Majesty,`he Is dead"
ئیدی بۆهووەیدا ببووە عادەت کە زۆربەی وتوویژە نهێنیی‌و گرنگەکانی بەزمانی فەڕانسەیی یان ئینگلیسی ئەنجام دەدان. جاری وا بوو تەنانەت بۆ قسەی ئاسایی دەگەڵ هاوکارەکانیشی زمانی فەڕانسەیی بەکار دێنا. دەگەڵ ئینتیزام زۆرتر بە فەڕانسەیی قسەی دەکرد. هەرچی نامەی ئاشقانەی لەسەرەتای دەیەی چلدا بۆلەیلای نووسیوە هەمووی بە ئینگلیسی بووە.[17] گرنگترین میراتی ئەو ساڵانەی لە دوورەوڵات ژیابوو، لەلایەک ڕەوشتە ئورووپاییەکەی‌و لەلای دیکە زاڵبوونی بەسەر دوو زمانی فەڕانسەیی‌و ئینگلیسیدا بوو. هەرگیز فارسی وەک فەڕانسەیی فێر نەبوو. ڕەنگە یەکێک لە هۆیەکانی ئۆگریی شا بەویش هەر ئەمە بووبێ. شاش هەر وەک هووەیدا فرانکۆفیل بوو. فەڕانسەیی لە فارسی باشتر دەزانیی‌و قسەی پێ‌دەکرد. دەگەڵ هووەیدا زۆرتر بە فەڕانسەیی یان ئینگلیسی قسەی دەکرد. دەتگوت بەشێک لە بنەمای خۆشویستنەکەشیان هەر ئەوقسەکردن بەزمانە ئورووپاییەکانە. هەروا بزانە هەردووکیان لە وڵاتی خۆیاندا کۆچبەر بوون. پەناگەی ڕاستەقینەی هەردووکیان ئەو ئورووپایە بوو کە لە مێشکی خۆیاندا پەروەردەیان کردبوو.

هووەیدا یەکەمین کەسایەتیی بەڕاستی جیهان-وەتەنی بوو کە لە ئێراندا بە دەسەڵات گەیشت. ڕۆم‌و بەیرووتی وەک تاران‌و پاریس دەناسین‌و بە ئاسانی دەی‌توانی لە هەرکامێکیان بژی. شاش ئەگەرچی وەک هووەیدا ڕووناکبیر نەبوو، بەڵام وەک وی جیهان-وەتەن بوو. هەردووکیان دەگەڵ ناوەندی قورسایی مەزهەبیی کۆمەڵ‌و فەرهەنگی ئەو کاتی ئێران بێگانە بوون. بێ‌ئەوەی گوێ بدەنە ئەو ناوەندی قورساییە، دەستیان دایە گۆڕینی بناخە ئابوورییەکانی کۆمەڵ. وەستاکار(معمار)ی کۆمەڵایەتی بوون‌و باوەڕی بێ‌ئەملاوئەولایان بە ڕاستیی پرۆژەکانیان هەبوو. دیارە گومان نەبوو کە ڕێبەرایەتیی کارەکە سەرپاک لە دەستی شادا بوو. بەڵام بێگانەبوون، یان بێ‌موبالاتیی شاو هووەیدا بەو ناوەندی قورسایی فەرهەنگییە، ڕەوتی خێرای ئاڵوگۆڕە

ئابوورییەکان، و،لە هەمووان گرنگتر، بێئیرادەیی شا لە ساتە قەیرانییەکانداو بێمەیلیی وی بە بەشدارکردنی خەڵکی دیکە لە دەسەڵاتی سیاسیدا، هەموو دەستیان وەدەستی یەک داو ڕێگایان بۆ شۆڕش‌و ئاکامە سەرسوڕهێنە کۆمەڵایەتییەکانی خۆش کرد. بە باوەڕی من، باشترین بەڵگەی ئەو بێگانەییە ئەوە بوو کە شاو هوەیدا بەشێکی زۆر لە وتوویژە گرنگەکانی خۆیان بە فەڕانسەیی یان ئینگلیسی ئەنجام دەدان. زمان‌و دەسەڵات ئاواڵدووانەن. دەسەڵاتێک بە زمانی خەڵکی خۆی قسە نەکا، ناتوانێ تاسەر حکوومەتیان بەسەرەوە بکا.

بەهەرحاڵ، دەسبەجێ دوای وتوویژە کورتەکەی دەگەڵ شا، هوەیدا خەبەری بە پزیشکەکان دا کە بانگ کراوە بۆ کۆشکی پادشایەتی. ئەوکات شا زۆربەی وەختی خۆی لە کۆشکی مەڕمەڕو کۆشکی تایبەتیدا دەگوزەراند. هەردووکیان نیزیک ناوەندی شارو نیزیک ئەو نەخۆشخانەیە بوون کە مەنسوور دواساتەکانی ژیانی تێدا بەسەر بردبوون. هەرچی ڕەوتی نوێکردنەوەی ئابووریی کۆمەڵ زیادی کردو هەرچەندی شا پتر ڕووی کردە ملهوڕی‌و خۆبەفیرعەون‌زانین، کۆشکی پادشایەتیی خۆشی پترو پتر لە ناوەندی شار دوور خستەوە. خاکەلێوەی ١٣٤٤ (١٩٦٥) ڕۆژێک لە کۆشکی مەڕمەڕ خەریکی کار بوو کە " سەربازێکی گاردی پادشایەتی بەموسەلسەلەوە وەژوور کەوت. ئامانجی کوشتنی شا بوو."[١٨٠] بەپێی قاعیدە ئەم ڕووداوەش مەیلی شای بۆ گۆڕینی کۆشکی دانیشتنی دووچەندان کرد. ئاخرەکەشی گوازتیەوە بۆ هێندێ کۆشکی سەرەوەی تاران کە لەنێو کێوێکدا دروست کرابوون.

بەتڵێک لە شەو ڕابردبوو کە هوەیدا چووە ژوورەکەی شا لە کۆشکی مەڕمەڕ. شا بەئاشکرا ناڕەحەت‌و تووڕە بوو. لەپەستا لەنێو ژوورەکەدا هاتوچووی دەکرد. ئۆقرەی نەدەگرت. هوەیدا هەروەک ڕەسمی شەرەفمەندبوونە، دەستی شای ماچ کرد. دوایە سەرەخۆشیی مەرگی سەرۆک‌وەزیری لێکرد. شا لە حاڵێکدا هەروا ڕاوێچکەی دەکردن بە هوەیدای گوت کە ئەوی بۆ دامەزراندنی کابینە هەڵ-بژاردوە. هوەیدا دواتر بە دۆستانی خۆی گوتبوو کە ڕاوێژی شا

دوودڵی‌و سەربزێویی هەڵنەدەگرت‌و وەک حوکمێکی کۆتایی دەچوو کە دەبوو جێبەجێ بکرێ.[19] دیارە نەیارانی هوەیدا دەڵێن کە ئەو، هەر لەو کاتەوە کە تەقە لە مەنسوور کرا، لە هیچ هەوڵێک بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆکوەزیری خۆی نەپاراست. لە بەرامبەردا هوەیدا دەیگوت هەرچەند پێی وا بووە دوای مەرگی مەنسوور، شا کاری پێک-هێنانی کابینە بەو دەسپێرێ، بەوحاڵە، بە بیستنی فەرمانی شا لەرزیوەو تێکچووە. جگەلەوە، دەیگوت هێشتا ڕێوشوێنی قسەکردن دەگەڵ شا بە باشی فێر نەببوو. ماوەیەک بەر لەو دیدارە، یەکێک لە دۆستانی لە بارەی چەندوچۆنی شەرەفمەندبوونەوە* هێندێ پرسیاری لێ‌کردبوو‌و بۆی ڕوون کردبۆوە کە لەحوزووری شادا، خۆی تەنیا بە "نۆکەر"[20] دەتوانێ ناو بەرێ. دیارە دوایە ڕێوشوێنی شەرەفمەندبوونی وەک ئاو لەبەر کردبوو. دەی‌زانی کە لە حوزووری شادا ناوی هیچکەس لە ناوو شۆرەتی ڕووت بەولاوە بە هیچ ناوێک نابێ ببرێ‌و ناکرێ وشەی ئاغا یان خانم بۆ هیچکەس بەکار بهێنرێ. هەرچەند ئەو ڕێوشوێنە کەمێک سەیر دەهاتە بەرچاو، بەڵام بە بەراورد دەگەڵ ڕێوشوێنی دەورانی ڕەزاشا هەنگاوێک بەرەوپێش بوو. ئەودەم، ڕەزاشا وەزیرەکانی تەنیا بە پۆستەکانیان ناو دەبردو بۆ نموونە دەیگوت "دارایی! بڵێ"[21].

ڕەفتاری هوەیدا لە شەرەفمەندبوونی شەوی مەرگی مەنسووردا بە چاکی نیشانی دەدا کە هێشتا لە داب‌وشوێنی دەرباردا زۆر تازەکارە. وەختێک دەستی بە قسە کرد، شا هێشتا خەریکی پیاسە بوو. هوەیدا پێش هەموو شتێک سوپاسی لوتفی شاهانەی کرد، شوکرانەبژێر بوو کە

---

* ڕەنگە بکرێ بڵێین وشەی "شەرەفمەندبوون" لە هەموو ناوو مانایەکی دیکە زیاتر، نێوەرۆکی لووتبەرزیی پادشاکان لە ئێراندا نیشان دەدا. هەروا بزانە شا، بۆخۆی، نوێنگەو سەرچاوەی شەرەف‌و هەرچاوپێکەوتنی بەسە بۆنەوەی یەکێک شەرەف پەیدا بکا. دیارە دەزانین کە وشەی شەرەفمەندبوون دوایە کەوتۆتە نێو زمانی ڕۆژانەشەوەو لەوێدا بۆ چاوپێکەوتنی هەر کەسایەتییەکی بەڕێزو بەدەسەڵات یان بەتەمەن بەکار دەبرێ.

شانسی خزمەتکاریی ئەعلاحەزرەتی دەست دەکەوێ. ئەمجار بە زمانێکی زۆر بەپارێزەوە، گوتی کە خۆی بە شیاوی ئەوکارە نازانێ. گوتی خەڵکی دیکە، یەک لەوان ئینتیزام بێگومان لە من زیاتر شیاوی سەرۆکوەزیرین."[22] ڕاست ڕۆژی پێش ئەم دیدارە، هووەیدا دەگەڵ سادقی چووبەک لە بارەی ئامادەنەبوونی بۆ پۆستی سەرۆک-وەزیرییەوە قسەی کردبوو. چووبەکیش بە ڕاشکاویو بێ پێچوپەنا پێی‌گوتبوو دەبێ لە قبووڵکردنی ئەوپۆستە خۆ ببوێرێ. پێی‌گوتبوو: "لەم هەلومەرجەدا کارێکی لەدەست نایە."[23] هووەیدا ئامۆژگاریی دۆستەکەی پشت گوێ خست. هەرچەند ئامادە بوو جڵەوی دەوڵەت بە دەستەوە بگرێ، بەوحاڵە بە شای گوت کە بەشی هەرەزۆری تەمەنی لە دەرەوەی وڵات گوزەراندوە. گوتی نە ئەمن خەڵکی ئێران باش دەناسم، نە ئەوان من. تەنانەت ئاماژەی بەوەش کرد کە فارسی بە لەهجەوە قسە دەکا.[24] لەهجەیەکی سەیری هەبوو: بندەنگێکی عەرەبیی دەگەڵ زرینگەی پێکهاتەو ئاوازەکانی فەڕانسەیی تێکەڵ دەکرد.

دیار نیە هووەیدا ئەم قسانەی چەندە بەڕاستی بوون یان چەند لەبەر ئەوە بوون کە دۆستە نیزیکەکەی، مەنسوور ، تازە مردبوو. ڕەنگە بکرێ ئەم قسانە بە نیشانەی لێوەشاوەییو زیرەکیی سیاسیی وی بزانین. هەروەک بە سروشتی یان بەزیرەکی تێگەیشتبێ کە شا ئیدی سەرۆکوەزیرێکی دەسەڵاتخوازی پێ قبووڵ ناکرێ. لەوانەشە ئەوەی وەک ڕەخنە لەسەر خۆی گوتبووی بە ڕاستی بووبێ، نەکهەر بۆ ڕێزگرتن لە شا. دوو حەوتوو بەر لە هێرش بۆ سەر مەنسوور، هووەیدا بە عەبدولمەجیدی مەجیدیی گوتبوو کە دەیەوێ لە وەزارەتی داراییی بکشێتەوە.[25] تەنانەت هێندێ گۆڤاری حەوتووانەی تارانیش خەبەریان دابوو کە هووەیدا بەزوویی لە پۆستی وەزارەت دەکشێتەوە. دەیانگوت دەبێتە باڵیۆزی ئێران لە فەڕانسە.[26] جگە لەوە، ساڵی ١٣٤٤ (١٩٦٥) باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە ڕاپۆرتێکی سیاسیی خۆیدا گەیشتبۆ ئەو ئاکامە کە بێمەیلیو حەزنەکردنی هووەیدا لە پۆستی سەرۆک-

وەزیری یەکێک لە گرنگترین ئامرازەکانی دەسەڵاتی وییە. لە راپۆرتەکەدا هاتبوو کە هووەیدا دایم بە دەوروبەرەکەی دەڵێ کە ئۆگرییەکی ئەوتۆی بە پاراستنی پۆستی سەرۆکوەزیری نیەو هەر ئەو نیشاندانی بێمەیلییە، بەقسەی باڵیۆزخانە، دەسەڵاتی وی زیاد دەکرد.[47]

بەڵام وەختێک لەونیوەشەوەدا، هووەیدا، بە دەنگێکی لەرزۆک، باسی نیگەرانیو بێئەزموونیی خۆی دەگەڵ شا دەکرد، شا لەکاتێکدا پشتی لە سەرۆکوەزیرو رووی لە پەنجەرەی باغی کۆشک بوو، بەراوێژێکی لێبڕاوانەو زۆر بەکورتی گوتی: "بۆخۆمان فێرتان دەکەین."[48]

دوارۆژ نیشانی دا کە ئەم قسانەی شا هەر بۆ بەهێزکردنی ورەی هووەیدا نەبوون. لەواندا هەم جۆرێک بەرنامەی کاری ئایندە شاردراوەتەوە، هەم جۆرێک پێشوێژی. لە راستیدا دەکرێ بڵێین لەو وتوویژە کورتەدا، رێککەوتنێکی داپۆشراوو بەئاماژە لەنێوان شاو هووەیدادا پەسند کراو ئەم خاڵە کە شا بۆخۆی چەندوچۆنی کاری سەرۆکوەزیر فێری هووەیدا دەکا بەشێکی بنەڕەتی لەو رێککەوتنە بوو. هەرلەوکاتەدا، ئاشکرایە کە ئەو رێککەوتنە، ئاکامی سیاسیی گرنگی بۆ ئایندەی ئێرانو رێژیمی پەهلەویو چارەنووسی قانوونی بنەڕەتیی ئێران تێدا بوون.

قانوونی بنەڕەتیی ئێران دەسکەوتی سەرەکیی شۆڕشی مەشرووتەی ئێران بوو. ئیلهامی لە قانوونەکانی بێلژیک وەردەگرتو بەشی زۆری دەسەڵاتی هێزی جێبەجێکردنی دەدایە سەرۆکوەزیر. توانای ملهوڕیی لە پادشا دەستاندو دەسەڵاتی شای زۆر بەرتەسک دەکردەوەو بەوردی دیاریی دەکرد. گومانی نەدەهێشتەوە کە شا دەبێ پادشایەتی بکا، نەک حکوومەت. بەڵام ساڵی ١٣٤٤ (١٩٦٥)، شا لە دواقۆناخەکانی گۆڕینی دەقو رووحی ئەم قانوونەدا بوو. دە ساڵێک دەبوو کە هەوای گۆڕینی پێوەندیی شاو سەرۆکوەزیر لە سەری دابوو. باسێکی یەکجار وردو روونی ئەم ئاڵوگۆڕانە دەتوانین لە راپۆرتی دەفتەری زانیاریو لێکۆڵینەوەکانی وەزارەتی کاروباری

دەرەوەی ئەمریکادا ببینین. ئەم ڕاپۆرتە کە ساڵی ١٣٤٤ ئامادە کرابوو تابلۆیەکی ورد لە دەسەڵاتی سەرەڕۆ لە ئێران دەخاتە بەر چاو. دەبینین کە تەنانەت لەوساڵەشدا ڕادەی دەسەڵاتی شا بەڕاستی سەرسوڕهێنەرو ترسێنەر بووە. لەو ڕاپۆرتەدا هاتوە کە:

شای ئێستا هەر شا نیە. بەکردەوە سەرۆکوەزیرو فەرماندەری گشتیی هێزە چەکدارەکانیشە. هەموو بڕیارە گرنگەکانی دەوڵەت یان بۆخۆی دەیاندا، یان دەبێ پێش جێبەجێکردن، ئەو پەسندیان بکا. هیچ دامەزراندنێکی گرنگ لە کادری بەڕێوەبەریی دەوڵەتی ئێراندا بە بێ ڕەزامەندیی وی ناکرێ. پێوەندییەکانی دەرەوەش هەرخۆی بەڕێوەیان دەبا. دانانی کادری دیپلۆماتیک هەمووی بەوە. بەرزکردنەوە پلەی سوپا لە پلەی سەروانی بەرەوسەر، تەنیا بەفەرمانی ڕاستەوخۆی ئەو ئەنجام دەدرێ. بەرنامە ئابوورییەکان... لە داوای ئیعتیباری دەرەکییەوە بگرە تا شوێنی دامەزراندنی کارخانەیەک... هەمووی بۆ بڕیاری یەکجاری دەچێتەوە لای شا. بەڕێوەبەریی زانکۆکانیش سەرەنجام لە دەستی خۆیدایە. هەر ئەویش بڕیار دەدا چ‌کەسانێک بەتاوانی گەندەڵی دادگایی دەکرێن. نوێنەرانی مەجلیس ئەو هەڵیان‌دەبژێرێ. هەر لەوکاتەدا دیاریکردنی ڕادەی ئازادیی کردەوەی ئۆپۆزیسیۆن لە مەجلیسدا لە ئەستۆی ئەوە. بڕیاری کۆتایی دەربارەی ئەو پرۆژەبڕیارانە کە دوو مەجلیس پەسندیان دەکەن بەدەست خۆیەتی. شا دڵنیایە کە لە هەلومەرجی ئێستادا، حکوومەتی تاکەکەسیی خۆی تەنیا ڕێگای فەرمانڕەوایی لە ئێراندایە.[٢٩]

دیارە دەتوانین ئیددیعا بکەین کە لە ئێران، هەر لە سەرەتای دامەزراندنی دەزگای پادشایەتییەوە، گرژی لە نێوان شاو وەزیردا دەرکەوتوە. مێژوونووسان وەزیرانی درێژایی مێژووی ئێرانیان بە دوودەستە دابەش کردوە. دەڵێن بەشێکیان تەنیا داردەستێکی دەستی شا بوون‌و کارێکیان نەبووە جگە لە بەجێ‌هێنانی فەرمانی شا. بەشێکی دیکە سەربەخۆیی کردەوەو دەسەڵاتێکی بەرچاویان هەبووە. جاری وابووە تەنانەت هەموو دەسەڵاتی وڵات جگە لە لەقەبی پادشایان

بەدەستەوە گرتوە[٢٠] * بە شۆڕشی مەشرووتە، هێندێ چەمکی تازەی وەک سەروەریی نیشتمانی، لێکجیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان، شای مەشرووتەو حکوومەتی قانوون هاتنە نێو وشە سیاسییە کانی ئێران. بەوحاڵەش گرژی لەنێوان پادشاو وەزیرەکەیدا هەروا درێژەی کێشا.

هەتا کاتی دیاریکردنی هوەیدا بۆ جێگای مەنسوور، شاش ئەزموونێکی تاڵی دەگەڵ سەرۆکوەزیرانی سەربەخۆو بەدەسەڵات هەبوو. جارێکی دیکە دەبینین کە دەفتەری زانیاریو لێکۆڵینەوەکانی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئەمریکا، بە زمانێکی ڕەوانو ورد، دیمەنێکی ئەو ئەزموونانەو ئاکامەکانیان پێشان دەدا:

لەکۆتایی شەڕی دووەمی جیهانییەوە تا ساڵی١٩٥٣ دەسەڵات [لەئێران] لە دەستی سەرۆکوەزیرانی بەتواناو کابینەکانیاندا بوو. قەواموسسەڵتەنە، ڕەزماراو موسەددیق هەرکام بەنۆرەی خۆیان نەیان-هێشت شا، نەخشێکی زاڵ لە ئێراندا وەربگرێ. بەربەرەکانیی شا دژی

* لە چیرۆکەکانی هەزارو یەک شەودا تووشی زۆر نموونەی هەردوو جۆرە وەزیرەکە دەبین. زۆربەی وەخت تەنیا پیلانی وەزیرێکی بەتوانا دەتوانێ دەگەڵ دەسەڵاتی جادوویی داستانی شەهرزاد، کە بۆخۆی دەچێتەوە سەر وەزیرێکی زاناو تێگەیشتوو،بەربەرەکانی بکا. لە شانامەدا زۆر نموونە لە وەزیری جۆراوجۆر دەبینین. هەرلەوکاتەدا،لاپەڕەکانی مێژووی ئێران پڕن لە تەرمی ئەو سەرۆکوەزیرە بەدەسەڵاتانە کە بە دەستی پادشاکان کوژراون. زۆر لەو شایانە بە کۆمەگی سیاسەتو دەوڵەتداریی ئەو وەزیرانە بناخەی دەسەڵاتی خۆیان قایم کردوەو ئەمجار بڕیاری کوشتنی ئەو وەزیرانەیان داوە. ئەو وەزیرەی تا دوێنێ پاڵپشتو ڕێنوێنو پلیکانی دەسەڵاتی شای لاوو تازە بەدەسەڵاتگەیشتوو بوو، دوای ماوەیەک دەبوو بە سەرچاوەی مەترسی بۆ شای دیکتاتۆری سبەینێ. جگەلەوە، جاری وابوو کە کوشتنی وەزیر بە نیشانەی پێگەیشتنی شا دەژمێردرا؛ نیشانی دەدا کە شا دەسەڵاتی توند دەدەستی خۆی گرتوە. گولستانی سەعدی، کە پەنجەرەیەکە بەڕووی ئەخلاقو ڕووحیەی ئێرانییەکاندا زۆرجار بەڕاشکاوی، پیاوی ئاقڵ لە نیزکیبوونەوەی شا دەترسێنێ. سەعدی دەیگوت مەترسیی ئەوکارە هەمیشە لە قازانجەکەی پترە.

ئەو وەزیرە بەدەسەلاتانە شوێنەوارێکی درێژخایەنی لەسەر ناوبراو داناو بووە هۆی ئەوە کە ئەمڕۆ بەئاسانی ئامادە نەبێ دەسەلاتێک کە بە هەوڵ و زەحمەت بەدەستی هێناوە، بداتە دەستی خەڵکی دیکە. لە ڕۆژی وەلانانی موسەددیقەوە تا ئەمڕۆ، تەنیا عەلیی ئەمینی هەوڵی داوە دەسەلاتی قانوونیی سەرۆکوەزیر زیندوو بکاتەوەو بەدەستیەوە بگرێ.

پاش سەرۆکوەزیریی سەرلەشکر زاهیدی(٥٥-١٩٥٣) شا تەنیا کەسانێکی کردوونە سەرۆکوەزیر کە وەفاداری خۆی بن. حوسێنی عەلا دەرباریەکی وەفادار بوو؛ ئیقباڵ مودیرێکی پڕکار، شەریف‌ئیمامی ئەندازیارێکی کارمەندڕەوشت و عەلەم دۆستی نیزیک و دێرینی شا بوو. مەنسووریش تەکنۆکراتێکی بەرزەفڕ بووو دوای مەرگی مەنسووریش هووەیدا هاتە سەرکار کە کارزان بوو، بەلام سەرنجڕاکێش نەبوو. ئەمانە دووخاڵی هاوبەشیان هەبوو: هەموویان گوێ‌لەمستی شا بوون و هیچ کامێکیشیان لەنێو کۆمەلانی خەڵکدا پێگەی سەربەخۆیان نەبوو. لە دواڕۆژیشدا دیارە شا کەسێک ناکاتە سەرۆکوەزیر کە لایەنگری لەنێو خەڵکدا زۆر بن.

دوو مەجلیسەکەش، وەک سەرۆکوەزیرو کابینەکەی، هەموو بەشێک لە ڕواڵەتی ئەو حکوومەتە مەشرووتەیەن کە شا بەناچاری و بەتایبەتی بۆ پتەوکردنی جێگا جیهانییەکەی وەک پادشایەکی مەشرووتە، ناچارکراوە بیانپارێزێ. لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی١٩٦٣دا شا بۆخۆی نوێنەرانی مەجلیسی شووراو سەنای هەڵبژاردن.[31]

بەمجۆرە دەبینین کە وەختێک هووەیدا قبووڵی کرد کاری سەرۆکوەزیری لە شا "فێر بێ"، لە ڕاستیدا ڕازی بوو نەخشێک بگێڕێ کە شا زۆر لەوەوپێش بۆ سەرۆکوەزیرانی لەبەر چاو گرتبوو. ئەم سەرۆکوەزیرانە هەموویان جادەیان بۆ پتەوکردنی دەسەلاتی سەرەڕۆی شا تەخت کرد. هەر لەو کاتەدا دەتوانین بڵێین کە قبووڵکردنی ئەو مەرجانە لەلایەک زامنی مانەوەی هووەیدا لە پۆستی سەرۆکوەزیریدا بوو، بەلام لەلای دیکە کۆمەگی کرد کە پۆستی

سەرۆکوەزیرییش لە جاران زیاتر ببێتە تویکڵێکی نێو بەتاڵی ئەو شتە کە قانوونی بنەڕەتی دیاریی کردبوو. لە یەکقسەدا، هووەیدا سەودایەکی وەک سەوداکەی فاوستی کرد. لە نێوان میراتی سیاسیو سەرکەوتنی خۆیدا پێوەندییەکی پێچەوانە بەرقەرار بوو. پێوانەی دووەمەکە مانەوەی لە پۆستەکەیدا بووو پێوانەی یەکەمەکە، سەرکەوتنی لە پاراستنی سەربەخۆییو ڕێزی پۆستی سەرۆکوەزیردا بوو. دیارە ڕاپۆرتی نهێنیی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئەمریکا بەچاکی نیشان دەدا کە لە زەمانی دەستپێکردنی حکوومەتی هووەیدادا، سەربەخۆییو ڕێزێکی ئەوتۆ بۆ ئەم پۆستە نەمابۆوە. هووەیدا نەکهەر ئەو ڕەوتە بەرەودوایەی ڕانەگرت ، بەڵکە وەختێک قبووڵی کرد شا سەرۆکوەزیریی "فێر بکا"، لە ڕاستیدا کۆمەگی بە لاوازتربوونی ئەو پۆستەش کرد. داخوا هووەیدا هەقی هەبوو دواتر ئیددیعا بکا کە بەرپرسایەتیی دەستتێوەردانە ناقانوونییەکانی شا لە سیاسەتدا بەو نەبوو؟ ئایا ئەوڕاستییە کە ئەو دەستتێوەردانانە پێش بەحکوومەت-گەیشتنی وی برەویان پەیدا کردبوو، بە بەڵگەی بێگوناحیی وی دەژمێردرا؟ داخۆ ئەوانەی دروستکەری سیستمێکی ناقانوونیو عەیبدار نین، بەڵام کۆمەگ بەمانەوەی دەکەن، هیچ بەرپرسایەتییەکیان بەرامبەر بە کردەوەی ئەو سیستمە نیە؟ بەڕاست دەکرێ بیر بکەینەوە کە مورشیدو مورادی هووەیدا، ئینتیزام، ئەو ئیددیعایەی دواتری هووەیدا قبووڵ بکا کە ئەو خۆی بەرپرسایەتییەکی وای نەبووەو گوناحکاری بنەڕەتی ڕێژیم یان سیستم بووە؟ ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئینتیزام خانەنشینبوونی زۆرەملیی پێ باشتر بوو لەوەی مل بۆ سەودای دەسەڵاتپەرستیی بێبڕانەوەی شا ڕاکێشێ. لە بەرامبەردا، هووەیدا هەر لە یەکەم دیداری دەگەڵ شادا، کەوتە خزمەتی ئەو سەودایەوە.

پاش تەواوبوونی شەرەفمەندبوون، هووەیدا گەڕایەوە نەخۆشخانەی پارس. بە خاترجەمی لە پلیکانەکان وەسەرکەوت. جارێکی دیکە چاوی بە تیمی پزیشکیی مەنسوور کەوت. چەندکەس لە دۆستانیشی هاتنە وێ. هووەیدا کە چوونو هاتنەوەی سەعاتێکی زیاتر

نەبردبوو، ڕووی کردە حازریان‌و گوتی: "بە فەرمانی ئەعلاحەزرەت بەرپرسایەتیی پێکهێنانی کابینە بە من سپێردراوە." هەروەها گوتی: "بە نابەدڵی ئەم ئەرکەم وەرگرت. هەوای ئەم‌کارەم لەسەردا نەبوو. جگەلەوەش، ئەوڕاستییە کە ئەو ئەرکە لەئاکامی مەرگی دۆستەکەمدا بەمن سپێردراوە کارەکەم دژوارتر دەکا."[٢٢] گوتی دەبوو ڕێز لە یادی دۆستەکەم بگرم. پێی داگرت کە فەرمانی شاش دەبێ جێبەجێ بکرێ. سوپاسی زەحمەتەکانی تیمی پزیشکیی مەنسووری کرد. دیارە پێش مردنی مەنسووریش سرت‌وخورتێکی ژەهراوی لەبارەی کاری تیمەکەوە کەوتبووە سەر زارو زمانان. هەرئەو سرت وخورتە بەرەبەرە بوو بە دەنگۆیەکی زۆر پڕهات‌وهاوارو درێژماوە.

کەمێک دوای ئەوەی مەنسووریان هێنایە نەخۆشخانە، تێگەیشتن کە حاڵی شپرزەیەو بڕیار درا چەند پزیشکی بێگانەش بێنە نێو تیمی پزیشکانی چارەسەرەوە. لە سەد ساڵ پێشترەوە، واتە لەوکاتەوە کە پادشایەکی ئێرانی بێگانەیەکی کردە پزیشکی تایبەتیی خۆی، چوون بۆ ئورووپا بۆ چارەسەر، یان هێنانی پزیشکی بێگانە بۆ ڕاوتەگبیر، ببوو بە یەکێک لە نیشانەکانی دەسەڵات‌و پۆزو دەماری چینایەتی. حاڵی شپرزەی مەنسووریش بێ‌گومان یەکێک لەو حاڵەتە ناچارییانە بوو کە لەواندا کەلک‌وەرگرتن لە پزیشکی بێگانە بە پێویست دەزانرا.

بەڵام تێبینییە سیاسیی‌و فەرهەنگییەکان کاری هەڵبژاردنی پزیشکانی کارزانی بێگانەیان دژوار دەکرد. ساڵەکانی دوای شەڕی دووەمی جیهانی، لە نێوان ئەو ئێرانییانەی لە ئورووپایان خوێندبوو و دەرچووانی زانکۆکانی ئەمریکادا، مل‌بەملەیەکی توند ساز ببوو. هیچ کامیان قەدرو ڕێزێکی وایان بۆ لایەنی بەرامبەر دانەدەنا. تیمی پزیشکیی مەنسووریش بوو بە مەیدانی ململانەی ئەو دووگرووپە. ناچار وەختێک دوکتۆر سەمیعی، سەرۆکی تیمی پزیشکی، دوو پزیشکی ئەمریکایی لە زانکۆی کەرنێل بۆ ڕاوتەگبیر بانگهێشتن کرد، پاڵەپەستۆی سیاسی بۆ بانگهێشتنی پزیشکانی ئورووپاییش پەرەی گرت‌و سەرەنجام پزیشکێکی ئینگلیسیی‌و یەکی فەڕانسەییش بانگهێشتن کران.[٢٣]

سەرەڕای ململانەی نێوان دەرچووانی ئورووپاو ئەمریکا لە ئێران، مەسەلەی گرنگتری پێوەندییەکانی ئێران‌و وڵاتانی ڕۆژئاواش کاری کردە سەر چەندوچۆنی هەڵبژاردنی پزیشکانی ڕاوێژکارو چارەسەرکەری مەنسوور. ئەگەر تیمە پزیشکییەکە تەنیا لە پزیشکانی ئەمریکایی پێکهاتبا، لەوانە بوو جیهان‌و ڕۆژئاواییەکان بەهەڵە وا بیر بکەنەوە کە ئەو پێکهاتەیە نیشانەی وەرسووڕانی ئێران لە ئینگلیستانەوە بەرەو ئەمریکایە.

بەهەرحاڵ، پێکهاتەی تازەی تیمی پزیشکی هێندێ گرژیی تازەی دروست کردن‌و پاش ماوەیەک کار گەیشتە جێگایەک کە ئەندامانی تیم ئیدی نەیان‌توانی هاوکاری بکەن. پزیشکە فەڕانسەییەکەی ئەندامی تیم بەنیشانەی ناڕەزایی تارانی بەجێ هێشت‌و لە چەند وتارێکدا کە لە گۆڤارە فەڕانسەییەکاندا چاپ کران، ئیددیعای کرد کە لەڕاستیدا مەنسوور دووجار تیرۆر کرا: جاری یەکەم بە دەستی قاتڵەکان لە شەقام، و جاری دووەم بەدەستی پزیشکان لە نەخۆشخانە.

ئیددیعاکانی پزیشکی فەڕانسەیی برەوێکی تازەی دا بەو دەنگۆیانە کە پێشتر لە تاران بڵاو ببوونەوە. لەلایەک شا لە هێندێک لیدوانی خۆیدا، بە ئاماژە، ئینگلیستانی بە هاودەستی لە تیرۆری مەنسووردا تۆمەتبار کردبوو.[٢٤] لەلایەکی دیکە هاوسەری مەنسووریش پاش مەرگی مێردەکەی گەیشتە ئەو ئاکامە کە کوژرانی مێردەکەی بە پیلانێک بووە. بۆ ماوەیەک تەنانەت پێی وابوو دەوڵەت خۆی دەستی لەو کارەدا هەبووە. کاتێک وەبیرمان بێتەوە کە فەریدە هاوسەری نیزیکترین دۆستی هووەیدا، و خوشکی ژنێک بوو کە هووەیدا حەزی لێ‌دەکرد، ئەوردەم دەتوانین تێ‌بگەین کە ئەو تۆمەتانەی فەریدە لێی دەدان چ بارێکی قورسیان دەخستە سەر شانی هووەیدا.

دیارە دەگەڵ ئەوەی قاتڵەکانی مەنسوور دانیان بە نەخشی خۆیان لەو داستانەدا نابوو، تارمایی پیلان بەدوای ئەوکارەساتەوە هەرمابوو. تیئۆریی پیلان ئاواڵدووانەی زەبروزەنگی سیاسییە. هەروەخت خەڵک نەتوانن بۆ زانینی ئاڵوگۆڕەکانی کۆمەڵ دەستیان بە هەواڵ‌و بەڵگەی

باوەڕپێکراو ڕابگا، ناچار پەنا بۆ تیئۆریی پیلان دەبەن. تەنانەت هووەیدا خۆشی پاش ماوەیەک گومانی لە دروستیی گێڕانەوەی ڕەسمیی مەرگی مەنسووردا بۆ پەیدا بوو. پێی وابوو لەوانەیە ساواک دەستێکی لەوکارەدا هەبێ. پێنج ساڵ دوای مەرگی مەنسوور، شەوێکیان لە میوانداریییەکدا، هووەیدا لەحاڵێکدا سەرخۆش دیار بوو، بەڕێکەوت دیتی نەسیری، سەرۆکی ساواک، ڕەخنە لە هێندێ سیاسەتی دەوڵەت دەگرێ. هووەیدا کە شوێنەواری ویسکی بە سەروسیماو ڕوخساری سووورداگیرساوییەوە دیار بوو، ڕووی کردە نەسیریو گوتی: "تیمسار، هەرکات نۆرەی ڕۆیشتنی ئێمە هات، بفەرموون بۆخۆمان دەڕۆین. ئەوەی دەگەڵ مەنسوورتان کرد دەگەڵمان مەکەن."[٣٥] نازانم ڕاپۆرتی ئەم داستانە قەت بە گوێی شا گەیشتەوە یان نا. بەڵام چەندساڵ دواتر، لە بەسەرهاتێکی دیکەدا، دووبارە مەسەلەی بەدگومانبوونی هووەیدا بە نەخشی ساواک لە کوشتنی مەنسووردا هاتەوە گۆڕێ، و ئەمجارە سابیتی پاش باسێکی دوورودرێژ، سەرەنجام هەرنەبێ بەڕواڵەت، هووەیدای قانیع کرد کە ساواک دەستی لە کوشتنی مەنسووردا نەبووە.[٣٦]

وا دیارە لە شەوی مەرگی مەنسووردا، پیلانی ساواک زۆری مێشکی هووەیدا بەخۆیەوە خەریک نەکردوە. پێش هەموو شتێک، زەنگی بۆ سکرتێری تایبەتیی خۆی، وەجیهەی مەعریفەت لێداو داوای لێکرد چەندی زووە کاغەزو دۆسیەکانی لە دەفتەری وەزیری دارایییەوە بەرێتە دەفتەری سەرۆکوەزیر. هەرلەوکاتەدا داوای لێکرد وەزیرەکان بۆ کۆبوونەوەی نائاسایی کابینە بانگهێشت بکا. سەعات دووو نیوی بەیانی کۆبوونەوەی نائاسایی کابینە پێکهات. یەکەمین بەندی دەستووری کاری کۆبوونەوە نووسینو پەسندکردنی بەیاننامەیەک دەربارەی مەرگی مەنسوور بوو. ئەم بەیاننامەیە دەوری سەعات سێ-ونیوی بەیانی لە ڕادیۆ بڵاو کرایەوە. لەوێدا هاتبوو کە پیلانگێڕانی خائین، لە سێیەمینساڵوەگەڕی شۆڕشی شاو خەڵکدا، یەکێک لە پشتیوانە سەرەکییەکانی ئەم شۆڕشەیان دەخوێن وەردا.[٣٧] هەواڵی

ڕێوڕەسمی یادکردنەوەی مەنسوور لە مزگەوتی سوپاسالاریش لە بەشێکی دیکەی ئەو بەیاننامەیەدا هاتبوو. سەرنجڕاکێش ئەوەیە کە مەدرەسەی (رفاه)، ئەوجێیەی هووەیدا لە یەکەمین ڕۆژەکانی شۆڕشدا لێی بەند کرابوو، هەروەها مەجلیس کە مەنسوور لەبەر دەرگاکەی تیرۆر کرا، و سەرەنجام مزگەوتی سوپاسالار کە پرسەی مەنسووری لێ دانرا هەریەکەی تەنیا چەند هەنگاوێک لێک دوور بوون.[٢٨]

ئەوشەوە مەسەلەی کفن‌ودفنی مەنسووریش مێشکی هووەیدای بەخۆوە خەریک دەکرد. کاری ڕێکخستنی ئەو ڕێوڕەسمەی بە زیای شادمان ئەسپارد کە لە یەکەمین ئەندامانی "کۆمەڵی پێشکەوتنخواز" بوو، و دەگەڵ دامەزرانی کابینەی مەنسوور کرابووە شارەداری تاران. لە هەمووی گرنگتر ئەوە بوو کە شادمان لەنێو دۆستەکانیدا بە "سەید" بەناوبانگ بوو، کوڕە مەلا بووو بۆخۆشی باوەڕێکی پتەوی بە ئیسلام هەبوو. هووەیدا هیوادار بوو بە سپاردنی کاری کفن‌ودفن‌و پرسەی مەنسوور بە سەید زیای شادمان، ڕووداوەکە لە هەرچەشنە گومان‌و هەڵخلیسکانێکی مەزهەبی بپارێزی. بەڵام لێکدانەوەکەی هووەیدا یەکسەر بەهەڵە دەرچوو.

کەمێک دوای ئەوەی پزیشکان لە نەجاتدانی گیانی مەنسوور تەمابڕاو بوون‌و هووەیدایان لە مردنی ئاگادار کردەوە، تەرمی سەرۆک-وەزیر برایە پزیشکیی قانوونی. ساواک نیگەرانی پیلانێکی بەربڵاو بوو. دەترسا ئەندامانی دیکەی کابینەش پەلامار بدرێن. تەنانەت پێی وابوو تەرمی مەنسووریش لە ئازارو پەلامار لە ئەماندا نیە. ئاکام ئەوە بوو کە هەنگاوی ئەمنیەتیی زۆر توند هاویژران. بۆ گوازتنەوەی تەرمەکە، کەلکیان لە ئامبوولانسێکی سادەی بێ ئیسکۆرت وەرگرت. شادمان‌و فەرمانبەرێکی ساواک لە پەنا شۆفێرەکە دانیشتن‌و تەرمەکە بێپارێزەر لە ژووری پشتەوەی ئامبوولانسەکە دانرا.

لە پزیشکیی قانوونی، تەرمی مەنسووریان لە کەشەوی نێوەڕاستی ساردخانە سێنهۆمییە کانزاییەکە دانا. کەشەوی سەرەوە، تەرمی پیرەپیاوێکی تێدا بوو. چەندمانگ بوو مردبوو، بەڵام وا دیار بوو لە

هیچکوێ، هیچکەس چاوەڕێی نیەو بۆ تازییەکەی دانەنیشتوە. خزمو ئاشنایەک لێی نەپرسیبۆوەو بەناچار تەرمەکە چەند مانگ هەر لەو کەشەوەدا مابۆوە. کەشەوی بنەوە هی ژنێکی خەراپە بوو. چەند شەو پێشتر بە چەقۆ کوژرابوو. بەڵگەی پێوەندیدار بەم دوو تەرمەوە لە کەشەوی نێوبەندێ هاویژرابوون. دۆسیەکانیان ناردنە ئارشیفو تەرمەکەی مەنسووریان لەوێ هاویشت.[٣٩]

ڕۆژی پێنجشەممە هەشتی ڕێبەندان، ڕێوڕەسمی پرسە لە مزگەوتی سوپاسالار دانرا. دوایە تەرمەکەیان بۆ ناشتن بردە حەوشەی گڵکۆی ڕەزاشا. ناشتنی مەنسوور لەو شوێنە، پێویستیی بە ڕەزامەندیی شا هەبوو کە وەرگیرا. چەندڕۆژ دوای ئەو ڕێوڕەسمە، دەنگۆیەک لە تاران داکەوت. دەیانگوت کاتێک تەرمی مەنسوور دەنێژرا، هووەیدا بەرگێک قورئانی لەنێو کفنەکە هاویشتوە. دەیانگوت هەموو کەس دەزانێ کە قورئان نابێ بخرێتە گۆڕەوە چوونکە گڵ پیسی دەکاو کەوایە ئەوکارەی هووەیدا حوکمی کفری هەیە. دەیانگوت هووەیدا ویستوویە بەوکارە خۆی بە دیندار بنوێنێو لەوڕێگایەوە بەهاییبوونی خۆی بشارێتەوە.

تەنیا لایەنێکی ئەو دەنگۆیە ڕاست دەرچوو. لە وێنە ڕەسمییەکانی ڕۆژنامەکانی ئەوکاتدا، بەئاشکرا دیارە کە وەختێک دەیانەویست تەرمی مەنسوور بخەنە خاکەوە، هووەیدا بە چاوی بەفرمێسکەوە بەرگێک قورئانی خستە نێو توێی کفنەکەوە. بەڵام ئەوکارە نە فکری خۆی بوو، نە حەتمەن نیشانەی ناشارەزایی لە ئەحکامی ئیسلام بوو. لە کاتی ناشتنەکەدا سەید زیائەددینی شادمان لە پەنا هووەیدا ڕاوەستابوو. ئەو بۆخۆی دەیگوت: "کە تەرمەکەیان خستە نێو گڵکۆکە، قورئانێکی چووکەڵەم پێبوو، لە گیرفانم دەرێنا. وەهووەیدام داو پێمگوت خەراپ نیە لە توێی کفنەکەی باوێی." جگەلەوە شادمان بەداووناو دەیگوت: "لە ئیسلامدا هیچ قانوونێک دژی ئەو کارە نیە." و بۆ ئیسباتی قسەکەی خۆی لێی زیاد دەکرد کە: "زۆر کفن بە چەند ئایەتی قورئان دەڕازێندرێنەوە."[٤٠]

بەهەرحاڵ، هەركە هووەیدا بوو بە سەرۆكوەزیر، كۆڕوكۆمەڵە سیاسییەكانی تارانیش یەكدەنگ بوون كە دەوڵەتەكەی كورتخایەن دەبێ. دەیانگوت ئەو سیاسەتمەدارێكی تازەكارە؛ پێگەیەكیشی لەنێو خەڵكدا نیە. دەیانگوت دانانەكەی لە ڕاستیدا ڕێزدانانێك بۆ مەنسوور بووە. هەر كە قەیرانی ئێستا بەسەر چوو، حكوومەتی هووەیداش تەواو دەبێ.

عەلیی ئەمینیش دووبارە خۆی بە كاندیدای سەرۆكوەزیری دەزانی‌و لە هەوڵی دروستكردنی "بەرەی یەككگرتوو"ی حیزبە سیاسییەكاندا بوو.[41] شا زۆر زوو ئەمینیی لە گەیشتن بە سەرۆك-وەزیری تەمابڕاو كرد.[42] ڕۆژی چواری خاكەلێوەی ساڵی دواتر، ئاماژەی بە دەورانی ئەمینی كردو گوتی: "سێ ساڵ لەمەوبەر زەبری بێوێنە لە ئابووریی ئێران درا." لە چەند مانگی هەوەڵدا گۆڤاری "خواندنیها" باسی بێتوانایی هووەیدای دەكردو بەگاڵتە دەیگوت هووەیدا بە زوویی دەبێ وەك پیرەكەی فێری دابوشوێنی دەروێشی بێ.[43] ئاماژەی بەوڕاستییە دەكرد كە ئەو تەنانەت مافی دامەزراندنی خزمەتكاری ماڵەكەی خۆشی نیە.[44] لە یەك قسەدا هەموو خاوەنئەزەرە سیاسییەكان لەسەر ئەوە یەكدەنگ بوون كە كابینەی هووەیدا تەنیا "جاش"، واتە "محلل"ێكە. خەڵك ئەم وشەیەیان وەك شۆخی بەكار دێنا. دیارە ئاماژە بە زووتێپەڕبوون- و خۆڕانەگرتنی تێدا بوو. بەڵام بەكردەوە، مێژوو زیاتر بەڕیشی ئەوكەسانە پێكەنی كە لەو ڕۆژانەدا بەم قسانەیان گاڵتەیان بە هووەیدا دەكرد. ئەو بوو بە تەمەندرێژترین حكوومەتی سەردەمی مەشرووتەی ئێران‌و لە هەمووكەس پتر لەو پۆستەدا مایەوە.

وا دیار بوو ئەو ڕۆژانە ئەستێرەی بەختی هووەیدا، هەرجۆرێك بوو، دەگەڵ مەسەلەی زەماوەند لێك گرێ درابوو. لەلایەك لە ژیانی سیاسیدا دەوڵەتەكەی بە "جاش" دەزانرا، و لەلایەكی دیكە، لە ژیانی تایبەتیی خۆیدا لەنەكاو زەماوەند لە ئاسۆ دەركەوتبوو. نێوەڕاستی پووشپەڕی ١٣٤٥ (١٩٦٦)، لەیلا دوای سەفەرێكی درێژ بۆ ئورووپا، گەڕایەوە ئێران. چەند مانگ پێشتر دەگەڵ خوشكە دڵبەغەمەكەی،

فەریدە چووبووە ئورووپا. فەریدە بە مردنی مێردەکەی زۆر شەمزاوو غەمگین بوو. گومانی نەخۆشانەی بەدڵدا دەهاتن. دەگەڵ هەمووان بە چەشنێکی لەتوانابەدەر ڕووگرژو مۆن بوو. بەڕواڵەت نەخشی بێوەژنێکی خۆڕاگری یاری دەکرد. لەوکارەدا چاوی لە ژاکلین کەنەدی دەکرد کە ئەودەم -پێش ئەوەی مێرد بە ئوناسیس بکاتەوە- ببوو بە نموونەی هەموو بێوەژنە سیاسییەکان. بەڵام لە ڕاستیدا بە مردنی مەنسوور، فەریدە بێ‌سەبرو سیکەدانەو توندەتەبیات ببوو. هەمیشە تەشەری لەم‌و لەو دەدا. هەزارویەک تیئۆریی وەک پیلانی لەسەردا بوو. لەیلا دەیگوت: "فەریدە هەرچی ویستبا، ئەمیر بەقسەی دەکرد. بەسەبرەوە هەموو سووکایەتییەکانی لێ قبووڵ دەکردو جوابی نەدەدایەوە. بە هەوڵ‌و هیممەتی ئەمیر سەرەنجام بڕیارێک لە مەجلیس پەسند کرا کە بەپێی ئەو فەریدە تا کۆتایی ژیانی، تەواوی مووچەو بەراتی سەرۆک‌وەزیرێکی وەردەگرت."[45]

مردنی مەنسوور باری دەروونیی فەریدەی شێواند. ماوەیەک چووە نێو لایەنگرانی چ. گیڤاراوە. بەینێک بوو بە هاودەمی هەمیشەیی شاپووری ڕیپۆرتێر کە بە وتەی باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە ئێران، یەکێک لە "قۆڵبڕە پلە یەکەکانی تاران" بوو. ڕیپۆرتێر نەک‌هەر یەکێک لە نۆکەرە گرنگەکانی ئینگلیس لە ئێران بوو [46] ـ و ئەم کارەشی لە بابی بۆ بەمیرات بەجێ مابوو، کە بەهۆی ئەوخزمەتانەی بە شاژنی کردبوون لەقەبی "سێر"ی وەرگرت ـ[47] بەڵکوو لە دەورەی ناوەندییشدا هاوپۆلی مەنسوور بوو. هەر ئەمەش بەس بوو بۆئەوەی فەریدە خۆشی بوێ.

بەڵام لە ئاکامدا نە ڕادیکالیزمی چ.گیڤاڕایی، نە ڕابردووی پڕنهێنیی ڕیپۆرتێر نەیان‌توانی برینی فەریدە ساڕێژ بکەنەوە. هەروەک پێشوو بەدئەخلاق‌و خەمۆک بوو. پاش ماوەیەک تەنانەت لەیلاش بەدئەخلاقییەکانیی پێ قبووڵ نەکراو گەڕایەوە ئێران.

ئەوماوەیەی لەیلا لە ئورووپا بوو، بەردەوام نامەی ئاشقانەی لە ئەمیرعەبباسی هووەیداوە بۆ دەهاتن. لەیلا دەیگوت هەموو نامەکانم سووتاندن. چوونکە بە ئینگلیسییەکی پڕلەنازو کەمێکیش سەخت‌و نامۆ

نووسرابوون."[480] دووسێ ڕۆژ دوای گەڕانەوەی بۆ تاران، لەیلا ڕۆژێک چووە سەردانی هووەیدا. بێپێشەکی گوتی: "با زەماوەند بکەین." هووەیدا سەری سوڕما، بەڵام دەسبەجێ پێشنیارەکەی قبووڵ کرد. لەیلا مکوڕ بوو کە هەرچی زووە زەماوەند بکەن. هەرلەو کاتەدا پێی دادەگرت کە، "ڕێوڕەسمێکی ڕازاوە لە گۆڕێدا نەبێ."[490] بڕیار درا حەوتووی دواتر لە ڤیلاکەی هووەیدا لە شیمال زەماوەند بکەن. لەیلا دەیگوت: "عەرزی ئەو ڤیلایە ئەمن پێم فرۆشتبوو.ماڵێکی چووکەڵەی بەشی پیاوێکی ڕەبەنی تێدا ساز کردبوو. ژوورێکی گەورەی دانیشتن، بە کوورەخانەیەکەوە، ژوورێکی چووکەڵەی خەو، حەمامێکو بەرهەیوانێکی هەبوو."[500]

وادیارە بڕیاری هووەیدا هەرنەبێ دوو هۆی هەبوون. پێش هەمووان عیشقی لەیلا بوو. ئەوی دیکەش فشاری سیاسی بوو. چەند حەوتوو دوای دیاریکرانی بە سەرۆکوەزیر، سەناتۆر مەتین‌دەفتەری، لە کۆبوونەوەیەکی سەنادا گوتبووی کە سەرۆکوەزیرو ئەندامانی دیکەی کابینە دەبێ ژن بێنن. دەیگوت لەو ڕێگایەوە چەندوچۆنی موخاریجی بنەماڵەیەکی ئێرانی تێ‌دەگەن. جگەلەوە، ئەو ڕۆژە کە هووەیدا کرا بە وەزیری دارایی، لە ڕێوڕەسمی ناساندنی بە هەیئەتی دەوڵەتدا شاش پێی گوتبوو کە: "دەبێ ژن بێنێ."[510]

ڕاست حەوتوویەک دوای سەردانی لەیلا لە هووەیدا، ئەم‌دووانە ڕۆژی٢٩ی پووشپەڕی ١٣٤٥ (١٩٦٦) لە ڕێوڕەسمێکی سادەدا زەماوەندیان کرد. شاو شاژن، دایکوبابی لەیلا، دایکی هووەیدا، دوکتۆر مەنووچیهری شاهقولی، دۆستی هووەیداو هاوسەرەکەی تەنیا میوانانی ئامادەی ئەو زەماوەندە بوون. فەرەیدوونی هووەیدا ئەوکاتە لە ئورووپا بوو و دۆستەکانی دیکەی هووەیداش هیچیان بانگهێشتن نەکران چوونکە لەیلا ڕێوڕەسمێکی زۆر سادەی ویستبوو. بۆ مارەکردن ئاخوندێکی ناوچەیان هێنابوو. پێشتر سەروکاری هەر دەگەڵ خەڵکی لادێ ببوو. بە بڕوونی شاو شاژن بەجۆرێک سەری لێ شێوابوو کە وەختێ مارەکردنەکە هەموو گیانی دەلەرزی.

دەزانین کە لە ئێران وا باو بوو (ئێستاش باوە) کە لە وەختی مارەکردندا مەلا سێ جار لە ژن دەپرسێ داخوا حازرە پیاوەکە بە مێردی خۆی قبووڵ بکا یان نا. بەپێی ئەو نەریتە ژن دەبێ جاری یەکەم‌و دووەم دەنگ نەکا، نەوەک تۆمەتی هەوەس‌و پەلەپەلی لێبدرێ. لە ڕێوڕەسمی زەماوەندی هوەیداو لەیلادا هەر کە ئاخوند پرسیارە باوەکەی هێنایە گۆڕێ بووک هەر جاری یەکەم گوتی بەڵێ‌و مارەکردنەکەی زوو تەواو کرد.[52]

حاڵ‌و وەزعی لەیلا دەتوانین لە وێنەیەکی ئەو شەوەدا ببینین. لە تەنیشت هوەیدا دانیشتوەو هوەیدا باوەشی پێدا کردوە؛ بەڵام لەیلا وا دێتە بەرچاو کە دەیەوێ بەسپایی خۆی لە باوەشی هوەیدا بێنێتە دەر. کراسێکی بێ‌قۆڵی جوانی دەبەرداو کەوشی پاژنە بڵندی دەپێدا یە. سیگارێکی بە دەستێکەوەو جامە شەڕابێکی بە دەستەکەی دیکەیەوەیە.[53]

هەرچەند بڕیار بوو ڕێوڕەسمەکە بە سادەیی بەڕێوە بچێ، بەڵام ڕۆژی دواتر ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی تاران چەند وتاریان بە وێنەو وردەکارییەوە لەسەر زەماوەندەکە بڵاو کردەوە. هەموویان تاریفی سادەیی ڕێوڕەسمەکەیان کردبوو. بەڵام ڕەخنەگرانی هوەیدا زەماوەندەکەیان بە نیشانەی نیازی گڵاوو قازانج پەرستی لێکدایەوە. یەک دەیگوت هوەیدا بەو زەماوەندە ڕەگەڵ بنەماڵەیەک کەوت کە تا ئێستا پێنج سەرۆک‌وەزیری لێ هەڵکەوتوون. بە جۆرێکی دیکە ، تەنیا مەبەستی پایەخوازیی کۆمەڵایەتی بووە. هێندێکی دیکە ئیددیعایان دەکرد کە ئامانجی بنەڕەتیی ئەو زەماوەندە لابردنی تۆمەتی نێربازی لەسەر خۆی بووە.[54]

بەڵام وادیارە ئەو دەنگۆ -جاروبار- ژەهراوییانە نێوەرۆکی ڕاستەقینەی زەماوەند تێنەدەگەیشتن. پاڵنەری زەماوەند بۆ هوەیدا پێش هەموو شتێک عیشق‌و بۆ لەیلا سوپاس کردن بوو. لەیلا ئەمڕۆ بە ڕاوێژێک کە دەتوانی جۆرێک خەفەتی تێدا بخوێنیەوە، دەڵێ: "هەموومان لە بنەماڵەدا بەڕاستی لە ڕەفتاری ئەمیر دەگەڵ فەریدە سەرمان سوڕمابوو."[55] کەچی بە تێپەڕینی ڕۆژگار، پێوەندیی وی دەگەڵ

مێردەکەی هندێجار بە شێوەیەکی نەناسراو دەگۆڕا. دیارە لە کورت-خایەندا، تەنیا مانگی هەنگوینیان مانەوەی چەندڕۆژەیان لە ڤیلاکەی شیمال بوو.[٥٦] ڕاستییەکەی ئەوە بوو کە هووەیدا ئۆگریی بە کارەکەی بە ئەندازەی ئۆگری بە هاوسەرەکەی بوو. لە بوواری کاردا یەکێک لە یەکەمین هەنگاوەکانی، ناردنی تەلگرافێک بۆ ئێدوارد سابلیەی دۆستی بوو. تەلگرافەکە تەنیا یەک وشە بوو: "!Viens"، واتە وەرە.[٥٧]

# سەرچاوەکان

1. "Premier of Iran Shot by Student," *New York Times*, 22 January 1965.

2. U.S. Embassy in Tehran, Iran, "Assassination Attempt on Iranian Prime Minister," Unclassified Cable #00762, 1/21/65. NSA, no. 545.

۳. برای دستیابی به بحثی پیرامون فدائیان اسلام و وفاداری آن به آیت‌الله خمینی، ر.ک.:

Amir H. Ferdows, "Khomeini and Fada'iyan's Society and Politics," *International Journal of Middle East Studies 15* (1983), 241.

۴. احمد کسروی، شیعی‌گری، تهران، ۱۳۵۷. کسروی در ۱۰ اردیبهشت ۱۳۲۴ کشته شد.

برای دستیابی به گزارشی مفصل درخصوص قتل وی ر.ک.: ناصر پاکدامن، قتل کسروی، اوپالا، ۱۹۹۹.

۵. برای دستیابی به شرحی درخصوص نقش هاشمی در این ماجرا، ر.ک.: هاشمی رفسنجانی: دوران مبارزه، تهران، ۱۳۷٦، صص ۳۳ ـ ۳۷.

٦. خواندنیها، ۲۹ خرداد ۱۳۴۴.

7. U.S. Embassy in Tehran, Iran, "Discussion of Various Topics Including the Mansur Assassination, the National Front, and Other Political Parties with Hedayatollah Matine-Daftary," NSA, no. 547.

8. Ibid.

۹. «مقام امنیتی عالی‌رتبه»، گفتگو با نگارنده، ٦ ژانویه‌ی ۲۰۰۰.

۱۰. پیشین، ۲۳ نوامبر ۱۹۹۷.

۱۱. پیشین.

۱۲. لیلا امامی، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۸ مارس ۱۹۹۹.

13. "Premier of Iran Shot by Student," *New York Times*, 22 January 1965.

14. "Iran, The 18th Premier," *Time*, 20 March 1964, 36.

۱۵. لیلا امامی، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۱۰ مارس ۱۹۹۹.

۱٦. برای دستیابی به اطلاعاتی درخصوص این دیدارها، من به گزارشهای آن زمان روزنامه‌ها و مجله‌های ایرانی، به‌خصوص کیهان و سپید و سیاه، و نیز حافظه‌ی دکتر ابوالحسن سمیعی، در گفتگو با نگارنده، ۷ فوریه ۱۹۹۸، تکیه کرده‌ام. برای بحث مختصری در باب روابط دکتر سمیعی و هویدا، به یادداشت شماره ۷ از فصل اول همین کتاب رجوع کنید.

۱۷. لیلا امامی، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۱۲ مارس ۱۹۹۹.

18. U.S. Department of State, "Information Memorandum," in *Foreign Relations of the United States, 1964-1968*, Vol. XXII (Washington, 1999), 138.

۱۹. شرح من از ملاقات هویدا با شاه متکی بر مطالبی است که هویدا چندین بار برای دوستانش تعریف کرده بود. صادق چوبک، احمد قریشی، و فریدون هویدا، در گفتگوهای جداگانه ماجراهای مشابهی را درباره‌ی این ملاقات به من گفتند، و هر کدام از آنها این حکایت را از خود هویدا شنیده بودند. تنها اختلاف در این مورد نوع تأکیدی بود که هر یک بر عناصر حکایت خود می‌گذاشتند.

۲۰. عبدالمجید مجیدی، گفتگو با نگارنده، واشنگتن دی سی، ۱۵ فوریه ۱۹۹۹.

۲۱. برای دستیابی به شرحی درخصوص رفتار رضاشاه با وزیرانش، ر.ک.: عباسقلی گلشائیان، «خاطرات»، وحید، دسامبر ۱۹۹۷، صص ۲ ـ ۱۷.

۲۲. «مقام عالی‌رتبه‌ی امنیتی» گفتگو با نگارنده، ۶ ژانویه ۲۰۰۰.

۲۳. صادق چوبک، گفتگو با نگارنده، ۲۵ نوامبر ۱۹۹۷.

۲۴. به گفته‌ی مصطفی الموتی، هویدا تأکید داشت که به شاه گفته است که توان تحمل مسئولیتهای نخست‌وزیری را ندارد. ر.ک.: الموتی، ایران در عصر پهلوی، ص ۹۸.

۲۵. عبدالمجید مجیدی، گفتگو با نگارنده، ۱۵ فوریه ۱۹۹۹.

۲۶. خواندنیها، ۱۲ تیر ۱۳۴۴. همین مجله ادعا کرد که جمشید آموزگار نخست‌وزیر آینده خواهد بود. آموزگار سرانجام به نخست‌وزیری گمارده شد، اما در مرداد ۱۳۵۶، دوازده سال بعد!

27. NA. U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Short-Term Trends in the Political Situation in Iran," March 18, 1965, A-483.

۲۸. صادق چوبک، گفتگو با نگارنده، ۲۵ نوامبر ۱۹۹۷؛ احمد قریشی هم می‌گفت که از هویدا شنیده بود که شاه این کلمات را بر زبان آورده بود. احمد قریشی، گفتگو با نگارنده، ۱۴ اوت ۱۹۹۸. حرفهای شاه در عین حال شبیه گفتگویی بود که بعدها شاه با مهدی سمیعی داشت. زمانی این شایعه سخت بر سر زبان‌ها افتاد که سمیعی به‌زودی جانشین هویدا خواهد شد. سمیعی به دیدار شاه رفت. می‌خواست این نکته را تأکید کند که در شرایط فعلی، «آماده‌ی این کاره نیست. به‌علاوه، او خود را دوست هویدا می‌دانست. شاه در جواب گفته بود، «اگر ما بخواهیم کسی را نخست وزیر کنیم، این حرفها دیگر هیچکدام اهمیتی نخواهد داشت. تنها نکته‌ی مهم این است که ما چنین تصمیمی گرفته باشیم.» آن گاه شاه باریکه‌راهی را نشان داد که در کنار جویبار جاری در قصر امتداد داشت و به سمیعی گفت، «راه را می‌بینی؛ می‌بینی چقدر باریک است. نخست وزیر هم همین‌قدر استقلال دارد.» مهدی سمیعی، گفتگو با نگارنده، لس آنجلس، ۱۱ ژوئن ۱۹۹۸.

29. Bureau of Intelligence and Research, Department of State, "Studies in Political Dynamics in Iran," Secret Intelligence Report # 13 NSA, no. 603.

۳۰. برای دستیابی به بحثی پیرامون روابط شاهان و وزیران، ر.ک.:
Amanat, *The Pivot of the universe.*

31. Bureau of Intelligence and Research, "Studies in Political Dynamics of Iran," 14.

۳۲. سمیعی، گفتگو.

۳۳. پیشین.

۳۴. شاه، در بیانیه خشماگینش خطاب به مردم، و در اشاره‌ی غیرمستقیمش به نقش بریتانیا، تا حدودی هم جانب احتیاط را نگه‌داشت. اما، در خلوت ظاهراً به بریتانیا حمله و آن را متهم به دخالت می‌کرد. «مقام عالی‌رتبه‌ی امنیتی»، گفتگو با نگارنده، ۲۷ نوامبر ۱۹۹۹.

۳۵. من این ماجرا را از احمد قریشی و «مقام عالی‌رتبه‌ی امنیتی» شنیدم.

۳۶. «مقام عالی‌رتبه‌ی امنیتی»، گفتگو با نگارنده، ۱۲ ژانویه ۲۰۰۰.

۳۷. بامشاد، ۵ بهمن ۱۳۴۳.

38. *New York Times*, 28 January 1965, 6.

۳۹. ضیاء شادمان، گفتگو با نگارنده، مونترال، ۲۹ مه ۱۹۹۹.

۴۰. شادمان، گفتگو.

41. U.S. Embassy in Tehran, Iran, "Discussion of Various Topics, including the Mansur Assassination, the National Front, and Other Political Parties with Hedayatollah Matine-Daftary," NSA, no. 547, 4.

42. NA, U.S. Embassy in Tehran, Iran, "Confidential Cable," 25 March 1969.

۴۳. خواندنیها، ۵ آذر ۱۳۴۵.

۴۴. خواندنیها، ۱۱ بهمن ۱۳۴۵.

۴۵. لیلا امامی، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۱۲ مارس ۱۹۹۹. متن قطعنامه در: الموتی، ایران در عصر پهلوی، ص ۱۰۳، آمده است.

۴۶. سفارت امریکا، طی تلگرافی محرمانه فهرستی «برگزیده»، نه جامع» از «کمپانیهای مشهور امریکایی» که «بنابر اطلاعات قطعی سفارت، نفوذ اشخاص برشمرده را می‌خرد»، تهیه کرد. این فهرست از این قرار است: «جنرال الکتریک ـ فتح‌الله محوی؛ شرکت نورثروپ ـ فتح‌الله محوی؛ کمپانی هواپیمایی بوئینگ ـ فتح‌الله (ابوالفتح) محوی؛ سی‌تیز سرویس ـ خسرو اقبال؛ مک دانلد داگلاس کورپوریشن ـ فتح الله (ابوالفتح) محوی؛ رادیو

کورپوریشن آو امریکا - رضا رزم‌آرا؛ مریل - پیرس - شاپور ریپورتر.» ر. ک.:
"American Companies and Influence Peddlers," Secret list (Document from U. S. Espionage Den. V,17–70), NSA, no. 701.

۴۷. برای شرحی از زندگی و نقش ریپورتر در ایران، ر. ک.:
"Iranian Affairs: Caught Reporter," *Private Eye*, 19 March 1976.
که به‌طور مختصر نقل شده در:
Cyrus Chani, *Iran and the West* (London, 1987), 877.

۴۸. لیلا امامی، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۱۲ مارس ۱۹۹۹.

۴۹. پێشین.

۵۰. پێشین.

51. NA, U.S. Embassy in Tehran, Iran, "Confidential Cable," March 1965.

۵۲. خواندنیها، یکم مرداد ۱۳۴۵، ص ۶.

۵۳. پێشین، ص ۵۰.

۵۴. اسکندر دلدم، زندگی و خاطرات امیر عباس هویدا، تهران ۱۳۷۷، صص ۶۳-۶۶.

۵۵. لیلا امامی، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۱۲ مارس ۱۹۹۹.

۵۶. لیلا امامی، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۱۹ ژوئیه ۱۹۹۹.

۵۷. ادوارد سابلیه، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۱۲ مارس ۱۹۹۹.

# فەسڵی دەیەم

## یادداشتەکانی سەردەمی شەڕ

"ڕێوی زۆر شتان دەزانێ، بەڵام سیخوڕ
شتێکی گەورە دەزانێ"

ئارشیلا خووس

# یادداشتەکانی سەردەمی شەڕ

ڕۆژی هەینی دەی مانگی مەیساڵی ١٩٤٠، فڕۆکەکانی ئەڵمانی نازی بۆمبارانی شاری برۆکسێلیان دەست پێکرد. ئەمیر عەبباسی هووەیدا لە ژوورەکەی خۆی لە ماڵێکی شەقامی لووئیز دەرپەڕی. پیادەڕێیەکان پڕ بوون لە خەڵکی پەرێشان. هەمووان چاویان دەئاسمانەوە بڕیبوو. لێدانی ژیانی ئەوشارە هێندی چاو لەسەریەک دانێی گۆڕابوو. شەوی پێشتر، ئەمیر عەبباس دەگەڵ یەکێک لە دۆستانی چووبووە تەماشای فیلمی نینووچکا، کاری لووبیچ. ئەوشەوە نانیان لە ڕێستوورانی "سەعاتی شین" خوارد. هووەیدا داوای بیفتەکو پەتاتەی کرد. دوای شێوخواردن چوونە سالۆنێکی سەما. تا لای بەیانی لەوێ بوون. سەکۆی سەما پڕ لە کچی جوانی شیکپۆشی خۆجوانکردوو بوو. قۆڵە ڕووتو جوانەکانیان سەرنجی هووەیدایان ڕادەکێشا.[1]

بۆ هەموو ئەو زانیارییانە قەرزداری ئەمیر عەبباسی هووەیدام. دەوری ساڵێک دوای وەرگرتنی پۆستی سەرۆکوەزیری، چەند بەشێک لە یادداشتەکانی سەردەمی لاوەتیی خۆی دا بە چاپ. یادداشتەکانی لەجێدا بە فەڕانسەیی نووسیبوونو بە کۆمەگی دۆست یان کارمەندێک کە نایناسم کران بە فارسی.[2] بەرهەمی کارەکە پەخشانێکی تاڕادەیەک پوختو هەرلەوکاتەدا قورس بوو.

لەجێدا وەرگێران کارێکی ئاسان نیە. وەرگێرانی ڕاوێژو شێوەو هونەری گێڕانەوەی دەقێک لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی دیکە کارێکی زۆر ناسکو دژوارە. لە بارەی وەرگێرانی بەرهەمەکانی هووەیداوە دیارە ئەم دژوارییە دووچەندان بوو. ڕیشەی ئەو دژوارییە لە هەزارلۆنەی

زمانیو فەرهەنگیو سۆزداریی ژیانی منداڵیو گەنجیی هووەیدادا بوو. گۆیا ئەسڵی ئەو یادداشتانە لەنێو چووە. ئێوارەی دادگای دووەمی هووەیدا، خزمو دۆستانی نیزیکی، نیگەرانی هێرشی کۆمەڵانی تووڕە بوونو بەناچار یادداشتو کاغەزەکانی ئەویان دایە کڵپەی ئاگر.[۲] جگەلەوە، ئەوڕاستییە کە هووەیدا بۆخۆی لەنێو هەموو یادداشتەکانیدا، هێندێ بەشی بۆ وەرگێڕان هەڵبژاردن، و بەشەکانی دیکەی بە ئەنقەست واز لێهێنان، و سەرەنجام ئەو دەسکارییە ناچارییانە کە لە وەرگێڕانی ڕیوایەتێک لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی دیکەدا ڕوو دەدەن، هەموو دەستیان وەدەستی یەک دەداو ناسنامەیەکی "داستانی"یان دەدا بە بیرەوەرییە چاپکراوەکانی. هەروەک هووەیدا بۆخۆی لەو ڕاستییە ئاگادار بووبێ، لە بەشێکی ئەو یادداشتانەدا نووسیبووی کە ڕۆژێک ڕیوایەتێکی تەواو لەوان دەدا بە چاپو بە پێشوازی لە شاکاری مارسێل پرووست، ناوی دەنێ گەڕان بەدوای ڕۆژگاری ڕابردوودا.[٤]

بۆ دژوارپی کاری ژیاننامەنووسین هەر ئەوە بەسە کە ئەمن ئەمڕۆ، سی ساڵ دوای چاپی گوڵبژێری یادداشتەکانی، بەنیازم بە لێکۆڵینەوەی چەندوچۆنی وانو بە پشتبەستن بە بەڵگەنامە فارسی، فەڕانسەییو ئینگلیسییەکان، کە هەرکامەی لە ڕوانگەی دۆستێک یان پیاوێکی دەوڵەتەوە نووسراونو سەرەنجام بە پشتیوانیی بیرەوەریی زۆرجار پڕلەهەڵەی دۆستانو دوژمنانی، تابلۆیەک لە کەسایەتیی وی بنەخشێنم.

ئاڵۆزیی ئەوکارە بۆخۆی، ئەودووددڵییە کە دەتوانێ لەبارەی گۆڕین یان زیادپێوەنانی ئەم یان ئەولایەنە لە کەسایەتیی ئەودا بێتە ئاراوە، و سەرەنجام کەسایەتیی چەند فەرهەنگیی هووەیدا کاری لێکدانەوەو هەڵسەنگاندنی بیرەوەرییەکانی دووچەندان دژوار دەکا. پێش هەموو شتێک دەبێ ئەو ڕاستییە وەبیر بێنینەوە کە چاپی ئەوجۆرە بیرەوەرییانە لە ئێران کارێکی نوێو جۆرێک نەریتشکاندن بوو. لەلایەک دەزانین کە لە نەریتی ئەدەبی فارسیدا، باسی خۆو ژیاننامەنووسینی ڕەخنەگران هیچکامیان برەوێکی وایان نەبووە.[٥] وا

دیاره سیاسەتمەدارانی هاوچەرخی هووەیدا کە دەفتەری یادداشتی ڕۆژانەیان دەنووسی کەم بوون. هەرلەوکاتەدا، هیچکامێکیان لە سەردەمی دەسەڵاتداریی خۆیاندا ئەوجۆره یادداشتانەیان چاپ نەکردوە. تەنانەت لە ڕۆژئاواش، کە ئەو جۆره یادداشتنووسینە لەنێو سیاسەتمەداراندا باوتره، ئەو حاڵەتانە کە یادداشتەکان وەختێک چاپ بووبن کە نووسەرەکانیان هەروا لەسەر کار بوون، بەقامک دەژمێردرێن.

جگەلەوە، زمانی فارسی زمانی جامەلووسکەییە، زمانی جیاوازیی دەرو ژووره، زمانێکە کە بنەمای تەقیەی شیعەی_کە بەرێکەوت زۆر وەک دروّی مەسڵەحەتیی[٦] ❁ مەسیحییە یەسووعییەکان دەچێ_لە زەینی ناوشیاری خۆی چەسپاندوە. لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە فارسی لە شێوەی نووسراویدا، عادەتەن سەربەخۆیی‌و فەزایەکی جیا بۆ "من" دانانێ. لە هەر دەستەواژەیەکدا "من" زۆرتر بەشێوەی پیتێکی زیادی بە فیعلەکەوە دەچەسپێ‌و موبالاتێکی ئەوتۆی پێناکرێ. ئەوە کە"من" لە دەستەواژەدا جێیەکی سەربەخۆی نیە، بۆخۆی نوێنگەی ئەو ڕاستییەیە کە تاکپەرستی لە فەرهەنگی فارسیدا جێگای نەبووە. شاراوەمانەوەی "من" لە پشتەوەی فیعلدا دەتوانین بە بەڵگەیەکی دیکەی ئەو ڕاستییەش بزانین کە نەریتی ژیاننامەنووسیی ڕەخنەگران لە ئێراندا بزانین. ژیاننامەنووسی، وەک شێوازێکی ئەدەبی، لەسەر بناخەی بایەخی "من" دامەزراوە. ژیاننامەنووس هەمیشە لەنێو هەودا تێکئاڵقاوەکانی هەلومەرجی کۆمەڵایەتی‌و مێژووییدا بە دوای شوێنپێی ئەو من ەدا عەوداڵە کە هەمەکارەی ڕیوایەتەکەیە. بەڵام وادیاره لە ئێران نەکهەر "من" زۆرتر شاراوە دەمێنێتەوە، بەڵکوو فیعلەکە خۆی لە کەسایەتیی فاعیلەکە گرنگتره. بەجۆرێکی دیکە بڵێین، هووەیدا بیرەوەرییەکانی لە کۆمەڵێکدا بە چاپ گەیاند کە بیناسازییەکەی خووی بە دیوارو فەزای داخراو گرتوە، کۆمەڵێک کە دەرێ لە ژووری جیا دەکاتەوەو "ژوور"ێ

---

❁ Equivocation.

هەمیشە لە ئازاری "دەر"ێ دەپارێزێ؛ کۆمەڵێک کە داوا لە تاک دەکا لەبارەی ژیانی تایبەتیی خۆیەوە بێدەنگ بێ. بەڵام هوەیدا باسی لاوازیو هەڵخلیسکانەکانی سەردەمی لاوەتیی خۆی دەنووسیو ئەو راستوێژیو بێپەروایییەش بۆخۆی جۆرە نەریتشکێنییەک بوو. سیاسەتمەدارانی هاودەورەی وی ژیانی تایبەتیی خۆیان زۆرتر لەپشت پەردەیەک دەشاردەوە. تەنانەت ئەو بێدەنگییەیان بە کۆڵەکەو پایەی دەسەڵات دەزانی. هوەیدا لە بیری گۆڕینی ئەو بایەخانەدا بوو. لە یەک قسەدا، بۆچوونی بۆ مەسەلەی نووسینو چاپی بیرەوەرییەکانی رۆژانەی زیاتر رۆژئاوایی بوو هەتا ئێرانی.

یەکەم پرسیار کە لەبارەی بیرەوەرییەکانی هوەیداوە سەرنج رادەکێشێ ئەوەیە کە بۆچی، لەنێو ئەو هەموو یادداشتەی لە سەردەمی لاوەتیدا نووسیونی، لە پێشدا ئەو بەشەی چاپ کرد کە پێوەندیی بە بڕۆکسێلەوە هەبوو* ئەودەم کۆمەڵی ئێران هوەیدای ئەوەندە نەدەناسی. بیرەوەرییەکانی جۆرێک خۆناساندن بوون. پوختەیەک لە کەسایەتیی خۆی بوو کە رووماى وی، بەوجۆرە کە خۆی دەیەویست، بەخەڵکی ئێران نیشان دەدا. بەڵام قسەی نووسراو هەرگیزغولامی تەواو گوێبەفەرمانی نووسەرەکەی نیە. لەواندا زۆرجار دەتوانی شتی وا ببینی کە مەبەستی نەبووە بیاندرکێنێ.

ئەگەر لە "بیرەوەرییەکانی سەردەمی شەڕ" ورد بینەوە، پێم وایە، بەو ئاکامە دەگەین کە هوەیدا لەوێدا، بە زیرەکییەکی تەواو، هەم بەشێک لە باوەڕە سیاسییەکانی خۆی گونجاندووەو هەم قسەی خۆی لەسەر دەورەیەکی گرنگی ژیانی هێناوە. بە بەراورد لەگەڵ ئەو بەشانە

---

* پێش ئەوەی ببێتە سەرۆکوەزیر،هوەیدا چەند بەشێک لە بیرەوەرییەکانی چاپ کرد. لە هەرکامیاندا شتێکی لەبارەی کەسایەتییە ناسراوکانی رۆژگار، بەتایبەتی ئەوکەسانەوە کە لە ژنێڤ چاوی پێکەوتبوون،دەخستە روو. "بیرەوەرییەکانی سەردەمی شەڕ یەکەمین کۆمەڵە بیرەوەرییە کە تەوەرەکەیان ژیانی هوەیدا خۆیەتی.

کە دواتر دانی بە چاپ، ئەمەیان لە هەمووان درێژتر بوو. زمانەکەی جاری وابوو هێند سادە بوو بنیادەمی فریو دەداو جاری واش بوو تەواو هێمایی‌و پڕپەمزوڕاز دەهاتە بەر چاو. ئەگەر بە وردەکارییەکانیدا بچینە خوار، تێ‌دەگەین کە پایەکانی بیروباوەڕی لەواندا دەست دەکەون. هەرلەو کاتەدا، تێ‌دەگەین کە بۆچی هووەیدا حەزی لە دەسەڵات دەکردو بۆ دەیەویست لە ئێران کارێکی بەدەستەوە بێ.

ئەو کەسایەتییەی هووەیدا لە "بیرەوەرییەکانی سەردەمی شەڕ"دا بۆخۆی دروست کردوە لەجێدا کەسایەتییەکی ئەدەبییە. هەرلەو کاتەدا ڕەگەیەک لە سیاسەتیشیان تێدا دەست دەکەوێ. جگەلەوە، هەزارویەک نوکتەی فەلسەفی، مێژوویی، و هێمای جۆراوجۆری ئەدەبی هاتوونە نێو ئەم یادداشتانەوە. ئەگەر دابەشکردنە درەوشاوەکەی ئایزابەرلین لەبارەی کەسایەتییە جۆراوجۆرە سیاسی‌و فکرییەکانەوە قبووڵ بکەین، واتە قبووڵمان بێ کە بیرمەندان دووجۆرن، جۆرێکیان ژووشکن‌و هەموو مەسەلەکان بە تاقە بنەڕەتێک لێک دەدەنەوەو لە ئامانج‌و ئامراز هەردووکیاندا دوچاری جۆرە بۆچوونێکی یەکڕیشەن‌و هێندێکیشیان ڕێوین‌و ئامانجی جۆراوجۆریان هەیەو قەتیش هەوڵ نادەن هەموو مەسەلەکان بە تاقە بنەڕەتێک لێک بدەنەوە،[٧] ئەودەم پێم وایە دەگەینە ئەو ئاکامە کە ڕەنگە هووەیدا ڕێوییەک بووبێ کە بەرێکەوت لەکۆمەڵێکدا ژیاوە کە ئەوپەڕی ئاواتی ژووشکەکانن. هووەیدای "بیرەوەرییەکانی سەردەمی شەڕ" کەسایەتییەکە لەیەک کاتدا هەم بەرپەرو هەم گۆشەگیر. زۆر بایەخ بە ژیانی ڕۆژانە نادا، بەڵام بەرامبەر بە ماناو لێکدانەوەی فەلسەفیی بوون‌و جیهان بەپرسیارە. گەشبینییەکەی لەبارەی یەکیەکی مرۆڤەکان‌و ئایندەی نیزیکەوە ئەندازەی نیەو هەرلەو کاتەدا، لەبارەی مرۆڤەوە بەگشتی، و دوارۆژی مرۆڤایەتییەوە یەکجار ڕەش‌بینە. ژیانی ڕۆژانەی لەسەردەمی شەڕدا بێ‌غەم لە گیروگرفتە ناسراوەکانی هەوڵی گوزەران بووو دەچۆوە سەر شێوەی ژیانی

کەسانێک کە ڤالتەر بنیامین بە"فلانوور"[*]ی ناو دەبردن: پۆلیسێکی شارنشین؛ موسافیرێکی وردبین‌و قسەخۆش کە "لە هەموو جێیەک بە شێوەیەکی نەناسراو دێت‌ودەچێ. سنوورو سەراوردێک ناناسێ. هەموو جیهان مەیدانی تەراتێنی خۆیەتی.[٨] هووەیدا چ ئەودەم کە باسی پاریس‌و بەیرووت‌و لەندەن دەنووسێ، چ کاتێک بیرەوەرییەکانی لە تاران‌و برۆکسێل دەگێڕێتەوە، شۆرو شەوق‌و ئۆگرییەکەی یەکە.

لەڕاستیدا فلانوور شتێکە وەک ڕووناکبیرە مەشاییەکانی ئێمەو لە راوێژی قسەی "بیرەوەرییەکانی سەردەمی شەڕ بەچاکی دەردەکەوێ کە هووەیداخۆی پتر لە هەموو شتێک بە ڕووناکبیر دەزانی.لە هەر لاپەڕێکی نووسراوەکەیدا، دەتوانی ئاماژەیەک بە یەکێک لە ڕووناکبیرانی ڕۆژئاوا ببینییەوە. لە ئالبێر کامۆو ئاندرەژیدەوە بگرە تا دەگاتە کارل مارکس‌و ئالفرێد دوڤینی، کۆمەڵێکی سەیر لە فەیلەسووفان- و نووسەران لە یادداشتەکانیدا ئامادەو کاریگەرن. ڕەنگە بکرێ هەرئەو کەسایەتییە ڕووناکبیرییە بە یەکێک لە هۆیەکانی ئۆگریی شا بە هووەیدا بزانین. شا تینووی پشتیوانیی ڕووناکبیران بوو. زۆرجار تەنانەت ئامادە بوو بۆ بەدەستهێنانی نەزەری مووافیقی وان هەر نرخێک بدا. زۆرجار بە خۆڕانانەوە بە ڕۆژنامەنووسانی گوتبوو کە "سەرۆک‌وەزیرەکەمان" لە ڕیزی کتێب‌خوێناندایە. دیارە هووەیداش بێ‌مەیل نەبوو کە لە باری ڕووناکبیریی خۆی‌و پێوەندییەکی تاڕادەیەک بەربڵاو کە دەگەڵ کۆمەڵی ڕووناکبیرانی ئێرانی دروست کردبوو، کەلکی سیاسی وەربگرێ. دەیەویست ئەوکەلێنە گەورەیە کە کەوتۆتە نێوان ڕێژیم‌و ڕووناکبیرانی ئێرانەوە، پڕ بکاتەوە.

گرنگترین هەوڵی لەوبارەیەوە، دیداری دەگەڵ کۆمەڵێک لە نووسەرانی ئێران لە ئاخرو ئۆخری ساڵی١٣٤٤ (١٩٦٥)دا بوو. ئەحمەدی شاملوو، ڕەزای بەراهەنی، غولامحوسێنی ساعیدی، یەدوڵڵای ڕوویایی، دەرویشی شەریعەت، سیرووسی تاهبازو جەلالی ئالی

---

[*] Flaneur.

ئەحمەد لەم دانیشتنەدا ئامادە بوون.[٩] لەبارەی چەندوچۆنی ئەم دیدارەوە تا ئێستا هەرنەبێ تووشی سێ گێڕانەوەی جۆراوجۆر بووم. بەخۆشییەوە ئەوگێڕانەوە ناتەبایانە لە چەند خاڵی گرنگدا کەموزۆر یەکدەنگن. هەموویان دەڵێن ئەو حەوت نووسەرو شاعیرە دەوری سەعاتونیوێک دەگەڵ سەرۆکوەزیر وتووتێژیان کردوە. دەڵێن هووەیدا پەریشان دەهاتە بەرچاو. چەندین جار ئاماژەی بەوڕاستییە کرد کە ئەو سیاسەتانەی باس کراون دەبێ دەگەڵ "تیمسار ڕێک بخا. گومانێک نەبوو کە مەبەستی نەسیری سەرۆکی ساواک بوو. لەلایەن نووسەرەکانەوە ئالی ئەحمەد هەمەکارە بوو* جاری وابوو بە زمانێکی توندو چزوودار پەلاماری ڕێژیمی دەدا. لە نێو نووسەرانی ئەوکاتی ئێراندا کەم کەس بەقەدەر ئالی ئەحمەد هەوای ناوو ناوبانگی لەسەردا بوو. وەک دوژمنی ئازاو بێباکو سەرکێشی ملهوڕی ناوبانگی

---

* یەکێک لەو سێ گێڕانەوەیە هی غولامحوسێنی ساعیدییە. لە وتووێژێک بۆ مێژووی زارەکیی ئێراندا،لە زانکۆی هاروارد، دەڵێ ڕۆژێکیان کەسێک بەناوی داودی ڕەمزی پێوەندیی پێوە گرتەو گوتی ئەگەر نیگەرانی سانسۆر لە ئێرانی دەتوانی دەگەڵ سەرۆکوەزیر لەو بارەیەوە قسە بکەی. ساعیدی دەگەڵ چەند کەس لە دۆستانی،یەک لەوان ئالی ئەحمەد ڕاوێژی کرد. بڕیار درا هەیئەتێک بە نوێنەرایەتیی نووسەران چاوی بە هووەیدا بکەوێ. ڕەزای بەراهەنی گێڕانەوەیەکی جیاوازی لەم دیدارە خستۆتە بەرچاو،ئەو لە پێشەکیی کتێبەکەیدا کەناوی ناوە "ظل-الله" واتە سێبەری خوا دەنووسێ کە داواکارو ڕێکخەری دیدارەکە نووسەرەکان خۆیان بوون. مەبەستیان لە دیدارەکە بێزاریدەربڕین لە سانسۆر بوو. ئەو لە وتووێژێکی جیادا،بە درێژی وتووێژەکانی ئەو چاوپێکەوتنەی بۆمن باس کرد. گێڕانەوەی سێیەم هی ئیحسانی نەراقییە. بە قسەی ناوبراو هەردوو گێڕانەوەکەی پێشوو "پڕوپووچ"ن. نەڕاقی دەیگوت: "کاکە، ئەمانە هەموو درۆ دەکەن." بەقسەی وی، جەلالی ئالی ئەحمەد لەو کارەدا پێش کەوت. ئەوەی وتووێژەکەی پێکهێنا نەڕاقی خۆی بوو،وەختێکیش دیدارەکە دەگەڵ هووەیدا سەری گرت، جگە لە ئالی ئەحمەد تەنیا کەسێکی دیکە لە ژوورەکە بوو، ئەویش نەراقی بوو.

دەرکردبووو نەیدەویست ئەوناوبانگە خەوشدار بکا. دەردی دڵی لە سانسۆر کرد. هووەیدا ئیددیعای کرد کە ئەویش دژی سانسۆرە. بەڕێکەوت چەندمانگ دوای دانرانی بە سەرۆکوەزیر، لە کۆبوونەوەی مەجلیسی شووڕای نیشتمانیدا گوتبووی: "ئەمن دژی سانسۆری چاپەمەنیم... ئامادەم گیانم بدەم تا خەڵکی دیکە بە ئازادی قسەی خۆیان بکەن. دەبێ بێڵین هەرکەس ئازادانە قسەی خۆی بکا."[10] بەوحاڵە، لە وەڵامی ناڕەزایەتیی ئالی ئەحمەددا، هووەیدا ئیددیعای کرد کە ئاگای لە بوونی سانسۆر لە ئێراندا نیە.[11] ئیددیعاکەی تەواو بێبناخە بوو. ڕاستییەکەی ئەوە بوو کە ئەو گۆڤارەی بۆخۆی سەرنووسەری بوو، ماوەیەک سانسۆر کراو داخرا. بە قسەی موحەممەدی سەفا سەرۆکی دەفتەری هووەیدا لە سەردەمی سەرۆکوەزیریداو یەکێک لە هاوکارانی لە گۆڤاری "کاوش" لە کومپانیی نەوتدا، فەرمانی داخستنی گۆڤارەکە شا خۆی دەری کردبوو. دەیگوت لە ژێرنووسی یەکێک لە وتارەکانی گۆڤاردا ئاماژە بە موسەددیق کرابوو، شاش هیچ جۆرە مودارا، یان ئاماژەیەکی ناڕاستەوخۆ بە موسەددیقیشی پێ قبووڵ نەدەکرا.[12] بەهەرحاڵ ئالی ئەحمەدو هاوڕێکانی ئەوڕۆژە بە ئامادەیی تەواو هاتبوونە کۆبوونەوەکە. زۆرنموونەی ڕوونیان لە سانسۆر باس کردن‌و هووەیداش کەریمپاشا بەهادوریی، کە ئەوکات یەکێک لە نووسەرانی دەفتەری هووەیدا بوو، بانگ کردە ژوورەکەی‌و داوای لێکرد لە بارەی ئەو شتانەوە کە نووسەرا ن ئاماژەیان پێ کردبوون لێکۆڵینەوەیەک بکاو ڕاپۆرتێکی لەسەر ئامادە بکا.

لە نێوان ئەم وتوێژانەدا، هووەیدا پێشنیاری کرد هەیئەتێکی هەڵبژێراوی نووسەرەکان، کاری چاوەدێری بەسەر چاپی هەموو کتێب-و بڵاوکراوەکانی ئێراندا بگرێتە ئەستۆ. دیارە پێشنیارەکەی قبووڵ نەکرا. ئالی ئەحمەد لە وەڵامدا بە نوێنەرایەتیی ئەوانی دیکە، گوتی: "ئێمە هاتووینە ئێرە ناڕەزایەتی لە سانسۆر دەرببڕین، ئێستا دەتەوێ خۆمان بکەی بە سانسۆرچی."[13] ئەمجار ئالی ئەحمەد ئاماژەی بە شەڕی لەمێژینەو لەئاشتینەهاتووی نێوان "دەسەڵات‌و قەڵەم" کردو دەیەویست

لەوبارەیەوە درێژتر قسە بکا کە لەنەکاو هووەیدا قسەکەی پێبڕیو گوتی: "جەنابی ئالی ئەحمەد، ئەم قسانە بە ئێمە مەڵێ. ئەو شتانەی ئێوە خوێندووتانەتەوە ئێمەش خوێندوومانەتەوە."[140]

دەتوانین ڕاوێژی توندو لەئاشتینەهاتووی ئەو کۆبوونەوەیە بە نوێنگەو نموونەی ئەو ڕیزبەندییە سیاسییە سەیرە بزانین کە سەرەنجام سەری کێشایە سەرکەوتنی شۆرشی ئیسلامی. نوێخوازانی ئێران ڕیزێکی یەکگرتوویان نەبوو. هێزی جیاواز، لە شاو هووەیداوە بگرە، تا چینە نێونجییە شارنشینەکانو کۆڕێکی بەرین لە ڕووناکبیران هەموویان لە ئەسڵێکی گشتیی مێژووییدا یەکدەنگ بوون: هەموو خوازیاری نوێ-بوونەوە لە ئێراندا بوون. بەڵام شێوەی جۆراوجۆریان لە نوێبوونەوە پەسند دەکردو جاری وابوو ئەو جۆراوجۆرییە دەگەیشتە ناکۆکیی توندی سیاسی. بەناچار نوێخوازەکان لە جیاتی یەکڕیزی زۆرتر لە حاڵەتی شەڕو کێشەی سیاسی دەگەڵ یەکتردا بوون. جگە لە تێگەیشتنی جیاواز لە نوێبوونەوە، هۆیەکی دیکەش کۆمەگی بە پەرش-وبڵاوی وچەند پارچەیی هێزە نوێخوازەکان دەکرد. بای تاڵی ئەزموونی کۆدیتای ۲۸ی گەلاوێژ ئاگری ئەو ناکۆکییانەی خۆشتر دەکرد. شا بە ملهوڕی حکوومەتی دەکرد. دڵنیا بوو کە تەنیا بە پشتبەستن بە دەسەڵاتی خۆی دەکرێ کۆمەڵی ئێران بەرەو نوێبوونەوە ببرێ. جگەلەوە، نوێبوونەوەو نوێکردنەوەی ئابووریی لە بوارەکانی دیکەی نوێبوونەوە پێ لەپێشتر بوو. لە بەرامبەردا، نەیارانی ویش دێموکراسیی سیاسییان بە یەکەمەرجی نوێبوونەوەو یەکیەتیی سیاسی دەزانیو لە ئاکامدا خۆیان لە هەرچەشنە هاوکاریو هاوپەیمانییەک دەگەڵ ڕێژیمی شا دەپاراست. لەڕاستیدا شا نەکهەر نوێبوونەوەی بە هاومانای نوێکردنەوەی ئابووری دەزانی، بەڵکوو ئامادە بوو هەرچەشنە مۆدێرنیزمێکی هونەری لە کۆمەڵدا بە ڕەوا دابنێ. لە سەردەمی پادشایەتییەکەیدا، جاری وابوو، بەتایبەتی لە فستیڤاڵە هونەرییەکانی دەیەی پەنجادا، بەشێک لە پێشەنگترینو ئازایانەترین بەرهەمە هونەرییەکانی سەردەم لە ئێراندا پێشان دەدران. هەرلەو

کاتـەدا، ئـەو نـوێبوونـەوەی سیاسـی، واتـە حکوومـەتی مەشـرووتەو دیموکراسـیی ڕاسـتەقینەی کـە لـەودا ئازادییـە سیاسـییەکانو مـافی تاکەکەسـیی هاونیشـتمانان مسـۆگەر بـێ، تەحـەممول نـەدەکرد. لـە بەرامبـەردا، هێزە نەرتییـەکان، بـە ڕێبەرایـەتیی ئایـەتوڵڵا خومـەینی، نەکـهـەر ڕێکخـراوو یەکگرتوو بوون، بەڵکوو توانیـان لـە بڕگـە ناسـکو یەکلاکەرەوەکانـدا، دەگـەڵ هێنـدێ بەشـی چینـی نێـونجیی شارنشـینو ڕووناکبیرانی ئێران یەک بگرن. ڕادەی ئینکەبەریی ڕووناکبیران دەگەڵ ڕێژیمی پەهلەوی گەیبووە جێگایەک کە زۆر لەوان سەرەنجام یەکگرتن دەگەڵ ڕووحانیەتێک کە دەیەویست دەوڵـەتێکی مەزهـەبی دامـەزرێنێو دژی مافی دەنگدانی ژنان بوو، لە هاوکاری دەگەڵ ڕێژیمی شا بە باشتر بزانن. بۆ زۆر لەو ڕووناکبیرانە، "خەبات دژی ئیمپریالیزم" لـە بـەرگری لە ئازادییە سیاسییەکان گرنگتر بوو. دەیانگوت "ناتەبایی گەورە" دەگەڵ ئیمپریالیزمـە. دیـارە ئایـەتوڵڵا خومـەینییش لـەو ڕۆژگـارەدا زۆر لـە دروشمە دژی ئیمپریالیستییەکانی دووپاتە دەکردنەوەو بەمجۆرە ئەو یەکگرتنە سـەیرەی نێوان ڕووحانیـەتو ڕووناکبیرانی عورفیڕەوشتو چینی نێـونجیی تـەکنۆکراتی ئاسـانتر دەکـرد. بـە بـاوەڕی مـن دەتـوانین هەرئەم ڕیزبەندییە سـەیرە بە یـەکێک لەکلیلـەکانی ڕەمزی سـەرکەوتنی شۆرشـی ئیسـلامی لـە ئێرانـدا بـزانین. هەرلـەو کاتـەدا، چەنـدوچۆنی وتوویژی هووەیدا دەگەڵ ڕووناکبیرانو نووسەران، و ئەو ئالۆزییانـەی لـەو دیـدارەدا ڕوویـان دەدا نوێنگـەی ئـەو ڕاسـتییە مێژووییـە بـوون. تەنانەت ئەو ڕاستییەش کە ئالی ئەحمەد کتێبی "خوانە زەمینییەکان"ی ئانـدرە ژیـد، واتـە کتێبـی خۆشەویسـتی دەورانـی لاوەتیـی هووەیـدای کردبوو بە فارسی، نەیتوانی خاڵێکی هاوبەش لە نێوان ئەوو هووەیدادا دروست بکا.[١٥]

دوای دەوروبەری سـەعاتێک وتوویژی توند، هووەیدا سـەرەنجام تێگەیشت کە لەو فەزایەدا دەرەتانی هیچ ڕێککەوتنێک نیە. لەنەکاو شێوەی باسەکەی گۆڕی. هێنایە سەر باسی دۆستایەتیی خۆی دەگەڵ سادقی چووبەکو ئاماژەی بەو نوکتەیە کرد کە دوانیوەڕۆی هەموو

چوار شەممەیەک دەچێتە سەردانی چووبەک. ئەمجار پێشنیاری کرد کە: "ئەم حەوتوویە شووشەیەک ئیسکاچ دەکڕم‌و ئێوە دۆستانیش دەتوانن بۆ درێژەی باسەکە بێنە ماڵی چووبەک. بەڵکوو لەوێ بتوانین ناکۆکییەکانمان چارەسەر بکەین." دووبارە ئالی ئەحمەد لەلایەن گرووپەکەوە جوابی دایەوە. گوتی: "ئێمە تەنیا ڤۆدکای هەرزان‌بایی‌و ئەویش لە کافەکانی لالەزار دەخۆینەوە."[16] ئەم قسەیەی ئالی ئەحمەد لە دوو بارەوە گرنگە. لەلایەک، بەمانای ڕەتکردنەوەی پێشنیارەکەی هووەیدا بوو. لەلای دیکەش نوێنگەیەکی دیکەی ئایینی هەژاری‌پەرستی بوو کە ئەوسالانە لە نێو ڕووناکبیرانی ئێران-و زۆر شوێنی دیکەی جیهان-دا قەدرو قیمەتێکی زۆری هەبوو. هەمووان خۆیان بە هەژار نیشان دەداو ئەو هەژارییەشیان بە پێشمەرج‌و نیشانەی هاوپێوەندی دەگەڵ خەڵک دەزانی. شانازیی ئالی ئەحمەد بە ڤۆدکای هەرزان‌بایی‌و کافەکانی لالەزارەوەش هەموو لەمەوە سەرچاوەی دەگرت.

کۆبوونەوە بەبێ ئاکامێکی دیار کۆتایی هات. بەڵام لەماوەی چەند حەوتوودا، سیستمێکی تازەی سانسۆر لە ئێراندا دەستی پێکرد. لەوەودوا، بوو بە ئەرکی بڵاوکەرەوەکان کە لە هەر کتێبێکی تازە چەند دانە پێشانی کتێبخانەی نیشتمانی بدەن‌و ژمارەیەکی تایبەتی وەرگرن. ڕواڵەتەکە ئەوە بوو کە ئیدی سانسۆر نەماوە. بەڵام ڕاستییەکە ئەوە بوو کە هیچ کتێبێک بێ ژمارەی کتێبخانەی نیشتمانی بڵاو نەدەکرایەوە. سانسۆرچییەکانیش کاری خۆیان لە ژێر چەتری کتێبخانەی نیشتمانیدا ئەنجام دەدا. هێندێک لە نووسەرە ئێرانییەکان هووەیدایان بە بەرپرسی سیستمی تازەی سانسۆر دەزانی.[17] جگەلەوە، لەمانگەکانی پاش ئەو دیدارە بێ‌ئاکامەدا، ساواک بە هەڕەشەو تۆقاندن پێشی کۆبوونەوەکانی کانوونی نووسەرانی ئێرانی گرت‌و هێندێک لە چالاکانی کانوونیشی خستە گرتووخانەوە.

دیارە هووەیدا جارجار ڕووناکبیرانی دیکەی ئێرانیشی لە ماڵی فەرەیدوونی برای دەدیتن.[18] بەوحاڵە لەبەر چاوی زۆربەی کۆمەڵی ڕووناکبیری ئێران، ڕێژیمی پەهلەوی، بەتایبەتی دوای کۆدیتای ٢٨ی

گەلاوێژ، نوێنگەی گەندەڵی بوو. هووەیداشیان یان یەکسەر وەک بەشێک لەو دیاردەیە سەرکۆنە دەکرد، یان پێیان وابوو لەبەر پێوەندی- و نیزیکی دەگەڵ ڕێژیم تووشی نەفرین بووە. ئالی ئەحمەد کە لە- پێشەنگانی تیپی ڕووناکبیریی ئەو سەردەمە بوو، نەکهەر گومانی لە ناسنامەی ڕووناکبیریی هووەیدادا هەبوو، بەڵکوو تەنانەت دەیگوت فەرەیدوونی براشی، لەخۆیدا، ناکرێ بە ڕووناکبیر دابنرێ. دەیگوت ناکرێ لەڕێژیمی شادا کاربەدەست بیو بە ڕووناکبیریش بمێنیەوە.[19] هەربۆیە، ڕەنگە ئەگەر هووەیدا لەو ڕۆژانەدا لە داوەری لەسەر سروشتی کۆمەڵی ئێراندا بێئەزموونیی بەخەرج نەدابایە، ئەگەر گەش- بینییە سیاسییەکەی ڕاستییەکانی کۆمەڵی لە مێشکی نەسڕیبایەوە، تێ- گەیشتبا کە دیداری وەک ئەوەی دەگەڵ ئەندامانی کانوونی نووسەرانی کرد ناتوانێ جگە لە ناکامی ئاکامێکی هەبێ.

دیارە شکانی ئەم کۆبوونەوەیە هووەیدای لە هەوڵی ئاشت- کردنەوەی ڕێژیمی شاو ڕووناکبیرانی نەیار سارد نەکردەوە. شەش مانگ لەم کۆبوونەوەیە ڕانەبردبوو کە داوای لە سەرۆکی دەفتەرەکەی، موحەممەدی سەفا کرد خەلیلی مەلەکی بۆ نانی نیوەڕۆ بانگ بکاتە دەفتەری سەرۆکوەزیری. بیستو پێنج ساڵێک دەبوو کە خەلیلی مەلەکی لە نێوجەرگەی ئاڵوگۆڕەکانی ئێراندا بوو. لە سەرەتای چالاکییەکانی حیزبی تووده‌دا، ئەو یەکێک لە بژاردەترینو خوێندەوارترین تیئۆریسیەنەکانی حیزب بوو. زۆری پێ نەچوو کە بەهۆی لایەنگری لە بنەڕەتەکانی سۆسیالدێموکراسیو نەیاری دەگەڵ لینینیزمو ستالین، کەوتە نوختەی بەرامبەری ڕێبەریی حیزبی توودە. پاش جیابوونەوەی لە حیزبی توودە، دەزگای پروپاگەندەی ئەو ڕێکخراوە، بە کۆمەگی شووڕەوی، مەلەکیی کردە دێوەزمەیەکی بێ- شاخو کلکو وای نیشان دەدا کە ئەو نوێنگەی داماوییەو هەوای سازان دەگەڵ ڕێژیمی لە کەللەدایە. لە لایەکی دیکەوە، ڕێژیمی پەهلەوییش هەرگیز متمانەی تەواوی پێنەکرد. یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی کەسایەتیی مەلەکی سەربەخۆیی فکری بوو. لە هەر مەسەلەیەکدا

ڕاستییەكانی هەڵدەسەنگاندو ئەوەی بە ئەقڵو نەزەریدا هاتبا دەیگوت و باكی لە "مەزهەبی مەنسووخ" و "مەزهەبی موختار" نەبوو. نموونەی ئەو سەربەخۆییە فكرییەی دەتوانین لە لێكدانەوەی ناوبراو لە بەسەرهاتی ١٥ی جۆزەرداندا ببینین. لە نێو نەیارانی ڕێژیمی شادا ڕەنگە ئەو تەنیا كەس بووبێ كە یەكیەتیی هێزە نیشتمانیی و دیموكراتەكان دەگەڵ ئایەتوڵڵا خومەینیی بە نادروست دەزانیی و لە نامەیەكدا بۆ دوكتۆر موسەددیق سەرانی بەرەی نیشتمانیی ڕاست لەسەر ئەوە خستە بەر ڕەخنە.[20]

هووەیدا جارێكی دیكەش لە ئاخروئۆخری دەیەی ٣٠دا، چاوی بە مەلەكی كەوتەوە. دیداری جاری یەكەم بەهۆی ئیحسانی نەراقییەوە ڕێك خرابوو.[21] هووەیدا چووبووە ماڵی مەلەكی و سەعاتێك قسەی دەگەڵ كردبوو. جاری دووەم هووەیدا بۆخۆی دیدارەكەی پێكهێنا. هەر لەو دەوروبەرەدا هێندێك لە لایەنگرانی خەلیلی مەلەكی، بە تایبەتی لە ئورووپا، بە زمانێكی زۆر توندو ڕاوێژێكی لەئاشتی‌نەهاتوو ڕەخنەیان لە دەوڵەتی هووەیدا گرتبوو. بۆنموونە، یەكێك لەوتاقمانە كە لە پاریس چالاك بوو، لە وتارێكدا تۆمەتی لە دەوڵەتی هووەیدا دابوو كە نەكهەر "ئەو چاكسازییە نیوەچڵو ناتەواوەشی ڕاگرتوە كە لە ئێران لە بواری دابەش‌كردن و فرۆشتنی زەوی بە جووتیاراندا دەست پێ‌كرابوو، بەڵكە وەك نوێنەری سیاسیی سەرمایەداریی كۆمپەڕادۆری ئێران، بۆتە دەڵاڵی كاڵای بێ‌كەلكی بێگانە لە بازاڕی نێوخۆییشدا." بە قسەی ئەم وتارە، دەوڵەتی هووەیدا دیفاع لە سیاسەتی "دەرگای كراوە" دەكاو ئەو سیاسەتەش هەر پرۆژەكەی سندووقی نێونەتەوەیی دراوەو ئاكامێكی جگە لە ملكەچیی ئابووریی ئێران بە دواوە نابێ و هەربۆیەش نووسەری وتارەكە دەوڵەتی هووەیدای بە "كۆنەپەرستترین" دەوڵەتی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست زانیبوو.[22]

بەڵام سەرەڕای ئەو هێرشانەو سەرباری ئەو ڕاستییە كە ئەوكاتە مەلەكی تازە لە زیندان ئازاد كرابوو، هووەیدا لەسەر دیتنی مكوڕ بوو. سەرەتا، مەلەكی هێندەی ئەو دیدارە پێ خۆش نەبوو. دەیگوت ئەگەر

خەبەری ئەو دیدارە بچێتە دەرێ بۆ هوووەیدا دەبێتە مایەی ژانەسەر. هوووەیدا وەڵامی دابۆوە کە "ئێران شوورەویی سەردەمی ستالین نیە. سەرۆکوەزیری وڵات دەتوانێ دەگەڵ هەرکەس خۆی بخوازێ دیدار بکا."[34] ڕوون نیە ئەم دیدارە بە ڕەزامەندیی پێشوو، یان تەنانەت بە فەرمانی شا ڕێک خرابوو یان بەڕاستی دەسپێشخەریی هوووەیدا خۆی بوو. هەرچۆنێک بوو، ڕۆژی دیاریکراو، موحەممەدی سەفا کە ڕێکخەری دیدارەکە بوو، مەلەکیی هێنایە دەفتەری سەرۆکوەزیری. هەردووکیان لە دەرگای پشتەوەڕا چوونە ژوور، نەوەک کارمەندانی دیکەی دەفتەر میوانی ئەو ڕۆژەی سەرۆکوەزیر بناسن.

دیداری مەلەکیو هوووەیدا کەمێک زیاتر لە سەعاتێکی خایاند. لە تەواوی ئەو ماوەیەدا، مەلەکی بەوپەڕی ئازایەتیو لێزانییەوە ڕەخنەی لە سیاسەتەکانی ڕێژیمی پەهلەویو دەوڵەتی هوووەیدا گرت. ئەو ئەوندە بەگەرمی قسەی دەکرد کە بەکردەوە هوووەیدا دەرفەتی قسەکردنی چنگ نەکەوت. جارێکیش کە هەوڵی دا لە وەڵامی یەکێک لە هێرشەکانی میوانەکەیدا شتێک بڵێ، مەلەکی بە لێبڕاوییەوە قسەکەی پێ بڕیو گوتی: "چاپەمەنیو ڕاگەیەنە گشتییەکانی وڵات شەووڕۆژ لەبەر دەستو لە پاوانی تۆدان. ئەگەر قسەیەکت بۆ گوتن هەیە، دەتوانی لەو ڕاگەیەنانە کەلک وەرگری. ئەم چەند دەقیقەیە دەرفەت بە من بدە با بۆچوونەکانم لە بارەی مەسەلەکانی وڵاتەوە لەگەڵ تۆ باس بکەم."[40] کاکڵی قسەکانیشی، بە باوەڕی خۆی، نەبوونی دیموکراسیو حکوومەتی تاکەکەسیو سەرەڕۆی شا بوون.

پاش مەلەکی نۆرەی فرووهەر بوو. ئەویش وەک ژمارەیەکی بەرچاو لە هاوتەمەنانی، لە ساڵەکانی دوای شەڕدا تێکەڵی سیاسەت بوو. لە سەرەتادا زیاتر بە هێزی دەستومەچەکی بەناوبانگ بوو. جگەلەوە، دەیانگوت بۆ دیفاع لە هەڵوێستە سیاسییەکانیشی زۆرتر پەنا بۆ هێزی دەستومەچەکی دەبا. ئەو بەشێکی بەرچاوی ساڵانی تەمەنی لە زیندانەکانی ڕێژیمی شادا گوزەراندبوو. لە نێوەڕاستەکانی بانەمەڕی ١٣٤٧ (١٩٦٨)دا، هوووەیدا لە ڕێگای هومایوونی

جابیرئەنسارییەوە، کە تازە هاتبۆ نێو ڕیزی ڕاوێژکارانی هوورەیداوەو هەرلەوکاتەدا خزمی فرووهەر بوو، ئەوی بۆ دیدارێکی دۆستانە بانگ کردە دەفتەری سەرۆکوەزیر. ڕێبەندانی١٣٥٧(١٩٧٩)، کاتێک هوورەیدا بڕیاری دا خۆی تەسلیمی کاربەدەستانی دەوڵەتی ساوای شۆرش بکا، فرووهەرو جابیرئەنساری هەردووکیان نەخشێکی گرنگیان لە چەندوچۆنی ئەو داستانەدا یاری کرد. ئەوکاتە فرووهەر لە وەزیرانی کابینەی دەوڵەتی کاتیی شۆرش بوو، بەڵام ساڵی١٣٤٧، ڕێبەری گرووپێکی چووکەڵە بوو کە بەخۆی دەگوت حیزبی میللەتی ئێران‌و بە ناسیۆنالیزم‌و لایەنگری لە بیروباوەڕی دژی مارکسیستی بەناوبانگ بوو.

باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە ئێران لەوکاتەدا ڕاپۆرتێکی لەم دیدارە ئامادە کردبوو. دەبینین کە "هوورەیدا پۆستی ڕاوێژکاری یەکێک لە وەزارەتەکانی بە فرووهەر (کە لەجێدا، وەکیلی دادگایە) پێشنیار کردوە. تەنیا مەرجیشی ئەوە بووە کە فرووهەر دەست لە دژایەتی دەگەڵ ڕێژیم هەڵبگرێ... هوورەیدا فرووهەری وەک ڕێبەرێکی سیاسی پەسن دا، بەڵام هەرلەوکاتەدا جەختی کردەوە کە درێژەدانی بەربەرەکانی دەگەڵ ڕێژیمی شا کارێکی بە تەواوی خۆڕایی‌و بێسوودە."[٢٥] فرووهەر قبووڵی نەبوو*. بەڵام هەوڵی هوورەیدا لەو بارەیەوە دەبێ بە درێژەی سیاسەتێک بزانین کە لە سەردەمی مەنسووردا دەست پێکرابوو. ئەگەرچی هوورەیدا، لەجێدا، لە مەنسوور بەپارێزتر بوو و هەرگیز سەبرو پارێزی وەلا نەدەنا، بەڵام وردەوردە توانی دەوڵەتی خۆی بکاتە جۆرێک هاوپەیمانی هێزە جۆراوجۆرەکان. کۆتایی ساڵی١٣٤٣(١٩٦٥)، هوورەیدا لە پرۆژەی سەرەتایی وتارێکدا، دوورەدیمەنی هەوڵەکانی بۆ

---

* کۆتاییەکانی ساڵی١٣٧٧فرووهەر،دەگەڵ هاوسەرەکەی پەروانەی ئەسکەندەرپوور،بە شێوەیەکی دڕندانە لە ماڵەکەی خۆیاندا کوژران. چەند کەس لە مەئموورە ئەمنیەتیەکانی کۆماری ئیسلامی دانیان بەوەدا نا کە ئەو تاوانە بەدەستی وان ئەنجام دراوە.

ڕاکێشانی هێزەکانی نەیاری ڕێژیمی خستبووە بەرچاو.

بۆ جێبەجێکردنی بەرنامەکانی دروستکردنەوە، شا پێویستیی بە هاوکاریی لاوانی پسپۆڕ هەبوو. لەو کاتەدا وامان هاتە بەرچاو کە هەلومەرج بۆئارەزووی لەمێژینەمان، واتە دەرهێنانی ئابووریی وڵات لە دواکەوتوویی ئامادەیە. دیارە بنیاتنانی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی کارێکی ئاسان نیەو پێویستیی بە هاوکاریی هەزاران کەس هەیە. کۆمەڵێک لە لاوانی دەرس‌خوێندوو باوەڕێکی شەوتۆیان بە شاو دەوروبەرەکەی(کە زۆرتریان سیاسەتمەداری پیرو پیاوماقووڵان بوون) نەبوو و لە هاوکاری‌کردنیدا دوودڵ بوون.

تویێژی دەرس‌خوێندوو کەوتبووە سەر دووڕێیانێک: درێژەی دژایەتی‌و هەرنەبێ بێ‌موبالاتی بەرامبەر بە شاو تاقمی دەسەڵاتدار یان دەستپێکردنی هاوکارییەکی بەرتەسک‌و واقیعبینانە بۆ پیادەکردنی بەرنامەکانی چاکسازی. ئەم وەچە لاوە پێکهاتبوو لە:

١) لایەنگرانی موسەددیق‌و بەرەی نیشتمانی؛
٢) توودەییەکان؛
٣) لیبراڵەکان؛
٤) ناسیۆنالیستەکان؛
٥) مەزهەبییە پێشکەوتنخوازەکان؛
٦) کەسانێک کە سەر بە هیچ گرووپێکی سیاسی‌و فەلسەفی نەبوون.[٢٦]

بەباوەڕی هوەویدا، سەرکەوتنی کاری "دروستکردنەوە"ی کۆمەڵ بە "هاوکاریی "بەرتەسک"(یان بە جۆرێکی دیکە "مەرجدار") دەگەڵ بادشایەتییەوە بەسترابۆوە. بەتایبەتی کە شا سیمبولی یەکبوونی وڵات بوو.[٢٧] ئەمڕۆ بە لێبڕاوییەوە دەتوانین بڵێین کە هوەیدا بۆخۆی بە یادەو بەڵێنەکانی خۆی وەفادار نەبوو. بەرەبەرە هاوکارییە "بەرتەسک‌و مەرجدار"ەکەی بوو بە تەسلیمبوونی تەواو بەرامبەر بە هەموو داخوازو فەرمانەکانی شا. هەرلەوکاتەدا، لەم سەردەمەشدا هەروەک جاران هەوڵی دەدا ڕەوتە جیاوازە فکری‌و سیاسییەکان ڕاکێشێتە نێو

کابینەکەی خۆی. ئەگەر سەیری پێکهاتەی کابینەی هوەیدا لە سەرەتای دەیەی پەنجادا بکەین دەبینین کە بەشێک لە ڕەوتە سیاسییەکانی وڵات لە دەوڵەتدا ئامادە بوون. بۆ نموونە، لە یەکێک لەو کابینانەدا، حەوت وەزیر لە کۆنە توودەییەکان بوون. هەر لەوکاتەدا هوەیدا بەنیاز بوو تێکۆشانی حیزبی توودە بکاتە قانوونی. دەیەویست هەلومەرجێک پێک بێنێ کە ڕێبەرە ڕاکردووەکانی حیزب بگەڕێنەوە ئێران.[28] وەک لە ڕاپۆرتی یەکێک لە کاربەدەستانی بەرپرسی باڵیۆزخانەی شووڕەوی لە ئێران دەردەکەوت، سەرەنجام ملنەدانی شا بوو بە هۆی جێبەجێ-نەبوونی ئەو پڕۆژەیە.[29]

فەریدوونی مەهدەوییش لەو سەردەمەدا ئەندامی کابینەی هوەیدا بوو، هەرئەویش، لە سەرەتای دەیەی چلی[هەتاوی]دا، لە گرنگترین و چالاکترین و گەنجترین سەرانی بەرەی نیشتمانیی ئێران بوو. ئەو زۆرجار لە دیداری نوێنەرانی باڵیۆزخانەی ئەمریکادا، دژایەتیی توندی خۆی نەکهەر دەگەڵ شا بەڵکوو دەگەڵ مەنسوورو هوەیداش ڕاگەیاندبوو. بۆنموونە، لە یەکێک لە دیدارەکاندا، مەهدەوی لە پێشدا لەسەر داستانی پڕۆژەی پارێزراویی ڕاوێژکارانی ئەمریکایی و ئەندامانی بنەماڵەکانیان بە توندی ڕەخنەی لە دەوڵەتی ئەمریکا گرت و ئەمجار بە زمانێکی زۆر توندو پڕهەست ڕەخنەی لە دەوڵەتی مەنسوور بە گشتی و لە سیاسەتە ئابوورییەکانی بە تایبەتی گرت...و زۆر بە توندییش هێرشی کردە سەر ڕەفتاری دەوڵەتی مەنسوور دەگەڵ مەلاکان.[30] بۆچوونی مەهدەوی لەبارەی کابینەی هوەیداشەوە زۆر فەرقی نەبوو و ڕاوێژێکی یەکجار توندی هەبوو.

دیارە ئەوەی مەهدەوی لەو دیدارانەدا دەیگوت بە ڕواڵەت بیروبۆچوونی خۆی بوو، نەک هەڵوێستی ڕەسمیی بەرەی نیشتمانیی ئێران. لە یەکێکی دیکەی ئەو دیدارە نارەسمییانەی باڵیۆزخانەی ئەمریکا دەگەڵ یەکێک لە ڕێبەرانی بەرەی نیشتمانیدا، شاپووری بەختیار گوتبووی کە "پێی وایە دەوڵەتی هوەیدا چەند بەرابەر لە دەوڵەتی مەنسوور باشترە." دەیگوت هەرچەند ئەم دەوڵەتە تائێستا کارێکی

ئـەوتۆی نـەکردوە، بـەلام هووەیـدا [لـەچاو مەنسـوور] پیـاوێکی متمانـەپێکراوترەو بەپێچەوانـەی مەنسـوور وادەی پـووچو بـەتاڵ کـەمتر دەدا[*][31].

دیـارە وتـوویرەی دەسـەلات بەرەبـەرە زەبـری لـە ڕووحیـەی هیواداری هووەیدا دەدا. هەر لەوکاتەدا، ئۆگرییەکەی بە دروسـتکردنی یەکیەتی لە نێوان ڕووناکبیرانی نەیاری ڕێژیمدا لە پێشوو کەمتر دەبوو. وا دیار بوو هەرچی زیاتر لە دەسەلاتدا دەمایەوە ڕووحیـەی پڕهیواشـی دەبووە جۆرێک ڕەشبینیو نائومێدی. دوای ماوەیەک هەوڵەکەی پتر ئەوە بوو کە بە دانی دراوێک، نەیارانی ڕێژیم بێنێتـە ڕیزی لایەنگرانو ناچـار بـە سـازانیان بکـا. قـەراردادی دەوڵـەتیی دەدا بـە هێنـدێکانو بـۆ هێندێکی دیکە مووچەیەکی دیاری دەکرد کە هـەموو مانگێک بێئەوەی بچنە شوێنی کار، وەریان دەگرت. جاری وابوو هووەیدا لـە بوودجەی نهێنیی سـەرۆکوەزیر کـەلکی وەردەگرتو کۆمـەگی بـەو ڕوونـاکبیرە نەیارانـە دەکـرد کـە لـەباری ماڵییـەوە دەسـتەنگ بـوون.[32] هێنـدێ ڕووحانییش بەشێکی بەرچاو لەو یارمەتییانـەیان وەردەگرت. یـەکێک لـە ئەڵقە سـەرەکییەکانی پێوەندیی هووەیدا دەگـەڵ ڕووحانییەکان هیدایـەتی ئیسـلامینیـا بـوو. ناوبـانگی خـەراپ بـوو، گۆیـا بـەهۆی دۆسـتایەتیی هووەیداوە سامانێکی زۆری، ڕەنگە لە ڕێگای ناڕەواشـەوە، وەسـەریەک نـاوە.[33] لە سـەروبەندی شۆڕشـدا ئەو وەک ئەڵقـەی پێوەنـدیی دەوڵـەت دەگـەڵ ڕووحانییـەکان، بەتایبـەتی ئایـەتوڵلا شـەریعەتمەداری نەخشـێکی

---

* لە کۆماری ئیسلامیدا ڕاپۆرتی باڵیۆزخانە لە بـارەی هێنـدێک لـەو وتووێژانـەوە وەک چـەکێکی سیاسـی بـە دژی نـەیارانی خۆیـان بـەکار دەبـەن. لـە کتێبی"نێوبژیوانـە باشەکانی ئەمریکا"دا دەتوانی نموونەی بەرچاوی ئـەو هەولانـە ببینـی. مەبەسـتم لـە ئاماژە بـەم وتووێژانـە بـە هـیچ جۆر دروسـتکردنی گومـان لـە سـەر ڕەسـەنایەتیی سیاسیی ئەو کەسانە نیە کە چاویان بە باڵیۆزخانە دەکەوت. بە باوەڕی من زۆربـەی ئەو دیدارانە دەکەونە بەر چەمکی وتـووێژی ڕەوای سیاسـەتمەدارانو نـەیاران دەگـەڵ باڵیۆزخانەیەکی بێگانە.

گرنگی یاری کرد.[24] دوای شۆرش، لە ترسی گیانی خۆی لە ئێران ڕای-کردو پەنای بۆ ئەمریکا برد. بەڵام لەوێ چارەنووسێکی شووم چاوەڕێی بوو. یەکێک لە کوڕەکانی ئیسلامی‌نیا سەر بە تاقمێک بوو کە دواتر بە جووچکە میلیاردێر" بەناوبانگ بوون. بە کۆمەگی ئەو کوڕە نارەسەنە، باوکیان بە زۆر لە ماڵەکەی ڕفاندو داوای ژمارە حیسابەکانی بانکەکانی سویسیان لێکرد. دەیانەویست بیترسێنن. گوتیان هەتا ژمارە حیسابەکانیان نەداتێ، بەرەڵلای ناکەن. دەیانەویست بی‌بەنە ماڵێکی ئەمین. بۆیە لە سندووقی پشتەوەی ترومبێلێکدا شاردیانەوە. بەڵام وا دیارە دڵی ئیسلامی‌نیا بێ‌هێز بووو بەرگەی ئەو فشارانەی نەگرتو لە ئاکامی وەستانی دڵدا، هەر لەنێو سندووقەکەدا گیانی دەرچوو. کوڕەکەی چەند ساڵان بە تاوانی هاوبەشی لە کوشتنی باوکیدا لە زیندان بوو. ئەوو بنەماڵەکەی هەمیشە جەختیان دەکردەوە کە بێ‌گوناحەو وابوو لە دوامانگەکانی ساڵی ٢٠٠٠دا دادگاکانی کالیفۆرنیا حوکمی ئازادی-یان بۆ دەرکرد. دیارە هۆی ئازادکردنەکەشیان نەک بۆ بێ‌گوناحیی خۆی، بەڵکوو بۆ هەڵە قانوونییەکانی دادگاکانی پێشتر گەڕاندەوە.

بەهەرحاڵ، لە سەردەمی هووەیدادا، جگە لە بوودجەی نهێنیی سەرۆکوەزیری، ئیدارەی ئەوقافیش هێندێ جار دراوێکی دەدا بە ڕووحانییەکان. بەڵام بە پێچەوانەی ئەوەی خەڵک بۆی دەچن، ئەم ئیدارەیە هەرگیز کاناڵی سەرەکیی دانی دراو بە ڕووحانییەکان نەبوو.[25] بە وتەی نەسیری عەسسار، کە لە سەردەمی هووەیدادا چەندین ساڵ سەرۆکی ئیدارەی ئەوقاف بوو، ئەوقاف زۆرترین وەخت دراوێکی بەدەستەوە نەبوو. جگەلەوە، ئەگەر هەق‌وحیسابێکیش دەدرا بە ڕووحانییەکان زۆروەخت نەدەچووە گیرفانی لایەنگرانی جیددیی ئایەتوڵڵا خومەینی."چونکە هیچکام لەو ئاخوندانە حازر نەبوون دراوی دەوڵەت وەربگرن."[26] دەیگوت زۆربەی ئەو ڕووحانییانەی دراویان وەردەگرت نفووزێکی وایان نەبوو. ئەگەریش پێویست بایە دراوێکی زۆر بدرێ بە ڕووحانییەکان، عادەتەن دەوڵەت بوودجەیەکی تایبەتیی بۆ ئەوکارە دیاری دەکرد. بۆنموونە، کۆتاییەکانی دەیەی چل، هاوکات

بۆو دەگەڵ دەستپێکردنی خەباتی بەربڵاوی کوردەکانی عێراق بە دژی دەوڵـەتی ئـەو وڵاتـە. دەوڵـەتی ئێرانیش بـۆ پێشـگیری لـە پەیدابوونی ئاڵۆزی لە نێو کوردە ئێرانییەکاندا، بڕیاری دا ساڵێ میلیۆنێک تمەن بدا بە ڕووحانییە کوردەکان. بوودجەی ئەوکارە دەوڵەت دابینی کرد، بەڵام دراوەکە لەڕێی ئیدارەی ئەوقافەوە بڵاو دەکرایەوە.[٣٧]

زەحمەتە بتوانین دیاری بکەین کە ڕەشبینیی هوەیدا لە کەنگێوە دەستی پێکرد. لە کەیەوە هیوا بە ڕاکێشانی هاوکاریی نەیارانی وەلا نا؟ یەکێک لە هاوکارانی هووەیدا پێی وایە لـە سـەرەتای دەیـەی پەنجاوە، هووەیدا یەکسەر هاتە سەر ئەو باوەڕە کە: "هەمووکەس دەتوانی بکڕی. تەنیا جیاوازی لە نرخی کەسەکاندایە."[٣٨] هەر لەو ساڵانەدا بوو کە هێزە نەیارەکان بە گاڵتە بە ڕێژیمیان دەگوت: "بێچووە کۆمۆیستانێک کە لە کـۆلێژی ئـابووریی لەنـدەن دەرس دادراون."[٣٩] تەنانـەت گاڵتـەیان بـەو دەسـتەیە لـە دۆستانیشـی دەکـرد کـە جاروبـار پێوەندییـەکیان دەگـەڵ نەیارانی ڕێژیم دەگرت.[٤٠] زۆرترین وەخت جۆرێک پێپێکەنین کە چـە-شـنە سـووکایەتیپێکـردنێکیش شـەپۆلی تێـدا دەدا، لەسـەر گۆشـەی لێوەکـانی دەبینـرا. دەڵـێن پێکـەنین یـەکێک لـە حاڵەتـە دەگمەنـەکانی ڕوخسـاری مرۆڤـە کـە هـەموو کاتێـک، لای هـەموو فەرهەنگـەکان، بـە شـێوەیەکی یەکسـانو سروشـتی دەردەکـەوێ. بـەڵام وا دیـارە سیاسـەتبازان زمـانێکی تایبـەتیی پێکـەنینیان هەیـە. هووەیـدای سـاڵانی پـەنجاش سیاسـەتبازێکی تـەواو عـەیار بـوو. وەختێـک پێکـەنینی ڕێـزو زەمانێک پێکەنینی ڕێوشـوێنە ڕەسمییەکان، ساتێک پێکـەنینی تەسلیمو دەقیقەیەک پێکەنینی ڕەخنە یان سووکایەتیی بە ڕوخسارەوە دیار بوو. لەڕاستیدا هەم ڕووحی هیواداری یەکەمین ساڵەکانی سەرۆکوەزیریو هەم گومانو ناهومێدیی دەورەکانی دواتر دەتوانی لە "بیرەوەرییەکانی سەردەمی شەڕ"دا ببینی.[٤١]

هووەیدا کاتی خۆی ئەم بیرەوەرییانەی لە ساڵی ١٣٢٠ (١٩٤١)دا نووسـیون. لـەو سـەردەمەدا بەتونـدی سـەرقاڵی خوێندنـەوەی

بەرهەمەکانی ئاندرە ژید بوو. هەرلەو کاتەدا لە بەرهەمەکانی نووسەرانی ئێگزیستانسیالیستیش ورد ببۆوە. جۆرێک ناهومێدیی بوونناسی ، چەشنە دڵساردییەک لە ژیانی سۆزدارانەو ئەستێوری چەرخی تازە، و سەرەنجام نائومێدی لە نزمیو بێخێریی مرۆڤی نوێخواز دەتوانی لەم یادداشتانەدا ببینی. لە بەشێکدا کە دیمەنو ڕادەی دڵساردییەکەی ڕشانەوەکەی ژان پۆل سارتەر وەبیر دێنێتەوە، هووەیدا دەڵێ: "ئەمنیش کە بیرم لە نزمیو چارەڕەشیی مرۆڤ دەکردەوە حاڵەتێکی سەیری ڕشانەوەو دڵپێکداهاتنم لەخۆمدا هەست پێدەکردو وشە پڕژانەکانی بوودلێرلە بارەی تەرمی بۆگەنی مرۆڤەوە جارێکی دیکە بەسامو شکۆیەکی تایبەتییەوە لەبەر چاوم زەق دەبوونەوە.

هەرلەوکاتەدا، زمانی ترسناکی دەورانی شەڕ، چاوچنۆکیی ماڵپەرستانو دەلالانی بازاڕی ڕەشی بڕۆکسێل هووەیدایان وا تووڕە کردبوو کە پەخشانە سادەو ڕەوانو دوورلە دروشمدانەکەی، لەنەکاو لە باسی ئەو قازانجپەرستانەدا ڕۆحێکی تازەی وەردەگرت. بە ڕاوێژێکی توندو ئازاردەر ڕەخنەی لە نیزامی سەرمایەداریو هەڵکشانو داکشانەکەی دەگرت. ئاماژەی بە "بازرگانێک دەکرد کە خوێنی هاونەوعی خۆی دەمژێ" و بە گاڵتەوە، باسی سەرمایەدارێکی دەکرد کە "خۆی بە ئاغاو فەرماندەری کرێکارانو ژێردەستانی خۆی" دەزانی. بە زمانی شاعیرێکی ڕوومانتیک، گاڵتەی بەو ڕاستییە دەکرد کە لە سەدەی بیستدا دراو چارەسەری هەموو گیروگرفتەکانە. دەیگوت"لە سەدەی بیستدا لە هەموو جێیەک چارەسەری هەموو گیروگرفتەکان ئەسکیناسی بانکەو لە هەر کوێوە بڕوانی سەرچاوەیەکی جوانیو شیعری تێدا دەبینرێ."[٢٤] زرینگانەوەی بەرهەمە مارکسیستییەکانی سەردەمی لاوەتییەشی دەتوانی لەو ڕستەیەدا ببینی.

دەگەڵ ئەم ئۆگرییە بە بیروباوەڕی شۆرشگێڕانەوە، جۆرێک بیرکردنەوەو ئایندەبینیی سیاسی، شێوەیەک لەخۆپارێزیو دووربینیی ئەرەستوویيو باوەڕی گومانهەڵنەگر بە توانای ڕزگاریدەری پیاوانی سیاسەتیش دەتوانی لەم نووسراوەدا پەیدا بکەی. ئەو دەڵێ: "ئەرکی

پیرۆزی سیاسەتمەدارانە" کە جیهان لە دۆزەخی "گیانی خەراپکاری" مرۆڤ ڕزگار بکەن. باوەڕی وایە، دیسان ڕەحمەت لە بابی پیاوانی سیاسەت. ئەگەر ئەوان نەبایەن، ئێستا دنیا لە ئاگری خەراپکاریدا ببوو بە وێرانەیەکی سامناک."[420] دەڵێ ئەم دەستەیە تەنیا وەختێک دەتوانن ئەرکی مێژوویی خۆیان بەجێ بگەیەنن کە پێ بنێنە مەیدانی سیاسەتەوە. وادیارە دەیەوێ بەم قسانە بۆ هەموو خوێنەرێک ڕوون بکاتەوە کە ئەو بۆخۆی بۆچی سەودای دەسەڵاتی لەسەردا بووو بە چ هیوایەک ئۆگری دنیای سیاسەت ببوو. ئێرانییەکان عادەتەن سیاسەت، وەک پیشەیەک بە چاوی گومانەوە سەیر دەکەن. هووەیدا دەیەویست ئەو دڵساردیو بێمتمانەییە لەنێو بەرێ. دەیەویست بۆخۆی وەک نموونەو نوێنگەی نێوەرۆکێکی تازە لە سیاسەت دەربکەوێ.

لەڕاستیدا وا دیتە بەرچاو کە هووەیدا دەیەویست لەڕێگای بابەتەکانی نێو "بیرەوەرییەکانی سەردەمی شەڕ"ەوە بەربەرەکانی دەگەڵ دوو جۆر بۆچوونی دژبەیەکی سیاسی بکا. هەرچەند هەرگیز ڕاستەوخۆ ئاماژە بەو کەسانە ناکا، بەڵام دەتوانی سێبەری قورسی وان لە هێندی بەشی گرنگی یادداشتەکاندا هەست پێبکەی. بە لەبەرچاوگرتنی ئەمە دەکرێ وا دابنێین کە هێندێ پێویستیی سیاسیی ڕۆژ ، هووەیدایان بۆ هەڵبژاردن یان جەختلەسەرکردنی ئەو بەشە لە یادداشتەکانی پاڵ پێوە ناوە. تەنانەت دوور نیە کە هەر لەبەر ئەو ململانە سیاسییانەش، لانی کەم هێندێک لەو بەشانەی لە ساڵی١٣٤٥دا خستبێتە سەر "بیرەوەرییەکانی سەردەمی شەڕ". دیمەنو هەڵوێستی نووسەر لەم بەشانەدا وەک دیمەنو هەڵوێستی لاوێکی ئێرانی لە ئورووپای شەڕلێدراو ناچێو زیاتر وەک دەنگی سیاسەتمەدارێک دەچێ کە دەگەڵ پاڵەپەستۆو دەستەبەندیی جۆراوجۆری سیاسی بەرەوڕوو بێ.

بەهەرحاڵ، یەکەم بۆچوون کە هووەیدا لەم بەشانەدا دەگەڵی بە کێشە هاتبوو، هی کەسانێک بوو کە هەرچەشنە چالاکییەکیان لە چوارچێوەی نیزامی ئەوکاتدا بە بێهوودە دەزانی. دەتوانین ئەوان بە

نوێنگەی جۆرێک لە نەبوونبینیی سیاسی بزانین کە لەو ساڵانەدا بەسەر مێشکو زمانی زۆر لە ڕووناکبیرانی ئێراندا زاڵ ببوو. خۆش ئەوەیە ڕیشە مێژووییەکانی ئەو نەبوونبینییە هەم لە ئیلاهییاتی شیعەدا دەکرێ بدۆزینەوەو هەم لە تیئۆریی شۆرشگێڕانەی عورفیی سەدەی نۆزدەیەمدا[*] بۆ نیزیکی هەزار ساڵ زۆر لە ئیلاهییاتناسەکانی شیعەگەری پێیان دادەگرت کە دەسەڵاتی عورفی، لەجێدا زەوتکەرانەیە. دەیانگوت تەنیا دەسەڵاتی ڕەوا، هی ئیمامو جێگرەکانیەتی. هەرلەوکاتەدا، هاودەستیو هاوکاریو تەنانەت بەقسەکردنی هەر حکوومەتێکیان کە مەشرووعبوونی خۆی لە خەڵک زانیباو گوێی بە مەشرووعیەتی ئاسمانی نەدابایە، بە گوناحو ناپەسند دەزانی. ئایەتوڵڵا خومەینی لەڕاستیدا تەنیا دوا بانگەوازکەری ئەوجۆرە بیرکردنەوەیە بوو.

ڕووناکبیرە شۆرشگێڕە عورفیڕەوشتەکان هەرنەبێ لەولایەنە گرنگە، واتە ئینکاری ڕەوایی دەوڵەتە دەسەڵاتدارەکاندا، دەگەڵ ئیلاهییاتی شیعەگەری هاوڕا بوون. ڕیشەی فکریی ئەو ڕووناکبیرانە دەبێ لە نەبوونبینیی فکریی ڕووسی لە چەرخی نۆزدەدا ببینین کە چەندوچۆنی بیرو کردەوەیان دەکرێ لە"باوکانو کوڕان" توورگنیفو "جندارەکان"ی داستایوسکیدا بە ڕوونی ببینین. ئەم دەستەیە لە ڕووناکبیرانی ڕووس هەرجۆرە هەوڵێک بۆ چاککردنی نیزامی سەرمایەداری یان زۆرداریی سیاسییان نەکهەر بە کارێکی غەڵەت

---

[*] نیکۆلای بێردیاییف لە کتێبێکی گرنگدا،هێندێ وێکچوونی جەوهەریی لە نێوان بۆڵشۆڤیزمو چەند لایەنێکی گرنگی بیروبۆچوونی ئۆرتۆدۆکسی مەسیحییەتی ڕووسیدا نیشان داوە. بە باوەڕی من ئەگەر بێتو ڕیشەکانی بیروباوەڕی شیعەگەریو مارکسیزمی ئێرانی بە شێوەیەکی جیددیو بەراوردی بخەینە بەر لێکۆڵینەوە،وێکچوونی زۆریان لە نێودا دەبینین. کتێبی بێردیاییف دوکتۆر عینایەتوڵڵای ڕەزا کردوویەتە فارسیو ناوی ناوە ڕیشەکانی کۆمۆنیزمی ڕووسی. بە داخەوە نوسخەیەکی ئەو کتێبەم بە دەستەوە نەبوو و تەنانەت ناوی کتێبەکەشم بە وردی لەبیر نیە.

بەڵکوو بە زیانباریش دەزانی. ئاکام ئەوە بوو کە ڕووناکبیران ئۆمێدیان بە ڕووخاندنی تیئۆریو لەفزیی نیزامی فەرمانڕەوا بەست. هەموو دەوڵەتێکیان بە چاوی بێ متمانەیی دەدیتو باوەڕیان بە هیچ چاکسازییەک نەبوو کە دەوڵەت هەنگاوی بۆ هاویشتبێ. هووەیدا لە تێکەڵیی بە نیسبەت بەربڵاوی خۆی دەگەڵ ڕووناکبیرانی ئێراندا، تامی ئەو بێباوەڕیو نەبوونبینییەی چێشتبوو. بە ڕواڵەت بە ئاماژە بەو ئەزموونانە بوو کە دەیگوت: "ئێمە ی ئێرانی بە قسە دەژیین. تەواوی ژیانو تەواوی فەلسەفەی ئێمە بریتییە لە مستێک ناکۆکیی بێهوودەو بێمانا دەربارەی وشەکان... هەموو چاکسازییەکانمان بە وشە دەکەینو هەموو کارەکان بە زمان ئەنجام دەدەین، بەڵام هەرکە نۆرەی کارکردن دێ، هەموو دەڵێن، بابە لێی گەڕێ. چما چاک دەبێ."[٤٥]

لایەنێکی دیکەی قسەی هووەیدا لەو یادداشتانەدا هێزێک بوو هەر بەو ڕادەیە هەمووگرو جێی مەترسی. بانگەوازکەرانی، سیاسەتبازانی نەریتیی ئێران بوون کە بە وتەی هووەیدا باوەڕێکی پتەوو دۆن-کیشۆتانەیان بە لێزانیی خۆیانو دروستیی بۆچوونەکانیان هەبوو. ئەو بە زمانێکی زۆر توند ئاماژەی بە "کۆڕوکۆمەڵە نائومێدکەرەکانی وڵات" دەکردو دەیگوت ئەمانە "هەموو شتێک لە نێوان بێحاڵیو متمانەی نەزانانە بەخۆیاندا نابووت دەکەن." هەرلەوکاتەدا، "ئازایەتیی هەموو ئەو لاوانە کە ئامادەن بەهەر ئامرازێکو بەهەر قیمەتێک بۆ خزمەت بە نیشتمانو دانیشتووانی فیداکاری بکەن، لە بەین دەبەن."[٤٥]

دەبێ لەبیرمان بێ کە هووەیدا ئەم قسانەی لە ساڵی سێیەمی حکوومەتەکەیدا چاپ کردوون. ئاماژە ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆکانی دەتوانین بە پێکهاتەی دەسەڵاتی ئێرانی ئەو سەردەمە لێک بدەینەوە. لەو ڕۆژانەدا چەند ناوەندی دەسەڵات لەکاردا بوون کە هەموویان سەرەنجام بە دەوری شادا دەخولانەوە. یەکێک سەربە شاژن بوو. ئەوی دیکە دەبووە لایەنگری ئەشرەفی پەهلەوی. سێیەم بەستراوە بە ساواک بوو. دیارە سەرسەختترین دژبەری هووەیدا لە تەواوی دەورانی سەرۆکوەزیرییەکەیدا ئەسەدوڵڵای عەلەم بوو.

بیرەوەرییەکانی عەلەم کە پاش مردنی چاپ کراون پڕن لە ڕەخنەی توند لە هووەیداو جنێوی زۆر ناشیرن.[46] هووەیدای بە"دەلقەک"و "پشتکووڕی نۆتردام" ناو دەبرد. دەیگوت خائین"ەو بۆ "قوون-لستنەوەی" ئەمریکاییەکان کیسنجێری لە تاراندا دەبردە گەڕان.[47] لە ڕاستیدا بە پێچەوانەی پێوەندییەکی بەڕواڵەت دۆستانەو تێکەڵبەڕێز کە لەنێو عەلەمو هووەیدادا هەبوو، قوونەشەڕێکی هەمیشەیی لە نێوان ئەم دووانەدا هەبوو.

ڕوانگەی سیاسیی هووەیدا لە "بیرەوەرییەکانی سەردەمی شەڕدا" دەگەڵ دوو ڕوانگەی پێشوو، کە یەکیان هەرجۆرە چاکسازییەکی بە نامومکین دەزانیو ئەوی دیکە نکوولیی لە پێویستیی بەشداریی بەرینی خەڵک لە بڕیارداندا دەکرد، ناتەباییەکی ئاشکرای هەبوو. ئەوەی بۆ هووەیدا گرنگ بوو کردەوە بوو. دیارە مەبەستی کردەوەی شۆڕشگێڕانە کە ڕیشەی لە خەونە نەناسراوەکاندا بووو زۆربەی وەختیش ناکام دەردەچوو، نەبوو. ئەو خوازیاری کردەوەیەکی هەڵسەنگاو، تێکەڵ بە مەسڵەحەتو هەنگاوبەهەنگاو بوو. هووەیدا دژایەتییەکی لەئاشتینەهاتووی دەگەڵ بیرو ئەندێشەی ڕادیکاڵ هەبوو. هەرلەوکاتەدا، لەو کەسانە کە بەهەر هۆیەک لە قەراغ دادەنیشتن -چ ئەوانەی لە شکان دەترسانو چ ئەوکەسانەی ئامانجە نادیارەکانیان بە پیرۆز دەزانی- بێزار بوو. پێی وابوو تەنیا کردەوەیەکی تێکەڵ بە مەسڵەحەت کە بە حەوسەلەوە لە شارەزایی تەکنۆکراتییەوە هاتبێ دەتوانێ کۆمەگێک بە چارەسەری گیروگرفتەکانی کۆمەڵی ئێران بکا. ئەو ڕۆژانە کە هێشتا ناهومێدیو ڕەشبینی دەوری بیروبۆچوونی وی نەدابوو، ئەو خۆی بە نوێنگەی ئەو هێزانە دەزانی کە دەتوانن دیموکراسیو لێبووردەیی سیاسی بۆ کۆمەڵی ئێران بە دیاری بێنن. دەیگوت: "گەورەترین کەسانێک کە تا ئێستا کاریان بۆ مرۆڤایەتی کردووەو خزمەتیان بە خەڵک گەیاندوە، سیاسەتمەدارانی گەورەن. وەختێک ئەو پیاوانە دەکەونە کارو جڵەوی کارەکان بەدەستەوە دەگرن، ئەودەم دەتوانن بیروبۆچوونەکانیان وەکار بخەنو لە ڕێگای

پێشکەوتن‌و بەختیاریی گەلانی جۆراوجۆردا تێ‌بکۆشن. ئەوە ئەرکی سیاسەتمەدارانە کە بە ئامرازی جۆراوجۆر دەرەتانی پێشکەوتنی گەلان پێک بێنن، [48]

هوەیدا هەرلەو کاتەدا باوەڕی وابوو کە جگە لە هۆکارە سیاسییەکان، نەریتە فەرهەنگییەکانیش دەتوانن وەک بەربەست، ڕێگا لەو جۆرە چاکسازیخوازییە کەدڵخوازی خۆیەتی بگرن. بە ڕاوێژێکی ڕاستگۆیانە دەیگوت: "هەرچی بێ، ئەمن لە قووڵایی خۆمدا ئێرانیم‌و پێم وایە مرۆڤ هەرکات ئەجەلی هات دەڕوا. "باوەڕی وابوو کە لە ئێران هەموو کەس "دەیەوێ سەرۆک بێ." دەی‌پرسی کە "باشتر نیە پێش گۆڕینی نەزمی وڵاتی خۆیان... ژیانی بنەماڵەیی‌و کۆمەڵایەتیی خۆیان ڕاست بکەنەوە." [49]

هەرچەند لەوقسانە بە ئاشکرا دەردەکەوێ کە هوەیدا زۆر باشی ئاگا لە نەخشی مەسەلە فەرهەنگییەکان لە ئاڵوگۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا هەبووە، بەڵام بە کردەوە، لە سەردەمی حکوومەتی خۆیدا بوو بە کلکەی شا کە هەمیشە ئاڵوگۆڕی ئابووریی وەپێش ئاڵوگۆڕی سیاسی دەخست. هەروەک لە یادداشتی نهێنیی۱۹٦۸ی سیادا هاتوە: "پرۆژەی شا بۆ ئایندەی ئێران لەسەر هەڵدانی ئابووری دانراوە، نەک سیاسی...ئەو پێی وایە هەڵدانی خێرای سەنعەتی نەک‌هەر بنەڕەتییەو سامانی نەتەوایەتی زیاد دەکاو دەستەبەری کۆمەڵایەتییە، بەڵکوو هەرلەو کاتەدا بۆ ئێرانییانی دەرس‌خوێندووش ڕێگایەکە کە ئەوان لە چالاکیی دژی ڕێژیم دەگێڕێتەوە." [50] لە کۆتایی ئەم ڕاپۆرتەدا، تووشی ئاکام‌وەرگرتنێکی گرنگ دەبین کە داهاتووی شا بە وردی پێش‌بینی دەکا: "هەرچەند ئەم [هەڵدانە سەنعەتییە] لە درێژخایەندا جێی نەخشی سیاسیی پتر بۆ توێژی دەرس‌خوێندووی ئێران ناگرێتەوە، بەڵام لە کورت‌خایەندا توانیویەتی نائارامییە سیاسییەکانی ئەم ساڵانەی دوایی لەنێو بەرێ." [51]

لەبارەی هوەیداوە، ڕیشەکانی ئەو جۆرە بۆچوونە "ئابووری-لێدراو"ە، یان وەک بەرهەمە مارکسیستییەکان ناوی دەنێن "ئیکۆنۆمیزم"

دەبێ لە لایەنی جۆراوجۆری ئەزموونو ئۆگرییە فکرییەکانیدا وەبینین. بۆچوونــە سیاسـییەکانی وی لــە ســاڵەکانی دەیــەی دووەمــی ســەدەی ئێستای هەتاویدا دروست ببوون. واتە ڕاست ئەو ساڵانە کە مارکسیزم، و بەتایبـەتی ڕیوایەتـە سـتالینییەکەی تووشـی جۆرێک بیـری دەوڵـەت-لێـدراوو ئـابووریلێـدراو هـاتبوو. زۆربـەی مارکسیسـتەکانی ئـەو سەردەمە، بە چاولێکەریی ستالین، پێیان وابوو ئەگەر بتوانی ژێرخانی ئابووریی کۆمەڵ بگۆڕی، سەرخانی فەرهەنگیو سیاسییش هەر بۆخۆی پێ بەپێی ژێرخان، دەگۆڕێ. جگەلەوە، زۆربەی ڕاوێژکارانی ئابووریی هووەیدا، و ژمارەیەکی بـەرچاو لەوکەسـانەی بەرنامەڕێژیی ئابووریی وڵاتیان لە دەستدا بوو، هەموویان لە ئەمریکا خوێندنیان تەواو کردبوو. کۆمەڵێک لەوان بە "مافیای هاروارد" بەناوبانگ بوونو باوەڕیان وابوو کـە کلیلــی مەتەڵۆکــەی نوێکردنــەوەی کۆمــەڵ لــە دروســتکردنــی ژێرخانەکەیدایە. لە هەمووی گرنگتر ئەوە بوو کە وەختێک هووەیدا بوو بە سەرۆکوەزیر زۆر لە بۆچوونە سیاسییـەکانی خۆی وەلا نـاو کـەم-وزۆر لـە هـەموو بووارەکانـدا، بـووە هـاوبیرو هـاودینی شـاو گومـانیش نەبوو کە بە باوەڕی شا، هەڵدانی خێرای سـەنعەت ڕێگـەچارەی هـەموو گیروگرفتە کۆمەڵایەتییەکان بوو.

لــە دواڵیکدانــەوەدا، گرنگتــرین کۆســپی ســەر ڕێــی جــۆری چاکســازیخوازیی سیاســیو مەسـڵەحەتخوازانەی دڵخــوازی هووەیــدا وشـکبیرکردنــەوە بــوو، بەڕێکــەوت هووەیــدا لــە بیرەوەرییــەکانی ســەردەمی شــەڕ"دا، بــە ئامــاژەو بــە ڕاشــکاوی بــەگژ ئــەوجۆرە بیرکردنەوەیــەدا چۆتــەوە. داخــوا بەڕێکەوتــە کــە هووەیــدا لــە یەکــەم عیبارەتی ئەو بەشە لە "بیرەوەرییەکان"دا ئاماژە بە فیلمی نینۆچکا دەکا؟ بـە سـادەترین هەڵسـەنگاندن نینۆچکـا فیلمێکـە پـڕ لـە گاڵتـەی سیاسـی. بەسەرهاتی چەند باڵشەویکی دەمارگرژی ڕووسییە کە بە نوێنەرایـەتیی "هەیئـەتی بازرگـانیی ڕووس" هاتوونـە پـاریس. نـەجیبزادەی ڕووسـیو دوورخـراوە بۆتـە گاڵتـەجاڕی موسـافیرە شۆڕشگێڕەکان. ئـەو لـە بـاری ئابوورییــەوە تــەنیا سەربارێکــەو بــۆ پابەنــدی بــە دابوشــوێنی

پیاوماقوولانیش بەقەد بالشەویکەکان بیروشکو کەللەرەق دیارە. گرتاگاربۆ کە لە فیلمەکەدا روخساریکی زۆر جوان، بەلام بێرووحی هەیە پشکنەر "نوێنەری تایبەتی"ی حیزبە. ئەو بۆ کارئاسانی، و هەروەها بۆ مسۆگەرکردنی نیازپاکیی ئیدەئۆلۆژیکیی بیرو کردەوەی هەیئەت لە مۆسکۆوە نێردراوەتە پاریس؛ لە سەرەتای مانەوەی لە پاریسدا، رەفتارو کردەوەو بیرکردنەوەی پوختەو نوێنگەی وشکبیرکردنەوەی حیزبییە. بەلام دوای ماوەیەک ئەویش وەک هاورێیانی دیکەی هەیئەت، بەرەو "وەسوەسە شەیتانییەکان"ی کۆمەلی بۆژووایی دەکێشرێ. نەکهەر وەسوەسەی ئەڤین بەلکوو ناسکیو جوانییەکانی ژیانی رۆژانەی کۆمەلی سەرمایەداری وەک خۆرە بەردەبێتە گیانی هەموو پایەکانی وشکبیرکردنەوەی.

بەلام فیلمی نینۆچکا لەوانەیە لە روانگەیەکی تەواو جیاوازیشەوە کەوتبێتە بەر ئامارەی هووەیدا. دەزانین کە یەکێک لە شاکارەکانی گالتەجاریی سادقی هیدایەت کتێبی البعثة الإسلامية في بلاد فرنجية بوو. ئەم داستانە، لەبارەی دارشتنی سەرەکیی ریوایەتەکەوە زۆر وەک نینۆچکا دەچێ. ئەم جارە هەیئەتێک لە ئیماندارانی شەرعزان بۆ رێنوێنیی کافرانی مەسیحی چوونە پاریس. بەلام زۆر زوو بیری برەوپێدانو بلاوکردنەوەی تۆوی ئیسلام بە تەواوی وەلا دەنێنو ئاشقی هێندێ دیاردەی وەک فوولی برێژە دەبن. نەکهەر باوەر، بەلکوو عەباو مەندیلیش لەبیر دەبەنەوەو بە پەیرەوی لە بالشەویکە بەباوەرەکان، گیرۆدەی بەهرەکان یان گەندەلییەکانی بورژووایی دەبن. دەزانین کە هووەیداو هیدایەت دۆستی یەکتر بوون. هەر لەو کاتەدا دەزانین کە هیدایەت لە نووسینی البعثة...دا کاریگەریی نینۆچکای بەسەرەوە بوو. بە لەبەرچاوگرتنی هەموو ئەمانە، پێم وایە زیادمان نەگوتوە ئەگەر بلێین ئامارەی هووەیدا بەم فیلمە لە سەرەتای وتارەکەیدا بەرێکەوت نەبووەو نیازو مەبەستێکی تایبەتیی لەپشت بووە."[52]

هەر لەو یادداشتانەدا، ئاماژەیەکی ناڕاستەوخۆو بەئێشی دیکەش دەتوانین ببینین. ئەم جارە، بە گومانی من، هووەیدا بە ئاماژە ڕەخنە لە ڕێژیمێک دەگرێ کە بۆخۆی خزمەتی دەکرد. لە باسی داگیرکردنی برۆکسێل -بە هۆی نازییەکانەوە-دا، هووەیدا دەڵێ خوێندکارانی زانکۆ، بە کوێرایی چاوی سەربازانی نازی، مارکسیان دەخوێندەوەو بەرهەمەکانی‌یان لەبن هەنگڵ دەناو بە شەقامەکاندا دەگەڕان. بەڵام ڕاست لە کاتێکدا کە هووەیدا ئەم عیبارەتانەی دا بەچاپ، خوێندنەوەو بوونی نوسخەیەک لە بەرهەمەکانی مارکس لە ئێران تاوانێکی گەورە بووو زۆربەی وەخت سزای ساواکی دەگەڵ بوو. ئاماژەی هووەیدا بە ڕەفتاری خوێندکارانی برۆکسێل دەتوانین وەک ناڕەزایەتییەکی ناڕاستەوخۆی ناوبراو بە ساواک دابنێین. وابزانە ویستوویە بە ئاماژەیەکی لەو بابەتە خۆی لە سیاسەتی سەرکوت دوور ڕابگرێ.

"بیرەوەرییەکانی سەردەمی شەڕ بە درێژی سەرقاڵیی ڕۆژانەی هووەیدا لە ساڵەکانی شەڕدا باس دەکا. هەر لەو کاتەدا، لەبارەی ژیانی سۆزدارانەی، و چەندوچۆنی باری دەروونیی ناوبراوەوە زانیارییەکی ئەوتۆ نادا بە خوێنەر. بە شیرینی باسی غەمی ئەڤینێک دەکا کە لە بێلژیک بەرۆکی دۆستەکانیی گرتبوو. دەڵێ بۆخۆم ناتوانم ئەو دەردە بەچاکی تێبگەم چونکە 'هێشتا ئاشق نەبووم کە پەی بە نهێنییەکانی دڵێکی ئاشق بەرم."[٥٢٠] بەڕێکەوت کاتێک هووەیدا ئەم قسانەی دابوو بە چاپ، نەکهەر بۆخۆی ئاشق دیار بوو، بەڵکوو تامی غەمی عیشقیشی چاشتبوو.

هەرچەند ژیانی تایبەتیی هووەیدا بەهۆی پیشەیەکەوە کە هەڵی-بژاردبوو، تا ڕادەیەکی زۆر لە ژێر زەڕەبینی بیروڕای گشتیدا بوو، بەڵام ئەو لەپاڵ خۆیدا، مرۆڤێکی یەکجار گۆشەنشین بوو. هاوسەرەکەی دەیگوت: "هەرگیز نەدەکرا بزانی لە هەناویدا چ دەگوزەرێ."[٥٤٠] پیاوێکی داخراو بووو بەدەگمەن نیگەرانیو پەرێشانییەکانی هەناوی خۆی دەگەڵ خەڵکی دیکە باس دەکرد. لە ڕۆژئاوا، کونپشکنیی زۆرتر بەدرۆو هێندێ جار بۆگەنی کۆمەڵانی خەڵک، ژیانی سیاسەتمەدارانی

کردۆتـــە خـــۆراکی هەمیشـــەیی دەزگاکـــانی هـــەواڵو بڵاوکـــراوە هەڵڵاسازەکان. لـە ئێرانیش نـەکـهـەر ئـەو کونپشکنییـە هەیـە، بـەڵکوو زۆرداریـــی سیاســـی ئـــەم ڕەوتـــە ژەهراویتـــر، قـــینلەزگانـــەترو ڕووخێنـــەرتر دەکا. لـــە کۆمەڵگا زۆرداریلێدراوەکاندا، دەنگۆو سرت-وخـورت جێگـای ڕاسـتی دەگرێتـەوەو هـەر لەوکاتـەدا دەبێتـە چـەکی سیاسی. لەوجۆرە کۆمەڵانەدا، لە نێوان خـەڵکو فەرمانڕەوا ملهوڕەکاندا شـەڕی سیاسیو فەرهـەنگیی هەمیشـەییو هێندێجار شاراوە لـە ئارادایە. بیـروڕای گشـتی مەیـدانی شـەڕی سەنگەربەسـەنگەری ئـەو دوو هێـزە نەیارەیـەو لـەو شـەڕەدا، هـەردوو لا لـە دەنگـۆ وەک ئامرازێکی بـەهێز کەلک وەردەگرن. هەربۆیە، چەندین ساڵ پێش ئەوەی دادگای شـۆڕش هووەیـدای موحاکەمـە بکـاو گیـانی لـێبسـتێنێ، هـەر ئـەو دەنگـۆ باوانـە کەسـایەتیی ئـەویان تێـرۆر کردبـوو. بـە کـەلکوەرگـرتن لـە زاراوە یۆنگییـەکان، دەتـوانین بڵێـین هووەیـدا، ببـووە "سـێبەر"ی بـە کۆمـەڵی سیاسەتی ئێران. هەرچی مایەی گومانی بێجێی خـەڵک بـوو، هـەرچی لـە مەیـدانی سیاســەتدا تـرسو بێزاریـی خـەڵکی دەبزوانـد، و سـەرەنجام هـەموو ئـاواتو ئارەزووە شـاراوەکانیان بـە هووەیـدا مانـا دەکردنـەوەو دەیانخستنە ئەستۆی ئەو.

دیـارە ژیـانی سیکسـیی هووەیـداش بابـەتو تـەوەری دەنگۆیـەکی زۆرو پڕهـەنگامـە بـوو. لـە کۆمەڵێکـدا کـە 'پیـاوەتیو ژنبـازیو توانـای سیکســـی، هەرکامـــەی بـــەجۆرێک ســـەرمایەی کۆمەڵایـــەتیی پیـــاوان دەژمێردرێ، ئەویان بە نەزۆکبوون تۆمەتبار دەکرد. جارێک دەیانگوت ژنبـازەو وەختێـک تەنانـــەت تۆمـەتی منـداڵبازییشـیان لـێدەدا.[55] لـە کۆمـاری ئیسـلامیدا تەنانـەت بەڵگەیەکیشـیان چـاپ کـرد کـە لـەودا ڕاوی ئیـددیعای کردبـوو کـە لـە سـەفەرێکی هووەیـدا بـۆ مازەندەرانـدا، هاوسـەرەکەی، ئـەوی لـە حـاڵی ماچومووچ دەگـەڵ هەتیوێکدا گرتـوە.[56] دەمزانی لە وتوویژ دەگەڵ لەیلادا بەناچار دەبێ لە بـارەی ئـەو ڕاپۆرتـە بە تایبەتی، و بەگشتی لـەبارەی پێوەندیی سیکسیی دەگـەڵ هووەیـداوە پرسـیاری لـێبکـەم. بـەلام نـەمدەزانـی چـۆن دەتـوانم بـەڕێزەوە ئـەو

پرسیارانە بێنمە گۆڕێ. کەچی ئەو لەلوتفی خۆیەوە هاتە کۆمەگم‌و لە یەکێک لە وتوویژەکانماندا، بەشێوەیەکی زۆر سروشتی‌و بە سەنگینی، گوتی: "پێوەندیی سێکسیمان گیروگرفتی نەبوو. زۆر باش نەبوو، بەڵام گیروگرفتی ژیانیشمان نەبوو."[٥٧] ڕاشکاویی قسەکانی غیرەتی وەبەر نام‌و هەر لەو لەحزەیەدا لە بارەی چەندوچۆنی ڕاپۆرتەکەی ساواکەوە پرسیارم لێکرد. زەردەخەنەیەکی تاڵی هاتە سەر لێوان‌و گوتی: "ئەمانە ئەمیری ناناسن." ئەمجار لێبڕاوانە حاشای لە بوونی ئەو ڕووداوە کرد کە لە ڕاپۆرتی ساواکدا هاتوە. لە خۆمم پرسی کەوایە دەبێ ئەو بەڵگەیە کە بڵاو بۆتەوە یەکسەر بە هەڵبەستراو بزانین؟ ڕەمزی ڕاپۆرتەکەم تەنیا دوای لێگەڕانێکی زۆرتر بۆ دەرکەوت. تێگەیشتم کە توانای دەنگۆ لە دەورانی شادا بە ڕادەیەک گەیشتبوو کە ساواکی ناچار بە دژکردەوە کرد. لە هەرشارێک کۆمیتەیەکی دروست کرد بەناوی ئێکۆ کە ئەرکی کۆکردنەوەو ڕاپۆرتدانی دەنگۆی باوی ئەوشارەی لە ئەستۆ بوو. هەر لەوکاتەدا لەسەریان بوو کە ئەگەر پێویست بوو، هەنگاو بۆ پووچەڵکردنەوەی دەنگۆی بەڕاستی زیانبارو مەترسیدار هەڵێننەوە. بۆ نموونە وەختێک لە ئێران بڵاو بۆوە کە شا ژنی هێناوەو لە تەنیشت شاژنە فەڕەح، کچێکی جحێڵیشی کردۆتە هاوسەری خۆی، ساواک دەستبەکار بوو. گۆڤارێکی پڕفرۆشی تارانی هان دا تا ڕاپۆرتێکی دوورو درێژو بەوێنەوە لە بارەی زەماوەندی ئەو کچەوە چاپ بکا.[٥٨] وەختێک ڕاپۆرتی ساواک لە بارەی پێوەندیی هووەیدا دەگەڵ ئەو هەتیوەشم بەوردی خوێندەوە تێگەیشتم کە دەقی گێڕانەوەکە نەک باسی ڕووداوێک بەڵکوو ڕاپۆرتی دەنگۆیەکە.

بەمجۆرە زۆر بەشی "بیرەوەرییەکانی سەردەمی شەڕ" لە ڕاستیدا دژکردەوەیەکن بەرامبەر ئەو دەنگۆیانە کە هەر لە سەرەتای حکوومەتی هووەیداوە لەبارەیدا بڵاو کرابوونەوە. هەر لەو کاتەدا، دەتوانین وڵاتی فەڕانسە وەک تەوەری سۆزداریی ئەو یادداشتانە دابنێین. هەروەخت باسی باشییەکانی فەرهەنگی فەڕانسە، یان جوانییەکانی شاری پاریس دەکا هەروا بزانە زمانی دەکرێتەوەو جارێک

ڕاویژێکی حەماسەیی‌و جارێکی دیکە قالبێکی شاعیرانە وەردەگرێ. لەهەر حاڵدا ڕاویژی ئەو بەشانە دەگەڵ بەشەکانی دیکەی یادداشتەکان جیاوازییەکی بەرچاوی هەیە. پەسنی فەڕانسە بە زمانی مرۆڤێکی سەوداسەرو پاشماوەی داستانەکە لە ڕوانگەی سیاسەتمەدارێکی بەپارێزەوە داڕژاوە. دەنووسێ: "فەڕانسە ئەتۆ ڕێی ئازادیت بە گەلانێک نیشان دا کە لەژێر مامزەی زۆرداریدا گیانیان دەردەچوو. نووسەران‌و شۆڕشگێڕانی ١٧٨٩...ی تۆ جادەی ئازادی‌یان بۆ گەلانی دیکە کردەوە. ڕۆسۆ! ڕۆبسپێر! سەنت‌ژووست! هۆگۆ! گامبتا! لە نێو گڵکۆکانتاندا بگرین، فەڕانسە! ئەتۆ بریندارێ... ئەمن... ئەمنِ ئەویندارێ تۆم، هەرگیز لە تۆ نائومێد نابم... چونکە ئەتۆ هەرگیز نامرێ."[٥٩٠]

هوودەیدا لەلایەک لە تاریفی سروشتە باشەکانی پاریس‌و فەڕانسەدا زمانێکی شاعیرانەی بەکار دێنا، و لەلایەکی دیکە، لە بارەی مەزهەب‌و باوەڕە ئایینییەکانەوە یەکسەر بێدەنگیی ڕەچاو دەکرد. مەزهەب هەرگیز نەخشێکی یەکلاکەرەوەی لە ژیانی تایبەتیی هوودەیدادا نەبوو. نە سیستمی ڕەوتی ژیانی لەسەر بناخەی مەزهەب دانرابوو، نە ئەفسانەی ئافراندنی مەزهەبیی قبووڵ دەکرد، نە بنیاتە فەلسەفییەکانی ژیانی ڕەنگ-وبۆیەکی مەزهەبی‌یان هەبوو. دەگەڵ دۆستانی نیزیکی هەمیشە دەیگوت وەک نیچە ڕقی لە هەموو دینەکانە. "بیرەوەرییەکانی سەردەمی شەڕ" دەکرێ بە دیارترین نیشانەی باوەڕی تەواو عورفی‌و نامەزهەبیی هوودەیدا بزانین. دیارە وەک کاربەدەستێکی سیاسیی وڵات، ئەو لە ڕێوڕەسمە مەزهەبییەکاندا بەشدار دەبوو. بەڵام بە پێچەوانەی زۆربەی سیاسەتبازانی هاودەورەی خۆی کە زۆرجار لە هەر دەرفەتێک بۆ ئیسباتی باوەڕیان بەخوداو پشت‌بەستن بە ئیسلام کەلکیان وەردەگرت، هوودەیدا لە"بیرەوەرییەکانی سەردەمی شەڕ"دا خۆی لە هەرچەشنە خۆنواندنێک بە دینداری‌و ئیسلامپارێزییەوە پاراستوە. لە ڕاستیدا، نەک-هەر خۆی وەک باوەڕمەند دەرنەدەخست بەڵکوو بە پێچەوانە بێ‌پەروا دانی بەوەدا دەنا کە هێندێ جار ئارەق دەخواتەوە، جاری وابوو دەگەڵ ژنان هەڵدەپەڕی‌و زۆرجاریش قۆڵی ڕووتی ژنان نەشەی پێ‌دەگرت‌و

هەمووشمان دەزانین ئەو سێ کارە لەلای موسوڵمانان گوناحی گەورەن. دەتوانین شاو کتێبەکەی، مەئموورییەت بۆ نیشتمانم بە نموونەی بەرچاوی ئەو نەریتە دینپارێزییە لە ئێراندا بزانین. لەوێدا ئەو نەک هەر زۆرجار باسی باوەڕی پتەوی خۆی بە ئیسلام دەکا، بەڵکوو باسی چەند خەونیشی کردوە کە بە قسەی خۆی هەموویان ڕیشەیان لە پەیامێکی خوداییدا بووە. دەڵێ کاتێک منداڵ بووە جارێکیان کەوتۆتە مەترسیی مەرگەوەو تەنیا بە مۆجیزەی حەزرەتی عەبباس گیانی دەرباز کردوە. ساڵەکانی دواتریش، لە وتوویژ دەگەڵ ئووریانا فالاچیدا شا ئیددیعای کرد کە تەنانەت ڕاستەوخۆش دەگەڵ خودا قسەی کردوون."[٦٠]

"بیرەوەرییەکانی سەردەمی شەڕ لە بارێکی تەواو جیاوازی دیکەشەوە گرنگن. کاتێک بڵاو بوونەوە، کەسایەتیو بیروبۆچوونی ڕواڵەتیی هووەیدا زۆر وەک ئەوە دەچوو کە لە خۆیدا هەیبوو. بەڵام هەتا شا زۆردارتر دەبوو، هەتا لێبووردەیی بەرامبەر بەو ژێردەستانە کە بێگوێیی‌یان دەکرد کەم دەبۆوە، هەرچی ڕاوێژی پرتەوسو ڕەخنەی بەرامبەر بە دیموکراسی توندتر دەبوو، هووەیداش پترو پتر هەرنەبێ بەڕواڵەت، فەرمانو باوەڕەکانی شایانەی دووپاتە دەکردنەوە. بۆنموونە، ساڵی١٣٤٣(١٩٦٤)، شا گوتبووی: "ئازادیی بیرورا! ئازادیی بیرورا! دیموکراسی! دیموکراسی!... هەمووی بۆخۆتان. بزانم ئەم دیموکراسییە چ گوڵێکی لەسەری ئێوە داوە. ئەو دیموکراسییەی بەڕێزتان. تا چەند ساڵی دیکە دەبینن ئەم دیموکراسییە دەگاتە کوێ."[٦١] تا ئەودەم هووەیداش، هەرنەبێ لە وتارەکانو وتوویژە چاپەمەنییەکانیدا، لە جیاتی دووپاتەکردنەوەی ئەو هەڵوێستە لیبراڵییانە کە "بیرەوەرییەکانی سەردەمی شەڕ" نوێنگەیان بوون، بە کردەوە پەلامارەکانی شا بۆ سەر دیموکراسیی دووپاتە دەکردنەوە. لەڕاستیدا ئەو لەبەر زەینی بیروڕای گشتی، بەتایبەتی لە ڕۆژئاوا ببوو بە کاریگەرترین بەرگریکەری ڕێژیمی پەهلەوی. چەندین جار حاشای لە بوونی گەندەڵیو ملهوڕیو سانسۆر لە ئێراندا دەکرد. تەنانەت جاری وابوو بە چاولێکەریی شا بێزاریی لە ڕێژیمە سیاسییە دیموکراتییەکانی

ڕۆژئاوا دەردەبڕی. بۆنموونە، لە وتاری خۆیدا بۆ کۆنفرانسی ئاسپن لە شیراز گوتبووی: "ئێمە پەیدابوونی ئیمپەراتۆریی مەزنی بۆرژوکراتیکمان دیوە... هەرلەو کاتەدا، ئەو کۆمەڵانەمان خستۆتە بەر لێکۆڵینەوە کە سەرەتایەکی دیموکراتیکیان هەبوو. بەڵام دوای ماوەیەک گەڕانەوە سەر جۆرێک ژیانی عەشیرەتیی مۆدێرن. ئەو کۆمەڵانە بێکاریو بەرەڵڵایی بەهێز دەکەنو دەگەڵ خۆیان لە شەڕدان."[٦٢٠] ئەگەر ڕووکێشە تیئۆرییەکەو وشە قەبەکانی ئەم قسانە بخەینە لاوە، شتێک بێجگە لە پەلاماری هەمیشەییو زۆرجار ساویلکانەی شا بۆسەر دیموکراسییان تێدا بەدی ناکەین. بەڵام بە پێچەوانەی ئەو هەڵوێستە ڕواڵەتییانە، هوەیدا هەروەک جاران لە خۆبەخۆیایەتیدا بیروبۆچوونێکی وەک ئەوەی هەبوو کە لە "بیرەوەرییەکانی سەردەمی شەڕ"دا گوتبوونی. بە شاهیدیی زۆر لە دۆستانی نیزیکی هوەیدا، ئەو لەوە ئاقڵتر بوو کە پەلاماری ساویلکانەو قسەی نێوبەتاڵ بەدژی دیموکراسی بە جیددی وەربگرێ. بەمجۆرە دووپارچەییەکی قووڵ لە ژیانیدا دەرکەوت. بە ئاشکرا لایەنگری بێئەملاوئەولای ڕێژیمی شا بووو لەپاڵ خۆشیدا دەگەڵ زۆر لە سیاسەتەکانی نەیار بوو. ئەو دووپارچەییە ، ئەو پچڕانو نارێکییە لە نێوان قسەو هەنگاوی بەکردەوەو باوەڕە تایبەتییەکاندا نەک-هەر وەک باوە، بوو بە "مەزهەبی موختار"ی ژیانی هوەیدا بەڵکوو چارەنووسی نەوەیەکی ئازار چێشتوو لە سیاسەتمەدارە ئێرانییەکانی ئەو سەردەمە بوو.

# سەرچاوەکان

۱. هویدا، «یادداشتهای زمان جنگ»، ص ۳۳.

۲. در اوایل دهه‌ی ۱۹۶۰ میلادی، چندین نفر برای نوشتن و پیراستن مقالات فارسی به هویدا یاری رساندند. از جمله‌ی آنها می‌توان رئیس دفترش محمد صفا، دوستانش، صادق چوبک، انجوی شیرازی، و پرویز راجی را برشمرد. صفا، چوبک، و راجی، هر یک تأکید کردند که در ترجمه‌ی یادداشتهای روزانه نقشی نداشته‌اند. آنان همچنین نمی‌دانستند که چه کسی به ترجمه‌ی آن ها پرداخته و یا به کار این ترجمه کمک کرده است.

۳. دکتر فرشته انشاء، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۱۱ مارس ۱۹۹۹.

۴. امیر عباس هویدا، «مراجعت به ایران»، تهران ۱۳۵۰، ص ۲۷۶.

۵. برای مروری کلّی به تاریخچه‌ی زندگی‌نامه‌نویسی و خاطرات در ایران، ر. ک.: احمد اشرف، «تاریخچه‌ی کوتاه خاطرات در نزد ایرانیان»، ایران‌نامه، جلد XX شماره ۱، ۱۹۹۷.

۶. برای دستیابی به بحثی در باب ایده‌ی «دو پهلوگویی»، ر. ک.:

Austin Fagothey, *Right and Reason: Ethics in Theory and Practice* (St. Louis, 1953), 319 – 21.

۷. ایزایا برلین، متفکران روس، تهران، خوارزمی، ۱۳۶۵.

8. Walter Benjamin, *Charles Baudelaire: A Lyric Poet in the Era of High Capitalism*, tr. Harry Zohn (London, 1969), 36–40.

۹. رضا براهنی، گفتگو با نگارنده، ۱۲ ژوئن ۱۹۹۹.

۱۰. نقل شده در بامشاد، ۲۱ اسفند ۱۳۴۵.

۱۱. براهنی و ساعدی هر دو درخصوص کلیّات این بحث همداستانند. ر. ک.: براهنی، ظل الله، صص ۱۴ ـ ۲۷؛ و غلامحسین ساعدی، پروژه‌ی تاریخ شفاهی ایران در دانشگاه هاروارد، الفبا (پاریس)، شماره ۷، صص ۱۷۰ ـ ۱۳۹.

۱۲. در آن زمان، هویدا محمد صفا را برای اداره‌ی امور روزانه‌ی مجله برگزیده بود. صفا از پیروان خلیل ملکی از طرفداران مصدق بود. در پانوشت مصاحبه‌ای با علی امینی، نکته‌ای در تأیید مصدق اضافه کرده بود. به گفته‌ی صفا، علم نسخه‌ای از مصاحبه‌ها را به شاه نشان داد و شاه از اشاره به مصدق به‌خشم آمد و دستور توقیف مجله را صادر کرد. محمد صفا، گفتگو با نگارنده، ۱۲ نوامبر ۱۹۹۷.

۱۳. در ارتباط با اظهارات آل احمد، من به گفتگو و مصاحبه‌ای تکیه کردم که در ۱۲ ژوئن ۱۹۹۹ با رضا براهنی به عمل آوردم.

۱۴. ساعدی، الفبا، ص ۱۰۰.

۱۵. جلال آل احمد و پرویز داریوش، مائده‌های زمینی، تهران، ۱۳۴۴.

۱۶. رضا براهنی، گفتگو با نگارنده، ۱۲ ژوئن ۱۹۹۹.

۱۷. ر.ک. ابراهیم گلستان، گفته‌ها، نیوجرسی، ۱۹۹۹.

۱۸. ابراهیم گلستان رفت و آمدهای منظم خود به خانه‌ی فریدون هویدا در تهران، جایی که حلقه‌ی گسترده‌ای از روشنفکران گرد می‌آمدند، شرح می‌دهد. ابراهیم گلستان، فروغ فرخزاد، و صادق چوبک در میان این مهمانان همیشگی به چشم می‌خوردند. ابراهیم گلستان، گفتگو با نگارنده، ۱۵ سپتامبر ۱۹۹۹.

۱۹. رضا براهنی، در پیشگفتار چاپ فارسی اثرش، ظل‌الله، حال و هوای روشنفکری آن زمان را بازگو می‌کند. ر.ک. براهنی، ظل الله، صص ۲۷ - ۱۴. برای دستیابی به دیدگاه‌های آل احمد درباره‌ی برادران هویدا، ر.ک. آل احمد، کارنامه‌ی سه ساله، صص ۲۲۵ - ۲۲۳.

۲۰. خلیل ملکی، دو نامه، تهران، ۱۳۵۷، نامه‌های ملکی خطاب به مصدق نوشته شده‌اند. در این نامه‌ها، ملکی از رهبران جبهه‌ی ملّی شِکوه می‌کند، که به گفته‌ی وی با روحانیون مرتجع متحد شده‌اند.

به نظر ملکی، حتی شاه بر ملاها مرجح است. در مقابل، شاه و ساواک هم هرگز حاضر نشدند با مخالفان مذاکره‌ی جدی کنند. هر چه بر قدرت شاه افزوده می‌شد، تساهلش نسبت به مخالفانِ حتی میانه‌رو هم کاستی می‌گرفت.

۲۱. احسان نراقی، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۱۲ مارس ۱۹۹۹.

۲۲. «کارنامه‌ی دولت هویدا»، سوسیالیسم، فروردین ۱۳۴۵، صص ۱ - ۱۶.

۲۳. محمد صفا، گفتگو با نگارنده، ۲۱ نوامبر ۱۹۹۷.

۲۴. صفا گفتگو.

25. U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Confidential Memorandum of Conversation: Prime Mister Hoveyda's Meeting with Nation of Iran Party Leader Foruhar," 1968/05/09, NSA, no. 664.

۲۶. امیر عباس هویدا، «یادداشتهای سخنرانی»، به لطف فریدون هویدا.

۲۷. پیشین.

۲۸. برای دستیابی به شرحی درخصوص نقش هویدا در مذاکرات مربوط به قانونی کردن حزب توده و بازگشت رهبران آن حزب به ایران، ر.ک.: ایرج اسکندری، خاطرات، تهران، ۱۳۶۲، ص ۴۱۷.

29. U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Confidential Memorandum of Conversation," NSA, no. 835.

ولادیمیر ولاسف، دبیر اول سفارت شوروی در تهران، اظهار می‌دارد که «رهبران حزب مایل‌اند به ایران برگردند و در قالب یک حزب سیاسی قانونی به فعالیت علنی بپردازند، اما شاه این را نپذیرفت.»

30. U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Discussion about Vienna Convention, Military Assistance, the Mansur Government and Land Reform: Memorandum of Conversation," National Security Archive, doc. 542.

31. U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Discussion with Shapour Bakhtiar about the National Front, the Shah, Communism and Prime Minister Hoveyda: Memorandum of Conversation," NSA, no. 552.

۳۲. سیف الدین وحید نیا، سردبیر مجله‌ای به نام وحید، که یکی از هواداران هویدا به‌شمار می‌آمد، گزارشی از این پرداختها منتشر کرده است. این شخص به کمک هویدا به نمایندگی مجلس رسید. وی نوشت، «غالباً اتفاق می‌افتاد که [هویدا] به اندیشمندان و روشنفکران این کشور که ناگزیر به خانه‌نشینی بودند کمک کند.... وقتی از گرفتاری آنها باخبر می‌شد، بدون هیچگونه تظاهر یا چشمداشتی [از سپاسگزاری] سعی می‌کرد مشکلات آنها را حل و فصل کند. اخیراً، شنیده‌ایم که او مقداری پول برای یکی از تواناترین شاعران که در اروپا سرگردان مانده بود، فرستاده بوده است.» ر.ک. وحید، آبان ۱۳۴۹، ص ٦۳٦. احمد قریشی، که در نیمه‌ی دهه‌ی ۱۹۷۰ به ریاست دانشگاه ملی منصوب شد، اظهار داشت که کمی پس از انتصابش، از جانب نخست وزیر فرا خوانده و به او گفته شد که کریم سنجابی، یکی از رهبران جبهه‌ی ملّی، را به‌عنوان مشاور در لیست حقوق بگیران دانشگاه قرار دهد. احمد قریشی، گفتگو با نگارنده، ۲۸ نوامبر ۱۹۹۷. در گزارش دیگری به سفارت امریکا، ادعا می‌شود که «سنجابی مدتها در فهرست حقوق بگیران شرکت ملی نفت با حقوق... معادل حدود ۳۲۲۰ دلار بوده است.»:

U. S. Embassy, "Secret Intelligence Report," NSA, no. 2142.

۳۳. مصطفی الموتی مدعی است که در روزگاری که در مجلس از نفوذ و قدرت فراوانی برخوردار بود به دیدن هویدا رفت و از بدنامی اسلامی‌نیا صحبت کرد و هشدار داد که این شهرت سوء برای هویدا هم گران تمام می‌تواند شد. هویدا پاسخ می‌دهد: «می‌دانم، من مرتباً گزارشهایی در این موارد دریافت می‌کنم... اما، اسلامی‌نیا به آیت‌الله احمد خوانساری بسیار نزدیک است... هر مشکلی که ما با روحانیت یا با بازاریان داشته باشیم، وی می‌تواند حل کند.» مصطفی الموتی، ایران در عصر پهلوی، لندن، ۱۹۹۲، صص ۱۱۷ ـ ۱۱۸.

۳۴. در دوم مرداد ۱۳۵۶، اسلامی‌نیا این پیام را، از طریق هویدا، برای شاه فرستاد که او «دیگر با [آیت‌الله] خمینی همکاری نمی‌کند، زیرا وی بر علیه شاه است.»:
U. S. Embassy, Tehran, Iran, "Latest Developments on the Religious Front: Confidential Memorandum of Conversation," NSA, no. 1427.

۳۵. نصیر عصار، گفتگو با نگارنده، واشنگتن، ۱۵ فوریه ۱۹۹۹. البته این تصور در میان مردم رواج داشت که اموال اوقاف اغلب مورد حیف و میل قرار می‌گیرد.

۳۶. نصیر عصار، گفتگو.

۳۷. پیشین.

۳۸. داریوش همایون، گفتگو با نگارنده، کالیفرنیا، ۶ ژوئن ۱۹۹۹.

۳۹. به نقل از:
James A. Bill, *The Eagle and the Lion*: The Tragedy of American-Iranian Relations (New Haven, 1988), 166.

۴۰. فاطمه سردآور فرمانفرمائیان، سیروس غنی، و جهانگیر بهروز، هر کدام، ماجرایی با فحوای مشابهی اظهار داشتند.

۴۱. هویدا، «یادداشتهای زمان جنگ»، ص ۳۴.

۴۲. پیشین، ص ۳۸.

۴۳. پیشین، ص ۳۹.

۴۴. پیشین، ص ۵۳.

۴۵. پیشین.

۴۶. علم، شاه و من، ص ۱۳۳۴.

۴۷. پیشین، ص ۲۲۳.

۴۸. هویدا، «یادداشتهای زمان جنگ»، ص ۳۹.

۴۹. پیشین، ص ۵۳.

50. CIA Board of National Estimates, "Secret Special Memorandum, #9–68: The Shah's Increasing Assurance," NSA, no. 448.

51. Ibid., 1–3.

۵۲. در سالهای اول دهه‌ی نود، بارها در باره‌ی دوستی چوبک با هویدا با چوبک صحبت کردم. او بارها گفته بود که هدایت، به اذعان خودش، در نوشتن البعثه... تحت تأثیر نینوچکا بوده است. روشن نیست که آیا او واقعاً این فیلم را دیده است یا صرفاً در یکی از مجله‌های اروپایی که آنها را مشتاقانه می‌خواند، درباره‌ی این فیلم چیزهایی خوانده است. ابراهیم گلستان، مکاتبات شخصی، ۲۶ ژانویه‌ی ۲۰۰۰.

۵۳. هویدا، «یادداشتهای زمان جنگ»، ص ۳۴.

۵۴. لیلا امامی، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۱۲ مارس، ۱۹۹۹.

۵۵. در کتاب اسکندر دلدم تمام این ادعاها و اتهامات بدون ارائه هیچگونه مدرکی بارها تکرار می‌شود. ر.ک.: دلدم، زندگی و خاطرات.

۵۶. مرکزی که عموماً به‌عنوان یکی از بازوهای آژانسهای اطلاعاتی جمهوری اسلامی نامبردار است، این اسناد را منتشر کرد. ر.ک. جستارهایی در تاریخ معاصر ایران، جلد ۲، تهران، ۱۳۷۰، صص ۳۹۷ ـ ۳۹۶. دلدم در کتاب خود این اتهام را تکرار می‌کند، ر.ک.: زندگی و خاطرات، صص ۶۸ ـ ۶۶.

۵۷. لیلا امامی، گفتگو با نگارنده.

۵۸. «مقام عالی‌رتبه‌ی امنیتی»، گفتگو با نگارنده، ۲۲ نوامبر ۱۹۹۷.

۵۹. هویدا، «یادداشتهای زمان جنگ»، ص ۴۷.

۶۰. محمدرضا پهلوی، مأموریت برای وطنم، تهران، ۱۳۴۰. در این کتاب اشارات فراوانی به تجربیات روحانی و خارق عادت سراغ می‌توان کرد. همان‌طور که شاه به اوریانا فالاچی‌ی سخت شکاک اظهار داشت، همه عمر احساس می‌کرد «نوعی وحی، با پیامهایی از فراسو»، دریافت می‌کند. ر.ک.: اوریانا فالاچی، گفتگوها، تهران، ۱۳۷۸، صص ۱۵۳ ـ ۱۴۱.

61. Quoted in *The Nation*, 7 october 1978, 329.

۶۲. امیر عباس هویدا، «آینده ایران»، ایران، حال و آینده:

Jane W. Jacps (New York, 1975), 448.

# فەسڵی یازدەیەم

## سیاسەت لە ڕۆمپەیی نەوتەڵاندا

**دەرباریيەکان دەڵێن هەمووکەس، لە دەربار، دڕندە خوویە.**
**دەریای خۆبەزلزانین، لە دیو بەولاوە بەرهەمێکی نیە.**

**شکسپیێر، سیمبلین**

# سیاسەت لە پۆمپەیی نەوتەلآندا

هووەیـدا بـەیانان زوو هـەڵدەسـتا. لـە دەورانـی سـەرۆک-وەزیرییەکەیدا، بەیانان سەعات پێنج‌ونیو لەخەو هەڵدەستا. فنجانێکی قاوە دەخواردەوە. حەمامو ڕیش‌تاشینی ڕۆژانەی دەوری دوو سەعاتی دەگرت. لـەیلای ئیمامی دەیگوت: "ئەمیر بەقەد بنیادەمێکی حەمبەڵی، بایەخی بە پاک‌وخاوێنیی خۆی دەدا." دوای زەماوەند، دایکی لـەیلا خانوویەکی دا بە بووک‌وزاوا. بەڵام پێش ئەوەی هووەیدا بگوازێتەوە ماڵە تازەکە، دوو ژووری تازەیان لە خانووە کۆنەکە زیاد کرد. حەمامێکی تایبەتییان بۆ هووەیدا ساز کردو ژوورێکیش بۆ کتێبەکانی. لەیلا دەیگوت: "پێم وا نەبوو ئەو بتوانێ دەگەڵ خەڵکی دیکە لە جێیەکی وەک حەمامدا ببێتە شەریک." پاشان بە ڕاوێژێکی تاڵو خەماوی، ئاماژەی بە وتوویژی ئووکران کردو گوتی: "کاتێک وتوویژی ئەو دێڵەدێوە دەگەڵ ئەمیرم دی، یەکێک لە یەکەمین خاڵەکان کە بە زەینمدا هاتن چەپەڵیی ژوورەکەی بوو. دڵنیا بووم لەنێو ئەو چەپەڵییەدا ناتوانێ بمێنێ." دەیگوت: "لە ڕیش‌تاشینیشدا زۆر حەمبەڵی بووو زۆر هەوڵی دەدا کراسە سپییەکانیشی هەمیشە پاک‌وخاوێن بن. هەرجارێک دەچووە ئورووپا دەرزەنێک لەو کراسانەی، بە ئەندازەی جۆراوجۆر دەکڕی‌و دەگەڵ خۆی دێنانەوە ئێران. دەزانی کە زۆر بە ئاسانی کێشی کەمو زیاد دەکرد."[10] بەڕاستییش زێدەکێش‌و قەڵەوی یەکێک لە گیروگرفتە هەمیشەییەکانی هووەیدا بوو. لەیلا پاش ماوەیەک هووەیدای ڕازی کردبوو کە ڕێژیمی خۆراکیی چەوری دڵخوازی وەلا بنێ، و لە

جیاتییان خواردنی کەمچەوری‌و ڕێژیمی بەکار بێنێ. هووەیداش قبوولّی کردبوو. چونکە زۆریشی حەز لە خواردنی فەڕانسەیی بوو، ناچار ئاشپەزی تایبەتیی سەرۆکوەزیریان بۆ دیتنی دەورەیەکی ئاشپەزیی خواردنی گیایی‌و ڕێژیمیی فەڕانسەیی ناردە پاریس.[٢]

دوای حەمام‌و ڕیش‌تاشین، نۆرەی خوێندنەوەی چاپەمەنی بوو. هووەیدا بەیانان هەرنەبێ سەعاتێک چاپەمەنیی نێوخۆو دەرەوەی دەخوێندەوە. زۆرجار تەنانەت پێش ئەوەی بگاتە دەفتەری کارەکەشی، بە تەلەفۆن دەگەڵ چەندکەس لە خاوەن‌چاپەمەنییەکان‌و وەزیرانی کابینەو تەنانەت دەگەڵ شاش قسەی دەکرد. جاری وابوو گلەیی لە دەقی ڕاپۆرتێک هەبوو، بۆ نموونە پێی وابوو ڕاستییەکانی پێچەوانە نیشان داوە، و جاری واش بوو ڕەخنەی لە گۆشەی ڕوانینی نووسراوێک دەگرت.

لە ڕێگای چاپەمەنییەوە، لە ئاڵوگۆڕەکانی دنیای کتێب لە ڕۆژئاواش ئاگادار دەبوو. میتۆدێکی وەڕێ خستبوو کە بتوانێ کتێبە دڵخوازەکانی خۆی بکڕێ.[٣] لە تەنیشت ناوی هەر کتێبێک، کە ویستبای نیشانەیەکی چووکەڵەی دادەناو ئەودەم کارمەندانی دەفتەرەکەی بە کەلکوەرگرتن لە حیسابێکی تایبەتیی دراوی بێگانە کە بۆ ئەو مەبەستە کردبوویەوە، ڕایان‌دەسپارد کتێبەکە بکڕرێ. جەختی دەکردەوە کە دیپلۆماتە ئێرانییەکان لە دەرەوە هەرگیز ناچار بە دانی خەرجی کڕین‌و ناردنەوەی ئەو کتێبانە نەکرێن.[٤] لە مەسەلەی ماڵییشدا ڕاست وەک مەسەلەی پاک‌وخاوێنیی خۆی حەمبەلی بوو. بەڵگەی حەمبەلی‌بوون‌و دەست‌پاکیی ماڵیی هووەیدا دەتوانین لەو ڕاستییەدا ببینین کە داوای لە موحەممەدی سەفا، سەرۆکی دەفتەرەکەی کردبوو ڕادەی کرێی یەکێک لە ژوورەکانی دەفتەری سەرۆک‌وەزیریی بۆ لێک‌بداتەوە. کتێب‌و بەڵگەنامەکانی خۆی لەو ژوورەدا ڕادەگرت. دەیگوت: "کارە تایبەتییەکانم لەم ژوورەدا دەکەم. نامەوێ خەرجەکەی دەوڵەت بیدا."[٥] هەربۆیە مانگانە هەشت‌سەدوپەنجا تمەنی لە جیاتیی بەکارهێنانی ئەو ژوورە دەڕژاندە حیسابی دەوڵەتەوە. کاری ڕاگەیشتن بە مەسەلە

ماڵییەکانی هەمووی لە ئەستۆی خاتو وەجیهەی مەعریفەت بوو. حیسابە بانکییەکانیشی هەر ئەو بەسەریان ڕادەگەیشت. هەر لەوحیسابە، مانگانە دووهەزار تمەن دەدرا بە دایکی هوەیدا.[6]

جاری وابوو هوەیدا لە خوێندنەوەی بەیانانی، هێندێ پرۆژەی بۆ ئایندەی ئێران دەدیتەوە. بۆ نموونە، بەفرانباری١٣٤٤ (١٩٦٥)، وەک لە ڕاپۆرتی باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە ئێران دەردەکەوێ، هوەیدا وتارێکی لە بارەی "دوورەدیمەنی بیست ساڵەی ئابووری"ی فەڕانسە لە نووسینی کۆمەڵێک لە" دواڕۆژبینان"ی* ئەو وڵاتە، خوێندبۆوە. هوەیداش، بە چاولێکەریی ئەو نووسراوە، هاتە سەر ئەو فکرە کە پرۆژەیەکی وا "بۆ ئێران ساز بکا. کۆمەڵێک لە بەرچاوترین ئابووری-زانانی ئێرانی لە کۆمیتەیەکدا خڕ کردنەوە. سەرۆکایەتیی کۆمیتەکەی بە عەبدوڵڵای ئینتیزام سپارد...و داوای لە ئەندامەکانی کرد دوورەدیمەنی بیستساڵەی ئابووریی ئێران بکێشنەوە."[7]

پاش ئەوەی لەخوێندنەوەی چاپەمەنیی بەیانان دەبۆوە، دەچووە دەفتەری کارەکەی. هەمیشە گوڵێکی ئۆرکیدەی لە بەرۆکی چاکەتەکەی دەدا. ئۆرکیدەکان عادەتەن دیاریی لەیلا بوون. پێش ئاشنابوون دەگەڵ لەیلا، هوەیدا مێخەکی بەکار دێنا. لەیلا نەکهەر مێخەکی هوەیدای کردە ئۆرکیدە، بەڵکوو چاندنی ئەو گوڵەشی لە ئێران کردە باو. هەر لەوکاتەدا یەکەمین ئەنجومەنی گوڵپەروەرانی ئێرانیشی وەڕێ خست. ئۆرکیدە گوڵێکی خۆوڵاتیی ئێران نیە. دەڵێن گوڵێکی جیهانوەتەن"ە. وادیارە گوڵو گوڵپۆش لە یەک بابەت بوون.

گوڵە ئۆرکیدەکانی هوەیدا لەو سەردەمەدا هەڵڵایەکی گەورەیان لێ ساز بوو. هێندێک دەیانگوت حاڵەتێکی ژنانەی دەدەنێ، هێندێکی دیکە دەیانگوت ئەو جۆرە ڕەفتارانە لە سەرۆکوەزیری ئێران ناوەشێنەوە. دواتر دەنگۆی سەرسوڕهێنتریش لەو بارەیەوە برەویان پەیدا کرد. لە سەروبەندی شۆڕشدا لەنەکاو بەشێک لە چاپەمەنیی وڵات ئیددیعایان

(*) Futurists

کرد کە هووەیدا هەمیشە لە پشت گوڵە ئۆرکیدەکەوە میکرۆفۆنێکی شاردۆتەوە. ڕاپۆرتی ئەم داستانە تەنانەت بە گوێی باڵیۆزخانەی ئەمریکاش گەیشتەوە. کاربەدەستێکی ئێرانی، لە چاوپێکەوتنی مەئموورانی باڵیۆزخانەدا، گوتبووی هووەیدا لە پشت گوڵە ئۆرکیدەکەیدا میکرۆفۆنێکی وەکار خستوە کە "وتوویژەکانی دەگەڵ شاو خەڵکی دیکەی پێ تۆمار دەکا." شریتی ئەم وتوویژانەش، بۆ ڕۆژی خۆی دەنێریتە لای فەرەیدوونی برای کە نوێنەری ئێران لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانەو لە نیۆیۆرک دەژی.[8] بەداخەوە هەموو بەڵگەکان نیشان دەدەن کە ئەو شریتانە هەرگیز نەگەیشتوونە دەفتەری نوێنەرایەتیی ئێران لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان. هەر لەوکاتەدا، ڕیشەی ئەو ویستە سەیروسەمەرەیە دەبێ لە لایەنێکی پێچەڵپووچی ژیانی هووەیدادا بدۆزینەوە.[9]

ماوەیەک دوای وەرگرتنی پۆستی سەرۆکوەزیری، هووەیدا کەوتە کۆکردنەوەی هێندێ بەڵگە کە بەفکری خۆی جۆرێک بیمە دژی پیلانی نەیارەکانی بوون‌و ئەگەر پێویست بایە لە هەلومەرجی سامناکدا، دەیان‌توانی لە گێژاو یان موحاکەمە ڕزگاری بکەن. بەڵگەی پێوەندیدار بە گەندەڵیی کاربەدەستانی پلە بەرزی وڵات‌و نوسخەیەک لەو فەرمانانەی کە پێچەوانەی قانوونی بنەڕەتی بوون، لە دۆسیەیەکدا ڕادەگرتن. ئەو بەڵگانەی عادەتەن لە پاکەتێکی گەورەی زەرددا ڕادەگرتن. پاکەتەکە لاک‌و مۆر دەکراو لە سندووقێکی تایبەتیی ئەمین، لە دەفتەری کاری خۆی لە سەرۆکوەزیری، ڕادەگیرا. هەروەخت دەچووە سەفەر، پاکەتە لاک‌ومۆرکراوەکەی دەدایە دەستی سکرتێرە جێگەی باوەڕەکەی، وەجیهەی مەعریفەت. دەیگوت ئەگەر تووشی ڕووداوێک بووم، پاکەتەکە بکەوەو دەستووراتی پێویستی تێدا دەبینی.[10] جگە لە وەجیهەی مەعریفەت‌و یەکی دیکە لە کارمەندانی دەفتەری سەرۆکوەزیری، بەشێک لە نیزیکان‌و خزمانی هووەیداش لە بوونی ئەو پەروەندەیە ئاگادار بوون. فەرەیدوونی هووەیدا ڕۆژێک پەروەندەکەی لەسەر مێزی براکەی دیتبوو. لە چەندوچۆنی نێوەرۆکەکەی پرسیبوو. هووەیدا

وەڵامێکی سەربەرەژووری دابۆوە. تەنیا ئەوەندەی گوتبوو کە بەڵگەکانی ئەو پەروەندەیە پێوەندییان بە چالاکییە ئابوورییەکانی بنەماڵەی پادشایەتییەوە هەیە. خەرمانانی١٣٥٧ (١٩٧٨)، کاتێک دەنگۆی گیرانی هووەیدا لە تاران داکەوت، فەرەیدوونی هووەیدا یەکێک لە دۆستانیی کە نیگەرانی ئایندەو سلامەتیی هووەیدا بوو، دڵنیا کردەوەو گوتی: "ئەمیر عەبباس نیگەرانی وەزعی خۆی نیە. بۆ ئیسباتی بێ-گوناحیی خۆی بە ڕادەی پێویست بەڵگەی کۆ کردوونەوەو هەمووشی لە جێگایەکی ئەمین داناون."[11]

یەکەمین نیشانەی ناڕاستەوخۆی بوونی ئەو بەڵگانە دەتوانین لە نامەیەکی دەستخەتی هووەیدا خۆیدا وەبینین. نامەی ڕۆژی ٢٨ی گەلاوێژی ١٣٤٨ی وی لە دوو بەشی کورت پێک هاتوە: یەکیان بە فەڕانسەییەو ڕووی دە فەرەیدوونەو ئەوی دیکە بە فارسی بۆدایکی هووەیدا نووسراوە. نێوەرۆکی هەردووکیان یەکەو لەوێدا هووەیدا ئاماژە بە بوونی " کاغەزە تایبەتییەکانم کە لە دوو چەمەدانی چووکەڵەدان" دەکاو داوا لەدایکیو براکەی دەکا ئاگایان لەو بەڵگانە بێ.

کاری هووەیدا بۆ کۆکردنەوەی ئەو پەروەندەیە لەبەر چاوی ساواکیش ون نەبوو. بە ڕواڵەت یەکەمین ڕاپۆرت لەو بارەیەوە ئاخرو ئۆخری ساڵی١٣٥٥ (١٩٧٧) بڵاو بۆتەوە. لەو ڕاپۆرتەدا هاتوە کە: "ژمارەیەک لە پەروەندە تەواو نهێنییەکان کە سەرۆکوەزیری پێشوو ئاغای هووەیدا لە سندووقی پۆڵای ژووری خۆیدا ڕایگرتبوون نەدراونەوە بە ئاڕشیڤو زۆر وێدەچێ بردبنیە ماڵێ خۆی یان شوێنێکی ئەمینتر. ئەمانە ئەو دۆسییانە بوون کە بە ڕێگای جۆراوجۆردا کەلکی خەراپیان لێوەرگیراوە یان دەستوورێک بە پێچەوانەی قانوونو ڕێوشوێنەکان دەرچووە."[12] خەزەڵوەری ١٣٥٧(١٩٧٨)، چەند ڕۆژ بەر لە گیرانی، دووبارە بەپێی ڕاپۆرتی ساواک، "ئەمیر عەبباسی هووەیدا، سەرۆکوەزیری پێشووتر لەلای کەسانێک کە چوونە سەردانی گوتوویەتی ئەوکاتەی تۆمەتێکی لێدراوە، بە پێشبینیی پێشتر، ڕووداوەکانی ئێرانی کە بۆخۆی شاهیدیان بووە لە٣٠٠ لاپەڕدا ڕێک-

خستوەو بۆ خزمێکی خۆی لە دەرەوەی وڵاتی پۆست کردوون تا ئەگەر ڕۆژێک موحاکەمە کراو هێندێ وتاریان لە ئێران بەدژی وی چاپ کردن، هاوکات، ئەو یادداشتانە وەرگێڕن و لە چاپەمەنیی وڵاتانی دەرەوەدا چاپیان بکەن.[120] ڕەنگە هووەیدا ئەم قسانەی بە هەڕەشە کردبن. بە بووکێی گوتوە تا خەسوو گوێی لێبێ. ویستوویەتی شاو ساواک لە فکری گرتنی خۆی پەژیوان بکاتەوە. بەهەرحاڵ، ئەگەر مەبەستی شتێکی لەو بابەتە بووبێ، دەبێ بڵێین کە کارەکەی سوودێکی نەبەخشی و بێهوودە دەرچوو.

ئەو خزم و نیزیکانەی هووەیدا کە لە بوونی پەروەندەکە ئاگادار بوون هەموویان دەڵێن هەرچی تێدا بووە لە ڕۆژە پڕترس و لەرزەکانی سەرکەوتنی شۆڕشدا سووتێندراوە. لە دادگای هووەیداشدا مەسەلەی ئەو پەروەندەیەو چارەنووسەکەی هاتە گۆڕێ. سەرۆکی دادگا لە هووەیدای پرسی داخوا حازرە نێوەرۆکی ئەو پەروەندەیە بداتە دادگای شۆڕش. هووەیدا نەچووە ژێر بار. بە زمانێکی بەپارێزو بەحورمەتەوە پێشنیاری سەرۆکی دادگای ڕەت کردەوە*.

ساڵەکانی سەرۆک‌وەزیریی هووەیدا دەتوانین بە دوو دەورانی جیاواز دابەش بکەین. دەورانی یەکەم پڕلە شەوق و ئومێد بوو. هووەیدا هەمیشە بە دەماغ و چالاک دیار بوو. بەردەوامی و پڕکارییەکەی وەک ئەوکەسانە دەچوو کە ئەرکێکی مێژوویی لەسەر شانی خۆیان هەست پێ‌دەکەن. کۆسپەکانی سەر ڕێی بە هیچ نەدەزانی. باوەڕی پتەو بوو کە بە کاری سەخت و شێلگیرانە، دەتوانرێ هەموو کۆسپێک لەنێو ببرێ.

---

* ئەمن توانیم دووسێ پەڕ لەو پەروەندەیە کە لە بڵێسەی ئاور ڕزگاریان ببوو پەیدا بکەم. ئەو پەڕانەیان بەومەرجە دامە دەست کە وردەکاریی نێوەرۆکەکەیان چاپ نەکەم. ئەم مەرجەم قبووڵ کرد. بە باوەڕی من ساغکردنەوەی بوونی ئەو پەروەندەیە لە چاپی گۆشەیەک لەو شتانەی تێیدان کەمبایەختر نیە. لە هەر لاپەڕێکدا لیستێکی دەستنووس دەبینین کە لەواندا ڕادەی بەشە بانکییەجۆراوجۆرە-کانی ئەندامانی بنەماڵەی پادشایەتی باس کراون.

لەجێدا بێکارەیی پێ قبووڵ نەدەکرا. وشیاریی دەدا بەو کەسانە کە خۆیان لە هەموو تێکەڵی‌و هاوکارییەک دەگەڵ ڕێژیم دەپاراست، دەیگوت لە دەرەوەی مەیدانرا هیچ گۆڕانێک بەدی نایە. لە ڕاستیدا، لەو دەورانە پڕپاپەرەی یەکەمدا، هەمیشە لە هەوڵی باش‌کردنی پێوەندیی ڕێژیم دەگەڵ تویژە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵدا بوو. ئەم ڕاستییە کە بڵاوکراوەکانی ئەو سەردەمە دەکرێ بڵێین هەموو ڕۆژێ باسی ڕووخانی نیزیکی کابینەکەی‌یان دەکرد، شوێنێکی لەسەر ورەی لەشکان‌ناهاتووی دانەدەنا. دایم دەگەڵ نوێنەرانی چاپەمەنی دیدارو وتوویژی دەکرد. کۆمەگی بە دامەزرانی یەکیەتیی نیوەڕەسمیی ڕۆژنامەنووسان کردو لەلایەن دەوڵەتەوە زەوییەکی بۆ دروستکردنی خانووی هەرزان‌بایی دا بەو یەکیەتییە. تەنانەت گۆڤاری "خواندنیها" کە دوژمنایەتیی کۆنیشی دەگەڵی هەبوو پێی لەو ڕاستییە نا کە سەبرو سیکەدانەی سەرۆک‌وەزیری تازەو ڕەفتاری جوانی، ڕەزامەندی‌و ئافەرینی بەشێک لە نەیارانیشی بزواندوە.[14]

بەلام دەورانی دووەمی سەرۆک‌وەزیریی هووەیدا جۆرێکی دیکە بوو. گیانی خۆبەدەستەوەدان بەرامبەر بە ڕاستییەکانی دەوروبەر بە سەریدا زاڵ ببوو. دەتگوت قبووڵیەتی کە ڕاستییەکانی ئێران نەگۆڕن. لە جیاتی خەبات دژی کاری ناقانوونی، ئێستا ئیدی تەنیا بە ڕاگرتنی پەروەندەیەک لە گەندەڵی‌و کاری ناقانوونی وازی دێناو مەبەستی لە کۆکردنەوەی ئەو دۆسیەیەش تەنیا پاراستنی قازانج‌و جێگەوپێگەی خۆی بوو. هەرچەند جاروبار بەگژ هێندێ حاڵەتی ئەو گەندەڵییەدا دەچۆوە، بەلام زۆربەی وەخت بێدەنگەی لێ‌دەکردو ئەگەر دۆست‌و خزمەکانیشی ئاماژەیان بە بەربڵاویی گەندەڵی دەکرد، هووەیدا وەلامەکەی کەم‌وزۆر یەکشت بوو. دەیگوت: "نیگەران مەبن، ئەمانە هەموو بەرهەمی لەچارنەهاتووی هەڵدانی ئابوورین. لە دوورەدیمەنی هەموو ئابووریی ولاتدا ئەم وردە بێروبەوێدادانە گرنگ نین."[15]

پەرویزی ڕاجی کە ماوەیەکی زۆر سەرۆکی دەفتەری هووەیدا بووو دوایە کرا بە باڵیۆزی ئێران لە ئینگلستان، دەیگوت هووەیدا

بــە تایبــەتی لــە دواســاڵەکانی حکوومــەتی خۆیــدا، "زۆرجــار لــە خۆبەخۆیایەتیـدا قبـووڵی بـوو کـە سیاسـەتەکانی ئیـدی نوێکردنـەوەو داهێنانیـان تێدا نیە. دەیگـوت قسـەکانی لـەلای خـەڵک ئیعتیبـارێکی وایـان نەماوە. بۆخۆشی وا دیار بوو متمانەیەکی بەم قسانە نیە. لەو ساڵانەدا زۆر مانـدوو دیـار بـوو. بـە ئاسـانی تـوورە دەبـوو. بەدئەخلاقو کـەم-حەوسەلە ببوو."[16] لە ڕاستیدا تەنانـەت توندترین لایـەنگرانی هووەیـداش لەوەدا یەکدەنگن کە ئەو لەو دەورەیـەدا ببووە شـەیداو سـەوداسـەری خۆشـیو چێـژە لاوەکییـەکانی دەسـەڵات.[17] بـۆ پاراسـتنی پۆسـتەکەی هـەموو سـووکایەتییەکی قبـووڵ دەکرد. جارێکیـان زۆر بـە ڕاسـتوێژیو واقیعبینیی ڕەخنەگرانە گوتبووی: "هێندێ کەس تریاکین؛ هێندێک ئاشقی مـاڵی دنیـان. هێنـدێکیش ڕمـوودەی دەسـەڵاتن."[18] مەبەسـتی لەوانـەی ڕموودەی دەسەڵاتن دەبێ پێش هەمووان خۆی بووبێ.

نـاتوانین بـەوردی دیـاری بکـەین لـە چ سـاڵێکدا شۆڕوشـەوقو لیبڕالیزمو بێموبالاتی بە دەسەڵات کە هەموویان سروشتە تایبەتییەکانی سـەردەمی یەکـەمی حکوومەتەکـەی بـوون کۆتـایی هـاتو دەورانـی زیانباری ڕەشبینیو ئۆگریی توندی بە دەسەڵاتو سەرۆکوەزیرییەوە دەستی پێکرد. لە برگەی جۆراوجۆردا، هێنـدێک لـە دۆسـتانو خزمانی ئامۆژگاریـان دەکرد کـە دەبێ واز لـە کـاری سـەرۆکوەزیری بێنێ. وەڵامی هەمووانی کەموزۆر وەکیەک دەدایەوە. دەیگوت: "بوونی من هەرنەبێ پێشی هێندێ دزی چاوەڕوانی دەسەڵات دەگرێ. ئەگـەر ئـەمن بکشـێمەوە، شـەوەی دواتـر حەتمـەن خـەراپتر دەبـێ." فەرەیـدوونی هووەیداش چەند جار داوای کردبوو لەکار بکشێتەوەو وەڵامی هووەیدا بەویش لـەوەی بـە دۆسـتانی دیکـەی گوتبـوو جیا نـەبوو. دەیگـوت: "لـە ئێران هیچکەس هەقی کشانەوەی نیە. هەموو دەبێ چاوەڕوانی فـەرمانی شاهەنشا بن. کشانەوە تەنیا بە فەرمانی ئەوانە."[19]

دوولایەنی گرنگی ڕەفتاری هووەیدا لەم دەورانەدا نەگۆڕان. یەکیان دەستپاکیی ماڵی بوو، ئەوی دیکە بێفیزی کە خۆپاراستن لە کەشوفشی دەسەڵاتیشی دەگەڵ بوو. بە وتەی یەکێک لە مەئموورانی باڵیۆزخانەی

ئەمریکا، هووەیدا هەمیشە "بێفیز دیار بوو...و حەزی لە خۆڕانان بە دەسەڵاتەوە نەبوو."[20] بۆ هاتوچووی ئیداریو تایبەتی، دەکرێ بڵێین هەرگیز کەلکی لە ترومبێلی ڕەسمیی سەرۆکوەزیر وەرنەدەگرت. ئەو بۆخۆی پەیکانێکی سادەی هەبوو کە ئامرازی سەرەکیی هاتوچووی بوو. ئەو پەیکانەشی بۆخۆی لێدەخوڕیو سەرۆکی گرووپی پارێزەرەکانی لە کورسیی پشتەوەی دادەنیشت. جاری وابوو ترومبێلێکی دیکەی بەدوادا دەڕۆیشت کە پارێزەرەکانی دیکە سواری دەبوون.[21] لە ڕاستیدا ئەو هەرچەند دەسەڵاتی زۆر پێخۆش بوو، بەڵام جۆرێک خۆبەکەمگرتنی سروشتییشی هەبوو کە لە زۆربەی سەرۆک-وەزیرانی پێشووی وڵاتی جیا دەکردەوە.

جاری واش بوو لەسەر ڕێی کارەکەی، بە پێچەوانەی وشیارکردنەوەو نیگەرانیی پارێزەرەکانی، هووەیدا لە پێش سەفی ئۆتووبووس ڕادەوەستاو ژنێک یان پیاوێکی کە چاوەڕوانی ئۆتووبووس بوو بانگ دەکردە نێو پەیکانەکە. دەیەویست لەم ڕێگایەوە هەڵکشانو داکشانی بیروڕای گشتیی کۆمەڵ بزانێ. هەرلەو کاتەدا ئەو دەرفەتەی بۆ ژمارەیەکی بەقەد قامکی دەستان لە موسافیرانی هێڵی ئۆتووبووسی تاران پێکدێنا کە ڕاستەوخۆو بێواسیتە دەگەڵ سەرۆک-وەزیری وڵات دیدارو دەردی دڵ بکەن.

دیارە نەیارانی هووەیدا، بە تایبەتی ئەسەدوڵڵای عەلەم، ئەم لایەنەی ڕەفتاری هووەیدایان بە شتێک جگە لە نەزانخەڵەتێنی یان بە وتەی عەلەم "دێماگۆژی"، نەدەزانی. عەلەم چەند جار هووەیدای وشیار کردبۆوە کە کاری ووەک کەلکوەرگرتن لە پەیکان لە جیاتی ترومبێلی سەرۆکوەزیر لە خۆڕانان بەولاوە شتێک نیە. عەلەم ئیددیعا دەکا کە هووەیدا هەرگیز بەرامبەر بەو ڕەخنانە "وەڵامێکی نەبوو بیداتەوە." هەرلەو کاتەدا، عەلەم دەڵێ زۆرجار باسی ئەم وتووێژانەی عەرزی شا کردووەو داماویی هووەیدا بۆتە هۆی کرانەوەی شاو وەپێکەنینی خستوە.[22]

ئەو پێکەنینەی شا نابێ بە ڕووداوێکی ڕێکەوت بزانین‌و هەرلەو کاتەشدا ناکرێ تەنیا وەک نیشانەی هاودەستیی شا لە قوونەشەڕی هەمیشەیی‌و زۆرجار توندو جاروبار تەنانەت مندالآنەی عەلەم‌و هووەیدایدا سەیر بکەین. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی شێوەی کاری شا دروستکردنی دووبەرەکی‌و چەنددەستەیی لە نێوان ژێردەستەکانیدا بوو. لەم ڕێگایەوە دەسەڵاتی خۆی سەقامگیر دەکرد. هەروەک لە ڕاپۆرتی باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە ئێراندا بە ڕاشکاوی هاتوە، شێوەی حکوومەتی سەرەڕۆی شا پێویستیی بەوە هەبوو کە، "مودیرانی وڵات، لە هەموو پلەکاندا، هەمیشە دەگەڵ یەکتر لە ململانەدا بن. جارێک ئەو ململانەیە لەسەر مەسەلە ئیدارییەکان بوو؛ جارێک لەسەر مەسەلە کەسییەکان. بەمجۆرە هێزێک کە دەبوو سەرفی ئەنجامدانی کاروباری وڵات بکرێ لە ڕێگای پیلانی هەمیشەیی [مودیران دژی یەکتر]دا بەفیڕۆ دەچوو."[٢٣] بە جۆرێکی دیکە بڵێین شا نەکهەر قوونەشەڕی هەمیشەیی عەلەم‌و هووەیدای قبووڵ دەکرد، بەڵکوو بە ڕواڵەت ئاگرەکەشی خۆشتر دەکرد.

هەرچۆنێک بێ، سەرباری ڕەخنەو تەشەرەکانی کەسانی وەک عەلەم، هووەیدا هەروا بە پەیکانەکەی خۆی دەچووە سەر کار. جگەلەوە، هێندێجار بە زمانی خەڵکی ئاسایی قسەی دەکردو جاری وابوو گاڵتە سووکو باوەکانی ڕۆژی دووپاتە دەکردنەوە. لە میوانداریییەکاندا هێندێ جار بە شێوەیەک هەڵدەپەڕی کە بەشێک لە قەدیمییەکان بە ناشیرنیان دەزانی. لە دیدارە ڕەسمییەکاندا، زۆرجار لە ڕێبازە دیاریکراوەکە دەچووە دەرو دەگەڵ خەڵکی ئاسایی دەکەوتە قسەوباس. ئەو جۆرە کارانەی نەکهەر دەبوونە مایەی نیگەرانیی پارێزەرەکانی، بەڵکوو ئەوانەی قسەشی دەگەڵ دەکردن سەریان سوڕ دەما. لە کۆڕوکۆمەڵە دەرباریییەکاندا، هووەیدا بەڕاستی جێگەوپێگەیەکی جیاوازی هەبوو. غەوارەیەکی ئاشنا بوو. بە پێوانەکانی ئەوکات شێوەو جۆری ژیانی دەروێشانە بوو. دەگێڕنەوە تەنانەت لە سەردەمی سەرۆکوەزیرییەکەیدا، ڕۆژێک شا دەچێتە سەردانی ماڵێک کە هووەیدا

دەگەڵ دایکی لیی دەژیا. سادەیی ماڵەکە دەبێتە جێی سەرسوڕمانی شا. گۆیا لە هووەیدا دەپرسێ، "چۆن لەوکولانە مریشکەدا دەژین؟"[٢٤٠]

کاری ڕۆژانەی هووەیدا لە دەفتەرەکەی عادەتەن بە ڕاپۆرتی یەکێک لە کارمەندەکانی دەست پێدەکرا. دەستەیەکی زۆر بژاردەو جێی متمانەی لە دەفتەری خۆیدا خڕکردبوونەوە. کەموزۆر یەکیەکی ئەو کەسانەی لە دەفتەرەکەیدا کاریان دەکرد، لەباری ماڵییەوە ناوبانگیان باش بووو هووەیدا ڕەفتاری وانی بە پێوانەی وردو سەختگیرانە هەڵ-دەسەنگاند. ڕەفتاری دەگەڵ ژێردەستانی زۆرتر نەرمو دۆستانە بوو. بەڵام جاری وابوو، بەجارێک، دەبوو بەتوندیو توورەیی. دەنگە ئارامو دۆستانەکەی لەنەکاو دەبوو بە نەڕەیەکی قیناوی. دیارە عادەتەن تەنیا چەند دەقیقە دوای ئەو نەڕاندنە، ئەو کارمەندەی چەند ساتێک پێشتر سەرزەنشت کرابوو، بانگی دەکردە کن خۆیو دڵخۆشیی دەدایەوە. جارێکیان پاش یەکێک لەو ساتە توورەییانە بۆ دڵخۆشیدانەوە بە کارمەندەکانیی گوتبوو: "ئەمن بنەماڵەم نیە. ئێوە وەک بنەماڵەی من وان. قیژەو هەرایەکەم هەروەک کێشەی نێو بنەماڵە وەربگرن."[٢٥٠]

هووەیدا هەرلەوکاتەدا یاریکەرێکی کارامە بوو کە دەیتوانی بەپێی بارودۆخو پێویستیی ڕۆژگار، ڕقو پێکەنین، یان خەفەتو پەرێشانی لەخۆی نیشان بدا. بەڵام ئەو پێش هەموو شتێک دیپلۆماتێکی کارامە بوو. دەیزانی چۆن لەپشت پەردەوە لۆسە(اهرم)ە پێویستەکان بۆ گەیشتن بە ئامانجە دڵخوازەکان بجووڵێنێ. هەم لە ستایشو ڕێزداناندا کارامە بوو، هەم لە هەڕەشەی ڕاشکاوانەو ناڕاستەوخۆدا. وەزعوحاڵی سۆزداریی کارمەندەکانی باش دەناسی. دەگمەن بوو جەژنی لەدایکبوون، یان زەماوەند، یان ڕووداوێکی گرنگی دیکەی ژیانی هیچ کامێکیانی لەبیر بچێ. لە هەر بۆنەیەکدا، دیارییەکی گونجاو بۆ ئەو بۆنەیەی ئامادە دەکرد. تەنانەت دەگەڵ دوژمنانیشی بە دەرگای دۆستایەتیدا دەچووە ژوور. جاری وابوو بە لۆکە سەری دەبڕیو زۆرتر دەیەویست بەخۆشەویستی نەیارانی خۆی چەک بکا. زۆر لەو کەسانەی هاتوچوویان دەگەڵی بووە داستانێکی وەک ئەوەی بەسەر

عەلینەقیی عالیخانی هاتبوو دەگێڕنەوە. لە یەکدووساڵی سەرەتای حکوومەتی هوەیدادا، عالیخانی کە بە پشتیوانیی ئەسەدوڵڵای عەلەم پشتئەستوور بوو، بە جۆرێک خەنیمو جێنشینی هوەیدا دەژمێردرا. لە دەورانێکدا کە عالیخانی وەزیر بوو پێوەندییەکانی دەگەڵ هوەیدا رووی لە ناخۆشی بوو. بگرە دوای ئەوەش کە عالیخانی کرا بە سەرۆکی زانکۆی تاران پێوەندیی وی دەگەڵ هوەیدا هەروا ناخۆش بوو. تەنانەت جارجار بە ئاڵۆزییەکی تازە ناخۆشتریش دەبوو. کارگەیشتبۆ جێگایەک کە لە ساڵی ١٣٤٩(١٩٧٩) بە دواوە عالیخانیو هوەیدا ئیدی یەکتریان نەدەدواند.

لەونێوەدا، خەسووی عالیخانی لە فەڕانسە کۆچی دوایی کرد. هوەیدا نەکهەر دەسبەجێ نامەیەکی سەرەخۆشیی بۆ سووزان، هاوسەری فەڕانسەیی عالیخانی بەڕێکرد، بەڵکوو کاتێک ئەو دەگەڵ مێردەکەی لە فڕۆکەدا، چاوەڕێی فڕین بەرەو پاریس بوون، یەکێک لە یاریدەرانی سەرۆکوەزیر بە نوێنەرایەتیی هوەیدا، چووە سەردانیان. پاکەتێکی لەلایەن هوەیداوە دانێ کە هێندێک "دراوی بێگانە بۆ خەرجی سەفەر"ی تێدابوو.[26]

لە هەوەڵین مانگەکانی سەرۆکوەزیرییەکەیدا، هوەیدا چارەسەری قەیرانی ئابووریی لە سەرووی هەموو بەرنامەکانی دەوڵەتی خۆیدا دەدی. کابینەی مەنسووریش ململانەی دەگەڵ ئەم قەیرانە کردبوو. بەمردنی مەنسوور، هوەیدا ڕایگەیاند کە لەسەر بەرنامە ئابوورییەکانی دەوڵەتی پێشوو دەڕوا. هەرلەوکاتەدا، بەڵێنی دا کە نەک- هەر بوودجەیەکی تازە ئامادە دەکا بەڵکوو قانوونی ماڵیاتو هەروەها قانوونی کارمەنددامەزراندنی وڵاتیش دەسکاری دەکا. بەڵام بەکردەوە، درێژەدانی سیاسەتە ئابوورییەکانی مەنسوور دژوار دەرچوو. پێش هەموو شتێک، بێزاریی بەربڵاوو ڕۆژبەڕۆژزیاتری خەڵک، لە هێندی بوواردا دەوڵەتی ناچار بە پاشەکشە کرد. بۆ نموونە، دوای ماوەیەک، دەوڵەت لە بەیاننامەیەکدا ڕایگەیاند کە، "بە فەرمانی ڕاستەوخۆی شا نرخی بەنزین، قەندو بەرقی داشکاندوە."[27] ئەم هەنگاوە هەرنەبێ لە

کورتخایەندا دەوڵەتی هووەیدای لەنێو خەڵکدا خۆشەویستتر کرد. لە لایەکی دیکە، بە داشکاندنی ئەو نرخانە دیارە کەمایەسیی بوودجەی دەوڵەت زیادی کرد. ئەم کەسری بوودجەیەش بە نۆرەی خۆی، دەوڵەتی ناچار کرد بوودجەی ئیدارەو وەزارەتخانە جۆراوجۆرەکان کەم بکاتەوە. دیارە سوپاو ساواک لەو قاعیدەیە بەدەر بوون. بوودجەی هەردووکیان شا بۆخۆی دیاریی دەکردو گۆڕینو کەمکردنەوەی هەڵ-نەدەگرت.

ئەگەر ڕاپۆرتی باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە ئێران بە پێوانە دابنێین، هووەیدا توانی بە وردەکاریو تێگەیشتنێکی جێگەی ئافەرین، بوودجەی وەزارەتخانە جۆراوجۆرەکان کەم بکاتەوەو "لە بەسەرهاتی ئەم دواییەی بوودجە سەربەرزو سەرکەوتوو بێتە دەر."[48]

جگەلەوە، بەرنامەی هەڵدانی ئابوورییش کە نەخشەکێشە ڕاستەقینەکەی ئەمریکاییەکان بوون، بەڕواڵەت سەرکەوتوو دەرچووبوو. بە باشبوونی وەزعی ئابووری، وەزعی سیاسییش باشتر بوو. تەنانەت دەنگۆی نێو میوندارییە شەوانەکانی تارانیش گۆڕا. بەپێی ڕاپۆرتی باڵیۆزخانەی ئەمریکا، "خەڵک ئیدی کەمتر باسی سیاسەت دەکەنو زۆرتر لەبارەی کارو کاسبیو مەسەلە سێکسییەکانو چەندوچۆنی ڕەحەتیی حەمامیماڵەکانیانەوە پێکەوە دەدوێن. بە دواڕۆژی خۆیان هیوادار بوون، و لە ئاکامدا کەمتریش ڕەخنە لە ڕێژیم دەگرن."[49]

بەڵام پاش ماوەیەک قەیرانێکی تازەی ئابووری لە ئاسۆ دەرکەوت. لە ئاکامی پاڵەپەستۆی ئاوساندا، نرخەکان بە خێرایی چوونە سەر. دەوڵەتیش سەری لێشێواو کەوتە فکری چارەسەری بەپەلە. لێرەدا، ئۆگریی هووەیدا بە دەفتەری فەڕانسەیی کۆنتڕۆڵی نرخەکان، و هە-روەها ئەو ڕاستییە کە بە گەنجی ئۆگری بیروباوەڕی مارکسیستی، و دەستتێوەردانی دەوڵەت بوو، هەموو دەستیان وەدەستی یەک داو لە دیاریکردنی جۆری سیاسەتی دەوڵەت بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئاوساندا کاریگەر بوون. گرنگتر لە هەمووی ئەوە بوو کە شاش

هەمیشە زۆر بە چوونەسەری نرخەکان قەڵس بوو، و بۆ کۆنترۆڵی نرخەکان بەکارهێنانی دەسەلاتی دەوڵەتی لە کەلکوەرگرتن لە میکانیزمی بازاڕ بە باشتر دەزانی. ئاکامەکە ئەوە بوو کە هووەیداش لە جیاتی کەلکوەرگرتن لە توانای دراوی‌و ماڵیاتیی دەوڵەت، سیاسەتی هێنانەخواری زۆرەملیی نرخەکانی گرتە پێش. خاوەنکالاکان لە هێنانەخواری نرخەکان بەولاوە چارەیەکیان نەبوو. ئەگەر لەو بارەیەوە سەرپێچییشیان لە دەستووری دەوڵەت کردبایە دەکەوتنە بەر لێپرسینەوەو سزا دەدران. جگەلەوە، بۆ شکاندنی بازاڕی گرانفرۆشان، دەوڵەت چەندین فرۆشگای تایبەتیی دامەزراند کە لەواندا کالای جۆراوجۆر بە نرخی هەرزان دەدرا بەخەڵک. ئەم فرۆشگایانە بەدڵی کۆمەڵانی خەڵک بوون، بەلام بە ئاشکرا خاوەنسەنعەتەکان‌و بازرگانەکانیان توورە کرد.[٣٠]

لە سەرەتای دەیەی چلی[هەتاوی]دا، سیاسەتی هێنانەخواری زۆرەملیی نرخەکان، هەرنەبێ لە کورتخایەندا، سەرکەوتوو بوو. ساڵی١٣٥٣، دووبارە پاڵەپەستۆی ئاوسان زیادی کردو ئەمجارەش دەوڵەتی هووەیدا هاتە سەر ئەوە کە تەنانەت شێوەیەکی لێبڕاوانەتر لە سیاسەتەکەی ساڵانی چل بگرێتە پێش. لە جەرگەی قەیرانە تازەکەدا، فەرەیدوونی مەهدەوی، کە وەختێک لە چالاکانی بەرەی نیشتمانی‌و لە ڕەخنەگرانی سەرسەختی هووەیدا بوو، وەک وەزیری بازرگانی چووە نێو کابینەوە[٣١].❀

شا، ڕاست مانگێکی مۆڵەت دا بە مەهدەوی کە نرخەکان بێنێتە خوار. هەڕەشەی کرد کە ئەگەر وا نەبێ بۆ داشکاندنی نرخەکان کەلک لە سوپا وەردەگرێ. لە ڕاستیدا فەرمانندەرانی سوپا بە فەرمانی شا

---

❀ تەنانەت ساڵی١٣٥٠ش شا هێشتا موسەددیقی لەبیر نەچووبۆوە. خۆشەویستیی موسەددیق مایەی ڕەنجو ئازاری شا بوو. کاتێک ئێران قەراروومەدارێکی تازەی دەگەڵ کۆنسێرسیۆم ئیمزا کرد،بۆی قورس بوو کە یەکێک لە ڕووما ناسراوەکانی بەرە، لە ڕادیۆدا دیفاع لەو قەراروومەدارە بکا.

کاردروستایی عەمەلیاتیکی وایان دەستیش پیکردبوو. مەهدەوی کە دەرسی ئابووریی لە ئەڵمان خوێندبوو، دەیگوت: "ئەمن لە سەردەمی خوێندکارییەوە، دەگەڵ سیاسەتی نرخ‌داشکاندنی نازییەکان کە ساڵی ١٩٣٦ جێبەجێ کرا ئاشنا بووم. ئەودەم، دەوڵەتی ئەڵمان نەکھەر زیادکردنی نرخەکانی قەدەغە کرد، بەڵکوو نرخی هەر کاڵایەکیشی بۆخۆی دیاری‌و سەقامگیر کرد. ئەمنیش هەر ئەو سیاسەتەم ڕەچاو کرد."[٢٢٠] جگەلەوە، مەهدەوی بۆ کۆنترۆڵی نرخەکان کەلکی لە خوێندکارانی زانکۆکانی ئێران وەرگرت. ئەم خوێندکارانە تەنانەت هەقیان هەبوو سەرپێچی‌کەران بشکرن. ڕەفتاری وان نارەزایەتیی کاسبکاران‌و دوکانداران‌و خاوەن‌سەنعەتەکانی زیاتر کرد. نرخەکان سەقامگیر بوون. سوپا نەهاتە نێو کاری خەبات دژی ئاوسان. بەڵام ئەمجارە دەرمانی دەردەکە لە دەردەکە خۆی خەراپتر بوو، و ژمارەیەکی زۆر لە کاسبکارانی ناردە نێو ڕیزی نەیارانی ڕوولەزیادبوونی شا. لە یەک قسەدا، ئەزموونی ساڵەکانی چل، کۆمەگی بە سیاسەتی دژی ئاوسانیی دەوڵەت لە ساڵەکانی دەیەی پەنجادا کرد.

ساڵی ١٣٤٤(١٩٦٥) نەکھەر چارەسەری قەیرانی ئابووری ئاسان دەرنەچوو، بەڵکوو هووەیدا تێگەیشت کە کاری گۆڕینی قانوونی کارمەنددامەزراندنی وڵاتیش لەباری سیاسییەوە ڕەوتێکی پێچەڵپووچ‌و مەترسیدارە. لەوکاتەدا، ئیدارە دەوڵەتییەکانی ئێران پڕ لە کەسانێک بوون کە مووچەیەکی کەمیان وەردەگرت‌و کارێکیشیان نەدەکردو دیارە ئەوانە قازانجی خۆیان لە پاراستنی وەزعی حازرو (نەمرنەژی)یەکەی خۆیاندا دەدی. یەکێک لە هونەرە سەرەکییەکانی هووەیدا وەک سیاسەتمەدارێک سەبرو حەوسەلەکەی بوو. دەیزانی هەر شەڕێک کە ئەمڕۆ دەرەتانی بردنەوەی نیە سبەینییەکی لە پێشدایە. بە دەگمەن خۆی لە شەڕێک دەدا کە لە بردنەوەی دڵنیا نەبایە. وەختێک تێگەیشت کە نرخی سەرکەوتن لە شەڕی پەسندکردنی قانوونی تازەی دامەزراندندا دەتوانێ زۆر گران بێ، کاری پڕۆژە بڕیارەکەی خستە وەختێکی دیکە. بەفرانباری ١٣٤٣، دەوڵەت ڕایگەیاند کە بەهۆی

پاڵەپەستۆی ماڵییەوە، ئەنجامی چاکسازیی پێویستی سیستمی دامەزراندنی وڵاتی بۆ وەختێکی دیکە هەڵگرتوە. دیارە باڵیۆزخانەی ئەمریکا پێی وابوو هۆی دواخستنەکە نەک ماڵی بەڵکوو تەواو سیاسییەو لەو باوەڕەدا بوو کە دەوڵەت دەیەوێ، "لەم ڕێگایەوە دژایەتیی گرووپە بەنفووزە کارمەندییەکان بەلانی کەم بگەیەنێ."[۳۳۰] هەرلەو کاتەدا، قانوونە ماڵیاتییە تازەکانیش هەر لە یەکەم مانگەکانی تەمەنی دەوڵەتی هوەیداوە، "لە وەزارەتی دارایی، و بەڕێنوێنیی ڕاوێژکارێکی سندووقی نێونەتەوەیی دراو خەریکی ئامادە کران بوون."[۳٤۰]

هوەیدا لە کاری سەرۆکوەزیریدا شێوەو ڕەواڵی تایبەت بەخۆی هەبوو. کەموزۆر هەر ڕۆژە نانی نیوەڕۆی دەگەڵ کۆمەڵێکی جیاواز لە خەڵک دەخوارد. ڕۆژێک نۆرەی ڕۆژنامەنووسان بوو، ڕۆژی دواتر نوێنەرانی مەجلیس، تەوەری زۆر لە چالاکییەکانی لەو سەردەمەدا ڕاکێشانی چەند توێژێکی زیاتری خەڵک بۆ نێو ڕێژیم بوو. دەیەویست ئەوان لە چوارچێوەی ئەو ڕێوشوێنەدا کە ڕێژیم بۆخۆی دای‌نابوو، بەرەو هاوکاریو هاوبەشیی سیاسی ڕابکێشێ. بۆچوونی سەبارەت بە مەرگی موسەددیق نوێنگەی بەرچاوی شێوەی کارەکەی بوو. شازدەی ڕەشەمەی ١٣٤٥(١٩٦٦) موسەددیق، لە تەمەنی٨٧ ساڵیدا، بە سەرەتان مرد. بە فەرمانی دەوڵەت چاپەمەنیی ئێران خەبەری مردنەکەی‌یان تەنیا بە چەند دێڕی کورت بڵاو کردەوە. هوەیدا دەگەڵ ئەوجۆرە ڕەفتارە نەیار بوو. "پێشنیاری بە شا کرد بە گوێرەی جێگەوپێگەی موسەددیق وەک سەرۆکوەزیری پێشووتری ئێران سەرەخۆشییەکی چووکەڵەی بۆ دابنرێ. گۆیا شا بەتوندی دژی ئەو پێشنیارە ڕاوەستاوەو گوتوویە دەیەوێ هەموو ناوونیشانێکی موسەددیق لەم وڵاتە بسڕێتەوە."[۳٥۰] دیارە سەرەخۆشییەک بۆ موسەددیق دانەنرا. ڕۆژی مەرگی ناوبراو، ئاڵای سێ‌ڕەنگی ئێران لە پێتەخت خرایە وەزعی نیوەهەڵدراوەوە، بەڵام نەک بۆ مەرگی پیاوێک کە تەنانەت باڵیۆزی ئەمریکاش ئەوی بە یەکێک "لە بەرچاوترین کەسایەتییەکانی ئێران" دەزانی، بەڵکوو بۆ ڕێزدانان بۆ

مەرگی فەرمانداری گشتیی کانادا، "جۆرج واینێر"[٣٦] ❀

جگە لەوە، لە سەرەتای حکوومەتی هووەیدادا، وەک لە هێندێک ڕاپۆرتی باڵیۆزخانەی ئەمریکا دەردەکەوێ، هێندێ هەوڵ بۆ گێڕانەوەی ئایەتوڵڵا خومەینی بۆ ئێران دران. "قەرار وا بوو بەرامبەر بە مۆڵەتی گەڕانەوە ئەویش بەڵێن بدا کە ئیدی دەست لە کاروباری سیاسی وەرنادا."[٣٧] مەهدیی پیراستە، کە ساڵی١٣٤٤ باڵیۆزی ئێران لە عێراق بوو، هێڵە گشتییەکانی ئەم ڕاپۆرتە پشتڕاست دەکاتەوە، بەقسەی وی، چەند ڕۆژ دوای ئەوەی چووە بەغدا، "یەکێک لە نیزیکانی خومەینی هاتە باڵیۆزخانە. دەیەویست کارێک بکا کە[ئایەتوڵڵا] بتوانێ بگەڕێتەوە ئێران. ئەمن خۆم لەو کارە نەدا. گوتم متمانەم بە خومەینی نیە. بە شام گوتبوو کە نەدەبوو دووری خستبایەوە. گوتم دەبوو لە ماڵێکی ئێراندا وەک بەندی ڕایبگرین."[٣٨] پیراستە دەیگوت نوێنەری ئایەتوڵڵا خومەینی کە لەمن نائومێد بوو پەنای بۆ سەرهەنگ پەژمان، نوێنەری ساواک لە باڵیۆزخانەی ئێران، برد. پەژمانیش بەنۆرەی خۆی پێوەندیی بە تارانەوە گرت و پاش ماوەیەک وەڵام هاتەوە کە هیچ ڕێککەوتنێک دەگەڵ ئایەتوڵڵا خومەینی مومکین نیە.[٣٩] نەخشی هووەیدا لەو وتوویژانەدا ڕوون نیە. جگەلەوە، هەرچەند ئەو بۆ زیارەتی گڵکۆی حەزرەتی ڕەزا چووە مەشهەد، "و دایکییشی ناردە حەج"، بەڵام هەروەک جاران زۆر لە ڕووحانییەکان نەیاری بوون. بە باوەڕی باڵیۆزخانەی ئەمریکا، هۆی سەرەکیی ئەو نەیارییە "ئەم دەنگۆیە بوو کە هووەیدا بەهاییە و ئەندامانی ئەو گرووپەش لە ئێراندا بێزراون."[٤٠] دیارە لەسەریەک وا دێتە بەرچاو کە هەرنەبێ لە چەند ساڵی سەرەتای حکوومەتی هووەیدادا، پێوەندیی دەوڵەتی وی دەگەڵ ڕووحانییەکان لە پێوەندییەکانی دەورانی مەنسوور باشتر بوو.[٤١]

هەرچەند هێندێک لە ڕووحانییەکانی تاران، پاش ئەوەی هووەیدا چاکەی دەگەڵ کردن، نەزەرێکی باشتریان دەرهەقی هەبوو، بەڵام لەو

❀ George Weiner.

بارەیەوە گۆڕانێک لە هەڵوێستی ئایەتوڵڵا خومەینیدا بەدی نەهات. لە تەنیا نامەیەکدا کە بە درێژایی ژیانی بۆ هوەیدای نووسی، هیچ نیشانەیەک لە نەزەری باش بەرامبەر بە هوەیدا، یان نەرمبوونی هەڵوێستی بەرامبەر بە دەوڵەت ناتوانی وەبینی. هەرلەو کاتەدا، لە نامەکەدا هوەیدا بە بەهاییبوون تۆمەتبار نەکراوە. نامەکە ساڵی١٣٤٦ نووسراوە. ئەوکات ئایەتوڵڵا خومەینی مەلایەکی دوورخراوەو هوەیدا سەرۆکوەزیری وڵات بوو. بەوحاڵە ڕاوێژی نووسراوەکە زیاتر وەک پەندو تەشەری بەڕێوەبەری قوتابخانە بۆ قوتابییەکی خەتاکار دەچێ. دەڵێ: "جەنابی ئاغای هوەیدا، پێویستە هێندێ ئامۆژگاریت بکەمو هێندێ قسەت وەبیر بێنمەوە... چ دەسەڵاتت هەبێ قبووڵیان بکەیو چ نا..." لەو نامەیەدا هەروەها ئاماژە بە"حکوومەتی پۆلیسیی ئێوە"و "ڕیاکاریو فێڵبازیی ئێوە" کرابوو. هۆشداری بە دەوڵەتی هوەیدا دابوو کە ئیسرائیل "بەسەر کاروباری ئابووریی وڵاتدا" زاڵ بووەو بەناڕەوا دەست لە مەبسەلە فەرهەنگییە-کانیش وەردەدا. لە کۆتاییدا ئایەتوڵڵا خومەینی بە ڕاوێژێکی پڕتانووتو بەجۆرێک هەڕەشە دەپرسێ: "چۆن ویژدانتان قبووڵ دەکا بۆ حکوومەتێکی زووتێپەڕ ئەو هەموو جامەلووسکەییە بۆ بێگانە بکەنو پاشەکەوتەکانی میللەتیان بەخۆڕایی یان بە شتێکی کەم تەسلیم بکەن... تاوانەکانتان لەقاو دەدەرێن. تواناتان نیە ئازادی بدەن...ئەوندە ڕاووڕووت لە کاسبکارە نەدارەکان مەکەن... پێتان دەڵێم بەڵکوو وشیار بنەوەو بەخۆدا بێنەوە."[٤٢]

نێوەرۆکی نامەکە جگە لە ڕاوێژەکەی لە بارێکی دیکەشەوە گرنگییەکی تایبەتیی هەیە. ئەگەر باش چاو لە نێوەرۆکەکەی بکەین دەبینین ئەو تۆمەتانەی لەوێدا دراونە پاڵ هوەیدا دوازدە ساڵ دواتر، لە داوانامەی دادگای شۆڕش دژی هوەیدادا سەرلەنوێ سەریان هەڵ-داوەتەوە. ئاشکرایە لە کاتی نووسینی نامەکەدا کەس باوەڕی نەدەکرد کە لە مەودایەکی بەڕاستی کورتدا نووسەرەکەی ببێتە ڕێبەری شۆڕش-و ئەوەی بۆشی نووسراوە ببێتە زیندانیو دیلی دەستی وی.

لە ڕۆژەکانی سەرەتای سەرۆکوەزیریدا، هووەیدا سەفەریشی زۆر دەکردن. سەری دوورترین نوختەکانی ئێرانی دەدا. ناناوەندی-کردنی دەوڵەت یەکێک لە پایەکانی بەرنامەی کاری بوو. وەخت و توانایەکی زۆری بۆ ئەوکارە خەرج دەکرد. زۆرجار کۆبوونەوەی دەوڵەتی لە نوختە دوورکەوتووەکانی وڵات پێکدێنا. هێندێ جار بە سەردان دەچووە ئەو شوێنانە. زۆر لەو سەفەرانەی لەنەکاوو بێ-ڕاگەیاندنی پێشتر بوون. پێش سەفەر زۆرتر ڕاوێژکارە متمانەپێکراوەکانیی ڕادەسپارد لە نیزیکەوە لە پرسەکانی ئەو ناوچەیە بکۆڵنەوەو چەندوچۆنەکەی بۆ باس بکەن. سەردانی لە تەوریز لە دووی گەلاوێژی ١٣٤٦دا نموونەیەکی ئەو سەفەرانە بوو. ئەمجارە لەیلای هاوسەرییشی دەگەڵ بوو. کۆنسوولی ئەمریکا ڕاپۆرتێکی کەمێک درێژی لەسەر ئەو سەفەرە نووسیوە؛ تێیدا دەڵێ هووەیدا بە ئاشکرا دەیەویست کاربەدەستانی شارەکە تەمبێ بکا. دەڵێ سەرۆکوەزیر بێ-خەبەردانی پێشتر هاتە شارەکە.

زۆر گوێی نەدایە ڕێوشوێنی ڕەسمی...بەرنامەیەکی زۆر چڕوپڕی هەبوو. چاوی بە هێندێک لە بەرپرسان کەوت. سەری چەند ناوەندی جۆراوجۆری دەدا. دەسبەجێ دەستووری پێویستی دەداو کاربەدەستانی شاری دەخستە پەلەقاژەوە...ڕوانینی وەک هەڵۆ تیژبینی چەند کونی لە میچی سالۆنی چاوەڕوانیی ئێزگەی قەتاردا دۆزینەوە. هەربۆیە سەرۆکی ڕێگەی ئاسنی بە توندی سەرکۆنە کرد. بەرنامەکەی بەم شێوەیە سێ ڕۆژ درێژەی کێشا. دەکرێ بڵێین سەری هەموو ئیدارە دەوڵەتییەکانی داو کەمتر کەسێک هەبوو نەکەوێتە بەر سەرکۆنەی. دیارە هووەیدا تۆپوتەشەرە سەرەکییەکانی بۆ ئەو ڕۆژە هەڵگرت کە چووە زانکۆی تەوریز.

لە نیزیکەی سێ مانگ پێشترەوە، زانکۆ مەکۆی خۆپیشاندان و ناڕەزایەتیی ناوبەناوی خوێندکاران بوو. کاتێک هووەیدا گەیشتە شوێنی زانکۆ، وەکازەکەی وەلا نا، چاکەتەکەی داکەند، و بەئاشکرا ڕوو بە خوێندکاران و مامۆستایان کە نەکهەر سالۆنەکەیان پڕ کردبوو، بەڵکوو

لە ڕاپەوەکانیشدا ڕاوەستابوون گوتی کە هەموو شتێکی زانکۆ دەستبەجێ دەگۆڕێ. گوتی مامۆستاکان، پۆلەکان، خەوگەکان، بوورسەکانو پێوانە زانستییەکان دەبێ بگۆڕێن. گوتی هەموو شتێک دەبێ بگۆڕین. ئەمجار بە شێوەیەکی ڕێکوپێکو لیبراوانە سیستمی زانکۆی خستە بەر هێرشو ڕەخنەو جاروبار تەنانەت بە ناوی خۆیان ڕەخنەی لە هێندێک لە مامۆستاو بەرپرسەکانیش گرت. گوتی ئەوان قازانجی خوێندکارانیان لەبیر بردۆتەوە...کاری دەرسو پۆلەکانیان قوربانی پڕکردنی گیرفانی خۆیان کردوە...لە یەکقسەدا زیانیان بە شاو خەڵک گەیاندوەو زانکۆیان بە شێوەی سەدەکانی نێوەڕاست بەڕێوە بردوە. ڕایگەیاند کە هەموو سەرۆکانی کۆلێژەکان دەستبەجێ دەگۆڕێن...

خوێندکارەکان (دەگەڵ ژمارەیەک لە مامۆستا لاوەکان) بۆماوەی نیزیک بە پێنج دەقیقە، بێوەستان، چەپڵەیان بۆ سەرۆک-وەزیر لێدا.[42]

جگە لەو سەفەرانە، وەختی هوەیدا سەرفی کۆبوونەوەکانی کابینە، نیورۆژە بەناوبانگەکانی دەگەڵ تویژە جۆربەجۆرەکانی خەڵک، دیدار دەگەڵ شاو، دیارە، دیداری حەوتووانەی دەگەڵ دایکی دەکرا. هەرنەبێ حەوتووی جارێک شای دەدی. ئەگەر پێویست با، شەرەفمەندبوون پتریش دەبوو. هەرلەو کاتەدا شا لەسەر ئەوە مکوڕ بوو کە فەرماندەرانی سوپا پێوەندییەکی زۆریان دەگەڵ ئەهلی سیاسەتی ئێران نەبێو هەربۆیە ژووری چاوەڕوانیی ئەم دوو دەستەیە بۆ دیتنی شا جیاواز بوو.[43] جگەلەوە هوەیدا عادەتەن ڕۆژێ چەندین جار بە تەلەفۆن قسەی دەگەڵ شا دەکرد. لەو پێوەندییانەدا شا تەلەفۆنێکی تایبەتیی بەکار دێنا کە دەفتەری کارەکەی بە مێزی سەرۆکوەزیرەوە گرێ دەدا. وتوویژەکانیان جارێک بە فارسیو وەختێک بە فەڕانسەیی یان ئینگلیسی بوون. زۆرتر ئەوکاتانە زمانە بێگانەکانیان بەکار دێنا کە دەیانەویست،باسی بابەتێکی نهێنیو گرنگ بکەن. ئەگەر مەبەستیان لە بەکاربردنی ئینگلیسیو فەڕانسەیی جۆرە نهێنیکارییەک بووبێ، دەبێ

بڵێین هەوڵێکی منداڵانەو مایەی پێکەنین بووە. دەزگا ئەمنیەتییە نێوخۆیی‌و دەرەکییەکان هەموو بە ئاسانی لە ئینگلیسی‌و فەڕانسەیی حاڵی دەبوون. بەڵام دەکرێ بەکارهێنانی زمانە بێگانەکان زیاتر ئاکامی ئەوڕاستییە بووبێ کە هەردووکیان بەو دوو زمانە ئاسانتریان قسە بۆ دەکرا تا فارسی‌و وردەکارییەکانیشیان لە هی فارسی باشتر دەزانی. دیارە ئەگەر ئەوە قبووڵ بکەین، ئەودەم ئەم ئاکامگیرییەش خۆی دەسەپێنێ کە شۆڕشی ئیسلامی دەبێ بە جۆرێک یاخی‌بوونی زماناسانە بناسین: یاخی‌بوونی زمان‌و فەرهەنگی خۆوڵاتی بە دژی حکوومەتی جیهان‌وەتەنانی بێگانە دەگەڵ زمانی فارسی. تەنانەت دەتوانین هەنگاوێک بەرەوپێشتریش بچین‌و ئیددیعا بکەین کە هەروەخت فەرمانڕەوایانی وڵاتێک زمان‌و فەرهەنگی وڵاتەکە نەناسن، ئەودەم بەرپابوونی شۆرشیش بێ‌ئەملاوئەولایە.

خۆش ئەوە بوو دەگەڵ هەموو ئەو تێ‌بینییە ئەمنیەتی‌یانە، و سەرەڕای کەلک‌وەرگرتن لە تەلەفۆنی تایبەتی‌و زمانی بێگانەش، زۆر وێ‌دەچوو تەنیا شاو هووەیدا نەبن کە لە نێوەرۆکی ئەو وتوویێژانە ئاگادار دەبوون. هووەیدا پێی وابوو ساواک هەموو تەلەفۆنەکانی دەفتەری کاری کۆنتڕۆڵ دەکا. تەنانەت گومانی وابوو کە نەک‌هەر لە ژووری کارەکەی لە سەرۆک‌وەزیری بەڵکوو لە ژوورەکانی ماڵی دایکیشیدا دەزگای گوێگرتنیان داناوە. زۆرجار ڕێ دەکەوت دۆستێک یان خزمێک دەیەویست لە بارەی مەسەلەیەکی هەڵلاسازەوە قسەی دەگەڵ بکا، بەڵام هووەیدا خێرا قامکی وسکوتی بۆ لێوان دەبردو بە برۆهەڵتەکاندن، ئەوکەسەی بانگ دەکردە حەوشەی ماڵێ‌و تەنیا لە پەنای دارەکانی ئەو حەوشەیەدا، بەشداری ئەو جۆرە باسانە دەبوو.[45]

لە ڕاستیدا، لەوەتا هاتبۆوە ئێران پێوەندییەکی ئاڵۆزی دەگەڵ ساواک هەبوو. دیارە ڕەخنەگرەکانی کە لە هیچ گوناح‌و هەڵخلیسانێکی بەدوور نازانن، ئیددیعا دەکەن کە هەر دەگەڵ گەڕانەوەی بۆ ئێران بۆتە ئەندامی ساواک. بەڵام بەڵگەو نیشانەکان پێوەندییەکی پێچەڵپووچتر دەردەخەن. ئەو پێوەندییانە زۆربەی وەخت پڕ لە ئاڵۆزی‌و هێندێ‌جار

تێکەڵ بەترس‌و جارجاریش بێ‌متمانەیی بە یەکتر بوون.[46] هەرچەند سەرۆکی ساواک بە ڕواڵەت جێگری سەرۆک‌وەزیر بوو، بەڵام شا ڕاستەوخۆ بەڕێوەبەرایەتیی ساواکی لە دەستدا بوو. سەرۆکی ساواک، تیمسار نەسیری، ڕاستەوخۆ ڕاپۆرتی بە شا دەدایەوە. جگەلەوە، لە حاڵاتی گرنگدا وەک ئەوە کە نەیارێکی بەناوبانگ دەگیرا، شا بەردەوام لە کاری لێپرسینەوەیان ئاگادار دەکرا.[47] بەوحاڵە، لە وەڵامی مێژووۆدا ئەو هیچ بەرپرسایەتییەکی کارەکانی ساواک قبووڵ ناکا. دەیەوێ دیزەوگۆزەکان لە سەری خەڵکی دیکەدا بشکێنێ. سەرەڕای هەموو نیشانەکان، ئیددیعا دەکا کە ئیدارەی ساواک بە سەرۆک‌وەزیر بوو، و تەنیا نەخشی شا، ئیمزاو پەسندکردنی لیستی کەسانێک بوو کە وەبەر لێخۆشبوونی شایانە دەکەوتن.[48]

بێجگە لە هەوڵی شا بۆ بەکاربردنی دەسەڵاتی پاوانخوازانە بەسەر ساواکدا، هێندێ هۆی دیکەش پێوەندیی هووەیداو نەسیری‌یان لێڵ دەکرد. لەلایەک بە گەندەڵیی ماڵی بەناوبانگ بوو. جگەلەوەش، بە یەکێک لە هاودەستان‌و باوەڕپێکراوانی عەلەم دەناسراو ئەم دوو ڕاستییەش کۆمەگیان بە ناخۆشیی پێوەندییەکانی دەگەڵ هووەیدا دەکرد. بەڵام هووەیدا سیاسەتمەدارێکی بەهۆش‌و فێڵەزان بوو. دەی‌زانی کە لە ئێران دەسەڵاتی ڕاستەقینە تاڕادەیەکی زۆر لە دەستی ساواکدایە. بە پێچەوانەی ئەو کۆسپانە کە شا لەسەر ڕێی دەست‌تێوەردان‌و نفووزی سەرۆک‌وەزیر لە کاری ساواکیدا دروست کردبوون، هووەیدا بۆ تێپەڕین لەو کۆسپانە، هەروەک شێوەی کاری بوو، سوودی لە پێوەندی‌و دۆستایەتییە تایبەتییەکانی وەردەگرت‌و لێرەدا بوو کە پێوەندییەکەی دەگەڵ سابیتی نەخشێکی یەکجار گرنگی گێڕا.

لە کۆتایی دەیەی چلەوە، کاری ئەمنیەتی نێوخۆ لە ڕاستیدا یەکسەر بە دەست پەرویزی سابیتی‌یەوە بوو کە سەرۆکایەتیی ئیدارەی سێیەمی ساواکی لە ئەستۆ بوو. لە حاڵێکدا هەموو شەممەو پێنجشەممەیەک نەسیری دەچووە سەردانی شاو لە کاروباری ئەمنیەتی ئاگاداری دەکرد، هەموو چوار شەممەیەک پاش‌نیوەڕۆش، زۆرتر دوای

ئـەوەی بەشـــی زۆری کارمەنـدەکانی دەفتـــەری ســـەرۆکوەزیـــری دەچوونەوە ماڵێ، پەرویزی سابیتی لە دەفتەری سەرۆکوەزیر سەری هووەیـدای دەدا. جگـە لـەو دانیشـتنە بەردەوامانـە، ئـەم دوو کەسـە جاروبار نیورۆژیان پێکەوە دەخوارد. لە هێندێ میواندارییی شەوانەی هووەیداشـدا سـابیتی یـەکێک لـە میوانـەکان بـوو. لـە دانیشـتنەکانی چوارشەممەدا، مەسەلەی جۆراوجۆری وڵات باس دەکران. تەنیا بابەت کە هەرگیز باسی نەدەکرا، مەسەلەی عەمەلیاتە ئەمنیەتییەکان بوو.[٩]

لـە سـەردەمی سـەرۆکایەتیی سـابیتیدا، ئیدارەی سێیەم نـەک هـەر خـەریکی لـەنێوبردنی هەرچەشـنە تێکۆشـانێکی سیاسـیی نـەیاران بـوو، بـەڵکوو هەرلـەو کاتـەدا هێندێ ڕاپۆرتیشـی دەربارەی گەنـدەڵیی مـاڵیی دەســەڵاتدارانی وڵاتــەوە ئامـادە دەکـرد. سـابیتی گەنـدەڵیی مـاڵیی بـە مەسەلەی سیاسیو ئەمنیەتی دەزانی. دەیگوت ئەم مەسەلەیە دەتوانێ ســەقامگیریو ئەمنیـەتی وڵات بخاتــە مەترسـییەوە. مـەئموورەکانی، چالاکییــە ئابوورییـەکانی سـەرانی سیاسـیو سـوپایی وڵاتیان دەخستە ژێـر چـاوەدێری. هـەرجۆرە بـەرتیلخـۆریـیـەک، دەڵاڵـیو کومپانییـە سـاختەکان، شـەریکایەتییە بـەدرۆو ڕواڵەتییـەکانو جۆرەکـانی دیکـەی گەنـدەڵیی کـۆنترۆڵ دەکـرد. تەنانــەت چـالاکیی ئەنـدامانی بنەماڵــەی پادشایەتییش لەو چاوەدێریو ڕاپۆرتانە پارێزراو نەبوون. جاری وابوو ڕاپۆرتـەکانی سـابیتی لـە بـارەی چـالاکیی ناقـانوونیی ئەندامانی بنەماڵـەی پادشـــایەتییەوە شـــایان تـــوورە دەکـــرد. هەرچەنـــد شـــا هـــەرگیز، لە دواڕۆژەکانی حکوومەتەکەیدا نەبێ، سابیتیی لەسەر کارلانەبرد، بەڵام قــەتیش حــازر نــەبوو بــیبینــێ* تەنانــەت لــە لووتکــەی چالاکییــە شۆڕشگێڕییەکانیشدا، ئەوکاتەی بناخەی ڕێژیمی پەهلەوی لە مەترسیدا بوو، زۆر لە ڕاوێژکارانی شا هانیان دا قسە دەگەڵ سابیتی بکا، بەڵام شا

* کاتێک سابیتی کرا بە "ئاجودانی تایبەتی" چاوی بـە شـا کـەوتو چەنـد قسـەیەکی ڕەسمییان پێکـەوە کـرد. لـەوە بـەولاوە شـا هـەرگیز ئامـادە نـەبوو چاوی بـەچاوی سابیتی بکەوێ.

هەر نەچووە ژێر بارو حازر بەو دیدارە نەبوو. ڕەنگە زێدەڕۆیی نەبێ ئەگەر بڵێین سابیتی لە هەموو کەسێک لە ئێراندا باشتری نوختە لاوازو بەهێزەکانی ڕێژیمی پەهلەویی دەناسی. بەوحاڵە، شا بە دەلیلێک کە لەوانەیە هەرگیز ڕوون نەبێتەوە، حازر نەدەبوو بیبینێ.[٥٠]

لە بەرامبەردا، هووەیدا هەموو حەتووان چاوی بە سابیتی دەکەوت. لەم کۆبوونەوانەدا، نەک هەر مەسەلە سیاسییەکانی ڕۆژیان باس دەکردن، بەڵکوو زۆرجار سابیتی هێندێ زانیارییشی لەسەر چالاکییە ئابوورییەکانی بژاردە سیاسییەکانی ئێران دەدا بە هووەیدا.[٥١]

کاتێک هووەیدا لە وتوویژە هەڵلاسازەکەی دەگەڵ ئۆکرانەدا ئیددیعای دەکرد کە ساواک تەنیا مەیدانی ڕمبازێنی شا بووو هیچی دی، وەختێک لە دادگای شۆرشدا پێی دادەگرت کە نەخشێکی لە ئیدارەی ساواکدا نەبووە، وەختێک دەیگوت هەرگیز حوکمی ئیعدامی کەسێکی دەرنەکردوە، بێشک بەمانای وردی وشە ڕاستی دەکرد. بەڵام مەسەلەی بەرپرسایەتیی ئەخلاقیو قانوونیی وی لە بەرامبەر ئەو کردەوانەدا باسێکی تەواو جیاوازو یەکجار پێچەڵپووچە. دەزانین کە دۆستایەتییەکی نیزیکی دەگەڵ سابیتی هەبوو، هەر ئەم ڕاستییە، بەناچار ئەوی تووشی مەسەلەکانی ساواک دەکرد. جگە لەوە لە دنیای سیاسەتدا، زانیاریِ هاوزێو پایەی دەسەڵاتەو جۆری ئەو زانیاری-یانەش کە سابیتی دەیخستنە بەر دەستی هووەیدا لەجێدا یەکێک لە ئامرازەکانی سەقامگیرکردنو درێژەدانی دەسەڵاتی وی بوون.

لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە هووەیدا نەیدەتوانی ئیددیعا بکا کە لەو ساڵانەدا لە چەندوچۆنی چالاکییەکانی ساواک بێئاگا بووە. چاپەمەنیی بێگانە کە هووەیدا هەمیشە بەوردی دەیخوێندنەوە زۆروەخت لەو بارەیەوە وتاری دووورودرێژیان دەنووسین. جگە لەوە لە زۆر لەو سەفەرانەدا کە بۆ دەرەوەی دەکردن هەواڵنووسانی بێگانە لە بارەی بوونی سانسۆرو شکەنجە لە ئێراندا پرسیاریان لێدەکرد. زیاد لەوەش، سەرۆکوەزیری وڵات بە پێی قانوونی بنەڕەتی، بەرپرسی کارەکانی دەوڵەتو ڕێکخراوەکانیەتیو ئەوڕاستییە کە بە

کردەوە هووەیدا نەخشێکی لە بەڕێوەبردنی ساواکدا نەبوو، ئەوی لە بەرپرسایەتیی قانوونی لە بەرامبەر کارەکانی ساواکدا بێبەری نەدەکرد. بە باوەڕی من تەنیا هەڵوێستی ماقووڵو مەنتیقی کە هووەیدا دەیتوانی بۆ بەرگری لەخۆی بیهێنێتە گۆڕێ ئەو نەزەرانە بوون کە فەرڕوخی نەجمابادی، بەوپەڕی ڕاستوێژیو ڕەوانی ڕێکی خستوون. لە وتووێژێکدا دەربارەی ئامانجو ئامراز، مافو بەرپرسایەتی، هەڵدانی ئابووریو ملهوڕیی سیاسی، نەجمابادی دەڵێ: " لەوساڵانەدا ئێمە دەمان- زانی کە لە ئێران شکەنجە هەیە، و بەو حاڵە بێدەنگ بووینو لەبەر ئەو بێدەنگییە گوناحبارین. بەڵام بێدەنگییەکەمان بۆیە بوو کە پێمان وابوو خزمەتەکەمان بە وڵات ئەو بێدەنگییە دێنێ. سەرباری ئەو بێدەنگییە کە دەتوانێ خەتاکارانەش بێ، ئەمنو هاوکارەکانم خزمەتی بەنرخمان بە ئێران کردووە. کارنامەیەکمان هەیە کە بە ڕاستی بۆیە دەبێ شانازیی پێوە بکەین."[520] دیارە هەرچەند هووەیدا لە تەواوی دەورانی حکوومەتەکەیدا بەوپەڕی لیبراڵییەوە حاشای لە پێشێلکرانی مافی مرۆڤ لە ئێراندا دەکرد، بەڵام لە دادگای شۆڕشدا، جارێک هیچ چەشنە بەرپرسایەتییەکی لە بەرامبەر ساواکدا قبووڵ نەدەکردو وەختێکیش هەڵوێستێکی وەک نەجمابادیی دەگرت.

جگە لە دیدارە ڕێکوپێکەکانی دەگەڵ سابیتی، هووەیدا دیارە پێوەندیی دیکەشی دەگەڵ ساواک هەبوون. بەشێکلەو پێوەندییانە ئاکامی بێئەملاوئەولای بەرپرسایەتییە ئیدارییەکەیو بەشێکیشیان لە هێندێ ڕاستیی ئاڵۆزترەوە هاتبوون. ساڵی ١٣٤٤(١٩٦٥)، داریووشی هومایوون کە ئەوکات ڕۆژنامەنووسێکی ناسیۆنالیستو گەنجو بەتوانا بوو، سەفەری ئەمریکای کرد. سەفەرەکەی بوورسێکی زانکۆی هارواردی بۆ دروست کرد. لە دەورانی مانەوەی لەوێدا وتارێکی دەربارەی هەڵدانی سیاسی لە ئێراندا نووسی. باوەڕی وابوو نیزامی سیاسی دەبێ هەتا زوویە لە نێوەوە چاکسازی بکرێ. وتارەکەی لە تاران هەڵلایەکی نایەوە. کاتێک دوای تەواوبوونی سەفەرەکەی گەڕایەوە تاران، هووەیدا بۆنانی نیوەڕۆ بانگهێشتنی کردە دەفتەری سەرۆک-

وەزیر. لەو ڕۆژانەدا هومایوون یەکێک لە ڕووما ناسراوەکانی دنیای ڕۆژنامەنووسی لە ئێراندا بوو. ناسیۆنالیزمە توندڕەوانەکەی، بیروباوەڕە دژە کۆمۆنیستییە نەگۆڕەکەی‌و جوانیی پەخشانەکەی بنێشتەخۆشەی سەر زاری هەمووان بوو.

لە دیدار دەگەڵ هومایووندا، لە بارەی چاکسازیی سیاسیی جێی باسی وتارەکەیەوە پرسیاری لێ‌کرد. دەیەویست بزانێ ئەوجۆرە چاکسازییە بەکردەوە چۆن دەکرێ بێتە ئاراوە. هومایوون لە وەڵامدا جەختی کردەوە کە پێی وایە مەرجی یەکەمی ئەم چەشنە نوێ-کردنەوەیە، وەڕێ‌خستنی ڕۆژنامەیەکی سەربەخۆو لیبراڵ‌ڕەوشت‌و هەر لەوکاتەدا وەفاداربەدەوڵەتە. گوتی ڕۆژنامەیەکی وا دەتوانێ "پایەی باسە سیاسییەکانی کۆمەڵ بەرێتە سەرێ."[52]

دوو ساڵ پاش ئەو دیدارە، و دوای چەندین کۆبوونەوەی دیکە کە لەواندا نوێنەرانی ئیدارە جۆراوجۆرە دەوڵەتییەکانیش بەشدار بوون، سەرەنجام لە کۆتایی ساڵی١٣٤٥دا، کۆبوونەوەیەک لە دەفتەری سەرۆک‌وەزیر پێک‌هات کە هوەیداو نەسیری‌و هومایوون تێیدا بەشدار بوون. بەرنامەی کاری کۆبوونەوەکە چەندوچۆنی دامەزراندنی ئەو ڕۆژنامەیە بوو کە هومایوون لێی دەگەڕا. ئاخرەکەی بڕیار درا بۆ دروست‌کردنی ئەو ڕۆژنامەیە کومپانییەک دروست بکەن کە پەنجاویەک‌لەسەدی بەشەکانی، دەوڵەت‌و ئەوی دیکەی هومایوون‌و ژمارەیەکی کەم لە هاوکارە ڕۆژنامەنووسەکانی دابینی بکەن. ناوی ڕۆژنامە تازەکە "ئێیندگان" بوو. هوەیدا، لەسەر ئامۆژگاریی ساواک، مەنووچێهری ئازموونی وەک نوێنەری بەشەکانی دەوڵەت لە هەیئەتی بەڕێوەبەریی کومپانییەکەدا دیاری کرد. ئازموون لە پیاوە کارکوشتەکانی ساواک بوو. بە گەنجی کۆمۆنیست بوو، و کاتێک وەنێو کەوت بوو بە وەزیری کابینە.

هەرچەند "ئێیندگان" دوای دەست‌بەکاربوون زۆرتر هەڵوێستی لیبراڵیی دەگرت، ئەگەرچی جاروبار تەنانەت بە زمانێکی ئازایانە ڕەخنەی لە هێندێ لایەنی سیاسەتی دەوڵەتیش دەگرت، بەڵام وا دیار بوو

هەرگیز متمانەی تەواوی خەڵكی بە دەست نەهێناوە. كاتێك ئایەندەگان بە لێبڕاوی دیفاعی لە بوونی ئەمریكا لە ڤێتنام كرد، وەختێك ئەو خەبەرە چووە نێو خەڵك كە دەوڵەت‌و ساواك دەستیان لە دامەزراندنیدا هەبووە، ئەو باوەڕە لەلای هێندێ توێژی خەڵك برەوی پەیدا كرد كە ئایەندەگان ڕۆژنامەیەكی ئەمریكاییەو هەرلەوكاتەدا سەرنج‌و پشتیوانیی ساواكیشی لەپشتە. سەرنج‌ڕاكێش ئەوەیە كە سەربارى ئەو ناكامییەی ئایەندەگان لە سەرەتادا بەهۆی ئەو ناوبانگە خەراپەوە تووشی هات‌و دیارە نەی‌توانی، وەك هومایوون‌و هاوكارەكانی دەیانەویست، "پلەی باسە سیاسییەكانی كۆمەڵ بەرێتە سەرێ"، بەلام لە دەروازەی شۆرشی ئیسلامیدا دەستەی نووسەرانێكی تازە ئیدارەی ڕۆژنامەكەیان وەئەستۆ گرت‌و بەخێرایی كردیانە گرنگترین بانگەوازی بیروڕای لیبراڵی‌و دژی زۆرداری‌و دژی دەوڵەتیی سەردەمی خۆی. تەنانەت هێندێك لە چاوەدێران‌و لێكۆڵەرانی مێژووی شۆرش لەو باوەڕەدان كە داخرانی ئایەندەگان خاڵێكی وەرچەرخانی مێژووی شۆرش بوو. دیارە هەر كۆماری ئیسلامی نەبوو كە ئایەندەگان‌و ڕەخنەكانیی پێ قبووڵ نەدەكرا. لە دەورانی شاشدا ئەم ڕۆژنامەیە چەندین جار تووشی گیروگرفتی سیاسی بوو.

ئەگەرچی دەوڵەت خاوەنی زۆربەی بەشەكانی ئایەندەگان بوو، هەرچەند ساواك لە ڕێگای ئازموونەوە هەمیشە لە ڕۆژنامەكە حازر بوو، و دەگەڵ‌ئەوەی هومایوون بۆخۆی ڕۆژنامەنووسێكی ناسراوو جێی متمانە بوو، و چەندین ساڵ دژی كۆمۆنیزم شەڕی كردبوو، بەوحاڵە كەمێك دوای دەست‌بەكاربوونی ئایەندەگان، شا ڕقی لێ - داگرت. دووكەس لە بەرپرسان‌و خاوەنانی سەرەكیی ڕۆژنامەكە، لە دوو برگەی جیاوازدا، بە دەستووری ڕاستەوخۆی شا لە ئایەندەگان دەركران. یەكیان ناوی جیهانگیری بێهرووز بوو كە لە ڕۆژنامەنووسە بەڕابردووەكانی وڵات بوو. ساڵی ١٣٥٠ وتارێكی دەربارەی چەندوچۆنی ئازادیی چاپەمەنی لە ئێران نووسی. شا كە زۆربەی ڕۆژنامەكانی تارانی دەخوێندەوە بەو وتارە قەڵس بوو، و فەرمانی دا بێهرووز دەربكرێ.

دەوڵەتیش بەشەکەی ویی کە بایی دەوری سەدوپەنجا هەزار تمەن بوو کڕیو نەکهەر لە کومپانی دەری کرد، بەڵکوو یەکسەر لە مافی وتارنووسین بۆ ئایەندەگانیش بێبەشی کرد.[54] برای حەسەنعەلیی مەنسوور، جەوادیش، کە خۆی لە یەکەمین ئەندامانی کۆمەڵی پێشکەوتنخواز بووو دوای مەرگی براکەی کرابوو بە وەزیری "، "٢٦ی خاکەلێوە، بە هۆی سەرۆکوەزیرەوە، بەڵام بە فەرمانی ڕاستەوخۆی شا لەسەر کار لابرا. لادانی مەنسوور گۆیا ئاکامی وتارێک بوو کە لە ئایەندەگاندا چاپ کرا."[55] هووەیدا هەوڵی دا شای لە فەرمانی لابردنی مەنسوور پەژیوان بکاتەوە، بەڵام لە هەوڵەکەیدا سەر نەکەوت. هەرلەو کاتەدا، بێهرووزیش کە هەرنەبێ بەپێی بەڵگەکانی باڵیۆزخانەی ئەمریکا، لە "باوەڕپێکراوانی هووەید" دەژمێردرا لەسەر کار لابراو هووەیداش هەوڵێکی بۆ نەجاتی وی نەدا.[56]

داریووشی هومایوونیش هەرنەبێ دووجار کەوتە بەر ڕقی شایانە. یەکەم گوناحی ئەوە بوو کە لە وتارێکدا نووسیبووی ئەوەی لە ئێراندا بە "شۆرشی سپی" بە ناوبانگە لە ڕاستیدا نەک شۆرش بەڵکوو ڕەوتێکی ڕیفۆرمخوازانە بوو. گوناحی دووەمی پاساوهەڵگر بوو کە لەودا ئەو، بەئاماژە، ڕەخنەی لە خۆپەرستیی شا گرتبوو. بەتۆڵەی ئەو پڕپووییە شا فەرمانی دا هومایوون لە ئایەندەگان دەربکەن. گرنگیش نەبوو کە بیرۆکەی دامەزرانی ئەو ڕۆژنامەیەو بەشێک لە یەکەمین بەشەکانی هی هومایوون خۆی بوون. هومایوون بە زەردەخەنەیەکەوە دەیگوت: "بۆ ماوەی پێنج حەوتوو هەقم نەبوو بچمە خانووبەرەی ڕۆژنامەکە."[57] ئەمجارە هووەیدا دیفاعی لە هومایوون کرد. چەند ڕۆژێک چاوەڕوان بوو، و پاش ئەوەی شا ڕقەکەی نیشتەوە، داوای لێکرد لە گوناحی هومایوون خۆش بێ. ساڵی ١٣٥٦ (١٩٧٧)، هومایوون بۆخۆی بوو بە وەزیری دەیگوت: "بە باوەڕی من ئەوە شا خۆی بوو کە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی دەخوێندەوەو ئەگەر شتێکی تێدا دەدین کە پێی خۆش نەبوو، داوای دەکرد نووسەرەکەی تەمبێ بکرێ." هەرلەو کاتەدا دەیگوت: "سیاسەتی هووەیدا جیاواز بوو. ئەو پێی باشتر بوو ڕێگایەک

پەیدا بکا کە دەگەڵ ڕۆژنامەنووسەکان ڕێک کەوێ. دەیەویست هەمووان بکڕێ. هەموو لە کڕین دێن. گرنگ ئەوەیە نرخی گونجاو بۆ هەرکەسێک بدۆزینەوە."[58]

هووەیدا، لە سەرەتای حکوومەتەکەیدا بەتوندی هەوڵی دەدا ڕۆژنامەنووسان‌و سەرنووسەران‌و خاوەن‌چاپەمەنییەکان بێنێتە ڕیزی دۆستانی خۆیەوە. بەڵام لە دەورانی دووەمدا سیاسەتێکی تازەی ڕەچاو کرد. دەیەویست لە هەموو جێیەک سەرنووسەرانی دڵخوازو لایەنگری دەوڵەت لەسەر کار دابنێ. لەو بارەیەوە، دەبێ دانانی ئەمیری تاهیری بە سەرنووسەری ڕۆژنامەی کەیهان بە گرنگترین سەرکەوتنی وی بزانین. ئەو کە لە ماوەیەکی کورتدا ببوو بە یەکێک لە ناسراوترین ڕووماکانی مەیدانی ڕۆژنامەنووسیی ئێران، بە باوەڕی باڵیۆزخانەی ئەمریکا یەکێک لە "پیاوەکانی هووەیدا" بوو.[59]

مستەفای میسباح‌زادە، خاوەن‌ئیمتیازی کەیهان دانانی تاهیری بەم-جۆرە شی‌دەکاتەوە:

ئاغای هووەیدا لە سەرەتای سەردەمی سەرۆک‌وەزیریی خۆیەوە کەوتە فکری نفووزی زیاتر لە چاپەمەنیدا. پێش ئەوە هەوڵی دابوو ژمارەیەک لە ڕۆژنامەنووسان بکاتە دۆستی تایبەتیی خۆی. لەو ڕێیەدا ڕاوێژکارو ڕێنوێن‌و کۆمەگی سەرەکیی وی فەرهادی نیکووخوا بوو... ڕۆژێک نیکووخوا هاتە لای من‌و گوتی ئاغای سەرۆک‌وەزیر پێی خۆشە ئاغای ئەمیری تاهیری بکەیە سەرنووسەری کەیهان. ئەمن گوتم لەم ساتەوەختەدا ئەمن ئەوپەڕی ڕەزامەندیم لە سەرنووسەری ئێستای کەیهان ئاغای دوکتۆر سەمسار هەیە کە نیزیکەی بیست ساڵە لەو پۆستەدا دڵسۆزانە دەگەڵ کەیهان‌و من هاوکاری دەکاو هیچ دەلیلێک بۆ گۆڕینی نابینم... ڕۆژێک سەرۆک‌وەزیر زەنگی لێ‌داو داوای کرد بی‌بینم. کاتێک چوومە سەردانی بە ڕاشکاوی مەسەلەی سەرنووسەریی ئەمیری تاهیریی هێنایە گۆڕێ‌و گوتی ئەمن زۆرم پێ‌خۆشە ئەم کارە سەر بگرێ. ئەمنیش هەر ئەو جوابەم دایەوە کە پێشتر بە نیکووخوام دابۆوە... هووەیدا فکرێکی کردەوە. دوایە باسەکەی گۆڕی. ئەمە

ماوەیەکی خایاند، هەتـا ڕۆژێک هــووەیدا دووبارە داوای لێکردم بۆ نیــوەڕۆ میــوانی بــم. لەســەر نــانخــواردن پرســی ئــەو مەســەلەی سەرنووسەرە بوو بەچی. هەرکە ویستم عوزر بێنمەوە، سەری هـەڵێناو وێنـەی شـای نیشـانداو گـوتی ئەمـە تکـای مـن نیـە، ئاغـا وای دەوێ. ئەمنیش گوتم ئەگەر فەرمانی ئەعلاحەزرەت بێ دەبێ جێبەجێی بکەین.

ئەمن کە بەڕاستی پێوە ببووم، بەفکرمدا هـات مەسەلەکە دەگـەڵ عەلەم وەزیری دەربار باس بکەم. چوومە لای، مەسـەلەکەم بۆ باس-کردو داوام لێکرد بچێتە بنجو بناوانی کارەکەو ئاگادارم بکاتەوە. عەلەم فکرێکـی کـردەوەو گـوتی پەلـە مەکـە، سـەبر کـە بۆخـۆم خەبـەرت دەدەمەوە. دوو حەوتوو دواتر زەنگی لێدا کە بۆ قاوڵتی وەرە لای من پێکـەوە قسـان دەکـەین. لەسـەر نـانخـواردن گـوتی ئـەو بابەتـە ئاغـا دەیـەوێ. وا دیـارە چـارەت نیـە... بـەم جـۆرە، ئـەمیری تـاهیری بـوو بـە سەرنووسەری کەیهان.[٦٠]

بیرەوەرییەکانی عەلەم نەکـهەر داستانەکەی میسباحزادە پشتڕاست دەکەنـەوە، بـەڵکوو هەرلـەو کاتـەدا هێندێک ئاڵۆزیی دیکەشـی لـێ زیـاد دەکـەن. لـە گێڕانەوەکـەی عەلەمـدا بیرۆکـەی سەرنووسـەریی ئـەمیری تاهیری لەجێدا هی هووەیدا بوو. بەڵام ئەو نەکـهەر شای ڕازی کرد کە ئـەوکارە پێویسـتـە، بـەڵکوو بەرەبـەرە وای بـردە مێشـکی شـاوە کـە داهێنەری فکرەکە تەنیا خۆی بووە.[٦١]

گێڕانـەوەی عەلـەم لـە بـارێکی دیکـەوە جگـە لـە چۆنیـەتیی دانـانی تـاهیرییش گرنگـە. هێنـدێک لـەو کەسـانەی پێکهاتـەی دەسـەڵات لـە سـەردەمی شـایاندا بـاش دەناسـی لـەو بـاوەڕەدان کـە هووەیـدا، بە پێچەوانـەی بۆچـوونی بـاو، داردەسـتی ڕووتـی شـا نـەبوو. دەڵێن بە پێچەوانە، ئەو لـەزۆر بارەوە بە دوای ئامانجو سیاسـەتەکانی خۆیـەوە بـوو، هــەر لــەو کاتــەدا وای ڕەفتــار دەکــرد کــە هــەروا بزانــە تــەنیا بەڕێوەبەری فەرمانـەکانی شـایە. دەڵێن هونـەری کاری هووەیدا لـەوەدا بوو کە تەنانەت شاشی وا حاڵی کردبوو کە کارەکان هـەموو لـە دەسـتی خۆیدانو هووەیدا لە داردەستێک بەولاوە شتێک نیە.[٦٢] هەرچۆنی بێ، بە

دانـانی تـاهیری، هووەیـدا هـەنگاوێکی گرنگـی بـەرەو سـەقامگیرکردنی دەسەڵاتی خۆی لە مەیدانی چاپەمەنیدا هەڵێنایەوە.

بـە پشـتیوانیی ئـەو دەسـەڵاتە بـوو کـە سـاڵی١٣٤٧(١٩٦٨) تـوانی بە فەمانی شا هێرشێکی بەربڵاوی چاپەمەنی بکاتە سـەر عـەلیی ئـەمینی. لە فێوریيەی ئەوساڵەدا، "شا پێش ئەوەی بڕوا بۆ ئورووپا دەستووری بە هووەیدا دا تا هێرشێکی گەورە دژی ئەمینی وەڕێ بخا." شـا ئـەمینیی "بـە نۆکـەری خۆشخزمـەتو مووزەردی کۆنسێرسیۆم دەزانـی."[٦٢] بـە بـاوەڕی باڵیۆزخانـەی ئـەمریکا، دەیەویسـت بـەهێرش بۆسـەر ئـەمینی، "وەزعـی خـۆی سـەقامگیر بکـاو بـۆ بـەرەنگار بوونـەوەی قـەیرانێکی چـاوەڕوانکراو ئامادە بێ." بڵاوکراوە جۆربەجۆرەکانی ئـەودەم عـەلیی ئەمینیيان وەک نۆکەری دەسەڵاتە بێگانەکان دایە بەر پـەلامار. هووەیـدا خۆشی هاتە نێو شەڕەکە. لە وتارێکی توندداۀ هوشداری دا: ئـەو زەمان بەسەر چوو کە دەسەڵاتە بێگانەکان سەرۆکوەزیريان بۆ ئێران دیـاری دەکرد؛ ئـەو دەسـەڵاتانە ئیـدی نـاتوانن سیاسـەتە دڵخوازەکـانی خۆیـان بەسەر ئێراندا بسەپێنن. هەرلەو کاتەدا، بۆ ئەوەی پتر ئابڕووی ئـەمینی بـەرن، دۆسـیەیەکیان وەکـار خسـتەوە کـە زۆر لـەوە پـێش بـە دژی هاوسـەرەکەی سـاز کرابـوو، و لـە ئارشـیڤی دادگـادا تـۆزی لەسـەر نیشتبوو. لەو دۆسیەیەدا ئیددیعا کرابوو کە لـە سـەردەمی حکوومـەتی ئەمینیدا، هاوسـەرەکەی پارچـە زەوییـەکی بـە نرخێکی زیاتر لـە قیمـەتی ڕاستەقینەی خۆی بە دەوڵەت فرۆشتوە. جگەلـەوە، دەوڵـەت ڕای‌گەیاند کـە ئـەمینی خۆشـی بـە تـاوانی کـەلکوەرگرتنـی خـەراپ لـە ئـەموالی دەوڵـەتی لـەو کاتـەدا کـە بـاڵیۆزی ئێـران لـە ئـەمریکا بـووە، لـەژێر لێپرسینەوەی قانوونیدایە.[٦٤] حـەوتی ڕەشـەمەی١٣٤٦ هـەیئـەتێکی تایبـەتی کـــە بـەپێی قـانوون بەرپرســی لێپرسینــەوەی خیلافکاريــی سـەرۆک-وەزیرانو وەزیرەکان بوو، پێکهاتو پەروەندەی عەلیی ئەمینیی خستە بەر لێکۆڵینەوەو گەیشتە ئـەو ئاکامە کە، "بەڵگەو نیشـانەی پێویست بۆ لێپرسینەوەی قانوونی لە ئەمینی لەبەر دەستدان."[٦٥]

لە ئێران خەڵک زۆریان دەیانزانی کە ڕیشەی هەموو ئەو تۆمەتانە

لە ناکۆکییە سیاسییەکاندایە. هەربۆیەش هیچکام لەوتۆمەتانە لە دادگادا سابیت نەبوون؛ بەڵام بە باوەڕی من، بایەخی ئەو بەسەرهاتە، دەبێ لە جێگایەکی دیکەدا وەبینین. هێرش بۆ سەر ئەمینی لەلایەک ڕادەی زۆرداریی ڕووڵەزیادبوونی شای دەردەخستو ئەو ڕاستییەی نیشان دەدا کە ئەو ئیدی هیچ جۆرە بەربەرەکانییەکی حکوومەتە سەرەڕۆیەکەی تەحەممول ناکا. جگەلەوە، هێرش بۆ سەر ئەمینی نیشانەی ئاڵوگۆڕێک بوو کە لە هووەیداو بایەخو ئامانجە سیاسییەکانیدا بەدی هاتبوو. "کۆمەڵی پێشکەوتنخواز"و هووەیدا وەک جێنشینی بەرەی نیشتمانی هاتبوونە سەر کار. قەرار بوو هێزە سیاسییە نێوەندڕۆیەکانو چینی نێونجیی ئێران ڕابکێشنو بایەخەکانی دێموکڕاسی بپارێزنو هەلومەرجێک پێکبێنن کە لەودا هێزە نێوەندڕۆیەکان بتوانن جێگایەک لە مەیدانی سیاسەتی ئێراندا بدۆزنەوەو داوای بکەن. کەچی دوای چەندساڵ، هووەیدا نەکهەر پاراستنی ئەو بایەخانەی وەلا نا، بەڵکوو بە نوێنەرایەتیی شا بۆ کەسایەتییەکی نێوەندڕۆی وەک ئەمینییش چووە مەیدان. زۆری پێنەچوو کە هەموو هێزە نێوەندڕۆیەکانی کۆمەڵ، لە ئەمینییەوە بگرە تا بەرەی نیشتمانی، یان بە تەواوی لەنێو چوون یان جگە لە پاسیڤبوونو پەراوێزنشینی چارەیەکیان بۆ نەمایەوە. بەڕاستی دەتوانین بڵێین شا مانەوەی بنەماڵەی پەهلەوی، و هووەیدا گیانی خۆی کردە بارمتەی زۆردارییەک کە هەموو هێزە نێوەندڕۆیەکانی کۆمەڵی لەنێو برد. بە جۆرێکی دیکە بڵێین، وەختێک لە ساڵی ١٣٥٦دا، پاڵەپەستۆی ئابووریو فەزای کراوەی سیاسی دەستیان وەدەستی یەک داو بناخەی ڕێژیمی پەهلەوییان وەلەرزە خست، پانتایی سیاسەتی ئێران وا ببووە پێخوستی ڕمبازێنی ملهوڕی کە ئیدی هیچ هێزێکی نێوەندڕۆ کە بتوانێ ڕێژیم لە گێژاوی قەیرانەوە بەرێتە کەنارێکی ئەمنو ئەمان لە ئاسۆدا بەرچاو نەدەکەوت. لە یەک قسەدا، لووتبەرزیی دەسەڵات لە ساڵی١٣٤٧دا سەری کێشایە هەڵوەرینی ڕێژیم لە ساڵی١٣٥٧دا. کاتێک پاش چەندین ساڵ سووکایەتیو بێڕێزی، شا لەبەر بێدەرەتانی دەستی یەکیەتیی بۆلای

هێزە نێوەندرۆیەکان درێژ کرد، ئیدی کار لەکار ترازابوو. ئەوە بوو کە ئیسلامی شۆرشگێرانە وەک تەنیا جێنشین لە مەیدانی سیاسەتی ئێراندا خۆی نواندو سەرەنجامیش بە دەسەلات گەیشت.



هەر لەو ساڵەدا کە شا بە کۆمەگی هووەیدا هێرشی کردە سەر ئەمینی، رێگەی بە هووەیداش دا سەفەری ئەمریکا بکا. نەکهەر هەموو سەفەرێکی سەرۆکوەزیر، بەڵکوو هەموو سەفەرەکانی وەزیران، باڵیۆزان، فەرماندەرانی سوپا، سەرۆکانی زانکۆو هەروەها سەرۆک-وەزیرانی پێشوو پێویستی‌یان بە ئیزنی شا هەبوو.[٦٦] سەرماوەزی١٣٤٦(١٩٦٧)، باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە ئێران تەلگرافێکی بۆ وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئەو وڵاتە ناردو پێشنیاری کرد کە، "ئەمیر عەبباسی هووەیدا بۆ سەفەرێکی رەسمی بۆ ئەمریکا بانگهێشتن بکەن." لە نامەی باڵیۆزخانەدا گوترا بوو کە: "سروشتی پێوەندییەکانی ئێران و ئەمریکا لە گۆڕانێکی گرنگدایە. سەربەخۆیی رۆژلەرۆژزیاتری ئێران یەکێک لە هۆیەکانی ئەو گۆڕانەیە. هووەیدا زۆر حەز لە سەردانی ئەمریکا دەکاو وەک زۆربەی ئێرانییەکان، وەک نیشانەیەک لە دۆستایەتیی بەرامبەر، بایەخێکی زۆر بۆ ئەوجۆرە سەفەرانە دادەنێ. هەرچەند هووەیدا جاران مەیلێکی ناسیۆنالیستیی توندی لەخۆی نیشان دەدا، ئەگەرچی دەگەڵ وڵاتانی ئەفریقایی و ئاسیایی هاودڵیی نیشان دەدا، بەڵام هەرلەوکاتەدا باوەڕێکی توندی دژی کۆمۆنیستیی هەبوو و نەکهەر دەرسخوێندنی بەڵکوو ئۆگرییەکانیشی رۆژئاوایی بوون... وا دیارە ئەو لە ساڵانی ئایندەشدا هەروا روومایەکی گرنگی مەیدانی سیاسەتی ئێران دەبێ و هەربۆیە، سەفەرێکی وا پێوەندییەکانمان دەگەڵ خۆی باش و پتەو دەکا."[٦٧]

کۆشکی سپی و وەزارەتی کاروباری دەرەوە سەرەنجام پێشنیاری باڵیۆزخانەیان قبووڵ کرد، بەڵام بۆ ئەوکارە دەلیلی جیا لەوەی

باڵیۆزخانەیان هەبوو. بە باوەڕی کۆشکی سپی، "ئامانجی نهێنیی بانگهێشتنی ئێمە لە هوودەیدا ئەوە بوو کە دەمانەویست جگە لە شا دەرفەتی خۆدەرخستتن بە یەکی دیکە لە ڕێبەرانی سیاسیی ئێران بدەین. دەمانەویست ئەو دەرفەتە بۆ کەسانێکی وەک هوودەیدا پێک بێنین. بە باوەڕی ئێمە: أ-کەسانی وەک هوودەیدا شیاوی ئەوەن؛ ب-سیاسەتێکی ئاقڵانەیە ئەگەر بتوانین جەخت لەسەر ئەوە بکەینەوە کە ئێران لەسەر تاقە کەسێک تاپۆ نەکراوە."[٦٨]

لە کاردروستایی ئەو سەفەرەدا، وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئەمریکا دەیەویست سەرکۆمار بۆ وتوویژەکانی خۆی دەگەڵ هوودەیدا ئامادە بکاو هەربۆیە ئەم ڕێنوێنییانەی بە پێویست زانین:

"لەکاتی تاریفی پێشکەوتنەکانی ئێراندا ، دەبێ پێش هەمووان باسی شا بکرێ. دەبێ لە کارە باشەکانی شاژنە فەرەحیش ستایش بکرێ. ئەگەر وانەبێ ئێرانییەکان قسەکانی ئێوە بە نیشانەی پشتیوانیی ئەمریکا لەم یان لەو کەسایەتی یان سیاسەت دەزانن."[٦٩]

وەزارەتی کاروباری دەرەوە، هەرلەوکاتەدا هێندێ لێکۆڵینەوەشی لەسەر فەرهەنگو مێژووی ئێران لەو ڕاپۆرتەدا گونجاندبوون. دەیگوت: "ئێرانییان پێیان ناخۆشە ئەوان دەگەڵ وڵاتانی دیکەی خەریک-بووژانەوە، یان وڵاتانی موسوڵمان تێک بخرێن. بە تایبەتی لە تێک-خرانەوە دەگەڵ تورکو عەرەبان بێزارن. باس لە بارەی مەزهەبیشەوە نارەحەتیان دەکا، چونکە ئێرانییانی دەرسخوێندوو لە وشکەموسوڵمانی بێزارنو هەرلەو کاتەدا حەز ناکەن لەو بارەیەوە دەگەڵ خەڵکی دەرەوە وتوویژ بکەن." دوابەشی ڕاپۆرتەکە باسی ئەو مەسەلە ناسکانە دەکا کە لەوانە بوو لە درێژەی وتوێژەکاندا بێنە گۆڕێ. لە ڕاستیدا، ڕاوێژکارانی وەزارەتی کاروباری دەرەوە دەیانەویست سەرکۆمار بەرامبەر بەگوتنی قسەیەک کە لەوانە بوو ئێرانییەکان پێیان ناخۆش بێ، وشیار بکەنەوە. دەیانگوت: "دەبێ لە پرسیار لە بارەی حیزبە سیاسییەکانی ئێرانەوە خۆ بپارێزێ، چونکە پارلمانی ئێران لە ڕاستیدا نیزامێکی یەکحیزبییە. ئێران دیموکراسییەکی "ڕێنوێنیکراو"ە کە لەودا یەکیەکی نوێنەرانی

پارلمان لەلایەن شاوە هەڵدەبژێردرێن. ئازادیی چاپەمەنییش بابەتێکی ناسکە."[70]

ڕاوێژکارانی جانسۆن هووەیدایان بە "مرۆڤێکی بێفرۆفێڵ، بێپێچ-وپەناو ڕاشکاو" دەزانی. دەیانگوت: "ئەو بەئاسانی دەتوانێ لە بارەی مەسەلە نیزامییەکانو سیاسەتی دەرەوەوە باسو وتوویژ بکا، بەڵام ئەم دوو بوارە لە پاوانی شادا دەبینێو بۆخۆی زیاتر باسی مەسەلە نێوخۆییەکان دەکا." ئامۆژگاریی جانسۆنیان دەکرد کە لەدیدار دەگەڵ هووەیدادا، "باشترە خۆی وا نیشان بدا کە حەز دەکا گوێی لە باسی ئاڵوگۆڕەکانی ئەم دواییەی ئێران بێ. لەو بارەیەوە خەراپ نیە بپرسێ کە شاو سەرۆکوەزیر چۆن هەوڵ دەدەن بنیاتی ئابووریو سیاسیی پێویست بۆ ڕاکێشانی لاوانو بەشدارکردنیان لە سیاسەتدا پێک بێنن. ئەگەرچی باسی ئەو مەسەلەیە بۆ ئێمە گرنگە، بەڵام دەبێ لەبیرمان بێ کە ئێرانییەکان زۆری پێ قەڵسن."[71]

هەرلەو کاتەدا، ژیاننامەیەکی کورتو بەشی زۆری وردیان دەربارەی یەکیەکی هاوسەفەرەکانی هووەیداوە دا بە جانسۆن. بۆ نموونە لە بارەی لەیلای ئیمامییەوە هاتبوو کە، "ئەو لە وەچەی نوێی ژنانی تەواو سەربەستو ڕۆژئاواادۆستی ئێرانییە. بەهۆشو چالاکو ئەهلی باسو موناقەشەیە. ئیرادەیەکی زۆر پتەوی هەیە. پابەندی نەریت نیە. لەوەی بە نهێنی دەگوزەرێ ئاگادارە. زۆرخێرا نەزەری لیبراوانە پەیدا دەکاو جاری وایە تەنانەت وەک ئەهلی کێشە دیار دەکا. خانمی هووەیدا جاری وایە زۆر توندەتەبیاتو کەمحەوسەلە دێتە بەرچاو. تاقەتی ڕێوشوێنی ڕەسمیی نیەو لە ڕێوشوێنی ڕەسمی بێزارە."[72] هەر لەو ڕاپۆرتەدا هاتوە کە خانمی هووەیدا سیگاری وینستۆن دەکێشێو لە خواردنەوەکانیش حەز لە ویسکی دەکا.

لە بەرامبەر ئەو هەموو موتاڵاو ڕاپۆرتە دووروودرێژەدا، خۆسازکردنی هووەیدا بۆئەو سەفەرە زۆر نارێکو سەرسەرەکی دیار بوو. سەرچاوەی سەرەکیی زانیارییەکانی لە بارەی ئەمریکاو سیاسەتمەدارەکانیەوە سیووسی غەنی بوو. ئەو کوڕی پزیشکێکی

ناسراوو ئەدیب بووو بەرەبەرە بوو بە یەکێک لە گرنگترین ڕاوێژکارانی هووەیداو وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئەمریکا ئەوی وەک "وەکیلێکی ئێرانی، بە توانایەکی سەرسوڕهێنو ئۆگریی زۆر جۆراوجۆرەوە" دەناسی. دەیگوت: "لایەنگری قانوونی بنەڕەتیی مەشرووتەیەو ڕەخنەی سەرەکیی لە ڕێژیمی ئێستا نیزامە زۆردارەکەیەتی...ئەدەبیاتی فارسیو ئینگلیسیو کلاسیکی ئەمریکایی باش خوێندۆتەوەو دەناسێ... تەواویش شارەزای سینەمایە. وا دیارە لێکۆڵینەوەی لە بواری بارودۆخی سیاسیی ئەمریکاوە، ساڵی١٣٤٧ سەرۆکوەزیری خستە ئەو فکرەوە کە دەگەڵ خۆی بیباتە ئەمریکا."[٧٣]

دیارە ئەمرۆ غەنی بە ڕاوێژێکی شیرینو خۆبەکەمگرتنێکی جێی ستایشەوە جەخت دەکاتەوە کە لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەمریکا شتێک زیاتر لە خوێندنەوەی وردی "بڵاوکراوە ڕۆژانەکانی ئەمریکا" نەبووە. هەربە پشتبەستن بەو خوێندنەوەیە، لە کۆتایی ساڵی١٣٤٦دا پێشبینیی کردبوو کە نیکسۆن سپیرۆ ئەگینوو* وەک یارمەتیدەری خۆی هەڵ- دەبژێرێ. دیارە پێشبینییەکەی ڕاست دەرچوو، و هەرئەو ڕاستییەش هووەیداو زۆری دیکە لە کاربەدەستانی ئێرانی قانیع کرد کە غەنی نەکهەر ئاگادارییەکی سەرسوڕهێنی لە ئاڵوگۆڕە سیاسییەکانی ئەمریکا هەیە، بەڵکوو پێوەندییەکی بەربڵاویشی دەگەڵ ئەم وڵاتە هەیە.[٧٤]

خۆسازکردنی هووەیدا بۆ سەفەرەکەی لە لایەنێکەوە نەریتشکێن بوو. دابی باو ئەوە بوو کە سیاسەتمەدارانی ئێرانی قاڵی، یان مینیاتۆری ئێرانییان بە دیاری دەدا بە هاوتایانو میوانانو میواندارانی خۆیان. هووەیدا بڕیاری دا لە جیاتی قاڵیو مینیاتور، نیگار(نقاشی)ی ئێرانی بۆ خانەخوێ ئەمریکاییەکانی بە دیاری بەرێ. بە دەستووری وی دەوڵەت پازدە تابلۆی لە سوهرابی سوپێهری کڕینو هەر ئەو تابلۆیانەی بە دیاری دان بە ئەمریکاییەکان.[٧٥] لە بەرامبەردا، ئەمریکاییەکانیش بە نۆرەی خۆیان، بۆ ڕێزگرتن لە "مێشکی چالاکو زیندوو"ی هووەیدا،

---

* Spiro Aginew.

جێ‌پێپێكی هەڵكەندراو، قتوویەكی زینەتیی سەرمێز، چەند پیپ‌و بژاردەیەك لە بەرهەمە تازەكانیان لە بواری سیاسەت‌و دەوڵەت‌و مێژوودا، بە دیاری دایە.[٧٦]

سەرباری ئەو هەموو كاردروستایی‌و بەرنامەرێژییە، وەختێك زەمانی سەفەری هوەیدا بۆ ئەمریكا گەیشت، چەند حەوتوو زیاتری بۆ كۆتایی دەورانی سەركۆماریی جانسۆن نەمابوو. ئەو لە ڕاستیدا سەركۆمارێكی دەست‌وپێ‌شكاو بوو. هەروەك لە دەقی وتووێژەكانی هوەیداو سەركۆمار لە كۆشكی سپی دەردەكەوێ، لەو دیدارەدا خاڵی ڕوون، یان زۆر گرنگ باس نەكران. بە پێچەوانە، ئەم دووانە بە باس‌و هەڵسەنگاندنێكی گشتی لەبارودۆخی نێونەتەوەیی وازیان هێنا. لەلایەك هوەیدا هیوای دەربڕی كە، "ژمارەیەكی زیاتر لە كومپانییە ئەمریكاییەكان سەرمایەكانیان لەئێران وەگەڕ بخەن." جانسۆنیش لە وەڵامدا گوتی: "لەو بۆچوونە ڕووناكبینانەی [دەوڵەتی ئێران] زۆر خۆشحاڵە." ئەو گوتی، سەفەری بۆ زۆر وڵات كردوە، بەڵام لە هیچ كوێ تووشی ڕێبەرییەكی زیرەكترو كاریگەرتر لە [ئێران] نەبووە."[٧٧]

سەرنج‌ڕاكێشترین باری ئەم وتووێژانە پێوەندیی بە مەسەلەی چەك‌وچۆڵی نیزامی، بوودجەی سوپای ئێران‌و ئەمنیەتی خەلیجی فارسەوە هەبوو. جانسۆن زۆر بە تێ‌بینی‌و پارێزەوە، و بە هەزارو یەك شێروڕێوی‌هێنانەوە، ئاماژەی بە مەسەلەیەك كرد كە لە تەواوی ماوەی دەساڵی پێشتردا، گرنگترین تەوەری ناكۆكییەكانی ئێران‌و ئەمریكا بوو. گوتی: "ئەمن هەمیشە نیگەرانم كە نەكا ڕادەو پەرەگرتنی بوودجەی نیزامیی ئێران هەڵدانی ئابووریی وڵات بخاتە مەترسییەوە." ئاغای سەرۆك‌وەزیر لە وەڵامدا گوتی: "لەو بارەیەوە ، دڵنیا بە كە لەنێو ئەم دووانەدا پێوەندییەكی هاوتا بەرقەرارە."[٧٨] دەبینین كە ڕاوێژی یەكجار بەپارێزی جانسۆن دەگەڵ ڕاوێژی كەم‌وزۆر فەرماندەرانەی كاربەدەستانی دەوڵەتی كەنەدی جیاوازییەكی بنەڕەتیی هەبوو. جگەلەوە، ساڵی ١٣٤٠، كەنەدی‌و هاوڕێكانی لە هێنانەگۆڕی "پرسگەلێكی ناسك"ی وەك دێموكراسی، و بەشداریی خەڵك لە سیاسەتدا دوودڵ

نەبوون، بە پێچەوانە، بە وتەی شا خۆی، "لەسەر ئەوە مکوڕ بوون کە تەنانەت وردەکاریی چەندوچۆنی نەفەرات‌و چەکدارکردنی سوپای ئێرانیش بۆخۆیان دیاری بکەن."[79]

بەشی هەرەزۆری دەورانی سەرۆک‌وەزیریی هوەیدا هاوکات دەگەڵ ئەوسالانە بوو کە لەواندا شاو ئێران سەربەخۆییەکی نەدیتراویان هەبوو. ساڵی ۱۳٤٥، ڕێکخراوی سیا لە ڕاپۆرتێکی تایبەتی لەژێر ناوی"بیرو بۆچوونی ئێستای شا"دا، ئیددیعای کرد کە، "شا دوای بیست‌وپێنج ساڵ پادشایەتی، بۆ یەکەمجار وەک فەرمانڕەوایەکی سەربەخۆ ڕەفتار دەکا. ئەو چارەنووسی خۆی وەک پادشایەکی نوێخوازو پێشکەوتوو بەدەستەوە گرتوە."[80] لە ڕاپۆرتێکی دیکەدا، سیا تەنانەت هۆشداریش دەدا کە، "سەربەخۆیی ڕوولەزیادبوونی شا لەوانەیە لە نێوان ئەوو ئەمریکادا ئاڵۆزی دروست بکا." لە بەشێکی دیکەی هەرئەو ڕاپۆرتەدا هاتوە کە لە چەند ساڵی دواییدا، شا سەرکەوتنەکانی "زۆرتر بە پێچەوانەی پێشنیارەکانی ئەمریکا بە دەست هێناون‌و لە ئاکامدا سەرکەوتنە بەرچاوەکانی بە حیسابی دروستیی سیاسەتەکانی‌و تێگەیشتنی سیاسیی خۆی دادەنێ. هەر ئەم باوەڕە ئەوی لە شایەکی لەرزۆک‌و بێ‌دەسەڵاتەوە کردۆتە سوڵتانێکی بەتواناو متمانەبەخۆ."[81] لە ڕاستیدا دەتوانین کڕینی کارخانەی ئاسن‌تواندنەوە لە شووڕەوی‌و دابین‌کردنی سەرمایەکەی لە ڕێگای فرۆشتنی گاز بەو وڵاتەوە بە یەکێک لە بەڵگەکانی ئەو سەربەخۆییە تازەدەستکەوتووە بزانین. نەخشی ئێران لە ڕێکخراوی ئۆپێکدا، ئامادەیی شا بۆ بەرەوڕووبوونەوەی ڕۆژئاوا، پێداگرتنی لەسەر زیادکردنی نرخی نەوت‌و ملبەملەی لیبراوانەی دەگەڵ نیکسۆن لەو بارەیەوە لە نیشانەکانی دیکەی ئەو سەربەخۆییە بوون.

بەڵام ڕووداوە خەماوییەکانی دەیەی دواتر بە ئاشکرا نیشانیان دا کە ئەو هەستی سەربەخۆبوونەی شا زۆر ناسک‌و بێ‌بناخە بوو. بە دەرکەوتنی یەکەمین نیشانەکانی درزتێکەوتنی کۆشکی پڕشکۆی پادشایەتی، ئەو هەستی سەربەخۆیی‌و دەسەڵاتەی شا یەکسەرو بە

شەوێک بوو بە هێندێک سیاسەتی جارێک بێ مەنتیقو جارێک لەرزۆک-و سەرەنجامیش گەیشتە ملکەچیی تەواو بەرامبەر بە فەرمانو نەزەری دەوڵەتانی ڕۆژئاوا. لایەنگرانی شاو پادشایەتی بۆ دیتنەوەی کلیلی ئەو مەتەڵۆکەیە، زۆرتر خەتای ئەو دەرمانانە دەگرن کە شا بۆ بەربەرەکانی دەگەڵ شێرپەنجە بەکاری دێنان، واتە ئەو نەخۆشییە کە ئاخرەکەی پێشی مرد. دیارە گومان لە کاریگەریی خەراپو زیانباری هێندێک لەو دەرمانانەدا نیە. جگەلەوە، شا لەو سەردەمەدا تووشی خەمۆکییەکی توندیش ببوو، کە هێندێک دەرمانیشی بۆ ئەو نەخۆشییە دەخواردن. تێکەڵکردنی ئەو دووجۆرە دەرمانەش لەوانەیە شوێنەواری خەراپی هەرکامێکی دووچەندانە کردبێتەوە. بەڵام بە باوەڕی من ڕیشەی ڕەفتاری سەیری شا دەبێ لە هۆکارە دەروونییەکانو سروشتی کەسایەتیی خۆیدا وەبینین. هەر لەساڵی ١٣٢٠، واتە لەو کاتەوە کە ئینگلستانو شووڕەوی ڕەزاشایان ناچار کرد لە تەختی شایەتی بێتە خوار، جێنشینی لاو دەیەویست دەگەڵ بابی وڵات بەجێ بێڵێ. ساڵی١٣٣٢ش، تەنانەت پێش ئەوەی چارەنووسی کۆدیتا ڕوون بێتەوە لە ئێران ڕایکرد. جگەلەوە دەزانین کە ساڵی١٣٤٠یش نیازی بوو وڵات بەجێ بێڵێو ساڵی دواتریش هەڕەشەی لە ئەمریکا کرد کە ئەگەر فشاری زۆرتری بۆ بێنن، لە پادشایەتی دەکشێتەوە. سەرەنجامیش ساڵی١٣٥٧، کاتێک شەپۆلی دژایەتییەکە هەڵچوو، ئەو بۆ ڕۆیشتن دەقیقەی دەژماردن. بەڵام ساڵی١٣٤٧، ئەودەم کە هووەیدا دەچووە ئەمریکا، دەورانی بڕەمبڕەمی شا هێشتا لەگۆڕێدا بووو سەربەخۆیی-خوازییەکەی هەردەهاتو زیاد دەبوو.

بێگومان هووەیدا بناخەدانەری ئەو سەربەخۆییە تازەدەستکەوتووە نەبوو، بەڵام دنیادیدەییو پێگەیشتوویی فەرهەنگیی خۆیو دەوروبەرو هاوکارە تەکنۆکراتەکانی کە چاوترساوی ڕۆژئاوا نەبوون دەستی وەدەست یەک داو سەقامگیریو توانای بە ڕووحی سەربەخۆیی تازە بەخشی. جگەلەوە، تەنانەت لایەنگرانی هووەیداش ئەم نوکتەیان قبووڵە کە، "ئەو بە زیرەکیو بیرتیژیی خۆی باش تێگەیشتبوو کە شا تینووی

پێهەڵلاگوتنە. دەیزانی شا پێی خۆشە دەگەڵ دوگۆل بەراوردی بکەن."[84] لە هەمووی گرنگتر ئەوە بوو کە زیادبوونی لەنەکاوی داهاتی نەوت پاڵپشتی ماڵیی بۆ ئازایەتیی سیاسیو سەربەخۆیی رووڵەزیادبوونی شا پێک دێنا. هەرلەو کاتەدا رۆژبەرۆژ ئەوی لە دروستیی بۆچوونەکانی دڵنیاتر دەکرد. بەرەبەرە ئەو متمانە تازە دەستکەوتووەی شا بە بیروباوەڕەکانی ئەوەندە بەهێز بوو کە گەیشتە دەروازەی شێتی بەڕاستی پێی وابوو لە هەمووکەس زیاتر قازانجو زەرەری ئێران دەناسێ. پاش ماوەیەک وای لێهات کە ئێرانیش بۆ بەرزەفڕییەکانی بەس نەبوو. زیاترو زیاتر بۆ کۆمەڵە رۆژئاواییەکانیش بە زمانێکی توند حوکمو دەستووری دەردەکرد، خاڵە لاوازەکانیانی دەژماردو ئامۆژگاریی دەکردن. شکی تێدا نیە کە زیرەکیی هووەیداو شارەزایی وردی لە ئەدگاری شا لەلایەک دەبووە هۆی ئەوە کە بە پێهەڵلاگوتنی هێندێجار زێدەڕۆییانەی شا، دەورانی حکوومەتەکەی درێژ بکاتەوە، و لەلایەکی دیکە، لەو ڕێگەیەوە خۆپەرستیی شا بەرێتە سەر.

دیارە ئەگەر ئاڵوگۆڕەکانی ئەو سەردەمەی ئێران لە دوورەدیمەنی مێژووییدا سەیر بکەین، ئەودەم ڕەنگە ڕیشە دەروونییەکانی سەرهەڵدانی ئەو خۆپەرستییەو ئەو لەخۆباییبوونە زیانبار، بەڵام لەچارنەهاتووەی شا باشتر بناسین. ئەوەندە بەسە لە بیرمان بێ کە لەساڵی یەکەمی سەرۆکوەزیریی هووەیدادا، بانکی ناوەندیی ئێران بۆ دانی خەرجی ڕۆژانەی دەوڵەت، پێویستیی بە قەرزێکی فەوریی پێنج میلیۆن دۆلاری هەبوو. مەهدیی سەمیعی، کە ئەودەم سەرۆکی بانک بوو، ناچار بوو لە دۆستایەتیی خۆی دەگەڵ سەرۆکانی بانکەکانی دەرەوە کەلک وەرگرێو قەرزی پێویست دابین بکا. دەساڵ دواتر، هەرئەم دەوڵەتە گەیشتبووە قۆناغێک لە سامانداری، کە شا، بە وتەی ڕێکخراوی سیا، کەوتە "زێدەخەرجی"و لە ماوەیەکی کورتدا حوکمی کرد کە ئێران نیزیک بە دوومیلیارد دۆلار قەرزو کۆمەگی خۆڕایی بدا بە وڵاتانی بێگانە، لەوانە فەڕانسەو ئینگلیس. دیارە لە نێوان دەوڵەتێکدا

کە موحتاجی پێنج ملیۆن دۆلاربوو دەگەڵ دەوڵەتێک کە دەیتوانی ساڵێ دوومیلیارد دۆلار بدا بە وڵاتانی دیکە جیاوازی لە زەوی تا ئاسمان بوو. شاش، بەهەق، خۆی بە میعماری سەرەکیی ئەو بازدانە گەورەیە دەزانیو لە ئاکامدا تووشی خۆپەرستی هاتو خۆی لێ بوو بە ئەقڵی گشتی. بەڵام هەرچۆنێک بێ یەکەم نیشانەکانی ئەم گۆڕانە لە جێگەوپێگەی نێونەتەوەیی ئێراندا بە ئاشکرایی دەتوانین لە ڕاوێژی وتووێژی جانسۆنو هووەیدادا ببینین.

هووەیدا، لە دیداری خۆی دەگەڵ جانسۆندا ئاماژەی بە دووخاڵی گرنگی دیکەش کردو هەردووکیشیان دواتر بوونە پایەی سیاسەتی دەرەوەی ئێران. لە بواری چوونەدەری هێزەکانی ئینگلیس لە خەلیجی فارسدا، کە قەرار بوو تا ساڵی ١٣٥٠ تەواو بێ، هووەیدا بە لێبڕاوییەوە گوتی: "ئەمنیەتی خەلیجی فارس"دەبێ "بخرێتە سەر شانی خەڵکی ناوچەکە"و هیچ هێزێکی دیکە لەو بارەیەوە مافی دەستتێوەردانی نیە. هووەیدا جگە لەوەش ئاماژەی "بە ڕاپۆتگەلێکی جێی نیگەرانی لە بارەی عێراقەوە" کرد. گوتی: "عێراق خەریکی ئامادەکردنی چەکوچۆڵو ئامرازی پێویست بۆ شەڕی شیمیاییە. شووروەوییەکان تائێستا لەو بارەیەوە هاوکارییان نەکردوون. عێراقییەکانیش ئێستا دەستەوداوێنی بولگارستان بوون." ئەو گوتی"فکری بوونی چەکی شیمیایی لە دەستی حکوومەتێکی ناسەقامگیری وەک عێراقدا ئەندامی وەلەرزە دەخا."[٨٢٠] ئەمڕۆ بەداخەوە دەزانین کە ئەو نیگەرانییەی هووەیدا بێبناخە نەبوو. ڕاست دوازدە ساڵ دواتر، هەرئەو "حکوومەتە ناسەقامگیر"و بەڕاستی خوێنخۆرە لە شەڕی درێژو خوێناویی خۆی بە دژی ئێراندا -شەڕێک کە بەهۆی سەرسەختیی [سەربەخۆییخوازانە]ی ئایەتوڵڵا خومەینییەوە دووروودرێژتریش بۆوە-لەوچەکە شیمیاییانە کەلکی وەرگرتووەو هەزاران ئێرانیی کوشتوە.

قسەکانی هووەیدا لە بارەی ئەمنیەتی ناوچەی خەلیجی فارسەوە لە چەند لایەنی گرنگی دیکەشەوە جێی سەرنجن. لەلایەکەوە دەتوانین ئەو قسانە وەک بەشێک لە زەمینەی مێژوویی "دوکترینی نیکسۆن"

دابنێین. دەزانین کە "دوکترینی نیکسۆن" لەسەر ئەو بناخەیە دامەزرابوو کە دەوڵەتی ئەمریکا ئیدی نە دەتوانێ، نە دەبێ ڕۆڵی ژاندارمو پۆلیسی دنیا یاری بکا. لە جیاتی ئەوە، دەبێ لە هەر ناوچەیەکی جیهان، یەکێک لە دەوڵەتانی ناوچە کە توانای پێویستیان هەیە، چەکدارو بەهێز بکاو وەک ژاندارمو پارێزەری ئەمنیەتو سەقامگیریی ناوچە بەهرەیان لێوەرگرێ. نیکسۆن ئەم تیئۆرییەی یەکەمجار لە وتارە بەناوبانگەکەی لە دورگەی گووام* لە ساڵی١٣٤٨(١٩٦٩)دا هێنایە گۆڕێ. یەکێک لە گرنگترین ئاکامەکانی دوکترینی نیکسۆن سیاسەتی تازەی ئەمریکا لە بەرامبەر فرۆشتنی چەک بە ئێراندا بوو** لەوەودوا ئەمریکا قبووڵی کرد کە. "ئێران باشتر لە هەر وڵاتێکی دیکە دەتوانێ سەقامگیریو ئەمنیەتی

---

* Guam.

** ئارمەن مایر کە لە ساڵی١٣٤٣وە تاساڵی١٣٤٨ (١٩٦٤تا١٩٦٩) باڵیۆزی ئەمریکا لە ئێران بوو، نوکتەیەکی مێژوویی جێی سەرنج لەو بارەیەوە دێنێتە گۆڕێ کە پێویستە ئەو کەسانەی ئۆگری مێژووی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکان لێیوورد ببنەوە. بە وتەی مایر، شا نەخشێکی گرنگی لە دروستکردنی دوکترینی نیکسۆندا هەبوو. دەڵێ وەختێک لە ساڵی١٩٦٧دا نیکسۆن سەفەری ئێرانی کرد،چەند سەعات دەگەڵ شا دووبەدوو دانیشتن. لەم دیدارەدا، شا بۆچوونەکانی خۆی دەربارەی ئەمنیەتی ناوچەی خەلیجی فارسەوە شی کردەوەو هەر ئەمە بوو بە هەوێنی "دوکترینی نیکسۆن" هێندێ بەڵگەی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئەمریکا نەکهەر ئەو باوەڕەی مایر پشتڕاست دەکەنەوە، بەڵکوو نیشان دەدەن کە تەنانەت پێش دیدار لەگەڵ نیکسۆنیش،شا بیروبۆچوونێکی گرنگی وەک ئەوەی هێناوەتە گۆڕێ. بۆنموونە، لە خەزەڵوەری ١٣٤٥دا، ئاوریل هەریمەن بە نوێنەرایەتیی جانسۆن هاتە ئێرانو چاوی بە شا کەوت. لەو دیدارەدا شا پێی داگرت کە "ئەم ڕۆژانە ئیدی بۆ وڵاتێکی وەک ئێران مومکین نیە بۆ دابینکردنی ئەمنیەتی خۆی پاڵ وەپشتیوانی یان دەستتێوەردانی دەسەڵاتێکی گەورەی وەک ئەمریکا بدا...ئێران دەبێ بۆ ڕەواندنەوەی مەترسیی ناوچەیی توانای نیزامیی پێویستی هەبێ. بڕوانە:
US Embassy, Tehran,iran, "Telgeram fram the embassy hn iran, FOREIGN RELATIONSOF UNITED STATES<1964 -68, VOL.XX11.(Wasgington, DC 1999), 327-3ykey uemrykakany d30

ناوچەی خەلیجی فارس دابین‌و مسۆگەر بکا. دیارە ئەمریکا هەروەک جاران درێژە بە هاوکاریی پێویستی ئێران [لەبواری نیزامی‌و دیفاعی]دا دەدا... ئەمریکا لەوەودوا قبووڵی کرد کە... بڕیارلەسەر چەندو چۆنی کڕینی چەک بۆ ئەرتەشی ئێران دەبێ زیاتر بدرێتە دەست ئێران."[84] بە جۆرێکی دیکە بڵێین، بۆ ئەوەی شا بتوانێ ئەرکی ژاندارمی ناوچە بەجێ بگەیەنێ، دەسەڵاتی تەواوی پێدرا کە چەکی پێویستی خۆی، بێ هیچ نیگەرانییەک لە بەرتەسککردنەوە لەلایەن ئەمریکاوە، لەو وڵاتە داوا بکا. ئەم بڕیارەی نیکسۆن، بەباوەڕی من، خاڵێکی وەرچەرخانی مێژووی ئێران بوو. ڕەنگە پێویست بێ، لە خۆمان بپرسین کە ئەگەر نیکسۆنیش وەک سەرکۆمارەکانی دیکەی ئەمریکا-لە ئایزەنهاوێرەوە تا جانسۆن-هەروا هەوڵی دابایە بوودجەی نیزامیی ئێران بەرتەسک بکاتەوە، ئەگەر دەستی شای لە کڕینی چەکدا، لە باری چەندی‌وچۆنییەوە ئاوەڵا نەکردایە، دوارۆژی ئێران‌و ڕێژیمی پەهلەوی چ گۆڕانێکی بەسەردا دەهات. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئەو ساڵانەی دوکترینی نیکسۆن ڕێک-دەخرا، ئیدی لە ئێراندا کەس نەبوو بتوانێ لە بەرامبەر ئیشتیای بێ-کۆتایی شا بۆ کڕینی چەک‌وچۆڵدا بەربەرەکانی بکا. هووەیدا کە بێشک لەو بارەیەوە بەرەنگارییەکی ئاشکرای نیشان نەداوە، زۆر وەخت لە خۆبەخۆیایەتیدا لە دەست ئەو ڕاستییە ناڵەی دەهات کە زیاتر لە سەدیحەفتای بوودجەی ساڵانەی وڵات لەژێر چاوەدێریی هێندێ ئۆرگانی وەک ساواکدا بۆ هێندێک بەرنامە خەرج دەکرێ کە سەرۆک-وەزیرو کابینە چووکترین ئاگاداری‌یان لێی نیە.[85]

زیاد بوونی نرخ‌و داهاتی نەوت دەستی وەدەست دوکترینی نیکسۆن داو هەلومەرجێکی پێکهێنا کە لەودا شا توانی ئەرتەشی ئێران لە ڕادەیەکی نەدیتراودا بەهێز بکاو نوێی بکاتەوە. کەلکوەرگرتن لە هێزە زەربەتییەکانی ئێران بۆ ڕاگرتن‌و سەرەنجام سەرکوتی بزووتنەوەی مارکسیستیی شۆرشگێڕانەی زوفار دەبێ وەک نوێنگەیەکی سەرکەوتووی دوکترینی نیکسۆن دابنێین. هەرلەو کاتەدا، دەگەڵ گرنگیی مەسەلەکە، ، بڕیاری ناردنی ئەرتەشی ئێران بۆ زوفار

تەنانەت یەک جاریش لە کابینەی هووەیدادا باس نەکرا. زۆر بەڵگە نیشان دەدەن کە هووەیدا تەنیا وەختێک لە ناردنی ئەرتەشی ئێران [بۆ زوفار] ئاگادار بوو کە هەواڵدەرییە نێونەتەوەییەکان بابەتگەلێکیان لەو بارەیەوە نووسی. جگەلەوە، ئەو مەسەلانەی پێوەندی‌یان بە سیاسەتی دەرەوە، ئەمنیەتی نێوخۆیی، نەوت، گاز، ئێنێرژیی ئەتۆمی‌و ئەرتەشەوە هەبوو هەرگیز لە هەیئەتی دەوڵەتدا باس نەدەکران. کاتێک لە هەرکام لەو بوارانەدا پێویستیی بە بوودجەی زیادی پەیدا دەبوو، بڕیارنامەیەک دەنووسراو وەزیرەکانیش دەیانزانی کە شا حەوسەلەی باس‌و وتوویژی هیچکام لە ئەندامانی هەیئەتی دەوڵەتی نیە. مەجیدی کە لە وەزیرانی جێی متمانەی هووەیدا بوو، تەنانەت ئیددیعا دەکا کە وەختی هاتنەگۆڕی ئەو جۆرە پرۆژەبڕیارانە لە هەیئەتی دەوڵەتدا، هووەیدا هەمیشە پێشی هەرجۆرە باسێکی جیددیی دەگرت‌و دەرەتانی باس‌و ڕادەربڕینی بە وەزیرانی ناڕازی نەدەدا.[٨٦] دیارە مەجیدی وەڵامی ئەو پرسیارە ناداتەوە کە ئەو وەزیرە ناڕازییانە بۆچی باوەڕەکانی خۆیان بۆ نموونە لە مەجلیس یان مەیدانێکی دیکەدا نەدێنایە گۆڕێ‌و لەوەش گرنگتر، بۆچی، بە حورمەتی ئەو بیرو بۆچوونە نەیارانە، لە دەوڵەت نەدەکشانەوە.

هەوڵی شا بۆ ئەوەی ئێران بکاتە دەسەڵاتی سەردەستی ناوچەی خەلیجی فارس، و هەروەها مکوڕبوونی لەسەر زیادبوونی نرخی نەوت، ئەوی بە ئاشکرا خستە ڕووبەڕووی ئینگلستان. زۆر ڕاپۆرتی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئەمریکاو ئینگلیس‌و باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە ئێران‌و لە ئینگلیس، هەموو باس لە "تاریکبوونی پێوەندییەکانی ئێران‌و ئینگلیس" دەکەن. بۆ نموونە، واڵتێر ئانەنبێرگ*، باڵیۆزی ئەوکاتی ئەمریکا لە لەندەن، لە ڕاپۆرتێکدا نووسی، "بە باوەڕی ئێمە دەوڵەتی ئینگلیس هێندە حەز ناکا ئێران نەخشێکی گرنگ‌و یەکلاکەرەوە لە ناوچەی خەلیجدا یاری بکا، واتە نەخشێک کە ئێران بەحەقی خۆی

* Annenberg.

دەزانی... قازانجی سیاسیی ئینگلیس زۆرتر دەگەڵ عەرەبەکانی دەوروبەری خەلیج تێکەلە. هەرنەبێ تا کاتێک چوونەدەری ئینگلستان لە خەلیج تەواو دەبێ، وەزع هەروا دەبێ. هەتا کاتێک بەستراوەیی [ئینگلیس بە عەرەبەکان] درێژەی هەبێ، ئاڵۆزیی نێوان ئێران و ئینگلیسیش درێژەی دەبێ."[87] یەکێک لە نیشانە دیارەکانی ئەم ئاڵۆزییە، رەخنەی ئێران لە ئینگلستان لە پووشپەڕی ١٣٥٠دا بوو. دەوڵەتی ئێران زۆر ناڕازی بوو کە، ئەم دواییانە، عولیاحەزرەت شاژنیش لە وتارە ڕەسمییەکان و جاروبار تەنانەت لە وتووێژی تایبەتییشدا، لە جیاتی وشەی خەلیجی فارس وشەی خەلیج بەکار دێنێ."[88] کەمێک دوای ئەو داستانە، باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە ئێران هوشداری دا کە، قەیرانی پێوەندییەکانی ئێران و ئینگلیس"، دەرکەوتوەو "نیشانەی جۆراوجۆر لەو بارەیەوە دێتە بەرچاو کە هەموویان زیادبوونی هەستی دژایەتیی ئینگلیس لە دەوڵەتی ئێراندا دەردەخەن."[89]

ئەم قەیرانە ڕۆژبەڕۆژ توندتر دەبووو مەسەلەی نەوتیش سەربار بوو. ئاخرەکەی لە بەفرانباری١٣٥١دا وەزیری کاروباری دەرەوەی ئەوکاتی ئینگلستان داگلاس هیوم* پەیامێکی توندی بۆ شا نارد. دەستووری بە باڵیۆزی ئینگلستان دا کە، "بۆخۆی ئەو پەیامە بۆ شا بەرێ و نامەکە ڕاوێژێکی پڕهەڕەشەو ڕاشکاوانەی هەبوو."[90]

مەسەلەی نەوت هەر بۆ ئینگلستان گرنگ نەبوو. دەوڵەتی ئەمریکاش هەر بەو ڕادەیە نیگەرانی چوونەسەری نرخەکان بوو، هەربۆیە، لە دیداری هووەیدا دەگەڵ جانسۆنیشدا مەسەلەی نەوت نەخشێکی گرنگی یاری کرد. لە وتووێژی ئەم دووانەدا کە لە کۆشکی سپی بەڕێوە چوو، هووەیدا، "وەبیری هێنایەوە کە دەوڵەتی ئەفریقای باشوور، کانە چۆڵەکانی کردوونە عەمباری نەوت و."[91] پێی وابوو ئەمریکاش دەتوانێ کارێکی وا بکاو ئەوەدەم بە کەلکوەرگرتن لەو عەمبارە تازانە، نەوتێکی زۆرتر لە ئێران بکڕێ. ڕاوێژکارانی جانسۆن

---

* Douglus-Home.

پێشتر هوشداریان پێ دابوو کە هووەیدا مەسەلەی نەوتو فرۆشتنی نەوتی زۆرتر دێنێتە پێش، بەڵکوو جوابی پێویستیشیان بۆ ئامادە کردبوو. بە جانسۆنیان گوتبوو لە وەڵامی ئەو داوایەدا بڵێ ئەمریکا بە مەرجێک حازرە نەوتی زۆرترلە ئێران بکڕێ کە "نرخەکەی بەقازانج بێ."[92] جانسۆنیش ڕاست ئەم قسەیەی پێگوتو هەرلەوکاتەدا وەبیری هێنایەوە کە مەسەلە گرنگە سیاسییەکانو یەک لەوان نەوت لە ئەستۆی دەوڵەتی تازەی نیکسۆنن. پێش ڕۆیشتنی هووەیدا لە دەفتەری سەرکۆمار، جانسۆن، واڵت ڕاستۆ* و هێنری کیسینجێری بۆ وتووێژ دەگەڵ سەرۆکوەزیر بانگ کردە ژووریو پێشبینیی کرد کە دەوڵەتی تازەی ئەمریکاش پێوەندیی باشی ئێرانو ئەمریکا دەپارێزێ.[93]

جانسۆن، بێئەوەی بەخۆی بزانێ، پێشبینییەکی دیکەشی کرد. لە ڕێوڕەسمی شێوێکدا کە بە شانازیی هووەیدا لە کۆشی سپی ڕێک خرابوو، لەسەر مێزی نانخواردن چەند شێعرێکی لە شالیر شاکاری شکسپیر خوێندنەوە. ئەو چەند بەیتە بێئەوەی جانسۆن بزانێ، پێش-بینییەکی بەڕاستی وردی دواڕۆژی هووەیدا دەرچوون. شکسپیر دەڵێ:

*ئەوانەی بە هیوای قازانج خزمەت دەکەنو*
*تەنیا هەوای ڕواڵەتیان لەسەردایە*
*دەگەڵ یەکەمین دڵۆپە بارانەکان دەڕۆنو*
*لە بەرامبەر گەردەلوولدا بە تەنیا بەجێت دێڵن*[94]

هووەیدا لە ماوەی مانەوەی لە ئەمریکادا سەری ئەنجومەنی ڕۆژنامەنووسان و"شووڕای پێوەندییەکانی دەرەوە"ی دا؛ دیدار دەگەڵ ئەو دوو گرووپە، بەشێک لە بەرنامەی بەشی زۆری ئەو ڕێبەرە سیاسییە گرنگانەیە کە سەفەری ئەمریکا دەکەن. لە نیۆیۆرک هووەیدا چاوی بە نیکسۆنو دێڤید ڕاکفللێریش کەوتو جگەلەوە وتووێژێکی دەگەڵ "سەرۆکانی کومپانییە نەوتییەکانی ئەمریکا کە ئەندامی کۆنسێرسیۆم بوون ئەنجام دا. جەختی دەکردەوە کە ئێران دەیەوێ

* Rostow.

ڕۆژانە پێنج ملیۆن بۆشکە نەوت دەربێنێ. هەرلەو کاتەدا وەبیری هێنایەوە کە ئەو زێدە بەرهەمهێنانە... لە دواڕۆژدا دەستی عەرەبەکان لە ململانە دەگەڵ ڕۆژئاواو کەمکردنەوەی ناردراوی نەوتدا دەبەستێ."[950] وەبیرهێنانەوەو پێشبینییەکەی هوەیدا ڕاست دەرچوو. کاتێک لە ئۆکتۆبری١٩٧٣دا، وڵاتانی عەرەبی لە ئاکامی شەڕی عەرەب و ئیسرائیلدا، حازر نەبوون نەوت بە ڕۆژئاوا بفرۆشن، ئێران نەچووە پاڵ ئەو بایکۆتە نەوتییەو هەروەک جاران نەوتی نەکهەر بە ڕۆژئاوا بەڵکوو بە ئیسرائیلیش فرۆشت.

هەرچەند لەکاتی دیدار لەگەڵ جانسۆندا هەوڵی هوەیدا بۆ فرۆشتنی نەوتی زیاتر بە ئەمریکا سەر نەکەوت، بەڵام چەند سەعات دوای ئەو دیدارە، ئەو سەرکەوتنێکی چاوەڕواننەکراوی بەدەست هێنا. باڵیۆزخانەی ئێران ئەو شەوە بە شانازیی هوەیدا میوانداریی‌یەکی ڕێک خستبوو. لەنەکاو جانسۆن بێ خەبەردانی پێشوو هاتە میوانداریی‌یەکە. هاتنی جانسۆن لەو ڕووەوە سەرسوڕهێن بوو کە بەپێی ڕێوشوێنی دیپلۆماسی، سەرکۆماری ئەمریکا تەنیا بەشداری میوانداریی‌یەک دەبێ کە بە شانازیی سەرانی وڵاتانی دیکە بەرپا کرابێ. هاتنی جانسۆن بۆ میوانداریی باڵیۆزخانەی ئێران بەو مانایە بوو کە دەوڵەتی ئەمریکا دەیەویست هوەیدای هەتا پلەی بەرزترین کاربەدەستی وڵاتێک هەڵ-کێشێ و وەک سەرۆکی وڵاتێک ڕەفتاری دەگەڵ بکا. هاوڕێیانی هوەیدا هەموویان لەو ڕێزدانانە تایبەتییەی ئەمریکاییەکان زۆر خۆشحاڵ بوون. بەڵام وابزانم هوەیدا لە هەمووان ئاقڵتر بوو. دەیزانی کە ئەو ڕێزلێنانە دەتوانێ بۆ وی مەترسیدار بێ. نیگەرانی دژکردەوەی شا بوو. دەتوانین جۆری بەرەوڕووبوونەوەی دەگەڵ ئەو داستانە بە نموونەیەک لە ڕووبەڕووبوونەوەی دەگەڵ شا دابنێین. هەرچەند لە ڕوانگەی کۆشکی سپییەوە، "هۆی نهێنیی بانگهێشتنی [هوەیدا] پێداگرتن لەسەر ئەو ڕاستییە بوو کە ئێران تەنیا حکوومەتی یەک نەفەر نیە"[960]، بەڵام مانەوەی هوەیدا لە پۆستەکەیدا هەرنەبێ تارادەیەک ئاکامی ئەو ڕاستییە بوو کە ئەو نەک هەر قبووڵی کردبوو کە ئێران حکوومەتێکی یەک کەسییە،

بەڵکوو بۆخۆی بانگەوازی بۆ ئەو تیئۆرییە دەکرد. زۆرجار گوتبووی کە لە ئێراندا شا کەسی یەکەمی وڵاتەو تەواو. دەیگوت کەسی دووەمیش نیە. پێی دادەگرت کە شا فەرماندەرو ڕێبەرو ڕێنوێنی ملکی ئێرانە. خۆی وەک سەرۆکی دەفتەری شا دەناساند. هەر لە سەرەتای سەرۆکوەزیرییەکەیەوە تێگەیشتبوو کە بیروباوەڕی لیبراڵیی وی نەکھەر دەگەڵ مەیلی سەرەڕۆیی شا سازگار نیە، بەڵکوو ناتەباییەکی لەچارەنەهاتووشی دەگەڵی هەیە. بەڵام ئەویش هەروەک بەرەیەک لە تەکنۆکراتەکانی ئێران جۆرێک گرەوی مێژوویی کردبوو. هیوادار بوو کە هەڵدانی ئابووریو پەرەگرتنی چینی نێوەڕاست، سەرەنجام مەیلی سەرەڕۆیانەی شا کەمتر دەکاتەوەو تەنانەت دەشی گۆڕێ. ئەو گرێوە لە ڕەفتاری ڕۆژانەی هوەیدا لە بواری سیاسەتدا شوێنەواری دادەنا. ناچار بوو نرخی بۆ بدا. لە سەفەری بۆ ئەمریکادا نرخی "گرێو"ەکەی ئەوە بوو کە نەیهێشت ئەو ڕۆژنامەنووسە ئێرانییەی دەگەڵی هاتبۆ سەفەر لە ڕاپۆرتی چاپەمەنیی خۆیدا ئاماژە بە ڕەفتاری تایبەتیی دەوڵەتی ئەمریکا دەگەڵ هوەیدا بکا. بۆیە لە ڕاپۆرتی چاپەمەنیی ئێران لەو سەفەرەشدا ئاماژەیەک بەو ڕێزو حورمەتە تایبەتییەی دەوڵەتی ئەمریکا بۆ هوەیدای دانابوو، نابینین.[٩٧]

ئەو ڕاستییە کە لەم سەفەرەدا لە بارەی نەوتو مەسەلە نیزامییەکانیشەوە وتوویژێک کرا لە بارێکی دیکەشەوە جێی سەرنجە. ڕەنگە وتوویژەکانی لەو بارەیەوە بەشێک لە هەوڵەکانی بۆ شاردنەوەی ڕادەی ڕاستەقینەی دەسەڵاتی شاو پەردەپۆشیی نەزۆکیی پۆستی سەرۆکوەزیر بووبن. لە سەفەرەکانی دیکەشدا هوەیدا بە لێبڕاوییەوە لە بارەی سیاسەتی دەرەوەو تەنانەت مەسەلەی وزەی ئەتۆمی لە ئێرانیشدا قسەی دەکرد، تەنانەت وای دەنواند کە لەو بوارانەدا زانیارییەکی وردیشی هەیە، بەڵام حەقیقەتی پێوەندیی وی دەگەڵ بەرنامەی ئەتۆمیی ئێران زۆر لەوە ئاڵۆزکاوتر بوو.

بە وتەی ئەکبەری ئیعتیماد، یەکەمین سەرۆکی ڕێکخراوی وزەی ئەتۆمی لە ئێران، لە ئاخروئۆخریی ساڵی ١٣٥٢(١٩٧٣)دا، ڕەزای

قوتبی*، کە خزمی شاژن‌و لەڕاوێژکارە سەرەکییەکانی بوو، پێوەندیی دەگەڵ ئیعتیماد گرت‌و خەبەری دا کە شا بڕیاری داوە کە ئێران دەبێ بەرنامەیەکی وزەی ئەتۆمیی هەبێ‌و ئەکبەری ئیعتیمادی بۆ سەرۆکایەتیی ئەو بنیاتە ساوایە هەڵبژاردوە. ئیعتیماد دوای تەنیا مانگێک لێکۆڵینەوە ڕاپۆرتێکی لە پازدە لاپەڕدا ئامادە کرد. ڕۆژێک کە دەقی ڕاپۆرتەکە دەدرایە شا، هوودەیداش لە کۆبوونەوەکە ئامادە بوو. شا بە وردی سێ جاری دەقی ڕاپۆرتەکە خوێندەوەو پاشان ڕووی کردە هوودەیداو گوتی: "بەرنامەی ئەتۆمیی وڵات ئەمەیە. نە یەک وشە کەم، نە یەک وشە زیاد. هەر ئەمەیە. ئەمن هەمووییم قبووڵە."[٩٨٠] ئەوە بوو کە یەکێک لە گرنگترین پڕۆژە تازەکانی دەوڵەتی هوودەیدا، کە پێویستیی بە نیزیکەی دوو میلیارد دۆلار سەرمایەدانانی ساڵانە هەبوو،

---

* لەسەرەتای دەیەی پەنجا[ی هەتاوی]دا، ڕەزای قوتبی کە سەرۆکایەتیی ڕێکخراوی ڕادیۆو تەلەڤیزیۆنی ئێرانی لە ئەستۆ بوو،ڕۆژبەڕۆژ نەخشێکی چالاکترو گرنگتری لە سیاسەتی وڵاتدا بە ئەستۆوە گرت. زۆرکەس پێیان وایە کە لە دواڕۆژەکانی حکوومەتی پەهلەویدا،ئەو یەکێک لە ڕووما سەرەکییە سیاسییەکانی وڵات بوو و لەزۆر بڕیاری گرنگ،یەک لە وان گرتنی هوودەیدادا نەخشی هەبوو. هەربۆیە،هەوڵم دا وتووێژی دەگەڵ بکەم. پێشنیارەکەمی قبووڵ کردو کەمێکیش، بۆ یەکترناسین، لە هێندێ بواردا کە مەبەستمان بوون وتووێژمان کرد. بەڵام کەمێک دواتر ئاگاداری کردم کە لە بڕیاری پێشووی خۆی پاشگەز بۆتەوەو ئامادەی وتووێژ نیە.
چەند ڕۆژ بەرلەوەی دوادەقی کتێبەکە بچێتە ژێر چاپ،دووبارە پێوەندیم دەگەڵ گرت. ئەو باسانەم وەبیر هێنانەوە کە لە کتێبەکەدا ناوی هاتوەو داوام لێکرد لە بارەی هەر کامێکیانەوە بۆچوون‌و گێڕانەوەی خۆیم بۆ باس بکا. دووبارە پێشنیارەکەمی قبووڵ کرد. پاش وەبیرهێنانەوەی چەند جێگا کە بیرەوەرییەکانی وی دەگەڵ ئەوەی خەڵکی دیکە گوتبوویان فەرقی هەبوو، لەنەکاو ڕای خۆی گۆڕی‌و حازر نەبوو درێژە بە وتووێژەکانمان بدا. ئەزموونی من دەگەڵ ناوبراو ڕاست وەک ئەزموونم دەگەڵ فەرەحی دیبا بوو. هەردووکیان لە پێشدا حازر بوون وتووێژ بکەن‌و هەردووکیان پاش دیتنی پرسیارەکانم ،خۆیان لە ئەنجامدانی وتووێژەکە بوارد.

بێ یەک قسەی سەرۆکوەزیر، بێ ڕاوێژی پێشتر دەگەڵ هەیئەتی دەوڵەت، و بێ نەزەردان‌و پێخۆشبوونی مەجلیس دەست پێکرا.[99] هووەیداش لە جیاتی نارەزایی بەرامبەر بەو داستانە سەیرو ناقانوونییە، هەرلەوێ پێشنیاری کرد کە ئیعتیماد بکاتە جێگری سەرۆکوەزیر. لەوەودواش ئەو هیچ ئۆگرییەکی بە چەندوچۆنی کاری ڕێکخراوی وزەی ئەتۆمی نیشان نەدەدا. دەیزانی کە مەسەلەی ئەتۆم یەکێک لەو مەسەلانەیە کە شا پێی خۆشە هەر بۆخۆی بەسەریان ڕابگا. هەربۆیە هەتا بۆی کرابا خۆی لە دەستتێوەردانی دەپاراست. قەت لە ئیعتمادی نەپرسی ئامانجی بەرنامە ئەتۆمییەکانی ئێران چییە؟ هەرگیز ئەو پرسیارەی نەهێنایە گۆڕێ کە ئایا لەپشت ئەو بەرنامەگەلەوە ئامانجی نیزامییش شاردراوەتەوە یان نا. بە پێچەوانە، ئەوە ئیعتیماد بوو کە ڕۆژێک لە هووەیدای پرسی کە دلخوا "لەپشت سەری دەوڵەت‌و ئەعلاحەزرەتەوە شتێکی وا هەیەو ئەگەر باسی کراوە دەبێ ئەمن بزانم." هووەیدا پرسیارەکەی ویی بە پرسیارێکی دیکە وەڵام دایەوە. پرسی: "ئەتۆ بۆ دەبێ بزانی؟"و ئاخرەکەشی پێی لێنا کە، "بەڕاستی ئەمنیش نازانم."[100] دیارە هووەیدا بە ڕواڵەت تەنیا کەس نەبوو کە بەرامبەر بە ئامانجی بەرنامە ئەتۆمییەکەی ئێران زۆر کونپشکن نەبوو. ئیعتیماد خۆشی کە بردنەپێشی ئەو بەرنامەیەی لە ئەستۆ بوو گۆیا لەو بارەیەوە زۆری کونپشکنی لەخۆی نیشان نەدەدا. دەڵێ: "ئەمن زۆر ئاسان تێدەگەیشتم چییان دەوێ‌و چییان دەسەردایە. وەسەر خۆم نەدینا...دەمدی کە بەرەبەرە هێندێ نوختەی مووزاییکێکی گەورە دروست دەکرێن."[101]

تەنیا کەس کە لە پڕۆژەی سەرەکیی ئەو"مووزاییکە گەورە"یە ئاگادار بوو شا خۆی بوو. ئەویش بڕیاری وابوو کە وەزعەکە هەروا بمێنێتەوە. دەستووری دابوو کە سەرۆکی ڕێکخراوی وزەی ئەتۆمی ڕاپۆرت بە خودی شا بداتەوە. بە ڕواڵەت ئەم ڕەفتارە دەگەڵ خودی قانوونی بنەڕەتیی ئێران ناتەبا بوو. کاتێک یەکێک لە سەناتۆرەکان لە وتوویژ لەسەر پڕۆژەبڕیاری پێکهێنانی ڕێکخراوی وزەی ئەتۆمیدا

ئەوەی وەبیر هێنایەوە، شەریف‌ئیمامی، سەرۆکی مەجلیسی سەنا، هاتە مەیدان‌و بەکۆمەگی ناوبراو "مەسەلەکەیان چارەسەر کرد."[102] دیارە هووەیدا لەلایەک قازانجی سیاسیی خۆی لەوەدا دەدی کە خۆی لە هەرچەشنە دەستتێوەردانێکی سیاسەتی ئەتۆمیی ئێران بپارێزێ. بەڵام هەرلەو کاتەدا ئامادە بوو لە وتارو وتووێژەکانی خۆیدا بە لێبڕاوی لایەنگری لەو سیاسەتەو ئامانجە ئاشتیخوازانەکانی بکا.

بۆ نموونە کاتێک لە ساڵی ١٣٥٥ دا بە سەفەرێکی ڕەسمی چووە فەڕانسە، لە وتووێژێکدا ڕایگەیاند کە "ئێران قەرارو مەداری پێویستی بۆ کڕینی دوو وێستگەی وزەی ئەتۆمیی فەرانسەیی ئیمزا کردوەو ئەمجار بە لێبڕاوییەکی تەواوەوە بەڵێنی دا کە، "ئێران بە هیچ جۆر نیازی نیە لە وێستگە ئەتۆمییەکانی فەڕانسە بۆ دروستکردنی چەکی ئەتۆمی کەلک وەربگرێ."[103] لە ڕاستیدا، هەر لە سەفەری ساڵی ١٣٤٧ بۆ ئەمریکاشدا هووەیدا پێش دامەزرانی ڕێکخراوی وزەی ئەتۆمی، دەربارەی پڕۆژەکانی ئێران بۆ کەلکوەرگرتن لە وزەی ئەتۆمی بە گەرمی دوابوو. ڕاگەیەندراوێکی هاوبەش کە ڕۆژی کۆتایی سەفەری هووەیدا بۆ ئەمریکا دەرچوو، ئاماژەی بە "هاوکاری لە بواری بەکارهێنانی ناسەربازیی وزەی ئەتۆمیدا" کردبوو."[104]

دیارە سەفەری هووەیدا بۆ ئەمریکا تەواو بەتاڵ لە ئاڵۆزییش نەبوو. ئەو ئۆگرییی دەربڕیبوو کە سەرکۆماری تازەهەڵبژێراو ڕیچارد نیکسۆنیش ببینێ. هووەیدا نیکسۆنی بە یەکێک لە "دۆستانی نزیک‌و شەخسی"ی خۆی دەزانی. بەڵام لە وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئەمریکا، پاش بیروڕاگۆڕینەوە دەگەڵ ڕاوێژکارانی سەرکۆماری هەڵبژێراو...کاربەدەستە ئێرانییەکانیان ئاگادار کرد کە جەنابی سەرکۆمار ناتوانێ دیدار لەگەڵ ئاغای سەرۆکوەزیر بکا، چونکە نایەوێ پێش بیستی ژانویە دەگەڵ هیچ کاربەدەستێکی پایەبەرزی بێگانە دیدار بکا. کەچی کەمێک دوای ئەوەی هووەیدا کالیفۆرنیای بەجێ هێشت، نیکسۆن چاوی بە مۆشێ دایان وەزیری بەرگریی ئیسرائیل‌و ئەمیری کووەیت کەوت. دیارە کاربەدەستانی ئێران لەو بەسەرهاتە دڵگران بوون، چونکە

بە وتەی بەڵگەکانی وەزارەتی کاروباری دەرەوە، "هووەیدا بەو کارە کەوتە هەڵویستێکی خەراپەوە."[105] دەوڵەتی ئەمریکا هیچ وەخت لەسەر ئەو بەسەرهاتە کە جۆرێک بێڕێزی بە هووەیدا بوو، ڕوونکردنەوەیەکی نەدا. هووەیدا دەگەڵ لەیلا بۆ چەند ڕۆژ حەسانەوەو سەفەری نارەسمی کالیفۆرنیای بەرەو هاوایی بەجێ هێشت. بەڵام لە ئێران قەزا لە بۆسەدا بوو. وا دیار بوو ژانەسەرەکانی هووەیدا ڕۆژبەڕۆژ زیاد دەبن.

# سەرچاوەکان


۱. لیلا امامی، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۱۲ مارس ۱۹۹۹.
۲. ژان بکر، گفتگو با نگارنده، ناپا، کالیفرنیا، ۲۱ مارس ۱۹۹۹.
۳. عبدالمجید مجیدی، «مصاحبه با عبدالمجید مجیدی»، بنیاد مطالعات ایرانی: برنامەی تاریخ شفاهی، اوریل ـ اکتبر ۱۹۸۲، ص ۴۷.
۴. افسانەی جهانبانی، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۳ ژوئن ۱۹۹۸.
۵. محمد صفا، گفتگو با نگارنده، ۲۱ نوامبر ۱۹۹۷.
۶. وجیهه معرفت، گفتگو با نگارنده، ۲۷ ژانویەی ۱۹۹۷.

7. NA, U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Bi-Weekly Economic Review, December 25, 1965-January 7, 1966," A-462.

8. U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Memorandum of Conversation," 1/21/78, NSA, no. 2142.

۹. فریدون هویدا، گفتگو با نگارنده، ۱ اوت ۱۹۹۹.
۱۰. وجیهه معرفت، گفتگو با نگارنده، ۲۷ ژانویه ۱۹۹۸.
۱۱. راجی، در خدمت تخت طاووس، ص ۲۳۶.
۱۲. رونوشت گزارش ساواک را می‌توان در جستارهایی در تاریخ معاصر ایران، تهران ۱۳۷۰، جلد ۲، یافت. این سند در قسمت آخر کتاب بەعنوان قسمتی از پیوست آمده است. کلّ بخش پیوستها فاقد شمارەی صفحەاند.
۱۳. پیشین.
۱۴. خواندنیها، ۳ مهر ۱۳۴۳.
۱۵. لیلا امامی، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۲۶ ژوئیه ۱۹۹۹.
۱۶. راجی، در خدمت تخت طاووس، ص ۸
۱۷. احمد قریشی، گفتگو با نگارنده، ۲۴ نوامبر ۱۹۹۷.
۱۸. احمد قریشی، گفتگو.
۱۹. فریدون هویدا، گفتگو با نگارنده، ۶ دسامبر ۱۹۹۷.

20. LBJ Library, "Profile of the Prime Minister" in *Visit of the PM Hoveyda of Iran*, 12/5-6/68.

۲۱. جهانسوز بهرامی فرماندەی گارد محافظ هویدا بود. بهرامی، گفتگو با نگارنده، لس آنجلس، کالیفرنیا، ۲۳ آوریل ۱۹۹۸.
۲۲. علم، یادداشتهای علم، جلد ۳.

23. U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Washburn's Views and Thoughts on Iran upon Leaving," August 11, 1973, NSA, no. 830.

۲۴. فریدون هویدا، گفتگو با نگارنده، ۲۳ ژوئیەی ۱۹۹۹.

۲۵. محمد صفا، گفتگو با نگارنده، ۲۱ نوامبر ۱۹۹۷.

۲۶. علینقی عالیخانی، گفتگو با نگارنده، ۴ اوت ۱۹۹۹.

27. NA, U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Bi-Weekly Economic Review, May 29-June 11, 1965," A-667.

28. U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Bi-Weekly Economic Review, March 6-19, 1965," NSA, A-489.

29. NA, U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Semi-Annual Assessment of the Political Situation in Iran," February 19, 1966, A-104, 2.

30. NA, U.S. Department of the Army, "Confidential Cable," March 1965.

۳۱. فریدون مهدوی، گفتگو با نگارنده، ۸ اوت ۱۹۹۹.

۳۲. مهدوی، گفتگو.

33. NA, "Confidential Cable, Department of the Army," February 1965.

34. NA, U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Dead of Former Prime Minister Mohammad Mosaddeq," 9 March 1967, A-493.

۳۵. فریدون هویدا داستان سفارت را تأیید می‌کند؛ فریدون اضافه می‌کند که غلامحسین، پسر مصدق، به نزد هویدا رفت و به‌عنوان دوست از وی برای اجازه‌ی مراسم خاکسپاری یاری خواست.

36. NA, U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Aftermath of Mosaddeq Death," 8 March 1967.

37. NA, U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Semi-Annual Assessment of the Political Situation in Iran," August 1965, A-105.

۳۸. مهدی پیراسته، گفتگو با نگارنده، ۸ اوت ۱۹۹۹.

۳۹. پیراسته، گفتگو.

40. U.S. Department of State, "Memoradum from the Director of the Bureau of Intelligence and Research (Hughes) to Secretary of State Rusk," in *Foreign Relations*, Vol. XXII, 127.

41. U.S. Embassy, Semi-Annual Assessment, 5.

۴۲. نقل شده در: محمود طلوعی، بازیگران عصر پهلوی، جلد ۱، تهران، ۱۳۷۲، صص ۵۱۶ ـ ۵۱۸.

برای ترجمه‌ی انگلیسی این نامه ر.ک. به:

*Islam and Revolution: Writings and Declaration Imam Khomeini*, tr.

Hamid Algar (Berkeley, 1981), 189 – 193.

43. NA, American Consulate, Tabriz, Iran "Prime Minister Hoveyda Cracks the Whip," A-5, 31 August 1967.

۴۴. عبدالمجید مجیدی، گفتگو با نگارنده، واشنگتن دی سی، ۱۵ فوریه ۱۹۹۹.

۴۵. فریدون هویدا، گفتگو با نگارنده، ۶ دسامبر ۱۹۹۷.

۴۶. سازمان اطلاعاتی جمهوری اسلامی، ساواما، ادعا کرده که هویدا اندکی پس از بازگشتش به ایران به ساواک پیوست. این ادعا بر دو پایه استوار است. نخست سیاهه‌ای از اسامی کارمندان ساواک که گویا نام هویدا در آن یافتنی است. شاهد دوم گزارشی است که در آن از تعلق او به دایره‌ی معینی از ساواک سخن رفته. وقتی در این مورد از «مقام عالی‌رتبه امنیتی» پرسیدم، می‌گفت به چند دلیل این دعاوی بی‌اساس، و این اسناد جعلی‌اند. می‌گفت اداره‌ای که ظاهراً به آن تعلق داشت سالها پس از تاریخ نامه‌ای که در آن به تعلق او به این اداره اشاره شده تأسیس شد. «مقام عالی‌رتبه‌ی امنیتی»، گفتگو با نگارنده، ۲۳ نوامبر ۱۹۹۸. برای دستیابی به روایت جمهوری اسلامی در این مورد، ر. ک.: جستارهایی در تاریخ معاصر ایران، صص ۳۷۵ ـ ۳۷۲.

۴۷. «مقام عالی‌رتبه‌ی امنیتی»، گفتگو با نگارنده، ۲۴ نوامبر ۱۹۹۷. وی نمونه‌هایی از مواردی را نقل کرد که شاه شخصاً متن ابراز ندامت یکی از مخالفان رژیم را تأیید و تصویب کرد. مورد بهرام مولایی، یکی از اعضای بازداشت شده حزب توده، مصداق بارز دخالت‌های شاه در جزئیات کار ساواک بود.

۴۸. پهلوی، پاسخ به تاریخ، ص ۱۵۸.

۴۹. «مقام عالی‌رتبه‌ی امنیتی»، گفتگو.

۵۰. پیشین.

۵۱. پیشین.

۵۲. فرخ نجم‌آبادی، گفتگو با نگارنده، واشنگتن دی سی، ۱۲ ژوئیه ۱۹۹۹.

۵۳. همایون، گفتگو.

۵۴. جهانگیر بهروز، گفتگو با نگارنده، ۲ آوریل ۱۹۹۹. نکات اصلی این ماجرا مورد تأیید داریوش همایون نیز هستند. وقتی با همایون درباره‌ی انتقاد بهروز از انفعالش در آن هنگام صحبت کردم، در جواب گفت، «شاید حق با او باشد و من باید از او حمایت می‌کردم.»

55. NA, U. S. Embassy, Tehran, Iran, "Changes in Ministry of Information," 22 June 1971, A–178.

برخی ناظران مدعی‌اند برکناری منصور یکسره ناشی از مخالفت او با لایحه‌ای بود که در آن سازمان رادیو و تلویزیون از استقلال کامل برخوردار می‌شد. ایرج آریان‌پور، مکاتبات شخصی، ۱۳ ژانویه‌ی ۲۰۰۰.

56. U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Confidential," 1968/02/27, NSA, no. 649.

۵۷. همایون، گفتگو.

۵۸. پیشین.

59. U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Traditional Iranian Politics," 10/25/78, NSA, no. 1617.

۶۰. مصطفی مصباح‌زاده، نامه به نگارنده، ۲۴ اوت ۱۹۹۸.

۶۱. علم، یادداشتهای علم، جلد ۳، صص ۳۱۶ - ۳۱۹.

۶۲. چنین دیدگاههایی را می‌توان هم در میان دوستان و هم دشمنان هویدا یافت. از میان گروه دوم، هوشنگ نهاوندی معتقد است که هویدا در دوران پایانی نخست وزیری‌اش، بیشتر از شاه قدرت به هم زده بود، و شاه نسبت به این امر بسی نگران شده بود. جمشید قره‌چه داغی، تکنوکراتی کارکشته، اظهار می‌دارد که هویدا غالباً شاه را با مهارت تمام کنترل و اداره می‌کرد. به نظر وی، هویدا قدرت خود را به رخ نمی‌کشید بلکه در واقع تلاش تمام می‌کرد تا به بی‌قدرتی تظاهر کند، و همین امر از کلیدهای موفقیتش به‌شمار می‌رفت.

63. U. S. Embassy, Tehran, Iran, "Ali Amini, 28 February 1968," NSA, no. 652.

بعد از ۱۳۴۴، وقتی شاه برای نخستین بار به امینی حمله کرد. سفارت ظاهراً از طریق یک واسطه با امینی ارتباط برقرار کرد. پیامهای امینی به سفارت، از جمله آن چه در اینجا نقل شده، همواره به وسیله‌ی رحمت‌الله مقدم مراغه‌ای به سفارت تحویل داده می‌شد. نیز ر. ک.:

NA, U.S. Embassy, Tehran, Iran, "The Pullic Attack on Former Prime Minister Ali Amini," 2 March 1968, A—465.

۶۴. ایرج امینی، گفتگو با نگارنده، ۴ اوت ۱۹۹۹.

۶۵. پیشین.

۶۶. علینقی عالیخانی، گفتگو با نگارنده، ۵ اوت ۱۹۹۹.

67. NA, U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Prime Minister Hoveyda: Recommendation for an Official Visit to the United States," 14 December 1967, Airgram, A-332.

68. LBJ Library, Harold H. Saunders, "Memorandum for Walt Rostow," 13 November 1968.

69. LBJ Library, "Suggestions on Approaching Iranians and Topics of Conversation."

70. LBJ Library, Memorandum for the President, 4 December 1968.

71. LBJ Library, "Checklist of Talking Points," 4 December 1968.

72. LBJ Library, "Wife of the Prime Minister of Iran," 1-2.

73. LBJ Library, "Cyrus Ghani, Advisor to the Prime Minister."

۷۴. سیروس غنی، گفتگو با نگارنده، ۲۵ ژوئیه ۱۹۹۹.

۷۵. سیروس غنی، گفتگو با نگارنده، ۹ ژوئیه ۱۹۹۹.

76. LBJ Library, "Visit of PM Hoveyda, Gift Suggestions."

77. Ibid., 1.

78. Ibid., 2.

79. U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Telegram from the Embassy in Iran to the Department of State," *Foreign Relations*, Vol. XXII, 190.

80. CIA, The Shah of Iran's Current Outlook, *Foregn Relations*, vol. XXII, 227.

81. CIA, Secret Special Memorandum #9-68, "The Shah's Increasing Assurance," 1968/05/07, NSA, no. 663.

۸۲. راجی، در خدمت تخت طاووس، ص ۶.

83. LBJ Library, Memorandum, 4.

84. U.S. State Department, "The Evolution of the U.S.-Iranian Relations," NSA, no. 3555, 20.

۸۵. راجی، در خدمت تخت طاووس، ص ۹۷.

۸۶. مجیدی، «مصاحبه با عبدالمجید مجیدی»، ص ۷.

87. NA, "Secret Cable, British and Iranian Relations in the Persian Gulf," June 1970.

88. NA, "Secret Cable, Iran-UK relations Re Gulf," July 1970.

89. NA, U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Secret Cable, Possible Iran-British Crisis Brewing," June 1971.

90. NA, "Secret Cable, Oil-Consortium/GoI Negotiations," January 1973.

91. LBJ Library, Memorandum, 2.

92. LBJ Library, "Checklist of Talking Points."

93. Ibid., 6.

94. LBJ Library, "President's Toast."

95. NA, State Department, "Secret Cable to Mr. Rostow," 18

December 1968.

۹۶. من به صریحترین لحنی این موضوع را از فرخ نجم‌آبادی شنیدم. نجم‌آبادی، گفتگو. مجیدی، نیز، در «مصاحبه‌ی تاریخ شفاهی» خودش به همین نکته اشاره می‌کند.

۹۷. غنی، گفتگو.

۹۸. اکبر اعتماد، برنامه‌ی انرژی اتمی ایران: مأموریت، ساختارها، سیاست، به کوشش غلامرضا افخمی، بتسدا، ۱۹۹۷، ص ۱۵.

۹۹. پیشین، ص ۸۵

۱۰۰. پیشین، ص ۶۵.

۱۰۱. پیشین.

۱۰۲. پیشین، ص ۲۹.

103. *New York Times*, 29 May 1976.

104. LBJ Library, Office of the White House Press Secretary, "Joint Statement," 5 December 1968.

105. NA, "State Department, Secret cable to Mr. Rostow," 18 December 1968.

به گفته‌ی فریدون هویدا، این تحقیر و بی‌اعتنایی دلایلی داشت. «از یک سو، نیکسون برای مبارزات انتخاباتی خود از شاه پول دریافت کرده بود و وی در ملاقات خود گمان می‌کرد این موضوع توجه اذهان را جلب خواهد کرد.» از سوی دیگر، «بسیاری از مشاوران نیکسون به زاهدی نزدیک بودند، که زاهدی با دسیسه‌هایش، می‌توانست آنها را به بی‌اعتنایی به هویدا ترغیب کند.» فریدون هویدا، گفتگو با نگارنده، ۱۱ اکتبر ۱۹۹۹.

# فەسڵی دوازدەیەم

## دۆڵی جندۆکان

تەنیا پێوانەی من بۆ سیاسەتمەدارێکی ڕاستەقینە ئەوەیە
کە سەوداى سەقامگیرکردنی سیستمی حازروگۆڕینو
تەواوکردنی ئەو ئەزمەی لەسەردا بێ. هەرشتێکی دیکە لە
نێوەرۆکدا بێمانا، و لەکردەوەدا مەترسیدارە.

ئەدمۆند برێک

# دۆڵی جندۆکان

پاییزی ساڵی١٣٤٧(١٩٦٨)، دەنگۆی زوورپووخانی کابینەی هووەیدا لە برەو کەوت. لە جیاتی ئەوە ئاڵۆزییەکانی نێوخۆی هەیئەتی دەوڵەت ڕوویان لە زیادبوون بوو. دیارە دەوڵەت هەمیشە کەسانێکی تێدابوون کە بە جۆرێک بە خەنیمی هووەیدا دەژمێردران. لەنێو ئەو خەنیمانەدا، جەمشیدی ئامووزگارو هووشەنگی ئەنساری جێگەیەکی تایبەتییان هەبوو. یەکەمیان تەکنۆکراتێکی کارکوشتەو دروستکارو ناکام بوو. لە سەرەتای ساڵێ ١٣٤٤ەوە نەخشێکی چالاکی لە وتووێژەکانی نەوتدا پەیدا کردبووو ڕاستەوخۆ ڕاپۆرتی بە شا دەدایەوە. دووەمەکەیان سەرمایەدارێکی سەربەگێچەڵ بوو. سامانێکی زۆری وەسەر یەک نابووو لە چەند پۆستی گرنگ، یەک لەوان وەزارەتی داراییدا، کاری بەدەستەوە گرت.[1] دواپۆستی بەڕێوەبەری کومپانیی نەوت بوو.

لە هەیئەتی دەوڵەتدا تەنیا ئەو دوو "وەزیرە تایبەتییە" نەبوون کە ڕاستەوخۆ دەگەڵ شا لە پێوەندیدا بوون. زۆری دیکە لە ئەندامانی کابینەش لە پێشدا گەلاڵەکانی خۆیان بە "شانازیی عەرز" دەگەیاندو پاش وەرگرتنی ڕەزامەندیی شا ئەم جار پرۆژەکەیان دەگەڵ هەیئەتی دەوڵەت دێنایە گۆڕێ. دیارە لەو حاڵەتانەدا هیچکەس، یەک لەوان هووەیدا، ئیدی نەیدەوێرا دژی پرۆژەیەک ڕاوەستێ کە بە "شانازیی عەرز" گەیشتبوو. هووەیدا زۆر وەخت گلەیی دەکرد کە وەزیرانی کابینەکەی خەبەرە خۆشەکان ڕاستەوخۆ بەعەرز دەگەیەنن‌و تەنیا وەختێک دێنە لای هووەیدا کە تووشی گیروگرفتێک دەبن.

بیرەوەرییەکانی عەلەم ئەم شێوە کارەی وەزیرەکان پشتڕاست دەکاتەوە. بە قسەی وی، "هەر وەزیرێک بەجودا ڕاپۆرتگەلێک عەرزی شاهەنشا دەکاو شاهەنشاش فەرمانگەلێک دەردەکەن. گیانی سەرۆک-وەزیری بەدبەختو نالێوەشاوەش لە هیچ کارێک ئاگادار نیە. ڕەنگە هۆی مانەوەشی هەر ئەوە بێ. کێ دەزانێ."[3] لە دوادواکانی حکوومەتەکەیدا، وەختێک هووەیدا هەستی بە دەسەڵاتێکی زیاتر کرد، هەوڵی دا پێوەندیی ڕاستەوخۆ دەگەڵ شا لە وەزیرە تازەکارو کەم-دەسەڵاتەکان قەدەغە بکا.[4]

هووەیدا بە وردەکاریو نەرمکێشییەکی تایبەتی ڕەفتاری دەگەڵ ئامووزگارو ئەنساری دەکرد. لە کۆبوونەوەکانی هەیئەتی دەوڵەتدا ڕێزو حورمەتێکی تایبەتیی بۆ ئەم دوو کەسە دادەنا. بە ڕواڵەت دیارە پێوەندیی ئەو سێ کەسە دۆستانە دەهاتە بەرچاو. بەڵام چاوەدێرانی ئاگادار دەیانگوت لەپشت پەردەوە قوونەشەڕێکی بەردەوامیان لەنێودا هەیە. دەیانگوت هووەیدا بە زانایيو تیژهۆشی پێشی چوونەسەری ئامووزگارو ئەنساری دەگرێ. دیارە هەرچەند پێوەندیی ئەو سێ کەسە پڕئاڵۆزی بوو، بەڵام پێوەندیی هووەیدا دەگەڵ ئەردەشیری زاهیدی تەنانەت پتر لە پێوەندی دەگەڵ ئەو دوو"وەزیرە تایبەتییە"ش ئاڵۆزو پڕ لە خوارووپێچەو دەمەقاڵەی توندبوو.

ئەردەشیری زاهیدی یەکێک لە ڕووما زۆر سەربەگێچەڵەکانی سێساڵی دوایی پادشایەتیی بنەماڵەی پەهلەوی بوو. بە قسەی ڕێکخراوی سیا، ئەو یەکەم جار لە ڕووداوی کۆدیتای ۲۸ی گەلاوێژدا سەرنجی شای ڕاکێشا. دیارە بابی لە ڕێکخەرانی سەرەکیی کۆدیتا بووو ئەردەشیر "نەخشی پێوەندیی باوکی دەگەڵ لایەنگرانی شای لە ئەستۆ بوو."[4] ئەردەشیر، کەمێک دوای کۆدیتای ۲۸ی گەلاوێژ، لە حاڵێکدا بابی هێشتا سەرۆکوەزیری ئێران بوو، سەفەری ژنێڤی کرد. دەیگوت: "سەفەرێکی نهێنیو لە پێوەندی دەگەڵ مەسەلەی نەوتدا[5] بوو. هەرلەوێ بۆ یەکەم جار ئەمیر عەبباسی هووەیدای ناسی. بۆخۆی

دەڵێ: "پێم پیاوێکی لەبەردڵان و بەئەدەب و میهرەبان بوو."[60] زاهیدی ساڵی١٣٣٦(١٩٥٧) دەگەڵ شەهنازی پەهلەوی، کچی شا زەماوەندی کرد. ئەو پەیوەندە حەوت ساڵ زیاتری نەکێشاو ساڵی١٣٤٣ کۆتایی هات. جێی سەرنجە کە زاهیدی تەنانەت دوای جیابوونەوە لە کچی شاش دەسەڵاتی خۆی لەدەست نەدا. لە ڕاستیدا تەنیا پاش ماوەیەک کارگەلێکی گرنگتریشی پێ سپێردران. وەختێک باڵیۆزی ئێران لە ئینگلیس و ماوەیەک باڵیۆزی ئێران لە ئەمریکا بوو. ساڵی١٣٤٦ شا وەزارەتی دەرەوەی پێسپارد. هەر لە سەرەتاوە دیار بوو ئەو دانانە ناگاتە هیچکوێ. تەنانەت پێش ئەوەی جڵەوی کاروباری وەزارەتی دەرەوەش بە دەستەوە بگرێ، لە وتووێژێک دەگەڵ هووەیدادا بڕیاری دا لە زۆربەی کۆبوونەوەکانی هەیئەتی دەوڵەتدا بەشدار نەبێ. زاهیدی بە زمانی ناسراوی خۆی کە زۆربەی وەخت خاڵی لە ڕێزدانانی عورفی دیپلۆماسی بوو، و زۆرجار دەگەڵ هێندێ زاراوەی توندی عەوامانەش تێکەڵ دەبوو، دەیگوت ئەوەی لەو کۆبوونەوانەدا دەگوزەرا بەشی زۆری تەواو بێبایەخ بوو. ئەو بەڵێنی خۆی بەجێ گەیاند، و لە تەواوی دەورانی وەزیرییەکەیدا، جگە لە چەند کۆبوونەوەی گرنگ، هەرگیز بۆخۆی لە کۆبوونەوەکانی هەیئەتی دەوڵەتدا بەشدار نەدەبوو، و لەجیاتیان یەکێک لە جێگرەکانی خۆی دەناردە ئەو کۆبوونەوانە.[7]

بەپێی ڕاپۆرتی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئەمریکا، "زاهیدی شێوازێکی تەواو نوێ و جوانیخواز، و ورەیەکی چالاک و تازەی بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئێران بە دیاری هێنا...لە چەند حەوتووی یەکەمی کارەکەیدا نەک هەر تەواوی ڕۆژێ بەڵکوو جاری وابوو تەواوی شەوێشی لە وەزارەت بەسەر دەبرد...ڕۆلزرۆیسە شینە میتاڵییەکەی جاری وابوو سەعات دووو نیوی بەیانی و تەنانەت درەنگتریش، لەبەر دەرکی وەزارەتخانە دەبینرا."[8] هەرلەو کاتەدا یەکەمین دەمەقاڵێی هووەیداو زاهیدییش هەر لە یەکەمین حەوتووەکانی وەزیرییەکەیدا ڕووی دا. بە وتەی ئارمەن مایر، باڵیۆزی ئەوکاتی ئەمریکا لە ئێران، "ئەم دواییانە لەنێو کابینەدا کێشەیەک [لەنێوان زاهیدی و هووەیدادا]

ڕووی دا کە لەودا بێشک زاهیدی براوە بوو. ئەو بێ ئاگاداریی هووەیداو بێئەوەی گوێی بداتێ ڕاستەوخۆ پێوەندیی بە شاوە گرتبوو. کێشە لەسەر بوودجەی وەزارەتی کاروباری دەرەوە بوو. بە باوەڕی زاهیدی بوودجەی پێشوو بەشی خەرجی وەزارەتی نەدەکرد. ئەو بە تەلگرافێک ڕاستەوخۆ دەستلەکارکێشانەوەی خۆی دا بەشا..ولەوڕێگایەوە قسەی خۆی بردە سەرێ."[٩]

کێشەی دواتر باری تایبەتیی هەبوو. دەوڵەتی ئەڵمان باڵیۆزێکی تازەی ناردە تاران کە لە دۆستانی کۆنی هووەیدا بوو، و لە سەردەمی شتووتگارتەوە دەیناسی. بە پێی قاعیدە دەتوانین وای بۆ بچین کە ئەو دۆستایەتییە کۆنە، شوێنەواری لەسەر هەڵبژاردنی دەوڵەتی ئەڵمانیش داناوە. ئەو ڕۆژەی باڵیۆزی تازە دەهاتە تاران هووەیدا بۆخۆی لە فڕۆکەخانە پێشوازیی لە دۆستە دێرینەکەی کرد. بەڵام بەپێی ڕێوشوێنە دیپلۆماتییەکان، باڵیۆزێکی تازە تەنیا پاش ئەوەی باوەڕنامەکانی پێشکەشی شا کرد دەیتوانی چاوی بە کاربەدەستانی دەوڵەتی ئێران بکەوێ. کاتێک زاهیدی لە دیداری هووەیدا دەگەڵ باڵیۆزی تازە لە فڕۆکەخانە ئاگادار بوو، لە پێشدا، بە تەلەفۆن، دوایەش بە نامەیەکی ڕەسمی کە ڕاوێژێکی یەکجار بەژانی هەبوو ناڕەزایی لە کاری هووەیدا دەربڕی. لە کاتێکدا هێشتا پاش سیوپێنج ساڵ، شەپۆلێکی ڕقوقین لە چاوانیدا دیار بوو، لەبارەی کێشەی خۆیو هووەیداوە دەیگوت: "فارسییەکەم زۆر باش نیە. داوام لە کارمەندێکم - کە دەمزانی پەخشان جوان دەنووسێ -کرد کە نامەیەک بۆ ئەمیر بنووسێ. گوتم بنووسێ کە ئەو نابێ مەسەلە تایبەتییەکانی ژیانی خۆی دەگەڵ کاری دیپلۆماسی تێکەڵ بکا."[١٠] هووەیدا کە لە ڕاوێژی نامەکە تووڕە ببوو، وەک شکایەت بردبوویە لای شا. شا لەجێدا لایەنی زاهیدیی گرتبوو. گوتبووی بەپێی ڕێوشوێنی دیپلۆماتی، هەق بە زاهیدییە. لەبارەی ڕاوێژی توندو بەژانی نامەکەشەوە هەر ئەوەندەی گوتبوو کە "هەوڵ بدەن ناکۆکییەکانتان چارەسەر بکەن."[١١] بە جۆرێکی دیکە بڵێین، هووەیدا دەبێ فکری لەسەرکارلابردنی وەزیری یاغی

لە سەری خۆی دەرکا. بەپێی قاعیدە کەمتر سیاسەتمەدارێک هەیە پاش شکان‌و سەرشۆڕییەکی ئاوا، دەست لە کارەکەی نەکێشێتەوە. بەڵام هووەیدا وا دیاربوو سەبری ئەییووبی هەیە. بە سەرۆک‌وەزیری مایەوەو چاوەڕێ بوو تا لە دەرفەتی گونجاودا خۆی لە دەست زاهیدی ڕزگار بکا.

گرنگترین کێشەی نێوان زاهیدی‌و هووەیدا لە "مەسەلەی پاس-ئاژۆیی" (اوتوبوسرانی)دا دەرکەوت. سەرەتای ساڵی١٣٤٩، دەوڵەت بۆ چارەسەری کەمایەسیی بوودجە، نرخی بلێتی پاسی زیاد کرد. خوێندکاران بۆ ناڕەزایی‌دەربڕین ڕژانە شەقامەکان‌و خۆپێشاندانیان ساز کرد. زۆر لە خۆپێشاندەران گیران. هەیئەتی دەوڵەت کۆبوونەوەیەکی تایبەتیی بۆ پێڕاگەیشتنی ئەو مەسەلەیە پێک هێنا. زاهیدی بە پێچەوانەی عادەت، لە کۆبوونەوەدا بەشدار بوو. هێندێک لە سەرۆکانی زانکۆکان، یەک لەوان عالیخانی، سەرۆکی زانکۆی تارانیش، لە کۆبوونەوەکەدا بەشدار بوون. زاهیدی‌و عالیخانی هەردووکیان پێیان وا بوو سیاسەتی زیادکردنی نرخی بلێتی پاس لە سەرەتاوە هەڵە بووە. دەیانگوت پێش ئەوەی کێشەکە قووڵ بێتەوە، دەوڵەت دەبێ پاشەکشە بکا؛ نرخەکان بێنێتەوە خوارو خوێندکارە زیندانییەکانیش ئازاد بکا. باسی کۆبوونەوەی دەوڵەت درێژەی کێشاو نەگەیشتنە ئاکامێکی هاوبەش. لەوکاتەدا شا لە سویس بوو، و پشووی زستانیی خۆی دەگوزەراند. لەبەر ئەوەی بەهەرحاڵ بڕیاری کۆتایی بەو بوو، لە دەفتەری سەرۆک‌وەزیرەوە تەلەفۆنیان بۆ کرد. لە پێشدا هووەیدا ڕاپۆرتێکی بارودۆخەکەی دایە. بە وتەی عالیخانی، "ڕاوێژی ڕاپۆرتی هووەیدا لە ئەندازەبەدەر بەپارێز بوو." دوایە نۆرەی زاهیدی هات. ئەو زۆر بە ڕاشکاوی، لێکدانەوەی خۆی لە وەزعەکە، کە پێی وا بوو مەترسیدارە، خستە بەر چاو. شا بۆچوونی عالیخانی‌و زاهیدیی قبووڵ کرد. خوێندکارەکان ئازاد بوون، و نرخەکان دابەزین، بەڵام کێشەو ناخۆشیی نێوان هووەیداو وەزیری کاروباری دەرەوەی دەوڵەتەکەی هەر زیادی کرد.[١٢]

مەسەلەی بەحرەین کۆمەگی بە تاریک‌بوونی ئەو پێوەندییانە کرد.

سـەد سـاڵ بـوو ئێـران ئیـددیعای دەسـەڵاتداریی بـەحرەینی دەکـرد. ساڵی١٣٤٧(١٩٦٨)، ئینگلستان ڕایگەیاند هەتا سێ مانگی دیکە هەموو هێزەکانی خۆی لە خەلیجی فارس دەباتە دەر. شا لە وتوویژێکی نهێنی دەگەڵ باڵیۆزی ئینگلیس لە ئێراندا بڕیاری دا کە ئێران واز لە داوای دەسـەڵاتداری بەسـەر بەحرەینـدا بێنـێ. هەرلـەو کاتـەدا بڕیـار درا چارەنووسـی بـەحرەین خەڵکەکـەی وێ لـە ڕێگـای ڕاپرسـییەکی گشتییەوەو لەژێر چاوەدێریی ڕێکخراوی نەتەوەکاندا دیاریی بکەن. لە بەرامبـەردا، ئێـرانیش دەسـەڵاتی خـۆی بەسـەر سـێ دورگـەی ئـەبوو مووساو تومبی گەورەو بچووکدا بەکار دێنا.[١٣] دیارە هاوکات دەگەڵ ئەو وتوویژە نهێنییانە، کۆمیتەیەکی دیکە لە وەزارەتی کاروباری دەرەوە خـەریکی لێکۆڵینـەوەی مەسـەلەی بـەحرەین بـوو. کـاری ئەوکۆمیتەیـە تـەواو بە نهێنی دادەنرا. بەڵام ئەندامانـی ئەو کۆمیتـەیە، و هـەروەها وەزیری کاروباری دەرەوەو تەنانەت سەرۆکوەزیریش، لە حەقیقەتی وتوویژی شا دەگەڵ ئینگلیس بێخەبەر بوون.[١٤] خـەڵکی ئێرانیش دیارە لەوداستانە هەرتـەواو بێئاگا بوون. لەلایەکی دیکەوە، شا لـەو کاتـەدا هـەروا بـەنیاز بـوو ڕواڵـەتی حکوومـەتی مەشـرووتە بپارێزێ. بـەناچار پرۆژەبڕیارێک کە لەودا بڕیارەکانی شا دەبوونە قانوونێکی پەسندکراوی مەجلیس درا بە مەجلیس. بە وتـەی عەلـەم ئـەم مەسـەلەیە بووە هۆی ئەوە کە ناکۆکییەکی توندی تازە بکەوێتە نێوان هووەیداو زاهیدییەوە. بە ڕواڵەت هیچ کامێکیان ئامادە نەبوون بۆ دیفاع لەو پرۆژەبڕیارە بچنە مەجلیس. بەپێی قاعیدە هەردووکیان دەیانزانی کە کۆبوونـەوەی باسـی ئەو پرۆژەبڕیارە، بە پێچەوانـەی نـەریتی بـاوی ئـەو ڕۆژگـارە، کـەمێک ئاڵۆز دەبێ. دیارە زاهیدی دەیگوت ناکۆکیی وی دەگەڵ هووەیدا لەسـەر بەشـداری لـە کۆبوونـەوەی مەجلیسـدا نـەبوو. دەیگـوت کێشـە لەسـەر چەندوچۆنی هەڵوێستی دەوڵەت لەکاتی دانی پرۆژەبڕیارەکەی دەوڵەتدا بـوو. دەیگـوت "دەقـی دوو وتـاری جیـاواز ئامـادە کـران، یـەکێک لـە وەزارەتـی کاروبـاری دەرەوە، ئـەوی دیکـە لـە سـەرۆکوەزیـری. ئەعلاحـەزرەت دەبـوو لـەنێو ئـەو دوو دەقـە پێشـنیارکراوەدا یـەکێک

هەڵبژێرێ.[150] حیزبی پان‌ئێرانیست-كە بە قسەی باڵیۆزخانەی ئەمریكا، رێبەرەكەی، پێوەندیی بە ساواكەوە هەبوو، و عادەتەن پەیڕەویی لە خەتی دەوڵەت دەكرد- هێرشی كردبووە سەر پرۆژەبڕیارەكە. فراكسیۆنی ئەو حیزبە تەنانەت هەڕەشەی كردبوو كە پرۆژەی "متمانە-ئەستاندنەوە" لە دەوڵەت، دەدا بە مەجلیس.[16]

بەهەرحاڵ، زاهیدی‌و هووەیدا هەردووكیان سەرەنجام لەو كۆبوونەوانەدا بەشدار بوون. هەروەك چاوەڕوان دەكرا، پرۆژەی "متمانەئەستاندنەوە" دەنگیكی وای نەهێنایەوە. بەحرەین سەربەخۆ بوو، بەڵام سەرۆكوەزیرو وەزیری كاروباری دەرەوەی ئێران هەر نەیان-توانی ناكۆكییەكانیان چارەسەر بكەن❀. بۆ ماوەی ساڵێك تەنانەت لێكیش زویر بوون‌و قسەیان پێكەوە نەدەكرد. لە میوانداربیەكاندا، زاهیدی پشتی دە هووەیدا دەكرد. جارێكیان بە دەنگی بەرز گوتبووی حازر نیە "دەست دە نێودەستی ئەو خوێڕییە گووە بنێ."[170]

چەندین مەسەلەی دیكە سەرەنجام ئەو شتەیان كە باڵیۆزخانەی ئەمریكا پێی دەڵێ "ململانەی دایمی‌و كێشەی تاڵی تاكەكەسی"ی نێوان

---

❀ رادەی بێ‌متمانەیی نێوان هووەیداو زاهیدی دەتوانین لە گوشەیەكی گێڕانەوەی ئەوداستانە لە زمانی زاهیدییەوە تێبگەین. دەڵێ: "ئەمن بە ئاسانی ئارەق دەكەم‌و ئەوان هەرچەند داواشم كردبوو پلەی گەرمای ساڵۆنی مەجلیسیان بردبووە سەر. بە ناچار وەختێك قسەم دەكرد دەموچاوم هەموو ئارەق بوو. چەند دەقیقە دوای قسەكانم ئەعلاحەزرەت زەنگی لێدا، فەرمووی "پێیان گوتووم كە وەختی قسەكردن گریاوی" وەڵامم دایەوە كە ئەو راپۆرتە درۆیە. فرمێسكێكیش لەگۆڕێدا نەبووە تەنیا ئارەقم كردبوو." زاهیدی دەڵێ هووەیدا دەستی لە زیادكردنی گەرمای ساڵۆنەكەدا هەبووە. دیارە ئەگەر وەبیر بێنینەوە كە لە ئامادەكردنی وتووێژە تەلەڤیزیۆنییە بەناوبانگەكەی نیكسۆن‌و كەنەدی لە ساڵی١٩٦٠دا، لایەنگرانی كەنەدی بەقەستی گەرمای ساڵۆنی ستۆدیۆكەیان زیاد كرد، چونكە دەیانزانی نیكسۆن بە ئاسانی ئارەق دەكا، ئەودەم داستانی سۆبەی مەجلیسی شووڕای میللی‌و ناكۆكیی نێوان زاهیدی‌و هووەیداش زۆر سەیر نایەتە بەرچاو.

زاهیدی‌و هووەیدا، گەیاندە حاڵەتی تەقینەوە. ساڵی ١٣٤٩، زاهیدی، بە پێچەوانەی نارەزایی هووەیدا ٩٠٠سەعاتی واشرۆن کۆنستانتینی بەکرین دا. دەیەویست لە وەزارەتی دەرەوە ئەو سەعاتانە بە دیاری بدا بە خەڵک* عەلەم ئیددیعا دەکا کە لەسەر ڕازی‌بوون بەو زێدە خەرجییانە، ئەویش لە هەلومەرجێکدا کە دەوڵەت دەگەڵ کەمایەسیی بوودجە بەرەوڕوو بوو، هووەیدای سەرکۆنە کردوە. دەڵێ هووەیداش کە دڵی لە زاهیدی پڕخوێن بوو، دەیەویست دەرگای شکایەت لەو بکاتەوە کە قسەکەیم پێ بڕی‌و گوتم: "لەخۆت بەولاوە کەس بەرپرس نیە. چونکە زۆر لاوازی بەخەرج دەدەی." دەڵێ پاشان داستانی سەفەری پاکستانم وەبیر هێنایەوە کە لەودا زاهیدی توند هێرشی بۆ کردبوو. گوتم: "ئەگەر ئەمن لەجێی تۆ بام، ڕۆژێک کە وەزیری دەرەوە لە کەڕاچی جنێوی بەتۆ دا ئەوندەم دار لە پشتەقوونێ دەدان کە بگاتە سەرەمەرگ**."[180]

دیارە لە پێوەندیی ئاڵۆزو پڕنەفرەتی عەلەم دەگەڵ هووەیدادا، تەنانەت ئەو سەرکۆنەوخۆهەڵکێشانەش بەس نەبوو؛ لەوە گەڕێین کە ئەو "دار لەپشتەقوون ڕاکێشان"ەی وەزیریش، ئەویش لە سەدەی

---

* زاهیدی دەڵێ کە تەنیا سەد سەعاتی بەکڕین داوەو دراوەکەشیانی لە گیرفانی خۆی داوە، نەک لە بوودجەی وەزارەتی کاروباری دەرەوە. (ئەردەشیری زاهیدی، نامە بۆ نووسەر، ١٢ی ژانوییەی ٢٠٠٠).

** بەرواڵەت لە کردەوەدا،ڕەفتاری عەلەم دەرهەقی زاهیدی دەگەڵ ڕەفتاری بەپارێزی هووەیدا زۆری فەرق نەبوو. زاهیدی دەیگوت: "ڕۆژێک نامەیەکم لە عەلەمەوە پێ-گەیشت کە تێیدا بە توندی ڕەخنەی لە چەند باڵیۆزی ئێران گرتبوو" زاهیدی دەسبەجێ نامەیەکی وەک ئەوەی بۆ هووەیدای نووسیبوو بۆعەلەم نارد. عەلەمیش لە جیاتی "دارلەپشتەقووندان"،دەسبەجێ نامەیەکی نووسی‌و داوای لێبووردنی کردو ڕوونی کردەوە کە نامە توندەکە نەک خۆی بەڵکوو یەکێک لە ژێردەستەکانی نووسیویەو لەجیاتی وی ئیمزای کردوە. (ئەردەشیری زاهیدی، وتوویژ دەگەڵ نووسەر، ١٢ی ژووئیەی ٢٠٠٠).

بیستەمدا، تەنانەت ئەگەر خۆهەڵکێشانی عەلەمیش نەبێ، لەخۆیدا قسەیەکی سەرسوڕهێنەرو کارێکی دزێوو لەباوکەوتوویە. بەهەرحاڵ، عەلەم، ڕەنگە بۆ زیاتر ئازاردانی هوویدا بووبێ نوکتەیەکی وەک پێش-وێژی هێنایە گۆڕێ کە زۆر پتر لەوەی بۆخۆشی بیری لێدەکردەوە، ڕاست دەرچوو. بە هووەیدای دەگوت: "بەڵام شتێکت لەبیر نەچێ، سەرەنجام ئەگەر هەودا ئابوورییەکان لەبەریەک [بپچڕێن]، ئەوانە تۆ ڕادەکێشن. بزانە چییان لە وەزیری بەرنامەڕێژیی توونس کرد کە دە ساڵ لەسەر کار بووو دوایە بەرنامەکانی شکستیان هێنا، بوورقیبە-سەرکۆمار- چیی کرد ئاغاش لەم قاعیدەیە بەدەر نیەو نۆرەی تۆش دێ." عەلەم دەڵێ هووەیدا "چاکی سەر لێشێوا."[190]

دەبێ بگوترێ سەرباری کێشەی خۆیان، مەسەلە سیاسییەکانیش ڕادەی ناکۆکییەکانی هووەیداو زاهیدییان زیاتر دەکرد. بۆ نموونە، زاهیدی بە توندی دژی دانانی کچەشا، ئەشرەفی پەهلەوی بە سەرۆکی دەستەی نوێنەرایەتیی ئێران لە کۆڕی گشتیی ڕێکخراوی نەتەوەکاندا بوو. هەر لەو ڕۆژانەدا بوو کە هووەیدا بە میوانی چووبووە ماڵی یەکێک لە دەوڵەمەندانی ئەودەم. لە دارایی‌و سامان‌و دەستبڵاویی خانەخوێ سەری سوڕمابووو گوتبووی فەزای ماڵەکەی پۆمپەیی وەبیر دێنێتەوە. ئێستا ژنێک کە لە هەمووکەس پتر لە بیروڕای گشتیی خەڵکدا نوێنگەی زێدەڕۆییەکانی ئەو پۆمپەییە بوو، کرابووە سەرۆکی دەستەی نوێنەرایەتیی ئێران لە ڕێکخراوی نەتەوەکانداو زاهیدی ئەو هەڵبژاردنەی پەسند نەدەکرد. دەیگوت: "گوناحکاری سەرەکی هووەیدا بوو؛ نەکهەر سەفەرەکەی ڕێک خست، بەڵکوو سێسەدو پەنجا هەزار دۆلاریشی بۆ خەرجی خۆی [کچەشا ئەشرەف] پێدا"*[20]

---

* زاهیدی دەڵێ کچەشا ئەشرەف دەیەویست یەکێک لە دۆستە کوڕەکانی دەگەڵ خۆی بەرێتە کۆبوونەوەکانی ڕێکخراوی نەتەوەکان. ئەو دۆستەی،لە ڕاپۆرتی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئەمریکادا بە ناوی،"یەکێک لە دەرستەواوکردوە تیژهۆشەکان لە خێڵی ئاشقانی لاوی [کچەشا]" ناو براوە. بڕوانە: ( IRANIAN ROYAL

بە وتەی باڵیۆزخانەی ئەمریکا، مەسەلەی دواتر لە پازدەی خەرمانانی١٣٤٩دا هاتە پێش. ئەم جارە "زاهیدی لیستێکی لە ناوی ئەو کەسانە کە دەبوو میدالّی هومایوونی وەربگرن ناردە دەفتەری سەرۆکوەزیری. هووەیدا لە ڕێگای یەکێک لە سکرتێرەکانیەوە لیستەکەی ناردەوەو ڕوونی کردەوە کە لیستەکە دوای وەختی دیاریکراو گەیشتوە."[11] گێڕانەوەی زاهیدی کەمێک فەرقی هەیە. بەقسەی وی، ڕقهەستانەکەی زیاتر لەوە بوو کە هووەیداو عەلەم دەستیان وێک دابووو ناوی چەندکەس لە دەوروبەرەکانی خۆیانیان لە لیستەکە زیاد کردبوو. بە هەرحاڵ زاهیدی دووبارە نامەیەکی توندو بەژانی بۆ سەرۆکوەزیر نووسی. هووەیداش نامەکەی بردەلای شاو دەست-لەکارکێشانەوەی خۆی پێشکێش کرد. شا دەستلەکارکێشانەوەکەی قبووڵ نەکرد. بەڵێنی دا کە بە مەسەلەکە ڕابگا. لە ڕێگای موعینیان، سەرۆکی دەفتەری تایبەتیی خۆیەوە، زاهیدیی بانگ کردە وەزارەتی دەربار. لەوێ پێی ڕاگەیەندرا کە دەبێ یان نامە توندڕاوێژەکەی خۆی وەرگرێتەوە، یان دەست لەکار بکێشێتەوە. زاهیدی کشانەوەی هەڵبژارد. دەسبەجێ بۆ گوزەراندنی پشوو چووە ڤیلایەکەی خۆی لە مۆنترۆی سویس."[12] ماوەیەک لەوێ مایەوە، بەڵام زۆری پێنەچوو کە دووبارە کەوتەوە بەر سەرنجی شاو کرایە باڵیۆزی ئێران لە وڵاتە یەکگرتووەکان. لە واشنگتۆن پاش ماوەیەکی کەم ناوبانگی دەرکرد. سالی کووئین* کە لە

---

FAMILY, NO.92B). بە وتەی زاهیدی، ئەو (معشوق)ە گوتبووی بۆ سەفەرێکی وا سێسەدهەزار دۆلاری دەوێ. بە پێچەوانەی دژایەتیی توندی زاهیدی دەگەڵ دانی ئەو دراوە،هەیئەتی دەوڵەت، بەپێی قسەی زاهیدی، دانی ئەو دراوەی پەسند کرد. وێنەیەک لە پەسندکراوێکی هەیئەتی دەوڵەت لەو ڕۆژگارەدا کە زاهیدی ئاماژەی پێ دەکا وەدەست من کەوت کە لەودا دەوڵەت دانی سێسەدهەزار دۆلار بە کچەشا ئەشرەفی پەسند کردوە، لەنێوەڕۆکی بەڵگەکە دەرناکەوێ کە ئەو دراوە بۆ چ شتێک خەرج کراوە.

* Sally Quinn.

بـەنفووزترین ژنـانی واشـنگتۆن بـوو، ئـەوی بـە "پیـاوێکی جـوانچـاک، دەوڵەمەنـدو بەدەسـەڵات" دەزانـیو دەیگـوت بەشـێک لـە باشـترین میواندارییـەکانی واشـنگتۆن" دەبێ لـە باڵیۆزخانـەی ئێران لـە واشـنگتۆن ببینی. باوەڕی وابوو کە "ئەردەشیر بە سەخاوەت بەناوبانگ بوو. لە جیاتی سوپاسنامە بەستەیەک خاویاری ئێرانیی بۆ هەموو ئەو کەسانە دەنارد کە بۆ نانی شەو بانگهێشتنیان دەکرد.[٣٣]

ئەو ڕاستییە کە شا ڕێگای بە هووەیدا نەدا بۆخۆی زاهیدی لەسەر کار لابا، لە ڕاستیدا بەشێک لەو ڕێککەوتنە نەگوتراوە بوو کە شەوی دانـانی هووەیـدا لـە نێوان ئـەوو شـادا پەسـند کرابـوو. ئەگـەر هووەیـدا وەزیرێکــی بــەهێزی وەک زاهیــدیی دەرکردبایــە، ئــەودەم ڕادەی دەســەڵاتەکەی لـەنێو خـەڵک، و هـەروەها لـەنێو وەزیرەکـانی کابینـەدا، بەجیدی دەچووە سەر. جگەلەوە، ئەوکارە خۆی جۆرێک سەربەخۆیی تێدا هەبوو کە شا لەمێژ بوو سەربەخۆییەکی وای لە سەرۆکوەزیرەکانی قبوول نـەدەکرد. دەگـەڵ هـەموو ئەمانەشـدا، لادرانـی زاهیـدی، ئەگـەریش بەدەستی شا بوو، دەسەڵاتی هووەیدای لەلای بەشی زۆری وەزیرانی کابینەکەی بردە سەرێ.

لـە هـەمووی گرنگتـر، شـا هـەرگیز ئـەو سـەربەخۆییەی لـە بـواری سیاسـەتی دەرەوەدا بــە ڕەوا نــەدەزانی. ڕەشــەمەی١٣٥١(١٩٧٣)، شــا دەســتووری بــە عەلــەم دا کــە، "بــە وەزارەتــی دەرەوەم گوتــوە هــیچ کاربەدەستێک جگە لەخۆم هەقی نیە دەست لەکاری وەزارەتی دەرەوە وەربدا، تەنانەت گوتوومە برای هووەیدا کە نوێنەری ئێمە لە ڕێکخراوی نەتەوەکانە هەقی نیە ڕاپۆرت بە سەرۆکوەزیر بداتەوە، تەنانەت تەلەفۆن بکا. سەرکۆنەم کرد کە بۆچی ڕاپۆرتەکانی وەزارەتی دەرەوە دەدەی بە براکەت. (دیار نیە ئەو دوو برایە چ هەڵەیەکیان کردوە کە ئاوا ئابڕوویان بەبادا دەدرێ)"[٣٤] *

---

* فەرەیدوونی هووەیدا فەرمانێکی وای لەبیر نەبوو. بە پێچەوانە، دەیگوت، هەرکات وتووێژێکی گرنگ لە ئارادا بووایە، شا دەستووری دابوو کە فەرەیدوون تەنیا دەگەڵ

ڕوون نیە شا ئەو فەرمانانەی لەسەر چ بناخەیەک دەرکردبوون، بەڵام لە دوورەدیمەنێکی گشتیتردا دەتوانین بڵێین پێوەندیی شاو هوەیدا دەگەڵ ئەوەی لە قانوونی بنەڕەتیی مەشرووتەی ئێراندا لەبەر چاو گیرابوو وێکچوونێکی نەبوو و پتر وەک پێوەندیی سوڵتانێکی نەریت-خواز دەگەڵ وەزیر یان ئەتابەکەکەی دەچوو. ئەم ڕاستییە هەرنەبێ لە بارێکەوە لە پێوەندیی نێوان هوەیداو وەزیرانی کابینەکەشیدا خۆی دەنواند. هەرچەند هوەیدا بەو بەڵێنە هاتە سەرکار کە دەزگای دەوڵەتیی ئێران نوێ بکاتەوە، ئەگەرچی لە زەمانی لاوەتییەوە هەوای نوێخوازیی لەسەردا بوو، بەڵام بەوحاڵە مووچەی وەزیرەکانی بە جۆرێک دەدرا کە ڕەنگێکی دیوەخانی دەرەبەگایەتیی پێوە دیار بوو. هەموو مانگێک نیوەی مووچەی هەر وەزیرێک لە ڕێگەی بوودجەی نهێنیی دەوڵەتەوە دەدرا. هەر وابزانە وەزیرەکان نەک کارمەندی دەوڵەت بەڵکوو خزمەتکاری هوەیدا بوون. شا بۆخۆشی جاروبار پاداشێکی دەدا بە وەزیران و لەو ڕێگایەوە نیشانی دەدا کە هەموویان لەئاخردا هەر خزمەتکاری ئەون.[25]



---

ئەمیر عەبباسی برای وتووێژ بکا. دەیگوت نموونەی ئەو وتووێژانە دەتوانین لە ساڵی١٩٦٧دا ببینین. ئۆکتۆبری ئەوساڵە شا بەنهێنی فەرەیدوونی بانگ کردەوە تاران. داوای لێکرد بچێتە پاریس بزانێ دەتوانێ لە ڕێی پێوەندییەکانی خۆی دەگەڵ کۆمۆنیستەکانی فەڕانسەوە،چاوی بە نوێنەرانی ڤێتنامی باکوور بکەوێو بیروبۆچوونیان لە بارەی ئاشتییەوە بپرسێ. گۆیا شا دەیەویست نەخشی نێوبژیوانی ئاشتی لە ڤێتنامدا یاری بکا. وتووێژی فەرەیدوونو هەوڵەکانی شا هیچیان بە جێیەک نەگەیشتن، بەڵام لەوداستانەدا فەرەیدوون فەرمانی پێدرابوو لەتاران تەنیا دەگەڵ ئەمیر عەبباسی هوەیدا لە بارەی چەندوچۆنی مەئموورییەتەکەیەوە قسە بکا. (فریدون هویدا، وتوویژ دەگەڵ نووسەر،٢١ی ئۆوتی١٩٩٩).

ساڵی١٣٤٩(١٩٧٠)، ساڵی ناکۆکییەکانی هووەیدا دەگەڵ ئەردەشیری زاهیدی بوو. لە بەرامبەردا ساڵی ١٣٥٠ ساڵی زیادبوونی ئاڵۆزی لە ژیانی تایبەتیی خۆیدا بوو. ژیانی هاوبەشی دەگەڵ لەیلا خەریکی لێک-هەڵوەشان بوو. وەک هەمیشە هیچ ڕووداوێک، هیچ ڕووبەڕووبوونەوەیەکی هەژێنەریش بەتەنیا، هۆکاری کۆتایی پەیوەندەکەیان نەبوو. بە پێچەوانە، دووبارەبوونەوەی ناسازگارییە چووکەکان، باری ماندووکەری ڕێوشوێنە ڕەسمییە پڕئاڵۆزییەکان، ئەرکەکانی هاوسەری سەرۆکوەزیر کە زۆرتر بێنرخ بوون‌و ڕەنگە گرنگتر لە هەمووان بێزاریی لەیلا لەو وردە سازانە چووکەلانە کە هووەیدا بە کۆمەکی وان لەسەر کار مابوو- پێکەنینێک لێرەو زەردەیەک لەوێ، سەرلەقاندنێک بەنیشانەی سوپاس بۆ ئەم‌و بێدەنگییەک بەرامبەر بە گەندەڵیی ئەو- ژیانی هاوبەشیانی نامومکین دەکرد. لە ڕاستیدا، گرنگترین تایبەتمەندیی هووەیدا وەک سیاسەتمەدارێک، گرنگترین خاڵی لاوازی وی وەکوو هاوسەرێک بوو. ئەو لە سیاسەتدا هەمیشە حەزی لە سازان دەکردو لەبەر ڕووبەڕووبوونەوە هەڵدەهات. بەڵام لە بواری ژیانی ژن‌و مێردایەتیدا، هەرئەو حەزەی ببووە گیروگرفتێک. ئەو قەت حازر نەبوو لە پرتەوبۆڵەیەکدا کە لەنێوان هەر ژن‌ومێردێکدا دێتە پێش، بەشدار بێ‌و بێمەیلیی وی بەوکارە لەیلای ئازار دەدا. دژکردەوەی هووەیدا بەرامبەر بە یەکیەکی ڕەخنەکانی لەیلاو دەردی دڵی هاوسەرەکەی تەنیا بێدەنگی بوو. لەیلا دەیگوت: "کەم‌دوێ‌و خۆخۆرەوە بوو. هیچ وەخت دەگەڵ من لەبارەی ئەو شتانەوە کە ئەویان ئازار دەدا، ئەوەی نیگەرانی دەکرد، قسەی نەدەکرد. بە پێچەوانەی [حەسەن] عەلی [مەنسوور] کە هەموو شەوێ دەنگۆ سیاسییەکانی ڕۆژی بۆ فەریدە باس دەکردن، ئەمیر هەرگیز لەماڵێ باسی سیاسەتی نەدەکرد."[٢٦٠]

ناڕەزایەتیی لەیلا ڕۆژبەڕۆژ زیاتر دەبووو، هاوکات، هەر ڕۆژە بە زمانێکی بێپەرواترو ئازاردەرتر بە ئاشکراو نهێنی شکایەتی لە ژیانی خۆی‌و دژوارییەکانی ئەرکی هاوسەری سەرۆکوەزیرو، تەنانەت لە

هووەیدا خۆشی دەکرد. لەو ڕۆژانەدا هێندێجار لە خواردنەوەی ئەلکولیشدا زیدەڕۆیی دەکرد، و هەرئەمەش کۆمەگی بە زیاتر توندبوونی قسەکانی دەکرد. وا دیار بوو دەنگۆی دژوارییەکانی ژیانی ژنومێردایەتیی هووەیدا وەبەر گوێی شاش کەوتبوو. کۆتاییەکانی ساڵی١٣٤٨، ڕۆژێک لە ڕێوشوێنێکی ڕەسمیدا، ئەو بە ڕاوێژێکی نیوە جیددی لێی پرسیبوو، "ئەو پیاوەی بۆ هێندە ئازار دەدەی؟"[٢٧]

یەکێک لە یەکەمین ڕیشەکانی کێشەی لەیلا دەگەڵ هووەیدا، بوونو ڕەفتاری مەئموورانی پارێزەری سەرۆکوەزیر بوو. لە یەکەم ساڵەکانی سەرۆکوەزیریی هووەیدادا یەکێک لەو مەئموورانە بەهەڵە باغەوانێکی بە گوللە کوشت کە چەندین ساڵ لە ماڵی بنەماڵەی لەیلادا کاری کردبوو. هەر لەوساوە لەیلا لە بوونی پارێزەران لەنێو ماڵدا ناڕازی بوو. چەند حەوتوو دواتر، لەیلا گوێی لێبوو کە یەکێک لە مەئموورەکان بە تەلەفۆنی ماڵی هووەیدا زەنگی بۆ فەرماندەکەی لێداو باسی کێشەیەکی بۆ کرد کە شەوی پێشتر لە نێوان هووەیداو هاوسەرەکەیدا ڕووی دابوو. گوتبووی: "دوێشەو جەنابی سەرۆکوەزیر لەسەر کاناپە خەوت." ئیدی پیاڵەی سەبری لەیلا لەسەریەوە ڕژاو لەوەودوا نەی- هێشت پارێزەرەکان بێنە ژووری ماڵێ.[٢٨]

لە درێژایی ساڵەکانی هاوسەریدا، هووەیداو لەیلا چەندین جار بە شێوەی کاتی لێک جوێ بوونەوە. هەموو جارێ هووەیدا دەچۆوە ماڵی دایکی. سەرەنجام ڕۆژێک لەیلا هاتە سەر ئەو ڕایە کە تەلاق نەبێ چارەیەک نیە. هەروەک کاتی خۆی لەپڕ باسی زەماوەندی دەگەڵ هووەیدا هێنابووە گۆڕێ، ئەمجارەش داوای تەلاقی لەنەکاو دەگەڵ باس کرد. شەوێکیان کە هووەیدا درەنگ لەسەرکارڕا هاتەوە ماڵێ، لەیلا ئەوی لە بڕیاری خۆی ئاگادار کرد. هەرچەند هووەیدا تووڕەو دڵشکاو بوو، بەڵام بەربەرەکانیی نەکرد. جانتایەکی پڕ کرد لە لیباسی خۆیو بەیانییەکەی ماڵی لەیلای بەجێ هێشتو ئیدی هەرگیز وەکوو مێرد

هەبوو. چەندین جار دووپاتەی کردەوە کە، "گەورەترین خاڵی لاوازیی وی ئەوە بوو کە هەموو ملهوڕییەکانی منی تەحەممول دەکرد."[٣١٠]

هوەیداش سەرەنجام ئەوڕاستییە تاڵەی قبووڵ کرد کە زەماوەندەکەی شکستی هێناوە. لە خاکەلێوەی ١٣٥٠دا، دۆستی جێی متمانەی خۆی، ناسری یەگانەی ڕاسپارد کە لەجیاتی وی وردەکارییە قانوونییەکانی تەڵاق، جێبەجێ بکا. حوکمی یەکجاریی تەڵاقەکە چواری گەلاوێژی ١٣٥٠ دەرچوو. لەیلا دەیگوت: "ئەمیر هیچی نەدەویست. تەنیا کتێبو لیباسەکانیی بردن. تەنانەت چەند تابلۆیەکیش کە بۆخۆی کڕیبوونیو ژووری دانیشتنی پێ ڕازاندبوونەوە، و دەستێک قاپو قاچاغی لیمووژ کە بۆخۆی لە ئورووپاوە هێنابوونی، ئەوانیشی بۆ من بەجێ هێشتن."[٣٢٠] دووی بانەمەڕی ١٣٥٠، لەیلا لە نامەیەکدا بۆ دۆستی دێرینی خۆی جین بێکەر* بە ڕاوێژێکی وەک ئەوە لە بارەی هوەیداوە نووسی: "مانگی ڕابردوو ئەمنو ئەمیر یەکترمان تەڵاق دا. دەمەویست زووتر بنووسم. بەڵام تا ئێستا دەقیقەیەکیش وەختی بەتاڵم نەبووە. کار لە گوڵخانەو دۆستانێک کە نایانەوێ بەتەنیام جێ بێڵن، دەستیان داوەتە دەستی یەکو سەری منیان لەو ڕۆژانەش کە ژنی سەرۆکوەزیر بووم شلووقتر کردوە. دیارە ئەمنو ئەمیر هێشتا دۆستی نیزیکی یەکترینو دەمانەویست ئەو هاوڕێیەتییە بپارێزینو لە ڕاستیدا هۆی تەڵاقەکەش هەر ئەوە بوو... دەمانەویست دۆست بمێنینەوە."[٣٣٠] بەڕاستییش دوای تەڵاق ئەو دووانە وەک دوو دۆستی نیزیک مانەوە. لەوەودوا، زۆربەی ڕۆژانی پشوویان پێکەوە ڕادەبوارد. بەرێکوپێکی یەکتریان دەدیو گوڵە ئۆرکیدەیەکیش کە هەموو ڕۆژێ لەیلا دەیناردو هوەیدا لە بەرۆکی کۆتەکەی دەدا نیشانەو سیمبولی ئەو ئۆگرییە پایەدارە بوو. نەکهەر زەماوەندو تەڵاق بەڵکوو دۆستایەتییە پایەدارەکەشیان ڕەنگدانەوەی تایبەتمەندییە بێوێنەکانی ڕەفتاری ئەو دووکەسە بوو.

---

* Jean Becker.

وا دیار بوو هوەیداش دوای ماوەیەک ناڕەحەتی‌و دڵبەغەمی سەرەنجام هەم تەسلیمی حەقیقەتی جودایی لە لەیلا بوو، و هەم هۆیەکانی باشتر تێگەیشت. ساڵی ١٣٥١، کاتێک جین کرۆکەر* یەکی دیکە لە دۆستانی لەیلا سەفەری ئێرانی کرد، هوەیدا نەکهەر وای کرد بە "فرۆکەو هێلیکۆپتێرو جیپ"ی سەرۆکوەزیری سەرانسەری ئێران بگەڕێ، بەڵکوو کاتێک لەیلا میوانداریيەکی شێوی بۆ دۆستەکەی ڕێک خست، "ئەمیریش هات، گوتی، لەیلا منی تەڵاق نەداوە، سەرۆک-وەزیری تەڵاق داوە."[٢٤٠] لەوەودوا سەربەندی قسەکانی لەبارەی تەڵاقەوە هەر ئەوە بوو. زۆرجار دەیگوت لەیلا حەزی لە ئەرکی ڕۆژانەی هاوسەری سەرۆکوەزیر نەبوو.

دیارە تەڵاقی هوەیدا تا ماوەیەکی زۆر بابەتی سەرەکیی دەنگۆی زۆرتر قینلەزگانەی تاران بوو. ئەو ڕاستییە کە تەڵاقی سەرۆکوەزیر کەم‌وزۆر هاوکات دەگەڵ بڕیاری دەوڵەت بۆ داخستنی ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی وڵات بوو، کۆمەگی بە برەوپەیداکردنی ئەو دەنگۆیانە کرد کە هێندێکیان بەحەق قینلەزگانە بوون. دەوڵەت ئیددیعای دەکرد کە ئەو بڵاوکراوانەی لەبەر تیراژی کەم داخستوە.

وەزارەتی (اطلاعات)ی ئەوکات پشتی بە بڕیارێکی هەیئەتی دەوڵەت لە ساڵی١٣٤٢دا دەبەست کە لەودا بڕیار درابوو مۆڵەتی بڵاوبوونەوەی ئەو بڵاوکراوانە کە تیراژیان ناگاتە نیسابێکی دیاریکراو هەڵوەشێتەوە. پەرویزی ڕاجی کە لە ڕاوێژکارانی نیزیکی هوەیدا بوو، پێی‌وایە، "زۆر لەو ڕۆژنامانەی داخران تەنانەت شیاوی ناوی ڕۆژنامەش نەبوون. زۆربەیان شەونامەگەلێکی چوار لاپەڕی بوون کە لەواندا بە تیتری درشت، ڕووخانی نیزیکی ئەم کابینەیە یان ئە وەزیرە پێش‌بینی دەکراو ئەو پێشبینییانەش تەنیا پەیڕەوی ئۆگریی کەسیتیی سەرنووسەرانی ئەو بڵاوکراوانە بوون. جگە لەوە، ئەم بڵاوکراوانە بەکردەوە هیچ خوێنەرێکیان نەبوو و تەنیا سەرچاوەی

---

* Jean Crocker.

داهاتیان چاپی ڕێکلامی دەوڵەتی بوو کە بە کۆمەگی وەزیرێک کە نەزەری بەرامبەر بەو ڕۆژنامەیە باش بوو وەریان دەگرت... لەونێوەدا (توفیق) کە ژمارەیەکی زۆر خوێنەری هەبوو جێگەو پێگەیەکی تایبەتیی هەبوو. بە باوەڕی من چارەنووسی (توفیق)و داخرانی ئاکامی ئەو ڕاستییە بوو کە بە چوونەسەری دەسەلاتی شا، ئیدی لە وڵاتدا جێگایەک بۆ شۆخیو گاڵتەجاڕی نەمابوو. بێگومان هووەیدا پیاوێکی لیبراڵڕەفتار بوو کە خزمەتی ئاغایەکی ملهوڕی دەکردو دیارە [لەبارەی داخستنی (توفیق)]ەوە ببووە داردەستی شا."[٢٥]

بە لەبەرچاوگرتنی هەموو نیشانەکانی بەردەست، یەک لەوان ئەوڕاستییە کە ئەوە شا بوو چەندین جار فەرمانی تەمبێکردنی ئەم گۆڤار یان ئەوسەرنووسەری دەردەکرد، و بە لەبەرچاوگرتنی بایەخی کۆمەلایەتیی (توفیق) وەک یەکێک لە خۆشەویستترین بڵاوکراوەکانی ئەودەمو لە گرنگترین گۆڤارە گاڵتەجاڕییەکانی سەردەمی مەشرووتەی ئێران، ڕوونکردنەوەکانی ڕاجی ماقووڵ دێنە بەرچاو. بە جۆرێکی دیکە، گرنگیی (توفیق) لەوە زیاتر بوو کە هووەیدا بتوانێ، بە تەنیایی، فەرمانی پەکخستنی دەربکا. مەجیدی بە زمانێکی بەپارێزتر قسە دەکا. بە ڕواڵەت ئەو بۆخۆی بەرامبەر بە مەسەلەی(توفیق) لەسەر هەست بوو، چونکە دەڵێ یەکدووجار لەو بارەیەوە پرسیارگەلێکی لە هووەیدا کردوە. دەڵێ "یەکدوو جاریش" کە لە بارەی (توفیق)ەوە پرسیم، "هووەیدا خۆی لە وەلامدانەوەی پرسیارەکەم بوارد." و ئەم مەسەلەیە بە باوەڕی مەجیدی نیشانی دەدا کە هووەیدا نەیدەویست بیڵێ."[٢٦] بە باوەڕی مەجیدی، "دەزانین کە ڕۆژنامەی(توفیق) دەگەڵ هەموو بەربە-ستو سانسۆرێک کە هەبوو، زۆر لە مەسەلە سیاسییەکانی دەنووسی. بەتەوسو پلار یان بە قەڵەمێکی تایبەتی ئاماژەی بە مەسەلەکان دەکردو لە کاریکاتۆرەکانیشدا زۆر ڕاشکاوانەترو ڕوونتر"هێرش"ی دەکرد. ئەو ژمارەیەی ڕۆژنامە کە ڕاگیراو بە دواشیدا ڕۆژنامەکە داخرا، ژمارەیەک بوو کە لەبارەی هووەیداو خێزانیەوە گاڵتەیەکی ناشیرنیان کردبوو. لەسەر ئەوە سەبرو حەوسەلەی دەزگا گەیشتە ئاخریو پێشیان پێ-

گرت. ئەمن پێم وانیە هووەیدا کەسێک بووبێ لەسەر گاڵتەیەک کە بە خۆیو خانمەکەی کراوە، هەرچەند ناشیرنیش بێ، پێشی کاری ڕۆژنامە بگرێ. چونکە هووەیدا دەگەڵ بنەماڵەی (توفیق)ەکان ئاشنا بووو دواتریش زۆری کۆمەگ کردنو تەنانەت یەکێک لەوان کە لە ڕێکخراوی بەرنامە بوو لەمێژ بوو مووچەی وەردەگرت بەڵام نەدەهاتە سەر کار، وەختێک ویستم دەری بکەم پێی گوتم نەکەیو پێشی کارەکەمی گرت. ئەوە نیشان دەدا کە هووەیدا دەگەڵیان دۆست بوو. بە تایبەتی کە دواتر دەوەللوویان هان دا ڕۆژنامەی کاریکاتۆڕ وەڕێ بخاو درێژەی بدا، چونکە پێیان وابوو ڕۆژنامەیەکی گاڵتەجار بۆ وڵات پێویستە...ئەدی بۆچی بەو شێوەیە پێشی ڕۆژنامەی (توفیق)یان گرت، ئەویش لە ژمارەیەکدا کە هێرش کرابووە سەر هووەیدا. بۆیە ئەمن ناتوانم باوەڕ بکەم کە هووەیدا بەتەنیا بڕیاردەری ئەوکارە بووە، ناتوانم، بۆخۆم نازانمو بۆیە ناتوانم وەڵامێکی دروستیش بدەمەوە."[٢٧٠]

گێڕانەوەکەی مەجیدی لە چەند بارەوە جێگای باسو لێ-وردبوونەوەیە. یەکەم ئەوە کە بە قسەی عەبباسی توفیق، ئەوو براکانی پتر لە هەموو کەس هووەیدایان بە بەرپرسی داخرانی(توفیق) دەزانی هەر بۆیەش لە وەزارەتی دادی دەورانی شا شکایەتیان لێکرد. جگەلەوە بە وتەی توفیق، هووەیدا بەر لە داخرانی (توفیق) چەندجار هەوڵی دا، بە ڕێگای جۆراوجۆردا گۆڤارەکە بێنێتە ژێر ڕکێفی دەوڵەتی خۆی. وەختێک پێشنیاری کرد کە دەوڵەت زۆربەی بەشەکانی خاوەنانی گۆڤارەکە بکڕێ، بەڵام برایانی توفیق نەچوونە ژێربار. عەبباسی توفیق دەیگوت کاتێک هووەیدا لە ڕاکێشانی (توفیق) نائومێد بوو کەوتە هەوڵی لەنێوبردنی. بە بوودجەیەکی قورس، بڵاوکراوەی (کاریکاتۆر)ی لە بەرامبەر (توفیق)دا قوت کردەوەو هێندێک لە نووسەرە بەڕابردووەکانی (توفیق)ی کێشانە بڵاوکراوە تازەکە. بە جۆرێکی دیکە بڵێین بە پێچەوانەی قسەی مەجیدی، دەستبەکاربوونی (کاریکاتۆر) پێش داخرانی (توفیق) بووو بە هەنگاوێک بۆ داخستنی دوکانەکەی دەژمێردرا. لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە عەبباسی توفیق ئەو

ئیددیعایەی مەجیدی کە ئەو دوای داخرانی (توفیق)یش، لە حاڵێکدا کارێکی نەکردوە، هەروا مووچەی لە ڕێکخراوی بەرنامە وەرگرتوە، بە "درۆی ڕووت" ناو دەبا. دەڵێ بەڕێکەوت بە فەرمانی مەجیدی نەکهەر ئەویان بێکار کرد، بەڵکوو نەیانهێشت لە ئیدارە دەوڵەتییەکانی دیکەشدا دابمەزرێ . بە وتەیەکی دیکە، نەک هەر کۆمەگیان نەکرد، بەڵکوو بەردیشیان خستە سەر ڕێی. بۆ ئیسباتی قسەکانی خۆی چەند وێنەی لە نامەکانی ڕێکخراوی بەرنامەی دامێ کە گێڕانەوەکەی لە بارەی ڕووداوەکانەوە پشتڕاست دەکەنەوە*.

لەلایەکی دیکە، ئاماژەی مەجیدی بەو ژمارەیەش کە [لەودا] هێرش کرابووە سەر هوەیدا لە ڕاستیدا دووپاتەکردنەوەی دەنگۆیەکە کە ئەمڕۆ وا دیارە بە حەقیقەت دەزانرێ. ئەگەرچی چەندوچۆنی نەخشی هوەیدا لە داستانی داخستنی (توفیق)دا تەنیا ئەوکاتە بە تەواوی ڕوون دەبێتەوە، کە دەستمان بە هەموو بەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەربارو وەزارەتی (اطلاعات)و ساواکو دەفتەری سەرۆکوەزیر ڕابگا، بەڵام نابێ لە شتێکدا گومانمان هەبێ: ئەو دوازمارەیە کە گۆیا لەودا "هێرش کرابووە سەر هوەیدا"، لەبنیڕا نەبووە. عەبباسی توفیق ئەمڕۆ بە ڕاشکاوی جەخت دەکاتەوە کە ئەوو براکانی کاتێک خەبەری داخرانی گۆڤارەکەیان وەرگرت، بە ئەنقەست ئەو دەنگۆیەیان لە شاردا برەو پێ-دا کە داخرانی (توفیق) بەهۆی کاریکاتۆرێک بووە کە لەودا ئاماژە بە پێوەندیی سێکسیی نێوان هوەیداو هاوسەرەکەی کرابوو. برایانی توفیق بە نامەزرۆیانو لایەنگرانی گۆڤارەکەی خۆیان دەگوت کە لە دوازمارەدا کە ڕاگیرا کارتۆنێک هەبوو کە لەودا، "هوەیدا لە لەیلا دەپرسێ، بۆچی داوای تەڵاق دەکا". ئەویش لەوەڵامدا دەڵێ. "ازدولت بپرس." [28] [ بۆ ئاگاداریی ئەو خوێنەرانەی فارسی باش نازانن ، ئەم

---

* بەشێک لەو بەڵگانەی دوای چاپی دەقی ئینگلیسیی کتێبەکەو دیتنی ئیددیعاکانی مەجیدی دان بەمن. لەو بارەیەوە سوپاسی دەکەم. بە وتەیەکی دیکە،دەبێ دەقە فارسییەکە بە هەمەلاگیرتر لە دەقە ئینگلیسییەکە بزانرێ.

ڕستە فارسییە بە دووجۆر دەخوێندرێتەوە ، مانای یەکێکیان ئەوەیە کە (لە دەوڵەت بپرسە)، دووەمەکەش دەڵێ (لە شتەکەت بپرسە.-وەرگێڕ] هەرچەند زۆر سەرچاوەی ئاگاداری دیکەش جەخت دەکەنەوە کە(توفیق) بە فەرمانی ڕاستەوخۆی شا داخراوە-هێندێک دەڵێن شا ڕقی لە کارتۆنێک هەستاوە کە لەودا ئێران بە گۆڕستان چوێندرابوو[٣٩] هێندێکی دیکەش دەیگێڕنەوە سەر ڕەخنەیەکی توند لە بنەماڵەی پادشایەتی-و ئەگەرچی بە لەبەرچاوگرتنی گرنگیی (توفیق) لە مێژووی چاپەمەنیی هاوچەرخدا بەدوور دەزانرێ کە هووەیدا، ئەگەریش ویستبای بتوانێ بێ ئێزنی شا (توفیق) دابخا، بەوحاڵەش گومان و دەنگۆی نەخشی هووەیدا لەو داستانەدا بەئاسانی لەنێو کۆمەڵانی خەڵکدا برەوی پەیدا دەکردو باوەڕی پێ‌دەکرا. بە باوەڕی من ئامادەیی خەڵکی ئەودەم بۆ قبوولکردنی دەنگۆی دژی دەوڵەت و دژی هووەیدا بۆخۆی نیشانەی ئاشکرای درزێک بوو کە کەوتبووە نێوان میللەت و ڕێژیمەوە. ئاشکرایە کە خەڵکی ئازادو ئاگادارو ڕازی کەمتر دڵ بە دەنگۆ خۆش دەکەن و ئۆگری‌یان بە برەوپێدانی دەنگۆیەک نیە کە خەراپەی ڕێژیم بڵێ.



نیشانەکانی دیکەی ئەو درزە دەتوانین لە هێندێ شوێنەواری ئەدەبیی ئەو ڕۆژگارەدا ببینین. جارێک هووەیدا بۆخۆی بابەتی سەرەکیی ئەو جۆرە ئاماژە ئەدەبییە ڕەخنەگرانەیە بوو. نموونەی زەقی ئەو جۆرە شوێنەوارانە دەتوانین لە داستانەکان و فیلمێکی ئیبراهیمی گولستاندا ببینین. گولستان پێوەندییەکی شەخسیی لەمێژینەی دەگەڵ هووەیدا هەبوو. ئاشنایەتییەکەیان دەگەڕایەوە کۆتایی دەیەی سی[هەتاوی]. هووەیدا ئەوکات هەروا لە کومپانیی نەوت بوو، گولستانیش جێگری سەرۆکی پێوەندییە گشتییەکانی کۆنسێرسیۆم لە ئێران بوو. جگە لەو ڕابردووە کارییە هاوبەشە، ئەم دووە دۆستانی

هاوبەشی وەک سادقی چووبەکیان هەبوون. هەرلەو کاتەدا، گولستان دایکو برای هووەیداشی دەناسین. ڕێزێکی زۆری بۆ دایکی هووەیدا هەبووو فەرەیدوونیش یەکێک لە نیزیکترین دۆستەکانی بوو (و هەشە). پێم وایە زیادمان نەگوتوە ئەگەر بڵێین هووەیدا "لە ژیانیدا هیچ ژنێکی بەقەد دایکیو هیچ پیاوێکی بە ڕادەی فەرەیدوون خۆش نەویستوە."[400] سەرباری ئەو ئۆگرییە سۆزدارییەش، لە تەواوی دەورانی چالاکیی سیاسیی هووەیدادا، گولستان یەکێک لە بەنفووزترین ڕووماکانی کۆمەڵەی فەرهەنگیی ئێران بوو. ئۆگریی هووەیدا بە ڕووناکبیرانو ئەو ڕاستییە کە ئەو خۆشی بە یەکێک لە گرووپی ئەدیبان دەزانی هەموو دەستیان وەدەستی یەک دەداو کەسایەتیی گولستانیان بۆ هووەیدا زۆر سەرنجڕاکێش دەکرد.

ئەو پێوەندییە سۆزدارانە پێچەڵپووچە لە نێوان ئەم دوولنەدا، جاری وابوو کاری گولستانی ئاسان دەکردو جاری واش بوو ژانەسەری بۆ پێکدێنا. بۆ نموونە، گولستان فیلمێکی دیکۆمێنتیی لە بارەی جەواهیراتی سەڵتەنەتییەوە دروست کرد. فیلمەکە دیمەنگەلێکی بێئەندازە تازەو داڕشتنێکی جوانی هەبووو زمانی گێڕانەوەکەشی زۆر لەسەرێ بوو. ئامادەکەری ئەو فیلمە بانکی مەرکەزی بوو کە ئەودەم مەهدیی سەمیعی سەرۆکایەتیی دەکرد. سەمیعییش لە دۆستانی نیزیکی گولستان بوو. بۆ تەواوکردنی لایەنە هونەرییەکان، پێویست بوو کۆپییەک لە فیلمەکە بنێردرێتە لەندەن. بەڵام بە هێندێک هۆ کە ڕیشەیان لە بەرچاوتەنگیو ململانەی پشتی پەردەی دیوەخانی ئێراندا بوو، وەزارەتی فەرهەنگ لە دەرکردنی مۆڵەتی گومرکی بۆ ئەو مەبەستە خۆی دەگنخاندو بە هەزارویەک بیانوو، کاری فیلمەکەی وەدوا دەخست. کاتێک مەهدیی سەمیعی هووەیدای لە کارشکێنیی وەزارەتی فەرهەنگ ئاگادار کرد، ئەو زۆر "تووڕە بووو فەرمانی دا چوار ئەڵقە فیلم بە کەلکوەرگرتن لە پۆستی دیپلۆماتیو بێ-مۆڵەتی وەزارەتی فەرهەنگ بنێرنە لەندەن."[410]

یەکی دیکە لە فیلمە دیکۆمێنتییەکانی گولستان دەربارەی ڕیفۆرمی

زەوی بوو. ئەمەیان چارەنووسێکی تەواو جیاواز لە فیلمی پێوەندیدار بە جەواهیراتی سەڵتەنەتییەوەی پەیدا کرد. گولستان لەم فیلمەدا نیشانی دابوو کە لە ئاکامی ریفۆرمی زەوی لە ئێراندا، "چینێک سەرمایەداری تازەی دێهاتی خەریکە پێ دەگا." هووەیدا فیلمەکەی لە ستۆدیۆی گولستان دی. بە ڕواڵەت پێی باش بوو. هەرچەند دەیگوت گولستان ویستوویە، "دروستبوونی چینێکی کوولاکی* ئێرانی نیشان بدا."[٢٤] هەرلەو کاتەدا، لەم فیلمەدا کوولاکە تازەسەرهەڵداوەکە ئەندامی حیزبی "ایران نوین یش بوو. بە واتەیەکی دیکە، گولستان ئەو کەسایەتییەی کردبووە سیمبولی نەخشی ڕوولەزیادبوونی دەوڵەت لە لادێ، و هی حیزب لە دەوڵەتدا. هووەیدا پاش دیتنی فیلمەکە دەسبەجێ پێشنیاری کرد کە گولستان بە دەوڵەتی بفرۆشێ. هەرلەوێ نرخێک دیاری کراو هووەیدا ئەڵقە فیلمەکانی، کە پێی وابوو هەرئەو یەک نوسخەیەیە، دەگەڵ خۆی برد. بەڵام سەرباری چەندین جار هەوڵو تەقەلا، گولستان نە هەرگیز توانی ئەو دراوەی دانرابوو وەرگرێو نە توانی فیلمەکە وەرگرێتەوە. هەرجارێکیش لەو بارەیەوە پرسیاری لە هووەیدا دەکرد، یەک وەڵامی وەردەگرتەوە. هووەیدا دەیگوت فیلمەکەی ناردۆتە دەربارو هێشتا وەڵامێکی وەرنەگرتۆتەوە. لە ڕاستیدا زرینگانەوەی ئەو ناخۆشییانەی نێوان هووەیداو گولستان دەتوانین لە بەشێکی داستانو فیلمەکانی گولستاندا ببینین.

لە داستانێکی درێژدا بەناوی "از روزگار رفته حکایت" (گێڕانەوەی ڕۆژگاری ڕابردوو)، گولستان بە پەخشانێک کە یەکجار کورتەو زۆرتر وەک شیعر دەچێ، دیمەنێکی زۆر ڕوونی لە ڕادەی بوونناسیی تێپەڕینی کۆمەڵی نەریتیی ئێران بەرەو نوێبوونەوە کێشاوەتەوە. هەرکام لە کەسایەتییەکانی ئەم داستانەی بە وردەکاریو وەستایەتییەکی تەواو دروست کردوەو حاڵەتی دەرەوەو ژوورەوەیانی

* کوولاک وشەیەکی ڕووسییەو بە دێهاتییە خۆشگوزەرانەکان دەگوترا. لە دەورانی ستالیندا تۆمەتی کوولاکبوون مەرگی بەمیلیۆن مرۆڤی لێکەوتەوە.

گێڕاوەتەوەو دیمەنێکی سەرنجڕاکێش‌و زیندووی لە ژیانی وەچەی پێشووی ئێرانییەکان خستۆتە بەر چاو. حیکایەتخوان پیاوێکە کە بیر لە ساڵەکانی لاوەتیی خۆی دەکاتەوە؛ بابیی وەبیر دێتەوە کە پیاوێکی سەختگیرو کەم‌دوێ‌و ملهوڕ بووو خۆی بە گرفتاری داوی ئاڵوگۆڕی قووڵ‌و لەچارنەهاتووی کۆمەڵ دەزانی. بەربەرینی‌و ئاکامەکانی ئەو ئاڵوگۆڕە ڕیشەی دەرهێنابوو. لەنێو دۆستانی بابیدا، پیاوێک هەبوو کە، "زاراوەکەی تێکەڵ، هۆشی ڕێک‌وپێک‌و جەفەنگەکانی لەڕووی یادداشتەکانیەوە بوون، و لەخۆوە وەکازی دەکوتا، و فێڵەکەشی ئەوە بوو کە هەرچی تەماعی پلەوپایەو دەسەلاتی هەیبوو لەپشت ئیددیعای بێ‌تەماعی، و بێ‌مەیلی، و لەپشت ئیددیعای ئەوە کە تەسلیمی قەزاوقەدەرە، دەشاردەوە- هەرچەند ئەمانە هەموو هووەیدا (ئاشکرا) بوون." [٢٣] زەحمەتە کەسێک ئەم دەقە بخوێنێتەوەو تێنەگا کە "هووەیدا"ی کۆتایی ڕستەکە نە سیفەت، بەڵکوو ناوێکی تایبەتەو نووکی تیژی هێرشەکەش ڕووی لە کەسایەتیی ئەمیر عەبباسی هووەیدایە.

جگەلەوە، کاتێک گولستان بەشێک لە شانۆنامەی بێرنارد شاو بەناوی "دۆن ژۆئەن لە دۆزەخ"ی، کردە فارسی‌و هێنایە سەر شانۆ، گوڵێکی ئۆرکیدەی لە بەرۆکی کۆتەکەی شەیتانیش دا کە یەکێک لە کەسایەتییەکانی داستانەکەیە. دیارە ئەمەش ئاماژەیەکی یەکجار ئازاردەرو ئاشکرای دیکە بە هووەیدا بوو. [٢٤]

بەڵام گرنگترین ئاماژەکانی گولستان بە هووەیدا دەبێ لە نهێنی-یەکانی گەنجی دۆڵی جندۆکان دا وەبینین. نهێنی‌یەکانی گەنج... لەجێدا فیلم بوو. بەڵام چونکە گولستان لەوە دەترسا کە فیلمەکەی هەرگیزمۆڵەتی نیشاندان وەرنەگرێ، نوسخەیەک لە ڕیوایەتی نووسراوی فیلمەکەشی هاوکات، بە شێوەی ڕۆمانێک، چاپ کرد. بەڕێکەوت هەم فیلمەکەو هەم ڕۆمانەکە دەگەڵ سەرسوڕمانی گولستان ڕێگای بلاوبوونەوەیان درا.

دیارە ئەوشانسەی نهێنی‌یەکانی گەنج... زۆری نەکێشا. چەند ڕۆژێک دواتر هەم ناوبانگی فیلمەکە لە هەموو شاردا بلاو بۆوەو هەم

...و ورانی سانسۆر لەنەکاو لە قووڵایی مانای ئەو بەرهەمە پڕزیرەکی-
... ڕەوشاوەیە حاڵی بوون‌و فەرمانی ڕاگرتنی‌یان دەرکرد.

نهێنی‌یەکانی گەنجی دۆڵی جندۆکان نیزیکەی دەساڵ پێش شۆڕش
...شان درا. لە سادەترین، و بگرە ساویلکانەترین پلەدا، دەتوانین بە
...رانەوەیەکی پڕپلارو تیژبین لە مەترسییەکانی سامانی بێئارەقەی
... انین. بەڵام بە کەمێک بیرکردنەوە لە وردەکارییەکانی، دەتوانین ئەو
...رهەمە بە نیشاندانێکی بێئەندازە تازەو زیرەکانەی تێپەڕینی خوارو
...ێچی ئێران بەرەو نوێبوونەوە لێک بدەینەوە. هەر لەوکاتەدا، دەتوانین
...ە دروستترین پێش‌بینیی مێژوویی بۆ ڕەوتی ئاڵوگۆڕەکانی ئێرانی
...زانین. ڕاست لە لووتکەی دەورانی دەسەڵات‌و توانای سیاسی‌و
...ابووریی شادا، گولستان لاچوونی حکوومەتەکەی پێش‌بینی دەکرد.

تەوەری داستانەکە، هەورازو نشێوی ژیانی دێهاتییەکی هەژارو بێ-
فەرهەنگە کە لە هەموو جێیەک بە "کابرا" ناوی براوە. ڕۆژێک کابرا، وەک
هەمیشە، بەئاموورەکەی " خاکی دەڕووشاند." لەنەکاو چاڵێکی لە بن
زەویی مەزرایەکەیدا دۆزیەوە. ئەو چاڵە سامانێکی بێئەندازی تێدا
شاردرابۆوە. هێندی چاو لەسەر چاو دانیی دێهاتیی هەژار، بوو بە
دەوڵەمەندێک کە ماڵ‌و سامانەکەی ئەندازەی نەدەناسی. هەموو شتێکی
لەبەر دەستدا بوو. لەوگوندە هەرلەو کاتەدا مامۆستایەکیش کاری دەکرد
کە بەئەخلاق‌و دروستکار بوو. زمان‌خۆشیش بوو، هەرچەند زۆرتر
قسەی قەبەو لەقاڵبدراوی دەکردنە ویردی زمانی خۆی. مامۆستا
وەکازیشی هەبوو، زۆرجاریش بۆجوانی گوڵێکی لە بەرۆکی کۆتەکەی
دەدا. زۆری نەخایاند کە مامۆستا بوو بە ڕێنوێن‌و ڕاوێژکاری کابرای
بەسەرداکەوتوو. بیرو بۆچوونەکانی مامۆستاکە وێکچوونێکی
حاشاهەڵنەگری دەگەڵ بۆچوونەکانی ئەمیر عەبباسی هووەیدا هەبوو
ئەو وێکچوونە بە تایبەتی وەختێک دەتوانین ببینین کە مامۆستاکە دەڵێ
"مەبەستم ئەوەیە کە ئەسڵی کار کارکردنە. پیاو دەبێ هەنگاو هەڵێنێتەوە
کار بکا، بکەوێتە نێوو کار بکا؛ نە تەمبەڵی‌و نە نەقەنەق سوودی نیە. کا
بۆخۆی پاساوی خۆیەتی. پیاو نابێ لەبەر نەقەنەق هەڵێ."[٤٥]

سامانی تازەدەستکەوتوو کابرای هان دەدا ژنی تازە بێنی. کچێکی جحێڵ دەخوازێو بە بیانووی زەماوەندی دووەمیەوە، میواندارییەکی بەشکۆ لە دیندا وەڕێ دەخا کە لەودا "هەرچی بەفکرتدا دێ لەسەر مێزەکان بوو. لە سەروپێڕا هەتا ئاواکادوو، لە خەیارو باینجانەوە تا خاویارو بلینی، لە پڵاوی ئیسلامبوولی‌یەوە بگرە تا پاتەی جەرگی قازی ستڕاسبوورگی بە سەرمۆری فووشوونەوە، پەنیر لە جۆری لیقوانەوە تا سنیلوون بە مارکی فۆرتسنتم ئەند میسنەوە." دیارە لەو میوانداریییە بەشکۆیەدا، کە کەم وەک جێژنەکانی دووهەزاروپێنسەد ساڵەی دەورانی شا نەدەچوو، خەڵکی دێیەکە بانگ نەکرابوونو ئامادە نەبوون. بە کۆمەگی تێل‌دڕوو لە میوانەکان جوێ کرابوونەوەو لە دوورەوە سفرەی ڕەنگینی خواردنو خواردنەوەی ئاشناو نائاشنا، و هەروەها ڕیزی دووروودرێژی میوانەکانیان دەدی.[41]

"کابرا" هەر لەوکاتەدا فەرمانی دا خانووبەرەیەکی پێکهاتوو لە "دوو بیچمی خڕی لە دوو بەری بورجێکی خڕدا" بۆدروست بکەن. تاریفی ئەو خانووبەرەیە لە کتێبەکەداو وێنەکەی لە فیلمەکەدا زۆر وەک خانووبەرەکەی مەیدانی شەهیاد دەچوو. لەتەواوی ئەو دەورانەدا، بە پێچەوانەی گەمژەیی "کابرا"و بۆچوونە چەوتەکانیو سەرەڕای ئەو ڕاستییە کە پرۆژەو ویستەکانی زۆرتر وڕێنەو بێبناخەن، مامۆستا هەرگیز دەست لە هاوکاری دەگەڵ وی‌و لە خزمەتگوزاری ناکێشێتەوە. دیارە سەرەتا هەوڵێکی دا "کابرا" لە ڕواڵەتبازی دوور بخاتەوە. دەیگوت دەبێ "ژوورێی دروست بکەین، جێ بۆ حەمامو ئاشپەزخانەو ئەوجۆرە شتانە دروست بکەین." هەرلەو کاتەدا دەیەویست" بەڵام دەرێی ڕاگرین، چونکە سەرنجڕاکێشە، نەریتییە." بەڵام "کابرا" نەدەچووە ژێر باری ئەو پێشنیارانە. بۆ وی قسەی پیاوان یەک بوو. لەسەر ئەوە مکوڕ بوو کە "ئەسڵی کار دەرێیە! ئەتۆ پێت وایە ژوورێیە؟ خەڵک دێن دەرێی ببینن. دەرێی دەبینن."[42] مامۆستاش بەرامبەر بەو قسە بێمانایانە تەسلیم دەبوو. لە گوێ‌لەمستی بەولاوە چیی لە دەست نەدەهات. هەرلەو کاتەدا هەستی بە گوناحیش دەکرد. ڕۆژێک وەک دەردی دڵ. بە دۆستێکی

دەگوت: "ئەمن دەمەوێ لێرە کارێک بکەم. بورج بۆمن بیانوویە. ئەوبابایە دراوێکی هەیە دەیەوێ بیدا ئەمن بۆی خەرج بکەم... بەڵام دژوارە. دەورووبەریان توند قایم کردوە. بەڵام کەلاکخۆرەی جۆراوجۆر، بە هەزار فرتوفێڵ لێی دەدزن، تەڵەکە دەکەن، چەندی بتوانن لێی دەبڕن."[٤٨٠]

"کابرا" هەرلەو کاتەدا دەشیویست جادەیەکی تازە بۆ دێیەکە ڕاکێشێ. بەڵام بۆ بەدشانسی، لە کاتی دروستکردنی جادەکەدا، تەقینەوەیەک ڕووی دا. ئەندامی گوندەکە کەوتە لەرزین. بەڵام "کابرا" باکی بەو لەرزینانە نەبوو. مەترسی لە هەوادا شەپۆلی دەداو ئەویش بێخەبەر لە هەموو شتێک، سەرسامی کاری نیگارکێشێک بووکە مامۆستاکە بەکرێی گرتبوو تا وێنەیەکی تازە لە "کابرا"بکێشێتەوە. سەرباری بێخەبەریی کابرا، "زەوی هێشتا دەلەرزی‌و تەقینەوەکە دەی‌نەڕاند"، سەرەنجام نەکهەر ماڵە کۆنەکەی کابرا، بەڵکوو باڵەخانە گەوجانە تازەکەشی کە لە فیلمەکەدا ڕاست وەک گورزی گۆشتین دەچوو، و هەزارویەک مانای دەروونناسانەی هەڵدەگرت، هەمووی چووە ژێر وێرانەکانی ئەم بوومەلەرزەیە. وەختێکیش مامۆستاکە ویستی خۆی لە ئازاری ئەو هەورە تریشقەیە ڕزگار بکا، "کابرا بە قەڵەمبازێک وەکازەکەی لێ ڕفاندو بە وەکازەکە وەرگەڕایە گیانی... دەی‌نەڕاند، ماڵوێران، ماڵت وێران دەکەم. ئەوە ماڵ بوو بۆمنت دروست کرد." پێم وانیە لە هیچ بەرهەمێکی دیکەدا کە تا ئەودەم چاپ کرابوو، چارەنووسی ئێران‌و شاو هووەیدا بەو وردی‌و لێزانییە پێش‌بینی کرابێ.

خۆش ئەوە بوو دەگەڵ ئەوهەموو ئامارە ئاشکراو ڕوونە بە شاو شەهیادو هووەیداو داهاتی نەوت، مەئموورانی سانسۆری ساواک‌و وەزارەتی "" لە چەندوچۆنی ئامارەکان نەگەیشتن‌و نهێنی‌یەکانی گەنجی دۆڵی جندۆکان لە سینەماکانی تارانیش پێشان درا. دیارە پاش ماوەیەکی کورت لەپڕ فیلمەکە ڕاگیراو قەتیش لە سەردەمی پەهلەویدا نەهاتەوە سەر شانۆ. لە بارەی چەندوچۆنی داستانەکەوە هەرنەبێ دەگەڵ دوو ڕیوایەتی تەواو ناتەباو دژبەیەک بەرەورووین. بە

ڕێوایەتێک کە گولستان لە هێندێک دۆستی خۆی بیستوە، شەوێکیان نهێنی‌یەکانی دۆڵی جندۆکان لە کۆشکی پادشایەتی نیشان دەدرێ تا شاو شاژنیش بۆخۆیان ئەو فیلمە هەڵلاسازە ببینن‌و داوەریی لەسەر بکەن. گۆیا هەر لەوێ هووەیدا ئاماژە سیمبولیکەکەن بۆ ئامادەبووان شی دەکاتەوەو ئاکامەکەی دەبێتە ڕاگرتنی فیلمەکە.[49] لە لایەکی دیکەوە، بە قسەی "کاربەدەستی ئەمنیەتی" هەر خۆی فەرمانی خڕکردنەوەی نوسخەکانی فیلم‌و کتێبی نهێنی‌یەکانی گەنجی دۆڵی جندۆکانی دەرکرد. دەیگوت: "ڕاپۆرتێکی پازدەلاپەڕیم نووسی‌و پەیامی خەتەرناکی فیلمەکەم لێکدایەوە. ڕاپۆرتەکەم بۆ شا نارد. نوسخەیەکیشم دا بە هووەیداو بە پێچەوانەی دژایەتیی دەوڵەت، پێشاندانی ئەو فیلمە لە ئێرانم قەدەغە کرد. گوتم ئەم فیلمە پێوەندیی بە مەسەلەی ئەمنیەتی وڵاتەوە هەیە نەک مەسەلە فەرهەنگییەکان."[500]

ڕاوێژی توندی ڕەخنەکانی گولستان لە هووەیدا لەم فیلمەو لە هێندێک داستان‌و وتووێژی تایبەتیی دیکەدا پێوەندییەکانی ئەم دووانەی ڕۆژلەڕۆژ ئاڵۆزتر دەکرد. چەند مانگ دوای دەرچوونی فەرمانی ڕاگرتنی نهێنی‌یەکانی گەنجی دۆڵی جندۆکان، شەوێک گولستان میوانی ماڵی فەرەیدوونی هووەیدا بوو. بە ڕێکەوت ئەمیر عەبباسی هووەیداش ئەوشەوە چووبووە سەردانی براکەی. بە هاتنی گولستان بۆ ژوورەکە، شەڕەقسەیەک لە نێوان ئەوو ئەمیر عەبباسدا هەڵگیرساو هەر هات‌و توندتر بوو. زۆری پێ‌نەچوو کە بووە بەرەوڕووبوونەوەیەکی جیددی. گۆیا هووەیدا بە تانووت شتێکی لە بارەی کراسەکەی گولستانەوە گوتوە. گولستانیش ڕقی هەڵدەستێ، کراسەکەی دادەکەنێ خڕی دەکاتەوەو بە هووەیدایدا دەداو بەدەنگێکی ڕەوان دەڵێ، "بۆنی پێوە کە. بۆنی ویژدانی لێ‌دێ... نەک بۆگەنی کەسێک کە ڕووحی خۆی فرۆشتوە."[510] پارێزەرانی هووەیدا دەسبەجێ پەلاماری گولستان دەدەن. بەلام هووەیدا بە ڕاگرتنی وەکازەکەی، پێشی هەرکارێکیان دەگرێ. چەند دەقیقە دواتر، گولستانی بانگ دەکاتە کن خۆی. داوا لە خزمەتکارێک دەکا لە قتوویەکی تایبەتی کە باڵیۆزی فەڕانسە بۆی

ناردبوو شووشـەیەک بێنێ. کۆنیاکی هۆرداژ* بوو. ئەمجار هووەیدا بە دەنگێکی هەڵاییساوو پەرێشان، دەنگی "مرۆڤێکی غەمناک" دەست بە قسە دەکا. دەڵێ: " هەست دەکەم خەیانەتم پێ کراوە." باسی ملهوڕیی ڕوولەزیادبوونی شا دەکاو "لە دەست بیری نزمی سیستمی تاکحیزبی لە ئێراندا دەناڵێنێ."[٥٢٠]

چەند حەوتوو دواتر، هووەیدا دووبارە لە میواندارییەکی ڕەسمیدا کە بە شانازیی ژاک شیراک ساز کرابوو چاوی بە گولستان کەوت. هووەیدا بێ ئەوەی نیشانەیەک لە دڵئێشی لە قسەو ڕەفتاری دەرکەوێ هاتە لای گولستان‌و بە میوانە فەڕانسەییەکەی دەوڵەتی ئێرانی ناساندو گوتی: "ئەوە گەورەترین نووسەرو فیلمسازی وڵاتەکەمانەو ئێمەش هەمیشە کارەکانی قەدەغە دەکەین."[٥٢٠] ئەمە دوادیداری گولستان‌و هووەیدا بوو.

---

* Hor's Dage.

# سەرچاوەکان

۱. از وی در یک فهرست نسبتاً شگفت، پیش و بعد انقلاب، از نخبگان سیاسی ایران یاد می‌شود؛ این فهرست را وزارت خارجه‌ی ایالات متحده با مشخصات: NSA, no. 3510، تهیه کرده است.

۲. علم، یادداشتهای علم، جلد ۱، ص ۳۷۸.

۳. بسیاری از این وزیران، از جمله فرخ نجم‌آبادی، عبدالمجید مجیدی، و مهناز افخمی، درباره‌ی این مسئله با من صحبت کردند. افخمی همچنین به من گفت که در روزی که به‌عنوان وزیر امور زنان منصوب شد، هویدا به او گوشزد کرد که نباید سعی کند مستقیماً با شاه تماس برقرار کند. مهناز افخمی، گفتگو با نگارنده، سان‌فرانسیسکو، ۲۶ اکتبر ۱۹۹۷.

4. CIA, "Elites and the Distribution of Power in Iran," February 1976, NSA, no. 1012, 37.

۵. زاهدی، گفتگو.

۶. پیشین.

۷. پیشین.

8. NA, U.S. Embassy, Tehran, Iran, "The Style of the New Foreign Minister," 13 February 1967, A-431.

9. Ibid., 2.

۱۰. زاهدی، گفتگو.

۱۱. پیشین.

۱۲. برای دستیابی به شرحی درخصوص این جلسه، به صحبتهای عالیخانی (گفتگو با نگارنده، ۱۱ ژانویه ۲۰۰۰) تکیه کرده‌ام.

۱۳. برای دستیابی به مروری مختصر در باب تحولات بحرین، ر.ک.:

Rouhollah K. Ramazani, *Iran's Foreign Policy 1941 – 1973: A Study of Foreign Policy in Modernizing Nations* (Charlottesville, 1975), 410 – 23.

۱۴. فریدون هویدا، یکی از اعضای این کمیته بود. می‌گفت او نیز مانند دیگر اعضا، ساعتها به بحث و تبادل نظر در مورد مسئله‌ی بحرین پرداخت. وقتی شنیدند شاه در این زمینه به توافقی محرمانه رسیده و دریافتند که تلاشهاشان همه زاید بود، سخت حیرت‌زده شدند. به‌علاوه، او می‌گفت وقتی برادرش امیرعباس از وجود چنین توافقی خبردار شد، به شاه پیشنهاد کرد که در انظار عمومی نخست وزیر را مسئول این توافق‌ها معرفی کند. در این صورت، اگر جنجالی علیه قرارداد به راه می‌افتاد، دامن شاه آلوده نمی‌شد. شاه البته پیشنهاد هویدا را نپذیرفت. فریدون هویدا، گفتگو با نگارنده، ٦ دسامبر ۱۹۹۷.

۱۵. زاهدی، گفتگو.

۱٦. در گزارشهای متعددی از سوی سفارت امریکا، حزب پان ایرانیست به‌سان تشکیلاتی یاد شده که رهبری آن در دست خود دولت است. قبلاً، در یکی از این گزارشها آمده که، «نمایندگان پان ایرانیست که به نمایندگی مجلس انتخاب شدند... انتظار می‌رود عمدتاً به‌عنوان ابزاری تبلیغاتی به‌کار گرفته شوند».

National Archive, "Confidential Airgram: Pan Iranist Party, August 30, 1967."

سفارت در گزارش دیگری تحت عنوان «نق زدن حزب پان ایرانیست در مجلس»، اظهار می‌دارد که «باید تأکید کرد که از نظر بسیاری از این افراد ـ بخصوص آنان که مسن‌ترند ـ عضویت در این حزب پاداشهای محسوسی به بار آورده است. این حزب، عمدتاً به علت روابط نزدیک با ساواک توانسته است امور اعضایش را پیش ببرد و سر و سامان دهد.»:

NA, "The Noisy Pan Iranist in Parliament, January, 27, 1968".

۱۷. زاهدی، گفتگو.

۱۸. علم، یادداشتهای علم، جلد ۲، ص ۸۸.

۱۹. پیشین، صص ۸۸ ـ ۸۹.

۲۰. زاهدی، گفتگو.

21. NA, U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Confidential Cable, GoI Cabinet Changes," September 1971.

۲۲. زاهدی، گفتگو.

23. Sally Quinn, *The Party*: A Guide to Adventurous Entertaining (New York, 1997), 206.

۲۴. علم، یادداشتهای علم، جلد ۳، ص ۳٦٦.

۲۵. چند تن از وزیران، از جمله مجیدی و شادمان، درباره‌ی این ماجرا با من صحبت کردند. احمد کاشفیان، مسئول این بودجه‌ی محرمانه، جریان آن را برایم توضیح داد.

۲٦. لیلا امامی، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۹ مارس ۱۹۹۹.

۲۷. پیشین، ۸ مارس ۱۹۹۹.

۲۸. پیشین.
۲۹. محمد صفا، گفتگو با نگارنده، ۲۱ نوامبر ۱۹۹۷.
۳۰. لیلا امامی، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۲٦ ژوئیه ۱۹۹۹.
۳۱. پیشین.
۳۲. پیشین، ۱۱ مارس ۱۹۹۹.
۳۳. لیلا امامی، نامه به ژان برومت، ۲۲ آوریل ۱۹۷۱. برومت، بعد از ازدواجش، نام همسرش بِکِر را برگزید. به این نامه به لطف ژان بکر دست یافتم.
۳۴. ژان کروکر به ژان برومت، مکاتبات خصوصی، دوشنبه، ۱۹۷۲.
۳۵. پرویز راجی، نامه به نگارنده، ۷ نوامبر ۱۹۹۷.
۳٦. عبدالمجید مجیدی، «مصاحبه با عبدالمجید مجیدی»، بنیاد مطالعات ایرانی: برنامه‌ی تاریخ شفاهی، آوریل ـ اکتبر ۱۹۸۲، ص ۴۹.
۳۷. پیشین.
۳۸. عباس توفیق، گفتگو با نگارنده، لس آنجلس، کالیفرنیا، ۱۴ اکتبر ۱۹۹۸.
۳۹. «مقام عالی‌رتبه‌ی امنیتی»، گفتگو با نگارنده، ۲۳ نوامبر ۱۹۹۸.
۴۰. ابراهیم گلستان، مکاتبات شخصی، ۲۰ ژانویه ۲۰۰۰.
۴۱. پیشین.
۴۲. پیشین.
۴۳. ابراهیم گلستان، از روزگار رفته حکایت، مدومه، تهران ۱۳۴۸، ص ٦۵.
۴۴. ابراهیم گلستان، گفتگو با نگارنده، ۱۲ سپتامبر ۱۹۹۹.
۴۵. ابراهیم گلستان، اسرار گنج دره‌ی جنی، تهران، ۱۳۵۳، ص ۱۵۴.
۴٦. پیشین، ص ۱۳۹.
۴۷. پیشین، صص ۱۱۴ ـ ۱۱۵.
۴۸. پیشین، ص ۱۵۸.
۴۹. ابراهیم گلستان، گفتگو با نگارنده، ۱۲ سپتامبر ۱۹۹۹.
۵۰. «مقام عالی‌رتبه‌ی امنیتی»، گفتگو با نگارنده، ۲۸ سپتامبر ۱۹۹۹.
۵۱. برای دستیابی به شرحی درباره‌ی این حادثه، به گفتگوهایم با فریدون هویدا و ابراهیم گلستان تکیه کردم. کلمات نقل شده از ابراهیم گلستان‌اند، مکاتبات شخصی، ۲۰ ژانویه ۲۰۰۰.
۵۲. پیشین.
۵۳. چند منبع، از جمله پرویز راجی و سیروس غنی، این مکالمه را نقل کردند. در اینجا من از ابراهیم گلستان نقل قول آوردم، مکاتبات شخصی، ۲۰ ژانویه ۲۰۰۰.

# فەسڵی سێزدەیەم

## ڕووخانی پۆمپەیی

مانگی ڕەنگپەڕیو بە ڕوانینێکی خوێناوی دە زەوییەوە ڕاماوەو
پێغەمبەرانی دەموچاوتێکقوپیو مزگێنیی ئاڵوگۆڕی ترسناک دەدەن.
دەوڵەمەندان غەمبارنو لاتولوتی هەڵدەپەڕن
ئەویان دەترسێ ماڵەکەی لەدەست بچێو
ئەمیان لەخۆشیی شەڕو هەرا:
ئەمانە هەموو نیشانەی مەرگ یان ڕووخانی پادشاکانن.

شکسپیر، ڕیچاردی دووەم

# ڕووخانی پۆمپەیی[7]

دوو کۆدیتای بێئاکام دژی سوڵتان حەسەنی مەراکیش، شای ئێرانیان تۆقاند. کۆدیتای یەکەم سەرەتای پووشپەڕی ١٣٥٠(١٩٧١) ڕووی داو دووەمەکە یازدە مانگ دواتر.[1] شا هەمیشە ئۆگرییەکی تایبەتیی بە سوڵتانەکانی دنیاوە نیشان دەدا. نیگەرانی ئەحواڵیان بوو. لە سەرەتای دەیەی پەنجادا، بەشێک لە سامانی تازە دەستکەوتووی ئێرانی بۆ کۆمەگ بە پادشایانی لێکەوتوو، سوڵتانە چاوچنۆکەکان و حاکمانی دەستکورتی دوێنێ و پیاوماقووڵـە لەباوکـەوتووەکانی ئەمڕۆ خەرج دەکرد. جگەلەوە، هەروەخت پادشایەک لێدەکەوت، یان تەنانەت کۆدیتایەک هەڕەشەی لێدەکرد، شا نیگەران دەبوو. هەرلەوکاتەدا، پێی وابوو ئەمریکاییەکان دەستیان لە کۆدیتای مەراکیشدا هەبووەو ئەم باوەڕەش نیگەرانییەکەی دووچەندان دەکرد. بە باوەڕی عەلەم، ئەو ڕاستییە کە لە کاتی کۆدیتادا "ئەو ستوارت ڕاکوولە سەگبابە" باڵیۆزی ئەمریکا لە مەڕاکیش بوو، ڕاستبوونی نەخشی ئەمریکا لەو پیلانەیدا پشتڕاست دەکردەوە.[2]

کەمێک پاش کۆدیتای دووەم، شا هووەیدای بۆ دیدارێکی درێژ بانگ کردە لای خۆی. ئەم جارە دیدارەکەیان نۆ سەعاتی کێشا. بەڵگەیەکی ورد لە بارەی ئەوەی لەو کۆبوونەوەیەدا گوزەراوە، لە دەستدا نیە.[3] زانیارییەکانی ئێمە لەوبارەیەوە تەنیا پشت بەو شتە کە-مانە دەبەستن کە هووەیدا لە بارەی چەندوچۆنی کۆبوونەوەکەوە دەگەڵ دۆستانی خۆی باسی کردبوون. هەرلەو کاتەدا دەزانین کە

لە ئاکامی ئەو کۆبوونەوەیەدا، ڕاوێژی زاری هووەیدا لە باسی هێندێ مەسەلەی وڵاتدا هەرنەبێ بۆ ماوەیەکی کەم گۆڕا. لە حەوتووەکانی دوای دیداری دەگەڵ شادا، بە شێوەیەکی دیار دەگەڵ یەکێک لەو گرووپانەی ڕاوێژی پێدەکردن بە ڕاشکاوی‌و ئازادییەکی زیاترەوە قسەی دەکرد.

پێکهێنانی ئەو گرووپە بۆخۆی لە ڕاستیدا ئاکامی سەفەری هووەیدا بۆ ئەمریکا بوو. لەوێ ئەو ڕاستییەی زۆر وەبەر دڵ کەوتبوو کە بۆی دەرکەوتبوو سەرۆککۆمار ڕاوێژ دەگەڵ کەسایەتییە ناسراوەکان‌و شارەزایانی بوارە جۆراوجۆرە ئابووری‌و سەنعەتی‌و فەرهەنگییەکاندا دەکا. دەیەویست شتێکی وەک ئەوە لە ئێرانیش وەڕێ بخا. بۆیە شەش کەس لە بژاردەکانی ئەو سەردەمەی هەڵبژاردو ئەرکێکی دوولایەنەی خستنە سەر شان. لەلایەک دەبوو هووەیدای لە چەندوچۆنی ئاڵوگۆڕەکانی بیروڕای گشتیی کۆمەڵ ئاگادار بکەن‌و لەلایەکی دیکە دەبوو ببنە ئەڵقەی پێوەندیی نێوان ئەوو کۆڕوکۆمەڵە ماڵی‌و سەنعەتییەکانی وڵات. ئەندامانی ئەو گرووپە، کە عادەتەن ڕۆژانی سێ-شەممە نانی نیوەڕۆیان دەگەڵ هووەیدا دەخوارد، بریتی بوون لە: سیرووسی غەنی، فەرەیدوونی مەهدەوی، ڕوکنوددینی تیهرانی، موحەممەدڕەزا ئەمین، شاهینی ئاقایان‌و عەبدولعەلیی فەرمانفەرمائیان.[4] دیارە هەرلە سەرەتاوە جۆرێک بێ‌متمانەیی لەنێو ئەندامانی ئەو گرووپەدا دەرکەوت* هەرنەبێ سێ کەس لەو شەش کەسە حازر

---

* ئەم بێ‌متمانەییە لەو کاتەدا یەکجار بەربڵاو بوو. وا دیار بوو هەمووان وایان داناوە کە لە هەر کۆبوونەوەیەکدا لانی‌کەم یەکێک ڕاستەوخۆ پێوەندیی بە شاوە هەیەو لە نێوەڕۆکی باسەکانی کۆبوونەوە ئاگاداری دەکا. ئەهلی سیاسەت لە ئێران بە پێی قاعیدە هەمووان داستانی کۆبوونەوەی ماڵی عەلایان دەزانی. ئەودەم عەلا وەزیری دەربار بوو. پاش سەرکوتی بەسەرهاتی ١٥ی جۆزەردان، عەلا چەندکەس لە سیاسەتمەدارانی بەڕابردووی ئێرانی بۆ بیروڕاگۆڕینەوە بانگ کردە ماڵەکەی خۆی. نیگەران بوو کە بارودۆخەکە بەرەو ئاڵۆزی بچێ. دەیزانی کە سوپا ژمارەیەک لە

نەبوون بە حوزووری سێ کەسەکەی دیکە قسەیەکی جیددی بکەن. ئەو متمانەبەیەکنەبوونە ئاکامی ئەو ڕاستییە بوو کە سیاسەتکارەکانی ئێران زۆربەیان پێیان وابوو لە هەر کۆمەڵێکدا یەکێک چاووگوێی شایەو یەکێک قسەیەکی نالەبار، جموجووڵێکی نەشیاو، ڕستەیەکی ڕەخنەگرانەی لێ بینرابایە، بەس بوو بۆ ئەوەی لەسەر کارەکەی دەربکرێ. بە هەرحاڵ، ئەندامانی ئەو گرووپە مانگی دوو جار، ڕۆژانی سێشەممە، دەگەڵ هووەیدا کۆ دەبوونەوە. هەرلە یەکەم کۆبوونەوەکانەوە، ئاڵۆزیی نێوان ئەندامەکان، کۆبوونەوەکانی لەهەر نێوەڕۆکێکی جیددی بەتاڵ کرد. وا دیار بوو تەنیا کاتبەفیڕۆدانێکەو هیچی دیکە.

بەڵام لەنەکاو لە سێشەممەی دوای کۆدیتای ١٣٥١ی مەڕاکیشدا، هووەیدا کۆبوونەوەکەی بە ڕاوێژێکی جیددیتر دەست پێکردو پەیامێکی تازە بۆ گرووپەکە قایل بوو. گوتی گەندەڵیی ماڵی بەردەرکی بە ڕێژیم گرتوەو لە هەموو شتێک زیاتر هەڕەشەی لێ دەکا. لە حاڵێکدا جاران زۆر بە پارێزەوە قسەی دەکرد، ئەم جارە بێپەروا دەدواو هەمووان سەریان سوڕما. داوای لە گرووپەکە کرد هەرچی لە بارەی گەندەڵیی ماڵییەوە لە وڵاتدا دەیزانن بۆی باس بکەن.[5]

لەوکاتەوە کە ببووە سەرۆکوەزیر، هووەیدا زۆر وەخت، بە تایبەتی

---

خۆپێشاندەرانی بەر گوللە داوەو ئەمەی تا ڕادەیەک بە جێگای مەترسی دەزانی. جەعفەری شەریف‌ئیمامی‌و تیمسار مورتەزای یەزدانپەنا لە بانگکراوەکان بوون. ئەم دووانە کاتێک تێگەیشتن کۆبوونەوەکە بەبێ ئیزنی شا پێک هاتوە دەسبەجێ ماڵی عەلایان بەجێ هێشت‌و خەبەری پێکهاتنی کۆبوونەوەکەیان دا بە شا. شا بەوکارەی عەلا یەکجار تووڕە بوو. زۆری پێ‌نەچوو کە عەلای لە وەزارەتی دەربارو ئینتیزامیشی لە سەرۆکایەتیی هەیئەتی بەڕێوەبەریی کومپانیی نەوت وەلا دا. شا پێی وابوو ئەو کۆبوونەوەیە بە دەستووری ئینگلیسییەکان بووە؛ لە دیداری دەگەڵ ئەمریکاییەکاندا، بە زمانێکی یەکجار توند باسی زۆربەی بەشدارانی ئەو کۆبوونەوەیەی دەکرد. هەر لەوکاتەدا بڕوانە: یادداشتهای علم، جلد دوم، ص١٢٨

لە خۆبەخۆیایەتیدا، لە دەست گەندڵیی ماڵی لە وڵاتدا دەی ناڵاند. هەرلەو کاتەدا، هێندێ جار نیگەرانیی خۆی لە تێوەگلانی ڕوولەزیادبوونی زۆر لە ئەندامانی بنەماڵەی پادشایەتی لە ژیانی ئابووریی وڵاتدا دەردەبڕی. کەم-وزۆر هەموو دۆستانی هوووەیدا هەرنەبێ جارێک گوێیان لە دەردی دڵی هوووەیدا لەو بوارەدا ببوو.

دیارە ڕەخنەگرانی هوووەیدا بۆچوونێکی تەواو جیاوازیان هەیە. ئەوان دەڵێن هوووەیدا نەکەهەر ئەو گەندەڵییەی قبووڵ دەکرد، بەڵکوو تێوەگلانی بنەماڵــەی پادشــایەتی‌و هەوڵــەکانیانی بــۆ دەڵاڵـــی‌و وەدەســـتهێنانی قەرارومــەدارە دەوڵەتییــەکان هــانیش دەدا.[1] هووشــەنگی نەهاوەنــدی کــە هوووەیدا بۆخۆی پێی گەیاندبوو، دەڵێ: "هوووەیدا هەوڵی دەدا هەقی دەڵاڵی بــۆ والا حــەزرەت ئەشــرەفــو والا حــەزرەت فاتمــەو والا حــەزرەت عەبدورڕەزا، غولامڕەزاو مەحموودڕەزا پەیدا بکا. دەیەویست ئەوان وەک واسـیتەی موعامەلـە داهاتێـک بەدەسـت بێـنن."[7] نەهاوەنـدی بـۆ ئیسـباتی قسەکانی بەڵگەیەک نیشان ناداو ئەم خاڵەش ناتوانین لەبیر بەرینەوە کە لە تاریکستانی سەوداو موعامەلـەی نامەشرووعی ماڵیدا، بەڵگەی دادگاپەسند بـە دەگمـەن دەسـت دەکـەوێ. لـە بەرامبـەردا، کەسـانێکی وەک فـەڕوخی نەجمابادی، ئیددیعاکانی کەسانی وەک نەهاوەندی‌و عەلـەم بە تـەواوی بـە بەتاڵ دەزانن‌و حاشایان لێدەکەن. نـەجمابادی دەڵـێ بە ڕێکـەوت هوووەیدا زۆرجار هــەوڵی دەدا ببێتــە "بـەلاگێڕەوەی وەزیرەکانی خـۆی لـە بەرامبـەر فشاری ئەندامانی بنەماڵەی پادشایەتیدا." ئەو لێی زیاد دەکا کە: "هوووەیدا بە ئێمــەی گوتبــوو کــە هــەموو وردە فەرمایشــتەکانی ئەنــدامانی بنەماڵــەی پادشـایەتی بنێرینـەوە دەفتەرەکـەی خـۆی. کاتێک ئـەو کارەشـمان دەکـرد، زۆرجــار ئیــدی هــیچ شــتێکمان لــە بــارەی ئــەو وردە فەرمایشــتانەوە نەدەبیستەوە، چونکە هوووەیدا مەسـەلەکەی تێپەڕاندبوو."[8] هـەتا وەختێک دەوڵەتی ئێران ئارشیڤەکانی بۆ لێکۆڵینەوە نەخاتە بەر دەسـتی لێکۆڵـەران، بــە وردی نــاتوانین بڵێــین هوووەیــدا تــاچ ڕادەیــەک کــارە ناقانوونییــەکانی بنەماڵـەی پادشـایەتیی هـان داوەو بـە چ ڕادەیـەک لـە دەسـەڵاتی خـۆی بـۆ پێش‌پێگرتنیان کەلکی وەرگرتوە.

بەڵام گومانێک نیە کە ساڵی١٣٥١، هووەیدا، بە ڕواڵەت بە ڕەزامەندیی شا هەرنەبێ کۆمەگی بە کەمکردنەوەی مەسەلەی گەندەڵی لە ئێراندا کرد. چەندین جار دەگەڵ سێ کەس لە ئەندامانی گرووپی سێشەممەکان، غەنی، مەهدەوی‌و فەرمانفەرمائیان، دیداری کردو خەریکی باس‌و لێکۆڵینەوەی چەندوچۆنی مەسەلەی گەندەڵی بوو. دیارە پاش ماوەیەکی کورت، لەنەکاو شۆروشۆقی هووەیدا لەو کۆبوونەوانەدا دامرکا. بە هۆگەلێکی ناڕوون، بەکردەوە کاری گرووپەکە پەکی کەوت. بەڵام ئەم وتووێژانە هەرنەبێ لە کورتخایەندا، ئاکامگەلێکیشیان بەدواوە هەبوو. بۆ نموونە، شەهرام، کوڕەگەورەی کچەشا ئەشرەف، لەورۆژگارەدا وەک دەلاڵ‌و کارڕێکخەر ناوبانگی دەرکردبوو. ڕێکخراوی سیا پێی وابوو، شەهرام " لەهێندێ بواردا، ڕێگای دایکی گرتۆتە بەر"، و لە "تاران وەک کارڕێکخەر ناوبانگێکی خەراپی دەرکردووەو بەشێ لە نیزیکەی بیست کومپانیدا هەیە... بێ‌پەرواترین‌و دزێوترین کاری، فرۆشتنی شوێنەوارە نیشتمانییەکان‌و کۆنینەکانی وڵات بوو."[٩٠] هەر ئەو شەهرامە، دەگەڵ ئەو بەدناوییە، بەپێی فەرمانێکی تایبەتیی شا، ڕێگەی پێدرابوو ناوی بنەماڵەی پەهلەوی‌نیا لەسەر خۆی دابنێ. بەڵام لەنەکاو، پاش چەند کۆبوونەوەیەک لە دەفتەری سەرۆک- وەزیر کە لەواندا چالاکییەکانی شەهرام باس دەکران، شا، دیارە بێ هیچ دادگایەک، و بێ‌ڕاگەیاندنی ڕەسمیی مەسەلەکە، فەرمانی دا شەهرام دەست لە چالاکییە ئابوورییەکانی هەڵگرێ‌و بۆماوەیەک لە ئێران بچێتە دەر. دیارە ئەم قەدەغەکردنە زۆری نەکێشا. هێندەی پێ نەچوو کە شەهرام ڕێگەی هاتنەوەی پێدراو چالاکییەکانیشی دەست پێکردنەوە. بە ڕواڵەت ئەندامانی بنەماڵەی پادشایەتی شایان قانیع کردبوو کە ئەگەر بۆ گوزەرانی خۆشیان بووە، دەبێ لە چالاکییە ئابوورییەکانی وڵاتدا بەشدار بن‌و هەقی دەلاڵی وەربگرن. هەڵویستی ناڕوون‌و لەرزۆکی شا لە پێوەندی دەگەڵ چالاکییە ئابوورییەکانی بنەماڵەی پادشایەتیدا دەتوانین لە ڕاپۆرتێکی دیکەی ڕێکخراوی سیادا ببینین. لەوێدا هاتوە کە "ئەم دواییانە سەرۆکی یەکێک لە گەورەترین بانکەکانی ئێران بە

کاربەدەستێکی باڵیۆزخانەی گوتوە کە ماوەیەک لەمەوبەر سەرنجی شای بۆلای یەکێک لە موعامەلەکانی ئەشرەف ڕاکێشاوە، پێی گوتوە ئەگەر وردەکاریی ئەم موعامەلەیە ئاشکرا بێ ڕەنگدانەوەیەکی خەراپی دەبێ. کەچی شا بایەخێکی پێ نەداوە. سەرۆکی بانک دەیگوت ئەگەر کەسێکی دیکە جگە لە ئەشرەف ئەوکارەی کردبایە، دەساڵ زیندانی دەکرا."[10] تەنانەت پەرویزی سابیتیش ئەزموونێکی وەک ئەوەی سەرۆکی بانکی هەبوو. ڕاپۆرتێکی دەربارەی چالاکییە ناقانوونییەکانی هێندێک لە ئەندامانی بنەماڵەی پادشایەتیی ئامادە کرد، کە نەکهەر سوودی نەبوو، بەڵکوو ڕقی شاشی هەڵستاند."[11]

هێندێک لە دۆستانی نیزیکی شاش هەروەک ئەندامانی بنەماڵەی پادشایەتی، وەک جۆرێک پارێزراویی قانوونییان هەبێ، هاتبوونە نێو مەیدانی چالاکیی ئابوورییەوە* لەلایەک، عەلەم بوو کە تەنانەت بە

---

* یەکێک لە نموونە سەرنجڕاکێشەکانی هەوڵی هوویدا بۆ بەربەرەکانیی گەندەڵی ململانەی پڕقۆرتوپێچی دەگەڵ سەرمایەدارێکی بەهایی بوو کە ئەو دەورەیە هەڵلاساز بوو. ئەو سەرمایەدارە کەلکی ناڕەوای لەو شتە وەردەگرت کە بانکداران پێی دەڵێن"فلووت" (FLOAT). لە ڕاستیدا بە دەرکردنی چەکی "بێجێ" لە حیسابی بانکێک بەشەکانی هەر ئەوبانکەی دەکڕینو پێشئەوەی چەکەکان بگێڕدرێنەوە، دراوی پێویستی دەڕشتە حیسابەوە. ساڵی١٣٤٥ (١٩٦٦) حەسەنعەلیی مێهران،سەرۆکی ئەوکاتی بانکی مەرکەزی، لەنەکاو تێگەیشت کە ڕادەی ئەو چەکە بێجێیانە گەیوەتە پتر لە یەک میلیارد تمەن. مێهران وەخۆ کەوتو داوای کۆمەگی لە هوویدا کرد. هوویدا سەرمایەدارە خەتاکارەکەی بانگ کردە دەفتەری سەرۆک-وەزیرو بە ڕاوێژێکی توندو تەنانەت بە هەڕەشە،داوای لێکرد واز لە دەستتێوەردانی کاری بانکەکانی وڵات بێنێو فکری کڕینی بانکێکی تازەش وەلا بنێ. دوای یەکدوو ڕۆژ،بانکی مەرکەزی نامەیەکی لە وەزارەتی دەربارەوە پێگەیشت. لەودا شا جەختی کردبۆوە کە ئەو سەرمایەدارە مرۆڤێکی زەحمەتکێشو کۆڵنەدەرەو دەوڵەت نابێ کۆسپ بخاتە سەر ڕێگای کارەکانی. یەکدوو ڕۆژ دوای ئەوەی نامەکە بە بانکی ناوەندی گەیشت، سەرمایەداری گۆڕین سەرکەوتووانەو ئەمجارە بێ بانگکران، چووە

وتـەی دۆسـتان‌و دەسـت‌پـەروەردەکانی خۆشـی لـە زۆر موعامەلـەی گوماناویدا بەشدار بوو. لەلای دیکە، ئەمیر هووشەنگی دەوەللوو بوو کە بـە "سـوڵتانی خاویـار" بـەناوبانگ بـوو. بـەڵام لـە هـەمووی سـەیرترو ئەفسووناویتر دوکتۆر کەریمی ئەیادی بوو. لە ڕاپۆرتێکی باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە ئێراندا ئەیادی بە "پزیشکی تایبەتیی شـا" ناو برابوو، و هـەر لەوکاتەدا هاتبوو کە ئەو "لە چەند کومپانی یەک لـەوان کومپانیی نـەوتی پارسـدا بەشـی هـەن* عادەتـەن ١٥تـا ٤٥ لەسـەدی بەشـەکانی ئـەو کومپانییانە هی ئەون، ئەو لەوجۆرە حاڵەتانـەدا نـاوی جۆراوجۆر بـەکار دێنێ. جارێک خۆی بە عەبدولکەریم، هێندێ‌وەخت بـە ئەیادی نـاو دەبا. تیمسار ئەیادی هەرلەو کاتەدا حەقی سوودوەرگرتن لە میگۆی خـەلیجی فارسیشی لە پاواندایە."[١٢] لە ڕاپۆرتێکی دیکـەدا، ڕێکخـراوی سیا ئەیادی، بە "کاناڵی سەرەکیی چالاکییە ئابوورییەکانی شا" دەزانێ‌و لێی زیاد دەکا کە ئەیادی گۆیا لـە سـەردەمی منداڵییـەوە دۆسـتی شـا بووە...تەنانـەت دەڵێن ئەوکاتـەی شـا دەگـەڵ سـورپەییای هاوسـەری لـە مـانگی هـەنگوین بـوون، ئەیادییشـیان هـەمیشـە دەگـەڵ بـووە. وەختێـک دەنگـۆ بـوو کـە بەشـەکانی شـا لـە کومپـانیی ماسـی‌گرتنیشـدا بـە نـاوی ئـەیادی تۆمـار کـراون... ئـەیادی بەهاییـەو هێنـدێ لـە چاوەدێران پێیـان‌وایـە پشـتیوانی سـەرەکیی بەهاییـەکانی ئێرانـە. دەڵێن هەرئـەویش لـە بەرامبـەر فشـارو

---

دەفتەری سەرۆکوەزیر. قامکە گەورەی لە سەرۆکی دەفتەری هووەیدا ڕاست کردەوەو بـە گاڵتـەپێ‌کردنـەوە گـوتی: "بـە ئاغاکـەت بڵێ،فـەرموو، ئـەوە بانکەکـەم کـڕی." سەرەنجام پاش وتووێژێک کە شا ڕاستەوخۆ دەستی تێدا هـەبوو، بڕیار درا ئـەو سەرمایەدارە هەموو بەشەکانی خـۆی لـە بانکە جۆراوجۆرەکانـدا بفرۆشێ‌و بەرامبـەر بەوە چڵلەسەدی بەشەکانی بانکێک بۆخۆی ڕابگرێ.

* خاتو فاتمەی سوودئاوەری فەرمانفەرما، کە مێردەکەی یەکێک لە بناخەدانەرانی ئەم کومپانییە بوو، حاشا لە هەرجۆرە نەخشێکی ئەیادی لـەو کومپانییـەدا دەکا. دەڵـێ شیا لەو بارەیەوە یەکسەر بەهەڵە چووە. فاطمە سـودآور فرمانفرمـا، وتـووێژ دەگـەڵ نووسەر،٢٠ی مارسی٢٠٠١

پەلاماری موسوڵمانانی دەمارگرژدا پارێزگاری لە پەیڕەوانی ئەو ڕێبازە دەکا."[130]

بەهەرحاڵ، لە هەوەڵ ساڵەکانی دەیەی پەنجای [هەتاوی]دا، هێندێک لە ئەندامانی بنەماڵەی پادشایەتی، ژمارەیەک لە دەربارییەکان، یەک‌دوو کەس لە هاوڕێکانی هووەیداو هەرنەبێ دوو کەس لە وەزیرانی کابینەکەی ناوبانگێکی خەراپیان لە نێو خەڵک پەیدا کردبوو؛ تۆمەتیان لێ‌دەدرا کە "دزی لە (بیت المال) دەکەن." ڕادەی ئەو ڕەش‌بینییە دەتوانین لە ڕاپۆرتێکی ساڵی١٣٥٧ی باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە ئێراندا ببینین. لەوێدا دەبینین کە بەپێی هەڵسەنگاندنی باڵیۆزخانە، " لە حەوتووەکانی دواییدا، گەندەڵیی ماڵی بۆتە یەکێک لە مەسەلە سیاسییە گرنگەکانی ئێران؛ بەشی هەرەزۆری ڕەخنە لە شا چۆتە قاڵبی ڕەخنە لە چالاکییە ناقانوونییەکانی دەوروبەری نیزیک‌و تەنانەت ئەندامانی بنەماڵەکەیەوە...وا دیارە ئەم مەسەلەیە بە ئاسانی چارەسەر ناکرێ‌و تەنیا وەختێک لەنێو دەچێ کە بناخەی بنەڕەتی‌ترین بنیاتی سیاسیی ئێران، واتە پادشایەتیی وەلەزە خستبێ."[140]



بە زیادبوونی داهاتی نەوت، گەشەسەندنی ئابووریی ئێرانیش خێراییەکی سەرسووڕهێنی پەیدا کرد. هەرچەند لە ساڵی١٣٤٧ەوە تاساڵی١٣٥١ بەرهەمهێنانی بەشی سەنعەت ساڵێ چاردە لەسەد چووبووە سەر، بەڵام قەڵەمبازە گەورەکە هێشتا مابووی. لە سەرماوەزی ١٣٥١ەوە، نرخی نەوت بەخێرایی بەرەوسەر چوو. لە ماوەی ساڵێکدا، نرخی بۆشکەیەک نەوتی خاو لە پێنج دۆلارەوە گەیشتە نیزیک دوازدە دۆلار، داهاتی ئێرانیش، شان‌بەشانی ئەوە زیادی کرد. بەرنامە ئابوورییەکانی وڵات هەموو لەبەر تیشکی ئەژمارە تازەکانی داهاتدا دەسکاری کران. لەو کاتەوەش بوو کە شا بەرەبەرە ئاماژەکانی بۆ "شارستانەتیی مەزن" دەست پێ‌کردبوو. بەڵێنی دەدا کە

ئێران پێش کۆتایی سەدە، دەبێتە پێنجەمین وڵاتی سەنعەتیی جیهان. دەیگوت وەپێش ژاپۆن دەکەوێتەوەو بۆ هەتاهەتایە لە جەغزی هەژاریو دواکەوتوویی ڕزگار دەبێ. تەنانەت پێش قەڵەمبازی لەنەکاوی نرخی نەوتیش بە دوارۆژی ئێران زۆر گەشبین بوو. ساڵی١٣٤٥ بە هاریمەنی گوتبوو: "لە بیست ساڵی داهاتوودا تەنیا ژاپۆنو ئێران دەتوانن بگەنە قۆناغی هەڵدانی ئێستای وڵاتانی ئوورووپایی." هەرلەو کاتەدا، بە سەربەرزییەوە گوتبووی: "ئێران لە ژاپۆنیش زیاتری سەرچاوەی سروشتی هەن."[15]

زۆر لە ئابووریزانان لەو باوەڕەدان کە لە پشتەوەی بیرۆکەی "شارستانەتیی مەزن" جۆرێک تیئۆریو ستراتیژیی ئابووریش شارابۆوە، کە بە تیئۆریی "پاڵەپەستۆی مەزن" بەناوبانگە. بەپێی ئەو تیئۆرییە، وڵاتانی جیهانی سێیەم تووشی "ئەڵقەی داخراوی هەژاری"ن. تەنیا بە یەک ڕێگادا دەتوانن لەو جغزی نەگبەتییە ڕزگار بن؛ لەمجۆرە وڵاتانەدا، دەوڵەت دەبێ لە "ڕادەیەکی بەرینو هەمەلایەنە"دا هەوڵی سەنعەتیکردنی وڵات بدا.[16] دیارە ئەوانەی بانگەواز بۆ ئەو تیئۆرییە دەکەن زۆربەیان دەزانن کە لە هەر وڵاتێکدا خێرایی ئەو "پاڵەپەستۆ مەزنە" سەرەنجام هەر پەیڕەوی "تواناکانی ڕاکێشانی ئابووری" لەو وڵاتەدایە.[17] شا لەلایەک خوازیاری ئەو "پاڵەپەستۆ مەزنە" بوو، بەڵام لەلایەکی دیکە، تەحەممولی وەرگرتنی هێندێ مەفهوومی ڕەزاگرانو ناڕوونی وەک "تواناکانی ڕاکێشانی ئابووری"ی نەبوو. لە حاڵێکدا قانوونو ڕاستییە ئابوورییەکان ئەوەندە سەرڕەقن کە پەیڕەوی لە فەرمانە شایانەکانیش ناکەن.

پەلەپەلی شا لەو بوارەدا، و بێموبالاتیی بە قانوونە ئابوورییەکان، لەلایەک لە سروشتی خۆیەوە دەهات؛و لەلایەکی دیکە، ڕیشەی لەم ڕاستییەدا بوو کە ئەو خوێندنی زانکۆی نەدیبوو. ئەوەی لە ئابووری دەیزانی لە ئەزموونو کردەوەدا فێری ببوو. لە بەرامبەردا هووەیدا، هەم بەهۆی ئەو خوێندەوارییەی بوویو هەم بەپێی سروشتی خۆپارێزی، بە پێی قاعیدە نەدەبوو سیاسەتی ئابووریی شا قبووڵ بکا. بەڵام هەروەک

پێشتریش گوتم، کەسایەتیی هووەیدا بیروبۆچوونە زۆرجار ناتەباو دژبەیەکەکانی دیاری‌یان دەکرد. لەلایەکەوە نیوەندڕۆ بووو حەزی لە توندڕۆیی‌و سستەپەلی نەبوو. هەرلەو کاتەدا بیروبۆچوونە ئابوورییەکانی جۆرێک بیری ویستپەسندانەیان تێدا هەبوو، واتە بیرێک کە پێی وایە ویستی مرۆڤ بۆ لەبەرچاونەگرتنی قانوونە ئابوورییەکان‌و پشتگوێ‌خستنیان بەسە. ڕیشەی ئەو بیرورایەی دەبێ بەرینەوە سەر باوەڕو موتالاکانی لە سالانی دەیەی سیی سەدەی بیستەمدا. لەو سەردەمەدا بیروبۆچوونە مارکسیستی-لینینیستییەکان، هەموویان دوچاری جۆرێک بیری "ئابووری‌لێدراو" بوون. لە لینین‌و ترۆتیسکییەوە بگرە تا مائۆو ستالین، هەموویان هەوای جۆرێک "قەڵەمبازی گەورە"یان لەسەردا بوو. دەیانگوت ئەگەر ژێرخانی ئابووری بگۆڕی، سەرخانی فەرهەنگییش چارەی نیە دەبێ شان‌بەشانی وی بگۆڕێ. دەزانین کە تەنانەت لە ساڵەکانی پەنجاشدا، وەختێک کە مارکسیزمی سەردەمی لاوەتیی هووەیدا تەنیا هێندێک لە دروشمە کۆمەڵایەتییەکانی لێ مابۆوە، دیسان کاتێک دەگەڵ شاژن چووە چین، ئاڵوگۆڕە ئابوورییەکانی ئەو وڵاتەی، کە هێشتا لە ژێر ئاڵای بیرو باوەڕەکانی مائۆدا بوون، یەکجار بەدڵ بوون.[18]

دیارە لە ڕێکخراوی بەرنامەی ئەوکاتدا کەسانێک هەبوون کە باش لە قانوونە ئابوورییەکان دەگەیشتن‌و دەشیان‌وێرا بیروبۆچوونەکانیان دەرببڕن. بۆنموونە، ڕەشەمەی١٣٥٢، لە ڕاپۆرتێکدا بە ڕاشکاوی گوتیان ئێران ناتوانێ هەتا کۆتایی ئەم سەدەیە، ببێتە پێنجەمین وڵاتی سەنعەتیی جیهان." هەر لەو ڕاپۆرتەدا جەختیان کردەوە کە "دەبێ هەرچی زووە سەرنج بخرێتە سەر بەهێزکردنی ژێرخانی لاوازو بێ‌توانای ئێستا."[19] ئەم گرووپە بۆچوونەکانی خۆیان لە کۆنفرانسی گاجەرەدا کە بە سەرۆکایەتیی هووەیدا پێکهات، گەلاڵە کردو هێنایانە گۆڕێ‌و بە کەلکوەرگرتن لە نموونەو هاوسەنگییە ئابوورییەکان‌و بە پشت‌بەستن بە پێش‌بینییە ئامارییەکان، گەیشتنە ئەو ئاکامە کە لە هەلومەرجی ئێستادا، ناتوانین‌و نابێ بوودجەی دەوڵەت زۆر زیاد بکەین. ئەوان خوازیاری زیادکردنێکی

ماقووڵو مامناوەندی بوون. دەیانگوت سەرخانی لاوازو ناسکی ئێران خۆی لەبەر سەرمایە دانانێکی زۆر زیاتر ڕاناگرێ. زیادکردنی لەنەکاوی بوودجەی دەوڵەت دەتوانێ مەترسیدار بێ. دەیانگوت هاتنی لەنەکاوی ڕادەیەکی زۆرتری کاڵا گرێپووچکەی ئابووریی زۆرترو مەترسیدارترمان بۆ دروست دەکا. یەکێک لەو لێکۆڵەرانە کە ناوی مەزلوومیان بوو لەوەش زیاتر ڕۆیشتو ئیددیعای کرد کە ئەگەر دەوڵەت هەموو داهاتی نەوت خەرج بکا، لە ئێراندا شۆرش ڕوو دەدا.[١]

هووەیدا سەرەتا دژی بۆچوونەکانی ئەو گرووپە بوو. دەیگوت دەتوانین بێتوانایییە سەرخانییەکان بە دروستکردنی خێرای ڕێگاو بەندەری تازە لەنێو بەرین. لەو بوارەدا ئاماژەی بە دوو قۆنتەراتچی کردکە هەم بە گەندەڵییماڵی بەناوبانگ بوون، هەم بەوە کە دەتوانن پرۆژەی گەورە لە زووترین کاتدا تەواو بکەن. هێندێک لەوکەسانەی لە کۆبوونەوەکە بوون ئاماژەی هووەیدا بەناوی ئەو دووکەسەیان، - بەتایبەتی لەو بارەیەوە کە هووەیدا بۆخۆی بە بەربەرەکانی دژی گەندەڵی بەناوبانگ بوو-، پێ سەیرو هەرلەو کاتەدا مانادار بوو. دەیانگوت مەبەستی هووەیدا بە ڕواڵەت پێداگرتن لەسەر ئەو خاڵە بوو کە دەوڵەت حازرە لە بەرامبەر ئەنجامی خێراو بەوەختی پرۆژەکانی ئاوەدانیدا، چاوپۆشی لە ڕادەیەکی دیاریکراو لە گەندەڵیی ماڵییش بکا.[١] بەڵام بە پێچەوانەی بۆچوونەکانی هووەیدا، ئەو دەستەیە لە پسپۆڕانی بەرنامەداڕشتن کە دەگەڵ مەزلوومیان هاوڕا بوون هەروا دژی سیاسەتی خەرجکردنی هەموو داهاتی نەوت بوونو سیاسەتێکی وایان بۆ دوارۆژی وڵات بە مەترسیدار دەزانی.[٢] لە ڕاستیدا هەر لە سەرەتای سەرۆک-وەزیرییەکەیەوە زۆرجار لە خۆبەخۆیایەتیدا ئەو قسەیەی جارێک بە باڵیۆزی ئەمریکای گوتبوو، دووپاتە دەکردەوە. ساڵی١٣٤٦، هووەیدا لە وتووێژێک دەگەڵ ئارمەن مایردا، گوتبووی: "شا دەیەوێ بەخێراییەک کە واقیعبینانە نیە وڵات بەرەوپێش بەرێ، لەحاڵێکدا بۆخۆی [واتە هووەیدا] لێبڕاوە پەیڕەوی لە خێراییەکی ماقووڵو لەسەرەخۆ بکا."[٣] لە گاجەرەش زۆر لە ڕاوێژکارانو لێکۆڵەرانو بەرنامەڕێژانی ڕێکخراوی بەرنامە ڕاست

ئەو خێراییە لەسەرەخۆیەیان ڕاسپاردبوو.

پێشنیارو پەسندکراوەکانی کۆنفرانسی گاجەرە بۆ بڕیاری یەکجاری لە کۆبوونەوەیەکدا لە ڕامسەر درانە شا. ئەم کۆنفرانسە ڕۆژی دەی گەلاوێژی ١٣٥٢ دەستی پێکردو دوو ڕۆژی خایاند. شا، لەحاڵێکدا قامکەکانی هەردوو دەستی لە گیرفانی جلیسقەکەی ڕاکردبوون و قامکە گەورەی هەردوو دەستانی لە حەوادا دەجووڵاندن، کۆبوونەوەکەی بە باسی ئەم نوکتەیە کردەوە کە، دیارە لە بارەی بەرنامەڕێژییەکانی دوارۆژەوە، بۆخۆی لەکاتی پێویستدا، ڕێنوێنیی پێویست دەردەکا. گوتی چونکە ئێوە بەهەرحاڵ لەم بوارەدا کارگەلێکتان کردوە، وەرن قسەکانتان بکەن.[٤٩] بەوحاڵە، تەنیا پاش بیستنی چەند بەشێک لە چەند ڕاپۆرت، بەئاشکرا توورە بوو. گاڵتەی بە ئابووریزانەکان کردو بە ڕاشکاوی گوتی دەوڵەت دەبێ فکری خێرایی مامناوەندیی هەڵدان بە یەکجاری لە سەری خۆی بەرێتە دەرێ. پێی داگرت کە ئەوەی پێشتر بۆخۆی گوتوویە جێبەجێ بکرێ، و پێشتریش پێی داگرتبوو کە دەوڵەت بەکردەوە دەبێ هەموو داهاتی نەوت خەرج بکا. هەرچەند کارناسانی ڕێکخراوی بەرنامە، و دیارە هووەیداو وەزیرانی دیکەی کابینە کە لە کۆبوونەوەکە بوون، هەموویان دەیانزانی کە ئەو سیاسەتەی پێشنیار کراوە جگە لە"ئاوسانی دووچەندان"* بەرهەمێکی نابێ، ئەگەرچی دەیانزانی سیاسەتێکی بەڕادەیەک مەترسیدارو شۆرشخوڵقێنە، بەلام هەموو بێدەنگ بوون، هووەیدا هیچ بەرەنگارییەکی نەکرد. وەزیرانی کابینەکەشی هەموو بێدەنگییان هەڵبژارد. هێندێ لەو کارناسانە ئەمڕۆ دەڵێن هووەیداو وەزیرانی کابینەکەی دەبوو هەر لەو کۆبوونەوەیەدا دەستیان لەکار کێشابایەوە. هەرلەوکاتەدا، پێموایە بە دروستی دەڵێن کە سەرۆکانی وڵات "ناتوانن ئیددیعا بکەن کە لە بارەی ئاکامە چاوەڕوانکراوەکانی ئەوسیاسەتەوە کە گرتبوویانە پێش وشیارکردنەوەی پێویستیان پێ-نەدراوە."[٥٠]

---

* Hyper-Boom.

خەرمانانی ١٣٥٤، لە کۆنفرانسێکدا کە بە خەرجی دەوڵەتی ئێران‌و بە هەوڵی دامەزراوەی ئاسپن* پێکهات، هووەیداو هێندێک لە خاوەن-سەنعەتەکان، بانکداران، سیاسەتمەداران‌و لێکۆڵەرانی زانستە کۆمەڵایەتییەکانی ئێران** هەوڵیان دا لەلایەک دەسکەوتە ئابوورییەکانی ئێران لە دەیەی ئاخردا لە ڕوانگەیەکی مێژووییەوە هەڵ-سەنگێنن‌و نیشان بدەن‌و هەرلەو کاتەدا، لەلایەکی دیکەوە، ڕووکێنشێکی تیئۆریکی بۆ ئەو حوکم‌و فەرمانانە دروست بکەن کە شا دەری کردبوون. ئەمجارە هووەیدا بە زمانی شارەزایەکی گەش‌بینی کۆمەڵایەتی دەدوا. ئیددیعای دەکرد کە ، "ئەگەر زانیاریی تەواومان لە دەستدا بێ‌و ئەگەر بتوانین ڕادەی ویستی ئینسانییش بقەبڵێنین، ئەودەم دەتوانین پاشەڕۆژ نەک‌هەر پێش‌بینی بکەین، بەڵکوو بەشێوەی دڵخوازیش ڕێکی بخەین." ئەمجار باسی هەڵدانی داهاتی سەرانەی ناخالیسی نیشتمانیی کرد کە ساڵی١٣٤٢سەد دۆلار بووەو قەرارە ساڵی١٣٥٦ بگاتە٢٠٦٩ دۆلار. ئاماژەی بە زیادبوونی ژمارەی ناوەندەکانی فێرکردنی بەرز کرد. گوتی ئێران ساڵی١٣٥٢ تەنیا دە کۆلێژی هەبووە، لەحاڵێکدا ساڵی١٣٥٥ ئەو ژمارەیە گەیشتۆتە ١٨٤. ئاماژەی بەژمارەی خوێندکاران کردو گوتی: "ئێستا، پتر لە چوارسەد هەزار خوێندکاری ئێرانی لە ئورووپاو ئەمریکاو شوێنەکانی دیکەی جیهان خەریکی دەرس‌خوێندنن."[٢٦]

بەشداربووە ئێرانییەکانی دیکەی کۆنفرانس دەربارەی ئاڵوگۆڕو پێشکەوتنەکانی ئێران لە بواری سەنعەت‌و کشتوکاڵدا دوان. یەکێک باسی ئەوەی کرد کە، "پاییزی ساڵی ١٣٤٢ خێرایی هەڵدانی بەشی سەنعەت پێنج لەسەد بووە، بەڵام ساڵی١٣٥٣ گەیشتۆتە بیست لەسەد."

---

* Aspen.

** لە هەلومەرجێکدا کە لەجێگایەکی دیکە بە درێژی باسم کردووە، ئەمنیش وەک مامۆستای زانکۆ لەو کۆنفرانسەدا بەشدار بووم. بۆ ئاگاداربوون لە درێژەی داستانەکە بڕوانە:

Abbas Milani.Tales Of Cities: A Persian Memoir. New York,1998

سەنعەتی ترومبێلسازی‌یان وەک نموونەی سەرکەوتووی "بەهێزکردنی سەنعەتە خۆماڵییەکان" هێنایەوە.[٢٧] یەکی دیکە لە وتاردەران، ئاماژەی بە دەسکەوتی گەورەی ژنان لە مەیدانی پەروەردەو فێرکردندا کرد. گوتی ساڵی١٣٢٦ لە ئێران تەنیا ٧٨٤٠ خوێندکاری کچ هەبوو، لە حاڵێکدا ساڵی١٣٥٣ ئەو ژمارەیە گەیشتۆتە ٣٢٧٧٥٧خوێندکاری کچ.[٢٨] لە سێبەری وێرانە پرشکۆکانی تەختی جەمشیددا، ئێرانییەکان بە شانازی‌و سەربەرزییەوە ئاماژەیان بەو ئاڵوگۆڕە بەرچاوانە دەکرد کە لە دەساڵەی دواییدا لە ئێران وەدی هاتبوون‌و ئابوورییەکی دواکەوتووو هەژاریان کردبووە یەکێک لە زیندووترین وڵاتانی قاڕەی ئاسیا. لە ڕاستیدا وتاری هووەیدا جۆرێک خڕکردنەوەی ئەو کاناڵە جۆراوجۆرانە بوو. لە ڕیوایەتێکی ڕێکوپێکدا شێوەو مانای بە ئەژمارەو ئامارە پەرش‌وبڵاوەکان دەبەخشی. گرنگترین باسی تیئۆریکی هووەیدا دەتوانین لە ڕەخنەی توندو بەئاماژەی لە نیزامی سەرمایەداریی ڕۆژئاواو نیزامی شووروەویدا وەبینین. گوتی: "ئێمە ئیمپەڕاتۆرییە بۆڕۆکراتیکەکانمان... دیتوە کە چۆن مرۆڤە ئیدئۆلۆژیکەکان‌و مرۆڤە تەکنۆلۆژیکەکان لەنێوان ناهومێدییەکی وێرانکەرو هومێدێکی بەدرۆی (حەللاجووقەیی) پانگلاسیدا* دێن‌و دەچن. ئێمەش نەکهەر بەهەق، بەڵکوو بە ئەرکی خۆشمان دەزانین کە ڕێگای دواڕۆژی خۆمان بۆخۆمان ببینینەوە."[٢٩] هووەیدا بە جەختکردن‌و دووپاتەکردنەوە ئەوەشی وەبیرهێنایەوە کە لەو ڕێگایەدا، ڕێبەرو پێشڕەوو فەرماندەر شا بووەو[ ]هەرئەویش دەبێ.

دیارە شا لەو ساڵانەدا زیاتر لە پێشووش دڵنیا ببوو کە قازانجەکانی ئێران لە هەمووکەس باشتر دەناسێ. لە کۆبوونەوە ئابووری‌و سیاسییەکاندا، زۆرتر، هەموو باسێکی جیددی یان ڕەخنەگرانەی بە هێنانەگۆڕی تێکەڵ بەهەڕەشەی ئەو پرسیارە تەواو دەکرد کە: "چما کتێبی ئێمەتان لەو بوارەدا نەخوێندۆتەوە."[٣٠] هەتا نیوەڕاستی دەیەی

---

* Panglassian.

پەنجا سێ کتێبی نووسیبوون. ناوی یەکیان مەئموورییەت بۆ نیشتمانم (١٣٤٠)، هی دووەمیان شۆرشی سپی (١٣٤٦)و هی سێیەمیان بەرەو شارستانەتیی مەزن بوو. لەم سێ کتێبەدا کەموزۆر لە هەموو ئەو بوارانەدا کە بە فکری گەیشتبوون بیروڕای دەربڕیبوو. ئەو ئیدی بەڕاستی حاڵەتی پێغەمبەرێکی بەخۆوە گرتبوو. دەتگوت هاتوە مێگەلێکی سەرلێشێواوو ڕێلێونبوو بگەیەنێتە شوێنی مەبەست. ئەو حاڵەتە بە باشی دەتوانین لە وێنەیەکدا ببینین کە ئەو ڕۆژانە لە زۆر ئیدارەی دەوڵەتیدا بە دیوارەوە دەبینرا. زەردەخەنەیەکی جیددیی لەسەر لێوان بوو. لەسەر کۆمایەک هەور ڕاوەستابوو. دەستەکانیی بەرەو حەوا ڕاگرتبوون، دەتگوت دەیەوێ بە دەستڕاوەشاندنێک مۆجیزەی خۆی نیشان بدا.

به پێچەوانەی ئیددیعای زۆربەی نەیارانی شا کە لە تەواوی ئەو سەردەمەدا بەڕاشکاویو پێداگرتنەوە ئەویان بە"نۆکەری ئیمپەریالیزم" ناو دەبرد، بە باوەڕی من هێندێ بەڵگەی حاشاهەڵنەگر نیشان دەدەن کە لە سەرەتای دەیەی چلەوە سیاسەتێکی دەرەوەو سیاسەتێکی نەوتیی تاڕادەیەک سەربەخۆی گرتبووە پێشو لە زۆر بواری گرنگدا دەگەڵ باوەڕپێکراوانو پشتیوانانی ڕۆژئاوایی خۆی لە کێشەو ململانەدا بوو. بەڵام نەگبەتیی شا لەوەدا بوو کە لەلایەک لە ئاواتو ئامانجەکانیدا بەرزەفریی نیشان دەداو لەلای دیکە لە کەلک-وەرگرتن لە ئامرازە پێویستەکان بۆ وەدیهێنانی ئەو ئامانجانەدا ترسەنۆک بوو. دەتوانین بە کۆمەگوەرگرتن لە زاراوە باوەکانی دەروونناسی، ئەو بەمانای وردی وشە بە کەسایەتییەکی دەسەڵات-پەرست* بزانین. بە جۆرێکی وردتر بڵێین، دەگەڵ بێدەسەڵاتانو ژێردەستان ملهوڕو بەفیز بوو، لە بەرامبەر کەسانێکیشدا کە بە دەسەڵاتداری دەزانین لاوازیو زەبوونیی نیشان دەدا. کاتێک هەستی بە دەسەڵات دەکرد، دەتگوت ئیدی بەندەی هیچ خوایەک نیە. بە لێبڕاوی

* Authoratarian.

حوکمی دەداو لە بڕیارداندا دوودڵیی بە ڕەوا نەدەزانی. بەرامبەر بەوە، هەرکە متمانەی بە خۆی نەدەماو لاوازی بە سەریدا زاڵ دەبوو، ئەودەم ئیدی گوێڕایەڵی هەموو کەس دیاریی دەکردو نەیدەتوانی چووکترین بڕیار بدا. ئەم تایبەتمەندییانەش هەموو بە سروشتی کەسایەتیی دەسەڵاتپەرست دەژمێردرێن. وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئەمریکا ئەوی بە "کەسایەتییەکی پێچەڵپووچو پڕلە ناتەبایی" دەزانیو لەودا "تێکەڵاوێکی پێشبینینەکراو لە دەستنەرمیو دڵڕەقی"ی بەدی دەکرد."[21] لە ڕاپۆرتێکی دیکەی باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە ئێراندا هاتبوو کە حاڵەتی خەمۆکیی[شا] لە ڕابردوودا متمانە بەخۆبوونی بە تەواوی لێ ئەستاندبوو."[22] لە هەمووی خەراپتر ئەوە بوو کە وەختێک مەسەلەی دیموکراسیی ڕاستەقینە لە ئێراندا دەهاتە گۆڕێ، شا بە هیچ جۆر گوێی بۆ نەدەگرت. جگەلەوە، بە زیادبوونی نرخی نەوت، ئەو ئیدی پێویستیی بە یارمەتییە ماڵییەکانی ڕۆژئاواش نەبووو دەیتوانی بە کەیفی خۆی، هەم سیاسەتی خۆشگوزەرانییەکی بەربڵاو بەڕێوە بەرێو هەم سوپا بەو جۆرەی بۆخۆی دەیەویست بەهێزو پڕچەک بکا. یەکێک لە سیاسەتە خۆشگوزەرانییەکانی ئەودەم خوێندنی خۆڕایی لە سەرەتایی، ناوەندیو زانکۆو بیمەی دەرمانی خۆڕایی، بیمەی کۆمەڵایەتیی بەربڵاوی تازەو خواردنی خۆڕایی بۆ هەموو قوتابییان بوو.[23] هەرچی ئەو سیاسەتانەو سەرکەوتنیان بەربڵاوتر دەبوو، وەڵامی شا بۆ هەواڵنووسە بێگانەکان لە بارەی دیموکراسییشەوە لووتبەرزانەترو بێموبالاتانەتر دەبوو. جاری وابوو بە ڕاوێژێک کە بۆنێکی ڕەگەزپەرستییشی لێدەهات، دەیگوت دیموکراسیی دنیای چاوشینەکان بە کەلکی خەڵکی ئێران نایە. دەیگوت: "هەڵەیە ئەگەر بڵێین دەکرێ دیموکراسیی ڕۆژئاوا بە شێوەی ئۆتۆماتیکی بگوازینەوە بۆ وڵاتێکی وەک ئێران." باوەڕی پتەوی هەبوو کە ئەگەر ڕۆژێک لە ئێران ڕاپرسییەکی گشتی لە بارەی شێوەی ڕێبەرایەتیی ئەوەوە بکرێ، هەموو خەڵک، جگەلە کەمایەتییەکی زۆرکەم لە ئێرانییە کەجڕەفتارەکانی دەرسخوێندووی ئەمریکاو ئینگلیس "پشتیوانی لە خۆیو شێوەی حکوومەتەکەی دەکەن."[24]

بە باوەڕی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، یەکێ دیکە لەو هۆیانەی شوێنیان لەسەر شێوەی بڕیاردانی شا دادەنا چەندوچۆنی رادەی دەرسخوێندنەکەی بوو. لە ڕاپۆرتێکدا دەیانگوت خوێندنی شا لە "دەورانی ناوەندی لە سویسو کۆلێژی ئەفسەری لە ئێران"دا بەرتەسک بۆتەوەو بۆیە، لە کاتی بڕیارداندا، "هێندێ جار لە دانی بڕیاری ئاقڵانە ناکام دەبێو زۆرتر ناچار دەبێ بڕیاری سۆزدارانە (عاطفی) بدا."[٢٥٠] نیشانەکان هەموو دەردەخەن کە شا مرۆڤێکی شەرمێون بوو، بە دەگمەن تەماشای چاوی کەسێکی دەکرد. زۆرجار لە کاتی وتوویژێکدا، لەنەکاو چاوی لەسەر جێیەکی دوور بە مۆلەق دەوەستا. حەزی لەوە بوو خۆشیان بوێ. ئیشتیای بۆ خۆشویستن بێکۆتایی بووو هەر ئەو ئیشتیایەش، گیانی دوورڕووییو جامەلووسکەیی لە دەوروبەرەکەیدا بەهێز دەکرد. بێگومان ئەو ئیشتیایە لە پادشایاندا زۆر مەترسیدارەو خۆش ئەوەیە ڕێنوێنو موڕادی هووەیدا، عەبدوڵڵای ئینتیزام باشتر لە هەمووکەس سروشتو مەترسییەکانی ئەو جۆرە حەزانەی بۆ شا ڕوون کردبۆوە. دەڵێن ئەوڕۆژەی ئینتیزام لە پۆستی بەڕێوەبەری کومپانیی نەوت لادرا، ڕووی لە شا کردو گوتی: "هیچکەس نەیوێرا قسەی درۆ بە بابی تۆ بڵێ، لە حاڵێکدا هیچکەس ناوێرێ قسەی ڕاست بە تۆ بڵێ." لە کۆنفرانسی ڕامسەردا، زۆرکەس هەبوون کە حەقیقەتیان دەزانی، بەڵام کەس نەبوو بوێرێ بەیانی بکا. هیچ کەس هەقی بەخۆی نەدا بە شا بڵێ شەڕ دەگەڵ ڕاستییە سەرسەختە ئابوورییەکان ناکرێ.

دیارە سیاسەتمەدارانی ئێران تەنیا کەسانێک نەبوون کە ملیان بۆ حەزی ڕۆژلەڕۆژزیاتری شا لە جامەلووسکەیی ڕادەکێشا.[٢٦] هەمیشە ڕۆژنامەنووسانو وێنەگرانو نووسەرانێکی زۆری ڕۆژئاوایی چاوەڕوان بوون تا لە بەرامبەر هەقدەستێکی "گونجاو"دا، بە شا هەڵڵا بڵێنو لە بارەی سروشتە جوانە ئەخلاقیو سیاسییەکانیەوە وتارو پەخشان بنووسن. تەنانەت دەوڵەتانی دەرەوەش هێندێ شێوەی تایبەتیی ئەو جامەلووسکەییەیان بەکار دێنا. ئینگلیسییەکان دەیانزانی کە شا خۆی بە

هاوسەنگی دوگول دەزانیؙو زۆری حەز لێیە دەگەڵ دوگول بەراورد بکرێ، هەربۆیە لە دەرفەتگەلی گونجاودا، کاربەدەستانی دەوڵەتی ئینگلیسیش تەسلیمی ئەو ئارەزووە دەبوون. نموونەیەکی دیکەی ئەو کارە دەتوانین لەنێو ئەمریکاییەکاندا ببینین. ژانوییەی ١٩٥٨، وەزیری کاروباری دەرەوەی وەختی ئەمریکا، جان فاستردالێس نامەیەکی بۆ ئایزەنهاوێر نووسیؙو پێیگوت کە، "زۆر باش دەبێ ئەگەر وەختی هاتنی شا بۆ واشنگتۆن، ئێوەو هێندێک لە کاربەدەستە پایەبەرزەکانی وەزارەتی دیفاع لە بارەی مەسەلە نیزامییەکانەوە کە زۆریان حەز پێ‌-دەکا، وتوویژی دەگەڵ بکەن. داوای لێبووردن دەکەم کە ئێوە تووشی ئەوکارە دەکەم، بەلاّم چونکە سەفەرەکەی نارەسمییە، وتوویژێکی ئەوتۆ پێویستیی بە ڕێورەسم یان ئامادەکردنێکی زۆر نیە. لە بەرامبەردا شاش لەوە کە ئێوەلە بارەی مەسەلە نیزامییە تازەکانەوە ئاڵوگۆڕی بیروڕای دەگەڵ دەکەن هەست بە شانازییەکی زۆر دەکا."[٢٧] هەشت ساڵ دواتر، لە ئامادەکردنی سەفەرێکی دیکەی شا بۆ ئەمریکادا، باڵیۆزی وەختی ئەمریکا لە ڕاپۆرتێکدا نووسی کە: "شا خۆی بە سیاسەتمەدارێکی جیهانی دەزانیؙو ئەگەر لە بارەی وەزعی نێونەتەوەییەوە باسی دەگەڵ بکەنؙو ئاماژەیەکیش بە مەسەلە نهێنییەکان بکەن، شانازی بەخۆیەوە دەکا."[٢٨] هەر لەو سەفەرەدا پێشنیار بە جانسۆن، سەرکۆماری ئەوکات کرابوو کە، "لە بارەی مەسەلە نێونەتەوەییەکانی دیکەوە قسە دەگەڵ شا بکەنؙو وا نیشان بدەن کە لەو بوارانەدا متمانەی پێ‌دەکەن."[٢٩]

لەم ساڵانەدا، تەنانەت ڕاوێژی ڕاپۆرتەکانی سیا لەبارەی ئێرانیشەوە بەشێوەیەکی سەیر گۆڕا. لەحاڵێکدا لەسەرەتای دەیەی چلدا، ئەوڕاپۆرتانە هەمیشە هوشداریان دەدا کە ئێران بەرەو بێ‌-سەرەوبەرەییؙو شۆڕش دەڕوا، ساڵی١٣٥٦ هەر ئەوڕێکخراوە ئیدیعای دەکرد کە، "ئێران لەژێر ڕێبەرایەتیی شادا دیارە سەقامگیر دەبێ. شا کە لەدەیەی ڕابردوودا ڕۆژبەڕۆژ پتر متمانەی بەخۆی پەیدا کردوە، کەمترو کەمتر گوێ دەداتە پێشنیارەکانی ئەمریکاو ئامۆژگاریی ڕاوێژکارە نێوخۆییەکانی."[٤٠]

شا نوقمی دەریایەک جامەلووسکەیی بووو تا دەهات لەخۆبایی-بوونو خۆبەزلزانییەکەیو باوەڕی بەدروستیی بۆچوونەکانی خۆی زیادی دەکرد. ئەگەر ئەوقسەیەی خاوەننەزەران قبووڵ بکەین کە یەکێک لە هۆیەکانی شۆڕشی ئیسلامی هەوڵی بەپەلەی شا بۆ نوێ-کردنەوەی کۆمەڵ بوو، ئەگەر ڕاست دەکەن کە بێتوانایی سەرخانی ئابووریی ئێران بۆ وەرگرتنی کالاو سەرمایە ئاگری شۆڕشی خۆشتر کرد، ئەودەم دەگەینە ئەو ئاکامە کە کۆنفرانسی ڕامسەر، و بێموبالاتیی شا بە بیروبۆچوونی ڕاوێژکارە ئابوورییەکانی یەکێک لە نوختە گۆڕانەکانی مێژووی هاوچەرخی ئێران بوو. هەرلەوکاتەدا، ئەگەر لەو کەسانە بین کە دەڵێن زۆر بڕگە هەبوون کە هووەیدا دەبوو حەتمەن دەست لەکار بکێشیتەوە، دەبێ کاتی تەواوبوونی کۆنفرانسی ڕامسەر بە یەکێک لەو بڕگانە بزانین. دەزانین کە هووەیدا بە بەرنامەیەکی بەردرێژی هەڵدانو گەشەکردنەوە هاتە سەر کار. پوختەی ئەو بەرنامەیە بەشدارکردنی چینی نێونجی لە دەسەڵاتی سیاسیی شادا بوو. هەڵدانی خێرای ئابووریی ئێران بێگومان ڕادەو دەسەڵاتی چینی نێونجیی ئێرانی زیاد کرد. لەلایەکی دیکەوە، شا بڕیاری پێوەندیدار بە چۆنیەتیی ئەو ئاڵوگۆڕانەیەوە بەشێوەیەکی یەکسەر ملهوڕانە دەردەکردن. دووریش دەهاتە بەرچاو کە لە داهاتوویەکی نیزیکدا مل بۆ داخوازە سیاسییەکانی ئەوچینە ڕاکێشێ. لە ڕاستیدا، شا نەکھەر دژی بەشدارکردنی چینی نێونجی لە دەسەڵاتدا بوو، بەڵکوو حازر نەبوو هووەیداش پاش چەندین ساڵ خزمەتی دڵسۆزانە، لە دەسەڵاتدا بەشدار بکا. بە وتەی ڕیچارد هێلمز، کە وەختێک سەرۆکی سیاو دواتر باڵیۆزی ئەمریکا لە ئێران بوو، "هەیئەتی دەوڵەت، لەژێر چاوەدێریی هووەیدادا، تواناو بنیاتی پێویست بۆ بڕیاردانو سیاسەتدانانی پەیدا کردوە...بەڵام دیارە بەو مەرجە شا ڕێگا بدا. لە ساڵی١٣٤٢ بەدواوە، شا ڕۆژبەڕۆژ زیاتر بە شێوەی ڕاستەوخۆ دەستی دە مەسەلەو بڕیاری ڕۆژانەی دەوڵەت وەرداوەو ئیدی حازر نیە دەسەڵاتی خۆی بدا بە خەڵکی دیکە."[٤١٠] هووەیداو هاوڕێ تەکنۆکراتەکانی دڵیان بەوە خۆش کردبوو کە

هەڵدان و خۆشگوزەرانیی کۆمەڵایەتی سەرەنجام شای هان دەدەن، بگرە ناچاری دەکەن، دەسەڵات دابەش بکا. بەڵام کۆنفرانسی ڕامسەر بە ئاشکرا نیشانی دا کە ئەو هیوایە خەیاڵێک زیاتر نەبووە. یەکێک لە هۆکارە گرنگەکانی شکستی تەکنۆکراتەکانی ئێران لەو گرەوە مێژووییەدا گۆڕانێک بوو کە لە هووەیدادا دەرکەوت. ئەو بەهیواو مەبەستی دروستکردنی بنیاتی پێویست بۆ پەرەپێدانی دیموکراسی لە ئێراندا هاتە سەر کار. بەڵام دوای ماوەیەک باق و بریق و هەوەسی دەسەڵات سێبەری خستە سەر ئەو ئامانج و ئارەزووانە. لەلایەک، زۆربەی دژبەرانی شا سیاسەتی ڕووخاندنی نیزامی دیکتاتۆریی‌یان گرتە پێش. هەموو هەوڵی خۆیان بۆ لەنێوبردنی ڕێژیم بەکار دێناو هیچجۆرە سازانێکیان قبووڵ نەبوو. لە بەرامبەردا، سیاسەتی هووەیداش کە لەسەر ملکەچیی بێ‌ئەملاوئەولا لە بەرامبەر شادا دامەزرابوو، بە مەترسیدارو زیانبەخش دەرچووو بەپێچەوانەی گومانی هووەیداو هاوکارەکانی، نەگەیشتە دیموکراسی.



ئەگەر قبووڵ بکەین کە کۆنفرانسی ڕامسەر نوێنگەی ئەو ملهوڕییە لە بواری ئابووریدا بوو، ئەودەم دەبێ بڵێین کە بواری سیاسەت تەنانەت لە ئابووریش پتر مەیدانی ئەو سەرەڕۆییە بوو، و فەرمانی بە ڕواڵەت لەنەکاوی شا دەربارەی دامەزراندنی سیستمی تاکحیزبی لە ئێراندا دیارترین دیمەنی ئەو زۆردارییە تاکەکەسییە سیاسییە بوو. بە وتەی هێلمز، فەرمانی دامەزراندنی حیزبی تازە، "لە پاییزی تەمەنی پادشایەکی سەرەڕۆدا" دەرچوو. هێلمز دەڵێ، بە دامەزراندنی نیزامی تاکحیزبی ئیدی لە ئێران بە ڕواڵەتیش هێزێکی، دژبەر، بەڵام وەفادار بە ڕێژیمی شا نەماوە. بە لەبەرچاوگرتنی ئەم ئاڵوگۆڕانە، ئیدی ناتوانین ئومێدێکی ئەوتۆمان بە دروستبوونی حکوومەتێکی دیموکرات هەبێ."[٤٠] ئەوەی هێلمز وەک ئاکاموەرگرتنی خۆی لەو ڕاپۆرتەدا نووسیبووی لە

ڕاستیدا جۆرێک پێشوێژیی وردی ڕووداوەکانی دواتری ئێران بوو* هێڵمز پێی وابوو، " لە ماوەی پێنج تا دە ساڵی دواتردا شا، یان بە دڵخوازی خۆی هێزەکانی دیکە لە دەسەلاتدا بەشدار دەکا، یان ناچاری دەکەن ئەوکارە بکا. ئەگەر لە ماوەی شەش‌حەوت ساڵی داهاتوودا، قەیرانێک لە بارەی دانانی جێنشینی شاوە دەرکەوێ، ئەنجومەنی پادشایەتی دەتوانێ تا ماوەیەک کاروباری وڵات ڕاپەڕێنێ، بەڵام هەرلەو کاتەدا ئەگەر هێزە دژبەرەکانی خوازیاری ئاڵوگۆڕ قازانجی گرووپەکانی خۆیان وەپێش تەواوەتیی خاک یان ئەمنیەتی ئێران بخەن، ئەودەم بۆشاییەکی خەتەرناکی دەسەلات پەیدا دەبێ."[430] چارەنووسی حیزبی "ایران نوین" (ئێرانی نوێ) نیشانی دەدا کە شا هیچ جۆرە شەریکە دەسەلاتێک تەحەممول ناکا.

حیزبی "ایران نوین" لەجێدا بە فەرمانی شا دامەزرا. بەلام ساڵی ١٣٥٤ ڕێکخراوێکی بەهێزی هەبوو و لەژێر دەستی هووەیداشدا بوو. سەرنج ڕاکێشیی حیزب لەوەدا بوو کە، "نێردیوانی پێشکەوتنی ئەندامەکانی بوو. هەرلەو کاتەدا، حیزب ببووە هۆی بەربلاویی دەسەلات و نفووزی ڕێبەرەکانی، بەتایبەتی هووەیدا. ڕێکخراوی حیزب لە سەرانسەری وڵاتدا پێوەندییەکی پتەوی دەگەڵ بنیات و ئیدارە ناوچەییەکان هەبوو و هەرلەو کاتەدا دەگەڵ دەزگا ئەمنیەتییەکانیش لە پەیوەندیی نیزیکدا بوو. حیزب کاروبارێکی زۆری دەوڵەتیی لەبەر

* هێلمز لە ڕاپۆرتی "کۆتایی خزمەت"ی خۆیدا بە چاکی نیشانی دا کە تێگەیشتنێکی ڕوونی لە مەسەلەکانی ئێران هەبوو. لەوێدا نووسیبووی" "ناتەبایی نێوان هەڵدانی خێرای ئابووری و نوێکردنەوەی وڵات دەگەڵ حکوومەتی هەروەک جاران سەرەڕۆی شا گرنگترین ناڕوونی لە دواڕۆژی ئێراندایە. ئەگەر ئەو ناتەباییە نەبوایە، دواڕۆژی ئێران تەواو ڕوون و جێی ئومێد دەبوو. بەڵام بەداخەوە ئەگەر مێژووی دیکتاتۆرەکانی ڕابردوو لە دواساڵەکانی ژیانیاندا بکەینە پێوانە،جێی ئومێدێکی زۆر نیە. ئەمن لەم مێژووەدا تووشی تاقە حاڵەتێکیش نەبووم کە لەودا حاکمی موتڵەق بە دڵخواز بەشێک لە دەسەلاتی خۆی وەلا نابێ. بڕوانە:
us Embassy. "End of Report: Ruchard Helms" NSA, No.979.

دەستدا بوو کە هەرکات پێویست بایە وەک پاداش دەیدان بە ئەندامەکانی خۆی. لە ڕاستیدا، ئەم دواییانە تەواوی پۆستە گرنگەکانی وڵات بەدەست ئەندامانی حیزبەوە بوون. ئەم هۆیانە دەستیان وەدەستی یەک داو دەسەڵاتێکی ڕاستەقینەیان بەحیزب بەخشی."[40]
عەلەم لە یادداشتەکانی خۆیدا زۆرجار دەردی دڵ لە وەزعی حیزبی "مردم" (خەڵک) دەکاو دەڵێ زۆر هۆی جۆراوجۆر نایەڵن ئەم حیزبە نەخشی خۆی وەک حیزبی ئۆپۆزیسیۆن بە باشی یاری بکا. دیارە گوناحی ئەوکارە یەکسەر دەخاتە ئەستۆی هووەیدا. دەڵێ ئەو هەمیشە لە فکری پیلانگێڕاندایەو جگە لە پەرەپێدانی دەسەڵاتی خۆیو پەک-خستنی کاری حیزبی ئۆپۆزیسیۆن ئامانجێکی نیە. بەڵام نێوەرۆکی یادداشتەکانی عەلەم زیاتر لە هەموو شتێک ئەو ڕاستییە پشتڕاست دەکاتەوە کە شاش ڕەخنەی حیزبی کەمایەتی، یان هیچ حیزبێکی دیکەی قبووڵ نەکردوە. ئەوەی عەلەم خۆی لە بارەی چارەنووسی یەکێک لە ڕێبەرانی حیزبی "مردم"ەوە دەیگێڕێتەوە نموونەی بەرچاوی ئەو بێ سیکەدانەییەیە. عەلەم دەڵێ، شا بە تووڕەیی ڕێبەری حیزبی "مردم"ی لەسەر کار لابرد چونکە پێی لە بەرەی خۆی زیاتر ڕاکێشابووو گوتبووی هەڵبژاردن لە ئێراندا بەتەواوی ئازاد نیە.

هووەیدا باش دەیزانی کە مانەوەی لە پۆستەکەیدا لە گرەوی دروستکردنی پێگەیەکی سیاسیدایە. هەرچەند زۆرجار گوتبووی تەنیا کەس کە ئەوی لەو جێیە داناوە شەخسی شایەو هیچ کەسی دیکە نیە، بەڵام بەکردەوە دەیزانی کە لەجێدا لە ڕێگای حیزبەوە دەتوانێ دەسەڵاتی ڕاستەقینەی خۆی پتەو بکا. شاش لە بەرامبەردا باش لەوە ئاگادار بوو. هەر لە سەرەتای دەستبەکاربوونی حیزبەوە هەوڵی دا ڕێکخراوی حیزب نەبێتە ئامرازی دەسەڵاتی هیچکام لە ڕێبەرانی. هەر بەو مەبەستەش، بەپێی ڕاپۆرتی باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە ئێران، عەتائوڵڵای خوسرەوانیی کە لە بڕواپێکراوانی خۆی بوو، کردە سەرۆکی حیزب.[45] خوسرەوانی لەنێو حیزبدا لایەنگرێکی زۆری نەبوون. زۆری پێنەچوو کە ڕێکخراوی حیزبی "ایران نوین" بوو بە

دوو دەستە. دەستەی یەکەم لە ئەندامانی کۆنی حیزب‌و کۆمەڵی پێشکەوتنخواز پێکهاتبوون. ئەم گرووپە خۆیان بە قوڵی ڕووناکبیر"ی حیزب دەزانی. دەستەی دووەم زیاتر لە تازەهاتووەکان پێک دەهات. جگە لەوە، زۆربەی ئەو کەسانەی لە ڕێگای یەکیەتییە کارتۆنییەکانەوە هاتبوونە نێو حیزب سەر بەو دەستەیە بوون. بە چوونەسەری دەسەڵاتی حیزب، هووەیداش دەسەڵاتی خۆی بەسەر ڕێکخراوەکەیدا سەقامگیر کردو بەکردەوە وەک پێگەیەکی سەربەخۆی دەسەڵاتی خۆی بەکاری دێنا. ڕەنگە هەر ئەو ڕاستییەش بە تەنیا، بەس بووبێ بۆ ئەوەی شا بێتە سەر ئەو ڕایە کە دەبێ حیزب لەنێو بەرێ. دەزانین کە پاش ئەزموونی موسەددیق، شا ئیدی حەزی لە چارەی سەرۆک‌وەزیرێک نەبوو کە پێگەیەکی سەربەخۆی سیاسیی هەبێ. هووەیدا نەک هەر دەسەڵاتی تەواوی بەسەر حیزبی "ایران نوین"دا هەبوو، بەڵکوو سەرەنجام توانی یەکێک لە هاوپەیمانانی خۆشی بکاتە سەرۆکی حیزب. یەکێک لە هاوکارە قسەخۆشەکانی هووەیدا پێچەڵپووچیی پێگە سیاسییەکەی لەو ساڵانەدا بە حاڵەتێکی دووپارچە دادەنا. دەیگوت: "هووەیدا ناتەباییەک لە دەروونیدا هەبوو. لەلایەک ژاردەستی شا بوو. بەڵام لە نێوەڕاستەکانی سەردەمی سەرۆک‌وەزیرییەکەیەوە بۆخۆشی ببووە بنیاتێکی بەدەسەڵات. دوورایی دەسەڵاتەکەی چووبووە نێو هەموو پلەکانی کۆمەڵەوە."[٤٦] بێگومان گرنگترین نموونەی دەسەڵاتی جێگرتووی هووەیدا هەر ئەو دەستڕۆیشتنەی بەسەر ڕێکخراوی حیزبی "ایران نوین"دا بوو.

ساڵی ١٣٥٤، حیزب گەورەترین کۆنگرەی مێژووی خۆی پێکهێنا. پێنج‌هەزار کەس لە چالاکانی حیزب لە سەرانسەری وڵاتەوە بەشداری کۆنگرە بوون. دەوری سەد حیزبی جۆراوجۆری بێگانەش نوێنەریان بۆ ئەوکۆنگرەیە ناردبوو. هووەیدا لە وتارێکی پڕهەستدا پەسنی دەستکەوتەکانی دەساڵی ڕابردووی دا. دیارە چەندین جاریش باس‌و تاریفی ڕێبەرایەتیی زانایانەی شای کرد. ڕەنگە ئامانجی هووەیدا لەو هەموو پێهەڵلاگوتنە ئەوە بووبێ کە دەیەویست هەرجۆرە گومان‌و

ڕەشبینییەکی شا پێش دروستبوونی، برەوینیتەوە. لەوانەیە ویستبیتی لە ڕێگای ئەو قسانەوە کە جاروبار پڕ لە زێدەڕۆیی بوون جەخت بکاتەوە کە حیزب و سەرۆکوەزیر هیچکامیان لە بەرامبەر شادا دەسەڵاتێکی سەربەخۆیان نیە. لەیەک قسەدا، ڕەنگە تاریفی لە شا بە مەبەستی پووچەڵکردنەوەی گومانەکانی شاو فیتنەیی دوژمنانی هووەیدا بووبێ.
بەهەرحاڵ، ئامانجی هەرچی بوو، تووشی ناکامی هات. هێشتا دەنگدانەوەی قسەکانی لە هەوادا مابوو کە شا بە جوولەیەکی خێرا، دەموودەزگای حیزبی "ایران نوین"و حیزبە قانوونییەکانی دیکەی وڵاتی تێکەوە پێچاو لە جیاتیان فەرمانی دامەزراندنی نیزامێکی تاکحیزبیی دەرکرد. تەنانەت بە پێوانەکانی ئەو دەمیش کە زۆرداریو سەرەڕۆیی تێدا باو بوو، ڕەفتاری شا لە بواری سیستمی حیزبیی وڵاتدا سەرەڕۆیانەتر لەجاران دیار بوو. ئەگەرچی گومان نیە کە ئاکامی نیزامی یەکحیزبی لە ئێراندا لە کارەسات بەولاوە نەبوو، بەڵام ڕیشەکانی ئەو بیرەو ناسنامەی کەسانێک کە هەوەڵجار بانگەوازیان بۆی کرد لە پەردەی لیلیو ڕیادا شاردراوەتەوە.
دەزانین کە گرووپێک لە ڕاوێژکارانی شاژن گەڵاڵەیەکیان بۆ وەڕێخستنی ڕاپەڕینێکی نیشتمانی لە ئێراندا ئامادە کردبوو. ئەم گرووپە لە غولامڕەزای ئەفخەمی، ئەمینی عالیمەرد، ئەبولفەزلی قازی، ئەحمەدی قورەیشیو مەنووچێهری گەنجی پێکهاتبوو. بەڵام لەبارەی چەندوچۆنی تێکۆشانی ئەو گرووپە، چۆنیەتیو وردەکاریی گەڵاڵەی پێشنیارکراوو لە هەمووی گرنگتر کاتو پێوەندیی وی دەگەڵ فکری حیزبی"رستاخیز" (ڕاپەڕین) لانی کەم تووشی سێ گێڕانەوەی جیاواز بووم. ئەگەرچی لە کاتی دامەزرانی حیزبدا، زۆر لە ڕووناکبیرانی سەربە ڕێژیم بە خۆڕانانێکی تەواوەوە، خۆیان بە بیردۆزی سەرەکیو یەکەمی حیزب دەزانی، بەڵام ئەمڕۆ، بەهۆی ئاکامە کارەساتبارەکانی ئەم حیزبەوە، ئەم بیرۆکەیە ئیدی هەتیو کەوتوەو ئەو مرۆڤە شەریفانە کەمن کە بێپەرواو بێپەردە، پێ لە نەخشی خۆیان لەو بوارەدا دەنێن.
لەلایەک غولامڕەزای ئەفخەمی ئیدیعا دەکا کە زەمانی گەڵاڵەی

ڕاپەڕین* ساڵی ١٣٥٠ بووه.[٤٧] دەڵێ ئەم گەڵاڵەیە پێوەندییەکی بەو شتەوە نەبوو کە دوایە بوو بە حیزبی "ڕستاخیز". لەلایەکی دیکە ئەمینی عالیمەرد کۆبوونەوەکانی ئەم گرووپەو ئامادەکردنی دواگەڵاڵە دەباتەوە دوو ساڵ پێش وتوویژە بەناوبانگەکەی شا لە بارەی دروستکردنی نیزامی تاکحیزبییەوە. لە بەرامبەردا، ئەحمەدی قورەیشی، کە گۆیا لە دواقۆناغی وتوویژەکانی ئەم گرووپەدا دەگەڵیان کەوتوە، دەڵێ ئەم گەڵاڵەیە دەوری شەش مانگ پێش ئەو وتوویژە ئامادە کرا. بە ڕیوایەتی قورەیشی، گەڵاڵەکە لە ڕێگای شاژنەوە درا بە شا. شاش بە تووڕەییەوە پێشنیارەکانی گرووپی ڕەت کردەوەو وەک لەو ڕۆژانەدا عادەتی بوو، گۆیا پرسیبووی: "چما ئێوە کتێبی ئێمەتان نەخوێندۆتەوە. بەقسەی قورەیشی، چەند ڕۆژ دوای ئەوەی پرۆژەی دروستکردنی حیزبی تاقانە لە ڕێگای شاژنەوە بە دەستی شا گەیشت، هووەیدا شەوێک لە میوانداریيەکدا لە قورەیشیی پرسی، "چتان کردوە کە ئاغا ئەوەندە تووڕە بووە."[٤٨] بە ڕاستییش ئەودەم شا بە تەواوی دژی نیزامی یەک-حیزبی بوو. لە مەئمووریەت بۆ نیشتمانم دا بەڕاشکاوی نووسیبووی کە نیزامە تاکحیزبییەکان لە سروشتە تایبەتیو زۆر دزێوەکانی سیستمە کۆمۆنیستییەکانن. ساڵی١٣٤٧یش لە وتوویژێکی دیکەدا، بیروبۆچوونیکی وەک ئەوەی دەربڕیبوو.[٤٩]

ئەندامانی پێشنیارکەری حیزبی"ڕستاخیز" لەو باوەڕەدا بوون کە گەڵاڵەکەیان، "هەنگاوێکە بەرەو دیموکراتیزەکردنی ڕەوتی سیاسی" لە ئێراندا.[٥٠] دەیانزانی کە شا بوونی حیزبێکی سەربەخۆی دژبەر تەحەممول ناکا. نیگەران بوون کە حیزبی "ایران نوین"یش خونچەکانی

---

* لە سەرتای دەیەی چلدا، مستەفای میسباحزادە ، خاوەنی ڕۆژنامەی کیهان ڕێکخراوێکی دروست کرد کە ناوی "رستاخیز" بوو. ئەم گرووپە خێرا پەرەی گرتو نۆری پێنەچوو کە ڕاپۆرتیان بە شا دا کە لە کۆبوونەوەکانی ئەو گرووپەدا وێنەی شا بە دیوارەوە نیە. فەرمان دەرچوو کە لەوە بەدوا وێنەی شایانە هەمیشە بە دیوارەوە بێ. ماوەیەک دواتر ئەم گرووپە بە هۆی بێمەیلیی خەڵکەوە خەوت.

هاوبەشیی سیاسیی ڕاستەقینەی لە وڵاتدا وشک کردوە. بۆیە دەیانەویست لە ڕێگای ئەو ڕاپەڕینەوە، هاوبەشیی سیاسیی خەڵک زیاتر بکەن‌و "کرانەوەیەک لە ڕەوتی سیاسیدا" پێک بێنن.[51] بە ڕواڵەت لە ئاکامی دەربەدەریدا کە بەرهەمی شۆرش‌و کۆچکردنە، نوسخەیەک لە دەقی ئەو گەڵاڵە پێشنیارکراوە لە دەستدا نیە. هەر بۆیە، چەندوچۆنی وردەکارییەکانی‌و چۆنیەتیی پێوەندیی بە فکری حیزبی "ڕستاخیز"ەوە بەوردی ناتوانین دیاری بکەین. بەوحاڵە، تەنانەت ئەگەر ئەو قسەیەش قبووڵ بکەین کە پێشنیارەکانی ئەو گرووپە پێوەندییەکیان بە حیزبی "ڕستاخیز"ەوە نەبووە، دیسان گیروگرفتێکی گرنگ بێ‌چارەسەر دەمێنێتەوە: چۆن گرووپێک کە هەموو ئەندامەکانی دەرسی زانستە کۆمەڵایەتییەکانیان خوێندبوو هەروا لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا، پێیان وابوو حیزبێکی تاقانە، یان بزووتنەوەیەکی خەڵکی، بە ڕێبەرایەتیی شا دەی‌توانی ئاکامێکی دێموکراتیکی هەبێ‌و "کرانەوەیەک لە ڕەوتی سیاسیدا" پێک بێنێ. ئەمینی عالیمەرد دەڵێ بیرە سەرەتاییەکانی ئەو گرووپە، زیاتر لە نموونەی خودگەردانیی کرێکاریی یۆگۆسلاڤی وەرگیرابوون.[52] بەڵام لەکاتی هێنانەگۆڕی ئەو فکرەدا، زۆر بەڵگەی مێژوویی نیشانیان دەدا کە نیزامە یەک حیزبییەکان ، بزووتنەوە خەڵکییەکان، ئەو نیزامە سیاسییانەی لەسەر ڕێفڕاندۆم دادەمەزرێن، و تەنانەت ڕواڵەتی فریودەری خودگەردانیی کرێکاری هەموویان سەرەنجام دەچنەوە سەر جۆرێک فاشیزم، یان لە باشترین حاڵەتدا، جۆرێک دەسەڵاتی پۆپۆلیستی. لە یەک قسەدا، دێموکراسی لە بیری "ڕستاخیز" هەڵنەدەستاو بەکردەوەش دیتمان کە ئەم بیرە نە لە نێو خەڵکدا پێشوازییەکی لێ‌کراو نە لە ڕاستیدا "کرانەوەیەکی" لە فەزای سیاسیدا پێک هێنا. بەرهەمەکەی نارەزایەتیی ڕوولەزیادبوونی خەڵک بوو.

هەرچەند پێوەندیی وردی پێشنیارەکانی ئەم گرووپەو فکری دروستکردنی حیزبی "ڕستاخیز" ڕوون نیە، بەڵام دەزانین کە ساڵی ١٣٥٣ شا سەفەرێکی میسری کرد. لەوکاتەدا سادات لە

باوەڕپێكراوان‌و دۆستانی نیزیكی شا بوو. گۆیا لە میسر سادات زۆری تاریفی قازانجەكانی سیستمی تاك‌حیزبی كردبوو، و ئەوبۆچوونانە گۆیا شوێنیان لەسەر شا داناوە.[53] پاش میسر، شا بۆ پشوودان چووە سویس. ئەوەندەی ئێمە دەزانین لە بارەی نیزامی تاك‌حیزبییەوە ڕاوێژی بە هیچكەس نەكرد. لە بیرەوەرییەكانی عەلەمدا دەبینین كە لە چەند مانگ پێش دامەزرانی حیزبی تاقانەوە، شا جاری وا بوو چەند سەعات لە دەفتەری خۆیدا بە تەنیا دادەنیشت‌و وا دەهاتە بەرچاو كە بیر لە پرۆژەی تازە بۆ وڵات دەكاتەوە. بەوحاڵە، لە بارەی حیزبەوە پێشتر كەسی ئاگادار نەكردەوە. تەنانەت عەلەمیش لە داستانەكە بێ-خەبەر بوو. لە سویس شا بڕیاری خۆی بەعەبدولمەجیدی مەجیدی ڕاگەیاند. مەجیدی بۆ پێشكێش‌كردنی ڕاپۆرتێك دەربارەی بوودجەی دەوڵەت چووبووە سویس. بە قسەی مەجیدی، شا، دوای بیستنی ڕاپۆرتەكە، سەرخەتی بۆچوونە سیاسییە تازەكانی خۆی دەگەڵ مەجیدی باس كرد. ئەم بۆچوونانە بوونە هۆی سەرسوڕمانی مەجیدی. دەڵێ پاش بیستنی بۆچوونەكانی شا، ئەو بیروڕای خۆی دەربڕیوە كە پێی وایە سیستمی تاك‌حیزبی لەوانەیە گیروگرفتەكانی ئێران چارەسەر نەكا. دەڵێ پێشنیاری بە شا كردوە كە نیزامێكی چەند حیزبیی ڕاستەقینەو كارامە دروست بكا. تەنانەت گوتوویە بە باوەڕی وی مەسەلەی سەرەكیی ئێران گەندەڵییە. وەڵامی شا بە ئاشكرا نیشانی دەدا كە چەندە لە بیروڕای كۆمەڵانی خەڵكی ئێران دوور كەوتۆتەوە. پرسیبووی: "ئەتۆ گەندەڵی بە چی تێ‌دەگەی؟" و كاتێك مەجیدی چەند نموونەیەكی بۆ باس كردبوون، شا گوتبووی: "جگە لەوانە، و لە ڕاستیدا گرنگتر لە هەمووی ئەمانەو گەندەڵیی بەڕاستی ئەوەیە كە خەڵك دروست كار ناكەن‌و كارمەندانیش ئەركی خۆیان بە دروستی ئەنجام نادەن."[54] خەڵك بەدەست گەندەڵیی گەورەكان‌و بنەماڵەی پادشایەتییەوە دەی‌ناڵاندو شا كەم‌كاریی خەڵكی بە گرنگترین گەندەڵیی وڵات دەزانی. شا لە كۆتایی وتووێژەكەدا ڕێگای بە مەجیدی دا نێوەرۆكی گشتیی بڕیارەكانی دەگەڵ هووەیدا، كە لە تاران بوو، باس بكا.

مەجیدی بەپەلە غاری دایە هوتێل سوڤریتا هاوس* کە ڤیلای تایبەتیی شا لە سەن مۆریتس کەوتبووە باغەکانی دەوروبەری ئەو هوتێلە. مەجیدی لە ژێرزەمینی هوتێلەکەوە بە تەلەفۆنێکی گشتی، زەنگی بۆ هووەیدا لێداو فکرە تازەکانی شای دەگەڵ باس کرد. هووەیدا حەزی نەدەکرد بە درێژی قسە بکا. نەیدەویست مەسەلەیەکی وا گرنگ لە هێڵێکی باوەڕپێنەکراوی تەلەفۆندا کە لەوانە بوو خەڵکی بێگانەش گوێیان لێگرتبێ، بکەویتە بەر باس. بەو حاڵە، هەر لەو وتووێژە کورتەدا، هووەیدا تێگەیشت کە نەکهەر دەمودەزگای حیزبێک کە چەندین ساڵ هەوڵی پەرەپێدان و پتەوکردنی دابوو، تێکەوە دەپێچرێ، بەڵکوو سیستمی حیزبیی وڵاتیش بە تەواوی دەگۆڕێ.

هەموو بەڵگەکان ئەوە دەردەخەن کە شا فکری دروستکردنی حیزبی تازەی دەگەڵ کەسی دیکە باس نەکردوە. عەلەم کە لەو کاتەدا لە هەموو سیاسەتمەدارو دەوروبەرەکانی شا لەو نیزیکتر بوو هیچ زانیارییەکی لەو بارەیەوە نەبوو.[55] بە ڕواڵەت تەنانەت ساواکیش لەو باسە تەواو بێئاگا بوو.[56] شا لە حاڵێکدا لە میسرو سویسەوە گەڕایەوە ئێران کە وەک پێغەمبەرێک، لە نەکاو دڵنیا ببوو کە سیستمی تاکحیزبی ڕێگەچارەی هەموو گیروگرفتە سیاسییەکانی ئێرانە. ئەوەندەی ئێمە بزانین هیچکام لە نیزیکانی شا نەوێرابوون لەو بارەیەوە قسەی دەگەڵ بکەن. هیچکەس نەوێرا ئەوندەی وەبیر بێنێتەوە کە نیزامی یەکحیزبی مافی کۆبوونەوەو حیزبدروستکردن بەرتەسک دەکاتەوەو ئەوەش بە پێچەوانەی قانوونی بنەڕەتیی ئێرانە. لەو ڕۆژانەدا ئیدی هیچکەس، ڕەنگە بڵێین جگە لە شاژن، غیرەتی ڕەخنەگرتن لە شای نەبوو. سەرپێچی لە فەرمانەکانیشی بە مێشکی دەوروبەرەکەیدا نەدەهات. لە هەمووی گرنگتر ئەوە بوو کە شاژنیش لەو بارەیەوە لە وەزعێکدا نەبوو کە دژی پرۆژەی حیزبی تاقانە ڕاوەستێ. دووریش نیە ئەسڵی فکرەکە سەرەتا لەلایەن ڕاوێژکارانی خۆیەوە گەڵاڵە کرابێ. دیارە

* Suvretia House.

هووەیداش بە ئاشکرا هیچ نەیارییەکی دەگەڵ بڕیاری شا نیشان نەدا. لە جیاتی کشانەوە لە پۆستەکەی-وەک زۆر لە دۆستان و خزمانی پێشنیاریان دەکرد- ملکەچی ڕاستییەکان بووو بە حەوسەڵەوە چاوەڕوان بوو بزانێ لەو نەزمە نوێیەدا کە شا دای‌ناوە چ ئەرکێکی پێ دەسپێردرێ.[٥٧]

ڕۆژی یازدەی ڕەشەمەی١٣٥٢، شا لە وتوویژێکی چاپەمەنیدا، کە شێوەو نێوەرۆکەکەی تەنانەت بە پێوانەکانی ئەودەمیش جێی سەرسوڕمان بوون، فەرمانی دا نیزامێکی تازەی تاک‌حیزبی دروست بکرێ. حوکمی کرد کە خەڵکی ئێران، هەموویان، دەچنە نێو ئەم حیزبەوە. هووەیداش لەو وتوویژە چاپەمەنییەدا ئامادە بوو. هێندێک لە هاوکارانی دەیانگوت وەختێک شا لە بارەی حیزبەوە دەستی بە قسە کرد، "لە ڕوخساری هووەیدادا نیشانەی سەرسوڕمان و باوەڕنەکردن دەرکەوتن." دەیانگوت حاڵەتی ڕوخساری، "بۆ هەمووانی ڕوون و ساغ دەکردەوە کە ئەمە یەکەمجارە لەو بڕیارە گرنگ و بنەڕەتییە ئاگادار دەبێ."[٥٨] ڕاستییەکەی ئەوەیە کە هووەیدا هەرنەبێ حەوتوویەک پێش ئەو وتوویژە، لە ڕێگای مەجیدییەوە خەبەری دامەزرانی حیزبی تاقانەی بیستبوو* ڕەنگە حاڵەتی ڕوخساری نیشانەیەک لە هەوڵی ئاگایانەی بۆ

---

* کاشفی کە لە جێگرەکانی سەرۆکوەزیر بوو و لەمێژساڵ بوو بوودجەی تایبەتیی سەرۆکوەزیریی ئیدارە دەکرد،دەڵێ دەوری دوو حەوتوو پێش وتووێژی چاپەمەنیی شا، هووەیدا دەستووری دا کە هیچکام لە قەرارداەکانی بەکرێ‌گرتنی خانووبەرەکانی حیزب تازە نەکەنەوە. هووەیدا لەو کاتەدا دەلیلێکی بۆ ئەو دەستوورەی خۆی نەهێنایەوە. بەڵام دوای وتووێژەکەی شا کاشفی هۆی دەستوورەکەی هووەیدای بۆ دەرکەوت. (کاشفی،وتووێژ دەگەڵ نووسەر، ٣١ی ئۆکتۆبری١٩٩٧). فەرەیدوونی هووەیداش لەو بارەیەوە بابەتێکی گرنگ باس دەکا. دەڵێ شا لە مانگەکانی پێش وتووێژە چاپەمەنییە بەناوبانگەکەیدا،هەر نەبێ دوو جار، فکری دروستکردنی حیزبی تاقانەی دەگەڵ هووەیدا باس کردبوو، هەردوو جاریش هووەیدا توانیبووی نەزەری شا بگۆڕێ. (فەرەیدوونی هووەیدا، وتووێژ دەگەڵ نووسەر، ١٠ی ئۆکتۆبری ١٩٩٩).

خۆدوورخستنەوە لە پڕۆژەیەک بووبێ کە پێی وابوو زۆر زیانبارە. زۆرجار لە خۆبەخۆیایەتیدا بە دەست بێهوودەیی ئەو فکرەوە دەی-نالاند، بەڵام بەوحاڵە حازر بوو سەرۆکایەتیی هەر ئەو حیزبە وەئەستۆ بگرێ.

هێندێک لە خاوەنـنەزەران‌و هەروەها باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە ئێرانیش، لەو باوەڕەدا بوون کە دروستکردنی حیزبی تازە لەڕاستیدا بەشێک لەهەوڵی "شا بۆ بەرتەسککردنەوەی دەسەڵاتی رۆوڵەزیادبوونی سەرۆکوەزیر" بوو. بەوحاڵە هەرلەو کۆنفرانسە چاپەمەنییەدا، شا هوەیدای کردە سکرتێری یەکەمی حیزبی تازە*.[٥٩] هیچکەس نەیوێرا لە شا بپرسێ کە بەپێی کام ماددەی قانوونی سکرتێری حیزبێکی دیاری کردوە کە هێشتا دانەمەزراوە. لە ڕاستیدا، شا نەک سکرتێری حیزبی دیاری کرد، بەڵکوو تەکلیفی هەموو ئەوانەشی ڕوون کردەوە کە حەزیان نەدەکرد ببنە ئەندامی حیزب. بە گاڵتەپێکردنەوە گوتی ئەم دەستەیە دەتوانن پاسپۆرتێک وەرگرن‌و ئێران بەجێ بێڵن. ئەفخەمی لە کتێبەکەیدا لە حاڵێکدا وادیارە مەبەستی

---

* دوکتۆر مەنووچیهری شاهقولی،کە لە دۆستانی نیزیکو لە باوەڕپێکراوانی هوەیدا بوو،لە دیدارێک دەگەڵ کاربەدەستانی باڵیۆزخانەی ئەمریکادا گوتبووی پێی‌وایە خرکردنەوەی دەمودەزگای حیزبی "ایران نوین" ئاکامی ئەو ڕاستییەیە کە: "شا ڕادەی توانای حیزبی بۆ دەرکەوتبوو. جارێکیان، دەگەڵ هەوڵی شا،و سەرەڕای کەڵکوەرگرتن لە بوودجەی بنیاتی پەهلەوی کە لەلایەن شەریف ئیمامییەوە ئەنجام درا، دەنگی خەڵکی ڕامسەر نەگۆڕاو کاندیدای حیزبی "ایران نوین" بەسەر حیزبی "مردم"دا سەر کەوت. کاتێک شا لەو بوارەدا شکستی هێنا،بڕیاری لەنێوبردنی حیزبی "ایران نوین"ی لەلا دروست بوو. پێی وابوو دەسەڵاتی حیزب لە ئەندازەبەدەر زیادی کردوە." بڕوانە: us Embassy, Tehran. "HOVEYDA,S LOYAL FRIEND," 25 Jan, 1977,NSA 2177. ئەو هەڵبژاردنەی شاهقولی ئاماژەی پێ دەکا لە ڕاستیدا لە شاری شەهسەوار کرا. هەڵبژاردنی نێوان دەورەیی بوو و کاندیدای حیزبی "ایران نوین" سەر کەوت.

هەر ئەو ڕاویژەی زاری شایە، دەڵێ: "بیرۆکەی سەرەتایی [رستاخیز] زیاتر بۆ وەدیهێنانی جۆرێک ئاشتیی نیشتمانی بوو... بەڵام ئەعلاحەزرەت [لە کاتی دەرکردنی فەرمانی دروستکردنی حیزبدا] حاڵەتێکی دوژمنانەی هەبوو."[60] بە ڕواڵەت ئەودەم بە مێشکی شادا نەهاتبوو کە بەپێی قانوونی بنەڕەتیی ئێران، هەر هاونیشتمانێکی ئێران بە ئەندازەی خودی شا، هەقی ژیانی لە ئێرانیدا هەیە. بەڵام ڕاستییەکەی ئەوە بوو کە شا لەوساڵانەدا ئێرانی بە مڵکی بێ‌ئەملاوئەولای خۆی دەزانی. وڵاتێکی بە ڕواڵەت مۆدێرنی هەبوو، بەڵام وا دیار بوو شا وڵاتەکە بە مڵکی خۆیو خەڵکەکەشی بە ڕەعیەتی خۆی دەزانێ، و هیچ مافێکی هاونیشتمانی‌یان بۆ دانانێ*

هووەیدا بە پێچەوانەی،هەموو گومانێک کە لە بارەی نیوەرۆکی نیزامی تاک‌حیزبییەوە بووی، دەسبەجێ حوکمی دیاریکردنی شای قبووڵ کردو دەستبەکار بوو. بەڵام وا دیار بوو قورسایی باری گرانی چەندین ساڵ سەرۆکوەزیریی لەسەر شانی هەست پێ‌دەکرد. لەوانەشە ویژدانی لەبەر ئەو سازانەی ملی پێ‌دابوو، ئازاری دابێ. هێندێ جار لە میوندارییەکاندا، درەنگوەخت بێحاڵ دەکەوت، پاڵی وەمێزێک دەداو لەنێو کۆڕی میوانانی سەرسوڕماودا ویژینگی دەدان. زۆربەی خەڵک نەیاندەزانی کە لە سەرەتای دەیەی پەنجاوە، پاڵەپەستۆی کار وای لێ‌کردبوو کە هەموو بەیانی‌یان، کاری خۆی بەخواردنی دە میلی‌گرەم ڤالیۆم دەست پێ‌دەکرد.[61] تەنانەت لە وێنەکانی ئەو سەردەمەشدا دەکرێ هەمیشە سێبەری ئەو ماندووییە لەسەر

---

* عەلەم لە یادداشتەکانیدا ئاماژە بە لەحزەیەکی زۆر بێزەر (گویا) دەکا کە لەودا ویستوویە قەباڵەی خاوەنیەتیی بەشێک لە دورگەی کیش بداتە خزمەتی شا،و ئەمە دەبێتە هۆی توورەبوونی شا. عەلەم دەڵێ: ماوەیەک لەمەوبەر کە ئەمن کۆشکی کیشم بەناوی شەخسی شاوە تاپۆ کرد، شا قەباڵەکەی بۆ فڕێ داو فەرمووی چما دەتەوێ تەنیا بستێک لە خاکی ئێران مڵکی من بێ؟ هەموو ئێران هی منە." (یادداشتەکان،بەرگی دووەم،ل٢٦٥).

ڕوخساری ببینی. چاوەکانی دەقووڵ کەوتبوون، و ئەو ڕوخسارە پڕشۆق‌و زیندووەی وەک ڕوخساری پیاوێکی شەکەت‌و داماوی لێ-هاتبوو.

بۆچوونی هووەیدا بۆ حیزبی تازە جۆرێک ناکامیی پڕگومان‌و سەرسوڕهێنی تێدا دەبینرا. هێندێ کەس لە ڕەفتاریدا "جۆرێک بێهوودەیی‌یان دەدی کە ڕیشەی لە جیهان‌بینیی زۆر سەرنج‌ڕاکێش‌و لێزانانەی ئەودا هەبوو."[٦٣] بە باوەڕی من قبووڵکردنی حیزبی تازە لەلایەن هووەیداوە دەبێ بەوپەڕی نزمیی ئەخلاقیی وی بزانرێ. زۆروەخت لە خۆبەخۆیایەتیدا قبووڵی بوو کە سەرەنجامی کاری حیزبی تازە "شتێک جگە لە شکست"[٦٤] نیە. تەنانەت پێش دەستپێکردنی ڕەسمیی چالاکییەکانی حیزب، دەستەبەندییە نێوخۆییەکان، ڕێکخراوەکەیان کردبووە چەند کوت. قۆڵەکانی دەسەڵات هەرکامە دەیەویست بە تەنیا بەرنامەو پێڕەوی حیزب بنووسێ‌و هەربۆیەش بەردیان دەخستە سەر ڕێگای قۆڵەکانی دیکە. جگەلەوە، شەپۆلێک لە نارەزایەتیی خەڵک دەوری حیزبی ساوای دابوو. بەوحاڵە، شارەکان، کارخانە گەورەکان، زانکۆکان‌و ئیدارە دەوڵەتییەکان هەرکامەی ڕێکلامێکی گەورەیان لە چاپەمەنیی وڵاتدا دەکڕی‌و پەیوەستبوونی بەکۆمەڵی خۆیان بە ڕیزەکانی حیزبەوە ڕادەگەیاند. ئەم شۆڕوشەوقە دەستکردو داسەپاوە، ئەوخۆپێشاندانە کارتۆنییە گەورانە کە لە هەموو ناوچەکانی وڵاتدا بۆ پشتیوانی لە حیزب وەڕێ دەخران هەموو لە قوماشی بزووتنەوە گەلییە پێکەنیناوییەکانی سەردەمی ستالین‌و مائۆ بوون. چوونەنێو حیزبی "ڕستاخیز" لەبەر چاوی خەڵک بەکردەوە ببووە کارێکی بێگاری. دەنگۆ بوو کە پاسپۆرتی هەموو ئەوکەسانەی نەچنە حیزبەوە دەستی بەسەردا دەگیرێ. دیار نەبوو ئەو فەزای ترساندنی گشتییەو ئەو دەنگۆیەی بەدوایدا هاتوە چەندی ئاکامی کاری دەوڵەت‌و چەندی دژکردەوەی خەڵکێکی هەژان‌لێدراوە. بەهەرحاڵ، هووەیداو کۆمەڵە پێشکەوتنخوازەکەی بەو بەڵێنە هاتنە سەر کار کە دێموکراسیی زیاتر بۆ ئێران بە دیاری دێنن، بەڵام ئەو بە قبووڵکردنی سکرتێریی

حیزبێک کە سروشتێکی تەواو شێوە توتالیتێریی هەبوو لە ڕاستیدا ببووە خزمەتکارو پیاوی دیکتاتۆری. دیارە ئەو گۆڕانە بە شەوێک دروست نەبوو. بەرەبەرەو هەنگاو بەهەنگاو بوو. وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئەمریکا هەر لە خاکەلێوەی١٣٤٧ەوە، هەستی بەو گۆڕانە کردبوو. ئەوساڵە، دەفتەری زانیاریو لێکۆڵینەوەی ئەو وەزارەتخانەیە لە ڕاپۆرتێکدا گوتبووی کە، "بە پێچەوانەی خۆشگوزەرانیی ڕوولەزیادبوون، و سەرەڕای ئەو ڕاستییە کە دەسەڵاتی هێزە دژبەرەکان ڕۆژبەڕۆژ کەمتر دەبێ، بەڵام شا هەروەک جاران دەرەتانی تێکۆشانی ئازاد بە خەڵک ناداو ئەوانی لە مافی خۆڕێکخستن بێبەش کردوە. حیزبی "ایران نوین"یش کە ساڵی١٣٤٢دامەزرا، پاش ماوەیەکی کورت بەکردەوە خۆی لە هەموو بەرەنگارییەکی سیاسی بەدوور دەگرتو بە ئاشکرا ببووە داردەستی ڕێژیمی ئێستا. شا بە ڕواڵەت بە ئاگاییەوە بڕیاری داوە بە بردنەسەری پایەی ژیانی خەڵک، ئەوان لە بەشداری لە کاروباری سیاسیدا پەژیوان بکاتەوە."[٦٤]

لەپاڵ ئەو ئاڵوگۆڕانەدا وەزعی ئابوورییش کەمێک تێکچوو. نرخەکان بەرەوژوور چوونو کەمبوونی شتوومەک لە سەرتاسەری وڵاتدا گاڵەی دەکرد. تاران کە پێتەختو نوێنگەی "شارستانەتیی مەزن" بوو، تووشی کەمبوونی بەردەوامی کارەبا بوو، و جارجار بێئاوییشی دەهاتە سەر. لە دەوروبەری شار "مەجبووراوا"کان سەریان وەدەر دەناو کاتێک دەوڵەت هەوڵی دەدا پێشی پەرەگرتنی ئەو گەڕەکانە بگرێ، خەڵکی هەژارو بێئەنوا سەرسەختانە بەرامبەری ڕادەوەستان. زۆرجار کارەکە دەگەیشتە پێکهەڵپڕژان. جاری وابوو خوێنیش دەڕژا. لە یەک-قسەدا نیشانەی قەیران زۆر بوون، بەڵام شا گوێی بە هیچیان نەدەدا. "ئامادە نەبوو ڕەوتی هەڵدانی ئابووری سست بکا. لە بەرامبەردا دەوڵەت ماڵیاتەکانی زیاد کردو قەرزی لە هێندێ وڵاتی دەرەوە وەرگرت... ساڵی١٣٥٣ ئێران دوومیلیارد دۆلاری زێدە بوودجە هەبوو، بەڵام زۆری پێنەچوو ئەو زیادییە جێی خۆی دا بە کەمایەسیی بوودجە. دەوڵەت٧/٣ میلیارد دۆلاری کەم بوو... ماڵیاتی داهاتی مووچەخۆرانیان

زیاد کرد. ئەم ژمارەیە ساڵی ١٣٥٤، ٤/.٢ ملیارد دۆلار دەبووو ساڵی١٣٥٧ گەیشتبووە ٥/٨٦ ملیارد."[٦٥]

لەو نێوەدا هۆکاری جیمی کارتەریش هاتە سەر گیروگرفتەکانی شا. ئەو زۆرجار ئەو کاتەی کاندیدای سەرکۆماری بوو، باسی پێویستیی بەرگری لە مافی مرۆڤی کردبوو. جاری وا بوو تەنانەت بە ڕاوێژێکی زۆر پێوەدەریش، ڕەخنەی لە حکوومەتی نادیموکراتیی شا گرتبوو. لەنەکاو چاپەمەنیی ڕۆژئاوا لە ڕادەیەکی بێوێنەدا، دەستیان کرد بە باس و ڕاپۆرت دەربارەی هەلومەرجی سەرکوت و ئەشکەنجە لە ئێراندا. ئەم هۆیانە هەموو دەستیان وێک داو نەیارانی شاشیان بەرەو جموجوڵ و خڕبوونەوە هان دا. بۆ هوەیدا، دیاریکرانی سالیڤان بە باڵیۆزی ئەمریکا لە ئێرانیش بە تایبەتی وەزعەکەی ئاڵۆزتر کرد. سالیڤان هەروەک بۆخۆشی بە ڕاشکاوی پێی لێدەنێ، هیچ شارەزاییەکی لە وەزعی ئێران نەبوو. فارسییشی نەدەزانی و دەگەڵ فەرهەنگ و زمان و مێژووی ئێرانیش تەواو بێگانە بوو. ناوبانگەکەی، هەرچی بوو، لە تێکەڵی دەگەڵ دیکتاتۆرەکانی باشووری ڕۆژئاوای ئاسیادا بەدەست هێنابوو. دەیانگوت زۆردارەکانی ئەو ناوچەیەی بە لێزانییەوە کۆنترۆڵ کردوە. تەنانەت پێش ئەوەی پێ بنێتە تاران، مەزەی فەزای سیاسیی ئێران و کێشەی نێوان تاقمە جۆراوجۆرەکانی چاشتبوو. لە بیرەوەرییەکانیدا باسی یەکەمین دیداری دەگەڵ ئەردەشیری زاهیدی دەکا. دەڵێ ئەم چاوپێکەوتنە کاتی خۆسازکردنم بۆ هاتن بۆ ئێران بوو، و لەودا زاهیدی، "بەڕێزێکی تایبەتییەوە باسی شای دەکرد... تەنیا ئەو کاتە ڕاوێژەکەی بێڕێزانە بوو کە باسی ئەمیر عەبباسی هوەیدای دەکرد. ئەو بە ئاشکرا دژی هوەیدایەو بە سووکی ناوی دەبا."[٦٦] کەمێک دوای ئەو دیدارە، سالیڤان هاتە تاران. لەوێ دەگەڵ زۆر لە دەسەڵاتبەدەستانی وڵات دیدارو وتوویژی کرد. سەرەنجامیش گەیشتە ئەو ئاکامە کە بژاردەکانی ئێران هیچیان کەسایەتیی بەرچاوو هەڵاواردە نین. دەڵێ تەنیا دووکەس لەو قاعیدەیە بەدەر بوون. یەکیان هوەیدا بوو کە بە باوەڕی سالیڤان "لە

ڕێـــزی ڕوونـــاکبیرانی کافەنشـــیندایەو زەینێکـــی وەک تیـــغ تیـــژو کەسـایەتییەکی وەک سیاســەتمەدارێک"ی هەیـە. ئـەوی دیکـە بـەفکری سـالیڤان جەمشـیدی ئامووزگـار بـوو کـە بـە یـەکێک لـە خەنیمـە سەرەکییەکانی هووەیداش دادەنرا.[٦٧]

لـە تـاران، سالیڤان چەنـد کۆبوونـەوەی دەگـەڵ هێنـدێک لـە بژاردە ئابووری‌و سیاسییەکانی ئێران پێکهێنا. بابەتی سەرەکیی باسی ئەو دیدارانە دواڕۆژی هەڵدانی ئابووریی ئێران بوو. سالیڤان هەر لەو کاتەدا لـە دیـدارێکی دەگـەڵ شـادا هـەولی دا لەسـەر بناخـەی ئـەوەی لـەو کۆبوونەوانـەدا بیسـتبووی، دیمـەنێک لـە دواڕۆژی ئـابووریی ئێـران بکێشێتەوە. دژکردەوەی شا بە قسەکانی باڵیۆزی تازەی ئەمریکا سەیر بوو. بـە وتـەی سـالیڤان، شـا " دەسـبەجێ کەوتـە حاڵـەتی بەرگرییـەوە. بەوردی گوێی بۆ قسەکانم ڕاگرت‌و دوایە بە ڕاوێژێکی توندو شەڕانـــی وەڵامـی دامـەوە... کاتێک قسـەم دەکـرد، دەتگـوت لـە کورسـییەکەی ڕۆ دەچێ. یەکجار تووڕە دیار بوو... پاش ئەم وتوویژە لە بارەی وەزعـی ئابوورییـەوە، ماوەیـەکی پـێ‌چـوو تـا شـا دووبـارە پێوەنـدیی دەگـەڵ گرتمـەوە. وای بـۆ چـووم کـە ئـەو مـاوە بێدەنگییە لـە ڕاستیدا جۆرێک تـەمبێ‌کردنـی مـن بـووە... بـەڵام هەرلـەو ماوەیـەدا، لـە بەرپرسـانی کاروباری ئابووریی باڵیۆزخانەو لە بەشێک لە ئێرانییەکانم دەبیست کە شا وەزیرانی بەرپرسی کاروباری ئابووریی بانگ کردۆتـە لای خۆی‌و داوای لێ‌کردوون کە بە وردی چاو بە بەرنامەی سەنعەتی‌کردنی وڵاتدا بخشـێننەوە... ئـەمجار شـا خەبـەری بـەمن دا کـە ئاڵوگۆڕێـک لەڕێدایـە. زۆری پـێ نـەچوو کـە کابینـەی [هووەیـدا] دەسـتی لـەکار کێشـایەوەو سـەرۆک‌وەزیـری پێشـوو کرایـە وەزیـری دەربـار. نـازانم لـە نێـوان وتوویژی من دەگەڵ شاو ئەو ئاڵوگۆڕەی لە بواری ئابووریدا کردی چ پێوەندییەک هـەبوو. پێم باشتر بوو وەڵامی ئەم پرسیارە نەزانم. بۆم قورس بوو ئەوەی لەو وەڵامەدا شاردرابۆوە قبووڵ بکەم."[٦٨]

بەڕاستییش دیـار نیـە قسـەکانی سـالیڤان چەنـدە لـە چارەنووسـی هووەیـدادا کاریگـەر بـوون. ئاخروئۆخری سـاڵی١٣٥٥ وەزعـی ئابووری

خەراپتر بوو. جگە لە کەمایەسیی بوودجەو گیروگرفتی دیکەی مالّی، مەسەلەیەکی تازەش هاتە سەر مەسەلەکانی دەولّەت. ژمارەیەکی رووڵەزیادبوون لە نووسەران‌و روونـاکبیرانی ولاّت لە نامەگەلیکی سەرئاوەلاّدا، کە زۆرتریشیان روو بە هووەیدا دەنووسران، ڕێژیمیان دەدایە بەر رەخنە. یەکێک لە هەوەڵین نیشانەکانی ئەو یاخی‌بوونە قەڵەمییە نامەی سەرئاوەلاّی عەلیٔ‌ئەسغەری حاجی سەید جەوادی بوو. بەفرانباری ١٣٥٤، ڕاست لەو کاتەدا کە شا دژی گەندەڵی وەک یەکێک لە مەسەلە بنەرەتییەکانی ولاّت دوابوو، حاجی سەید جەوادی لە نامەیەکی ڕاوێژتونددا، دەولّەتی هووەیدای تۆمەتبار کرد کە نەکهەر شەڕی گەندەڵیی نەکردوەو نایکا، بەڵکوو لە ڕاستیدا کێشەی دەگەڵ دوژمنانی ڕاستەقینەی گەندەڵی هەیەو لە سەرکوتی وان بەولاوە کاریکی نەکردوە."[69] لە مانگەکانی دواتردا، حاجی سەید جەوادی چەند نامەی دیکەشی نووسین. لە زۆریاندا هێرشی کردبووە سەر هووەیدا. دیارە ئەمڕۆ بۆخۆی قبووڵیەتی کە هێرشەکانی ئەوکاتی بۆ سەر هووەیدا لە ڕاستیدا بیانوویەک بوون بۆ هێرش بۆسەر شا."[70] بە جۆرێکی دیکە بڵێین، هووەیدا ڕێگایەک بوو بۆ پەلاماردانی شا. بەلاّم بەهەرحاڵ هێندێ لەو نامانە دواتر لە دادگای هووەیدادا ڕۆڵێکی گرنگیان گێڕا.

هووەیدا ئیدی دەیزانی کە دەورانی حکوومەتەکەی تەواو بووە. پتر لە هەر سەرۆکوەزیرێکی دیکەی مێژووی مەشرووتەی ئێران لە دەسەلاّتدا مابۆوە. بەلاّم لە رەشەمەی١٣٥٥دا، بە باوەڕی دۆست‌و ئاشناکانی، "یەکجار ماندوو، یەکجار بەدئەخلاق‌و بەڕاستی بێزار" دیار بوو."[71] ڕۆژێکیان لە کاتێکدا لە خۆبەخۆیایەتیدا خەریکی هەڵسەنگاندن‌و پێداچوونەوەی نەخشی سیاسیی خۆی ببوو، بە یەکێک لە وەزیرانی باوەڕپێکراوی خۆی گوتبوو: "هەر بەلاّیەک بەسەر خەڵکی ئێران دێنین، هیچ ناڵێن‌و تەنیا بێدەنگی هەڵدەبژێرن."[72] دەزانین کە لەو بارەیەوە زۆر لە هەڵەدا بوو. مێژووی ساڵەکانی شۆڕش شاهیدی زیندووی ئەو هەڵەیەی ئەوە. ئەم هەڵەیە ئاکامی بە ڕاستی خەفەتباری بۆ ئەو بەدواوە بوو.

# سەرچاوەکان

1. *New York Times*, 24 July 1999, 16

۲. علم، یادداشتهای علم، جلد ۳، ص ۶۱.

۳. سیروس غنی، گفتگو با نگارنده، نوادا، ۲۰ اوت ۱۹۹۹.

۴. برای دستیابی به شرحی پیرامون ایجاد و کار این گروه، به اطلاعات سیروس غنی و فریدون مهدوی توسل جستم. سیروس غنی، گفتگو. فریدون مهدوی، گفتگو با نگارنده، ۳ سپتامبر ۱۹۹۹.

۵. برای دستیابی به شرحی دربارەی این جلسات، به اطلاعات سیروس غنی و فریدون مهدوی توسل جستم.

۶. علم گزارش می‌دهد که در اواخر سال ۱۳۵۱ به شاه گفت که وی اطلاعاتی دریافت کرده است مبنی بر این که «نخست وزیر به کسانی که اطراف ملکه‌اند و سایر خدمتگزاران مبالغی پرداخت کرده است.» وی ادعا می‌کند که شاه دستور رسیدگی داد. ر. ک.: علم، یادداشتهای علم، جلد ۳، ص ۲۲.

۷. هوشنگ نهاوندی، گفتگو با شاهرخ مسکوب، ۲۹ مه ۱۹۸۵، پاریس، نوار شمارەی ۵، مجموعەی تاریخ شفاهی ایران، دانشگاه هاروارد.

۸. فرخ نجم‌آبادی، مکاتبەی شخصی با نگارنده، ۲۴ ژانویه ۲۰۰۰.

۹. غنی، گفتگو.

10. CIA, "Elites, and the Distribution of Power in Iran," NSA, no. 1012, 66.

۱۱. «مقام عالی‌رتبه امنیتی»، گفتگو با نگارنده، ۱۸ سپتامبر ۱۹۹۹.

12. U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Representative List of Intermediaries and Influence Peddlers," NSA, no. 780

13. CIA, "Elites, and the Distribution of Power in Iran," NSA, no. 1012.

14. U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Corruption in Iran," 15 December 1978, in *Documents from the U.S. Espionage Den*, vol. 13 (Tehran, n.d.), 12.

15. U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Shah-Harriman Talk," in *Foreign Relations of the United States, 1964-1968*, Vol. XXII (Washington, 1999), 329.

16. Hossein Razavi and Firouz Vakil, *The Political Environment of Economic Planning in Iran, 1971-1983: From Monarchy to Islamic Republic* (Boulder, 1984), 67.

17. Ibid.

۱۸. افراد زیادی، از جمله فریدون هویدا، لیلا امامی، و عبدالمجید مجیدی، درباره‌ی واکنش هویدا در سفرش به چین، با من صحبت کردند.

۱۹. فریدون مهدوی، "گفتگو با نگارنده"، ۱۹ سپتامبر ۱۹۹۹.

۲۰. عبدالمجید مجیدی، گفتگو با نگارنده، واشنگتن، ۱۵ فوریه ۱۹۹۹.

۲۱. احمد اشرف، مکاتبه‌ی شخصی با نگارنده، ۱۴ فوریه ۲۰۰۰.

22. Razavi and Vakil, *The Political Environment*, 72.

23. Foreign Relations, 338.

۲۴. احمد اشرف، مکاتبه‌ی شخصی با نگارنده، ۱۴ فوریه ۲۰۰۰.

۲۵. پیشین.

26, Amir Abbas Hoveyda, "The Future of Iran," *in Iran: Present and Future*, ed. Jane W. Jacqs (New York, 1976), 440-50.

27. Farokh Najmabadi, "Strategies of Industrial Development in Iran," *In Iran: Past, Present and Future*, 105.

28. Firouz Tofig, "Development of Iran: A Statistical Note," *In Iran: Past, Present and Future*, 63.

29. Amir Abbas Hoveyda, "The Future of Iran," 444-50.

۳۰. عبدالمجید مجیدی، «مصاحبه با عبدالمجید مجیدی»، پروژه‌ی تاریخ شفاهی، بنیاد مطالعات ایران، مصاحبه به وسیله‌ی سیما دبیر آشتیانی در واشنگتن دی‌سی، ۲۱ آوریل ۱۹۸۲، و به وسیله‌ی دکتر اکبر اعتماد، در پاریس در دوازدهم اکتبر ۱۹۸۲، ص ۵۴.

31. U.S. State Department, "Visit of the Shah of Iran," 1967, NSA,

32. U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Telegram," *in Foreign Relations*, 10.

۳۳. برای بحثی پیرامون این اصلاحات، ر.ک. به:

U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Movement toward a Welfare State," February 20, 1975, in *Documents From the U.S. Espionage Den*, vol. 61 (Tehran, n.d.), 12-22.

34. U.S. State Department, "Telegram from the Department of State to the Embassy in Iran" in *Foreign Relations*, 364.

35. U.S. State Department, "Visit of the Shah," 3.

۳٦. علم، یادداشتهای علم، جلد ۳، ص ۲٦۵.

37. "Telegram from Secretary of State Dulles," January 25, 1958, in *Foreign Relations of the United States*, 1958-60, vol. XII (Washington, D.C., 1993), 534.

38. U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Summary of Shah's Current Concerns," NSA, no. 523.

39. N.A, "Memorandum for the President," August 15, 1967.

40. U.S., Department of State, Bureau of Intelligence and Research," Secret Report # 704," 1977/1/78, NSA, no. 1144.

41. U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Decision-Making in Iran," n.d., NSA, n. 1066.

42. Ibid.

43. U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Iran's Modernizing Monarchy: A Political Assessment," 1 January 1971, NSA, no. 1060, 5.

44. U.S. Embassy, Tehran, Iran, "The Recent Evolution of Power in Iran," April 15, 1975, NSA, no. 947, 3.

۴۵. برای دستیابی به ماجرای روزهای اوّلیهٔ تشکیل حزب ایران نوین و نفوذ شاه در تعیین رهبری آن، ر.ک.:

U.S. Embassy, Tehran, Iran, "New Party Celebrates 5 Anniversary with a Party Purge," January 9, 1968.

۴٦. فریدون مهدوی، گفتگو با نگارنده، ۳ سپتامبر ۱۹۹۹.

47. Gholam Reza Afkhami, *The Iranian Revolution: Thanatos on a National Scale* (Washington, D.C., 1985), 70.

کوشیدم با غلامرضا افخمی درباره نقش در شکل‌گیری فکر حزب رستاخیز گفتگو کنم.

۴۸. احمد قریشی، گفتگو با نگارنده، ۲۲ سپتامبر ۱۹۹۹.

49. U.S. Embassy, "New Iran Party Celebrates," 3.

50. Afkhami, *The Iranian Revolution*, 70.

۵۱. امین عالیمرد، گفتگو با نگارنده، ۲۲ سپتامبر ۱۹۹۹.

۵۲. عالیمرد، گفتگو.

۵۳. چندنفر، از جمله «مقام عالی‌رتبه امنیتی»، احمد قریشی و عبدالمجید مجیدی به اهمیت سادات در این زمینه اشاره کرده‌اند.

۵۴. مجیدی، برنامه‌ی تاریخ شفاهی، ص ۹. امین عالیمرد، گفتگو.

۵۵. مجلدهایی از یادداشتهای علم که به اعلام سیستم حزبی جدید می‌پردازد، هنوز منتشر نشده‌اند. ویراستار این کتابها، علینقی عالیخانی، از راه لطف تمام دست‌نوشته‌های مجلداتی را که در آینده منتشر خواهند شد، از نظر گذراند و از عدم اطلاع علم از این موضوع خبر داد. به‌علاوه، عالیخانی در گفتگوهایش با علم متوجه این نکته شده بود که علم قبل از سخنان شاه در مورد ایجاد حزب واحد ازاین مسئله هیچ اطلاعی نداشت. حدود شش ماه پیش از روزی که ایجاد حزب جدید اعلام شد، شاه در پاسخ به شِکوه‌ی علم، با لحن مرموزی به او گفت: «هفته‌ی بعد چیزهایی درباره‌ی حزب اکثریت خواهم گفت.» امّا، تا آنجا که می‌دانیم، در خصوص این مبحث صحبت بیشتری ما بین آنها به میان نیامد.

۵۶. وقتی تشکیل کنفرانس مطبوعاتی اعلام شد، ارتشبد نصیری از ثابتی پرسید که آیا او از چند و چون این کنفرانس مطلع است. ثابتی هم در جواب گفته بود که هیچ اطلاعی در این زمینه ندارد. «مقام عالی‌رتبه‌ی امنیتی»، گفتگو با نگارنده، ۲۳ نوامبر ۱۹۹۷.

۵۷. مجیدی، برنامه‌ی تاریخ شفاهی، ص ۹. امین عالیمرد، گفتگو.

58. Parviz C. Radji, "Amir Abbas Hoveyda," in http//WWW.Hoveyda.Org/radji/html, Hoveyda Web Site.

59. U.S. Embassy, Tehran, Iran, "The Iranian One-Party State," 10 July 1976, NSA, no. 975, 1.

60. Afkhami, *The Iranian Revolution*, 70.

۶۱. پرویز راجی، گفتگو با نگارنده، ۱۲ اکتبر ۱۹۹۹.

62. Afkhami, *The Iranian Revolution*, 55.

۶۳. پرویز راجی، در خدمت تخت طاووس، ص ۹۷.

64. U.S. Department of State, "Research Memorandum from the Director of the Bureau of Intelligence and Research (Hughes) to Secretary of State Rusk," in *Foreign Affairs*, Vol XXII, 492.

65. Mohsen Milani, *The Making of Iran's Islamic Revolution: From Monarchy to Islamic Republic* (Boulder, 1994), 97.

۶۶. ویلیام سولیوان، مأموریت در ایران، ص ۲۶.

۶۷. پیشین، ص ۵۹.

۶۸. پیشین، صص ۷۲-۷۱.

٦٩. علی‌اصغر حاج سیدجوادی، دوتامه، تهران، ١٣٥٧، صص ١٤-٧.
٧٠. علی‌اصغر حاج سیّدجوادی، گفتگو با نگارنده، ٢ سپتامبر ١٩٩٩.
٧١. راجی، در خدمت تخت طاووس، ص ٦٩.
٧٢. عبدالمجید مجیدی، گفتگو با نگارنده، واشنگتن دی‌سی، ١٥ فوریه‌ی ١٩٩٩.

# فەسڵی چاردەیەم

## قوربانی

کەوایە دەژیین.
دوعا دەکەین، گۆرانی دەڵێینو داستانی کۆن دەگێڕینەوە.
بۆ پەپوولە باڵزێڕینەکان پێدەکەنین.
قسەی خەڵکی نەدارو ئاخرشەڕ لە بارەی دەربارەوە دەبیسینو ئێمەش دەگەڵ وان باسی پێگەیشتووو لیکەوتووەکان، براوەو دۆڕاوەکانو خۆشەویستو ناخۆشەویستەکان دەکەین.
بیر لە ڕەمزو ڕازی جیهان دەکەینەوە.
هەروا بزانە جاسووسی خوداین.
هەروا لە چواردیواریی زینداندا دەمێنینەوە،
تاقمو دەستەی گەورەگەورەکان دەبینین کە هەڵکشانو
داکشانیان بە حەرەکەتی مانگەوە بەستراوە.

شکسپێر، شاهلیر

# قوربانی

لە یەکەمین حەوتووی گەلاویژی١٣٥٦دا، هووەیدا پشووی هاوینیی خۆی دەست پێکرد. ڕەنگە پێش ڕۆیشتنیش زانیبێتی کە ئەمە دواسەفەری وەک سەرۆکوەزیری ئێران دەبێ. چووە یەکێک لە دورگەکانی یۆنان. هاوسەری پێشووی، لەیلا ئیمامی، و هەروەها عەبباسعەلیی خەلعەتبەری‌و هاوسەرەکەشی دەگەڵی بوون. ئیدوارد سابلیەش پاش ماوەیەک ڕەگەڵیان کەوت.[1] هووەیدا بەشی زۆری لە نێو لمی گەرمی کەناری دەریادا پاڵی دەدایەوەو ڕۆمانی پۆلیسیی دەخوێندەوە.

سێزدەی گەلاویژی١٣٥٦ گەڕایەوە تاران. ڕۆژی دواتر چووە سەردانی شا کە لەوڕۆژانەدا بۆخۆی لە نەوشەهرخەریکی حەسانەوە بوو. هەرکە شا دەستی بە قسە کرد، هووەیدا وەک ئەوەی زەینیی خوێندبێتەوە، کارەکەی بۆ شا ئاسان کرد. نەی‌هێشت ئەم وتوویژە پڕژانە درێژ بێتەوە. بە جۆرێک پەڕیە نێو قسەی شاو گوتی وەزعی تازە بە باوەڕی وی، خوێن‌و گیانی تازەی دەوێ[2]و بەم قسانە لە ڕاستیدا لە پۆستەکەی کشایەوە. دیارە شاش دەستلەکارکێشانەوەی هووەیدای قبووڵ کردو هەر ئەو ڕۆژە جەمشیدی ئاموزگاری وەک سەرۆک-وەزیری تازە هەڵبژارد. لە ڕاستیدا، حەوتوویەک بەر لەوە، وەختێک هووەیدا هێشتا لە یۆنان بوو، شا بە ئامووزگاری گوتبوو لە فکری پێک-

هێنانی کابینەکەیدا بێ.[3] دیارە دەستلەکارکێشانەوەی هوەیدا بە هیچ جۆر بە مانای شکستو وەلانرانی تەواوی نەبوو. هەرلەو کۆبوونەوەیەدا شا ئەوی لە جێی عەلەم کردە وەزیری دەربار. هەروەک لە ڕاپۆرتی گەلاوێژی١٣٥٦ (١٩٧٧)ی سیادا هاتوە، بەو دانانە هوەیدا لەوەودوا پێوەندیی هەمیشەیی دەگەڵ شا پەیدا کرد. جگەلەوە، "شا دووبارە هەروەک عادەتی خۆی" ڕەفتاری کردبوو. لەلایەک هوەیدای لە سەرۆکوەزیری لادەبردو لەلایەکی دیکە، ئەوی، "کە بەهۆی ساڵانی دوورودرێژی حکوومەتەکەیەوە نفووزو پێوەندیەکی بەربڵاوی[لە دەزگای سیاسیی ئێراندا] هەبوو، وەکوو وەزنەیەک لە بەرامبەر ئاموزگاردا، دەکردە بەرپرسی کارێکی دیکە. بەپێی قاعیدە ئەم دووانە لە دوارۆژدا هەرکامیان هەوڵی دەدا زیاتر خۆی لە شا نیزیک بخاتەوەو لەو بارەیەوە ڕقەبەرایەتییەکی توندیان لەنێودا دروست دەبێ."[4]

تەنانەت ڕوونتر لەم سیاسەتی "دووبەرەکیو حکوومەت"ە، جۆری ڕەفتاری شا دەگەڵ عەلەم بوو. دەزانین کە عەلەم چەندین ساڵ نیزکترین دۆستی شا بوو. هێندێ جار دەگەڵ شا دەچووە ئەسپ-سواری؛ لە زۆربەی مەسەلە سیاسی، ماڵی، دیپلۆماتیو بنەماڵەییەکاندا، باوەرپێکراوی شا بوو. تەنانەت لە پێوەندیی ئاشقانەی شا دەگەڵ ژنانیشدا ئەو هێندێجار دەلاڵیی بۆ دەکردو هێندێجار بۆی دەبوو بە داوەڵ. بەلام شا وادیار بوو ناتوانێ هاوڕێی ڕاستەقینەی کەس بێ. دەیتوانی دەگەڵ دۆستێکی وەفادارو نهێنیپارێزی وەک عەلەمیش هەر بە دڵڕەقی ڕەفتار بکا. لە حاڵێکدا عەلەم لە فەڕانسە دەگەڵ شێرپەنجە لە ململانەدا بوو، شا لە پێوەندییەکی تەلەفۆنیدا پێی ڕاگەیاند کە دوژمنە لەمێژینەکەی، واتە هوەیدای، کردۆتە وەزیری دەربار. لە یادداشتەکانی عەلەم بە ئاشکرا دەردەکەوێ کە لەوکارەی شا ڕەنجاوەو دیاریکردنی هوەیدای بە "گومانـاوی" دەزانی.[5] عەلەم کەمێک دوای وتوویژە تەلەفۆنییەکەی دەگەڵ شا، بە دڵشکاویو حاڵپەرێشانی کۆچی دوایی کردو چارەنووسی بەپێی قاعیدە دەبوو بۆ هوەیدا ببێتە پەند.

بە باوەڕی هووەیدا دەربار دەزگایەکی یەکجار نارێکی هەبووو لە داوی نەریتگەلێکی وشکو ڕزیو لەلایەک، و دارودستەگەلێکی قازانج-پەرستو خۆتەوەر لەلایەکی دیکە گیری کردبوو. بە یەکێک لە دۆستانی ئەودەمی گوتبوو: "دەزگای دەوڵەت هەر گەندەڵ بوو، لە چاڵێکدا دەربار شارەمارێکی ڕاستەقینەیە."[٦٠] جگەلەوە، زۆر لە کارمەندانی دەربار لە باری سۆزدارییەوە سەر بەعەلەم بوونو پێیان وابوو هووەیدا بەناهەق جێی وی گرتۆتەوە. لە یەک قسەدا، پێوەندیی هووەیدا دەگەڵ زۆر لە کارمەندەکانی تاریکو پڕکێشە بوو، بەڵام لە بەرامبەردا بەو ئاڵوگۆڕانە کە لە ڕادەی کۆمەڵدا بەڕێوە بوون، ناکۆکییەکانی دەربار تەواو بێبایەخ دیاریان دەکرد.

کەمێک پاش دەستلەکارکێشانەوەی هووەیدا لە سەرۆک-وەزیری، شەپۆلێک خۆپیشاندانی دژیدەوڵەتی دەستی پێکرد. گیانێکی تازەی سەرکێشی لە خەڵکدا پەیدا ببوو. بەرەبەرە ترس لە دەوڵەتو ساواک دەڕەوییەوەو هەر ڕۆژە ژمارەیەکی تازە لە کۆمەڵانی خەڵک دەهاتنە نێو ڕیزەکانی خەباتەوە. ئاموزگار تەکنۆکراتێکی لێوەشاوەو بەدئەخلاق بوو. هەر لەو کاتەدا زۆر سەری لە وردەکارییە-کانی دنیای سیاسەت دەرنەدەچوو. کاتێک خۆپیشاندانەکان پەرەیان گرت، یەکەمین دژکردەوەو لێکدانەوەی ئاموزگار لە وەزعەکە ئەوە بوو کە هووەیداو هاوپەیمانە بنەڕەتییەکەی لە ساواکدا، واتە پەرویزی سابیتی بە گوناحبار بزانێ. دەیگوت ئەم دووانە ئەو ئاڵۆزییانەیان بۆ ڕووخاندنو ناسەقامگیرکردنی دەوڵەت وەڕێ خستوە. دۆستەکەی، ئەحمەدی قورەیشیی کردە نێوبژیو داوای لەو دوو کەسە کرد کە دەست لە پیلانەکانیان هەڵگرن. هەردووکیان بە توندی حاشایان لە هەرچەشنە دەستبوونێک لەو خۆپیشاندانانەدا کردبوو. بە سەرسوڕمانەوە گوتبوویان: "چما پێیوایە ئێمە شێت بووین کە دەست بدەینە ئەو جۆرە ئاژاوەگێڕییانە."[٧٠]

هێندێک لە ئێرانییەکان، هەروەک ئاموزگار، یەکەمین خۆپیشاندانی ڕێخۆشکەری شۆڕشیان بە شتێک جگە لە پیلانی دەستەو تاقمە

خەنیمەکان نەدەزانی. هێندێکی دیکە خودی ئامووزگاریان بە خەتابارو هۆی سەرەکیی ئەو ئاڵۆزییانە دەزانی. دەیانگوت بە خۆڕایی، و بێ لەبەرچاوگرتنی ئاکامەکانی مەسەلە، یارمەتیی ئاخوندەکانی کە لە بوودجەی نهێنیی سەرۆکوەزیری دەدرا، بڕیو هەرئەوەش ڕێی بۆ شۆرش خۆش کرد. تاقمێکی دیکە بە چاولێکەریی شا، شۆرشیان یەکسەر بە بەرهەمی پیلانی کومپانییە نەوتییەکان دەزانی. مارکسیستەکانیش شۆرشیان بە بەشێک لە ئاڵوگۆڕە لەچارنەهاتووەکانی مێژوو دادەنا. دیارە هێندێک موافیقو هێندێک موخالیفی شۆرش بوونو هەربۆیەش، ئەوەیان بە کشانەوەیەک بەرەودوا یان هەنگاوێک بەرەوپێش دەزانی. هێزە مەزهەبییەکانیش دەیانگوت شۆرش کاری خودایە. دەیانگوت وەستاکاری یەکجاریی مێژوو لە خودا بەولاوە کەس نیەو شۆرشی ئیسلامییش نابێ بە شتێک جگە لە لەحزەیەکی ئەو مێژووە بزانرێ. بە پێچەوانەی جیاوازییە ڕواڵەتییەکانی نێوان ئەو بۆچوونە جۆراوجۆرانە، هەموویان لە خاڵێکدا یەک دەگرنەوە: هەموویان حاشا لە بەرپرسایەتیی خۆیان دەکەن. هیچکامیان ئامادە نین بیر لەوە بکەنەوە کە لە بڕگەگەلی جۆراوجۆردا، کۆمەڵگای ئێران دەیتوانی ڕێگایەکی دیکە بگرێتە پێش. بە جۆرێکی دیکە بڵێین، بە باوەڕی من دەتوانین چەند لەحزەی مێژوویی بژمێرین کە ئەگەر لەواندا یەکێک لە یاریکەرانی دنیای سیاسەت بڕیارێکی جیاوازی دابایە، تەنانەت هەر ئەو بڕیارەی چەند مانگ زووتر جێبەجێ کردبایە، لەوانە بوو شۆرش ڕووی نەدابایە. یەکێک لە بەرچاوترین نموونەکانی ئەو لەحزە مێژوویی-یانە، بڕیاری چاپی وتارێک بە ناوی "ئێرانو ئیمپەریالیزمی سوورو ڕەش" بوو کە حەڤدەی بەفرانباری ١٣٥٦ بڵاو بۆوە.

چەند ڕۆژ پێش چاپی ئەم وتارە، نەسیری، لە دیداری دەگەڵ شادا ڕاپۆرتێکی لە بارەی دوا بەیاننامەی ئایەتوڵڵا خومەینییەوە پێشکێش کردبوو. بەیاننامەکە بە بۆنەی مردنی کوڕە گەورەی ئایەتوڵڵا خومەینییەوە دەرچووبووو لەودا ئایەتوڵڵا گوتبووی غەمو ئازاری مەرگی کوڕەکەم، لە بەرامبەر غەمێکدا کە لە تاوانەکانی ڕێژیمی

پەهلەوی لە ئێراندا هەستی پێدەكا، یەكسەر كاڵ دەبێتەوە. ڕاوێژی توندی بەیاننامەكە شای دەهەری كرد. هەرلەوێ فەرمانی دا ساواك وتارێك لە وەڵامی بەیاننامەكەدا ئامادە بكاو لەودا ئایەتوڵڵا خومەینی وەك هیندیزادەیەك كە جاسووسی بێگانەیە بداتە بەر هێرش.[٨]

شا هەرئەو ڕۆژە بێئەوەی بە ساواك بڵێ دەستووری لەو چەشنەی بە هووەیداش دا. هووەیداش دەسبەجێ كاری ئامادەكردنی وتارەكەی بە دووكەس لە هاوكارانی سپارد. چلوهەشت سەعات دوای فەرمانی قیناویی شا، هووەیدا زەنگی بۆ داریووشی هومایوون كە ئەوكات وەزیری بوو، لێداو گوتی: "وتارێك هەیە كە بە فەرمانی ئەعلاحەزرەت دەبێ چاپی بكەن. ئەوم بە تەتەرێكی تایبەتیدا ناردۆتە دەفتەری كارەكەت."[٩٠] چەند دەقیقە دواتر، یەكێك لە كارمەندانی دەفتەری كاری هووەیدا چووە ژووری كاری هومایوون. پاكەتێكی سەرمۆری پێبوو. لە پاكەتە ڕەسمییەكانی وەزارەتی دەربار بوو. زەزدو نەخشێندراو بە ئارمی تایبەتیی دەربار. هومایوون بێئەوەی وتارەكە وەخوێنێ، یان تەنانەت پاكەتەكەش بكاتەوە، ناردی بۆ سەرنووسەری ڕۆژنامەی "" دەستووری دا چاپی بكەن. كاتێك لێم پرسی بۆچی پاكەتەكەی نەكردەوە، وەڵامێكی سادەی هەبوو گوتی: "چوونكە دەمزانی ئەگەر ئەمری شا بێ، ئیدی چارەیەكمان نابێ جگە لە چاپی وتارەكە."[١٠٠]

كاتێك دەقی وتارەكە گەیشتە دەستی نووسەرانی ""، دەسبەجێ بە سەرسوڕماوی زەنگیان بۆ هومایوون لێدا. گوتیان لە چاپی ئەم وتارە داوای لێبووردن دەكەن. گوتیان ڕاوێژێكی ئاژاوەسازی هەیە. هومایوون پەنای بۆ جەمشیدی ئاموزگار برد. شتەكەی بۆ باس كردو وەڵامی ئاموزگاریش كورتو لێبڕاوانە بوو. گوتی ئەگەر ئەعلاحەزرەت فەرمانی چاپی وتارەكەی دابێ چارە نیە دەبێ چاپ بكرێ. بەهەر حاڵ، سەرەڕای دوودڵیو هۆشدارەكان، سەرەنجام نە سەرنووسەری ""، نە سەرۆكوەزیرو نە وەزیری ولات هیچكامیان نەوێران سەرپێچی لە فەرمانی شا بكەنو وتارەكە چاپ كراو هەڵلایەكی لێ ساز بوو. لە شارە

جۆراوجۆرەکان خۆپیشاندانی خوێناوی دژی وتارەکە وەڕێ کەوتن. جگەلەوە، وا دیار بوو خۆپیشاندانەکان زاوزێ دەکەن. هەرکامیان چەند خۆپیشاندانی تازەی بەدوادا دەهاتن‌و سەرەنجام نەخوشیی خۆپیشاندان وا توندی کرد کە تەنیا بە شۆرش چارەسەر دەکرا.

ئەگەرچی هەرئەودەم، نەخشی هوەیدا لە ئامادەکردنی ئەم وتارەدا تا ڕادەیەک ئاشکرا بوو، بەلاّم پالّنەری وی بۆ ئامادەکردنی خێرای دەقێکی وا ڕوون نەبوو. دیارە یەکێک لە هۆیەکانی بەشداریی وی لەو کارەدا ئەو ڕاستییە بوو کە ئەویش وەک ئاموزگارو هومایوون‌و نووسەرانی "سەرپێچی لە فەرمانی شای تەواو بە نامومکین دەزانی. بەلاّم هەر لەو کاتەدا ئەودەم دەنگۆ بوو کە هوەیدا ئاکامە مەترسیدارەکانی وتارێکی وای باش دەناسی‌و بەوحالّەش کۆمەگی بە نووسین‌و چاپکردنی کرد چوونکە دەیەویست خەنیمەکەی لە مەیدان وەدەر نێ‌و لەسەر کار لابا. ژۆزێف کرافت* کە ئەو کاتە لەلایەن گۆڤاری نیۆیۆرکەرەوە سەفەری ئێرانی کردبوو، لە ڕاپۆرتی خەبەریی خۆیدا شتێکی لەو بابەتەی نووسیبوو. دەلّی: "وا هەست دەکەم کە هۆیەکی [چاپی وتارەکە] تووش‌کردنی ئاموزگار دەگەلّ نەیارە مەزهەبییەکانە."[110]

چاپی ئەو وتارە بوو بە پریشکێک کە دوای ماوەیەک ئاگرێکی هەموولاگری لێکەوتەوە. ڕادەی خۆپیشاندانی دژبەرەکان بەرەبەرە زیادی کرد. جگە لەوە، ئاشکرا بوو کە هۆیەکی سەرەکیی نارەزایەتییەکان، گەندەلّیی مالّیی نێو دەسەلاّتدارانە. هەربۆیە، هوەیدا پاش هەولّێکی زۆر، ئاخرەکەی شای ڕازی کرد کە چالاکیی ئابووریی بنەمالّەی پادشایەتی بەرتەسک بکاتەوە. بە کۆمەگی هوەیدا ڕێنوێنییەکی تازە لەو بوارەدا ئامادە کرا کە لە بیست بەند پێک‌هاتبوو و گەلاویژی ١٣٥٧ شا بە یەکجاری پەسندی کرد. ئەندامانی بنەمالّەی پادشایەتیی لە، "کرداری دوور لە بایەخە کۆمەلاّیەتییەکان"دوور

---

*Kraft

ڕادەگـــــرت. هەرچەشــــنە "پێوەندییـــــەک دەگـــــەڵ کومپانییـــــە بێگانەکان...وەرگرتنێ هەرجۆرە کۆمیسیۆنێک...بەشداریی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ دەگـەڵ ئـەو کومپانییانـەی سـاتوسـەودا دەگـەڵ دەوڵـەت دەکەن...ئەندامـەتیی لـە هەیئـەتی بەڕێوەبـەریی کومپانییەکانیـدا" بـۆ ئەنـدامانی بنەماڵـەی پادشـایەتی قەدەغـە دەکرد.[١٢] هووەیـدا زۆرجـار بـە دۆسـتو خزمـەکانی خـۆی گوتبـوو کـە ئـەم ڕێنوێنییـە بـە گـەورەترین دەسکەوتی خۆی لە سەردەمی وەزارەتی دەربـاردا دەزانـێ. بـەڵام لـەوە بێخەبەر بوو کە ئەوانە هەموو کەپەنکی پاش بارانن

ئامووزگار لەلایەک پیلانی دوژمنانی بە هۆکاری قـەیرانی سیاسیی کۆمـەڵ دەزانـیو لـەلای دیکـە، ڕێگـەچارەی بـۆ قـەیرانی ئـابووریش توندکردنی پشتێنەکانی وڵات بوو . هاوکات لەگەڵ ئەم ئاڵوگۆڕانە، شاش نـەزەری گۆڕیبـوو، و هەمیشـە مزگێنیـی دیموکراسـیی دەدا. ئـەمڕۆ کـە ڕووداوەکـانی سـەردەمی شـۆڕش وەرد دەدەینـەوە، پـێم وایـە ڕوونو ئاشـکرایە کـە ڕۆیشـتنی هاوکـاتی کۆمـەڵ بـەرەو ئـازادیی سیاسـی، و داخرانو فشـاری تـازەی ئابووری، لـە کارەسـات بـەولاوە نـەیدەتوانی ئاکامێکی هەبێ. دەبێ لەبیرمان بێ کە هـەر لەسـەردەمی ئەرەسـتووەوە، فیلسـووفەکان باشـیان دەزانـی کـە بـۆ پادشـا ملهوڕەکـان، هاتنـەخوار لـە بەشـێکی دەسـەڵات، کـارێکی گـەورەو خەتەرناکـە. دەیـانزانـی کـە ئـەو پادشا زۆردارانە کە لەنەکاو ڕفتاری شبلیو بایەزید پەیدا دەکەن بە - ئاسانیو بێخەتەر ناتوانن شێوەی کاری خۆیان بگۆڕن. لەیەک قسـەدا، دەیـانزانی کـە ڕەوتـی دیموکراتیزە کردنـی کۆمـەڵێکی زۆرداریلێدراو ڕەوتێکـی یـەکجار پێچـەڵپووچو مەترسـیسـازە. بـەڵام بـەوحاڵـەش، ڕێژیمی شا ڕاست لەو کاتەدا کە دەگەڵ قـەیرانێکی خەتـەرناکی ئابووری بەرەوڕوو بوو پێی نایە ڕێگای پڕمەترسیی دیموکراتیکردنی کۆمەڵەوە.

هەرنـەبێ دووهـۆی گرنـگ کۆمـەگیان بە هاوکـاتیی مەترسـیسـازی ئـەو دوو سیاسـەتە جیـاوازە-چارەسـەری قـەیرانی ئـابووریو فـەزای کراوەی سیاسـی –کرد. دیارە گرنگترینیان نەخۆشیی شا خۆی بوو. ئەو تێگەیشتبوو کە تووشی نەخۆشیی کوشەندەی شێرپەنجەیەو دەیزانـی

کـە لـەوەودوا، کـات دوژمنیـەتیو کۆمـەگی ناکـا. جگەلـەوە، بـە هاتنەسەرکاری جیمی کارتەر لە ئەمریکا، مەسەلەی دیموکراسیی سیاسی لە ئێرانیش پتر ببووە شتێکی هەنووکەیی. پێش دەستپێکردنی ڕەوتی دیموکراسی لە ئێراندا، شا بانگی قەرەباغیی کردو پێی ڕاگەیاند کە، "لە ئاکامی پاڵەپەستۆی نێونەتەوەییدا"، و هـەروەها بـۆ "مسـۆگەرکردنی مانەوەی بنەماڵەی پەهلەویو سەقامگیرکردنی گوازرانەوەی قانوونیی دەسەڵات"، بیری لە هێندێ ڕێگای تازە کردۆتەوە. گوتی: "ئازادییەکی پتر دەداتـە خـەڵک. جـەختی کـردەوە کـە، "فەرماندەرانی سوپا بـزانن سـەرەداوی هـەموو ئەو ئاڵوگۆڕانـە لـە دەسـتی خۆماندایـەو جێی هیچ نیگەرانییەک نیە."[١٣] جگەلەوە، چەندڕۆژ دواتریش کۆبوونەوەیەک دەگەڵ فەرماندەرانی سوپا کرا. هووەیداو ئەزهاری سەرۆکی ئەوکاتی ستادی سوپا، قسـەیان بۆ بەشداران کردو هەردووکیان جەختیان کـردەوە کـە "هـەموو ئاڵوگۆڕەکان"بـە تـەواوی "حیسـاب کـراون"و جێـی هـیچ نیگەرانییەک نیە."[١٤]

یـەکێک لـە هـەوەڵین نیشـانەکانی دیموکراسیی تـازە، ئازادیی پتـری چاپەمەنی بوو. هەرلەو کاتەدا، نوێنەرانی مەجلیسیش ڕێگایان پێدرا بە ئازادییەکی زیاترەوە ڕەخنە لە دەوڵەتو سیاسەتەکانی بگرن. زۆر لەو نوێنەرانـە پێیـان وابـوو کـە هـەڵبژاردنی دەوری دواتـری مـەجلیس بـە ڕاستی ئازاد دەبێ. پێیان وابوو تـەنیا بە کۆمـەگی دەنگی ڕاستەقینەی خەڵک شانسی چوونەوەمەجلیسیان دەبێو چونکە خـەڵک نـاڕازی دیـار بوون، ئەو نوێنـەرە دەستبژێرانەی حیزبی "ایران نوین"یش هـەموو بـە شەوێک بوونە شۆڕشگێڕو ڕەخنـەگری دەوڵـەت. مـەجلیس کـە تـادوێنێ گوێلەمستو ڕام بوو، بـوو بـە مەیدانی وتـاری زۆر توندو پێشنیاری شۆڕشـگێڕانە. شـەپۆلێکی لەنـەکاو لـە هێـرشو ڕەخنـەی تونـد دژی دەوڵەت ڕاگەیەنـە گشتییەکانی کۆمـەڵی داگـرت. ئاگری هێرشـەکان هـەر دەهاتۆ خۆشتر دەبوو. وا دیار بوو دەیانەویست بە قسـەی بـە ڕواڵـەت شۆڕشـگێڕانە لـە مەجلیسـدا، ڕاپـەڕینی ڕقئەسـتوورانەی خـەڵک لـە شەقامەکاندا کۆنترۆڵ بکەن. لەوانەشە ئومێدیان بووبێ کە بەو هێرشـە

توندانە نەک هەر گوناحەکانی ڕابردووی خۆیان پاک بکەنەوە، بەڵکوو جێیەکیش لە بارودۆخی تازەو پێکهاتەی دەسەلاتی دواڕۆژدا پەیدا بکەن. نیازیان هەرچییەک بوو، بەرهەمی قسە زلەکانیان شتێک جگە لە توندترکردنی شەپۆلی نارەزاییەکانو بەهێزکردنی ورەی شۆرشگێڕانەی خەڵک نەبوو.

تەوەری سەرەکیی ئەم هێرشانە هەرنەبێ لە سەرەتادا، دەوڵەتی هووەیدا بوو. هەموو مەسەلە کۆمەلایەتییەکان، لە سانسۆری چاپەمەنیو هەڵبژاردنی کارتۆنییەوە بگرە تا گیروگرفتە ئابوورییەکانو گەندەڵیی مالی لە ئیدارە دەوڵەتییەکاندا، هەموو دەخرانە ئەستۆی هووەیدا. دیار نیە ئەو هێرشانە چەندە لەخۆوە بوون. جگەلەوە، نازانین دلخۆ شا یان ئەندامانی دیکەی بنەماڵەی پادشایەتی لە وەڕێخستنی ئەو هێرشانەدا رۆڵێکیان هەبوو یان نا. هەر لەو کاتەدا، نەخشی دوژمنانی هووەیدا لە تێکڕای ئەو داستانەو لەو ڕاستییەدا کە نووکی تیژی هێرشەکان ڕووی دەو بوو، ڕوون نیە.

دوای ماوەیەک، نەک هەر شەپۆلی نارەزایەتییە سیاسییەکان بەرەوژوور چوو، بەڵکوو باشبوونێکی ئەوتۆش لە بارودۆخی ئابووریدا پێک نەهات. شاش ناچار بوو ئاموزگار هان بدا دەست لەکار بکێشێتەوە. ئەو پتر لە دەساڵ لە نۆرەی سەرۆکوەزیریدا ڕاوەستابوو، بەلام دەوڵەتەکەی زۆر کورتخایەن بوو* شا دەیەویست لەجێی ئاموزگار دەوڵەتێکی یەکیەتیی نیشتمانی بێنێتە سەرکار. بێگومان دامەزراندنی کابینەیەکی ئەوتۆ لەو هەلومەرجەدا کارێکی قورس بوو. بەلام زەحمەتە بیر بکەینەوە کە بۆ ئەو کارە گرنگە کەسێک لە شەریف-ئیمامی نەگونجاوتر دەست دەکەوت. بەرێکەوت هەر لەو ڕۆژانەدا،

---

* چەندین جار هەوڵم دا وتوویژ دەگەڵ ئاموزگار بکەمو بۆچوونی لە بارەی وەزعەکەوە بزانم و بیگێڕمەوە. هەموو هەوڵەکانم بە فیرۆ چوون. هەموو جارێ وەلامەکەی ئەوە بوو کە پێیوایە، قسەکردن لە بارەی هووەیداوە "تفی سەربەرەوژوورە" ئەحمەدی قورەیشی، وتوویژ دەگەڵ نووسەر،٢٢ی سێپتامری١٩٩٩.

شاپووری بەختیار، لە دیدارێک دەگەڵ ئەندامێکی باڵیۆزخانەی ئەمریکادا، هۆشداری دابوو،کە، "دەوڵەتی شەریف‌ئیمامی بۆخۆی تێکەڵ بەو گەندەڵییەیە کە بە ڕواڵەت بەربەرەکانیی دەگەڵ دەکا...بەختیار لە بارەی گەندەڵیی ماڵیی شەریف‌ئیمامییەوە زانیاریی زۆر تازەی هەبوون."[15] هەمووان دەیانزانی کە سەرۆک‌وەزیری کابینەی "یەکیەتیی نیشتمانی بە "ئاغای پێنج لەسەد" بەناوبانگە. دەیانگوت بۆیە وای پێ دەڵێن چونکە کەم‌وزۆر لە هەموو قەراردادە دەوڵەتییەکان سەدی پێنجی بەشی خۆی وەردەگرت. جگەلەوە، بەرزترین کاربەدەستی فراماسۆنی لە ئێراندا بوو، و بەوحاڵە، شا بەربەرەکانیی گەندەڵیو "یەکیەتیی نیشتمانی" و سەرەنجام نەجاتی ڕێژیمی پەهلەویی لە ناسکترین ساتەکانی مێژووی ئەودا ڕاست بەو کەسە ئەسپارد.[16]

دیارە هۆی جۆراوجۆر شایان بەرەو ئەو هەڵبژاردنە سەیرە پاڵ پێوە نا. حەتمەن دەبێ داخوازی هێزە مەزهەبییە نێوەندرۆیەکان بە یەکێک لەوانە بزانین. شا نیازی بوو ئەو داخوازانە قبووڵ بکاو بەرەی مەزهەبییەکان تێک‌بشکێنێ. چەندوچۆنی ئەولایەنە لە ئاڵوگۆڕی پشت پەردەی هەڵبژاردنی شەریف‌ئیمامی دەتوانین لە تەلگرافێکدا ببینین کە ٢٦ی گەلاوێژی١٣٥٧ لە باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە تارانەوە بەڕێ کرا. لەوێدا دەخوێنینەوە کە، "سەرچاوەیەکی زۆر گرنگ، نێوەرۆکی وتوویژی موقەددەم [سەرۆکی ساواک] دەگەڵ عەبباسی، زاوای شەریعەتمەداریی داوە بە ئێمە. ئەم دیدارە شەوی ٢٤ی گەلاوێژ بووە. موقەددەم پرسیبووی کۆڕوکۆمەڵە مەزهەبییەکان چ داخوازیگەلێکیان هەیە. عەبباسییش ئەم خاڵانەی خوارەوەی باس کردبوون:

أ ) دەوڵەت دەبێ بگۆڕدرێ.

ب) دەوڵەتی دواتر دەبێ هەرنەبێ هێندێک لەوانەی بە گەندەڵی بەناوبانگن، دادگایی بکا.

ج) چالاکییەکانی کچەشا ئەشرەف بێزراوی کۆڕوکۆمەڵە مەزهەبییەکانن. دەبێ پێشی کارەکانی بگیرێ.

د) خەڵک دەبێ ئازادیی دەربڕینو مەزهەبیان هەبێ. لایەنگرانی

شەریعەتمەداری تاریفی وتاری شا لە ڕۆژی مەشرووتەیاندا کرد [کە لەودا شا بەڵێنی دا لەوەودوا قانوونی بنەڕەتی بە تەواوی لەبەر چاو بگرێ]* عەبباسی داوای لە موقەددەم کردبوو کە ئەم خاڵە حەتمەن بە شا بڵێ. موقەددەم لە وەڵامدا گوتبووی کە هەر ئەوشەوە شا دەبینێ. سەرچاوە باوەڕپێکراوە مەزهەبییەکان ئەوەشیان زیاد کرد کە لە درێژەی وتووێژەکانی ئەو شەوەدا، ناوی کاندیداکانی سەرۆک-وەزیریش کەوتە بەرباس. گۆیا دوو ناو باس کران: عەلیی ئەمینیو جەعفەری شەریف‌ئیمامی، سەرۆکی مەجلیسی سەنا... سەرچاوەیەک ئەوەش زیاد دەکا کە لەنێو ئەو دوو کەسەدا، شەریف‌ئیمامی‌یان بە کاندیدایەکی باشترو گونجاوتر زانی. چونکە گۆیا بۆخۆی مرۆڤێکی زۆر ئیماندارەو جگەلەوە پشتیوانییەکی سیاسیی پتەویشی هەیە."[170]

بێجگە لە ئۆگری‌دەربڕینی هێندێ کۆڕوکۆمەڵی مەزهەبی، هۆیەکی دیکەش کە ڕەنگە لەودیاری‌کردنەدا کاریگەر بووبێ گومانی شا دەربارەی نەخشی ئینگلیس لە ئاڵوگۆڕەکانی شۆڕشدا بوو. شا دڵنیا بوو کە دەوڵەتی ئینگلستان یەکێک لە هاندەرە سەرەکییەکانی شۆڕشی ئیسلامییە. ڕەنگە هەربۆیەش پێی وا بووبێ کە فراماسۆنێکی دێرینەی وەک شەریف‌ئیمامی دەتوانێ ئەرکی پێکهێنانی کابینەی "یەکیەتیی نیشتمانی" یان وردتر بڵێین، بەرتیل‌خۆرکردنی ئینگلستان بەجێ بگەیەنێ.

بەڵام هووەیدا دەگەڵ ئەو دیاری‌کردنە نەبوو. دەیەویست عەلیی ئەمینی بکاتە جێنشینی ئاموزگار. لە نێوەڕاستی پووشپەڕدا گەیبووە ئەو باوەڕە کە تێکەڵاوێک لە گیروگرفتە ئابوورییەکان‌و جۆرێک ئیفلیجیی سیاسی، "خەڵکیان بەرامبەر بە دەوڵەتی ئاموزگار کەم متمانە کردووە"، و بۆیە دەیەویست، "پێش ئەوەی کۆنترۆڵی وەزعەکە لەدەست دەرچێ، گۆڕانێک لە دەوڵەتدا پێک بێنێ."[180] لەبەر ئەوە پێوەندیی دەگەڵ

---

* بایەخی ئەم خاڵە وەختێک زۆرتر دەردەکەوێ کە وتارە سەیرەکەی شا لە بەرەبەری پێکهاتنی دەوڵەتی ئەزهاریدا وەبیر خۆمان بێنینەوە.

عەلیی ئەمینی گرت‌و پێشنیاری پێکرد بەیاننامەیەک لەبارەی پێویستیی پێکهێنانی "دەوڵەتێکی یەکیەتیی نیشتمانی"یەوە دەربکا. هووەیدا هەرلەو کاتەدا داوای لە دۆستی خۆی فەرەیدوونی مەهدەوی کە لەوکاتەدا لە ئۆرووپا بوو کرد کە هەرچی زووتر بگەڕێتەوە ئێران‌و داوا لە بەرەی نیشتمانی بکا کە هەوڵی دامەزراندنی دەوڵەتی ئاشتیی نیشتمانی بدا. هووەیدا تەنانەت بە کۆمەگی مەهدەوی چاوی بە موزەففەری بەقاییش کەوت.[19] لە هەموو دەرگایەکی دا بەڵکوو ڕێگەچارەیەک بدۆزێتەوە. بەڵام ئەم هەوڵانە هیچیان سوودیان نەدا. شا هەر وەک جاران بەهۆی دڵئێشییەک کە لە ئەمینیی هەبوو حازر نەبوو بیبینێ. بەرەی نیشتمانییش حەزی نەدەکرد شایەکی داماو ڕزگار بکاو سەردەمی هێندێ کەسایەتیی وەک موزەففەری بەقاییش بەڕاستی بەسەر چوو بوو.[20]

تەوەری سەرەکیی سیاسەتەکانی دەوڵەتی شەریف‌ئیمامی باج‌دان بە نەیاران بوو. بە پێوانەی مێژوو ئەو چەمبەرلێنی زەمان‌و ئەهلی تەسلیم‌بوون‌و ملکەچی بوو. بە باوەڕێ زۆرکەس ، هەرئەو ڕەفتارە سیاسییەی ڕێگای بۆ شۆرش خۆش کرد. هەتا ئیمتیازێکی دەدا نەیارەکان دوو ئیمتیازی تازەیان دەویستن. ئەو هەر لە یەکەمین ڕۆژی حکوومەتەکەیەوە، بێ‌پەردەو پەروا جەختی دەکردەوە کە دەیەوێ دەگەڵ کۆڕوکۆمەڵە مەزهەبییەکان دەرگای ئاشتی بکاتەوە. دوای دەست‌بەکاربوون، دەسبەجێ " پۆستی وەزیری کاروباری ژنانی لەنێو برد؛ وەزارەتخانەیەکی تازەی بۆ ڕاگەیشتن بە کاروباری ئەوقاف دامەزراند. هەموو کازینۆکانی وڵاتی [کە بەڕێکەوت هەموویان هی بنیاتی پەهلەوی بوون‌و سەرۆکایەتیی بنیاتیش چەندین ساڵ لە دەستی ئەودا بوو] داخست. دەستووری داخستنی زۆر لەکابارەکانی تارانی دەرکرد؛ ڕۆژژمێری ئیسلامیی سەرلەنوێ وەکار خستەوە*؛ تێکۆشانی حیزبە

* هەتا سەرەتاکانی دەیەی پەنجا، کۆچی پێغەمبەری ئیسلام لە مەککەوە بۆ مەدینە سەرەتای تاریخی هەتاوی‌و مانگیی ئیسلامی بوو. کاتێک شا باوەڕی بە سەرکەوتنی

سیاسـییەکانی ئـازاد ڕاگەیانـد؛ سانسـۆری چاپەمـەنیی خـڕ کـردەوە؛ بەربـەرەکانیی گەنـدەڵیی لـە سـەرووی بەرنامـەی دەوڵەتـدا دانـاو زێدەمـووچەی بـۆ هـەموو کارمەنـدانی دەوڵـەت بڕیـەوە...و حیزبـی "ڕستاخیز"یشی یەکسـەر هەڵوەشاند."[10]

لەلایەک شەریف‌ئیمامی باجی دەدا بە نەیاران‌و لەلای دیکە شێوەی کاری شا تەواو گۆڕابوو. وەک لە یادداشتەکانی عەلەم دەردەکەوێ، شا هەرگیز ئۆگرییەکی وای بە کەلکوەرگرتن لە گرووپی ڕاوێژکار نەبوو. بەڵام بە پەرەگرتنی قەیران، شاش هاتە سەر ئەو ڕایە کە لە بیروڕای خەڵکی دیکە سوود وەربگرێ. لەنەکاو لافاوی ڕاوێژکارانی جۆراوجۆر بـەرەو دەربـار وەڕێ کـەوت. کـەم ڕۆژ هـەبوو شـا دەگـەڵ گرووپێک ڕاوێژ نەکا. زۆر لە سیاسەتمەدارە بەڕابردووەکانی ئێران کە هەریەکەی بەهۆیـەک چەنـدین سـاڵ کەوتبوونـە بـەر ڕقـی دەربـار، دووبـارە بانگ کرانەوە کە چاویان بە شا بکەوێ."[11] عەبدوڵڵای ئینتیزام‌و عەلیی ئەمینی‌و مەهدیی پیراستە بەشێک لەو ڕاوێژکارە تازانە بوون. دیـارە هـەرکام لـەو ڕاوێژکارانـە ڕێگەچارەیـەکی جیاوازیـان پێشـنیار دەکـرد. بـۆ نموونـە هێندێکی وەک شـەریف‌ئیمامی، بانگەوازیان بۆ ئاشتی‌و باجدان دەکرد. هێندێک دەیانگوت لە هەلومەرجی قـەیرانیی ئێسـتادا، ڕێژیم نـابێ لاوازی لەخۆی نیشان بدا. هێندێکی دیکـە دەیانگوت ڕووحانییەکان تـەنیا زمـانی دەسـەڵات تێ‌دەگـەن‌و لـە نیشـانەکانی لاوازی بـۆ بـەهێزکردنی هـەرچی زیـاتری خۆیان بـەهرە وەردەگرن. مەهـدیی پیراسـتە دەیگـوت بـە شـام گوت: "ئەمن ئاخوندان دەناسم. تەنیا شتی کە تێی دەگەن هێزە. پێشنیارم

---

تەواوی "شۆرشی سپی" پەیدا کرد، سەودای گۆڕینی ڕۆژژمێر لە سەری دا. دەزانین کە هەرئەو سەودایە هەرنەبێ بۆ ماوەیەک، لە فەڕانسـەی دوای شـۆرش‌و شـووڕەویی باڵشویکییش برەوی پەیدا کرد. لە فەڕانسەو ڕووسیە هەردووکیان دەیانەویست ساڵی سەرکەوتنی شۆرش بکەنە سەرەتای مێژوو. شـا لـە بەرامبـەردا، تـاریخی گریمانـەیی دەستپێکردنی پادشایەتی لە ئێرانیدا کردە بناخەو تەقویمی تازە لە سـاڵی٢٥٣٥ەوە ڕەسمیەتی وەرگرت، کە تەمەنێکی زۆری نەبوو.

بە شا کرد مەجلیس هەڵوەشێنێ، ماوەیەک بە دەسەلاتی تایبەتی کارەکان بەڕێوە بەرێ، بەرەبەرە ئالوگۆڕو چاکسازیی پێویست جێبەجێ بکا."[23] هەر لەو کاتەدا، کاربەدەستە ئەمریکاییەکان وایان دەهاتە بەرچاو کە پیراستە لەو ڕۆژانەدا سەودای سەرۆکوەزیریی لەسەردا بوو. لە دیدارێک دەگەڵ نوێنەرێکی باڵیۆزخانەی ئەمریکادا گوتبووی: "بەڵگەیەکی بەدەستەوەیە کە نیشان دەدا هووەیدا، بە پێچەوانەی ئیددیعا زۆرەکانی کە بەهایی نیە، لە ڕاستیدا بەهایی بوو. جگەلەوە، دەیگوت هووەیدا سەرۆکوەزیرێکی زۆر لاواز بوو."[24] لەمەودوا دەبینین کە لەوانەیە بێلوتفیی پیراستە دەرهەقی هووەیدا سەرەنجام نەخشێکی لە دیاریکردنی چارەنووسی ویدا یاری کردبێ.

دیارە پیراستە تەنیاکەسی خوازیاری سەرکوت نەبوو. هوویداش بەرەبەرە نیگەرانترو نائومیدتر دەبوو. دەیگوت: "دەوڵەت هیچ بەرنامەیەکی درێژخایەنی بۆ چارەسەری قەیرانی کۆمەڵ نیە." زۆرجار وەک ڕەخنە وەبیری هێنابۆوە کە، "کارەکانی ئێستای دەوڵەت هەموو دژکردەوەن." دەیگوت دەستپێشخەرییان نەماوە.[25] پێیوابوو دەوڵەت دەبێ بە دەسەلاتنیشاندانی پێویست وەزعەکە ئارام بکاتەوەو لەو ئارامییە، بۆ ڕێکخستنەوەی سەرلەنوێی هێزەکانی وەفادار بە ڕێژیم کەلک وەرگرێ. دەیگوت دەستەوستانیو داماویی ئێستا زۆر خەتەرناکەو سێبەری خستۆتە سەر هەموو کاروباری سیاسیی وڵات. کاتێک هێندێ لە دۆستانی هووەیدا ڕەخنەیان لە پێکهێنانی "گرووپەکانی زەبروەشاندن" لەلایەن دەوڵەتەوە گرتبوو، هووەیدا لە وەڵامدا گوتبووی، "بارودۆخی تازە دژکردەوەی تازەی دەوێ. دەبێ سەبرمان هەبێو هیوادار بین کە پاڵەپەستۆ لە هەردوو لاوە کەمتر بێتەوە."[26]

بەلام دیارە گرنگترین لایەنگری سیاسەتی سەرکوت پەرویزی سابیتی بوو. ئەو هەمیشە جەختی دەکردەوە کە دەوڵەت دەبێ بە لێبڕاویی تەواو، خۆپێشاندانەکان سەرکوت بکا. پاشان بەرەبەرە دەستی نەیارانی وەفادار بە ڕێژیم ئاوەلا بکا کە ڕەخنە لە ڕێژیمی فەرمانڕەواو

تەنانەت لە ئەندامانی بنەماڵەی پادشایەتییش بگرن.[47] لە نێوەڕاستی بەهاری١٣٥٧دا، سابیتی لە ڕێگای هووەیداوە پەیامێکی بۆ شا نارد. داوای لێکرد هەرنەبێ بۆ ماوەیەکی کورت جڵەوی کارەکان بداتە دەستی ساواکو لێگەڕێ ئەوان چارەی پێویست بۆ سەرکوتی ڕاپەڕینو ئارامکردنەوەی وڵات بدۆزنەوە. دەیگوت هێشتا شیرازەی وەزعی وڵات بە تەواوی تێکنەچووەو ڕێگەی گەڕانەوە ماوە. پێویستیی بە لێبڕاویو نیشاندانی دەسەڵات هەیە. شا ئەو پێشنیارەی یەکسەر ڕەت نەکردەوە. داوای لە سابیتی کرد پرۆژەی ڕوونی خۆی بۆ ئەو ئۆپەراسیۆنەی لە مێشکیدایە ئامادە بکاو بیداتێ. سابیتییش خێرا دەستبەکار بوو. لیستێکی ١٥٠٠کەسیی لە نەیارانی گرنگی ڕێژیم ئامادە کرد. پێی وابوو ئەگەر ئەوانە بگیرێن دەسبەجێ شارەکان ئارام دەبنەوە. ئەو لیستە درایە دەست شا. ئەو ڕۆژێکی تەواو مەسەلەکەی سەنگوسووک کرد. ئەو ڕۆژانە دوودڵیو بێبڕیاری وەک خۆرکە بەرببووە گیانی. ئاخرەکەی دەستووری دا کە ساواک تەنیا ئەوکەسانە بگرێ کە شا نیشانەی لە پەنا ناوەکانیان داناوە. وەختێک لیستی ناوەکان بۆ سابیتی بەڕێ کرایەوە، شا تەنیا لە تەنیشت ناوی سێسەد کەس نیشانەی دانابوو.

شا لە وەڵام بۆ مێژوودا بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئاماژە بەم مەسەلەیە دەکا. دەڵێ."ژەنراڵەکان دەیانەویست بەزۆر حکوومەتی قانوون لە شەقامەکاندا بەرقەرار بکەنەوە. ئەمڕۆ دەزانم ئەگەر ئەو ڕۆژانە ئیزنی تەقەکردنم بە سوپا دابایە، ئەو خوێنەی لە خەڵک دەڕژا سەدانجار کەمتر لە خوێنێک دەبوو کە لە هاتنەسەرکاری ڕێژیمی بەناو ئیسلامییەوە ڕژاوە. بەڵام تەنانەت ئەو ڕاستییەش گیروگرفتی من چارەسەر ناکا. پادشا ناتوانێ بە ڕشتنی خوێنی خەڵک تاجوتەختی خۆی بپارێزێ."[48] جگە لە بێمەیلیی شا، هۆیەکی گرنگی دیکەش لەو کاتەدا بەکاربردنی توندوتیژیی دژوارتر کرد. دەوڵەتانی ئەمریکاو ئینگلیس هەریەکەی چەندجارو بە ڕاشکاوی بە شایان گوتبوو کە دەوڵەتی ئێران دەبێ لە بەرامبەر خۆپێشاندانو داخوازەکانی خەڵکدا بە نەرمی

بجوولێتەوە. لە بڕگەگەلێکی جۆراوجۆرو گرنگدا هەردوو دەوڵەت، یان هەرنەبێ هێندێ قۆڵی هەرکام لەو دوو دەوڵەتە، پێیان لەسەر پێویستیی بەردەوامیی ڕەوتی دیموکراسی لە ئێراندا داگرتبۆوە. دەیانگوت دەوڵەتی ئێران نابێ کەلک لە توندوتیژی وەربگرێ. بۆ نموونە، لە نێوەڕاستەکانی سەرماوەزی١٣٥٧دا، شا بە باڵیۆزی ئەمریکای گوت، "سێ جۆرە ڕووبەڕووبوونەوەی تەواو جیاواز دەگەڵ نەیارانی لەژێر لێکۆڵینەوەدایە. یان دەبێ دەوڵەتێکی هاوپەیمانی "ائتلافی" دامەزرێنێ، یان سەر بۆداخوازەکانی نەیاران نەوی بکاو وڵات بەجێ بێڵێ، یان دەوڵەتێکی سەربازی بێنێتە سەر کارو سیاسەتی سەرکوت و "مستی ئاسنین" بگرێتە پێش. باڵیۆزی ئەمریکا بە درێژایی وتوویژە زۆرەکانی خۆی دەگەڵ شادا هەمیشە ئەوی هان دەدا دەوڵەتێکی هاوپەیمانی دامەزرێنێ."[٤٩٠] بە جۆرێکی دیکە بڵێین، ئەمریکا لایەنگریی لە سیاسەتی سەرکوت نەدەکردو شاش نەیدەویست بێ ڕەزامەندیی ئەمریکاییەکان سیاسەتێکی ئەوتۆ ڕەچاو بکا.

هەرچۆنێک بێ، سەرەتای ئاوریل، هەروەک دیتمان، شا بە شێوەیەکی سنووردار ڕەزامەندیی دەگەڵ پرۆژەی ئۆپەراسیۆنی ساواک نیشان دا. ساواکیش هەر بە وەدەستهێنانی ئیزنی شا دەستبەکار بوو. لەماوەی چەند سەعاتدا کەموزۆر هەموو ئەو سێسەد کەسەی گرت کە شا نیشانەی لە پەنا ناوەکانیان دانابوو. شوێنەواری ئەو گرتنانە دەسبەجێ دەرکەوت. شەپۆلی خۆپێشاندانەکان نیشتەوە. دووبارە ڕاپۆرتێک لە باڵیۆزخانەی ئەمریکا نیشانی دەدا کە، "دەگەڵ هێندێ تێکهەڵچوونی پەرش‌وبڵاویش... ئەم دواییانە جۆرە ئارامییەک جێی بێسەرەوبەرەیی‌و ئاڵۆزییەکانی گرتۆتەوە." لە بەشێکی دیکەی هەرئەو ڕاپۆرتەدا ئاماژە بە گیرانی ئەو چەندسەد کەسە کراو دوایە سالیڤان کە نووسەری سەرەکیی ڕاپۆرتەکە بوو، بە ڕاوێژێکی بەپارێزو گەشبینانەوە ، لە بارەی دواڕۆژەوە دوابووو گەیبووە ئەو ئاکامە کە سەرباری کەمبوونەوەی توندوتیژی‌و خۆپێشاندانەکان، دەوڵەت، "هێشتا بە تەواوی نەجاتی نەبووە. ڕێبەرانی سیاسی، وەک وەزیری

دەربــار، هووەیــدا دەبــێ هــەروا بــە وردیو زیرەکــی درێــژە بــە چالاکییەکانیان بدەنو فەزای [ئاڵۆزی] چەند مانگی ڕابردوو بە ڕاستی ئــارام بکەنــەوە. بــەڵام بەهــەرحاڵ دەکــرێ بڵێــین ڕەوتــی باشــبوونی بارودۆخ هەرئێستا دەستی پێکردوە."[٢٠٠]

بەڵام بە هۆگەلێک کە ڕوون نین-و ڕەنگە تەنیا وەختێکیش ڕوون بنەوە کە دەستمان بە هەموو ئارشیڤەکانی ئێرانو ئینگلیسو ئەمریکا ڕابگا- پاش ماوەیەکی کورت، دەوڵەت سیاسەتی سەرکوتو "مستی ئاسنین"ی وەلا نا. جگەلەوە سابیتی کە وەستاکاری سەرەکیی ئەم سیاسەتە بوو لەسەر کار لابراو پاش ماوەیەکی کورت ئێرانی بەجێ هێشت. شەوی پێش ڕۆیشتنەکەی، چووە سەردانی هووەیدا. هووەیدا ناهومێد دیار بوو. گوتی: "پێم وایە شا دەستی لە بەربەرەکانی هەڵ-گرتوە. لەسەرکارلابردنی تۆ نیشانەی ئەوەیە کە ئیدی نایەوێ شەڕ بکا." هەرلەو کاتەدا ئەو شەوە هووەیــدا خاڵێکــی سەرنجڕاکێشــی دیکــەی هێنایــە گــۆڕێ. وەک بڵێــی دواڕۆژی خــۆی لــە ئاوێنــەی ڕووداوەکاندا دەدی. ڕووی کردە سابیتیو گوتی: "شا ئیزنی دا ئەتۆ لە ئێران بڕۆی چونکە دەیزانی پێشی زمانی تۆیان پێ ناگیرێ. بەڵام لە منو نەسیری ئەرخەیانەو هەربۆیەش ئێمەی بۆ ڕۆژی خوانەکا هەڵ-گرتوە."[٢١٠] ئەو ڕۆژی خوانەکایە هێندەش دوور نەبوو. لەسەرکارلابردنی سابیتی لە حوکمی هۆشدارێکی جیددی بە هووەیداو نیشانەی تێکچوونی ڕۆژلەڕۆژ پتری بارودۆخی ڕێژیم بوو.

لە لایەکی دیکەوە، دەوڵەتیش دایم لە نێوان سیاسەتی سەرکوتو سازاندا دەهاتو دەچوو. ڕۆژێک نەیارانی دەگرتو ڕۆژێکی دیکە، لە هەڵوێستێکی بە ئاشکرا لاوازدا، ملی بۆ هەموو داخوازەکانی ئەو نەیارانە ڕادەکێشا. هەتا سەرەنجام لە ١٧ی خەرمانانی١٣٥٧دا سوپا لە مەیدانی ژالە کۆمەڵێک خەڵکی وەبەر دەسرێژ دا. بەوکوشتارە وا دیار بوو دەرگای سازانو ڕێگەچارەی ئاشتیخوازانە بە جارێک داخرا. شەوی پێشتر، دەوڵەت لە تاران حکوومەتی سەربازیی ڕاگەیاندبوو. کاتێک ئەو ڕۆژە کە بە "هەینیی ڕەش" ناوبانگی دەرکرد، ئەرتەشییەکان بە پشت-

بەستن بەوحکوومەتە سەربازییە، دەستووری بڵاوبوونەوەیان بەو کۆمەڵە دا کە لە مەیدان خڕ ببوونەوە خەڵک، ڕەنگە بە ئەنقەستو لەوانەشە بە هەڵەو لەبەر ئاگادارنەبوون لە ڕاگەیاندنی حکوومەتی سەربازی بووبی، فەرمانەکەیان جێبەجێ نەکرد. لە ئاکامدا سەربازان تەقەیان کردو ژمارەیەکیان لێ کوشتن کە هەرگیز نەزانرا چەند کەس بوون. زۆری نەخایاند کە ئەو کوشتارە بوو بە یەکێک لە گرنگترینو کارامەترین ئەفسانەکانی شۆرش. بوو بە چەکێکی زۆر کاریگەر بۆ کۆکردنەوەو هەژاندنی کۆمەلانی خەڵک. دەڵێن هەر شۆرشو بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتیی خەڵکی پێویستیی بە ئەفسانەیەک هەیە. دەڵێن کۆمەڵانی خەڵک بە دروشمو ئەفسانە دێنە مەیدان، نەک بە ئەقڵو لێکدانەوە. شۆرشی ئێرانیش لەو قاعیدەیە بەدەر نەبووو "هەینیی ڕەش"، دەگەڵ "سینەما ریکسی ئابادان"، بوونە دوو ئەفسانەی کاریگەری شۆرش. دەوڵەت لەو سەردەمەدا زۆری هەوڵ دا بەرپرسایەتیی سینەما ریکسو کوشتاری مەیدانی ژالە بخاتە ئەستۆی ڕووحانییەکان، بەڵام هەوڵەکانی تەواو تێشکان. لە بەرامبەردا هێزە دژبەرەکان بە ئاسانی توانیان خەڵکی قانیع بکەن کە هیچ کەس جگە لە دەوڵەتو شا بەرپرسی ئەو کوشتارانە نیە. ئەمرۆ کە پتر لە بیستساڵ بەسەر شۆرشدا تێپەرپوە، هێشتا بەرپرسایەتیی سینەماریکسو ژمارەی کوژراوەکانی مەیدانی ژالەو، بەرپرسی سەرەکیی ئەو کوشتارە لەژێر پەردەیەکی ناڕوونیدا ماوەتەوە*

* دەزانین کە لە ئاکامی بەدواداچوونی ئەو بنەماڵانەدا کە لە ڕووداوی سینەما ریکسدا خۆشەویستێکیان لەدەست دابوو،دەوڵەتی کۆماری ئیسلامی چەند کەسێکی لە شاری ئیسفەهان،دەگەڵ چەند مەئمووری ساواک، بە تاوانی هاودەستی لە سووتاندنی سینەماو کوشتنی پتر لە چوارسەد مرۆڤی بێگوناحدا دادگایی کرد. ئەگەرچی بەشێکی زۆر لە گرنگترین ئەو مەسەلانە کە پەیوەندییان بەو کارەساتەوە هەبوو هەرگیز لە دادگادا نەهاتنە گۆڕێ بەڵام هێندێ بڵاوکراوەی ئێرانی-بەتایبەتی بڵاوکراوەی "وحدت کمونیستی" کە بە شێوەی ناقانوونیو ژێرزەمینی چاپ دەکرا-

ڕۆژی دوای "هەینیی ڕەش" هووەیدا لە پۆستی وەزارەتی دەربار کشایەوە. دواتر لە نامەیەکدا کە لە زیندانەوە ناردیە دەرێ- و دەقەکەی لە بەشی دواتری ئەم کتێبەدا هاتوە- ئیددیعای کرد کە هۆی بنەڕەتیی دەستلەکارکێشانەوەی ناڕەزایی لە کوشتاری مەیدانی ژالە بوو. هەر لە سەردەمی کشانەوەیدا بە هێندێک لە خزمو دۆستانی دەگوت کشانەوەی لە وەزارەتی دەربار ئاکامی ڕاستەوخۆی ئاژاوەگێڕییەکانی ئەردەشیری زاهیدییە. هووەیدا پێی وابوو زاهیدی شای قانیع کردوە کە تەنیا ڕێگای ڕێککەوتنو تێکگەیشتن دەگەڵ ڕووحانییە نێوەندڕۆیەکان لابردنی هووەیدا لە وەزارەتی دەربارە.[22]

دیارە لەوکاتەوە ئیدی ڕێژیم بە تەواوی مانا کەوتبووە ئەڵقەی بێ- سەرەوبەرەییو نابەسامانییەوە. لە ماوەی چەند سەعاتدا سیاسەتی سازانو باجدانەکانی شەریفئیمامی جێی خۆی دا بە سیاسەتی "حکوومەتی قانوون"و سەرکوتی توندی نەیاران. دەوڵەتێکی سەربازی جێگای دەوڵەتی "یەکیەتیی نیشتمانی"ی شەریفئیمامیی گرتەوە. زۆر لە ڕاوێژکارانی شا پێیان وابوو دەبێ سەرۆکایەتیی دەوڵەتی تازە بدرێ بە عەلیی ئووەیسی کە لەبەر نەخشی لە ڕووداوی مەیدانی ژالەدا بە "قەسابی تاران" ناسرابوو، و لەبەر چاوی خەڵک ئەفسەرێکی بەسامو ترسێنەر بوو. ئەگەر مەبەست لە دانانی حکوومەتێکی سەربازی دروستکردنی ترسو سام لەنێو خەڵکدا بوو، ئەگەر مەبەست ئەوە بوو کە لە سایەی ئەو ترسو سامەدا ئارامییەک بەرقەرار کرێو بێ- سەرەوبەرەییو بێکیفایەتیی دەوڵەت کۆتایی بێ، ئەودەم ئاشکرا بوو کە ئووەیسی، ڕاست لەبەر ڕابردووەکەیو ناوبانگدەرکردنی بە "قەسابی تاران"، باشترین کاندیدا بۆ ئەو کارە بوو. کەچی شا بە هۆیەکی نادیار، لەجیاتی وی ئەزهاریی وەک سەرۆکوەزیر دیاری کرد کە ئەوکارەی لەدەست نەدەهاتو زۆری پێنەچوو کە بوو بە گاڵتەجاڕێک.

تەنانەت سەیرتر لە هەڵبژاردنی ئەزهارییش وتارێک بوو کە شا

---

بابەتگەلی ڕوونیان لە بارەی چەندوچۆنی نەخشی هێندێ کەسەوە نووسی.

ڕۆژی دوای هاتنەسەرکاری دەوڵەتی سەربازی خوێندیەوە. پێموایە هیچ شتێک بەقەد ئەو وتارە حاڵەتی نابەسامانی دەروونیو بێفکریو بێمەنتیقیی سیاسەتەکانی ئەو ڕۆژە ئاڵۆزانەی نیشان نەدەدا. دەڵێن لە ڕۆژانی پێش شۆڕشی فەڕانسەدا، لوویی شازدەیەم ڕۆژی١٤ی ژووئیەی١٧٨٩، بە خەیاڵی ئارامکردنەوەی ڕقی خرۆشاوی خەڵکی پاریس لە کۆشکی جێگەژیانی خۆیڕا بەپێ چۆتە پارلەمان. دەیەویست بەمجۆرە بڵێ کە بەڕاستی ئاگای لە گوناحەکانی ڕابردووی هەیەو لە بارەی وانەوە داوای لێبووردن لە بارەگای خەڵک دەکا. هەرلەو کاتەدا، زۆربەی مێژوونووسانیش لەو باوەڕەدان کە هیچشتێک بە ئەندازەی ئەو "ڕێپێوانە لێبووردنخوازانەیە" تێکەوەپێچرانی دەمودەزگای بنەماڵەی بووربۆنەکانی خێراو مسۆگەر نەکرد. وتاری ڕۆژی دوای دانانی ئەزهارییش بە باوەڕی من شتێک بوو وەک ئەو "لێبووردنخوازییانە"و ئاکامێکی واشی هەبوو. نەک هەر نێوەرۆکی قسەکانی شا بەڵکوو ڕاوێژو شێوەی دەربڕینیشیان بەزەییبزوێن بوو. نیشانەی ئەوپەڕی لاوازیی سیاسیی ڕێژیم بوونو بەلاوازییەکی تەواوی کەسایەتییشەوە دەردەبڕان. پێم وایە ئەوانەی شایان هان دا ئەوقسانە بکاو ئەوانەی دەقی وتارەکەیان بۆ ئامادە کرد، بەخۆیان زانیبێ یان نا هەنگاوێکی گەورەو بێگەڕانەوەیان بەرەو شکستی ڕێژیمی پەهلەویو سەرکەوتنی شۆڕش هەڵێنایەوە. کاتێک شا دەیگوت: "ئەمنیش پەیامی شۆڕشی ئێوەم بیست"، وەختێک سوێندی دەخوارد کە ئیدی قانوونشکێنیو گەندەڵیو زەبروزەنگی پێشوو قبووڵ ناکا، حاڵوهەوای ڕوخساری، دەنگی لەرزۆکیو چاوە خەفەتبارەکانی هەموو وەک مرۆڤێکی گوناحکار دەچوون کە لە بەرامبەر زاتی پاکی خوادا چۆکی لە زەوی داداوەو داوای لێبووردن دەکا.[٢٣]



ڕۆژێک کە هووەیدا لە وەزارەتی دەربار کشایەوە، شا پۆستی باڵیۆزی ئێران لە بێلژیکی پێ پێشنیار کرد. شا لە وەڵام بۆ مێژوودا ئاماژە بەوخاڵە دەکاو دەنووسێ، "بەڵام هووەیدا کە هێشتا جێگای ڕێزی من بوو، نیشانەی سەرەکیی هێرشی نەیاران بوو، هەرچەند ئامانجی ڕاستەقینە ئەمن بووم. کەمێک دوای ئەو بەسەرهاتە پێشنیارم بە هووەیدا کرد بچێتە دەرەوەو ببێتە باڵیۆزی ئێران لە بروکسێل."[٢٤٠]
هووەیدا لەو کۆبوونەوەیەدا پێشنیاری شای نە قبووڵ کرد نە ڕەت کردەوە. چەندرۆژێکی مۆڵەت خواست تا لایەنەکانی ئەوکارە هەڵ-سەنگێنێ. ڕاوێژی دەگەڵ هێندێک لە دۆستو خزمانی کردو سەرەنجام گەیشتە ئەو ئاکامە کە پۆستی باڵیۆزی قبووڵ نەکاو لە ئێران بمێنێتەوە.
بە باوەڕی من، زۆر هۆی پێچەڵپووچ ئەم بڕیارەیان لێکەوەتەوەو ناتوانین بە ئاکامی تەنیا هۆیەکی لێک بدەینەوە. لە هەمووان گرنگتر مەسەلەی دایکی هووەیدا بوو. ئەو زۆرجار بە زۆرکەس -یەک لەوان ئانتۆنی پارسۆنز، باڵیۆزی ئینگلیس لە ئێران-ی گوتبوو کە لەبەر دایکی ناتوانێ ئێران بەجێ بێڵێ. دەیگوت ئەفسەرولملووک زۆر نەخۆشەو ئامادەی سەفەر نیەو هەرلەو کاتەدا لێی زیاد دەکرد کە هیچ کاتێک دایکی بەتەنیا بەجێ نایەڵێ. بێجگە لەوە، هووەیدا لە ژیانی دوورخراوەییش بێزار بوو.`سالی ١٣٣٦(١٩٥٧)، دوای گەڕانەوە بۆ ئێران، زۆرجار بە دۆستو خزمانی گوتبوو کە ئیدی هەرگیز ئێران بەجێ ناهێڵێ. جگە لەوە، مەسەلەی ئۆگرىو ئەمەگناسیی هووەیدا بۆشاش گرنگ بوو. هووەیدا دڵنیا بوو کە دەورانی بنەماڵەی پەهلەوی هێشتا تەواو نەبووە؛ پێی وابوو لەپشت خۆپێشاندانی بە ڕواڵەت خۆکردی خەڵکەوە "سیناریۆیەک" لە ئارادایە. دەیەویست لە ئێران بمێنێتەوەو کۆتایی سیناریۆیەکە ببینێ. سەرەنجام دواهۆ کە کۆمەگی بە مانەوەی هووەیدا لە ئێران کرد پێشنیارەکانی هاوسەری پێشووی، لەیلای ئیمامی بوون. لەیلا پۆستی باڵیۆزیی بە "کەمتر لە شان"ی هووەیدا دەزانی. پێشنیاری دەکرد کە لە جیاتی وەرگرتنی ئەو پۆستە ناشایستەیە، دەبێ ئاواتی لە مێژینەی وەدی بێنێو کتێبفرۆشییەک

دامەزرێنێ. لەم وتووێژانەدا، تەنانەت ناوێکیشیان بۆ ئەو کتێبفرۆشییە خەیاڵییە هەڵبژارد. قەرار بوو ناوی بنێن "کتێبفرۆشیی پریزیدێنت".[25]

پێشنیاری شا دەربارەی باڵیۆزخانەی ئێران لە بێلژیک یەکەمین دەرفەتی هەڵاتنی هووەیدا نەبوو. ئاڵوگۆڕەکانی دواتر نیشانیان دا کە دوا دەرفەتیشی نەبوو. جۆزەردانی ١٣٥٧، یەکێک لە دۆستە فەرانسەییەکانی هووەیدا بە ناوی کلۆد دو پیرۆن* کە پێوەندییەکی نیزیکی دەگەڵ ناوەندەکانی دەسەڵات لە فەرانسە هەبوو سەفەری ئێرانی کرد. پەیامێکی لەلایەن شابان داڵماسەوە کە لەو کاتەدا، سەرۆکی پارلەمانی فەرانسە بوو بۆ هووەیدا هێنابوو. نێوەرۆکی پەیامەکە سادە بوو: "ئێمە دەزانین بارودۆخی ئێران بەرەو ناخۆشی دەڕوا. بەزوویی وەزع زۆر لەوە خەراپتریش دەبێ. پێشنیار دەکەین بە بیانووی چارەسەری [نەخۆشی] ئێران بەجێ بێڵی. کاتێک گەیشتیە پاریس، لە نەخۆشخانەیەک- دەتخەین و پاشان بۆ مانەوەت لە فەرانسە کاردروستایی پێویست دەکەین."[26] دو پیرۆن دەڵێ رۆژێک کە گەیشتۆتە تاران دەسبەجێ چۆتە سەردانی هووەیدا کە هەروا لە وەزارەتی دەربار بوو. دەڵێ شەوێ تا بەیانی باسی چارەنووسی ئێران- و پێویستیی چوونەدەری هووەیدا لە وڵاتمان کرد. دەڵێ هەرچی توانیم کردم تا هووەیدای قانیع بکەم لە ئێران بچێتە دەر. بەڵام هووەیدا قانیع نەبوو. بە دوو هۆ مانەوەی خۆی بە پێویست دەزانی. هۆی یەکەم دایکی بوو، و هۆی دووەم هەلومەرجی سیاسیی ئێران بوو. هووەیدا دەیگوت: "وەزعی وڵات نابەسامانە. شاش ئیدی توانای بڕیاردانی نەماوە. دەبێ لێرە وەمێنم." دو پیرۆن دەڵێ: "پێم وایە هووەیدا دەربارەی ئەوەی لە ئێران چاوەڕوانی بوو لە گوماندا بوو."[27]

بەهەرحاڵ، دەنگۆی گیرانی هووەیدا، کە بە دەستپێکردنی سەرۆکوەزیریی شەریفئیمامی برەوی پەیدا کردبوو، رۆژبەڕۆژ گەرمتر دەبوو. ڕاستییەکەی ئەوە بوو کە شەریفئیمامی چەندڕۆژێک

---

* Claude De Peyron.

دوای دیاریکرانی بە سەرۆکوەزیر، لە کۆبوونەوەیەکدا کە شاو شاژنیشی تێدا بوون، بە ڕاشکاوی گوتبووی کە: "بۆ نەجاتی وڵات پێویستیمان بە بڕیاری لێبڕاوانە هەیە." لەو کۆبوونەوەیەدا هەمووان دەیانزانیو قبووڵیان بوو کە گەندەڵیی ماڵی یەکێک لە شکایەتە ئەسڵییەکانو هۆیەکی گرنگی نارِزایەتیی خەڵکە. جگە لە شاو شاژنو شەریف‌ئیمامی، بەشداارانی دیکەی کۆبوونەوە بریتی بوون لە ئازموون، نەهاوەندی، باهیری، ئووەیسی، سەمەدیان پوور، گەنجی، قوتبیو موقەددەم. لەو نێوەدا، چەندکەسو بۆ وینە ئازموونو نەهاوەندیو باهیری، پێیان دادەگرت کە دەبێ، "هەموو ئەوانەی نەخشێکی گرنگیان لە گەندەڵیدا هەبووە، بە توندی سزا بدرێن." هەرچەند ناوی هووەیدا هەرگیز نەهاتە سەر زمان، بەڵام وا دیارە بۆ هەمووان ڕوون بوو کە مەبەست لەو حوکمە گشتییە هووەیدایە. هەرلەو کاتەدا دەبێ ئەوەشمان لەبیر بێ کە لەو ڕۆژانەدا، زۆر لە ڕاوێژکارانی شا لە بارودۆخی ڕاستەقینەی وڵات بێخەبەر بوونو زۆر وێ دەچوو، و لەوانەشە لە دنیای خەیاڵیی خۆیاندا سووربابنەوە. نموونەی ئەوجۆرە خەیاڵپەروەرییە کاڵو بێبنەمایانە دەتوانین لە پێشنیارەکانی ئازموندا ببینین. ئەو دەڵێ: "خەڵک شۆرشیان دەوێ... شاهەنشاش دەبێ بۆخۆی ڕێبەرایەتیی ئەو شۆرشە بە دەستەوە بگرێ. دەیگوت دەبێ دادگای سەحرایی دابنرێنو "لایەنگرانی گەندەڵی بە توندی، و بە ئاشکراو لەپێش چاوی خەڵک سزا بدرێن." وتوویژی ئەو گرووپە ئەوشەوە نەگەیشتە جێگایەک. کۆبوونەوە بەم قسەیەی شا کۆتایی هات کە، "فکری لێ-دەکەینەوە."[380]

دیارە ئەگەر بیروڕای خودی هووەیدا لە بارەی چەندوچۆنی گیرانەکەیەوە قبووڵ بکەین، دەبێ ئەوەشی لێزیاد بکەین کە جگە لەو کەسانەی لەو کۆبوونەوەیەدا بەشدار بوون، کەسانی دیکەش لە هەوڵی گیرانی هووەیدادا بوون. بە وتەی هووەیدا، پتر لە هەرکەس ئەردەشیری زاهیدیو لایەنگرانی لەو بووارەدا چالاک بوون. دەیانەویست هووەیدا بکەنە قوربانی. ئەو بە خەتاباری سەرەکی بزاننو

دیزەو گۆزەکان لەسەری ویدا بشکێنن و بە سزادانی ڕقی خەڵکی بنیشێننەوە* جگە لە هووەیدا، خەڵکی دیکەش هەن کە پێیان وایە زاهیدی نەخشێکی گرنگی لە گیرانی هووەیدادا گێڕاوە. بۆ نموونە، شاهینی ئاقایان، کە بۆخۆی لە دۆستانی نیزیکی هووەیدا بوو، دەڵێ، وەختێک لە بەرەبەری شۆڕشدا ئێرانی بەجێ دەهێشت، بەرێکەوت ئەردەشیری زاهیدی لەسەر کورسیی تەنیشتی دانیشتبوو. ئاقایان ئیددیعا دەکا کە زاهیدی ئەوڕۆژە خۆشحاڵ دیار بوو. گوتی: "سەرەنجام ئەعلاحەزرەتم ڕازی کرد کە ئەو هووەیدا دایکسەگە بگرێ."[٣٩] زاهیدی حاشا لەوە ناکا کە لەو فڕۆکەیەدا بووە. هەرلەو کاتەدا دەڵێ لە درێژەی سەفەرەکەدا قسەی دەگەڵ ئاقایان کردوە. بەڵام دەڵێ: "قسەیەک کە لە فڕۆکەدا کردم ئەوە بوو کە ئەعلاحەزرەت دەبێ هێندێ دایکحیزی وەک ئاقایان لەبن دیواری ڕیز بکاو [بەکوشتنیان] وڵات لە شەڕی وان ڕزگار بکا."[٤٠] جگەلەوە جەختی دەکردەوە کە، "ئەمن ڕێزێکی زۆرم بۆ دایکی هووەیدا هەبوو. تەنانەت جارێک بۆ سەردانی چوومەماڵەکەشی. مومکین نیە جنێوم پێدابێ."[٤١] دیار نیە لەم دوو گێڕانەوەیە کامیان لە ڕاستی نیزیکترە.

شا تا ماوەیەک بەرامبەر بەو هەوڵانە کە بۆ گرتنی هووەیدا دەدران ڕاوەستا. هەرنەبێ بە دوو کەسی جیاوازی گوتبوو گرتنی هووەیدا بە مانای دادگاییکردنی ڕێژیمی پەهلەوییە. تەنانەت دوو ڕۆژ پێش گیرانی هووەیدا شا باڵیۆزی ئینگلستان لە ئێرانی دڵنیا کرد کە، "هووەیدا ناگرن، دووپاتی دەکەمەوە، نایگرن."[٤٢] بەڵام دووڕۆژ دواتر، هەر ئەو باڵیۆزە خەبەری گیرانی هووەیدای لە ڕادیۆ بیست. خۆش ئەوەیە کە باڵیۆزی ئینگلیس بە ڕواڵەت باوەڕی بە بەڵێنی دڵنیاکەرەوەی شا نەکردبوو و هەرئەو شەوە، پاش گەڕانەوە لە کۆشکی پادشایەتی زەنگی

---

* هووەیدا لە نامەیەکدا کە لە زیندانەوە ناردوویەتە دەرێ،بۆچوونەکانی خۆی لەو بارەیەوە باس کردوە. نێوەرۆکی نامەکەم لە فەسڵەکانی ١٥و١٦ی ئەم کتێبەدا لێک-داوەتەوە.

بۆ هووەیدا لێداو باسی مەترسیی گیرانیی دەگەڵ کردو پێشنیاری کرد کە هەرچی زووە لە ئێران رابکا. بەڵام هووەیدا گوێی نەدایە ئامۆژگاریی ئەو دۆستەشی. ئەوڕۆژەی شا قەولی بە پارسوونز دا کە هووەیدا ناگیرێ، دەگەڵ دووکەسی دیکەش لەو بارەیەوە قسەی کرد. هەردووکیان لە دۆستانی هووەیداو هەردووکیشیان نیگەرانی حاڵی بوون. یەکیان عەبدوڵڵای ئینتیزام بووو ئەوی دیکەیان مەهدیی سەمیعی شا بەڵێنی بە هەردووکیان دا کە گرتنی هووەیدا بەهیچ جۆر لە گۆڕێدا نیە.[٤٢] دەزانین کە هووەیدا پێوەندیی نیزیکی دەگەڵ ئەو دووکەسە هەبوو، و بۆیە دەکرێ وا دابنێین کە ئەو، بەڵێنە هیوابەخشەکانی شای لەرێگای ئەو دوو دۆستەوە بیستبوون.

ڕاست لەو ڕۆژانەدا کە شا دەگەڵ وتوویژەی گرتنی هووەیدا لە ململانەدا بوو، هووەیدا، بەهەڵە پێی وابوو پشتیوانیی بێئەملاوئەولای شای دەگەڵەو بۆیە، بێباک لەو مەترسییەی هەڕەشەی لەو دەکرد، لەفکری دروستکردنی حیزبێکی پادشاییخوازی تازەدا بوو. چەندوچۆنی ئەوهەوڵە لە ڕاپۆرتێکی باڵیۆزخانەی ئەمریکادا دەتوانین ببینین. دەبینین کە، "هوەیداو بەشێک لە هاوکارە سیاسییەکانی خەریکی باس...دەربارەی ژیاندنەوەی حیزبی ایران نوین دا بوون. هووەیدا بێ-شک پشتیوانیی ژمارەیەک لە سیاسەتمەدارانی پلەکانی خوارەوەی ئێرانی دەگەڵە. ئەم گرووپە دەگەڵ مەسەلەیەکی بنەڕەتی بەرەوڕوون. ئەوان نازانن داخوا پۆستە سیاسییەکانی پێشووی هووەیدا چەندیان داوێنی سیاسیی وی ئالوودە کردوە. هەرنەبێ یەکێک لە ڕۆژنامە نووسانی ئێرانی ئیددیعای کردوە کە هووەیدا بە زوویی دێتەوە نێو مەیدانی سیاسەت. هەرلەو کاتەدا، ئەم دەنگۆیەش لەسەر زارو زمانانە کە بەزوویی ئەویش وەک زۆر لە کۆنەوەزیرەکانو بە تۆمەتێکی وەک هی ئەوان دەگرن." ئەم ڕاپۆرتە سالیڤان نووسیبووی. بۆ "بەخۆشی-برینەوە" نووسراوەکەی بە "یادداشتێکی گاڵتەجاڕی" تەواو کردبوو. نووسیبووی: "ئەو سیاسەتمەدارانەی ئەمڕۆ بۆ پیاڵەیەکی شیاوی شەڕابە سیاسییە تازەکەی خۆیان دەگەڕێن... هەرلەو کاتەدا هەمیشە

گۆشە چاوێکیشیان لەسەر شایە؛ دەیانەوێ بە زەردەخەنەیەکی شایانە دڵنیا بن کە هەوڵەکانیان پشتیوانیی شاشیان دەگەڵە."[٤٠]

لەو نێوەدا، ئەو هێزانەی لایەنگری گیرانی هووەیدا بوون لەپشت پەردەوە بە توندی خەریکی کار بوون. سەرەنجام لە حەڤدەی خەزەڵوەری١٣٥٧دا شا چەند کەس لە ڕاوێژکارەکانی بانگ کردە کۆبوونەوەیەک. شاژنیش ئامادە بوو، جگەلەوە، مەهدیی پیراستە، جەوادی شەهرستانی، هووشەنگی نەهاوەندی، ڕەزای قوتبی، حەسەنی پاکڕەوان و عەلیقولیی ئەردەلانیش (کە تازە کرابوو بە وەزیری دەربار) لە کۆبوونەوەکەدا بەشدار بوون. کۆبوونەوە بە باسێکی کورت دەربارەی نوێکردنەوەی دەزگای بنیاتی پەهلەوی دەستی پێکرد. دوایە چالاکییە ئابوورییەکانی بنەماڵەی پادشایەتی خرانە بەر باس و قسە لە پێویستیی شەففافبوونی زیاتر لەو بوارەدا کرا. بڕیار درا لەوەودوا ئەو چالاکییانە هەتا بکرێ ئاشکرا بن و بکەونە بەر چاوی خەڵک. ئەم باسانە هیچیان وەختێکی زۆریان نەگرت. لەنەکاو شا دەستووری کۆبوونەوەی گۆڕی. گوتی ماوەیەکە هێندێک لە ڕاوێژکارەکانی، بە تایبەتی فەرماندەرانی سوپا داوای گرتنی هووەیدایان کردوە. ئەمجار داوای لە بەشداران کرد لەو بارەیەوە باس و ڕاوێژ بکەن.

سەرگەرمی قسان بوون کە تەلەفۆن زەنگی لێدا. شا گووشییەکەی هەڵگرت. چەند لەحزە هەموو بێدەنگ بوون. شا قسەی نەدەکردو هەر گوێی ڕاگرتبوو. پاشان، یەکسەر گوتی: "بە ڕێکەوت کۆمەڵێک لێرە کۆبوونەوەو ڕاست باسی ئەو بابەتە دەکەن." دیار نەبوو ئەوەی زەنگی لێدا کێ بوو. دیارە هێندێ لەو کەسانەی لە کۆبوونەوەکە ئامادە بوون دواتر گەیشتنە ئەو ئاکامە کە ئەو نەناسیاوەی قسەی دەگەڵ شا دەکرد ئووەیسی بوو. پاش چەند لەحزە بێدەنگی، شا لە کاتێکدا زەردەخەنەیەکی تاڵی لەسەر لێوان بوو دەستی لەسەر زارکی تەلەفۆنەکە داناو گوتی: "ئەویش هەر پێیوایە گرتنی هووەیدا لە نوێژی بەیانی فەرزترە."[٤٥]

چەند دەقیقە پاش ئەو وتوویژە تەلەفۆنییە، شا داوای لە ڕاوێژكارەكانی كرد هەركامیان لە بارەی پێشنیاری گرتنی هووەیداوە نەزەری خۆی ڕابگەیەنێ. هێشتا بە یەقینو بە وردی نازانین یەكیەكی ئەو كەسانەی لەوێ بوون چ نەزەرێكیان دا. پیراستە كە ئێستاش پێی-وایە دەنگدانی بە گیرانی هووەیدا، لە چوارچێوەی هەلومەرجی ئەوكاتدا، بڕیارێكی ماقووڵو مەنتیقی بووە، دەڵێ: "هیچكەس لەو ژوورە دەنگی نەیاری بە پێشنیاری گرتنی هووەیدا نەدا. شا لە ڕاستیدا جۆرێك قسەی دەكرد كە دیار بوو پێشتر لە بارەی گرتنی هووەیداوە بڕیاری خۆی داوە. پێم وایە تەنانەت ئەو تەلەفۆنەش كە كرا بە دەستووری شا خۆی بووە، دەیەویست لەم ڕێگایەوە دڵپەتەوییەك بدا بەو كەسانەی لە كۆبوونەوەكەدا بەشدار بوون."[٤٦]

وەك نەهاوەندییش دەگێڕێتەوە، لە كۆبوونەوەكەدا كەس دژایەتیی گرتنی هووەیدای نەكرد. لە قسەكانی ویدا خاڵێكی سەرنجڕاكێشی دیكەش هەیە. نەهاوەندی بە ڕاوێژێك كە لەخۆبایی‌بوونێكی پێوە دیارە ئیددیعا دەكا كاتێك گیرانی هووەیدا بڕیاری بۆ درا، ئەو پێشنیاری بە شا كرد كە لە پێشدا شا بۆخۆی، بە تەلەفۆن هووەیدای لەو بڕیارە ئاگادار بكاو پاشانیش حەتمەن بۆ گرتنی سەرۆكوەزیری پێشوو كەلك لە فەرماندەرانی سوپا وەربگرێ![*][٤٧]

---

[*] بۆ باسی وتوویژەكانی ئەو كۆبوونەوەیە كەلكم لە چەند سەرچاوەی جۆراوجۆر وەرگرت. وتوویژم دەگەڵ مەهدیی پیراستە كرد؛ چوومەوە سەر نووسینەكانی نەهاوەندی-هەم كتێبەكەی كە فەڕانسەییەو هەم وتوویژەكەی لە مێژووی زارەكیی ئێراندا- گێڕانەوەی دەستی دووەمی كۆبوونەوەكە دەتوانرێ لە وتووێژی مێژووی زارەكیی ئێرانی هاروارد دەگەڵ فاتمەی پاكپەرواندا ببینرێ. وەرگێڕاوی فارسیی ئەم وتووێژە، لەژێر ناوی **بیرەوەرییەكانی فاتمەی پاكپەروان** دا چاپ كراوە. گێڕانەوەی داستانیی ئەم كۆبوونەوەیە دەكرێ لە **گیرانی هووەیدا** بە قەڵەمی سەعیدەی پاكرەوانیشدا ببینرێ. لە هەردووكی ئەم سەرچاوانەدا ئیددیعا كراوە كە پاكرەوان دژی گیرانی هووەیدا بووە.

دوای تەواوبوونی دەنگوەرگرتنەکە وەختێک گیرانی هووەیدا حەتمی بوو، شا ڕووی کردە شاژن‌و داوای لێکرد تەلەفۆن بۆ هووەیدا بکاو خەبەری گیرانەکەی پێ بڵێ* شاژن بە تووڕەیی ئەو پێشنیارەی ڕەت کردەوە. گوتی حازر نیە باری ئەو قسەکردنە بخاتە سەر شانی خۆی. گۆیا دەمەقاڵێیەکی توند کەوتۆتە نێوان شاو شاژن. شا دەسبەجێ ئەوانی دیکەی لە ژوورەکە دەرکردوەو وتوویژەکەی لە خۆبەخۆیایەتیدا درێژە داوە.[48] ئەوەی لەو چەند ساتەدا لە نێویاندا گوزەراوە ڕوون نیە.

دیارە هووەیدا تەنانەت پێش وتوویژی تەلەفۆنی دەگەڵ شاش، هێندێ نیشانەی لە دەستدا بوون کە شا لە فکری گرتنیدایە. یەکەمین نیشانەی ڕاستەوخۆی ئەو گۆڕانەی فکری شای لە دیدارێک دەگەڵ ڕەزای قوتبیدا هاتە دەست. سێ حەوتوو پێش ئەو کۆبوونەوەیە کە سەرەنجام چارەنووسی هووەیدای تێدا ساغ بۆوە، شەوێکیان لە ماڵی دوکتۆر فریشتەی ئینشا، ڕەزای قوتبی ڕووی کردە هووەیداو گوتی ڕەنگە تەنیا ڕێگای دەرچوون لە قەیران‌و بنبەستی ئێستا "دروستکردنی تریبوونێک بێ کە لەودا ڕێبەرانی ڕێژیم بتوانن دیفاع لە ڕابردووی خۆیان بکەن‌و وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەنەوە کە لە بارەی ڕابردوویانەوە لە مێشکی خەڵکدا هەن."[490] هووەیدا، لە حاڵێکدا تەواوی ئەو ماوەیە پیپەکەی بە دەمەوە بوو، بە وردی گوێی بۆقسەکانی قوتبی ڕاگرت. قسەکانی قوتبی تەواو بوون‌و هووەیدا وەڵامێکی نەدایەوە. بە بێ‌موبالاتی شانی هەڵتەکاندو بێدەنگییەکی ماناداری هەڵبژارد.



سەرەنجام ئێوارەی ڕۆژی حەڤدەی خەزەڵوەر، شا زەنگی بۆ

* شا تەنانەت لە وەڵام بۆ مێژووشدا خۆ لە قبووڵکردنی هەرچەشنە بەرپرسایەتییەک بەرامبەر بەگرتنی هووەیدا دەبوێرێو دەڵێ: "[ئەزهاری]یش هەوڵی دا بەڕێگایەکدا نەیارەکان ئارام بکاتەوەو پێش هەموو شتێک بڕیاری دا دوازدە کەس لە کەسایەتییەکان یەک لەوان هووەیدا بگرێ." (ص٤٠٢).

هووەیدا لێ‌دا. ئەو ڕۆژانە هووەیدا زۆرتر لەماڵی دایکی بوو. شا گوتی: "بۆ پاراستنی ئەمنیەتی ئێوە، دەستوورمان داوە چەند ڕۆژێک بتان‌بەنە شوێنێکی ئەمن."[50] دیارە لە چەند حەوتوو پێش ئەم وتووێژەوە، هووەیدا بەکردەوە لە ماڵی زیندانی بوو. پارێزەرەکانی دەستووریان پێ‌بوو نەهێڵن بچێتە فڕۆکەخانەی میهراباد.[51]

دەمەساتێک دوای وتووێژە کورتەکە دەگەڵ شا، هووەیدا زەنگی بۆ ماڵی بنەماڵەی ئێنشا لێ‌داو داوای لە دوکتۆر فریشتەی ئێنشاو دایکی کرد هەرچی زووە بێنە ماڵی دایکی هووەیدا. دوکتۆر فریشتەی ئێنشا دەڵێ: "کاتێک وەژوور کەوتین، ئاغا لەنێو ژوورەکەدا پیاسەی دەکرد. تووڕە دیار بوو. گوتی شا زەنگی بۆ لێ‌داوەو گوتوویەتی بەزوویی دێن بۆ گرتنی. پێم‌گوت دەبێ هەرئێستا ڕابکەی. گوتم ترومبێل حازرە. جێگای ئەمنیشت بۆ پەیدا دەکەم. پێکەنینێکی تاڵی هاتە سەر لێوان‌و بە ڕاوێژێکی جەفەنگاوییەوە پرسی، "لە کەنگێوە بوویە سیاسەتمەدار؟" ئەمجار هووەیدا هۆی سەرەکیی دیدار دەگەڵ مریەم‌و دوکتۆر فریشتەی ئێنشای هێنایە گۆڕێ. گوتی: "دەمەوێ لە نەبوونمدا دایکم بە ئێوە بسپێرم." چاوی پڕ ببوون لە فرمێسک. فریشتەو مریەمیش خەریک بوو بگرین. دوکتۆر فریشتەی ئێنشا دەڵێ: "کۆڵەگرووم دە ئەوکێ مابوو. بەوحاڵە، هەوڵم دا بە ورەیەکی باشەوە بڵێم، نیگەران مەبە. گوتم وەک دایکی خۆم ئاگام لێی دەبێ."[52] دوکتۆر فریشتەی ئێنشا دەگەڵ هەموو مەترسییەک کە هەڕەشەی لە خۆی‌و بنەماڵەکەی دەکرد ئەو بەڵێنەی بردە سەر.

دەوری سەعات سێی پاش نیوەڕۆ، چەند سەعاتێک دوای تەلەفۆنی شا، دوو فەرماندەری سوپا، بە دوو ترومبێلی بێنزی ڕەنگ‌تاریکەوە چوونە حەوشەی ماڵی دایکی هووەیدا. لەیلای ئیمامی‌و هێندێکی دیکە لە دۆستانی هووەیدا لەسەر داواو پێشنیاری خۆی، هاتبوونە وێ. هووەیدا بە تایبەتی دەیەویست ناسری یەگانە، کە دۆستی جێگای متمانەی خۆی‌و وەختێکیش سەرۆکی دیوانی بەرزی وڵات بوو، لە ساتەوەختی گیرانیدا لە ماڵی دایکی هووەیدا بێ. دەیەویست یەگانە شاهیدی گیرانەکەی بێ.[53]

لەیلا، هەروەک ڕەفتاری هەمیشەی بوو، سەرکێشیی دەنواندو ئەم-جارە بەربووە گیانی ئەو دوو مەئموورە داماوە کە هاتبوون هووەیدا بگرن. دەیگوت: "گووتان کردە ئەم وڵاتەو ئێستاش هاتوون ئەم بەستەزمانە دەکەنە قوربانی. هووەیدا لەژێر مێزەکەوە، نووکە لاقێکی لە لاقی لەیلا دا. دەیەویست ئارامی بکاتەوە."[٥٤] بەڵام لەیلا ئارامگرتنی نەبوو. فەزایەکی زۆر ئاڵۆز بوو. لەو نێوەدا هووەیدا ڕووی کردە فەرماندەرەکانی سوپاو پرسی داخوا دەتوانێ بە ترومبێلی خۆی بچێتە زیندان. دەیەویست بەلاقی خۆی بچێ، نەک بە گیراوی ماڵی دایکی بەجێ بێڵێ. ئەو فەرماندەرانەی بە نوێنەرایەتیی فەرمانداری نیزامی هاتبوون هووەیدا بگرن وەڵامیان دایەوە کە ناتوانن لەو بارەیەوە بڕیار بدەن. گوتیان دەبێ لە کاربەدەستانی سەرەوەتر بپرسن. پرسیاریان کردو وەڵام هاتەوە کە هووەیدا دەتوانێ بە پەیکانەکەی خۆی بچێتە زیندان. لە پێشدا چەمەدانێکی چووکەڵەی ئامادە کردبوو. چەند دەست لباس، هێندێ لەو دەرمانانەی بەکاری دێنان و چەند کتێبێکی تێدا بوون. ئەمجار بە تاقی تەنیا، سواری پەیکانە شینە ناسراوەکەی خۆی بووو لەحاڵێکدا دوو بێنزی ڕەش ئێسکۆرتیان دەکرد، ئەو بۆ دواجار ماڵی دایکی بەجێ هێشت.

هەرئەو شەوە زەنگی بۆ بنەماڵەی ئێنشا لێداو داوای لێکردن سبەینێ دایکی بۆ چاوپێکەوتنی بەرنە زیندان. لە خانوویەکی ئەمنی ساواک، لە شەقامی فریشتە لە شیمالی تاران زیندانی بوو. ئەو ماڵە جگە لە چەند پارێزەرو هووەیدا کەسی لێنەبوو. ڕۆژی دواتر دایکی هووەیدا، دەگەڵ دوکتۆر فریشتەی ئێنشا چووە سەردانی کوڕەکەی. جارێکی دیکەش، دوای چەند حەوتوو، ئەو دایکو کوڕە یەکتریان دیتەوە. هەردوو دیدارەکە کورت بوون. هەردوو جار دایکی هووەیدا دەگریا. هەردووک جار هووەیدا زۆری هەوڵ دەدا بە دەماغو هیوادار دیاری بکا. دەیەویست هەرچۆنێک بێ دڵی دایکی ئارام بکاتەوە، بەڵام دایک ئارام نەدەبۆوە. دیارە نیگەرانیو خەمۆکیی ئەفسەرولملووک تازە نەبوو. لەو ڕۆژەوە کە مەنسوور تیرۆرکرا، دایکی هووەیداش نیگەران بوو کە

کوڕەکەشی دواڕۆژێکی خوێناویی هەبێ.[55]

بنەماڵەی هووەیدا بە ئازادی لە زیندان سەریان دەدا. زۆریان هەوڵ دەدا ژیانێکی تا ڕادەیەک ئاسوودەی لە زیندان بۆ پێک بێنن. بەڵام هەتا دەهات هووەیدا زیاتر ناڕەحەت و خەفەتبار دەبوو. هەمیشە خواردنیان لە ماڵێ‌را بۆ دەبرد. نانی نیوەڕۆی دوکتور فریشتەی ئینشا سازی دەکردو نانی شەویشی لەیلا. هووەیدا دەستی بە تەلەفۆنیش ڕادەگەیشت. دەی-توانی دەگەڵ هەرکەس پێی خۆش بێ قسە بکا. هەمیشە دەگەڵ دۆستان- و هاوکارانی پێشووی، و جاری وابوو تەنانەت دەگەڵ ئەندامانی بنەماڵەکانیشیان، لە پێوەندیدا بوو.

چەند ڕۆژ دوای دەستپێکردنی دەورانی زیندانەکەی، هووەیدا لە ڕێگای دوکتۆر فریشتەی ئینشاوە پەیامێکی بۆ شا نارد. دەیەویست بزانێ "سیناریۆ چیە؟" و چ کەسانێک خوازیاری گیرانی وی بوون، شا هەرگیز بۆخۆی وەڵامێکی پەیامی هووەیدای نەدایەوە. بەڵام لە ڕێگای فەریدوونی جەوادییەوە، کە لە باوەڕپێکراوانی شاژن بوو، پەیامێک بۆ هووەیدا ناردرا. لە پەیامەکەدا هاتبوو کە سیناریۆیەک لە گۆڕێدا نییەو پاڵپەستۆ بۆ گیرانی هووەیدا نەک لەلایەنێک و قۆڵێکەوە بەڵکوو لە هەمووانەوە بووە.[56]

جگە لە ئەندمانی بنەماڵەکەی، هووەیدا لە زیندان بە ڕێکوپێکی دەگەڵ تیمسار موقەددەم، کە لەو کاتەدا سەرۆکی ساواک بوو، دیداری دەکرد. لەو وتووێژانەدا کە ئەودەم لە نێوان دەوڵەت و قۆڵە جۆراوجۆرەکانی نەیاراندا هەبوون، موقەددەم نەخشێکی سەرەکیی لە ئەستۆ بوو. هەرلەو کاتەدا، حەوتووی جارێک دەچووە سەردانی هووەیداو ئەوی لە ئاڵوگۆڕەکانی کۆمەڵ ئاگادار دەکرد. ڕەنگە هەر بەهۆی ڕاپۆرتەکانی موقەددەمەوە بووبێ کە هووەیدا هەتا ڕۆژی هاتنەوەی ئایەتوڵڵا خومەینی ڕوودانی کۆدیتایەکی سەربازیی بە شتێکی حەتمی دەزانی. دیارە بیرەوەریی کۆدیتای ٢٨ی گەلاوێژ ئەو چاوەڕوانییەی هووەیدای بەهێزتر دەکرد.[57]

ئەوەندەی ئێمە بزانین، کەسێکی دیکەش لە زیندان چووە سەردانی

هووەیدا. ئەو ناوی یووری لوبرانی بوو کە بەکردەوە باڵیۆزی ئیسرائیل لە ئێران بوو. دیارە ئیسرائیل لە ئێران باڵیۆزخانەی ڕەسمیی نەبوو، بەلام دەفتەری [پاراستنی] قازانجەکانی "لەلایەن دەوڵەتی ئێرانەوە لە هەموو بوارێکی ئەسڵیدا، وەک باڵیۆزخانەیەک حیساب دەکرا."[580] لە سەرەتای دەیەی پەنجادا، سەرۆکایەتیی دەفتەری ئیسرائیل لە ئەستۆی لوبرانی بوو کە پێوەندییەکی تایبەتیو نیزیکی دەگەڵ هووەیدا پەیدا کردبوو. نەکهەر بۆ زۆربەی میوانداریيەکانی شەوانەی هووەیدا بانگهێشتن دەکرا، بەڵکوو بە ڕێکوپێکی لە دەفتەری سەرۆکوەزیریش دیدارو وتووێژی دەگەڵ دەکرد. لە بارێکەوە، لوبرانی تەنیا هەڵاواردنی قاعیدەیەک بوو کە هووەیدا بۆخۆی لە سەردەمی سەرۆکوەزیرییەکەیدا جێگیری کردبوو. هەروەخت باڵیۆزێک لە وڵاتێکی دەرەوەڕا دەهاتە دیداری هووەیدا، ئەو جەختی دەکردەوە کە یەکێک لە سکرتێرەکانی لە کۆبوونەوەدا ئامادە بێ. تەنیا هەڵاواردن لوبرانی بوو.[59] کاتێک لەو بارەیەوە لە لوبرانیم پرسی، وەڵامی دایەوە: "ئەوەندەی بۆخۆم دەمزانی، هووەیدا هەڵاواردنێکی بۆمن دانەدەنا." هەرلەو کاتەدا، دەیگوت هەمیشە هەستی کردوە پێوەندییەکی تایبەتیی دەگەڵ هووەیدا هەیە. دەیگوت: "هەرلەبەر ئەو دۆستایەتییە بوو کە وەختێک کەوتە زیندان، ئەمنیش لە هەموو توانای خۆم کەلکم وەرگرت بۆ ئەوەی پێش دەرچوون لە ئێران، جارێک لە زیندان چاوم پێی بکەوێو خواحافیزیی لێبکەم."[600]

لە دەورانێکدا کە هووەیدا هێشتا لە زیندانی شادا بوو، دەوری سێ-حەوتوو پێش گەڕانەوەی ئایەتوڵڵا خومەینی بۆ ئێران، کاربەدەستانی فەڕانسە جارێکی دیکە لەڕێگای کەسێکی باوەڕپێکراوەوە پێوەندییان دەگەڵ دوکتۆر فریشتەی ئینشا گرتو داوایان لێکرد ڕەزامەندیی هووەیدا بۆ ئۆپێڕاسیۆنێکی کۆماندۆیی وەربگرێ. قەرار بوو کەسێک بەندییەوانەکانی هووەیدا بە کۆمەگی دەرمانێکی تایبەتی دەخەو بکا. ئەودەم گرووپێک کۆماندۆی بەکرێگیراوو بژاردەی ئەمریکایی هووەیدای لە زیندانەوە بەرێتە فڕۆکاخانەو بە فڕۆکەیەکی تایبەتی لە ئێرانی بەرێتە دەر. دەیانگوت تەنانەت پێش ئەوەی کاربەدەستانی

ئێرانی پێبزانن کە هووەیدا لە زیندان ڕایکردوە ئەو لە دەرەوەی ئێران دەبێ. هووەیدا گوێی بۆ وردەکاریی پرۆژەی فەڕانسەییەکان ڕاگرتو ئەمجار بە پێکەنینێکی تاڵەوە گوتی: "وا دیارە فیلمی جیمزباندییان زۆر دیوە."[610]

بەڵام ڕۆژێک کە هووەیدا لە موقەددەمی بیست کە شاو شاژن بە زوویی ئێران بەجێ دێڵن ورەی بە جارێک دابەزی. ئیدی، ئاسۆ بە تەواوی لیڵوتاریک دیار بوو. هووەیدا پێش ئەو کاتە هەمیشە پێوەندی دەگەڵ شاو شاژنی لە بنەماڵەکەی قەدەغە کردبوو. بەڵام کاتێک حەوتوویەک پێش ڕۆیشتنی شا لە ئێران، موقەددەم خەبەری ئەو سەفەرەی بە هووەیدا دا، نەکهەر نیگەرانییەکەی دووچەندان بوو، بەڵکوو ئەمجار، وەختێک دوکتۆر فریشتەی ئینشا پێشنیاری کرد کە پێوەندی بە بنەماڵەی پادشایەتییەوە بگرێو داوایان لێبکا کاتی چوونەدەر لە ئێران هووەیداش دەگەڵ خۆیان بەرن، هووەیدا بەربەرە-کانیو موخالەفەتێکی نەکرد. تەنیا بەوەندە وازی هێنا کە گوتی: "پێوەندی بگرە، بەڵام بزانە کە وەڵامیشت نادەنەوە."[620]

بەڕێکەوت بۆچوونەکەی ڕاست دەرچوو. دوکتۆر فریشتەی ئینشا چەندین جار، بە تایبەتی لە ڕێگای فەرەیدوونی جەوادییەوە، هەوڵی دا چاوی بە شاژن بکەوێ. هەموو هەوڵەکانی بێ ئاکام بوون. پەنای بۆ چەند واسیتەی دیکە بردو ئەوانیش هیچیان سوودیان نەبوو. وەختێک هووەیدا بیستی بنەماڵەی پادشایەتی حازر نەبوون فریشتە ببینن، لەنەکاو حاڵەتێکی ناهومێدیو دڵساردی بەسەر ڕوخساریدا زاڵ بوو. گوتی: "ئەگەر ڕۆژێک لە تۆیان پرسی لەم لەحزەیەدا چ هەستێکم هەبوو، بڵێ، "J'ai ete ecoeure" واتە حاڵەتێکی پڕ لە بێزاریی هەبوو."[630]

شا لەحاڵێکدا چاوی پڕ لە فرمێسک بوون، ٢٦ی بەفرانباری١٣٥٧(١٩٧٩) ئێرانی بەجێ هێشت. هەواڵی سەفەری شا خۆپێشاندانێکی پرشۆرو بەڕواڵەت خۆڕسکی لە تاران وەڕێ خست. وا دیار بوو هەمووان دەیانزانی بەم سەفەرە، تۆماری تەمەنی بنەماڵەی پەهلەوی تێکەوە دەپێچرێ. گەلاوێژی ١٣٥٦، سالیڤان پێشبینیی

کردبووکـە، "پاڵەپەسـتۆی دیموکراسـیی ڕاسـتەقینە لەوانەیـە پێکهاتـەی کۆمـەڵی ئێـران لەبـەر یـەک هـەڵوەشێنێ...پێشـتریش ئـاڵوگۆڕێکی وەک ئەوە لە ئێران ڕووی دابوو، و هـەموو جارێ ئەمریکا کۆمەگی کرد بۆ ئەوەی "ئەمنیەتی نێوخۆیی" بەرقـەرار بکرێ. ئەگـەر قازانجی خۆمـان لـە مانەوەی شادا دەبینین، ...دەبێ بە وردی بزانین لەوبارەیەوە ئێمە چیمان لـە دەسـت دێ."[64] بـەڵام بـە ڕواڵـەت ئـەمریکا گەیشـتە ئـەو ئاکامـە کـە مانەوەی شا ئیدی دەگەڵ قازانجەکانی تێکەڵ نیە. دوای ئەوە نەکهـەر هـەنگاوێکیان بـۆ کۆمـەگ بـە شـا هـەڵنەهێنایـەوە، بـەڵکوو لەجێدا تاقـە سیاسەتێکیشیان بەڕێوە نەدەبرد. هێندێک لایەنگری سیاسـەتی سـەرکوت بـوون. هێنـدێکی دیکـە، وەک سـالیڤان دایـم پێشـنیاریان بـە شـا دەکـرد دەوڵـەتێکی "ائتلافـی بێنێتـە سـەرکار."[65] جگەلـەوە، هـەر ئـەم سـالیڤانە هەرنـەبێ لـە بـەفرانباری ١٣٥٧ەوە گەیشـتبووە ئـەو ئاکامـە کـە ئـەمریکا دەبێ شا وەلا بنێ. دەیگوت، "دەبێ شـا لـەبیر خۆمان بەرینەوەو وەدوا قـازانجی نیشـتمانیی خۆمـان بکـەوین."[66] لـە ڕاسـتیدا دەتـوانین بڵێین هـەر لە سەرماوەزی ساڵی پێشترەوە سـالیڤان گەیشـتبووە ئـەو ئاکامە کە شـا جگە لە بەجێهێشتنی ئێران چارەیەکی نیە. دەیگوت ڕەنگە لەم ڕێگایـەوە، "بکرێ ڕواڵەتی قانوونی بنەڕەتی بپارێزرێو هێزەکانی سوپا بـە دەست-لێنەدراوی بمێننەوە."[67]

شا لە ٢٦ی بەفرانباردا، ڕاست ڕۆژێک دوای دانی متمانـەی مـەجلیس بە کابینەی شاپووری بەختیار، لە ئێران چووە دەرێ. بـەختیار تـەمەنێک لە بەرەی نیشتمانیدا دژی شا خەباتی کردبوو، و کاتێک بووە سـەرۆک-وەزیـر کـە شـانوشـکۆو دەسـەڵاتی سیاسـیی ئـەو پۆسـتە تـەنیا خەرمانەیـەکی کـەمڕەنگی لێمابۆوە. لە ڕاسـتیدا هـەر لـە ڕۆژی یەکـەمی دەسـەڵاتی بـەختیارەوە، دیـار بـوو کـە زۆری شانسـی سـەرکەوتن نیـە. هێزە عورفییەکانی کۆمەڵ پشتیوانییان لێنەکرد. بەرەی نیشتمانی ئەوی لـە ڕیزەکـانی دەرکـردو سـوپاش متمانەیـەکی پێـی نـەبوو. جگەلـەوە، لە سەرەتای فیوریەوە باڵیۆزخانەی ئەمریکاش بۆچوونی خۆی لە بارەی دواڕۆژی ئێرانەوە گۆڕیو گەیشتە ئەو ئاکامە کە، "بە لێکدانـەوەی ئێمـە،

بزووتنــەوەی ئیســلامیی شــیعەکانی ئێــران، بــە ڕێبەرایــەتیی ئایــەتوڵڵا خومەینی، زۆر ڕێکخراوتر، ڕووناکبین‌ترو دژەکۆمۆنیست‌تر لەوەیە کە نــەیارانی ئیســلام تائێســتا بــە ئێمــەیان گوتبــوو. دوور نیــە لــە درێــژەی حکوومەتکردندا، جۆرێک یەکیەتی‌و هاوکاری لە نێوان هێزە ڕووناکبیرییە ڕووحـــانی‌و ناڕووحانییەکانـــدا پەیـــدا بـــێ‌و بەرهـــەمی ئـــەوجۆرە دیموکراسییەش، دەتوانێ شتێکی وەک دیموکراسیی ڕۆژئاوایی بێ."[68]

بـەختیار لـە یەکـەمین حـەوتووی حکوومـەتی خۆیـدا، ساواکی هـەڵ-وەشـاند. بـەڵام ئـەوەی بـە ڕاسـتی بـە نیشـانەی کۆتـایی سـەردەمی پەهلەوی‌و سـەرۆک‌وەزیریی بـەختیار دەژمێردرا، "بەیاننامـەی بێلایـەنیی سوپا" بوو. دەزانین کە ڕۆژی٢٢ی ڕێبەندان دیدارێکی گرنگ لـە نێوان قـەرەباغی‌و بـەختیارو بازرگانـدا ڕووی دا. لـە ڕاسـتیدا قـەرەباغی پـاش چوونـەدەر لـە ئێـران هەمیشـە بـە ڕاشـکاوی جـەختی دەکـردەوە کـە ڕاگەیاندنی بێلایەنیی سوپا لە کۆبوونـەوەی فەرماندەرانی سـوپادا پەسـند کـراو هـیچ زەمینەیـەکی دیکـەی نـەبوو. بـەڵام بەڵگـەکانی باڵیۆزخانـەی ئەمریکا لە ئێران داستانێکی دیکە دەگێڕنەوە. بەپێی ئەو بەڵگانە، ئێوارەی یازدەی فێوریە، قەرەباغی، سـەرۆکی ستادی سـوپا، بەختیار سـەرۆک-وەزیر، و بازرگان یەکتریان دیت‌و "بڕیار درا قەرەباغی هێزەکانی سوپا لە تاران بەرێتە دەرو شار بداتە دەستی هێزە شۆڕشگێڕەکان."[69] بەم-جۆرە، هەنگاوی یەکەم بەرەو پووچەڵکردنەوەی سوپاو هاتنەسەرکاری ڕووحانییەکان هەڵێنرایەوە.

بـە ڕاگەیەنـدرانی بێلایـەنیی سـوپا، سـەربازان یـان لـە پاسـگاو سـەربازخانەکان هـەڵاتن، یـان ئەگـەر لـە شـەقامەکان بـوون گەڕانـەوە سـەربازخانەکان. لـە تـەواوی ئـەو دەورانـەدا هووەیـدا هێشـتا چـاوەڕێی کۆدیتایـەکی سـەربازی بـوو. دیـارە دواتـر دەرکـەوت چاوەڕوانییەکـەی تەواو دۆنکیشۆتانەش نـەبووە. ڕۆژی دوای ڕاگەیاندنی بێلایـەنیی سـوپا، ڕاسـت چەنـد سـەعات دوای ئـەوەی زۆر لـە سـەرانی سـوپا گیرابـوون، باڵیۆزخانـەی ئـەمریکا لـە تـاران تـەلگرافێکی لـە کۆشـکی سـپی وەرگـرت. دەوڵـەتی ئـەمریکا لـەو ڕێگایـەوە ڕەزامەنـدیی خـۆی دەگـەڵ کۆدیتایـەکی

سەربازی لەلایەن سوپاییانی ئێرانەوە ڕاگەیاند.[٧٠] ڕاستییەکەی ئەوە بوو کە پێشتر، هەرئەم کۆشکی سپییە، ژەنراڵ هوویزەری ناردبووە ئەم وڵاتە تا سوپای ئێران لە کۆدیتا بە دیفاع لە شا دوور بخاتەوە. بە فەرماندەرانی گوتبوو ئەمریکا کۆدیتایەکی وا تەحەممول ناکا.[٧١] دیارە بڕیاری تازەی ئەمریکاش وەک زۆر لە سیاسەتەکانی شا خۆی، کەپەنکی پاش بارانە بوو.

بەڕاگەیەندرانی بێلایەنیی سوپا، نیگابانەکانی هووەیدا کە هەموویان ئەندامی ساواک بوون لە ترسی گیانی خۆیان هەڵاتن. پێشنیاریان بە هووەیداش کرد هەڵێ. بۆ ئاسانکردنی کارەکەی سویچی ترومبێلێکو دەمانچەیەکیشیان دایە.[٧٢] هووەیدا گوێی نەدایە پێشنیاری نیگابانەکان. لە جیاتی ڕاکردن، زەنگی بۆ دوکتۆر فریشتەی ئینشا لێداو گوتی دەیەوێ خۆی تەسلیمی کاربەدەستانی تازە بکاو داوای لە فریشتە کرد ئەو کارە ڕێک بخا. لە پێوەندی دەگەڵ ئەم بڕیارەدا هووەیدا زەنگی بۆ کەسێکی دیکەش لێدا. حەوتوویەک پێش، لەیلای ئیمامی بۆ چارەسەری ددانەکانی چووبووە پاریس. دوا دیداری دەگەڵ هووەیدا بە قسەلێک-هەڵبەزینەوە تەواو ببوو. لەیلا لە ڕووبەڕووبوونەوەی هووەیدا دەگەڵ شا تووڕە بوو. دەیگوت ڕووبەڕووبوونەوەکەی شەرمێونانەو زەبوونانەیە. لەحاڵێکدا هووەیدا لە چاوەڕوانی بەولاوە چارەیەکی نەبوو، زەنگی بۆ پاریس لێداو ئەحواڵی لەیلای پرسی. لەیلا کە لە ڕێگای چاپەمەنییەوە ئاگای لە دەنگوباسی ئێران هەبوو وەڵامی دایەوە کە، "لەمن گەڕێ، وەزعی تۆ گرنگە. چۆنی؟" هووەیدا وەڵامی دایەوە کە حاڵی خەراپ نیە، بەڵام نیگەرانی وەزعی وڵاتە. لەیلا پێشنیاری کرد کە هووەیدا لە دەرفەت کەلک وەرگرێو هەتا زووە لە بەندیخانە ڕابکا. هووەیدا پێشنیاری لەیلاشی قبووڵ نەکرد. گوتی "هۆیەک بۆ ترسانم نیە، کارێکم نەکردوە. دەمەوێ خۆم بەدەستەوە بدەم. خەبەر بە دۆستە فەرانسەییەکانم بدەو."[٧٣] ئەمە دواوتوویژی تەلەفۆنیی هووەیدا بوو.

دوکتۆر فریشتەی ئینشا سەرەنجام توانی دەگەڵ داریووشی فرووهەر، کە لە وەزیرانی کابینەی تازە بوو، پێوەندی بگرێ. بە کۆمەگی

وی گرووپێکی پێکهاتوو لە ڕووحانییەک، گاردێکی چەکدار، نوێنەرێکی وەزارەتی داد، دەگەڵ فریشتەی ئینشاو مێردی خوشکی بە دوو ترومبێلی سواری بچنە ڤیلای ساواک لە شیان، لە نیزیک تاران. هووەیدا چەند حەوتووی دوایی لەو خانووەدا بەسەر بردبوو. شەقامەکانی شار هەموو قەڵەبالغ بوون. خەڵک بە هەزاوی لە پیادەڕۆو شەقامەکاندا دەسووڕانەوە. شۆری بێسەروبەرو تێرۆری لەخۆوەی شۆرش لەهەوادا شەپۆلیان دەدا. لاوان، چەکبەدەست سەرمەست لە بادەی سەرکەوتن، ئیدارەی شەقامەکانی شاریان بەدەستەوە گرتبوو. شەوی پێشتر هێندێک لە عەمبارەکانی سوپا پەلامار درابوون و ئەو تفەنگو دەمانچەو موسەلسەلە "دەستبەسەرداگیراو"انەی بە دەست ئەو لاوانەوە بوون هەموو دەسکەوتی ئەو پەلامارە شەوانەیە بوون. گرووپە شۆرشگێڕەکانیش لەو هێرشانەدا بەشدار بوون و لەو ڕێگایەوە ڕادەیەکی زۆر چەکیان بەدەست هێنا. یەکێک لەو گرووپانە تەنانەت تانکێکیشی بە "دەسکەوت" گرتبوو، و لە یەکدوو ڕۆژی سەرەتای شۆرشدا لەشەقامەکانی تاران دەیگێڕا. هێزە شۆرشگێڕەکان پەلاماری زیندانەکانیشیان دا. لە شۆرشی فەڕانسەدا، باستیلیان گرت و لەوە بەدوا، گرتنی زیندان بوو بە ڕوکنێکی واجبی هەموو شۆرشێک. بەڵام تا شەوی سەرکەوتنی شۆرش کەموزۆر هەموو زیندانییە سیاسییەکانی ئێران لە زیندان ئازاد کرابوون. ئاکامی "گرتنی باستیل" ئەم جارە ڕزگاربوونی ئەو دەستەیە لە سەرانی ڕێژیمی پێشوو بوو کە هەروا لە زیندان بوون. دیارە هەموو ئەو زیندانییانە نەیانتوانی هەڵێن. بەشێکیان کەوتنە دەستی کۆمەڵانی هەژاوی خەڵکو کەوتنە بەر لێدان و جنێوپێدان و زۆربەشیان درانە مەدرەسەی "رفاه" کە هەم بنکەی ئایەتوڵڵا خومەینی و هەم ناوەندی فەرماندەریی شۆرش بوو.

بڕینی شەقامەکانی تاران و گەیشتن بە زیندانی هووەیدا کارێکی هێندە ئاسان نەبوو. دیارە ئەوە کە لە نێو ئەو کۆمەڵەی دەچوون هووەیدا وەربگرن ڕووحانییەکیش هەبوو کاری تێپەڕین لە شەقامەکانی ئاسانتر دەکرد. زۆربەی شەقامەکان سەنگەربەندی کرابوون. لاوانی هەر

گــــەرەکێک، زۆرتـر موسەلسـەل‌بەدەست، نیگابـانیی ئـەو سـەنگەرانەیان وەئەستۆ گرتبوو. هەتا دەگەیشتنە یەکێک لەو سەنگەرانە ڕووحانییەکەی دەگەڵیان بوو بە پاسدارە خۆکردەکانی شۆرشـی دەگوت، "ئێمـە لەلایـەن ئیمامـەوە مەئمووریـیەتمان هەیـە."، و هەرئـەو قسـەیە بۆکرانـەوەی ڕێگـاو سـەنگەرەکە بەس بوو.

کە گەیشتنە شیان، وەزعەکە نـەختێک خەتـەرناک دیـار بـوو. خـەڵکی دێیەکـە کـە خۆشـیی شـۆرش کـەوتبووە کـەوڵیان، لـە دەوروبـەری ئـەو ڤیلایەی ساواک کە هووەیدای تێدا بەنـد کرابـوو، خـڕ ببوونـەوە. وا دیـار بوو نازانن کێ لەو چوار دیوارییەدا زیندانییە. بەوحاڵە تووڕە دیار بوون. گۆیـا دەیـان‌زانـی خانووەکـە هـی سـاواک بـووەو هـەر ئـەوە ڕقـی هەسـتاندبوون. دووبارە بە کۆمـەگی ئەو ڕووحانییـە، بـە نێـو قەڵـەباڵغیی لادێییەکانـدا ڕێگایـەک کرایـەوەو دەرگا ئاسـنەکانی ڤیلاشـیان هـەرچۆنێک بـوو کـردەوەو چوونـە حەوشـەی ماڵەکـە. جادەیـەکی خیزڕێـژ دەچـووە خانووەکە، و هێشتا نەگەیشتبوونە ئاخری جادەکە کە هووەیدایان دیت. لـە هـەیوانی پێشـەوەی خانووەکـەدا تـەنیاو بـێ‌پـارێزەر ڕاوەسـتابوو. بلووزێکی یەخـەدرێژی خـاکی‌ڕەنگ‌و شـەڵوارێکی ڕەنگ‌تـارێکی دەبـەردا بـوون. تـازە ڕیشـی تاشـیبوو. بـەڕێزەوە دەگـەڵ بەندییەوانـە تازەکـانی بـەرەوڕوو بـوو و چاک‌وخۆشـیی دەگـەڵ کـردن. گـوتی تـازەی چـا دێم کردوە، بـەڵام کـەس حەوسـەلەی چاخواردنـەوەی نـەبوو. زیاتر نیگـەران بوون کە هەتا زووە هووەیدا لەوێ‌و لەبـەر دەسـتی دێهاتییە هـەژاوەکان بەرنـە دەرێ. لـە ڕاپـەڕیوی‌وهـەژانی خـەڵک دەترسـان. دەیـان‌زانـی کـە هووەیدا گرنگتـرین زینـدانیی شۆرشـەو دەیانەویسـت هـەتا زوویـە بـی-گەیەننـە جێیـەکی ئـەمن. بـەڵام هووەیدا هێندێ فکری دیکـەی دەسـەردا بـوون. دایـم جـەختی دەکـردەوە کـە ئـەو، داخوازانـە خـۆی تەسـلیمی کاربەدەستانی شۆرش کردوە؛[٧٤] بە ڕواڵەت دڵی بەوە خۆش کردبوو کە ئەو ڕاستییە لـە هـەر دادگایـەکی بەویژدانـدا بـە قـازانجی تـەواو دەبـێ‌و گوناحەکانی، هەرچییەک بن، کەم دەکاتەوە.

لـە کـاتی هـاتن بـۆ زینـدانی هووەیـدادا، ئەنـدامانی گـرووپ لـە نیزیـک

ڤیلای ساواک ئامبوولانسێکیان دیبوو کە لە شەقامێکی دراوسێ ڕای-
گرتبوو. بە کۆمەگی موسەلسەلی ئەو گاردەی دەگەڵیان بوو،
ئامبوولانسەکەیان بەدەستەوە گرت‌و بردیانە ژووری ڤیلایەکە. ئەمجار
هووەیدایان بانگ کردە نێو ئامبوولانس. ڕووحانیی گرووپەکە پێشنیاری
کرد هووەیدا لە بەتالایی نێوان دوو سەکۆی پشتەوەی ئامبوولانسەکە
لەسەر زگ درێژ بێ. گوتی مەبەستی پاراستنی گیانی هووەیدایە.
دەیگوت بەمجۆرە ئەگەریش کەسێک لە پەنجەرەوە تەماشای ژووری
ئامبوولانسەکە بکا هووەیدای ناناسێ. دەیگوت ئەگەر لەنێو ئەو خەڵکەدا،
کەسێک هووەیدا بناسێتەوە، لەوانەیە نەتوانین پێشی توندوتیژی‌و
پەلاماری خەڵک بگرین. هووەیدا نەچووە ژێر بار. لە جیاتی ئەوە
کڵاوشەبکەیەکی ڕەنگ‌تاریکی لەسەر ناو خۆی لە گۆشەی لای چەپی
ئامبوولانسەکەو ئەوەندی کرا دوور لە دەرگاو پەنجەرە حەشار داو
فریشتەی ئێنشا لە تەنیشتی دانیشت‌و نوێنەری دادگاش هەر لە پەنای
دامەزرا. ئەوانی دیکەش لەسەر سەکۆی بەرامبەریان دانیشتن. تەختی
ئامبوولانس دوو گرووپەکەی لێک جیا دەکردەوە. ڕووحانیی گرووپەکە
لە پێشەوەی ئامبوولانس لە تەنیشت شۆفێرەکە سوار بوو. گرووپەکە
پێیان وابوو بوونی ڕووحانییەکە لە تەنیشت شۆفێر ڕێگای پڕ خەتەری
گەڕانەوەیان بۆ تەخت دەکا. بە درێژایی ڕێگا لە هەرکوێ ئامبوولانس
ناچار دەبوو ڕاوەستێ، کۆمەڵێک خەڵک دەوریان دەداو هەمیشە چەند
چاوی کونپشکن بە شووشەی دەرگای پشتەوەی ئامبوولانسەکەوە
دەچەسپان‌و تەماشای ژوورەوەیان دەکرد. بەڵام هووەیدا کڵاوەکەی
هەتا سەر برۆیان هێنابووە خوارو تەواو لە سێبەری فریشتەدا
دانیشتبوو. هەربۆیەش لە دەرێڕا نەدەبینراو نەدەناسرا.

ئومێدی گرووپەکە بەوە کە بوونی ڕووحانییەک سەفەرەکەیان بێ-
خەتەر دەکا زۆری نەخایاند. لە نیزیک یەکێک لە سەنگەرەکانی شەقام،
لاوانی نیگابان‌و موسەلسەل‌بەدەست فەرمانی ڕاوەستانیان دا، بەڵام
شۆفێرەکە بەوەخت گوێی لێنەبووو ئەوانیش تەقەیان کردو بە ڕێکەوت

تەنیا شۆفێرەکەیان بریندار کرد. دوای ژانەسەرێکی زۆر سەرەنجام گرووپەکە دەگەڵ هوەیدا، گەیشتنە دەفتەری ناوەندیی بەرەی نیشتمانی. دەوڵەتی ئەمریکا لە سەرەتای دەیەی چلەوە هەوڵی دابوو بەرەی نیشتمانی لە ئێراندا بێنێتە سەر کار. خۆش ئەوە بوو ئەو هەوڵانە بە ئاکام گەیشتن، بەڵام نەک لە سەردەمی پادشایەتیی شا، بەڵکوو لەژێر دەسەڵاتی رووحانییەکدا.

لە دەفتەری ناوەندیی بەرەی نیشتمانی، ئامبوولانسی هەڵگری هوەیدایان نارده کارپێژی ژێرزەمین. ئەمجار هوەیدایان خێرا برده بەشێکی چۆڵی خانووبەرەکە. داریووشی فرووهەر بۆخۆی هاتە پێشوازی زیندانییەکەورەفتارێکی زۆر رێزدارانەی دەگەڵ هوەیدا بوو. داوای میوەو شەربەتی کرد. چەند دەقیقە وتوویژی دەگەڵ هوەیدا کرد. هوەیدا سەعاتی دواتری هەر لەو ژوورەدا بەسەر برد. خانووبەرەکە پڕ لە ئەندامانی کۆن‌و نوێی بەرەی نیشتمانی بوو. لە تەواوی ئەوکەسانەی ئەو شەوە لەو خانووە خڕ ببوونەوە، تەنیا ژمارەیەکی کەم دەیانزانی کە هوەیدا بە شێوەی کاتی لە ژوورێکی ئەو خانووەدا زیندانییە. لەو ماوەیەدا فرووهەرو دووکەس لە هاورێکانی بە مەسەلەی هوەیداوە خەریک بوون. نەیاندەزانی رادەستی کوێی بکەن. سەرەنجام هاتنە سەر ئەو رایە کە بیبەنە مەدرەسەی "رفاه" کە ئیدی بە ستادی فەرماندەریی شۆرش دەژمێردرا. هوەیدا بۆیە پێوەندیی بە فرووهەرەوە گرتبوو کە لە راستیدا دەیەویست خۆی بداتە دەستی دەوڵەتی کاتیی بازرگان. بەڵام فرووهەر، پاش ماوەیەک باس‌و بیروراگۆرینەوە دەگەڵ هاوکارەکانی، سەرەنجام هوەیدای دایە مەدرەسەی رفاه". لە راستیدا بەوکارە دەسەڵاتی دەوڵەتی کاتی بەتوندی لاواز دەبوو. بە باوەری من ئەم بریارە بە رواڵەت سادەیە، لە دوورەدیمەنی مێژوویيدا، بایەخێکی تایبەتیی هەبوو. دەتوانین بڵێین گەرای ئاڵوگۆرەکانی ئێران لە چەند مانگی دوای شۆرشدا، واتە بە شێوەیەکی روون لاوازبوونی بەرەبەرەی دەوڵەتی کاتی‌و بەهێزبوونی رۆژبەرۆژی دەسەڵاتی رووحانییەکان‌و کومیتەکان لەو بریارە بە رواڵەت

سادەیە لەبارەی هووەیداوە گوورا. لە هەمووشی گرنگتر ئەوەیە كە ئەو بڕیارە ڕەنگە لە چارەنووسی هووەیداشدا نەخشێكی یەكلاكەرەوەی گێڕابێ. بەڵام لەو شەوە پڕهەژانەدا مەسەلەی گرنگی فرووهەرو هاوڕێكانی چۆنیەتیی گوازتنەوەی زیندانییەكە بۆ زیندان بوو. هەوا سارد بوو. ئەو گرووپەی هووەیدایان لە زیندانی شیان وەرگرتبوو، دووبارە وەڕێ كەوت. بەفر باریبوو و شەقامەكانی شاری داپۆشیبوو.

كۆمەڵێكی زۆری خەڵك لە شەقامەكانی دەوروبەری مەدرەسەی "رفاه" دەخولانەوە. ئامبوولانسی هووەیدا بەزەحمەت ڕێیەكی لەو شەقامەدا كردەوەو لە دەركەی ئاسنینی مەدرەسە نیزیك بۆوە. تاوێكی پێچوو تا لە ژووریڕا دەرگایان كردەوەو ئامبوولانس چووە حەوشەی مەدرەسە. دوكتۆر فریشتەی ئینشاو ڕووحانییەكە، دەگەڵ گاردە چەكدارەكە هووەیدایان بردە نهۆمی دووەمی خانووبەرەكە. لە پلیكانان وەسەر كەوتن و گەیشتنە دالانێكی درێژو تاریك. چەند گڵۆپی كز تەنیا سەرچاوەی ڕووناكایی دالانەكە بوون. لەوێ لەپشت مێزێكی ڕەنگ-خۆڵەمێشی كورەجحێڵەیەكیان دی كە قاپقاپەیەكی پلاستیكیی دەپێدا بوون و موسەلسەلێكی بەدەستەوە بوو. كەمێك ڕیشی هاتبوو. سەروچاوی ناڕێكوپێك دیار بوون. لەولای مێزەكە، لە نیزیك ئەو شوێنەی گەنجەكەی لێ دانیشتبوو، لەبەر دەرگای داخراوی ژوورێك كە تا چەند ڕۆژ پێشتر ژووری دەرس‌خوێندن بوو، كۆمەڵێك كەوش و قاپ-قاپەی جۆراوجۆر لەسەریەك كەڵەكە كرابوون. هووەیدایان بردە ژوورێكی چووكەلە لەوبەری دالانەكە. پەنجەرەكانی ئەو ژوورە بە ڕۆژنامەی كۆن گیرابوون. لە یەكێكیاندا مانشێتی گەورەی ڕۆژنامەی دوێنێ دەبینرا : "كە دێو بڕوا فریشتە دێتە ژوورێ." هووەیدا ئێستا لە خانووبەرەیەكدا دەژیا كە هەر لەو كاتەدا شوێنی ژیانی ڕێبەری شۆڕشیش بوو. كاتێك دوكتۆر فریشتەی ئینشا شەكەت و ماندووی هەورازو نشێوەكانی ئەو ڕۆژە پڕئاڵۆزییە لە دەروازەی مەدرەسەی "رفاه" هاتە دەرێ، گوێی لێبوو كە خەڵك بەسرتە دەڵێن: "ئێستا هووەیدایان هێنا."[٧٥]

# سەرچاوەکان

۱. ادوارد سابلیه، گفتگو با نگارنده، پاریس، مارس ۱۹۹۹.

۲. راجی، در خدمت تخت طاووس، ص ۹۸.

۳. احمد قریشی، گفتگو با نگارنده، ۱۲ فوریه‌ی ۲۰۰۰.

4. CIA, Tehran; Iran, "New Political Activity: Making a Silk Purse out of Shah's Ear," Confidential Report # 77-046, NSA, no. 1213.

۵. یادداشتهای مربوط به این دوره‌ی هنوز انتشار نیافته‌اند. یک نسخه از دست‌نویس آنها، به لطف ویراستار خاطرات علم، علینقی عالیخانی، به دستم رسید.

٦. راجی، در خدمت تخت طاووس، ص ۹۳.

۷. من در مورد نظر آموزگار و پاسخ هویدا و ثابتی از دو منبع آگاه شدم. احمد قریشی نقش خودش را در این مورد با جزئیات تشریح کرد. «مقام عالی‌رتبه امنیتی» پاسخ ثابتی را تأیید کرد.

۸. «مقام عالی‌رتبه امنیتی»، گفتگو.

۹. داریوش همایون، گفتگو با نگارنده، بلمونت، کالیفرنیا، ٦ ژوئن ۱۹۹۹.

۱۰. همایون، گفتگو.

11. Joseph Kraft, "Letter form Tehran," *New Yorker*, 18 December 1978.

12. Ibid., 153-54.

13. General [Abbas] Gharabaghi, *Vérités sur les Crises Iraniene* (Paris, 1985), 20-27.

14. Ibid., 24.

15. U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Memorandum of Conversation, Internal Politics, 1978/11/01." NSA, no. 1653.

۱۶. بەزودی روزنامەهای ایران پر شدند از حکایتهایی در خصوص نقش شریف امامی در فراماسونری. در کتاب رائین راجع به فراماسونری در ایران، شریف امامی به نحو چشمگیری بەعنوان استاد بزرگ جلوه می‌کند.

17. U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Increased Religious Pressure on the Government," Secret Cable # 07890, 19/78/08, NSA, no. 1475.

18. U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Ex-Prime Minister Reenters the Political Lists," 1978/08.03, NSA, no. 142.

۱۹. فریدون مهدوی، گفتگو با نگارنده، ۱۶ سپتامبر ۱۹۹۹.

۲۰. مهدوی، گفتگو.

21. Milani, *The Making of Iran's Islamic Revolution*, 117.

۲۲. علم، در یادداشتهایش، بارها ادعا کرده که می‌خواسته شاه را به‌تشکیل یک گروه مشاور کوچک متقاعد کند و شاه هرگز زیر بار نمی‌رفت. مثلاً، ر.ک. علم، یادداشتهای علم، جلد ۱، ص ۳۰۹.

۲۳. مهدی پیراسته، گفتگو با نگارنده، ۴ اوت ۱۹۹۹.

24. U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Memorandum of Conversation: Mehdi Pirasteh," 11 October 1978, NSA, no. 1591.

پیچیدگی سیاست در ایران را از جمله می‌توان دراین واقعیت سراغ کرد که پیراسته از سویی معتقد بود انقلاب اسلامی را انگلستان بەراه انداخت - می‌گفت: «نمی‌دانم شاه چه کرد که آنها را برآشفت، امّا مطمئنم که کارکار انگلیسی‌ها بوده» - و از سویی دیگر مأمور سفارت امریکا در تهران شرح مذاکرات خود با پیراسته را با ذکر این جمله به پایان می‌رساند که، «ضمناً، در میان کارمندان سفارت شایع است که پیراسته از عوامل انگلیس است.»

۲۵. احسان نراقی، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۲۲ اکتبر ۱۹۹۸.

۲۶. راجی، در خدمت تخت طاووس، ص ۱۷۳.

۲۷. «مقام عالی‌رتبەی امنیتی»، گفتگو.

۲۸. محمدرضا پهلوی، پاسخ به تاریخ، تهران.

29. U.S. Department of State, The Evolution of U.S. Iranian Relationship, NSA, no. 3556, 65.

خاطرات سر آنتونی پارسونز، ظهور و سقوط، نیز موضع بریتانیا را روشن می‌کند. ر.ک.:
Anthony Parsons, The Pride and the Fall (London, 1984).

سرانجام، شاه در کتاب خود، پاسخ به تاریخ، آشکارا به کم‌وکیف توصیه‌هایی که از دو متحد اصلی خود، آمریکا و انگلیس، دریافت می‌کرد اشاره می‌کند. وی دربارەی تلاش برای سازماندهی «نمایش عظیم نیرو و به نفع تاج و تخت» بعد از جمعەی سیاه صحبت می‌کند، و این که فرستادگان انگلیس و امریکا «شانه بالا انداختند و گفتند چه فایده؟» روز

بعد مخالفان دو برابر خواهند شد. این مسابقه‌ای است که شما در آن نمی‌توانید برنده شوید.» شاه می‌افزاید که والری ژیسکاردستن، رئیس جمهور فرانسه، «فرستاده‌ی شخصی خود را به تهران گسیل داشت، کسی که به وی بسیار نزدیک بود. وی نیز طرفدار راه‌حل "سیاسی" بحران بود، حسن تدبیری برای سازش و امتناع از به کار بردن زور.» ر.ک. پهلوی، پاسخ به تاریخ، صص ۱۷۲، ۱۶۴. چیزی که در اظهارات شاه روشن نمی‌شود، این است که چرا وی به تأیید و تصویب، یا اجازه‌ی آن «دو فرستاده» برای سازماندهی «نمایش قدرت عظیم... به نفع تاج وتخت» نیاز داشت؟

30. U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Why the Sudden Quiet," Confidential Cable # 05131, NSA, no. 1401.

۳۱. «مقام عالی‌رتبه امنیتی»، گفتگو.

۳۲. فریدون مهدوی، گفتگو با نگارنده، ۱۴ سپتامبر ۱۹۹۹.

33. Quoted in Mohsen Milani, *The Making of Iran's Islamic Revolution*, 123.

۳۴. پهلوی، پاسخ به تاریخ، ص ۱٦٦.

۳۵. لیلا امامی، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۱۱ مارس ۱۹۹۸.

۳٦. کلود دوپیرون، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۲۳ اکتبر ۱۹۹۸.

۳۷. کلود دوپیرون، گفتگو.

۳۸. برای شرحی راجع به این ملاقات، ر.ک.

Gharabaghi, Vérités Sur les Crises Iraniennes, 48-49.

سوای مضمون این کتاب، من جزئیات این جلسه را از دو منبع دیگر نیز شنیدم، در دهم مارس ۱۹۹۹ در پاریس با خود ارتشبد قره‌باغی گفتگو کردم.به‌علاوه، درروز ۲۴ آوریل ۱۹۹۹ در واشنگتن با محمد باهری صحبت کردم و او نیز روایت خود از جلسه رابرایم بازگو کرد.

۳۹. شاهین آقایان، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۱۲ ژانویه‌ی ۲۰۰۰.

۴۰. اردشیر زاهدی، گفتگو با نگارنده، ۱۲ ژانویه ۲۰۰۰.

۴۱. اردشیر زاهدی، گفتگو با نگارنده، ۱۲ ژانویه ۲۰۰۰.

42. U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Iran, Situation," 9 November 1978, NSA, no. 1708.

۴۳. مهدی سمیعی، گفتگو با نگارنده، لس‌آنجلس، ۱۱ ژوئن ۱۹۹۸.

44. U.S. Embassy, Tehran, Iran, "The Political Middle Stripes," 1978/09/19, NSA, no. 1532.

۴۵. مهدی پیراسته، گفتگو با نگارنده، ۴ اوت ۱۹۹۹.

۴٦. مهدی پیراسته، گفتگو. شرحی داستان‌وار از این جلسه منتشر شده است. فاطمه

۷

پاکروان در خاطراتش و سعیده پاکروان در گزارش داستان‌وار خود از این جلسه اظهار می‌دارند که سرلشگر پاکروان مصرانه با اندیشه‌ی بازداشت هویدا مخالف بود. ر.ک. فاطمه پاکروان، خاطرات، ترجمه‌ی اسماعیل سالمی، تهران، ۱۳۷۸، صص ۹۸-۱۹۱. این کتاب درواقع ترجمه‌ای است از:

*Memoires of Fatemeh Pakravan* (Cambridge, 1998), ed. Habib Ladjevardi.

نیز، ر.ک:

Saeideh Pakravan, *The Arrest of Hoveyda*.

در این روایت، برخی از حاضران در آن جلسه مخالفتشان را با تصمیم بازداشت هویدا، اعلام می‌دارند.

47. Houshang Nahavandi, interviewed by Shahrokh Meskoob, 29 May 1958, Paris, France, tape no. 5, Iranian Oral History Collection, Harvard University.

48. Ibid.

۴۹. دکتر فرشته انشاء، گفتگو با نگارنده، ۳ سپتامبر ۱۹۹۹.

۵۰. چندین نفر، از جمله دکتر فرشته و مریم انشاء، و نیز احمدکاشفی درباره‌ی این گفتگو با من صحبت کردند. احمد کاشفی، گفتگو با نگارنده، ۳۱ اکتبر ۱۹۹۷.

۵۱. افراد مختلفی، از جمله مریم و دکتر فرشته انشاء و نیز جهانسوز بهرامی، مسئول حفظ جان هویدا، براین نکته تأکید کردند که هویدا، در چند هفته قبل از بازداشتش، عملاً در خانه زندانی بود. جهانسوز بهرامی، گفتگو با نگارنده، لس‌آنجلس، کالیفرنیا، ۳ آوریل ۱۹۹۸. بهرامی با علاقه خاصی از هویدا یاد می‌کرد. وی می‌گفت اگر من، یا سایر مأموران محافظ او، می‌دانستیم دولت قصد بازداشت هویدا را داشت، حتماً در صدد نجات او برمی‌آمدیم و حتی حاضر بودیم جانمان را هم در این راه به خطر بیندازیم.

۵۲. دکتر فرشته انشاء، گفتگو با نگارنده، لس‌آنجلس، ۱۵ فوریه ۱۹۹۸.

۵۳. دکتر فرشته انشاء، گفتگو با نگارنده، ۱۳ سپتامبر ۱۹۹۹.

۵۴. افراد زیادی، از جمله خود لیلا امامی، درباره‌ی این مذاکرات با من صحبت کرده‌اند.

۵۵. دکتر فرشته انشاء، گفتگو.

۵۶. دکتر فرشته انشاء، گفتگو با نگارنده، ۳ سپتامبر ۱۹۹۹.

۵۷. دکتر فرشته انشاء، گفتگو با نگارنده، ۱۳ مارس ۱۹۹۹.

58. U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Israeli Operations in Iran," 2 April 1965. NSA, no. 549.

۵۹. افسانه جهانبانی، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۳ ژوئن ۱۹۹۸.

۶۰. یوری لوبرانی، گفتگو با نگارنده، ۸ ژوئیهٔ ۱۹۹۹.

۶۱. دکتر فرشته انشاء، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۳ سپتامبر ۱۹۹۹.
۶۲. دکتر فرشته انشاء، گفتگو با نویسنده پاریس، ۱۲ مارس ۱۹۹۹.
۶۳. دکتر فرشته انشاء، گفتگو با نویسنده پاریس، ۳ سپتامبر ۱۹۹۹.

64. U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Recommendation for President to Shah Letter," 08/02/77. NSA, no. 1493.

65. U.S. Department of State, "The Evolution of the U.S.-Iranian Relationship," NSA, no 3356, 65.

66. Ibid., 68.

67. Ibid., 66.

68. U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Understanding the Shiite Islamic Movement," NSA, no. 1298.

69. U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Political Security Report, Feb. 12, 1979,: NSA, no. 2292.

ارتشبد قره‌باغی، که در چند کتاب و رساله‌ی خود تصمیم نیروهای مسلح در ابراز و اعلام بی‌طرفی را تبیین می‌کند، مصرّانه انکار می‌کند که پیش از نشست فرماندهان، تصمیمی گرفته شده بود. گزارش سفارت امریکا آشکارا با حرفهای وی تناقض دارد.

۷۰. سولیوان، مأموریت در ایران، ص ۲۴۲. سولیوان ادعا می‌کند که پاسخی «روشن و رکیک» به آنها داده است.

۷۱. مطالب زیادی درباره مأموریت رابرت هویزر نوشته شده است. ر.ک:
Robert Huyser, *Mission to Tehran* (New York, 1986).

۷۲. دکتر فرشته انشاء، گفتگو با نگارنده، ۳ سپتامبر ۱۹۹۹.
۷۳. لیلا امامی، گفتگو.
۷۴. دکتر فرشته انشاء، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۱۲ مارس ۱۹۹۹.
۷۵. انشاء، گفتگو.

# فەسڵی پازدەیەم

## قازیی شۆڕش

**ناوی پاکی من، ژیانی هەژارانەم،**
**شاهیدیم بە دژی تۆ، و پلەو پایەم لە دەوڵەتدا**
**وا سێبەر دەخەنە سەر شکایەتەکانت**
**کە لە سێبەری گێڕانەوەکەتدا گیان دەسپێری.**
**هەرچیت پێخۆشە بیڵێ، درۆیەکانی من لە ڕاستییەکانی تۆ بەهێزترن.**

**شکسپیر**

# قازیی شۆڕش

ئەوانەی لە بەدناوبوون لای نەیارانیان ناترسێن، بوونەوەری زۆر مەترسیدارن. دوای شۆڕش هووەیدا کەوتبووە دەستی کەسایەتییەکی لەو چەشنە. ناوی شێخ سادقی خەڵخاڵی بووو هەروەک بۆخۆی لە بیرەوەرییەکانیدا دەڵێ لەلایەن نەیارانیەوە بە قازیی پیاوکوژ بەناوبانگ بوو.[1] ڕێکەوتی مێژووو پێویستیی شۆڕش ئەوی گەیاندبووە جێگەوپێگەیەکی یەکجار گرنگ.

منداڵی لادێ بووو خوێندەوارییەکی وای نەبوو. هاتبووە قوم تا دەرسی ئایینی بخوێنێ. دەموچاوی خڕی، لێوە دەرپەڕیوەکانی، برۆ پڕپشتەکانی، چاوە چووکەڵەکانی، ڕیشی کە لە چەنەگە دەرپەڕیوەکەی وەدەر دەکەوت، و سەرەنجام مێزەرە قەبەو زەلامەکەی هەموو شێوەی یەکێک لەو سوارانەیان پێ دابوو کە لە زۆربەی مینیاتۆرە ئێرانییەکاندا دەبینرێن. خەڵخاڵی مێشکێکی سادەی هەبوو. هەرلەو کاتەدا بێباکو بێپەرواش بوو. هەرئەو سروشتەش کردبوویە یەکێک لە پەیڕەوانی ئایەتوڵڵا خومەینی. کاری وای پێ دەسپێردران کە زۆرتر ئازایەتی یان دەویست تا بیرکردنەوە. بۆ نموونە، گۆیا ساڵی ١٣٤٢ هێندێک لە مەئموورانی ساواک ویستبوویان یەکێک لە کۆبوونەوەکانی ئایەتوڵڵا خومەینی لە مەدرەسەی فەیزیەی قوم تێک بدەن. ئایەتوڵڵا خومەینییش بە سادقی خەڵخاڵیدا پەیامێکی بۆ ناردبوون. گوتبووی

ئەگەر وتار خوێندنەوەکەم لێ تێکبدەن، ئەودەم مێزەرەکەم دەخەمە ژێر چەنەگەم‌و وەپێش خەڵک دەکەوم‌و دەیان‌بەمە حەوشەی حەزرەتی مەعسوومە.[1] چەند مانگێک پاش ئەو رووبەڕووبوونەوەیە، ئایەتوڵڵا خومەینی لە پێشدا بۆ تورکیەو سەرەنجام بۆ عێراق دوور خرایەوە. خەڵخاڵییش ماوەیەک زیندانی کراو دوایە دوور خرایەوە بۆ دێیەکی دوورکەوتووی ئێران.

لە سەروبەندی شۆرشدا، خەڵخاڵی بیرەوەریی دوورخرانەوەکەی چاپ کرد. بەرهەمێکی بە ڕاستی سەرسوڕهێن‌و هەژێنەر بوو. دروشمە دژی ئیستیعمارییەکانی دەگەڵ هێندێک دەنگۆی بێ‌بنەما تێکەڵ دەکردو هەردووکی بە زمانێک کە لە باری شێوەوە لاوازو لە باری ڕاوێژەوە پڕ لە یەقین بوو، تەحویلی خوێنەران دەدا. ئەو قەڵەمگێڕانەی بواری لێکۆڵینەوەی مێژوویشی دەگرتەوە. نامیلکەیەکی پەنجاوهەشت لاپەڕیی لە بارەی کووروشی مەزنەوە نووسی. دەیگوت ئەو لێکۆڵینەوەیەی لە زمانی شادا نووسیوەو ساواک پێشی چاپ‌و بڵاوکردنەوەی گرتوە. دەیگوت ساواک نەی‌دەهێشت بەرهەمی بیرکردنەوەکانی دەگەڵ خەڵکی خوا بێنێتە گۆڕێ. باوەڕی وابوو کە کووروش، لە تاوانبارێکی زگماک‌و حیزێکی بێ‌قیمەت بەولاوە شتێک نەبووە.[2]

بەڵام سەیر ئەوەیە خەڵخاڵی، دەگەڵ هەموو ئەو سروشت‌و بیروباوەڕە سەرسوڕهێنانەدا، دوای شۆرش، بە فەرمانی ڕاستەوخۆی ئایەتوڵڵا خومەینی، بوو بە سەرۆکی دادگای شۆرشی تاران. دەتوانین ئەو بە یەکێک لە جاڕچییە سەرەکییەکانی تیئۆریی "ئوممەتی شۆرش" دابنێین. جاڕچییانی ئەو تیئۆرییە، توندوتیژی‌و خوێن‌ڕێژی‌و تیرۆر وەک کەرەسەو ئامرازی پێویستی ئاڵوگۆڕە کۆمەڵایەتییەکان پەسندو ستایش دەکەن. خەڵخاڵی نەک‌هەر لایەنگری ئەو تیئۆرییە بوو، بەڵکوو ئەزموونەکانی منداڵی‌و گەنجی‌و دەورانی دوورخرانەوەشی تاڵییەکی ترسێنەریان تێدا پێکهێنابوو. سێ مانگ لە شۆرش نەگوزەرابوو کە ڕۆژێک خەڵخاڵی، بە شانازیی تەواوەوە، بە ڕۆژنامەنووسێکی گوت تا ئێستا هەرنەبێ چوارسەد کەسی داوەتە دەستەی ئیعدام. هەر لەو

وەختــەوە لەلایــەن نــەیارانی کۆمــاری ئیســلامییەوە ناســناوی "قــازیی پیاوکوژ"ی پێبەخشرا.

لـە یـەک قسـەدا، خـەڵخاڵی، رەنگـە لـە هـەموو کـەس پتر سـیمبولی توندترین هێزەکانی شۆرشی ئیسلامی بووبێ، و بە رێکەوت کاری دیاریکردنی چارەنووسی یەکێک لە لێوەشاوەترین و ئاقڵترین رووماکانی رێژیمی رابردوو بەو سپێردرابوو. رووبەڕووبوونەوەی ئەو دوو کەسە، نوێنگەی رووبەڕووبوونەوەی دوو جیهانبینیو دوو شێوەژیانی تەواو دژ بەیەک بوو. هەروا بزانە مێژوو وەک دەرهێنەرێکی بەتوانا، پوختـەی زێـدەڕۆترین رووما باش و خەراپەکانی رێژیمی شکاوو سەرکەوتووی لە بەرامبەر یەکتر دانابوو.

چەندوچۆنی یەکەمین لێپرسینەکان لە نامەیەکەوە تێدەگەین کە هووەیدا بە نهێنی لە زیندانەوە ناردبوویە دەرێ. رۆژی دەی رەشەمەی١٣٥٧، دوکتۆر فریشتەی ئینشا وەک پزیشکی چارەسەری هووەیدا، لە زیندان چووە سەردانی. لە کاتی ئەو سەردانەدا، لەپڕ هەراهەرایەک لە جێیەک بەرز بۆوە. نیگابانی ژوورەکە بە ناچار لەحزەیەک لە چاوەدێریی هووەیداو میوانەکەی غافڵ بوو و هووەیدا لەو تاقە لەحزەیە بەهرەی وەرگرت و نامەیەکی وەدەست فریشتە دا. فریشتەش بە تەرپەستی نامەکەی لە سینەبەندەکەی هاویشت. بۆخۆی دەڵێ، "ئارەقێکی سارد بە سەروچاومدا دەهاتە خوار، وا هەژابووم دڵم تەپەتەپ لێی دەدا." دیدارەکەیان یەکدوو دەقیقە زیاتری نەمابوو. دوکتۆر ئینشا کیفی پزیشکییەکەی هەڵگرت خواحافزیی لە هووەیدا کردو بە ئارامی چووە حەوشەی مەدرەسەی "رفاه". دەرگای چوونەدەر چەند هەنگاوێک دوورتر بوو، بەڵام دەڵێ لە پێش چاوم لەوسەری دنیا بوو. هەستی بە مەترسی دەکرد. دەیەویست چەندی بکرێ زووتر لەو نێوە دوور کەوێتەوە؛ هەر لەوکاتەدا نەیدەویست بە پەلەپەلێکی نائاسایی، شک و گومان بۆ نیگابانەکان دروست بکا. دوو هەنگاو پتری بۆ دەرگا نەمابوو کە لەنەکاو دەنگی نیگابان لەپشتەوە بەرز بۆوە: "خانم دەچیە کوێ؟" دوکتۆر ئینشا ئاوڕی دایەوە. پیرە پیاوێکی موسەلسەل-

بەدەستی دیت. دەڵێ دەمزانی کە دەبێ هەرچۆن بووە خۆم کۆنترۆڵ بکەم. بەزمانی پردەسەلاتی پزیشکێکی لەخۆرازی گوتی، "پزیشکم. هاتبوومە سەردلنی نەخۆشەکان." پیرەپیاو داوای لێبووردنی کردو دوکتۆر ئینشاش بەرەودەرگا وەڕێ کەوتەوە. دەڵێ: "هەستم دەکرد هەر لەحزەیەک لەوانەیە ئەژنۆکانم لەکار بکەون."[٤٠]

کاتێک سەرەنجام لە حەوشەی مەدرەسەی "رفاه" دەرچوو، بێ-هێزیو دڵەخورپەیەکی سوار بوو کە نەیدەتوانی ترومبێل لێخوڕێ. ترومبێلەکەی کە لەونیزیکانە راگرتبوو، هەرلەوێ بەجێ هێشتو بە تاکسی چۆوە ماڵێو ڕۆژی دواتر بۆ هێنانەوەی ترومبێلەکەی چۆوە دەوروبەری مەدرەسە. کە گەیشتەوە ماڵێ، پێش هەموو شتێک نامەی پڕگنجولۆنجی هووەیدای لە حەشارگە هێنایە دەر. کوتەکاغەزێکی چووکەڵە بوو کە لەودا بابەتگەلێک بە فەڕانسەیی نووسرابوون* هووەیدا لەوێدا باسی یەکەمین لێپرسینەوەی کردبوو کە هەر ئەو ڕۆژە لێی کرابوو. نووسیبووی بێگومان من لە دادگایەکی ئیسلامیدا دادگایی دەکەن. دەڵێ، "پارێزەر(وەکیل)ێک لە گۆڕیدا نابێ. ڕقیان لە ئێمەیە. پێیان وایە هەرچی ئەوان خۆشیان ویستوە وێرانمان کردوە. هەمووانمان دەکوژن. هەلومەرجەکە زۆر لەوە خەراپترە کە بتوانی بیری لێ-بکەیەوە. مردن بە بەراورد لەگەڵ ئەم وەزعە کرانەوەیەکە." دادگای خەڵخاڵی نوێنگەی ئەم ڕقو قینە بوو.



* ئەسڵی نامەکە لە لای دوکتۆر فریشتەی ئینشایە. هێندێ بەشی بە باوەڕی خۆی تەواو تایبەتینو بۆ چاپ نابن. دەگەڵ وی ڕێک کەوتین کە دەقی تەواوی نامەکە پێکەوە بخوێنینەوەو ئەمن تەنیا ئەو بەشانە بگێڕمەوە کە ئەو پێی وایە بۆ چاپ دەبن. ڕۆژێک لە پاریس، لە ماڵی دایکی دوکتۆر ئینشا، نامەکەمان پێکەوە خوێندەوە. دوکتۆر فریشتەی ئینشا لە گۆشەیەک دانیشتبوو و بە بیستنی وتەکانی هووەیدا،هێدیهێدی دەگریا.

بەتڵێک لە نیوەشەو گوزەرابوو کە هووەیدایان بردە دادگای خەڵخاڵی. چەند ڕۆژێک زیاتری بۆ نەورۆز نەمابوو و هێشتا مانگێکیش بەسەر شۆرشدا تێنەپەڕیبوو. تاران کە لەوێدا دەتوانی چوار وەرزی ساڵ ببینی دوا شەوەکانی سەهۆڵبەندانی زستانێکی ساردی بەجێ دەهێشت. هووەیدایان لەخەو هەستاند. دەستووریان دا جلەکانی دەبەر بکا. لاوازو ڕەنگپەڕیو دیار بوو.[5] چاویلکە تازەکەی دەچاودا بوون. لە تێکەڵپێکەڵیی یەکەمین ساتەکانی شۆرشدا چاویلکەکانی لێ ون ببوون. لە دیداری دواتردا داوای لە دوکتۆر فریشتەی ئێنشا کرد چاویلکەیەکی تازەی بۆ بە دروستکردن بدا. لەو وێنانەدا کە ڕۆژنامەکان لە یەکەمین دادگای هووەیدایان بڵاو کردنەوە، فریشتە ئەم چاویلکە تازەیەی لە چاوی تۆمەتبارەکەدا دیت.[6] دوو ڕۆژێک دەبوو ڕیشی نەتاشیبوو. ئەو ڕیشهاتنە، سێبەرێکی خستبووە سەر ڕوخسارە ڕەنگپەڕیوەکەی. جگەلەوە، لە چەند حەوتووی دواییدا، دەوری بیست کیلۆ لە کێشی کەم ببۆوە. دەموچاوێکی ڕەقەڵەو حاڵەتێکی داماوی هەبوو: پێش ئەوەی لەو ژوورە دەرسییەی کرابووە زیندان بێتە دەرێ، نیگابانەکان ڕایان گرت هەتا مقەببایەکی دەمل بکەن کە هەردوو سەری دەزووی تێخرابوو. ئەمە دیاریی شۆرشی فەرهەنگیی چین بوو. لەو ڕۆژە پڕئاڵۆزییانەدا، ڕێبەرانی غەزەبلێگیراوی حیزبیان، لە حاڵێکدا کڵاوێکی قووچیان لەسەرو مقەببایەکیان لە ملدا بوو، بە شەقامەکاندا دەگێڕان و گاردە سوورەکانیش کە خۆیان بە پارێزەرانی خاوێنیی شۆرش دەزانی، تفو لەعنەتیان بۆ ئەو چارەڕەشانە دەناردو هێندێ جار تەنانەت لێشیان دەدان و جنێویان پێ-دەدان. لە بارەی هووەیداشەوە، هەڵوەسراوی سووکایەتی و شکاندنی، کوتە مقەببایەک بوو کە بە نارێکی دوو کونی تێکرابوون و مقەببایەکەیان لەحاڵێکدا ناوی وی لەسەر نووسرابوو، بەملەوە هەڵواسی.[7] لیباسی نارێکوپێکی هووەیدا، حاڵەتی سامگرتوویەکەی و لەهەمووی خەراپتر کاتی نادیاری دەستپێکردنی دادگاکەی، هەموو بەشێک لە هەوڵێکی ڕێکخراوی هەڵسووڕێنەرانی دادگا بۆ سووکایەتیکردن بە زیندانی و تێک-شکاندنی گیانی بەربەرەکانی لەودا بوو.

لە ڕوخساری هووەیدادا، وەختێ هاتنی بۆ دادگا، دەردەکەوت کە ئەو ڕەفتارە پڕ سووکایەتییە کاری تێکردوە. ئەو بە حاڵەتێکی گێژو وێژو قەلاَفەتێکی تەواو شێواوەوە چووە ژووری دادگا. ئارەق نیشتبووە سەر ڕوخساری. ئەو ڕۆژنامەنووسانەی لە کۆبوونەوەکەدا بوون، لە ڕاپۆرتەکانیاندا نووسییان کە وەختێک هووەیدا هاتە ژوورێ، نەیدەزانی لە کوێیەو بۆچی هێناویانەتە نێو ئەو کۆمەڵە خەڵکە.[8] دیارە قەلاَفەتی گرژومۆنی خەڵخاڵی هۆی کۆبوونەوەکەی بۆ ڕوون کردەوە. حالاَتی هووەیدا هەموو نیشانەی نارەحەتیو پەریشانیی هەناوی بوون. چاوی ڕەشکەوپێشکەی دەکردو دڵەخورپە لە نێوچاوانیدا دیار بوو. دەوری سێسەد کەس لە ژوورەکەدا خڕ ببوونەوە.[9] کەسی بنەماڵەی تۆمەتبارکراویان دەنێودا نەبوو. جگەلەوە، کەسیش لەو خەڵکانە کە عادەتەن هەر بۆ ئەوەی بزانن چباسە دەچنە دادگا لەو کۆمەڵەدا نەبوو. دادگای هووەیدا لەحزەیەکی مێژوویی بوو. ئامادەیی لەو نمایشەدا هەر بۆ بژاردەکانی شۆڕش بوو. هووەیدا خێرا چاوێکی بە ئامادەبووانی کۆبوونەوەکەدا گێڕا. تێگەیشت کە تەنیا دووسێ ڕوومای تاڕادەیەک ناسراوی لێن. سەرۆکی دادگای پێشتر دیبووو دووکەس لە ڕۆژنامەنووسەکانیشی لە سەردەمی سەرۆکوەزیرییەوە دەناسین.

هووەیدایان لەسەر تەنیا کورسیی بەتاڵی ژوورەکە دانا. بە حاڵەتێکی ماتو بێدەنگەوە چووە نێو کورسییەکەوە. هەردوو دەستی لە ڕووی داماوی لەسەر ئەژنۆکانی دانان. بەلاَم چەند دەقیقە دواتر دووبارە کۆنترۆڵی بەسەر خۆیدا پەیدا کرد. لە هەموو ژیانیدا بەنەرمیو لەسەرەخۆیی ناوبانگی هەبوو. دەیانگوت لەو ڕێگایەوە لە هەموو تەنگانەیەک بە سلامەتی دەردەچێ. دەورانی درێژی سەرۆک-وەزیرییەکەشییان هەر دەبردەوە سەر ئەو سروشتە. داخوا ئەم-جارەش دەیتوانی بە پشتیوانیی ئەو بەهرەیە گیانی خۆی ڕزگار بکا؟ وەختێک زانی ئەویان بۆ دادگاییکردن هێناوەتە ئەو ژوورە، خەیاڵی کەمێک ئاسوودە بوو. دەیەویست پێش دەستپێکردنی کاری دادگاکەشی ئاڵۆزو زبری ژوورەکە بە قازانجی خۆی بگۆڕێ. هەمووان

دەیانزانی کە ئەو مرۆڤێکی یەکجار بەئەدەبە. ڕووی کردە سەرۆکی دادگاو لەجۆری لیباس‌دەبەرکردنی خۆی داوای لێبووردنی کرد. گوتی تەنیا لیباسم هەر ئەوەیە کە دەبەرمدایە. ئەمجار بە ڕاوێژێکی پڕگاڵتەوە لێی زیاد کرد کە، "لێرە هەمووکەس ناوی من دەزانێ"و داوای لە سەرۆکی دادگا کرد ڕێگا بدا ئەو مقەبیایەی دەملی‌دایە دەری بێنێ.[10] خەڵخاڵی مووافەقەتی کرد. ڕۆژنامەنووسێک لە دەرفەتێک کەلکی وەرگرت‌و پێش دەست‌پێکردنی ڕێوڕەسمەکە لە هووەیدای پرسی داخوا نووسەری ڕاستەقینەی بەرەو شارستانەتیی مەزن دەناسێ. دیارە کتێبەکە بە ناوی شاوە چاپ کرابوو، بەڵام هەمووکەس دەیزانی کاری قەڵەمی خۆی نیە. هووەیدا بە پارێزێکی تەواو، لەبن لێوانەوە، جوابی دایەوە ، "لە زمان منەوە مەنووسن، بەڵام بە کۆمەگی شوجاعەددینی شیفای نووسیبوو*."[110] دیارە ئەو ڕۆژنامەنووسەش وەسبەینێ‌ڕا ئەو بابەتەی لە زمانی هووەیداوە گێڕایەوە. هێشتا وتوویژی کورتی هووەیداو ڕۆژنامەنووسەکە تەواو نەببوو کە یەکێک دەستی کرد بە خوێندنی چەند ئایەتی قورئان. "بسم الله الرحمن الرحیم"ێکی گوت‌و ئایەتێکی قورئانی خوێندەوە. ئیدی ببووە ڕەسمێکی واجیب کە هەموو

---

* هووەیدا ئەم کتێبەی باش دەناسی. ساڵی١٣٥٤ نووسرابوو،و زۆرجار وەک پرۆژەیەکی ورد بۆ مەزنایەتیی ئێران کەوتبووە بەر پەسن‌بێژیی کاریەدەستانی دەوڵەتی ئێران. قەرار بوو فەرەیدوونی هووەیدا باڵیۆزی وەختی ئێران لە ڕێکخراوی نەتەوە یەککگرتووەکاندا، کتێبەکە بکاتە فەڕانسەیی. شا بە هۆگەلێک کە زۆر ڕوون نین زۆری پەلە بوو کە کتێبەکە چەندی بکرێ زووتر لە ڕۆژئاوا بڵاو بێتەوە. فەرەیدوونی هووەیدا کە ڕووناکبیرێکی لێوەشاوە بوو،خاڵە لاوازەکانی کتێبەکەو بە تایبەتی چەندین نموونەی بەرزەفڕییە سەرسوڕهێنەکانی دەناسین. چەندین جار لەو بارەیەوە شکایەتی بردبووە لای ئەمیر عەبباسی برای. هووەیدا لە وەڵامدا دەیگوت: "پێت وانیە بۆخۆشم ئەوانە دەزانم." هەرلەو کاتەدا جەختی دەکردەوە کە دەگەڵ هەموو ئەو خاڵە لاوازانە، کتێبەکە بایەخێکی تایبەتیی هەیە. فەرەیدوونیش دەگەڵ هەموو ئەو ڕەخنانەی لە کتێبەکەی هەبوون درێژەی بە وەرگێڕانی دا.

بۆنەیەکی ڕەسمی بە خوێندنی چەند ئایەتی قورئان دەست پێبکەن. موسوڵمانان لەو باوەڕەدان کە زمانی خودا عەرەبییە. هەروەک لە سەدەکانی نێوەڕاستدا، زمانی لاتینیان بە تەنیا زمانی ڕێگەپێدراوی کلیسا دەزانی. لە وڵاتانی موسوڵمانیش دوعای جۆراوجۆر هەر بە عەرەبی دەخوێنن. دیارە پێیان وایە هیچ کارێکی خوا بێ نهێنیی و حیکمەت نیە. ئەوشەوە هووەیدایان بەناوی شەڕکەر دژی خواو "مفسد في الأرض" دادگایی دەکرد، بەڵام لەنێو ئەو سێسەد کەسەی لە ژوورەکەدا خڕ ببوونەوە، کەمتر کەسێک هەبوو عەرەبی وەک هووەیدا باش بزانێ.

دوای خوێندنی چەند ئایەتی قورئان خەڵخاڵی دەستی بەقسە کرد. ئەویش لە پێشدا بیسمیللایەکی کردو دوایە ڕایگەیاند دادگا ڕەسمییە. دیارە وەختێک وشەی "دادگا"مان بە زماندا دێ، دیاردەیەکی ڕوون، بە هێندێک سروشتی تایبەتییەوە، لە مێشکماندا دەنەخشێ. فەزایەکمان دێتە بەرچاو کە لەوێدا جێی هەرکەس- لەسەرۆکی دادگاوە بگرە تا تۆمەت- لێدراوو دادئەستێن و پارێزەرو هەیئەتی مونسیفەو ئامادەبووان-دیاری کراوە. دەزانین کە لە چەندوچۆنی ئەو فەزایەو جێگای هەرکام لەوانەدا، حیکمەت و مانایەک شاراوەتەوە. لەلایەک، سەرۆکی دادگا دادەنیشێ. جێیەکەی عادەتەن لەسەر سەکۆیەکە بەرزتر لەوانی دیکە. ئەم مەودایە، و ئەم بەرەژوورییە هەردووک نیشانەی بێلایەنیی و دادپەروەریی خوازانەی سەرۆکی دادگان. جگەلەوە، تۆمەتلێدراوو دادئەستێن هەردووک، لە مەودایەکی وەکیەکدا، بەرامبەر بە سەرۆک دادەنیشن. ئەم مەودا وەکیەکە، ئەم دوورییە وێکچوویە، بەڕێکەوت نین و بایەخێکی سیمبولیکی تایبەتییان هەیە. لەوێدا ئەو نوکتەیە شاردراوەتەوە کە تۆمەتلێدراوو دادئەستێن، شکایەتکەرو شکایەت- لێکراون و هیچیان لە سەرۆک نیزیکتر نین و هیچیان ئیمتیازێکی تایبەتییان نیە. حەشیمەتی ئامادە لە دادگاش عادەتەن بە جیاو دوور لە سەرۆک و دادئەستێن و تۆمەتلێدراوو هەیئەتی مونسیفە ڕادەگرن. لە یەک قسەدا فەزای دادگا فەزایەکی پیرۆزو دوور لە قاووقیژی خەڵکە.

بەڵام لە دادگای خەڵخاڵیدا-و لە داگاکانی دیکەی شۆرشدا- دادئەستێنو سەرۆکی دادگاو هەیئەتی چاوەدێری دادگا هەموویان لە پشت یەک مێز دادەنیشتن. هەر وا بزانە کە هەموویان لە یەک ڕیزدانو یەککگرتوونو تۆمەتلێدراویش دوژمنی هاوبەشی هەموانەو لە ڕیزی بەرامبەریاندایە. جگەلەوە، هووەیدایان لەسەر کورسییەکی چووکەڵەو ڕاست لەنێو خەڵکەکەداو شانبەشانیوان دانابوو. لە ڕاستیدا لەپشت ئەو ڕواڵەتە بێپەردەیەی دادگاو لەپشت ئەو گوێنەدانەی بە ڕێوڕەسمە ناسراوە قانوونییەکان، جۆرێک توندوتیژیی خەتەرناک، چەشنێک ڕاگەیاندنی بێقانوونی، و شێوەیەک خوێنخوازیی هەژاوی کۆمەڵێکی ڕقهەستاو شارابۆوە. لە هەمووی خەراپتر ئەوە بوو کە سزاخوازییشی بە ئاشکرا وەک پەیامی ئاسمانی دەزانی. هەروا بزانە خواو مێژوو ڕەواییو دروستییەکەییان دەستەبەر کردوە. ئیدی لەوە گەڕی کە نێوەرۆکی هەر سزاخوازییەک، کۆمەڵێک تۆمەتەو کاری دادگا دروست ڕاگەیشتن بە چەندوچۆنی هەرکام لەو تۆمەتانەیە. لە قسەو ڕەفتاری خەڵخاڵی دەردەکەوت کە ئەو نەک داوەری لە بارەی ڕاستیو ناڕاستیی تۆمەتەکانەوە بەڵکوو تەنیا سزادانی تۆمەتلێدراو بە ئەرکی خۆی دەزانێ. ڕەنگە هەربۆیەش بووبێ کە مێزێکیان بۆ هووەیدا نەهێنابوو کە بتوانێ بەرگریی خۆی بەرامبەر بە سزاخوازییەکەی لەسەر ڕێک بخا. وا دیارە لە چەندوچۆنی فەزای ئەم دادگایەدا ئەو ئەسڵە گرنگو خەتەرناکە شارراوبۆوە کە لەجێدا تۆمەتەکانی سزاخوازی بەرگری هەڵناگرن، و نەکهەر گوناح بەڵکوو سزای تۆمەتلێدراویش لە پێشەوە دیاری کراوە. ڕنگە هەر لەبەر ئەوەش بووبێ کە هووەیداش بەوپەڕی بێموبالاتییەوە گوێی بۆ دەقی سزاخوازییەکە ڕاگرتبوو.

سزاخوازی دژی هووەیدا، بەڵگەیەکی پڕبایەخ بوو. ئەو بەرزترین کاربەدەستی ڕێژیمی ڕابردوو بوو کە کەوتبووە دەستی ڕێژیمی ئیسلامی. پازدە ساڵ لە نێوجەرگەی دەسەڵاتدا ببوو. ناوی ببووە ئاواڵدووانەی ناکامیو دەسکەوتەکانی ڕێژیمی پەهلەوی. شۆرشی ئیسلامی بە پشتبەستن بە دروشمگەلێکی گشتی بە دەسەڵات

گەیشتبوو. ڕێبەرانی شۆڕش هیچوەخت وردەکاریی بەرنامەکانی خۆیان شی نەدەکردەوە. دەیانگوت ڕووخاندنی پادشایەتی دەرمانی هەموو دەردە کۆمەڵایەتییەکانە. دەیانگوت باسی وردەکارییەکان دەبێ "بۆ دوای ڕۆیشتنی شا" هەڵگرین. ئێستا کە شا ڕۆیشتبووو شۆڕش سەر کەوتبوو، دادگا دەرفەتێک بوو تا ڕێبەرانی شۆڕش، ڕەوایی داخوازەکانیان سابیت بکەن. جگەلەوە، پێشێلکردنی مافی مرۆڤ، دادگا سەربازیو ڕواڵەتییەکان لە گرنگترین سکاڵاکانی خەڵکو دژبەران لە ڕێژیمی پێشوو بوون. شۆڕشی سەرکەوتوو ئێستا دەیتوانی بە نموونەو بەکردەوە، نێوەرۆکی ئەو دادپەروەرییە تازەیە کە مەبەستی بوو بە خەڵکی دنیا نیشان بدا. دەیتوانی ڕابردوو بکێشێتە دادگاو سووچە تاریکەکانی مێژووی هاوچەرخ ڕوون بکاتەوە. بەڵام بەداخەوە هەوای تۆڵە(قصاص)ی بەپەلەو سزای خوێناوی بەسەر زانستو دووربینیدا زاڵ بوو. لە دادگای هوەیدادا نە لە ڕاستییە مێژووییە تازەکانو پێلێنانە سەرسوڕهێنەکان نیشانەیەک هەبوو، نە لە تێگەیشتنی قانوونی. لە جیاتی هەمووی ئەمانە، مانایەکی تازە لە "دادپەروەری" دەرکەوت کە خۆی بە شۆڕشگێڕ دەزانیو ناو دەبرد.

**دەقی سزاخوازییەکە ئاوا بوو:**

لەسەر بناخەی سزاخوازی، ئەمیرعەبباسی هوەیدا کوڕی حەبیبوڵڵا ژمارەی ناسنامە٣٥٤٢ دەرچووی تاران لەدایکبووی١٢٩٥ وەزیری پێشووی دەرباری شاهەنشاهیی دوابراوو سەرۆکوەزیری پێشووتری شای پێشوو خەڵکی ئێران تۆمەتباری بە:

*١- بڵاوکردنەوەی گەندەڵی لەسەر زەوی.*

*٢- شەڕ دەگەڵ خواو جێنشینی ئیمامی زەمان علیه السلام.*

*٣- ڕاپەڕین بە دژی ئەمنیەتو سەربەخۆیی وڵات بە دامەزراندنی کابینەگەلی دەستنیشانکراوی ئەمریکاو ئینگلیس بۆ پشتیوانی لە قازانجی کۆلۆنیالیستەکان.*

*٤- هەنگاونان بە دژی سەروەریی نیشتمانی، دەستتێوەردانی هەڵبژاردنی مەجلیس، دانانو لابردنی وەزیرانو فەرماندەران*

بە داخوازی باڵیۆزخانەکانی بێگانە.

٥- دانی سەرچاوەکانی ژێرزەوی نەوت، مس، و ئوورانیۆم بە بێگانەکان.

٦- پەرەپێدانی نفووزی ئیمپەریالیزمی ئەمریکاو هاودەستە ئورووپاییەکانی لە ئێران لەڕێگای وێرانکردنی سەرچاوە نێوخۆییەکان- و کردنی ئێران بە بازاڕی قاڵبوونەوەی کالاکانی دەرەوە.

٧- دانی داهاتی نیشتمانیی بەدەستهاتوو لە نەوت بە شا، فەرەح و وڵاتانی سەربە ڕۆژئاواو پاشان وەرگرتنی قەرز بەسوودی زۆرو مەرجە کۆیلەییهێنەکانی ئەمریکاو دەوڵەتانی ڕۆژئاوا.

٨- نابووتکردنی کشتوکاڵو لەنێوبردنی دارستانەکان.

٩- بەشداریی ڕاستەوخۆ لە چالاکییە جاسووسییەکاندا بەقازانجی ڕۆژئاواو زایۆنیزم.

١٠- دەستەبەندی دەگەڵ پیلانگێڕان لە سەنتۆو ناتۆدا بۆ سەرکوتی نەتەوەکانی فەلەستینو ڤیتنامو ئێران.

١١- ئەندامی چالاکی فراماسۆنەکان لە لۆژی فرووغیدا بە پێی بەڵگەکانی بەردەستو دانپێدانانی خودی تۆمەتبار.

١٢- بەشداری لە ترساندنو تۆقاندنی خەڵکی مافخوازدا دەگەڵ کوشتارو لێدانو بریندارکردنیانو بەرتەسککردنەوەی ئازادییەکانیان بە داخستنی ڕۆژنامەکانو سانسۆری چاپەمەنیو کتێبەکان.

١٣- دامەزرێنەرو یەکەمین سکرتێری حیزبی ملهوڕی "رستاخیز ملت ایران" (ڕاپەڕینی نەتەوەی ئێران).

١٤- بڵاوکردنەوەی گەندەڵیی فەرهەنگیو ئەخلاقیو بەشداریی ڕاستەوخۆ لە پتەوکردنی پایەکانی کۆلۆنیالیزمو پێکهێنانی داوەریی کۆنسوولی بۆ ئەمریکاییەکاندا.

١٥- بەشداریی ڕاستەوخۆ دەگەڵ حەسەنعەلیی مەنسوور لە قاچاغی هێرۆئیندا لە فەڕانسە.

١٦- ڕاپۆرتی ناڕاست بە بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەگەلی دەستنێژو دیاریکردنی سەرنووسەرانی دەستنێژ.

*١٧- لەبەر کۆنووسەکانی کۆبوونەوەگەلی هەیئەتی دەوڵەت‌و ئەنجومەنی بەرزی ئابووری‌و سکاڵای شکایەتکەرانی تایبەتی یەک لەوان عەلی‌ئەسغەری حاجی‌سەید جەوادی‌و بە لەبەرچاوگرتنی ئەو بەڵگانەی لە ساواک‌و سەرۆک‌وەزیری بە شاهیدیی دوکتۆر مەنووچێهری ئازموون، مەحموودی جەعفەریان، پەرویزی نیکخوا دەست کەوتوون‌و پێ‌لێنانی تۆمەتبار خۆشی، چونکە ڕوودانی تاوانەکان ئاشکرایە دادئەستێنی دادگای شۆرشی ئیسلامی دەرکردنی حوکمی ئیعدام‌و زەوت‌کردنی دارونەداری تۆ لە بارەگای دادگا داوا دەکا.*

لە یەکەم ڕوانیندا، دەقی سزاخوازییەکە لەباری جۆراوجۆرەوە سەرنج‌ڕاکێش بوو. لە پێشدا چونکە نێوەرۆکەکەی بە شێوەیەکی بە ڕاستی سەرسوڕهێن، گشتی بووو کەمتر تاوانی ڕوون‌و تۆمەتی کەسیی تێدا دەبینرا. پاشان چونکە ئەوەی لە سزاخوازییەکەدا نەهاتوە بە ئەندازەی خاڵە زەقەکانی بایەخی سیاسی‌و مێژوویی.هەیە. دەزانین کە لە تەواوی دەورانی چالاکیی سیاسیی هوەیدادا ئەو دەنگۆیە لەسەر زاروزمانان بوو کە ئەو بەهاییە. هەر لەو کاتەدا دەزانین کە لە سەروبەندی شۆرشدا، زۆر بەڵگەی گرنگی ناوەندە بەهاییەکان کەوتنە دەستی کاربەدەستانی کۆماری ئیسلامی‌و چالاکانی ڕێکخراوی حوججەتییە کە لەکۆنەوە خەبات دژی بەهاییەکانیان لە سەرووی بەرنامەکانی ڕێکخراوی نهێنیی خۆیاندا دانابوو. بە باوەڕی من ئەگەر بەڵگەیەک لەسەر پێوەندیی هوەیدا بە مەزهەبی بەهاییەوە هەبووایە دەبووە بەشێکی گرنگ لە سزاخوازییەکە. سی ساڵ بوو ڕووحانییەکان ڕەخنە لە نفووزی بەهاییزم لە دەوڵەتیان کردبووە یەکێک لە دروشمە بنەڕەتییەکانیان‌و لە هەر دەرفەتێک بۆ ڕەخنە لەو لایەنەی کاری ڕێژیمی شا کەلکیان وەردەگرت. بۆیە ئەگەر لە دادگای کەسایەتییەکی گرنگی وەک هوەیدادا، چووکترین بەڵگەیان بۆ ئیسباتی بەستراوەیی ناوبراو بەو تاقمەوە لە دەستدا بایە، حەتمەن خۆیان لە بەکارهێنان‌و جەخت-لەسەرکردنەوەی نەدەبوارد. جگەلەوە، دەقی سزاخوازییەکە لەبارەی

گەندەڵییماڵیی هووەیدا خۆیەوە بە تەواوی بێدەنگەی کردبوو. هووەیدا هەمیشە لە ژیانی سیاسیی خۆیدا شانازیی بەم خاڵەوە دەکرد کە هەرگیز دەستی بە بەرتیل‌و ماڵی حەرامی بیت‌المال ئالوودە نەبووە. سزاخوازی هەرنەبێ لەو بارەیەوە بەنرخ بوو کە نیشانی دەدا بەخۆنازینی هووەیدا بێ‌جێ نەبووە.

بەڵام بناخەی سزاخوازییەکە، لە دروشم بەولاوە نەبوو. زمان‌و نێوەرۆکەکەی پێکهاتەیەکی ناڕێک لە وشەو دروشمە چەپی‌و مارکسیستییەکان‌و دروشمەکانی لایەنگرانی شۆرشی ئیسلامی بوون. هێرشی پەیتاپەیتای سزاخوازییەکە بۆسەر ئەمریکا، زمانی تایبەتیی بەشێک لە بەندەکانی("بڵاوبوونەوەی نفووزی ئیمپەریالیزمی ئەمریکاو هاودەستە ئورووپاییەکانی...کردنی ئێران بە بازاڕی قاڵکردنەوەی کالا دەرەکییەکان...قەزروەرگرتن بەنرخی هەورازو گران...دەستەبەندی دەگەڵ پیلانگێران لە سەنتۆو ناتۆدا")و سەرەنجام بێدەنگبوونی لە بارەی شووڕەویدا هەموو دەکرا ڕەنگدانەوەیەک لە نفووزی بیروباوەڕەکانی حیزبی توودە بن.[١٢]

سزاخوازی بۆ ئیسباتی گوناح‌و تۆمەتەکانی هووەیدا ئاماژە بە دوو جۆر شاهیدو بەڵگە دەکا. لەلایەک پشت بە دانپێدانانی تۆمەتلێدراوو زیندانییەکانی دیکە دەبەستێ‌و لەلایەکی دیکە بە سکاڵای شکاتکەرە تایبەتییەکان". جارێ دیار نیە پشت بەکام دانپێدانانی "زیندانییەکانی دیکە" دەبەستێ. هەلومەرجی بەدەستهێنانی ئەو دانپێدانانەو، ڕادەی بەکارهێنانی فشاری لەشی‌و ڕووحی لە بەدەستهێنانیشیاندا، بۆ دادگا هیچ مایەی گوێپێدان نەبوون.

پاشان ئاماژەی سزاخوازی بە سکاڵای عەلی‌ئەسغەری حاجی‌سەید جەوادییش بە زۆرهۆ پێویستیی بە لێوردبوونەوەو لێکۆڵینەوەی پتر هەیە. پێش هەموو شتێک چونکە سکاڵای حاجی سەیدجەوادی بەڵگەیەکی قانوونی نەبوو. لە هیچ دادگایەکیشدا سابیت نەببوو. لە ڕاستیدا شتێک نەبوو جگە لە بەیاننامەیەکی سیاسی کە جۆزەردانی١٣٥٦ نووسرابوو و چەند دانەیەکی کەمی لە تاران لێ بڵاو کرابۆوە. دەتوانین نووسینی ئەو

بەیاننامەیــە بــە یــەکێک لــە هــەوەڵین نیشــانەکانی زیندووبوونــەوەی سەرلەنوێی بزووتنەوەی دیموکراتیک لە ئێراندا بزانین. جگەلەوە، حاجی سەید جەوادی بۆخۆی دەڵێ مەبەستی لە نووسینی ئەو دادخوازییە، "لە راستیدا هێرش بۆ سەر شا بوو. بەڵام لە ساڵی١٣٥٦دا هێشتا هێرشی راستەوخۆ بۆسەر شا دەرەتانی نەبوو."[١٣] و هەربۆیە هووەیدا لە جیاتی شا کەوتە بەر پەلامار.

دیــارە هەرلــە کــاتی دادگاشــدا حــاجی ســەید جــەوادی دەیزانــی مەبەستیان تەنیا ئەوەیە کەلکی خەراپ لە "دادخوازی"یەکەی وەربگرن. هەربۆیەش بانگیان کردبوو تا لە کۆبوونەوەکانی دادگادا بەشدار بێ. بەڵام حاجی سەید جەوادی نەچووە ژێربار. ئەو دەڵێ شێوەی کاری دادگام بەدڵ نەبوو. جگەلەوە، گومانێک نیە کە وەختێک ئەو، بەوپەڕی ئازایەتییەوە، ترس‌و سامی ساواکی وەلا ناو ئەو نامە ئازایانەیەی نووسی، گومانی نەبوو کە چەند ساڵ دواتر، نیوەرۆکی ئەو "دادخوازی"یە دەبێتە بەڵگەی دەستی دادگایەک کە لە کوشتنی هووەیدا زیاتر ئامانجێکی نەبوو.

بەڕێکەوت لەو "دادخوازییە تایبەتی"یەدا مەسەلەی بەرپرسایەتیی قانوونیی هووەیداو وەزیرانی کابینەکەی چەند بەرابەر وردترو درێژتر لە دەقی سزاخوازییەکەی دادگای شۆرش شی کرابووە. حاجی سەید جەوادی "ئاغای هووەیداو هاوکارەکانی"ی بە لەژێرپێنانی لانی کەم پەنجاو شەش ئەسڵی قانوونی بنەڕەتیی ئێران تۆمەتبار کردبوو. نووسیبووی هووەیداو هاوکارەکانی ئەسڵەکانی قانوونی بنەڕەتی‌یان لە پێوەندی دەگەڵ مافی کۆبوونەوەو حیزبایەتی‌و سەربەخۆیی دەسەڵاتی دادوەریدا لە ژێر پێ ناوە. باسی ئەشکەنجەو سانسۆری کردبووو هووەیدای تۆمەتبار کردبوو کە هەمیشە بە لێبڕاوییەوە حاشای لە بوونی زەبرو زەنگ لە ئێراندا دەکرد.[١٤] گوتبووی کە لە تەواوکەری قانوونی بنەڕتیدا بە ڕاشکاوی گوتراوە "شا دەبێ پادشایەتی بکا نەک حکوومەت". بە ڕاشکاوی گوتبووی وەزیرەکان بەرامبەر بە مەجلیس بەرپرسن نەک بەرامبەر بەشا. گوتبووی بەپێی قانوونی بنەڕەتیی ئێران هیچ فەرمانێکی شــا، چ بەنووســراو، چ بــەدەم، بەرپرســایەتیی قــانوونی لــە وەزیــر

ناستێنێتەوە. باسی بەرپرسایەتیی هاوبەشی هەیئەتی دەوڵەتی كردبووو گەیبووە ئەو ئاكامە كە یەكیەكی وەزیران، بەرامبەر بە هەموو كارەكانی ساواک بەرپرسن.

دوابەشی "دادخوازی"یەكە بۆ مەسەلەی مافی خڕبوونەوەو حیزبایەتی تەرخان كرابوو. لەوێدا حاجی سەید جەوادی ئەو دەستەیە لە ئەسڵەكانی قانوونی بنەڕەتیو هەروەها بەیاننامەی مافی مرۆڤی كە پێوەندییان بە ئازادیی خۆڕێكخستنو حیزبایەتییەوە هەبوو، ناو بردبوو، ئەمجار گەیبووە ئەو ئاكامە كە دامەزراندنی حیزبی "رستاخیز" ئەو مافە گرنگەی لە خەڵكی ئێران زەوت كردوە. نووسیبووی ئەمە یەكەمجار نیە كە مافی حیزبایەتیی خەڵكی ئێران وەبەر شەق دراوە. هەرلەو كاتەدا پێی دادەگرت كە زۆر بەندی دیكەی قانوونیش لە ئاكامی سەرەڕۆیی دەوڵەتدا خراونە ژێر پێ. حاجی سەید جەوادی بە ڕاشكاوی دەیگوت لە ئێران دەسەڵاتی دادوەری سەربەخۆ نیە، بەوحاڵە داوای لە هووەیدا كرد هەرلەو دەسەڵاتە دادوەرییەدا، دادگایەک بۆ پێڕاگەیشتنو حوكمدان لە بارەی ئەو تۆمەتانەوە كە لە دادخوازییەكەدا هاتبوون دیاری بكا.[15] دیارە هووەیدا هەرگیز ئەو داوایەی قبووڵ نەكرد. گەلاوێژی١٣٥٦ بە یەكێک لە باوەڕپێكراوانی خۆی گوتبوو: "ڕیشەی خۆپێشاندانەكانی ئەم دواییەو كاغەزپەڕێنیو بەیاننامەنووسینەكانی تازە لە ئێران نیە."[16] ڕیشەی بەیاننامەكان لە هەركوێ بووبێ، ئەمجارە لە سزاخوازیی دادگای هووەیدادا خۆی دەرخستبووو هووەیدا بەوردی گوێی بۆ نێوەرۆكەكەی ڕادەگرت.*[17]

---

* تا ماوەیەک لەمەوبەر، ڕۆژنامەكانی ئەودەمو چەند بیرەوەرییەک، تەنیا سەرچاوەی بەردەست بۆچەندوچۆنی دادگای هووەیدا بوون،كۆماری ئیسلامی هیچكات شریتی تەواوی ئەو دادگایەی بلاو نەكردەوە. ئەم دواییانە لە ئێران ژیاننامەیەک بە قەڵەمی خوسرەوی موعتەزید و بە ناوی هووەیدا: سیاسەتمەداری پیپ،وەكاز،گوڵی ئۆركیدە بلاو بۆوە. دوو بەشی دوایی بەرگی دووەمی بۆ باسی دادگای یەكەمو دووەمی هووەیدا تەرخان كراوەو لە ڕاوێژی قسەكانو جۆری چاپی دەقەكە وا دەردەكەوێ كە

خوێندنەوەی سزاخوازییەکە تەواو نەببوو کە هووەیدا نارەزایی خۆی دەست پێکرد. ڕۆژی دوای شۆرش، ئەویان ناچار بە وتوویژێکی چاپەمەنی کرد. لە تەواوی ئەو وتوویژەدا، حاڵەتێکی سەرکێشی هەبوو. تەنانەت لە یەکێک لە پرسیارکەرەکان تووڕەش بوو کە، "ئێرە وتوویژی چاپەمەنییە، نەک دادگا."[١٨٠] بەڵام کاتێک لە دادگا دەستی بە قسە کرد توندیی وتەکانی کەم کردبۆوە. وەک ئەوەی بزانێ عاقیبەتی کارەکەی چیە نائومێدیو ترس سێبەریان خستبووە سەر گیانو قسەکردنی. گوتی، "ئەمن ئەم سزاخوازییەم هەرگیز نەدیوەو نەخوێندۆتەوە." پرسی چما بە پێی قانوون نەدەبوو دەرفەتێ بدرێتێ تا پێشتر سزاخوازییەکە وەخوێنێو بەرگریی خۆی ئامادە بکا. نارەزایی لە کاتی دەستپێکردنی دادگاش دەربڕی. وەبیری هێنانەوە کە ئێوارەی هەر ئەو ڕۆژە چاوی بە دادئەستێن کەوتبوو لەو دیدارەدا، دادئەستێن بیست پرسیاری جۆراوجۆری هێنانە گۆڕێ، "و بڕیار درا دەرفەتی تەواو بە من بدرێ تا بەرگری لەخۆم بکەم." گوتی، "ڕێک کەوتین کە ئەو ئەژمارەو زانیاری-یانەی لە بارەی ئەو پرسیارو تۆمەتانەوە پێویستن، کۆ بکرێنەوە." بێ-پەروا گوتی پێش ئەوەی لەخەوی هەستێنو ڕاکێشی دادگای بکەن حەبی خەوی خواردبوو. گوتی حەبەکان دوکتۆری زیندان بۆی دانابوو. پرسی : "لەم هەلومەجەدا چۆن دەتوانم وەڵامی سزاخوازییەکی وا بدەمەوە."[١٩٠] وەڵامی خەڵخاڵی بەو نارەزایەتی‌یانە بە ڕاستی سەرسوڕهێن بوو. واش دیار نەبوو بەگاڵتە بێ. گوتی کاتی نائاسایی دەستپێکردنی دادگا لە ڕێکەوت بەولاوە نیە. گوتی، دادگاکانی شۆرشی ئیسلامی شەوو ڕۆژ ناناسن. کارەکەی "خێراو شەووڕۆژی" ئەنجام دەدا، "هەروەک لە ناوەکەی‌ڕا دیارە شۆرشگێرە."[٢٠٠]

---

گێڕانەوەی کتێبەکە لە جێدا دەقی پیادەکراوی شریتی وتوویژەکانی دادگایە. بەڵام بە داخەوە موعتەزید هیچ سەرچاوەیەک بۆ گێڕانەوەکەی ناو نابا. بە ناچار ئەمنیش تەنیا لەو جێگایانەدا کەلکم لە کتێبەکە وەرگرت کە نێوەرۆکەکەیان دەگەڵ ئەوەی پێشتر لە چاپەمەنیی ئەو ڕۆژانەدا بڵاو ببۆوە دەخوێنێتەوە.

هووەیدا پاش نارەزایی لە شێوەی کاری دادگاو کاتی دەست-بەکارکردنی هێرشی کردە سەر نێوەرۆکی سزاخوازییەکە. راوێژی قسەی زۆر ورد بوو. تووڕە نەدەبوو، بەلام بە ڕاشکاوی قسەی دەکرد. دووبارە وەبیر سەرۆکی دادگای هێنایەوە کە، "بەپێی لێک-حاڵیبوونێکی دەگەڵ دادئەستێن کرابوو، قەرار بوو ئێمە زانیاریی بدەینێ."[41] بە ڕاستییش هووەیدا بۆ وەدەستهێنانی ئەو ئەژمارەو ئامارانە کە بۆ بەرگری لەخۆی پێویستیی پێیان هەبوو، داوای کۆمەگی لە بنەماڵەکەی کردبوو. پتر لە هەموو شتێک لە ئامارێک دەگەڕا کە ڕادەی هەڵدانی ئابووریی ئێرانی لە سەردەمی سەرۆکوەزیریی خۆیدا نیشان دەدا.[42] خەلخاڵی گوتی لەو کاتەوە گیراوی تا ئێستا دەرفەتی پێویستت بۆ ئامادەکردنی بەرگریی خۆت هەبووە. هووەیدا بە دژی ڕاوەستاو گوتی لە سەردەمی شۆڕشەوە تا ئێستا تەنیا دووجار دەگەڵ کاربەدەستێکی ڕەسمیی نیزامی ئیسلامی قسەی کردوەو دەرفەتی پێویستی بۆ کۆکردنەوەی ئەژمارەو ئامار نەبووە.[43] وەلامێک کە خەلخاڵی بەو نارەزایەتییەی دایەوە بە باوەڕی من تەنانەت لە مێژووی دادگا ڕواڵەتییەکانیشدا بێوێنە بوو. سەرۆکی دادگای شۆڕش گوتی، "بەشی زۆری بەندەکانی سزاخوازی مەسەلەی گشتیو تۆمەتگەلێکن کە پێویستییان بە شاهیدو بەڵگە نیە."[44]

بەرەبەرە ڕوون بۆوە کە ڕێوشوێنی باوو ناسراو لە دادگادا- لە پێویستیی بەڵگەی دادگاپەسندو بێگوناحیی تۆمەتلێدراو پێش سابیت-بوونی تاوانەوە بگرە تا بێلایەنیو دادپەروەریی سەرۆکی دادگا- هیچیان بۆ خەلخاڵیو دادگاکەی بایەخێکیان نیە. ئەو لە پۆستی سەرۆکی دادگادا تەنانەت پتر لە دادئەستێنیش ئیرادی لە تۆمەتلێدراو دەگرت؛ بە زمانێکی تەنانەت توندتر لە دادئەستێنیش ڕووی دەکردە تۆمەتلێدراوو سەرکۆنەی دەکرد. لە دادگایەکەیدا نە هەیئەتی مونسیفەیەک هەبوو نە پارێزەرێک. دەنگۆ بە ئەندازەی ڕاستی برەوی هەبووو بەرچاوترین نموونەی ئەو ڕاستییە دەتوانین لە بەندی ١٥ی سزاخوازییەکەدا وەبینین. لەوێدا هووەیدا بە قاچاغی هێرۆئین تۆمەتبار کراوەو دەزانین

کە دەنگۆیەکە لەجێدا ئەوی بە قاچاغی دراو تۆمەتبار دەکردو هەرلەو کاتەدا دەزانین کە بەڵگەکانی وەزارەتی دەرەوە بە ئاشکرا نیشان دەدەن کە هووەیدا بە هیچ جۆر گوناحکار نەبوو. بەلاَم لەلای خەڵخاڵی هەر ئەو دەنگۆ بێبناخەیە وەک حەقیقەتێکی ڕووت سەیر دەکرا. لە ڕاستیدا خەڵخاڵی دواتر لە بیرەوەرییەکانیدا بێپەروا شانازیی بەو ڕاستییەوە دەکرد کە لە دادگادا بێباکانە هێرشی کردۆتە سەر هووەیدا. دەڵێ، "ئەو دەکرێ بڵێین گێژ ببوو، وەک کەسێکی سەرەگێژەی گرتبێ."[25]

خەڵخاڵی لەو بارەیەوە ڕاستی دەکرد. ڕەفتاری لە دادگادا بە ڕاستی تۆمەتلێدراوی لەڕیشە دەردێنا. هووەیدا زوو تێگەیبوو کە ئەو دادگایە لەو بابەتە نیە کە ئەو چاوەڕوانی بوو. دەیزانی کە چارەنووسی لە پێشدا دیاری کراوە. دەیزانی کە سزلخوازیو وتوویژەکانی دادگا لە ڕواڵەتبازی بەولاوە شتێک نین. بەوحاڵە بە یەکجاری دەستی لە هێرش بۆ سەر سزاخوازیو دیفاع لەخۆی هەڵنەگرت. جاری وابوو پەنای بۆ وردەکاریی زمانناسی دەبردو دەیپرسی کە دلخوا بەڕاستی مرۆڤێکی فانیو بێدەسەلاتی وەک وی دەتوانێ شەڕ دەگەڵ دەسەلاتی بێ- برانەوەی خواوەند بکا. دەیگوت ئەمن بێچووە موسوڵمانمو دایکم ژنێکی ئیماندار بووو دەیپرسی چۆن دەکرێ مرۆڤێکی وەک من بکەوێتە فکری شەڕکردن دەگەڵ خوا.[26]

هووەیدا قبووڵی کرد کە دانی مافی کاپیتولاسیۆن بە ئەمریکاییەکان لە ساڵی١٣٤٣ (١٩٦٤)دا هەڵە بووە. بەلاَم بۆ بەرگری لەخۆی گوتی ئەودەم هێشتا نەببووە سەرۆکوەزیر. گوتی تەنیا وەزیری دارایی بووەو جگە لەوەش لەکاتی پەسندکردنی پڕۆژەبڕیارەکەدا لە دەرەوەی ئێران بووە. دیارە پاکانەکەی لەو بارەیەوە زۆر لاواز بوو. بێگومان ئەو باشی دەزانی کە بەپێی قانوونی بنەڕەتیی ئێران، ئەندامانی هەیئەتی دەوڵەت لە بەرامبەر بڕیارو کارەکانی کابینەدا بەرپرسایەتیی هاوبەشیان هەیە.

دەربارەی تۆمەتی قاچاغی هێرۆئین لە پاریس، هووەیدا ڕوونی کردەوە کە سەرچاوەی سەرەکیی ئەو تۆمەتە بێبنەمایە، قسەکانی

ڕۆژنامەیەکی بەدناوی چەپی بوون. حەقیشی بوو. گوتی ئەگەر دادگا بیهەوێ پشت بە هەموو دەنگۆیەکی بێبناخە ببەستێو بە بەڵگەی دابنێ، ئەویش یەکسەر لە بەرامبەر دادگادا بێدەنگ دادەنیشێ. لە ڕاستیدا هەر لە ڕەتکردنەوەی ئەم بەندەی سزاخوازییەکەدا بوو کە هووەیدا بە ئازایەتیو لێزانیی خۆی دادگای بردە ژێر پرسیار. گوتی، "ئاغای سەرۆک ئەم سزاخوازییە لاوازە. دادگا دەبێ ئەم سزاخوازییە وەر بگرێتەوە."[٤٧] گوتی ئەگەر بە ڕاستی دەستم لە کاری قاچاغدا بووبێ، بەڵگەکانی ئەو داستانە حەتمەن لە وەزارەتی کاروباری دەرەوەو پۆلیسی نێونەتەوەیی ڕاگیراون. گوتی ئەگەر چووکترین نیشانەی گوناحی من لەو بوارەدا دۆزرایەوە، ئەمنیش هەموو لایەنەکانی دیکەی سزاخوازییەکە قبووڵ دەکەم. دیارە سەرۆکی دادگا مەرجەکەی هووەیدای قبووڵ نەکردو تەنیا ئەوەندەی گوت کە هووەیدا باشترە درێژە بە بەرگریکردنەکەی بدا.[٤٨]

لەبارەی تۆمەتە گشتیترەکانی وەک خەیانەتو جاسووسییەوە، هووەیدا جۆرێکی دیکە جووڵایەوە. لەو بارەیەوە باری بەرپرسایەتیی خستە سەرشانی سیستەم. گوتی تاک لەو سیستەمەدا بەرپرسایەتییەکی وای نەبوو. گوتی ڕێژیمی پێشوو ئەمن دروستم نەکردوە؛ ئەمن هەر خزمەتکاری ئەو نیزامە بووم. جەختی کردەوە کە بەرپرسایەتیی ویش هەر بەقەد بەرپرسایەتیی هەموو ئەو کەسانە بووە کە ملیان بۆ حکوومەتی شا ڕاکێشاوە. باوەڕی وابوو کە زۆربەی ئەو کەسانەی لە دادگا ئامادە بوون وەک وی بەشێک لە ڕێژیمی پێشوو بوون. دەیگوت ئەمن تەنیا پەڕەیەک لە چەرخی ئەو دەزگا گەورەیە بووم. قبووڵی بوو کە لە سەردەمی سەرۆکوەزیرییەکەیدا حەتمەن هێندێ هەڵەش ڕوویان داوە، بەڵام دەسبەجێ لێی زیاد دەکرد کە هەر لەو دەورانەدا ئێران دەسکەوتی گەورەی بە نسیب بوون. بە ئاشکرا لێبڕابوو کە بەرگری لە کارنامەی دەورانی حکوومەتەکەی بکا. دەیگوت ئەگەر داوەری لەسەر من دەکەن، دەبێ بارە باشەکانیش لەپەنا بارە خەراپەکان لەبەر چاو بگرن. پێی دادەگرت کە هیچ نەخشێکی لە بەڕێوەبردنی ساواکدا

نەبووەو هەموو نیشانەکانیش دەردەخەن کە ئیددیعایەکەی لەو بارەیەوە ڕاست بووە. هەر لەو کاتەدا حاشای لەوە کرد کە پیاوەکانی خۆی کردبنە سەرنووسەری چاپەمەنی.[29] وەبیر دادگای هێنایەوە کە ئەو مەسەلانەی پێوەندییان بە سیاسەتی دەرەوە، سوپاو سیاسەتی نەوتیی ئێرانەوە هەبووە هەموو لە پاوانی شادا بوون. گوتی هیچ خەبەرو ئاگادارییەکی لە هێرشی ئێران بۆ سەر زوفار نەبووەو مانگێک دوای دەستتێوەردانی ئێران لەو شەڕەدا، لە ڕێگای چاپەمەنییەوە، لەو بەسەرهاتە ئاگادار بووە. کاتێک ئەوقسانەی دەکرد ڕقو نارەزایەتی لە دەنگیدا شەپۆلیان دەدا. بێپەروا ئیددیعای کرد کە ئەندامانی دادگاش ناتوانن بەرامبەر بە ڕێژیمی پێشوو یەکسەر بەرپرسایەتی لە خۆیان دارنن، چونکە بەهەرحاڵ ئەوانیش لەو سەردەمەدا لە ئێران ژیاونو لەژێر فەرمانی ڕێژیمدا بوون.[30]

خەڵخاڵی لێرەدا پرسیارێکی هێنایە گۆڕێ کە زۆرجار دۆستانو خزمانی هوەیداش لێیان کردبوو. پرسی بۆچی وەختێک تێگەیشتی هیچکارێکت لە دەست نایە، دەستت لەکار نەکێشایەوە.[31] هوەیدا لەژێر ئەو پرسیارە دەرچوو، وەڵامێکی وردی نەدایەوە. تەنیا ئەوەندەی گوت کە گوناحی وی لەو بارەیەوە، هەر ئەوە بووە کە لە سەردەمی حکوومەتەکەیدا لە هەموو دەسەلاتی سەرۆکوەزیر کەلکی وەرنەگرتوە.

ئەم پرسیارەی خەڵخاڵی لە ڕاستیدا دەکرێ بە نوێنگەی ڕاستییەکی گشتیتر بزانین. هەرچەند خەڵخاڵی وەک سەرۆکدادگایەک تەنانەت بۆ ڕواڵەتبازییش خۆی بێلایەن نیشان نەدەدا، بەڵام بەوحاڵەش، و ڕەنگە بە پێچەوانەی ویستی خۆشی، هێندێ پرسیاری هێنانە گۆڕێ کە هەموویان بۆ هەڵسەنگاندنێکی جیددیی جێگەو پێگەی مێژوویی هوەیدا بنەڕەتیو پێویستن. بۆ نموونە، ئایا هوەیدا بەڕاست هەر قوربانییەکی ڕێژیمی سەرەڕۆیی بوو یان لە هێنانەمەیدانو ڕەنگوڕووپێدانیدا نەخشێکی بنەڕەتیی هەبوو؟ دلخوا بەڕاست، وەک بۆخۆی زۆرجار ئیددیعای کردبوو، لە دەورانی شادا کەس نەیدەوێرا دەست لە کار

بکێشێتەوە؟ داخوا لە نێوان هاوکاریی سەرۆک‌وەزیرێک دەگەڵ شاو چالاکیی- بۆ نموونە- مامۆستایەکدا کە ئەویش مووچەی هەر لەو ڕێژیمە وەردەگرت جیاوازییەک نەبوو.

سەرنج‌ڕاکێش ئەوەیە کە خەڵخاڵی تەنیا کەس نەبوو کە ئیددیعای هوەیدای لەو بارەیەوە کە ئەو هەر قوربانیی ڕێژیمی شا بووە، قبووڵ نەبوو. بەڕێکەوت هێندێک لە ئەندامانی بنەماڵەی پادشایەتی‌و ژمارەیەکی بەرچاو لە لایەنگرانی پادشایەتییش هوەیدا نەک بە قوربانییەک بەڵکوو بە مۆرەیەکی گرنگ‌و خەتاکار دەزانن. چەند ڕۆژ دوای دەرچوونی شا لە ئێران، ئێدوارد سابلییە لە مەڕاکیش وتوویژی دەگەڵ کرد. سابلییە لە بارەی چارەنووسی هوەیداوە پرسیاری لێ‌کرد. دەیەویست بزانێ دلخوا شا پێش چوونەدەر لە ئێران هوەیداشی لە زیندان ئازاد دەکرد. شا لە حاڵێکدا ڕوخسارێکی داگیرساوو تووڕەی هەبوو، وەڵامی دایەوە کە، "ئەو درۆی دەگەڵ کردین."[٢٢] کچەشا ئەشرەفی پەهلەوییش بەشێکی بەرچاو لە گوناحی ڕووخانی ڕێژیمی پەهلەوی دەخاتە سەر شانی هوەیدا. گۆیا بە یەکێک لە باوەڕپێکراوانی خۆی گوتبوو، "هوەیدا چاردەساڵ درۆی دەگەڵ برایەکەم کرد. هەرگیز هەنگاوێکی بۆ گرتنی دزەکان هەڵنەهێنایەوە."[٢٣] نە ئیددیعای شاو نە قسەی کچەشا ناتوانین بە جیددی وەربگرین. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە شا لەجێدا گوێی بۆ خەبەری ناخۆش‌و ڕەخنە لە ڕێژیمەکەی ڕانەدەگرت. ئەگەر بیرەوەرییەکانی عەلەم بە جیددی بگرین، دەبێ قبووڵ بکەین کە حەوتوو نەبووە عەلەم بابەتێک لە بارەی ڕادەی ناڕەزایەتیی خەڵکەوە بە شا نەڵێ.[٢٤] جگە لەوە، بە درێژایی دواساڵەکانی شایەتییەکەی، شا چەندین جار ڕاپۆرتگەلێکی لە بارەی خەراپیی بارودۆخەوە لە کەسایەتییە سیاسییەکانەوە پێ‌دەگەیشت‌و بەکردەوە هەموویانی یان پشت گوێ دەخست یان گاڵتەی پێ‌دەکردن. نەک هەر عەلەم، لە گەلاوێژی ١٣٥٦دا، ئەوکاتەی دەگەڵ نەخۆشیی شێرپەنجە دەست‌وپەنجەی لێ‌دەداو لە فەڕانسە لە سەرەمەرگدا بوو، نامەیەکی بۆ شا نووسی‌و نیگەرانیی خۆی لە دواڕۆژی وڵات دەربڕی، بەڵکوو

مـەنووچێهری ئیقبـاڵیش پـاش کشـانەوە لـە سـەرۆکایەتیی هەیئـەتی بەڕێوەبەریی کومپانیی نـەوتی ئێران، لە نامەیەکدا بۆ شـا بـە ڕاشکاوی ڕای‌گەیاند کە، "خەڵکی وڵات لە بارودۆخ ناڕازین." شـا ئـەو هۆشـدارانەی بـە پووڵەڕەشـکەیەک نـەدەکڕین. لـە وەڵامـی ئیقباڵدا گوتبـووی کـە ئـەو "ئاگای لـە کاروبـار نیـە"و شـا بۆخـۆی بارودۆخـی وڵات لـە هەمووکـەس باشتر دەناسێ.[٢٥]

دیارە ئەگەر دادگای موحاکەمەی هووەیدا لە هەلومەرجێکی ئارامداو بە حەوسەلەوە بەرپا کرابایە، لەوانە بوو بتوانێ پرسیارگەلێکی گرنگی وەک ئەوانەی پێشتر ئاماژەم بۆ کردن بخاتە بەر باس‌و لێکۆڵینەوەو بە چوونەخوارێکی وردتر بە دوورایيە ئەخلاقی‌و قانوونی‌و مێژووییەکانی هەرکامێکیانـدا، داوەری لەسـەر هـەرکامێکیان ئاسـانتر بکـا. بـەڵام بـە پێچەوانـە، سـەرۆکی دادگـا هەمیشـە دروشـمی دەدان، گشـت‌وێژیی دەکـردو کاتێـک سـەرەنجام کـاری دادگـا گەیشـتە بنبەسـت، هووەیـداش بەرگرییـەکانیی بـە ئامـاژە بۆ ژیـانی تایبـەتیی خـۆی تـەواو کـرد. گـوتی، "دەستەکانم نە بە خوێنی کەس ئاڵوودە بوون‌و نە بە بەیتولمال. جەختی کـردەوە کـە "ڕقـی کەسـم دەدڵدا نیـە." گـوتی ئـەمنیش ئەگـەر بەڕاسـتی گوناحکار بایەم ڕام‌دەکردو ئـەمڕۆ وەک پێنج سـەرۆک‌وەزیری دیکەی ئێران لە شـەقامەکانی ئورووپا یان ئەمریکادا پیاسـەم دەکـرد. پێـی داگـرت کـە، "مامـەوە چونکـە وڵاتەکـەمم خـۆش دەویسـت‌و دڵنیـاش بـووم کـە گوناحکار نیم." ئـەمجار باسـی ژیـانی سـادەی خـۆی کـرد. گـوتی لـە ماڵـی دنیا تـەنیا شـوققە (ئاپارتمـان)ێکم هـەبوو کـە ئـەویش کۆمیتـەی شـۆرش دەستی بەسـەردا گرت. باسـی ئۆگریی خۆی بـە دایکی پیریی کـرد. گـوتی، "هەشـتا ساڵەیەو ئـەمن زۆرم خـۆش دەویسـت." بـە پاڕانـەوە داوای لـە دادگا کرد کە دایکی نەهێننە دادگا. دەیگوت، "باشترە ئەم وەزعە نەبینێ- و دڵ بە بیرەوەرییەکانی ڕابردوو خۆش بکا."[٢٦]

بەڕواڵەت یادی دایکی، هووەیدای زۆر تێک‌دا.* دەسەسڕەیەکی لـە گیرفانی دەرێناو دڵۆپە فرمێسکەکانی لە ڕوخساری سڕینەوە. ئەودەم بە دەنگێک کە لەبەر هەسـت‌وسـۆز دەلەرزی، داوای لە سـەرۆکی دادگا کرد

کۆبوونەوەکە تەواو بکاو دەرفەتی بداتێ تا بەرگریی خۆی بەوەخت ئامادە بکا. خەڵخاڵی پێشنیاری هووەیدای قبووڵ کرد. بەپێی قاعیدە هۆکارگەلێکی جۆربەجۆر کۆمەگیان بەو پەکخستنە کاتییەی کاری دادگا کرد. بێجگە لەوەی ئەو شەوە لە دادگادا گوزەرابوو، دەوڵەتی بازرگانیش، لە پشتی پەردەوە، بە توندی دژایەتیی کاری دادگاکانی شۆرشی دەکرد. بەتایبەتی دەیەویست کارێک بکا کە هووەیدای لە دادگایەکی ئاشکرادا موحاکەمە بکەن. هەرچۆنی بوو، پەکخستنی کاتیی کاری دادگا، لەبەر هەرهۆیەک بوو، گیانی هووەیداشی، هەرنەبێ بۆ ماوەیەک، رزگار کرد.

# سەرچاوەکان

۱. صادق خلخالی، «خاطرات»، سلام، ۸ مهر ۱۳۷۱، ص ٦.
۲. برای دستیابی بەگزارشی از سخنرانی آیت‌الله خمینی، و فعالیتهای اوّلیه‌اش، ر.ک. سیدحمید روحانی، بررسی و تحلیل نهضت امام خمینی، تهران ۱۳۵۸، ص ۳۳٦.
۳. صادق خلخالی، کورش دروغین و جنایتکار، تهران، ۱۳۷۰.
۴. انشاء، گفتگو.
۵. کیهان، ۲٦ بهمن ۱۳۵۷، ص ۸.
٦. دکتر فرشته انشاء، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۴ ژوئن ۱۹۹۸.
۷. کیهان، ۲۴ اسفند ۱۳۵۷، ص ٦.
۸. پیشین، ص ٦.
۹. پیشین، ص ۱.
۱۰. پیشین، ص ٦.
۱۱. پیشین.
۱۲. پیشین.
۱۳. علی‌اصغر حاج سیّدجوادی، گفتگو با نگارنده، ۲ سپتامبر ۱۹۹۹.
۱۴. نسخه‌ی دست‌نویس اصلی، با عنوان «اعلام جرم مردم ایران علیه آقای هویدا، نخست‌وزیر، و تمام وزیران گذشته و حال در کابینه‌ی ایشان»، به لطف علی‌اصغر حاج سیدجوادی، در اختیارم قرار گرفت.
۱۵. پیشین، ص ۹.
۱٦. راجی، در خدمت تخت طاووس، ص ۹٦.
۱۷. حاج سید جوادی، گفتگو.
۱۸. کیهان، ۲۳ بهمن ۱۳۵۷، ص ۸.
۱۹. کیهان، ۲۴ اسفند ۱۳۵۷، ص ۸.
۲۰. پیشین.
۲۱. پیشین.
۲۲. انشاء، گفتگو.
۲۳. کیهان، ۲۴ اسفند ۱۳۵۷، ص ۸.

۲۴. پیشین.
۲۵. خلخالی، «خاطرات»، ص ۷.
۲۶. کیهان، ۲۳ بهمن ۱۳۵۷، ص ۸.
۲۷. خسرو معتضد، هویدا: سیاستمدارِ پیپ، عصا و اورکیده، تهران، ۱۳۷۸، ص ۱۰۱۹.
۲۸. پیشین، ص ۱۰۱۹.
۲۹. پیشین، ص ۱۰۱۰.
۳۰. کیهان، ۲۴ اسفند ۱۳۵۷، ص ۸.
۳۱. پیشین.
۳۲. ادوارد سابلیه، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۱۴ مارس ۱۹۹۸.
۳۳. راجی، در خدمت تخت طاووس، ص ۲۲۴.
۳۴. علینقی عالیخانی، از سر لطف، نسخه‌ای از این نامه را برایم تدارک کرد. علم از ماهیت مسئله تحلیلی ارائه نمی‌کند. در عوض، تأکید فراوانی بر کمبود برق در ایران می‌کند و از شاه می‌خواهد هرچه زودتر در صدد حل این مسئله بر آید.
۳۵. خسرو، برادر منوچهر اقبال، از محتوای این نامه به سفارت امریکا خبر داد. ر.ک.
U.S. Embassy, Tehran, Iran, "Memorandum of Conversation, October 11, 1975," NSA. no. 1586.

۳۶. کیهان، ۲۴ اسفند ۱۳۵۷، ص ۸.
۳۷. پیشین، ص ۸.
۳۸. پیشین، ص ۸.
۳۹. پیشین، ص ۸.

# فەسڵی شازدەیەم

## گۆلی سەهۆڵبەستووی کاکیتووس

هەر هەناسەیەك
ترسی کۆنی لە خوێنداخەوتوو وەخەبەردێنێ.

دانتە

# گۆلی سەهۆڵبەستووی کاکیتووس*

خەڵخاڵی گێڕانەوەی ڕووداوەکانی دادگای دووەمی هووەیدا بە باسی ئەو خۆراکە دەست پێدەکا کە نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە خواردبووی. ڕۆژی هەژدەی خاکەلێوەی ١٣٥٨ بوو. خەڵخاڵی دەوری سەعات یەکی پاش نیوەڕۆ گەیشتە زیندانی قەسر. برسی بوو. چووە ئاشپەزخانەی زیندان. خواردن نەمابوو. بەلام بیستی کە "ئەوڕۆژە شویتپلاویان هەبووە." دەڵێ، "ئەمن نان و پەنیرم خواردو." دەستم کرد بە ئامادەکردنی زەمینەی دادگا.[1]

هەرچەند لە بیرەوەرییەکانیدا کە بە ڕاستی بێسەرەوبەرەن، چێژی نانخواردن هەمیشە جێیەکی زەقی پێدراوە، بەلام ناکرێ و نابێ دوورایی سیمبولیک و سیاسیی ئاماژەی خەڵخاڵی بە نان و پەنیر، ئەویش لە دوو دێڕی یەکەمی گێڕانەوەی بۆ دادگای دووەمی هووەیدادا، لەبەر چاو نەگرین.

دەزانین کە لە زمانی فارسیدا، "نانوپەنیر" هەم پەسنێکی سادەیەو هەم سیمبولێکی مانادار. بە جۆرێکی دیکە بڵێین، هەروەک بۆنموونە لاقەفڕووج بە نموونەی خواردنی دەوڵەمەندان دادەنرێ، نانوپەنیریش بە نیشانەی ئیفتادەیی و بێفیزی و سادەیی ژیان دەژمێردرێ. بەم جۆرە دەبینین کە گێڕانەوەی خەڵخاڵی بۆ دادگای دووەمی هووەیدا بە جۆرە نواندن و ئەدایەکی سیاسی دەست پێدەکا. هەروا بزانە دەیەوێ بڵێ کە

---

* Cocytus: لە دۆزەخ ی دانتەدا، نۆیەمین ئەڵقەی دۆزەخ ناوی گۆلی کاکیتووسە.

ئەو وەکوو کەسێک کە لەنێو خەڵک پێگەیشتوە، باری داوەری لەسەر یەکێک لە نۆکەرانی کاربەدەستانی لێکەوتووی گەندەڵی پێشووی خستۆتە سەرشان.

بەڕێکەوت خەڵخاڵی بۆ ئیسباتی گەندەڵیی ئەخلاقیی هووەیدا کەلکی لە داستانێکی زۆر ڕوون وەرگرتوە. هەر بەو زمانە کە سروشتی جیاکەرەوەی هەموو نووسینەکانیەتی، دەڵێ هووەیدا لە زیندان "زۆر دەخەوت، بەڵام بە ڕووتوقووتی کە ئەوکارەی چەند جار بووە مایەی ناڕەزایەتیی پاسدارەکان."[٤] لە ئێران عادەتەن پیاوان ڕووتیی لەش، تەنانەت ئەگەر لەشی خۆشیان بێ، بە ئاسانی تەحەممول ناکەن ئەوانەی بە ڕووتی دەخەون زۆر دەگمەنن. ڕیشەی ئەو ڕاستییە دەبێ لە حوکمی نەریتو مەزهەبو چەمکی وەک حەیاو شەرمدا بدۆزینەوە. بەرامبەر بەوە لە ڕۆژئاوا پێوانەی سەرەکیی بۆ ئەوەی هەرکەس چۆن دەخەوێ ئاسوودەیی خۆیەتیو بڕایەوە. شۆرشی ئیسلامی هەرنەبێ بۆ زۆر لە هێزە مەزهەبییەکان، جۆرێک شەڕی فەرهەنگی بوو. لەلایەک ئەخلاقێکی تازە هەبوو کە ڕێژیمی پەهلەوییان بە نوێنگەی وی دەزانی. دەیانگوت ڕیشەی لە سیمبولو بایەخە ڕۆژئاواییەکاندایەو دەگەڵ بایەخە نەریتییەکانی ئیسلام لە ناتەباییدایە. لە لایەکی دیکە لایەنگرانی نەریتی مەزهەبی بوون. ئەگەر مێژووی شۆرش لەو ڕوانگەیەوە، و وەک ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو دوو هێزە فەرهەنگییە سەیر بکەین، ئەودەم پێم وایە دەگەینە ئەو ئاکامە کە سکاڵای خەڵخاڵی لە هووەیدا تەنیا باری تاکەکەسیو تایبەتیی نەبوو، بەڵکوو بەشێک بوو لە کۆمەڵە مەسەلەیەک کە هووەیدایان دەگەڵ سەرکەوتووانی شۆرش لێک جیا دەکردەوە.

لەو ڕۆژانەدا زیندانی قەسر ببووە "میوانخانەی مردن". هەمیشە کۆمەڵێک ڕۆژنامەنووس لە دەوروبەری دەرگاکانی زیندان چاوەڕوان بوون تا دادگای شۆرش ژمارەیەکی تازە لە سەرانی ڕێژیم بداتە دەستی تاقمی ئیعدامو ئەوانیش چەندی بکرێ زووتر، خەبەرەکە بگەیەننە گوێی خەڵکی ئێرانو جیهان. بەڵام ڕۆژی هەژدەی خاکەلێوە، دەوری سەعات دووی دوانیوەڕۆ، لەنەکاو دەرکەکانی زیندانیان

لە ژووریّڕا داخست. ئیدی هیچکەس، و بۆ وێنە ئەو ڕۆژنامەنووسانەی بە هەرهۆیەک لە حەوشەی زیندانـدا بـوون، مـافی چوونـەدەرەوەیان نـەبوو. سـیمەکانی تەلـەفۆنیش پچـڕان. هـەر بـۆ تـیّبینـی، خـەلّخالّی دەزگاکانی تەلەفۆنی لەنێو سەهۆڵدانێکدا شاردەوە.[٣]

ئەو جموجۆڵە سەرسوڕهێنانە نابیّ بە تیّبینیی ئەمنیەتی دابنرێن. کەس نیگەرانی هێرشی کۆماندۆیی نەبوو. ئەو دەرگاداخستن‌و تەلەفۆن-پچڕینـە هـەمووی بەرهـەمی ڕاستەوخۆی ململانەیـەکی تونـد بـوو کـە لـە نێوان قۆڵـە جۆراوجۆرەکـانی دەسـەلاّتدا هـەڵگیرسـابوو. خـەلّخالّی بۆخۆی بیّپەروا هۆی ئەوکارە سەیرو سەمەرانەی دەگێڕێتەوە. دەڵیّ نەیدەویست دەوڵەتی بازرگان بزانیّ کە ئەو کاری دادگای هووەیدای دەست پیّکردۆتەوە. بازرگـان هـەر لـە سـەرەتاوە دەگـەڵ خـەلّخالّی‌و تێگەیشتنی لە دادپەروەریی ئیسلامی موخالیف بوو. سیّ حەوتوو پێش دەسـتپێکردنـی دادگـای دووەمـی هووەیـدا، ڕۆژێکیـان بەڕێکـەوت بازرگـان‌و خـەلّخالّی هـەردووکیان لـە ژووری چـاوەڕوانیی مـالّی ئایەتوڵلاخومەینی چاوەڕیّی دیداری ڕێبەری شۆرش بوون. لەو بەینەدا وتوویّژێک لـە نێوانیانـدا هەلاّیسا. تەوەری باسـەکەیان چۆنیـەتیی کـاری دادگاکانی شۆرش بوو. زۆری نەخایاند کە بوو بە شەڕە قسـەو چەند لەحزە دواتر گەیشتە دەروازەی لێکڕاکێشان.[٤]

دیـارە تەنانـەت پـێش ئـەو دەمەقاڵێیـەش، بازرگـان‌و هێنـدیّ لـە هاوکارەکانی چاوەڕیّی خڕکردنەوەی دەم‌ودەزگای دادگاکانی شـۆرش بوون. دەیانگوت کاری ئەو دادگایانە ئابڕووی شۆرشی لە سەرانسـەری دنیادا بردوە. دەیانەویست هووەیدای حەتمەن لە دادگایەکی ئاشکرادا موحاکەمـە بکـەن. هێنـدیّ کـەس تەنانـەت دەڵـێن کـاری وەڕێخسـتنی دادگایەکی لەو چەشنە دەستیشی پیّکردبوو. قەرار بوو پارێزەرێکی فەڕانسەیی کاری بەرگری لە هووەیدا وەئەستۆ بگری. هێندێک دەڵـێن ئەو پارێزەرە مافناسێک بوو بە ناوی لۆبلان* و هێندێکی دیکە دەڵێن

---

* Le Blanc.

ئەدگار فوور* کە بۆخۆی وەختێک سەرۆکوەزیری فەڕانسە بوو، بەرگری لە هوەیدای وەئەستۆ گرتبوو. دەڵێن پارێزەرەکان جانتای سەفەریشیان تێکنابوو و لە فڕۆکەخانە چاوەڕوانی مۆڵەتی فڕین بوون. فەرەیدوونی هوەیدا کە پاش ڕووخانی ڕێژیمی پەهلەوی لە ئورووپا مابۆوە، چالاکانە هەوڵی دەدا بیروڕای گشتیی ڕۆژئاوا بە قازانجی دادگایەکی دادپەروەرانە بۆ برایەکەی یەک بخا. هێندێ سەرکەوتنی بەرچاویشی لەو بوارەدا بەدەست هێنان. لە جێرزی کۆزینسکی لە ئەمریکاوە بگرە تا ژمارەیەکی بەربڵاو لە ڕووناکبیرانی فەڕانسەو هەموو سەرۆکوەزیرانی پێشووی زیندووی ئەو وڵاتە نامەی سەرئاوەڵایان بۆ کاربەدەستانی ئێران ناردو داوای نەجاتی گیانی هوەیدایان کرد.[٥]

هوەیدا لە زیندان ئاگای لە چەندوچۆنی ئەو هەوڵە هەبوو. بۆخۆشی بۆ نەجاتی گیانی خۆی دەهەوڵدا بوو. نیوەڕاستی خاکەلێوە هەرچۆنێک بوو توانی نامەیەکی دیکە بە دزی لە زیندانەوە بنێرێتە دەرێ. نامەکە بەخەتی خۆی بووو دەبێ بە بەڵگەیەکی گرنگیش دابنرێ. بایەخەکەی لە چەند خاڵدا دەکرێ ببینین: یەکەم ئەوە کە نامەکە لە هەلومەرجێکی یەکجار پڕمەترسیدا نووسرابوو. ناردنیشی لە زیندانەوە کارێکی ئاسانو بێخەتەر نەبوو. جگەلەوە، ئەم نامەیە دوادەستخەتی هوەیدایەو هەر لەو کاتەدا بەڵگەیەکی نووسراوە کە لەودا باسی چەندوچۆنی گیرانی لە زەمانی شایدا کردوە، و خەتابارانو هاندەرانی سەرەکیی ئەوکارەی، هەرنەبێ لە ڕوانگەی خۆیەوە، ناساندوە. ئەم نامەیە هەر لەو کاتەدا دەڵێی ڕوو بە وەچەکانی داهاتوو نووسراوە. لەودا هوەیدا بە ئاشکرا ویستوویەتی نەخشێک لە دیاریکردنی جێگەوپێگەی مێژوویی خۆیدا یاری بکا. ویستوویەتی لە هێندێ بواری گرنگدا، بۆچوونی خۆی لەبارەی ڕووداوە گرنگەکانی ژیانی خۆیەوە تۆمار بکا. سەرەنجام ئەوە کە لە دەقو ڕاوێژی نامەکەڕا دەتوانین پەی بە ورەی وی لە زیندان‌دا بەرین. دەتوانین چاوەڕوانییەکانی لە دواڕۆژ

* Edgar Faure.

بناسین‌و ئەو پرۆژەیە کە بۆ بەرگری لەخۆی دای‌ڕشتبوو هەڵ-سەنگێنین. نێوەرۆکی نامەکە بە ئاشکرا نیشان دەدا کە هووەیدا لە زیندان دەستی لە هەوڵدان هەڵنەگرتبوو، بەتوندی بۆ ڕزگارکردنی گیانی تێ‌دەکۆشا. پێشتر دیتمان کە جارێکی دیکەش نامەیەکی لە زیندانەوە ناردبووە دەر. نامەی یەکەمی هەروەک لە فەسڵی پازدەیەمدا دیتمان، ڕاوێژێکی نائومێدانەی هەبوو. بەڵام لە نامەی دووەمیدا تروووسکەیەکی هیوا بەدی دەکەین. بە پێچەوانەی نامەی پێشووی کە بە فەڕانسەیی بوو، ئەمجارە یادداشتەکەی بە ئینگلیسی نووسیبوو. هێندێ-جار ڕستەکانی هەڵەو شێواو بوون. ئەم هەڵخلیسکانانە دەبێ بە حیسابی ئەو ڕاستیە بگرین کە نامەکە لە هەلومەرجێکی زۆر خەتەرناکو بە پەلەدا، نووسراوە. لە وەرگێڕانی دەقەکە بۆسەر فارسیدا، هەوڵم نەدا ڕستەکان ڕاست بکەمەوەو تێ‌کۆشام دەقی هەر ڕستەیەک وەک خۆی بکەمە فارسی. دەقی نامەکە ئەمەیە:

*١-پاراگرافێکم (بەڕەنگی سوور) لە یادداشتەکانم زیاد کردو لەودا داوام کرد چەندی زوویە ئەو دەقانەی پێوەندی‌یان بە محاربە و بوختانەوە هەیە بگەیەننە دەستی من. دەق‌و لێکدانەوەی ئایەتەکانم بۆ شیکردنەوە لە دادگادا پێویستن. هەرلەو کاتەدا سوپاس دەکەم ئەگەر لیستی ئەو کتێبە مەزهەبی‌یانەم بۆ بنێرن کە بۆ بەرگری‌کردن بەکەلکم دێن. لێرە دەتوانم تکا لەمانە بکەم بۆم بکرن.*

*٢- لە هەوڵدام چەندی بکرێ زووتر دادئەستێنی گشتی ببینم‌و لە بارەی داهاتوومەوە قسەی دەگەڵ بکەم‌و دەقی سزاخوازییەکەی لێ-وەربگرم.*

*٣- پێم‌وایە دەبێ ئێوە لە فکری پەیداکردنی تیمێک لەو پارێزەرانەدا بن کە لەو بوارانەدا شارەزان. ئانجل* ❁ *لەوبارەیەوە قسەی دەگەڵ کەسێک کردوە، باشترە پێوەندی بەوەوە بگری.*

---

❁ لەدەقی ئینگلیسییەکەدا Angel هاتوە کە بە مانای فریشتەیەو لە نامەی هووەیدادا بێگومان ئامازە بە دوکتۆر فریشتەی ئینشایە

٤- لەودۆستانەمان کە لەبازاڕو کۆڕوکۆمەڵە مەزهەبییەکان ئاشنایان هەن بپرسە داخوا (جگەلە پارێزەران) دەتوانین پیاوێکی شارەزای مەسەلە مەزهەبییەکان بدۆزینەوە. داخوا پێی وایە فەلسەفی حازرە لەو بارەیەوە کارێک بکا؟(لە دادگاو ئەگەر نەکرا لە دەرەوەی دادگا؟ تەلەڤیزیۆن- چاپەمەنی).

٥- دەمەوێ لێرەدا چەند خاڵێک ڕوون بکەمەوە: بۆچی منیان لە ١٧ی خەزەڵوەردا گرت. ئەمە پیلانێک بوو بەدەست زاهیدییەوە (کە دیارە دەگەڵ شەریف ئیمامیو ئەمینی دەست پێکرا)و هەروەها چەند کەسێک لە سوپادا بۆ ئەوەی هەموو دیزەو گۆزەکانی ڕووداوەکانی ١٥ساڵی ڕابردوو لە سەری مندا بشکێنن. قەرار بوو شا ئیددیعا بکا کە خەبەری لەو شتانە نەبووەو چۆن خەڵک باوەڕیان بەو دەکرد. بەرگی نوێت لێ مەبارەک بێ. ئەمە بیرێکی گەوجانە بوو. خەڵک ئەوەیان وەک ڕێگەچارەسەر قبووڵ نەکرد. لەبیرت نەچێ دوای دەست-لەکارکێشانەوەی من چاپەمەنیو نوێنەرانی مەجلیس هێرش بۆ سەر منیان دەست پێکرد زاهیدیو داروەدەستەکەی دەیانەویست من بکەنە قوربانیو شا سەرەنجام تەسلیم بوو. (ئامووزگار کۆمەگی کرد.)

٦- بۆچیو کەنگێ لە وەزارەتی دەربار کشامەوە. شەوی شەممە ١٨ی خەرمانان واتە ڕۆژی دوای هەینیی ڕەش، ئەو ڕۆژەی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵک کوژران. ئەمە ڕێگەچارە نەبوو. ئەمەم بە شا گوتو دەستم لەکار کێشایەوە. چەندڕۆژ دواتر کاتێک لە شوێنی ژیانی خۆم چوومە دەر ئەو وەزیرێکی تازەی دەرباری هێنا. [زەق-کردنەوەکان هەموو هی دەقەکەن] ئەمن دژی ئەوکارە بووم کە کردیان.

٧- پێموایە دۆستانی ئێمە دەتوانن ئەم دووخاڵە زانیارییە بە ئاشکرا یان بە نهێنی لە بازاڕو لە نێو کۆڕوکۆمەڵە مەزهەبییەکاندا بێننە گۆڕێ.

٨- خەڵکێکی زۆر گیراون-وەزیران، سوپاییان، کارمەندان- زۆری پێدەچێ تا نۆرەی دادگای هەموویان دیاری دەکرێ. لە ڕاستیدا دەبێ

*هەموو ڕێژیمی پێشوو پاکسازی بکەن‌و ئەمە دوو ملیۆن کەس دەگرێتەوە.*

*٩- باوەڕم وایە دەبێ بزانین دادگا کەنگێ دەست پێ‌دەکاو لە بارەی پارێزەرەکانەوە دەبێ چبکەین. لەو بارەیەوە دەگەڵ ئانجل پێوەندی بگرە.*

*١٠- ئاکامی داخوازی کەسایەتییە نێونەتەوەییەکان چبوو؟ پێم وایە لە ڕێگای تەقیەددین سوڵح، وەزیری دەرەوەی لوبنانەوە دەتوانین کەلک لە شیعەکانی لوبنان‌و موسوڵمانانی دیکە وەربگرین کە هەیئەتێک بنێرنە ئێرە. وابزانم ئانجل لەو بارەیەوە ئاگادارەو دەبێ پێوەندیی دەگەڵ بگیرێ. نازانم کەنگێ دێتەوە.[زەق‌کردنەوە لە دەقەکەدایە.]*

*١١- لە یادداشتێکدا پوختەی خەبەرەکانم بدەیە. لێرە لە هەموو شتێک بێ‌خەبەرم.*

*١٢- لەبارەی "کاناڵ"ەوە تکایە بە ئانجل بڵێ هەرکارێکی پێویستە بیکا.*

ئەو "کاناڵ"ەی لە بەندی ١٢ی نامەکەدا ئاماژەی پێ‌کراوە یەکێک لە بەندییەوانەکانی هووەیدا بوو. هەر بۆخۆی پێوەندیی بە بنەماڵەی هووەیداوە گرت. گوتی لە بەرامبەر پاداشێکی گونجاودا، دەبێتە ئەڵقەی پێوەندیی هووەیداو بنەماڵەکەی. دیارە بنەماڵەی هووەیدا لەو کاتەدا، لەو جۆرە پێشنیارانە بەگومان بوون. چەندین کەسی دیکەش پێشتر دەرگای ئەو سەودایەیان کردبۆوە. دەیانگوت لە پارێزەرانی هووەیدان، کەچی بەکردەوە بە قۆڵبڕ دەردەچوون. بەڵام "کاناڵ" بەڵێنی خۆی بردە سەر. لە بەرامبەر هەر پەیامێکدا کە دەی‌گەیاند، کرێیەکی وەردەگرت. دیارە ئەوەندە بەتەماعیش نەبوو. بەرزترین پاداش کە داوای کرد تەلەڤیزیۆنێکی ڕەنگاوڕەنگ بوو، و هەربۆیەش ناوە نهێنییەکەی بوو بە "کاناڵ".[٦]

هەوڵەکانی هووەیدا لە زینداندا لە ناردنی ئەو پەیامە نهێنییانەدا بەرتەسک نەدەبوونەوە. لە نێوەڕاستی خاکەلێوەدا، یادداشتێکی بۆ ئەسەدوڵڵای موبەششیری نووسی کە ئەودەم هێشتا وەزیری دادی

دەوڵـەتی کـاتی بـوو* لـە نامەکـەدا داوای دیـدارێکی تایبـەتیی لـە موبەششیری کردبوو. هەرلەو کاتەدا نووسیبووی ئەگەر لە دادگایەکی ئاشـکرادا موحاکەمـەی بکـەن، ئـەویش هــەرچی لـەبارەی مێـژووی سەردەمی پەهلەوییەوە دەیزانێ باسی دەکا. هووەیدا بە ڕواڵەت تێ-گەیشتبوو کە تەنیا ئیمکانی زیندوومانی لەوەدایە کە چارەنووسی خۆی بداتە دەستی دەوڵەتی کاتی. دەیزانی کە تەنیا دەوڵەتی کاتی لەوانەیە بۆ ڕاگەیشـتنێکی جیددی بـە دۆسیەی هووەیدا، دادگایـەکی دادپـەروەرو ئاشـکرا پێـکبێنـێ. هەربۆیـە نـەکهـەر لـە یەکـەمین ڕۆژی شۆرشـدا پێوەندیی دەگەڵ یەکێک لە وەزیرانی دەوڵەت گرت، بەڵکوو دواتریش، وەک لــەو نامەیـــەو نیشـــانەکانی دیکـــە دەردەکـــەوێ، هـــەوڵی دەدا چارەنووسی خۆی بداتـە دەسـت ئـەو دەوڵەتـە. بەڵام ڕاستییەکە ئەوە بـوو کـە موبەششـیری، هەرچەنـد بـە ڕواڵـەت بـەرزترین کاربەدەستی دادوەریی وڵات بوو، بەکردەوە هیچ دەسەڵاتێکی نەبوو. تەنانـەت نـەی-دەتوانی بچێتە دیداری هووەیدا لە زیندانیش. هەڵسووڕێنەرانی زیندانی قەسـر، بـە ڕواڵـەت بـە پـەیڕەوی لـە فـەرمانی ڕووحانیگـەلێکی وەک خەڵخاڵی، پێشی ئەو چاوپێکەوتنەیان گرتبوو.[٧]

موبەششیری کە لە سەرنەکەوتنی هەوڵەکانی وەجان هاتبوو، پەنای بۆ بەنیسەدر برد. هـەردووکیان دەیانزانـی کـە لـەهـەموو مەسـەلە گرنگـەکانی وڵاتـدا، دوابڕیـار بـە ئایـەتوڵڵا خومـەینییـە. دەیـانزانـی کـە چارەنووســـی هووەیـــداو چەنـــدوچۆنی دادگاکەشـــی لـــە گرنگتـــرین مەســـەلەکانی ڕۆژن. هەربۆیـە بـە هـەلیکۆپتێر چوونـە قـومو چاویـان بە ڕێبەری شۆڕش کەوت. کیسـەیەکی پڕ لە بەڵگەو هـەروەها یادداشـتی هووەیدایان کە لەسەر کوتە کاغەزێکی زەرد نووسرابوو دەگەڵ خۆیـان برد. موبەششیری تەنانەت لەو کاتەشدا پێوەندیی بە هێندێک لە چالاکانی

---

* بە باوەڕی من ئـەوە کـە لـە بەنـدی دووەمـی نامەکەیدا ،ئامـاژە بـە دیـدار دەگـەڵ "دادنەستێنی گشتی" دەکا، مەبەستی هەر ئەم نامەیەو هـەوڵی چاوپێکـەوتن دەگـەڵ موبەششیرییە.

پێشووی کۆنفیدڕاسیۆنەوە گرتبوو و داوای لێکردبوون بەڵگەو سەنەد لەدژی هووەیدای بۆ بنێرن. بەنیسەدرو موبەششیری بە ئایەتوڵڵا خومەینی‌یان گوت کە، "ئەم کیسەیە پڕە لە بەڵگە کە وەزارەتی داد کۆی کردوونەوەو هەموویان ڕادەی بەربڵاوی گەندەڵیی ڕێژیمی پێشوو پشتڕاست دەکەنەوە"، گوتیان هووەیداش ئامادەیە، ئەگەر لە دادگایەکی ئاشکرادا دادگایی بکرێ، هەرچی دەیزانێ بیڵێ.[8] بەنیسەدر جەختی کردەوە کە دادگایەکی وا بە سەرکەوتنێکی گەورە بۆ شۆرشی ئیسلامی دەژمێردرێ. گوتی لەم ڕێگایەوە دەتوانین لە دادگای بیروڕای گشتیی ئێران و جیهاندا، ڕێژیمی پێشوو مەحکووم بکەین. بە ڕێنوێن و مەبەست "مرشد و مراد"ی خۆی لەو دەورانەیدا گوت بەمکارە، "مێژووش ئێمە بە بێگوناح دەناسێ."[9]

ئایەتوڵڵا خۆمەینی نەدەچووە ژێر بارو دەیگوت ئەم تاوانبارانە شیاوی دادگا نین. بەڵام دوای ماوەیەک، هەرنەبێ بەڕواڵەت، ڕازی بوو. دەستووری بە بەنیسەدرو موبەششیری دا کە بچنەوە تاران و کاری وەڕێخستنی دادگای ئاشکرای هووەیدا دەست پێبکەن. دیداری ئەو سێ-کەسە لای ڕۆژئاوا تەواو بوو. موبەششیری بڕیاری دا ڕۆژی دواتر بچێتە سەردانی هووەیداو لەو بڕیارە ئاگاداری بکا.[10]

بەڵام بە پێچەوانەی ئەم وادەو بەڵێنانە، بە پێچەوانەی بەڵێنی ئایەتوڵڵا خومەینی، ڕۆژی دوای دیداری دەگەڵ بەنیسەدرو موبەششیری، دەوروبەری سەعات سێی پاش نیوەڕۆ، هووەیدایان بردە دادگای خەڵخاڵی. بەنیسەدر بە پێداگرتنەوە دەیگوت: "هیچ کەس جگە لە خومەینی نەیدەتوانی لە بارەی دادگای هووەیداوە بڕیار بدا."[11] خەڵخاڵییش لە بیست ساڵی دواییدا زۆرجار گوتوویە هەرچیی کردوە، بە فەرمانی ئیمامەکەی بووە. هاوکات دەگەڵ بیستەمین ساڵوەگەڕی شۆرش، خەڵخاڵی لە وتووێژێک دەگەڵ هەواڵنووسی ڕۆژنامەی نیۆیۆرکتایمزدا دووبارە جەختی کردەوە کە، "هەرچی کردوومە، بە فەرمانی پیرۆزی ئیمام بووە. تەنیا ئەوشتەم دەکرد کە ئەو دەیەویست."[12]

لەو سەردەمەدا ڕێژیمی کۆماری ئیسلامی تووشی ململانەیەکی سەختی نێوخۆیی بوو. جگەلەوە، کاربەدەستانی ڕێژیم نیگەرانی کۆدیتای شاپەرستەکانیش بوون. ئاخوندە توندڕۆیەکان بە ڕێبەریی ئایەتوڵلا خومەینی گەیشتنە ئەو ئاکامە کە بەرپاکردنی دادگایەکی ئاشکرا بە زیانیان تەواو دەبێ. دەیانزانی کە دادگایەکی وا هەرنەبێ دووسێ حەوتوو دەکێشێ‌و بە پێ‌داگرتن لەسەر ڕێو شوێنە قانوونی‌یەکان‌و عورفی قانوونی، سەرەنجام دەستی هێزە نێوەندڕۆیەکان بەهێزتر دەکا. بەناچار سیاسەتی تۆڵەکردنەوەو قین‌پی‌ڕشتنیان وەپێش داوەریی هەڵسەنگاوو قانوونیی دادگایەکی ڕاستەقینە خست. دیارە بە باوەڕی بەنی‌سەدر، ئایەتوڵلا خومەینی بوو، کە موحاکەمەی هووەیدای بە خەڵخاڵی ئەسپارد. دەڵێ، هێندێک کەس دەترسان لە درێژەی دادگادا، تەون‌وبەستەکانیان دەگەڵ ئەمریکاییەکا بکەونە ڕوو. جگەلەوە، هێندێکیش دەترسان دۆسیەکانیان ئاشکرا ببن‌و بۆیە تێ‌دەکۆشان رایەکەی خومەینی پشت گوێ بخەن‌و نەیەڵن دادگایەکی ئاشکرا بۆ هووەیدا پێک بێ. لە یەکەم ڕۆژی شۆڕشدا، کاتێک دەفتەرەکانی ساواک کەوتنە دەستی ئێمە، لەنەکاو دیتمان دەوری چل دۆسیەی نهێنی ونن. ئەو جەنابانە نیگەران بوون کە هووەیدا لە دادگادا تەون‌وبەستەکانیان دەگەڵ ڕێژیمی شا لەقاو بدا. دەترسان باسی ئەو دەم‌شیرنی‌یانە بکا کە هێندێکیان لە دەوڵەتیان وەردەگرتن. کاتێک دواتر دووکەس لە کارمەندانی دەفتەری من ڕاپۆرتێکی نهێنیی سەد لاپەڕی‌یان دەربارەی تەون‌وبەستەکانیان دەگەڵ ئەمریکا ئامادە کرد، هەردووکیان دەسبەجێ بەتۆمەتگەلێکی پڕوپووچ گرتن‌و ئیعدامیان کردن.[١٣٠] بەنی‌سەدر دەیگوت لە ئەنجومەنی شۆڕشیشدا کە بەکردەوە ئیدارەی وڵاتی بە دەستەوە بوو، هەموو بێ هەڵاواردن هەرنەبێ بەڕواڵەت لایەنگری دادگایەکی ئاشکرا بۆ هووەیدا بوون.[١٤] بە جۆرێکی دیکە بڵێین، تەنیا کەس کە دەی‌وێرا موحاکەمەی هووەیدا، ئەویش لە دادگایەکی شۆڕشگێڕی کەم‌وزۆر نهێنیدا، بە خەڵخاڵی بسپێرێ ئایەتوڵلا خومەینی بووو بەس. مەبەستی ئایەتوڵلا خومەینی هەرچی بوو، لەیەک شتدا

ناکرێ گومانمان هەبێ: بە موحاکەمەی هووەیدا بە دەستی خەڵخاڵی پاکسازییەکی بەربڵاوی ئیدارە دەوڵەتییەکانیش دەست پێکراو پاش ماوەیەک، ئەندامی لەشی یەکیەکی کارمەندان، ئەفسەرانی سوپا، جوولەکەکان، بەهاییەکانو هەموو نەیارانی ڕێژیمی ئیسلامیی ئێرانی وەلەرزە خست. زۆری پێنەچوو کە ئیسلام پەنایی بوو بە تەنیا دەستەبەری مانو ئەمنیەتو گرنگیش نەبوو ئەو ئیمانهێنانە ڕیشەی لە باوەڕی ڕاستەقینەدایە یان تەنیا ڕواڵەتبازییەکەو بەس.



کاتێک هووەیدایان هێنایە ژووری دادگا، دەوری چلکەس لە ژوورەکە بوون، چاکەتێکی چەرمو بلووزێکی تەنکی یەخەخڕی دەبەردا بوو. یەخەی کراسە ڕەنگتاریکەکەی لە بلووزەکەی هاتبۆ دەر. شاڵوارێکی کمریتیی ڕەنگقاوەیی دەپێدا بوو. یەکدوو ڕۆژ پێش دەستپێکردنی دادگا، کەسێکی نەناسیاو زەنگی بۆ ماڵی دوکتۆر فریشتەی ئینشا لێداو دەستووری دا دەستێک لیباسی تازە بۆ هووەیدا بەرنە زیندان. وا دەهاتە بەرچاو دێهاتی بێ. هەرئەو کەسە پێشتریش چەندجار زەنگی لێدابوو. لە ئێرانیش هەروەک وڵاتانی دیکەی جیهان، زمان دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە. وشەکانو ڕاوێژی هەر کەسێک مۆرێکی چینایەتیی پێوەیەو ڕەگە کۆمەڵایەتییەکانو جوگرافیای زمانیی قسەکەرەکە نیشان دەدەن. دوکتۆر فریشتەی ئینشاش کەسایەتیی دێهاتییانەی مەئمووری زیندانی هەر لەو ڕێگایەوە بۆ دەرکەوتبوو. دەزانین کە بۆ زۆربەی زۆری پیاوانو ژنانی دێهاتی ئێران، ناوی ژن بەشێک لە ناموسی پیاوو پیرۆزو تایبەتییە، و دەبێ لە ئازاری چاوو گوێو زمانی نامەحرەم بەدوور ڕابگیرێ. هەربۆیە، پیاوانی لادێ عادەتەن هاوسەرەکانیان هەرگیز بە ناوی ڕاستەقینەی خۆیان بانگ ناکەن. دەیانەوێ نەکهەر ڕوخسار بەڵکوو ناوی ژنانیش لەپشت پەردەوە ڕابگرنو بپارێزن. یەکێک لە باوترین پەردە لەفزییەکان، ناوی

کوڕە گەورەی بنەماڵەیە مەئموورى زیندانیش بە پەیڕەوی لەو نەریتە لە پێوەندییە تەلەفۆنییەکانی خۆیدا، بە دوکتۆر فریشتەی ئینشای دەگوت "دایکی عەلی چونکە کوڕەکەی ناوی عەلی بوو. ئەمجارەیان گوتبووی، "دایکی عەلی، دەستێک لیباسی تازەو دەرمانەکانی بۆ بێننە زیندان."[150]

کە هوەیدا وەژوور کەوت، فەزایەکە ئاڵۆز دیار بوو. ئەویان لەسەر کورسییەکی سادە لە نێوەراستی ژوورەکە دانیشاند. ڕووبەڕووی وی سەرۆکی دادگاو ڕاوێژکارەکانی‌و دادئەستێن لەپشت یەک مێز دانیشتبوون. دوو مێزی چووکەڵە لە تەنیشت کورسییەکەی هوەیدا دانرابوون‌و بە پێچەوانەی دادگای یەکەم، ئەمجار ئەگەر پێویست بایە دەی‌توانی بۆ نووسین کەلکیان لێ‌وەرگرێ. دەفتەرێکی ئەستووری یادداشتی بەرگ‌چەرمی پێ‌بوو لەسەر یەکێک لە مێزەکانی دانا. هوەیدا لە یەکێک لە هەوەڵین ڕۆژەکانی نێو زیندانی کۆماری ئیسلامیدا داوای لە دوکتۆر فریشتەی ئینشا کردبوو دەفتەرێکی یادداشتی بۆ ئامادە بکا. گوتبووی: "دەمەوێ ئەوەی لێرە بەسەرم دێ لەو دەفتەرەدا بنووسم."[160] دواشوێنەواری ئەو دەفتەری یادداشتە، وێنەگەلێکن کە ڕۆژنامەکان لەو سەردەمەدا لە باسی دادگای هوەیدادا چاپیان کردن کە لەواندا دەکرێ دەفتەرەکەش لەسەر مێزە چووکەکە ببینی. ڕوون نیە دوای ئەوڕۆژە ئەو دەفتەرە چیی بەسەر هاتوەو داخوا ئەمڕۆ دەکرێ سەروسۆراغی پەیدابێ یان نا.

ڕوخساری دانیشتووان لەبەر چاوی هوەیدا گرژترو نادۆستانەتر لە دادگای یەکەم دیار بوو. ژمارەی ڕۆژنامە نووسەکانیش بێگومان کەمتر بوو. هادیی غەففاری کە توندڕەوی‌و جنێوفرۆشی‌و وتە بە ڕواڵەت شۆڕشگێڕانەکانی، و ئۆگرییەکەی بە توندوتیژی بۆ هەمووان ڕوون بوو، وەک ڕاوچییەکی بێ‌سیکەدانە لەپەنای هوەیدا دانیشتبوو. ئیدی هوەیدا ئەو هوەیدایە نەبوو کە لە ڕۆژەکانی سەرەتای شۆڕشدا بێ‌پەروا بەرگریی لە دەسکەوتەکانی دەوڵەتی خۆی دەکرد. ئێستا وا دیار بوو ئارامو سەنگین تەسلیمی چارەنووسی حەتمیی خۆی

بووە. بە ڕاوێژێكی پڕ لە نیگەرانییەوە لە خەڵخاڵیی پرسی: "ئەمانە هەموو پاسداری شۆڕشن؟" خەڵخاڵی وەڵامی پرسیای هووەیدای نەدایەوە. لەجیاتی ئەوە، بەڕاوێژێكی توندو تێكەڵبەسەركۆنە، پرسی، "چما فەرقی چیە؟ خۆ برایانی پاسدار وەک ساواكییەكانی ئێوە نین."[17]

دەوری سەعات سێی دوانیوەڕۆ دادگا بە ڕەسمی دەستی بەكار كرد. چەند ئایەتێک قورئان خوێندراو پاشان دەقی سزاخوازییەكەیان كە بێكەموزۆری هەر سزاخوازییەكەی دادگای یەكەم بوو، خوێندەوە. هێشتا خوێندنەوەی ئەو حەقدە بەندە تەواو نەببوو كە دەنگی باڵەكانی هەلیكۆپتێرێک كاری دادگای ڕاگرت. پەرێشانیو دڵەخورپە لە حەوادا شەپۆلیان دەدا. هەلیكۆپتێر هاتە خوارو لەجێیەک، ڕاست بەرامبەر پەنجەرەی ئەو ژوورەی دادگایەكەی تێدا بەڕێوە دەچوو، دەمەساتێک ڕاوەستا. فڕینەوەكەی تەواو چاوەڕواننەكراو بوو. تەنانەت دیار نەبوو ئیزنی فڕینیشی لە كێ وەرگرتوە. ئامانجیشی ڕوون نەبوو. ئایا نیازی نیزیكایەتیی هەبوو یان بە دوای ئامانجێكی دوژمنانەوە بوو؟ هیچكەس وەڵامی هیچكام لەم پرسیارانەی نەدەزانی. ناچار تێكەڵاوێک لە ترسو ناڕوونی، و تەنانەت ترسو ئومێدیش، دادگای تووشی پەككەوتنێكی كاتی كرد.[18]

ڕەنگە خەڵخاڵیو هووەیدا هیچیان نەیانزانیبێ كە شەوی پێشتر هێنری پرێشت*، بەرپرسی بەشی ئێران لەوەزارەتی كاروباری دەرەوەی ئەمریكا، ئاگادار بوو كە دادگای هووەیدا بەزوویی دەست پێدەكرێتەوەو گیانی هووەیدا لە مەترسیدایە. ئەویش دەسبەجێ تەلگرافی بۆ چارلز ناس**، كارداری ئەو كاتی ئەمریكا لە ئێران لێداو داوای لێكرد هەرچی بكرێ زووتر كاربەدەستە ئێرانییەكان ببینێو نیگەرانیی دەوڵەتی ئەمریكا لە وەزعی هووەیدا بە ئاگاداریی دەوڵەتی ئێران بگەیەنێ.[19]

* Henry Precht.

** Charles Nass.

پاش نیوەڕۆی ڕۆژی دواتر، ناس چاوی بە ئیبراهیمی یەزدی کەوت کە ئەوکات هێشتا لە ڕووما چالاکەکانی دەوڵەتی کاتی بوو. هەرکە ناس ناوی هووەیدای بە زماندا هات، یەزدییش بە ڕاوێژێک کە، "نە دۆستانە بوو، نە ڕاستوێژانە"، لە بارەی تاوانەکانی ساواکەوە دەستی کرد بە وتاردان. هێندێ دۆسیەی لە چەکمەجە (کشو)ی مێزەکەی دەرکێشان. گوتی بەڵگەی تاوانەکانی ساواکن. گوتی هووەیدا دەستی لە تەواوی ئەو تاوانانەدا هەبوو.[20] سەرەنجامیش وتەکانی بەم قسەیە کۆتایی پێهێنا کە سەرەڕای هەموو ئەو ڕاستییانە گیانی هووەیدا بەهیچ جۆر لەمەترسیدا نیە. دواتر ڕوون بۆوە کە هەرئەو کاتەی یەزدی ئەم بەڵێنانەی دەدا، هووەیدا لە دادگای خەڵخاڵیدا بوو و زۆریش وێ دەچوو تەنانەت چارەنووسیشی دیاری کرابێ. ناس دەیگوت: "هەرگیز تێ-نەگەیشتم کە بەڕاستی ئەوکاتەی یەزدی قسەی دەگەڵ من دەکرد نەی-دەزانی هووەیدا چیی بەسەر هاتوە یان درۆی دەگەڵ دەکردم."[21]

بەهەرحاڵ چاوەڕوانیی دادگا زۆری نەکێشا. هەلیکۆپتێرێک کە بە شێوەیەکی گوماناوی هاتبووە فەزای زیندانی قەسر لەنەکاو هەروا بە چەشنێکی گوماناوی، فەزای زیندانی بەجێ هێشت و قەتیش نەهاتەوە. ڕەنگە هاتنی ئەو هەلیکۆپتێرە دواساتەکانی هومێدی هووەیدا بووبێ. خوێندنەوەی سزاخوازییەکە دەست پێکرایەوە. پێش هەڵفڕینی هەلیکۆپتێرەکە، فەزای کۆبوونەوەکە ئاڵۆز بوو. کاتێک دادگا کاری خۆی دەست پێکردەوە، ترس و دڵەڕاوکێیش کەوتە سەر ئەو ئاڵۆزییە. دوای تەواوبوونی خوێندنەوەی سزاخوازییەکە، دادئەستێن دەستی بە قسە کرد. قسەو بەڵگەو شاهیدێکی تازەی نەبوو. هەرئیدیعای نێو سزاخوازییەکەی دووپاتە دەکردنەوە. تەنیا جیاوازیی وی دەگەڵ خەڵخاڵی ئەوە بوو کە لە ڕاوێژی قسەکانیدا نەزم و ویژدانێکی هەرچەند کەمڕەنگیش بێ بەرچاو دەکەوت.[22] دیارە پاش قسەکانی دادئەستێن، دووبارە نۆرەی خەڵخاڵی هاتەوە. جارێکی دیکە بەتوندی هێرشی کردە سەر تۆمەتلێدراو. تەنانەت هەوڵی نەدەدا بەڕواڵەتیش خۆی بێلایەن نیشان بدا. لە بیرەوەرییەکانیدا بە خۆڕانانەوە دەڵێ چل و پێنج دەقیقە بێ-

ڕاوەستان، هێرشم بۆ کرد. دەڵێ تاوانەکانی ڕێژیمی پەهلەویم گێڕانەوەو هاودەستیی هووەیدام لە هەموویاندا نیشان دا. تەنانەت حاشا لەوەش ناکا کە چارەنووسی هووەیدا پێش دەستپێکردنی دادگا بڕابۆوە. لە بیرەوەرییەکانیدا پێی لێدەنێ کە، "ئێمەش تەواو هۆشمان لە خۆمان بووو نەماندەویست کڵاومان لەسەر نێن. بۆیە زۆر بەجیددی دەمەویست تا کۆتایی دادگاو تەنانەت ئیعدامی هووەیداش لە دەرەوەی زیندان کەس لە چارەنووسی ئاگادار نەبێ."[٤٣]

کاتێک هووەیدا بەوردی گوێی لە سزاخوازیو هێرشە توندەکانی سەرۆکی دادگاو دادئەستێن بوو، وەختێک فەزای قورسو داگیرساوی دادگای هەڵسەنگاند، و کاتێک بیری لە کاتو هەلومەرجی نائاسایی کاری دادگا کردەوە، وا دیار بوو یەکسەر ناهومێدیو تەسلیم بەسەریدا زاڵ بوون. جارجاریش لەنەکاو لە بارودۆخەکە تووڕە دەبوو. لە شێوەی کاری دادگا ناڕازی بوو. گوتی کەسێک لەلایەن دادگاوە قەولی بەو داوە کە سزاخوازییەکی تازە ڕێک دەخرێو پێش دەستپێکردنی کاری دادگا، دەقەکەی دەدرێتێ. پرسی، "ئەمن لێرەدا نازانم دەربارەی کام سزاخوازی قسە دەکەین." کاتێک وەڵامی لابەلاو توندی خەڵخاڵیی وەرگرتەوە، دیسان بێپەروا گوتی، "دیسان عەرزتان دەکەم لێرە قوربانی پێویستە. ئەمن تەسلیمم."[٤٤] هەرلەو کاتەدا چەند ساتێک دواتر، زەردەخەنەیەکی بەڕوخساری خەڵخاڵییەوە دیتو گوتی، "بزەی ئێوە جەنابی سەرۆک لە باری دەروونییەوە هێزم پێدەبەخشێ."[٤٥]

ئەمجارەش هەروەک دادگای یەکەم خەڵخاڵی لە ڕاستیدا هەموو ڕێوشوێنە ناسراوە قانوونییەکانی پشت گوێ خست. وا دیار بوو لە شێوەو نێوەرۆکی کاردا پابەندی هیچ ئەسڵێک جگە لە تەواوکردنی خێراتری کاری دادگاو جێبەجێکردنی حوکمەکە نیە. هەرلەو کاتەدا، ئەوشتانەی ئەوو دادئەستێن لە هێرش بۆسەر هووەیدادا دەیانگوتن لەجێدا هەر دووپاتەکردنەوەی ئەو بۆچوونانە بوون کە لە دادگای یەکەمدا هاتبوونە گۆڕێ. هووەیداش ستراتیژیی بەرگریی خۆی نەگۆڕیبوو. ئەوەندە نەبێ کە بەشێک لە بەرپرسایەتیی کارەکانی ڕێژیمی

پێشووی قبووڵ دەکرد. جەختی دەکردەوە کە گوناحکاری سەرەکی سیستمەکە بوو. داوای لێبووردنی لەو کەسانە کرد کە بە دەستی ساواک ئەشکەنجە کرابوون، بەڵام هەرلەو کاتەدا دووپاتەی کردەوە کە ئیدارەی ساواک تەنیا بە دەست شاوە بوو. گوتی لە شەڕی دووەمی جیهانییەوە، هەموو سەرۆکوەزیرەکان، بێجگە لە موسەددیق، لە چوارچێوەی سیستمێکدا کاریان کردوە کە لەودا بەشی زۆربەی دەسەڵات بە دەست شاوە بووە. گوتی ئەمن ئەوسیستمەم دانەهێناوە، بەڵکوو درێژەم پێداوە.[26] دووبارە وەبیری هێنایەوە کە ساواک، سوپا، سیاسەتی دەرەوەو کەموزۆر هەموو بوارە گرنگەکانی بڕیاردان لە پاوانی شادا بوون. حاشای لەوە دەکرد کە "نۆکەری ئەمریکاییەکان" بووبێ. گوتی، "ئەگەر ئەمریکاییەکان ئاغای من بوایەن، جەنابی سەرۆک، ئەمن لێرە چیم دەکرد؟ ئێستا لێرە لە خزمەتتاندا نەدەبووم." پرسی، "جەنابی سەرۆک، لەنێو هەموو ئەوانەدا کە پێش منو پاش من بوونە سەرۆکوەزیر کامیان لێرە، لە تارانن؟" [27]

ستراتیژیی بەرگریی هووەیدا لە زۆربارەوە لاوازیی هەبوو. گومانێک نیە کە ئەو دەیزانی لە ڕوانگەی قانوونی بنەڕەتیی ئێرانەوە، بە هیچ جۆر ناتوانی سیستم بە تەواوی بە بەرپرس بزانیو تاک، ئەویش سەرۆکوەزیری وڵات بە بێخەتا دابنێی. دەزانین کە هووەیدا لە سەرەتای سەردەمی سەرۆکوەزیریی خۆیدا، ڕۆژێکیان دەگەڵ ژمارەیەک لە وەزیرانو ڕاوێژکارەکانی چاوی بە شا کەوتبوو. بەرنامەی کاری کۆبوونەوەی ئەوڕۆژە "شۆرشی ئیداری" بوو. قەرار بوو ئەو مەسەلەیە وەک ئەسڵێکی تازە، بخرێتە سەر ئەسڵەکانی "شۆرشی شاو خەڵک" کە بە خێرایی لە زیادبووندا بوون. دوای کۆتایی کۆبوونەوەکە کە لەودا لایەنەکانی ئەو شۆرشە بە کورتی کەوتنە بەرباسو وتووێژ، هووەیدا داوای لە نەراقی کرد کە دەگەڵی بچێتە شارو کۆشکی سەرۆکوەزیری. نەراقی لە کۆبوونەوەکەو لە حوزووری شادا گوتبووی دەبێ کارمەندانی دەوڵەت فێر بکرێن کە چۆن سەرپێچی لە فەرمانە ناقانوونییەکان بکەن. هووەیدا هەروەک هەمیشە لەپشت

فـەرمانی پەیکانەکـەی دانیشـتو نـەراقی لـە تەنیشـتی سـوار بـووو پاریزەرەکانی هووەیداش لەسەر کورسییەکانی پشتەوە سوار بوون. هووەیدا دەستی بە قسە کردو چونکە بابەتەکەی بە گرنگ دەزانی، وەک عادەتی خۆی بە فەرانسەی قسەی کرد. بە نەراقیی گوت: "ئەگەر ئەوقسەیەی ئەمڕۆ کردت دروست بێ، هەمووومان گوناحبارین. لە هەلومەرجی ئێستادا چارەیەکمان نیە جگە لەوەی فەرمانی سەرۆکەکانمان کە هێندێ جار نارەواشن جێبەجێ بکەین."[480] لە ڕاستیدا، هووەیدا زۆرجار بە دۆستانو هاوکارانی نیزیکی خۆی گوتبوو کە پێشکەوتنی ئێران لە گرەوی ملڕاکێشان بۆ ئەو فەرمانە جاروبار ناقانوونی‌یانەدایە. باوەڕی وابوو کە پێشکەوتن بێ ڕێبەرایەتیی شا دەرەتانی نیەو لە هەلومەرجی ئێستادا بەردەوامیی ئەو ڕێبەرایەتییەی لە ملکەچی بەرامبەر بە فەرمانەکانی شادا دەدی. دیارە زۆرجار دۆستانو خزمانی هووەیدا دژی ئەو بۆچوونەی دەوەستان. لەلایەک هێندێکان دەیانگوت لەجێدا ملکەچی بەرامبەر بە فەرمانی ملهوڕانە ڕێگای پێشکەوتن نیە. لەلایەکی دیکەش، هێندێ کەس وەبیریان دێنایەوە کە هووەیدا ئیدی هیچ خۆڕاگرییەک بەرامبەر بە فەرمانەکانی شا نیشان نادا. دەیانگوت ڕەفتاری وی لە سنووری بیروبەرژەوەندی سیاسی گوزەراوەو بۆتە ملکەچیی تەواو. ئێستا هووەیدا لە دادگادا، سزای سیاسەتی مودارایەکەی دەدایەوە. دەزانین کە ئەو ملکەچیو مودارایە تەواو بە پێچەوانەی ئەسڵەکانی قانوونی بنەڕەتیی ئێران بوو. بەڵام خەڵخاڵی ئەوەندە لە ئەسڵەکانی ئەو قانوونە بێئاگا بوو، ئەوەندە بەرامبەر بە وردەکارییەکانی باسە ئەخلاقییەکان بێموبالات بوو، ئەوەندە خووی بە دووپاتە کردنەوەی دروشمە بەتاڵو بێنێوەرۆکەکان گرتبوو کە دادگایەکەی هەرگیز نەیتوانی ببێتە مەرجەعێکی خاوەن-سەلاحیەت بۆ ڕاگەیشتن بە خەتاکاری یان بێگوناحیی هووەیدا. خەڵخاڵییش هەر وەک ئۆکران لە وتوویژە تەلەڤیزیۆنییەکەیدا، باوەڕی نەدەکرد کە سەرۆکوەزیری وڵات نەخشێکی لە ئیدارەی ساواکدا نەبووبێو نەیتوانیبێ سیاسەتەکانی وڵات دیاری بکا. بەڵام خەڵخاڵی،

دەگەڵ ئەوەی زۆربەی قسەکانی ناقانوونی بوون، هەرنەبێ لە خاڵێکی گرنگو بنەڕەتیدا هەقی هەبوو. دەیگوت سەرۆکوەزیر بەپێی قانوونی بنەڕەتیی ئێران بەرپرسی کاروباری دەوڵەتە. دەیگوت ئەگەر قانوونو ئەسڵی سەروەریی نیشتمانی پێشێل بکرێ، وەزیرانو سەرۆکوەزیران ناتوانن بەرپرسایەتی لە خۆیان دارنن. لە هوەیدای دەپرسی بۆچی وەختێک تێگەیشتی کارێکت لەدەست نایە، دەستت لە کار نەکێشایەوە.[29]

لە درێژەی باسەکانی دادگای دووەمدا، دوو خاڵی تازە هاتنە گۆڕێ. خەلخالی لە هوەیدای پرسی: "بە توندی دەنگۆیە کە ئەتۆ گوتووتە هێندێ بەڵگەت لە دژی شا هەن... ئایا پشتڕاستی دەکەیەوە یان نا." دەیەویست بزانێ داخوا هوەیدا حازرە بەڵگەکان بداتە دادگا، و کۆماری ئیسلامی یان نا. هوەیدا لەلایەک بوونی ئەو بەڵگانەی پشتڕاست کردەوەو لەلایەکی دیکە گومانێکی نەهێشتەوە کە حازر نیە بەڵگەکان بداتە دادگاو کۆماری ئیسلامی. گوتی: "ئەمن عەرزت دەکەم ئەگەر خوا تەمەنم بدا مێژوویەک لە ٢٠ی خەرمانانی[١٣٢٠]ەوە تا ئەمڕۆ دەنووسمو لەو مێژووەدا بێگومان زۆر خاڵی تاریک ڕوون دەبنەوەو بەڵگەگەلێکیشم هەیە."[30]

خاڵی دووەم لە بارەی خەرجی چاککردنەوەی یەکێک لە شوێنە پیرۆزەکانی مەزهەبی بەهایی بوو. خەلخالی لە هوەیدای پرسی ئایا لەو کارەدا، ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، یان لە ڕێگای دابینکردنی خەرجی-یەوە ڕۆڵێکی هەبووە یان نا. هوەیدا زۆر سەرسوڕماو هاتە بەرچاو. لە سزاخوازییەکەدا هیچ ئاماژەیەک بەو مەسەلەیە نەکرابوو. لە ڕاستیدا ئەمە تەنیا حاڵەت بوو کە بە درێژایی دادگای یەکەمو دووەم ئاماژە بە مەزهەبی بەهایی دەکرا. هوەیدا حاشای لە هەرجۆرە بەشدارییەک لەو کارەدا کرد.[31]

پاش ماوەیەک، ڕاوێژی شەڕانیی خەلخالی جارێکی دیکە هوەیدای قانیع کرد کە ئەم کۆبوونەوەیەو وتووێژەکانی، لە ڕواڵەتپارێزی بەدەر شتێک نین. تێگەیشت کە چارەنووسی دیاری کراوەو، و ئەمجار، هەرکە خەلخالی هێرشی کردە سەر هوەیدا، ئەویش هاتە نێو

قسەکانی‌و گوتی: "قوربان، قازی نابێ دژی تۆمەتلێدراو قسە بکا."[32] بەناهومێدییەوە لە خەڵخاڵیی پرسی، چیتان لەمن دەوێ؟"[33] خەڵخاڵییش لە وەڵامدا گوتی ئەتۆ "مفسد في‌الأرض"ی‌و پێشنیاری پێ‌کرد کە دوا بەرگریی خۆی بخاتە بەر گوێی دادگا. خەڵخاڵی بەم قسەیەی بە ئاشکرا نیشانی دا کە تەنانەت پێش "شور" کۆبوونەوەی دادگاش حوکمەکەی دیاری کراوە. دەگەڵ خەڵخاڵی لەسەر ئاقڵانەبوونی تۆمەتی "مفسد في-الأرض" کەوتە کێشەوە. لەوجۆرە بەڵگەهێنانەوەیە، و ئەویش لەو کاتەدا، دەکرا حاڵەتێکی خەفەتبارو ناهومێدییەکی جێگای بەزەیی ببینین. گومانێک نیە کە خەڵخاڵی بە خوێنی سەری هووەیدا تینوو بوو. داوەرییە بەپەلەکانی ئیدی لەو دەورانەدا ناوبانگیان دەرکردبوو.[24] بەوحاڵەش، هووەیدا لە دادگای کەسێکی وادا لە وردەکارییەکانی زمانی عەرەبی‌و لە ئاقڵانەبوونی تۆمەتی "گەندەڵی لە زەویدا" دەدوا.[25]

هووەیدا قبووڵی بوو کە لە دەورانی سەرۆکوەزیریی خۆیدا تووشی خەتاگەلێک بووە. بەڵام هەرلەو کاتەدا جەختی دەکردەوە کە لەم دەورانەدا، کۆمەڵی ئێرانیش گەشەو پێشکەوتنی بەرچاوی بەدەست هێناون. دەیگوت دادگا دەبێ بارە باش‌و خەراپەکانی کارنامەی من لەبەر چاو بگرێ. دەتگوت وردەوردە ورەی خۆڕاگری‌و تەنانەت سەرکێشیی خۆشی بەدەست هێناوەتەوە. هەرلێرەدا بوو کە بێ‌پەروا دەستی کرد بە بەرگری لە کارنامەی دەوڵەتی خۆی. گوتی بەرنامەی ئێمە بۆ کۆمەڵی ئێران هەم پێشکەوتوو بوو، هەم هەقانیەتی مێژوویی لەپشت بوو. پێی داگرت کە بەداخەوە دەرفەتی پێویستی دەست نەکەوت کە ئەو بەرنامەیە بە تەواوکەماڵی، جێبەجێ بکا. ئامارو ئەژمارێکیشی ئامادە کردبوو کە ئەو پێشکەوتنانە نیشان بدەن. بنەماڵەی ئێنشا لە ئامادەکردنی ئەو ئامارانەدا کۆمەگیان کردبوو.[26] بەڵام خەڵخاڵی پێشی قسەکانی هووەیدای گرت‌و پێی داگرت کە "مەچۆ نێو وردەکاری." هووەیدا بە توندی‌و تاڵی گوتی ئەمن لەم دادگایەدا "بەرگری لە گیانم دەکەم." گوتی:"ئەمن ناچارم وردەکاریی ئامارو ئەژمارەکان باس بکەم."

خەڵخاڵی قانیع نەبووو داوای لە هووەیدا کرد لە بوارێکی گشتیدا درێژە بە بەرگرییەکانی بدا."[37]

سەرەنجام هووەیدا بە نیشانەی سەرکێشیی و دڵشکاوی لە کاری داگا، بێدەنگ بوو. دەستی ڕاستی بە تێکەڵاوێک لە تووڕەیی و بێ-موبالاتی لە حەوادا ڕاوەشاندو بەم کارە نیشانی دا کە ئیدی بەرامبەر بەو دادگایە قسە ناکا. بەمجۆرە قۆناخێک لە کاری [دادگای] خەڵخاڵی کۆتایی هات و ئەو بەناو "کەوتە کۆبوونەوە". سێ ئاخوندەکەی دیکە – ئازەری، جەننەتی و گیلانی –[38] چاوەدێرو ڕاوێژکاری دادگا بوون. بەپێی نەریتی ئیسلام، ئەم ڕاوێژکارانە تەنیا لە کاتێکدا دەست لەکاری دادگا وەردەدەن کە بزانن بێعەداڵەتی کراوەو چوون لە دادگای خەڵخاڵیدا نیشانەیەک لە بێعەداڵەتی یان نەدیبوو، قسەیەکیشیان تێدا نەکردو بێدەنگ دانیشتن و تەماشای کاری دادگایان کرد.

چەند دەقیقە دوای دەستپێکردنی "کۆبوونەوە" خەڵخاڵی حوکمی دادگای ڕاگەیاند. گوتی: "مفسد فيالأرض بوون و خەیانەتی ئەمیر عەبباسی هووەیدا بە گەل و نیشتمان سابیتەو ناوبراو مەحکووم بە ئیعدام و زەوتکرانی دارایییەکەیەتی."[39]

لەنەکاو ئارەقێکی سارد نیشتە سەر نێوچاوانی هووەیدا. ڕەنگی بە ڕووانەوە نەما. بۆ نەجاتی گیانی خۆی جارێکی دیکە وەقسە هات و گوتی: "دەزانم دەتانەوێ من بکوژن. مانگێکم دەرفەت بدەنێ تا مێژووی دوو دەیەی دوایی بنووسم." هووەیدا دەیزانی زەمان بە قازانجیەتی. خەڵخاڵییش ئەوەی دەزانیی و هەربۆیەش بێ لەحزەیەک دواکەوتن، پێشنیاری هووەیدای ڕەت کردەوە. گوتی خەڵکی دیکە زۆرن کە دەتوانن ئەم مێژووە بنووسن. پاشان دەستووری دا تۆمەتلێدراو لە ژوورەکە بەرنە دەر. هەرلەو کاتەدا حوکمی کرد کە هیچ کەس هەقی نیە لە ژوورەکە بڕواتە دەر. هەروەک جاران نیگەرانی دەستتێوەردانی حکوومەتی کاتی بوو. لەوە دەترسا کەسێک بچێتە دەرێ و خەبەری کاری دادگا بداتە دەوڵەتی بازرگان. دەیزانی لەحاڵەتێکی وادا، بازرگان و کابینەکەی تێدەکۆشن جێبەجێکردنی حوکمەکە وەدوا بخەن. خەڵخاڵی

لێبڕابوو فەرمانی ئیمامی خۆی جێبەجێ بکا. نەیدەویست هیچ کەس لە بەشی خۆی لەو ساتە مێژووییەدا بێبەشی بکا.

کە لە ژووری چوونەدەر، هووەیدا جارێکی دیکە هەوڵی نەجاتی گیانی خۆی دا. داوای لە خەڵخاڵی کرد ڕێگای بدا قسە دەگەڵ ئەحمەدی خومەینی بکا. دەیزانی کە وەختی خۆی کۆمەگی بە ئەحمەدی خومەینی کردوە بچێتە لای بابی کە دوور خرابۆوە بۆ عێراق. هیوادار بوو ئەو چاکەیەی دوێنێ ئەمڕۆ بۆ نەجاتی گیانی فریای کەوێ. خەڵخاڵی دووبارە بێڕاوەستان‌و دوودڵی، داخوازی هووەیدای ڕەت کردەوە. گوتی ئەحمەدی خومەینی هیچی لەدەست نایە. جەختی کردەوە کە: "کارێکی نائاسایی کە بۆ ئەحمەدئاغات کردوە ئەوە بووە کە دەستوورت داوە پاسپۆرت بۆ ئەوو خێزان‌و کچەکانی ئیمام دەربکەن. ئەمە شتێک نیە بتوانێ کۆمەگت بکا بۆ ئەوەی ببەخشرێی."[40]

ئەمجار خەڵخاڵی دەستووری بە هووەیدا دا وەسیەتنامەی خۆی بنووسێ. هووەیدا ئەوکارەی نەکرد. خەڵخاڵی سەرپێچیی هووەیدای بە هەوڵێک بۆ نەجاتی گیانی دەزانی. دەڵێ هووەیدا بە هەڵە پێی وابوو ئەگەر وەسیەتنامە نەنووسێ، ئێمەش حوکمەکەی جێبەجێ ناکەین.[41] بەڵام سەرپێچیی هووەیدا دەتوانێ هۆی دیکەشی هەبن. گرنگتر لە هەمووان ئەوە کە دەزانین ئەو، کەمێک پێش گیرانی، وەسیەتنامەیەکی نووسیبوو‌و لەلای یەکێک لە سکرتێرەکانیی دانابوو. خەبەری بە فەرەیدوونی براشی دابوو کە وەسیەتنامەیەکی وای هەیە.[42] جگەلەوە، ڕەنگە هووەیدا نەیویستبێ بە نووسینی وەسیەتنامە ڕەوایی بە دادگای شۆرش‌و حوکمەکەی ببەخشێ.

پاشان هووەیدایان بە دالانێکدا بردە حەوشەی زیندان. دیارە ئەو زلنیویەتی لە کۆتایی ئەو دالانەدا چ چارەنووسێک چاوەڕوانیەتی. هادیی غەففاری کە بە درێژایی دادگاکە لە تەنیشت هووەیدا دانیشتبوو‌و بەخێسە تەماشای دەکرد، دەگەڵ خەڵخاڵی‌و گرووپێکی چووکەڵەی پاسداران‌و ڕووحانی‌یان بە دوای هووەیدادا دەڕۆیشتن.

هەرکە هوەیدا پێی دەحەوشەی نا، یەکێک لەو کەسانەی لە دوایەوە دەڕۆیشتن دەمانچەیەکی دەرهێنا، سێرەی لە گەرووی هوەیدا گرت و دووگوللەی پێوە نان. هوەیدا کەوتە سەر زەوی. خوێن لە ڕەگی ملی فیچقەی بەست. دیار بوو ئەوەی تەقەی لە هوەیدای شەست ساڵە کرد، دەیەویست بە مەرگێکی لەسەرەخۆو پڕئازار بیکوژێ. وا دیار بوو مەرگی دەسبەجێی دەستەی ئیعدامی بۆحاڵی هوەیدا بە گونجاو نەدەزانی. هوەیدا کە دەیزانی برینێکی کوشەندەی هەڵگرتوە، ڕووی لە کەسێک بە ناوی کەریمی کرد، کە لەریزی هاوڕێیانی خەلخالیدا بوو، بە پاڕانەوەوە داوای لێکرد گیانی لێبستێنێ. کەریمییش دیار بوو لە ڕووی لوتفەوە، دەمانچەکەی بە دەستەوە گرت و گوللەیەکی خەلاسی لە سەری هوەیدا دا.[٤٣] هوەیدا ئیدی دوا ساتەکانی ژیانی دەگوزەراند. گۆیا لەبەر خۆیەوە گوتبووی، "قەرار نەبوو ئاوا تەواو بێ."[٤٤] بەپێی ئەو وێنانەی لە تەرمی هوەیدا بڵاو بوونەوەو بە پێی ڕاپۆرتی پزیشکیی قانوونی، و ئەوە کە دوکتۆر فریشتەی ئینشا دیتبووی دەتوانین بڵێین بێشک هوەیدا نەک بە دەسرێژی دەستەی ئیعدام بەڵکوو بە سێ گوللەی دەمانچەیەک کوژراوە. دوکتۆر ئینشا دەیگوت، "ئەوانەی دەستەی ئیعدام دەیان-کوژێ، دەموچاویان شین هەڵدەگەڕێ؛ ڕاست وەک کەسێک کە دەخنکێ. بەلام ڕوخساری هوەیدا ئەو ڕەنگو حاڵەتەی نەبوو."[٤٥]

جگەلەوە، خەلخالی ئەو دەمانچەیەی وەک بەڵگەی شانازیو وەک نیشانەی ئەو ڕۆژە مەزنانە کە دادپەروەریی ئیسلامی بە دەستی وی بەڕێوە دەبرا، بۆخۆی هەڵگرت و بردیەوە ماڵێ. کاتێک نووسەری بە ناوبانگی ئینگلیسی، ڤی.ئیس.نێپاڵ* لە قوم، و لە ماڵی خەلخالی چاوی پێی کەوت، ئەو هەروا شانازیی بە ئیعدامی هوەیداو نەخشی خۆی لەو ڕووداوەدا دەکرد. بە نێپاڵی گوتبوو، "دەزانی هوەیدا ئەمن کوشتم." وەختێک دیلمانجەکەی نێپاڵ بۆ تەواوکردنی قسەی خەلخالی لێی زیاد

---

* V.S.Naipal.

کرد کە "لە ڕاستیدا کوڕی ڕووحانییەکی بەناوبانگ" هووەیدای کوشت. خەڵخاڵی دەسبەجێ بە لەخۆبایی‌بوونێکی تەواوەوە زیادی کرد کە، بەڵام دەمانچەکەی لەکن منە... هەر لە وژوورەی تەنیشتییە."[46]

کاتێک خەڵخاڵی لە مەرگی هووەیدا دڵنیا بوو، گەڕایەوە ژووری دادگاو ئامادەبووانی لە چارەنووسی هووەیدا ئاگادار کردو پاشان بۆخۆی، دوای چەند لەحزە، زیندانی قەسری بەجێ هێشت. خەریک بوو بچێتە دەر کە یەکێک لە بەرپرسانی زیندان غاری دایە لای خەڵخاڵی‌و پرسی هووەیدای چ لێ‌بکەین. بە جۆرێکی دیکە بڵێین، تا ئەو لەحزەیە، تەنانەت زۆر لە بەرپرسانی زیندانیش ئاگایان لە چارەنووسی هووەیدا نەبوو. خەڵخاڵی لە وەڵامدا گوتی ئیدی هووەیدایەک لە ئارادا نیەو بەڕێی خۆیدا ڕۆیشت.[47]

ڕۆژی مردنی هووەیدا چاپەمەنیی پێتەخت، سەرمەست لە بادەی سەرکەوتن، لاپەڕەکانی خۆیان بۆ وێنەگەلێکی بە ڕاستی ناشیرین لە پەیکەری هووەیدا تەرخان کرد. لە ڕۆژانی یەکەمی شۆڕشدا، تاران شاری بێ‌دەوڵەت بوو. بەوحاڵە، خەڵکی شار کەم‌وزۆر لە نەخۆشیی قین‌لەزگی‌و خوێن‌خوازیی بەکۆمەڵ کە فەتای زۆر لە شۆڕشەکانی سەردەمی نوێ بوو، بەدوور مابوونەوە. لە ڕاستیدا لە سەردەمی شۆڕشی فەڕانسەوە ئەو جۆرە شێتییە دەسبەجێیە بە یەکێک لە پێویستییەکانی شۆڕشە گەلییەکان دەژمێردرا. بەڵام لە ئێران‌و تاران، شۆڕشەکە گەلی بوو، و هەرلەو کاتەدا زۆربەی خەڵک نەجیبی‌یان نیشان داو ئارام مانەوەو هەوای خوێنڕێژی‌و خوێنخۆری لە سەری نەدان. لە بەرامبەردا، هێندێ بەش لە دەوڵەت‌و هێزە شێوە سەربازییەکانی خوێنڕێژی‌و قین‌لەزگی‌یان ڕەچاو کرد. لە شۆڕشی فەڕانسەدا، بە گیووتینیان دەگوت "ماشێن"و لە پێش چاوی خەڵک‌و بە ڕێوڕەسمیکی تایبەتییەوە بەکاریان دێناو دوای ماوەیەک هەرئەو "ماشێن"ە بوو بە سیمبولی توندوتیژیی شۆڕشگێڕانەی گەل. لە ئێران بە باوەڕی من، وێنە خوێناوییەکانی پەیکەری مەحکوومانی دادگا شۆڕشگێڕەکان نەخشێکی وەک ئەو "ماشێن"ەی شۆڕشی فەڕانسەیان لە ئەستۆ بوو.[48]

لە یەکێک لە وێنەکاندا تەرمی هوەیدا دەبینین کە لەسەر زەوی پان بۆتەوەو پەتووە شرەیەک نیوەی لەشیی داپۆشیوە؛ پەڵەخوێن لەسەر گەرووی‌و سەر ڕوومەتی وشکب بوون. کوتە مقەببایەک لەسەر سنگی دانراوە کە بە خەتێکی منداڵانە، ناوی هوەیدای لێ نووسراوە. لە وێنەیەکی دیکەدا، لە چەکمەجەی ساردخانەی پزیشکیی قانوونیدایە. دوو پیاوی تفەنگبەدەست لەسەر تەرمەکە وەستاون. لە ڕوخسارياندا نەک شادی، بەڵکوو سەرسوڕمان دەبینین. دەڵێن ئازاری مەرگ دەموچاوو جەستەی مرۆڤ خواروخێچ دەکا. بەڵام لە ڕوخساری هوەیدادا نیشانەیەک لەو خواروخێچییە نەبوو. بە پێچەوانە، ئارامی‌و هێمنییەکی سەیرو تەنانەت هەژێنەر، دەهاتە بەرچاو. لە تەنیشت ئەو وێنە شووم‌و مەرگلێدراوانە، ڕۆژنامەکان وێنەگەلێکیشیان لە دەورانی دەسەڵات‌و شەوکەتی هوەیدا چاپ کردبوو.

تەنانەت لە هەڵبژاردنی ئەو وێنە کۆنانەشدا جۆرێک نیازخەراپی بەرچاو دەکەوت. لە یەکێکیاندا هوەیدای دەبینین کە داهاتۆتەوەو دەستی شا ماچ دەکا. لە یەکی دیکەدا، کڵاوی گەورەی کاوبۆیەکانی ئەمریکای لەسەرە. لە پەنای نووسرابوو کە کڵاوەکە دیاریی ڕیچارد هێلمز بوو-ئەو کەسەی وەختێک باڵیۆزی ئەمریکا لە ئێران بووو پێشتریش سەرۆکایەتیی ڕێکخراوی جاسووسیی سیای لە ئەستۆ بوو-. پێم وایە پەیامێک کە لەو وێنەیەدا شاردرابۆوە زۆریش پێچەڵپووچ نەبوو. ئەمریکاییەکان کڵاوێکی گەورەیان لەسەر هوەیدا نابوو.

لە هەلومەرجی ئاساییدا، خەبەری مردن بە هەزار زەمینەسازی بە خزمان‌و دۆستان ڕادەگەیەندرێ. بەڵام هەروا بزانە لە سەردەمی شۆرشدا، هەموو پێوانەکان تێکەڵ دەبن. خۆشەویستی‌و ناسکی‌و جوانکاری جێگایەکیان نیە. موداراو خۆشەویستی زۆربەی وەخت جێی خۆیان دەدەن بە توندوتیژی‌و دڵڕەشی. دڵڕەقی لەژێر ناوی ڕقی خەڵکداو قینلەزگی بە شێوەی توندوتیژیی شۆڕشگێڕانە خۆ دەنوێنن.

پێش هەمووان تەلەفۆن بوو. هەرئەو دەنگە بوو کە هەمیشە لە زیندانەوە زەنگی لێدەداو داوای "دایکی عەلی"ی دەکرد. ئەمجارە

دەوروبەری حەوتونیوی ئێواریێ زەنگی لێدا. لەو رۆژەوە کە هووەیدا گیرابوو، دایکیشی لە ماڵی دوکتۆر فریشتەی ئینشا دەژیا. بەرێکەوت ئەورۆژە ئەفسەرولملووکو چەند ژنی هاوتەمەنی لە ژووری دانیشتنی ماڵی ئینشادا رێورەسمێکی ئایینییان گرتبوو. دایکی هووەیدا گوتبووی خێری لەخۆی گرتوە. هەرکام لە ژنەکان قورئانێکیان لەسەر سەری خۆیان راگرتبوو، و بەعەرەبیو بەدەنگی بەرز دوعایەکیان دەخوێندو بە هاواری غەمی هەناویانەوە خۆیان رادەژاند. زەنگی تەلەفۆن ئارامیی خەڵوەتەکەیانی شکاند. لەنەکاو دڵەخورپەو پەرێشانی جێگای خاترجەمیی گرتەوە.

دوکتۆر فریشتەی ئینشا تەلەفۆنەکەی هەڵگرت. دەنگێک لەوبەرەوە بەرز بۆوە، "ئەتۆ دایکی عەلیی؟" کاتێک وەڵامی ئەرێی وەرگرتەوە، بە کورتییەک کە رەنگە لە دڵرەشییەوە هاتبێ، گوتی، "ئیدی پێویست نیە لیباسی بۆ بێنن. چەند دەقیقە پێش ئێستا ئیعدامیان کرد." ترس کەوتە گیانی دوکتۆر فریشتەی ئینشا. دەیزانی کە هەموو ژنەکانو یەک لەوان دایکی هووەیدا چاویان لە زاری وییە. جگە لەوە کە خۆی ئارام نیشان بدا چارەیەکی نەبوو. هەر ئەوەندەی گوت کە، "زۆر سوپاس"و ئەمجار بە هێمنی، دەگەڵ ئەوەی چاوی پڕ لە فرمێسک بوون، زەردەخەنەیەکی هێنایە سەر لێوانو خۆی خۆشحاڵ نیشان داو گوتی، "خانم مزگێنی. ئاغایان بۆ ئورووپا دوور خستۆتەوە." دایکی هووەیدا وەڵامێکی نەدایەوە. پرسیارێکی نەکرد. هەستوسۆزێکیشی نیشان نەدا. دوعایەکەی دەست پێکردەوە. بەڵام وادیار بوو لەو لەحزەیەدا چاوە پڕفرمێسکەکانی یەکسەر لە تیشکو شۆقی ژیان بەتاڵ بوون.[49] هەروا بزانە بە سروشتی دایکایەتی، لەحزەی مەرگی جگەرگۆشەکەی دەزانی.

ئەوشەوە دووررِاگرتنی دایکی هووەیدا لە دەنگوباسی رادیۆو تەلەڤیزیۆنو تەلەفۆنی دۆستو خزمان تەنیا هەوڵی بنەماڵەی ئینشا بوو. بەشی زۆری شەوێیان بە سووتاندنی ئەو بەڵگەنامانەوە گوزەراند کە لە ماڵەکەیان شاردرابوونەوە. دوکتۆر ئینشا دەڵێ، "زۆربەی بەڵگەنامەکان هی هووەیدا بوون. یەکێک لەوشتانە کە ئەو

شەوە سووتاندمانن نامەکانی هووەیدا بۆ شاو شاژن بوون. بۆخۆی گوتبووی ئەگەر شتێکی بۆ هاتە پێش، هەموو بەڵگەکان بسووتێنین."[500] هەتا بەتڵێک لە شەوێ گوزەرا، یەکی دیکە لە دۆستانی هووەیداش کە بیست ساڵێک هاوکاریی نیزیکی دەگەڵی هەبوو، خەریکی سووتاندنی بەڵگەنامەکانی هووەیدا بوو. دیارە نیگەرانیی ئەو دۆستو خزمانە دوولایەنە بوو. لەلایەک نەیاندەویست ئەو بەڵگانە بە پێچەوانەی ویستو دەستووری هووەیدا بکەونە دەستی کاربەدەستانی کۆماری ئیسلامی. لەلایەکی دیکەش باشیان دەزانی ئەگەر پاسداران ئەو بەڵگانە لە ماڵی ئەو دۆستو خزمانەدا وەدۆزن، بۆیان دەبنە مایەی ژانەسەر. بە باوەڕی من بەشێک لەو بەڵگەنامانەی ئەوشەوە سووتێندران هەرئەو بەرگەو بەڵگانە بوون کە هووەیدا لە فەرمانو چالاکییە ناقانوونییەکانی دەورانی سەرۆکوەزیریی خۆی ئامادەی کردبوون. پێی وابوو ئەو دۆسیەیە، سەلامەتیو ئازادیی وی لە ڕێژیمی پەهلەویدا دەستەبەر دەکەن. هەرلەو کاتەدا وای دەزانی ئەگەر ڕێژیم بگۆڕێ دۆسیەیەکی وا وەک کارتێکی براوە بە دەستیەوە دەبێ. بەڵام لەو لێکدانەوەیەدا لە خاڵێکی گرنگ غافڵ بوو. ڕەنگە هەر بیری لەوە نەکردبێتەوە کە لە ئێران ڕێژیمێک بێتە سەر کار کە یەکسەر لەبەر دەستی ڕووحانییەکاندا بێ. ئەویش ئەو ڕووحانی‌یانە کە تۆڵەو سزا (قصاصو مجازات)یان زۆر لە پاراستنی بەڵگەنامە مێژووییەکان بۆ گرنگتر بوو. جگەلەوە، لە شەوی مەرگی هووەیدادا، خزمو دۆستانی ویش، جگە لە غەمی مەرگی خۆشەویستەکەیان، زیاتر لە فکری ڕەواندنەوەی مەترسی لەسەر خۆیاندا بوونو دیارە غەمی کونپشکنیی مێژوونووسانی دواڕۆژیان لە دڵدا نەبوو.

چەند سەعات دوای مەرگی هووەیدا، ڕۆژنامەکانی تاران ژمارەی تایبەتی‌یان لە بارەی ئیعدامی وییەوە بلاو کردنەوە. جاری وابوو تیترە درشتەکانیان نیو لاپەڕەی دەگرت. یەکێک دەیگوت، "دادگای عەدڵی ئیسلامی هووەیدای گوللەباران کرد"و ئەوانی دیکەش تیتری لەو بابەتەیان لێ‌دابوو. چەند دەقیقە پاش چاپی ئەو ژمارە تایبەتی‌یانە،

کەسێک نوسخەیەکی لە لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەکە بە پەنجەرەی ژووری دانیشتنی بنەماڵەی ئینشاوە دا. ڕوون نییە داخوا ئەفسەرولملووک هەرگیز نێوەرۆکی ئەو ڕۆژنامەیەی دی یان نا. دوکتۆر فریشتەی ئینشا دەسبەجێ ئەوی لە پەنجەرەکە کردەوە. جگەلەوە، ئەوشەوە ڕادیۆو تەلەڤیزیۆنەکانی ماڵێیان کوژاندەوە. دەترسان دایکی هوویدا خەبەری مەرگی کوڕەکەی لە بەرنامەیەکی ڕادیۆ یان تەلەڤیزیۆن ببیسێ.[51]

بنەماڵەی ئینشا هەوڵی تەواویان دەدا ئەفسەرولملووک بە ڕاستی قانیع بکەن کە کوڕەکەی، ئەمیر عەبباس، بۆ ئورووپا دوور خراوەتەوەو دایکی هوویداش لەویارییەدا هاوکاریی تەواوی نیشان دەدا. هاوکات دەگەڵ مەرگی کوڕەکەی، ئەویش ڕۆژلەڕۆژ پتر دەخزیە نێو خۆی. دنیای دەرەوە ڕایەدەکێشا. لە دوانیوەڕۆی ئەو ڕۆژەوە کە داغی مەرگی کوڕەکەی دی، تا ئەو ڕۆژەی چوار ساڵ دواتر مرد، کەموزۆر هەمیشە بێدەنگ بوو. زۆربەی وەختی بە دوعاکردن دەگوزەراند. لەبارەی ئەمیر عەبباسەوە پرسیاری لەکەس نەدەکرد. هەرگیز داوای نەکرد بیبەنەوە ماڵەکەی خۆی. کاتێک بنەماڵەی ئینشا وایان دەنواند کە بۆ وێنە نامەیەکی هوویدا هاتوەو دەقێکیان بە دەنگی بەرز دەخوێندەوە، ئەفسەرولملووک هەستو سۆزێکی دەرنەدەبڕی. تەنانەت ئەو دیاری-یانەش کە بەڕواڵەت هوویدا بۆی ناردبوون- "لەچکێک، قاپقاپەیەک، چەند جووت گۆرەوی" - دژکردەوەیەکیان لەودا نەدەبزواند.[52]

شەوی ئەو ڕۆژە کە هوویدا ئیعدام کرا، ماڵێک کە ئەو دەگەڵ دایکی لێی دەژیا، و هەروەها ئاپارتمانێکی چووکەڵە کە کەمێک پێش کشانەوە لەپۆستی سەرۆکوەزیری لە ساختومانێکی تازەی تاران کڕیبووی تالان کران. ئالبوومەکانی بنەماڵە لەتوپەت کران و وێنەکانی، لێرولەوێ، لە پیادەڕۆیەکانی دەوروبەری ماڵێ و دالانەکانی نیزیک ئاپارتمانەکەیدا بلاو بوونەوە. لە ئاپارتمانەکەیدا "تەنانەت دیوارەکانیشیان کونکون کرد. پێیان وابوو شتە گرانبابیەکان و دراوە نەغدەکانی لەوێ لە سندووقێکدا شاردوونەوە."[53]

هەموو ڕۆژنامەکانی تاران هەوڵیان دەدا ئیعدامی هووەیدا بە ڕەوا نیشان بدەن. لە تەواوی ئەو لاپەڕە زۆرانەدا کە بۆ ڕاپۆرتی کاری دادگا، سزاخوازی، حوکمی دادگاو جێبەجێکردنی حوکمەکەیان تەرخان کردبوو، تەنانەت یەک کەسیش وشەیەکی وەک ڕەخنە لە سروشتی ئەو دادگایەو حوکمی بەپەلەیەوە نەنووسی. لە جیاتی ڕەخنەی بەجێو بنەڕەتی، ڕۆژنامەنوسانو لێکۆڵەران دروشمی شۆڕشگێڕانەیان دەدانو دەنگۆیان بڵاو دەکردنەوە. یەکێک دەیگوت گوڵە ئۆرکیدەکەی هووەیدا هەر بۆ ڕواڵەتبازی بووو لەپشت گوڵەکەوە میکرۆفۆنێک شاردرابۆوەو هووەیدا دوژمنانی خۆی پێ دەداو دەخست. یەکی دیکە ئیددیعای دەکرد کە ئۆرکیدەکانیان هەموو ڕۆژێ بە فڕۆکە لە پاریسەوە دێنانە تاران. سێیەم گاڵتەی بە پێوەندیی ژنومێردایەتیی هووەیدا دەکردو نووسەری چوارەم ئیددیعای دەکرد هووەیدا تەونو بەستی نهێنیی دەگەڵ ساواک هەبوو. دەچووە هەرجێیەک، بە کۆمەگی هێندێ ئاماژەی تایبەتی دوژمنانی خۆی بە ساواک نیشان دەداو ساواکیش دەسبەجێ دوژمنی هووەیدای دەگرت. یەکی دیکە لە وتارەکانیدا دەیەویست ئیسبات بکا کە، "ساواک لە کۆشی هووەیدادا بوو بە دێوەزمەیەک."

لای نیوەشەوێ بوو کە جارێکی دیکە تەلەفۆنیماڵی ئینشا زەنگی لێدا. ئەمجارە کەسێک لە پزیشکیی قانوونی بوو. دەیەویست بنەماڵە ئاگادار بکا کە تەرمی هووەیدا گوازراوەتەوە بۆ ئەوێ. بڕیار درا، "بەیانی کەسێک لەلایەن بنەماڵەوە بچێتە پزیشکیی قانوونی"و کاری کفنودفنی تەرمەکەو ئەنجامدانی قۆناغە قانوونییەکانی دیکە وەئەستۆ بگرێ. جارێکی دیکە ئەرکەکە کەوتە سەرشانی دوکتۆر فریشتەی ئینشا. دەڵێ وەختێک گەیشتمە پزیشکیی قانوونی، "سالۆنێکم دی زۆر بەرینو پڕ لە تەرم، هێندێ لە تەرمەکان ڕووت بوون، و چەند بەشێکیی لەشی ڕووتی هێندێکی دیکە بە خاولییەک یان پەڕۆیەک داپۆشرابوون."[٥٤٠] دەڵێ لە ناسنامەی هەرکام لەو تەرمانە تەنیا مقەببایەکی چووکە مابوو کە بە کوتە دەزوویەک لە لاقی مردووەکان گرێ درابوو. بۆنی مردن فەزای سالۆنەکەی پڕ کردبووو حاڵەتێکی سامناکی پێ-

دابوو.[55] سێبەری مەرگ بەسەر ئەو نێوەندەدا زاڵ بوو و فەزایەکی مەرگهێنی تێدا پێکهێنابوو.[56] دەڵێ پیشەی من پزیشکییە. لە بەشی زۆری ژیانمدا لە نیزیکەوە دەگەڵ مردن ئاشنا بووم. بەڵام تەنانەت ئەمنیش لەوهەموو مەرگەی لەو ساڵۆنەدا هەبوو ترسام.[57]" دەڵێ لە سووچێک تەرمی درشتی پیاوێک دەبینرا کە وا دیار بوو بە هەزارو یەک چەقۆ گیانیان کێشابوو. لاویژگەیەکی دەوروبەری پازدەساڵە لە پەنا تەرمەکە ڕاوەستابوو. ئارامئارام دەگریا. دەڵێ لە چارەنووسیم پرسیوگوتی "پیاوەکە ئاژان بووو لاویژگەکەش کوڕیەتی.[58]"

ئەمجار دوکتۆر فریشتەی ئینشایان بردە ژوورێک کە دیوارە کانی، لەمیچی تا سەر زەوی، بە دەرگای کانزایی شینی ساردخانەی پزیشکیی قانوونی داپۆشرابوو. یەکێک لە چەکمەجەکانیان ڕاکێشا. لەشی ڕووتی هووەیدا وەدەر کەوت. کەسێک بە ماژیک، لەسەر یەکێک لە پەراسووەکانی نووسیبووی، "ئەمیر عەبباسی هووەیدا"، دوکتۆر ئینشا دەڵێ: "ڕەقەڵەیی دەموچاوی سامناک بوو." دیتنی جەستەی ڕووتی هووەیدا فرمێسکی هێنایە چاوەکانی دوکتۆر ئینشاوە. بە تووڕەیی گوتی، "بۆچی ئاواتان ڕەفتار دەگەڵ کردوە؟" یەکێک لەو دوو پزیشکەی لەوێ بوون، وەڵامێکی کورتی دایەوە. خانم چ فەرق دەکا. ئەو خۆ مردوە.[59]"

پاش ناسرانەوەی تەرمەکە، دوکتۆر ئینشایان بۆ دەفتەری یەکێک لە پزیشکانی قانوونی ڕێنوێنی کرد. لەوێ نوسخەیەک لە ڕاپۆرتی ڕەسمیی پزیشکیی قانوونی درایە دوکتۆر ئینشا. هەرلەو کاتەدا داوایان لێکرد تەرتیبی کفنودفنی تەرمەکە ئامادە بکا.

ڕاپۆرتی پزیشکیی قانوونی بە زمانی وشکو بێ سۆزی زانستی بوو. نووسرابوو:

تەرمی پیاوێکە جووتێک گۆرەویی لاسک نیوە درێژیی دەزووی بەڕەنگی سەوزی تاریک دەپێدان...سپیپێستە. بەژنی ١٦٧سانتی میترو کێشی دەوری ٦٨ کیلۆیە. خەتەنە کراوە. پێشەسەری ڕووتاوەتەوە. ئەوی دیکەی مووی کەمێک درێژو کەمپشتی ماشو برنجییە...ددانی

شەویلکەی سەریی دەسکردن...سەروچاوو دەستەکانی خوێنیان پێوە وشک بووە. بەهۆی ویکەوتنی زەبری توند... چەند کون لەسەر لەشی کە وەک برینن بە شێوەی خوارەوە دەبینرێن:

١) برینێکی وەک کونێکی بازنەیی بە ئەندازەی شەش میلیمیتر لەسەر ملی... لای ڕاست.

٢)کونێکی دووەم کە هەورازەو لەشانی ڕاستی دەرچووە ... بە ئەندازەی شەش میلیمیتر.

٣)کونێکی سێیەم لە کەللەسەری... مێشکی ئازاری دیوە... بەپێی چۆنیەتیی ئەوانە شوێنی چوونەژووری گوللەی چەکی گەرمن. هەرچەند ئەو چەکەی بەکار براوە یان فیشەکەکانی لەبەر دەستی ئێمە نین، بەوحاڵە بەپێی ڕادەی برینەکان وا دیارە چەکەکە دەوری کالیبر ٣٨ بووە...بەهۆی زەبری جیسمی ڕەق کە پێوەندیی بەکاتی ژیانەوە هەیە، کوترانێکی سەرپێستی بە درێژیی سانتی میترێکو پانایی دوو میلیمیتر لە چەنەگەدا هەیە...

ڕەفتاری جێی ستایشی دوکتۆر گەڕمان هەر لەم ڕاپۆرتەدا بەرتەسک نەدەبۆوە. پیاوێکی بەخۆوەو کەمدوێو جیددی بوو. ڕوخساری سوورکارە بوو. پاش ئەنجامی ڕێوڕەسمە قانوونییەکان، داوای لە دوکتۆر ئینشا کرد دەگەڵی بچێتە دەفتەری کارەکەی. لە ژوورەکەی خۆی کە تاڕادەیەک چۆڵ بوو ئاماژەی بەو خاڵە کرد کە ئەم ڕۆژانە، زۆروەخت، خەڵکی هەژاو لە دەوروبەری بارەگای پزیشکیی قانوونی دەخولێنەوە. چاوەڕوانن ببینن چکەسێک لە گەورەپیاوانی پێشوو، ڕێی دەکەوێتە پزیشکیی قانوونیو جاری وایە بێڕێزییش بە تەرمی ئەو کەسایەتییانە دەکەن. دوکتۆر گەڕمان گوتی، "دوو ڕێگا چارەسەر پێشنیار دەکەم. دەتوانم تەرمەکە بسووتێنم. ڕێگای دیکە ئەوەیە تەرمەکە ماوەیەک لێرە، لە جێیەکی ئەمن، ڕادەگرمو کاتێک وەزعەکە ئارام بۆوە پێوەندیت پێوە دەگرمو ئەودەم دەتوانن تەرتیبی کفنودفنی بدەن."[٦٠٠] کاری دوکتۆر گەڕمان بە ڕاستی سەرسوڕهێن بوو. ئەو بۆخۆی هیچ ئۆگرییەکی بە ڕێژیمی پەهلەوی نەبوو. لە بنەماڵەکەیدا

خەباتو دژایەتی دەگەڵ ڕێژیمی شا بە نەریتێکی لەمێژینە دەژمێردرا. بەڵام لەو لەحزە سامناکەدا دوکتۆر گەڕمان کە لە خانەنشینی نیزیک ببۆوە، هەموو شتێکو لەوانە کارو مووچەی خانەنشینییەکەی خستە مەترسییەوە تا دوژمنی سیاسیی دوێنێی لە بێدەنگیو ئارامییەکی شیاوی مەرگی خۆیدا بەخاک بسپێردرێ. دوکتۆر ئینشا ڕێگەچارەی دووەمی هەڵبژاردو چۆوە ماڵێو بنەماڵەکەیان چاوەڕێ مان.

ڕۆژی دواتر خەبەر بە کاربەدەستانی کۆماری ئیسلامی گەیشت کە دۆستانی هووەیدا بە کەلکوەرگرتن لەو بێسەروبەرەییەی بەسەر پزیشکیی قانوونیدا زاڵە تەرمەکەیان ڕفاندوە. خەڵخاڵی لەو درۆ مەسڵەحەتییەی دوکتۆر گەڕمان، پیلانێکی نێونەتەوەیی دروست کرد کە لەودا هەمووکەس، بۆ وێنە زایۆنیستەکان، بەشدار بوون. گوتی بازرگانو مەتیندەفتەریو شاپەرستانو فەڕانسەییو ئینگلیسیو ئیسرائیلییەکان پێکەوە پیلانیان گێڕاوەو تەرمی هووەیدایان سێمانگ لە پزیشکیی قانوونی شاردۆتەوەو پاشان ڕفاندوویانەو بردوویانەتە فەڕانسەو لەوێوە بردوویانەتە ئیسرائیلو لە گۆڕستانی جوولەکان لە پەنای بابی ناشتوویانە.[61]

ئەوداستانە دوورودرێژە تەنیا لایەنێکی لە ڕاستی نیزیکە. تەرمی هووەیدا بەڕاستی دەوری سێمانگ لە ساردخانەی پزیشکیی قانوونی مایەوە. دوای ئەو چاوەڕوانییە دوورودرێژە، پاشنیوەڕۆی ڕۆژێک دوکتۆر گەڕمان زەنگی بۆ بنەماڵەی هووەیدا لێداو گوتی سبەینێ بۆ بردنەوەی تەرمی هووەیدا سەری پزیشکیی قانوونی بدەن. گوتی، "بەیانی زوو وەرن، ژمارەتان زۆر نەبێ، نابێ سەرنج ڕابکێشن." ڕۆژی دواتر پێش تاوهەڵات، کاروانێکی دوو ترومبێلی لە ماڵی ئینشاوە ڕۆیشت. یەکێکیان چوارکەس لە ژنەکانی بنەماڵەی ئینشای تێدابوون. لە ترومبێلی دووەمیشدا پیاوێک، بەتاقی تەنیا، دەهات. برای دوکتۆر فریشتەی ئینشا بوو. لەترسان نەیدەویست دەگەڵ گەلی ڕەشپۆشان بکەوێو بە مەودایەکی نەک هێندە دوور بە دوایاندا دەڕۆیشت.

لە پزیشکیی قانوونی، چوار ژنە ڕەشپۆشەکە ڕێنوێنیی پێویستیان

لە دوکتۆر گەڕمان وەرگرت. بەناوێکی خوازراوەوە ئیزنی ناشتن بۆ هوەیدا دەرکرابوو. دوکتۆر گەڕمان گوتی: "ئەگەر لە گۆڕستان ناسنامە یان کارتێکی دیکەی پێناسیان لێ‌ویستن بلێن بە ڕووداوی ترومبێل کوژراوەو بەلگەو سەنەدەکانی هەموو دزراون."[٦٢] یەکێک لە دۆستانی هوەیدا کفنێکی دابوو بە بنەماڵە. تەرمەکەیان تێوە پێچا. دوکتۆر ئینشا دەڵێ لەشی هوەیدا بەهۆی ئەو دەرمانانەوە کە لە پزیشکیی قانوونی بەکاریان هێنابوون، ببووە شینێکی ئاسمانی. دەڵێ: "ئەو ڕۆژەی بۆ کفن-ودفنەکە چووم ڕۆژی پشوو بوو. جەژنی میعراجی پێغەمبەر بوو. شەقامەکانیان کردبووە چراخان. پێم‌وایە دوکتۆر گەڕمان بە ئەنقەست ئەو ڕۆژەی هەڵبژاردبوو. دەیەویست لەو ڕێگایەوە ئیمکانی ناسرانەوەی هوەیدا کەمتر بکاتەوە."[٦٣] بنەماڵەی ئینشاش، هەر بەوهۆیەوە، ڕێوشوێنی کفن‌ودفنەکەیان زوو تەواو کرد. تەنیا نیشانەی تازیەباری کاتێک دەرکەوت کە دەیانەویست تەرمەکە لەخاک‌ڕاکەن. دوکتۆر فریشتەی ئینشا لەبن تەرمەکە چۆکی داداو لەبەر خۆیەوە چەند وشەیەکی بە زماندا هاتن کە پێی وابوو هوەیدا لە هەموو شتێک زیاتر تامەزرۆی بیستنیان بوو. گوتی، "ئاغا، بەڵێن دەدەم چاکم ئاگا لەدایکت بێ."[٦٤] تەرمەکەیان لە ناخ‌ڕا کردو بنەماڵەی ئینشاش گەڕانەو نێو شار.

چەند مانگ دواتر سەرەنجام بەردێکیان لەسەر گلکۆی هوەیدا دانا. بەڵام ئەوکاتیش ناوە ڕاستیەکەی‌یان لەسەر بەردەکە نەنووسی‌و تەنیا بە ئاماژەیەکی ناڕاستەوخۆ بە ناسنامەی ئەوکەسەی لە خاکدا خەوتوە وازیان هێنا. دوای شەست ساڵ ژیانی پڕهەورازو نشێو، پاش زۆر سەرکەوتن‌و تێ‌شکان، ئەڤینی سەرکەوتووو ناکام، دوای چارەڕەشی‌و بەدبەختیی ئاوارەیی‌و شەوکەت‌و کەلکەڵەی دەسەلات، پاش چەند جار ئومێد بە ئازادی‌و دڵشکاوی لە چارەنووسی حەتمیی خۆی، ئاخرەکەی هوەیدا هیچی لێ بەجێ نەما جگە لە بەردێک لەسەر گلکۆیەکی نەناسراو.

ڕۆژی مردنەکەی، ڕۆژنامەکانی تاران کە هەموویان تازە لە زنجیری سانسۆر ئازاد ببوون، هەموو هەولێکیان دا تا ئیعدامی هوەیدا

بە ڕەوا نیشان بدەن. بەڵام بە پێچەوانەی ئەو تیترانە کە هەمووان باسی تاوان‌و سزایان دەکرد، لەو وێنانەدا کە لە لاپەڕەی یەکەمی کەیهاندا چاپ کرابوون، داستانێکی تەواو جیاوازو غەمبزوێن دەهاتە بەرچاو. وێنەی یەکەم ئەوی لە دادگادا نیشان دەدا. دەموچاوێکی ڕەقەڵەو خەمناکی هەبوو؛ دڵشکاو دیار بوو. خەریکی نووسین بوو. خەرمانەیەک لە پەرێشانی‌و تەسلیم لە بەرامبەر چارەنووسدا، سێبەری خستبووە سەر ڕوخساری. وێنەی دووەم لە تەرمەکەی بوو. پەڵە خوێنەکان جێی گوللەکانیان نیشان دەدا. بەوحاڵە، لە ڕوخساریدا هێمنی‌و ئارامییەکی هەژێنەر شەپۆلی دەدا.

هووەیدا بەشی زۆری تەمەنی لەنێو دوو بەرداشدا گیری کردبوو. لەلایەک دژبەرانی ڕێژیم بوون کە زۆربەیان وشک‌و ناسازگار دیار بوون. لەلای دیکەش شایەک بوو کە لە پاییزی باوکسالارییەکەیدا لەجاران زیاتر ملهورو خۆپەرست بوو. دەتگوت هووەیدا بەو پێکەنینە ئارامەی نیشتبووە سەر ڕوخساری، دەڵێ؛ "نەفرەت لە هەردوو ڕەچەڵەکتان."[٦٥٠]

# سەرچاوەکان

۱. خلخالی، «خاطرات»، سلام، ۷ مهر ۱۳۷۱، ص ۷.
۲. خلخالی، «خاطرات»، سلام، ۸ مهر ۱۳۷۱.
۳. پیشین، ۷ مهر ۱۳۷۱.
۴. پیشین.
۵. فریدون هویدا و دکتر فرشته انشاء در گفتگوهای متعددی با من در مورد چند و چون تلاشهایشان برای آزادی هویدا صحبت کردند. برای دستیابی به شرحی در خصوص درگیری کوزینسکی با مسئله‌ی هویدا، ر.ک.:
James Park Sloan, *Jerzy kosinski: A Biography* (New York: 1996), 317 & 363.
۶. دکتر فرشته انشاء، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۲ ژوئن ۱۹۹۸.
۷. برای نخستین بار در گفتگویی با بنی‌صدر از وجود چنین یادداشتی، و نیز از مضمون آن خبردار شدم. محمود رفیع نیز که خود وی یکی از معتمدان مبشری بود، از وجود این یادداشت و مضمون آن خبر داشت. زمانی که من نوشتن این کتاب را آغاز کردم، مبشری درگذشته بود. محمود رفیع، گفتگو با نگارنده، ۱۷ اوت ۱۹۹۸.
۸. بنی‌صدر، گفتگو با نگارنده، ورسای، فرانسه، ۳ ژوئن ۱۹۹۸.
۹. پیشین.
۱۰. بنی‌صدر، گفتگو. توصیف بنی‌صدر، در تمام جزئیات، با شرح محمود رفیع، یکی از مخالفان سرشناس شاه، و در دوازده سال اخیر یکی از رهبران خستگی‌ناپذیر در امر حقوق بشر در ایران، انطباق دارد.
۱۱. بنی‌صدر، گفتگو.
12. John F. Burns, "Former Hanging Judge of Iran Upheaval Now Backs Reformers," *New York Times*, 23 October 1999.
۱۳. بنی‌صدر، گفتگو.
۱۴. بنی‌صدر، گفتگو. بنی‌صدر، در دو کتاب و مقالات متعددش، درباره‌ی این

معامله‌ها نوشته است. و بر این اعتقاد هم هست که گروه انتخاباتی ریگان در واقع برای به تأخیر انداختن آزادی گروگانهای امریکایی تا بعد از انتخابات نوامبر ۱۹۸۰، با جمهوری اسلامی به توافقی محرمانه رسیده بود. برای دستیابی به دیدگاه‌های بنی‌صدر درباره‌ی «معجزه اکتبر» که در بسیاری از جزئیات مهمّ با گری‌سیک، یکی از مشاوران امنیت ملّی پرزیدنت کارتر همداستان است، ر.ک.:

Abol Hassan Banisadr, *My Turn to Speak: Iran, The Revolution and Secret Deals with the U.S.* (New York, 1991).

برای اطلاع از روایت گری‌سیک از رویدادها، ر.ک.:

Gary Sick, *The october Surprise* (New York, 1991).

۱۵. دکتر فرشته انشاء، گفتگو با نگارنده، لس آنجلس، کالیفرنیا، ۱۵ فوریه ۱۹۹۸.

۱۶. دکتر فرشته انشاء، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۲ ژوئن ۱۹۹۸.

۱۷. خلخالی، «خاطرات»، ۸ مهر ۱۳۷۱. برای دستیابی به روایتی روزنامه‌ای از دادگاه، ر.ک.: کیهان، ۱۹ فروردین ۱۳۵۸.

۱۸. خلخالی، «خاطرات»، ۸ مهر ۱۳۷۱.

۱۹. هنری پرشت، گفتگو با نگارنده، ۱۰ ژانویه ۲۰۰۰.

۲۰. چارلز ناس، گفتگو با نگارنده، ۱۱ ژانویه ۲۰۰۰.

۲۱. پیشین.

۲۲. معتضد، هویدا، ص ۱۰۴۱.

۲۳. خلخالی، «خاطرات»، ۸ مهر ۱۳۷۱، ص ۷.

۲۴. معتضد، هویدا، ۱۰۴۱.

۲۵. کیهان، ۱۹ فروردین ۱۳۵۸.

۲۶. پیشین.

۲۷. معتضد، هویدا، ص ۱۰۴۲.

۲۸. احسان نراقی، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۲ ژوئن ۱۹۹۸.

۲۹. کیهان، ۱۹ فروردین ۱۳۵۸، ص ۱.

۳۰. پیشین.

۳۱. پیشین، ص ۲.

۳۲. معتضد، هویدا، ص ۱۰۴۷.

۳۳. خلخالی، «خاطرات»، ۸ مهر ۱۳۷۱، ص ۷.

۳۴. خلخالی نه‌تنها از چند و چون شهرت خود خبر داشت، بلکه به‌آن فخر می‌کرد. ر.ک. «خاطرات»، ۹ مهر ۱۳۷۱.

۳۵. پیشین.

۳۶. هویدا در تدارک مدافعات خود در چنین دادگاهی از خانواده‌ی خود کمک

طلبیده بود. از آنها خواسته بود ارقام و آماری در زمینه‌های مختلف ـ از تعداد دانش‌آموزان دبیرستان تا جمع تولید فولاد در کشور ـ برایش فراهم کنند. خانواده‌ی هویدا هم البته ارقام و آماری را که وی خواسته بود گردآورد. امّا تلاش‌هایشان همه عبث از آب در آمد. دکتر فرشته انشاء، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۴ ژوئن ۱۹۹۸.

۳۷. کیهان، ۱۹ فروردین ۱۳۵۸.

۳۸. خلخالی، «خاطرات»، ۸ مهر ۱۳۷۱.

۳۹. کیهان، ۱۹ فروردین ۱۳۵۸.

۴۰. خلخالی، «خاطرات»، ۸ مهر ۱۳۷۱.

۴۱. خلخالی، «خاطرات»، ۹ مهر ۱۳۷۱.

۴۲. فریدون هویدا، گفتگو با نگارنده، ۱۷ ژانویه ۱۹۹۹.

۴۳. کریمی این رویداد را برای احسان نراقی تعریف کرد. احسان نراقی، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۲ ژوئن ۱۹۹۸.

۴۴. این شرح از آخرین دقایق حیات هویدا را کریمی، کسی که تیر خلاص را شلیک کرد، نقل کرده است. وی در گفتگویی با احسان نراقی درباره‌ی نقش خویش صحبت کرده است. ظاهراً یک نوار ویدیویی از این اعدام محرمانه به وسیله‌ی روزنامه‌نگاری که اکنون ساکن فرانسه است، گرفته شده است. دکتر انشاء تلاش فراوانی کرده تا نسخه‌ای از آن را خریداری کند، امّا موفق نشده است. احسان نراقی، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۳ ژوئن ۱۹۹۸. نیز، دکتر فرشته انشاء، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۴ ژوئن ۱۹۹۸.

۴۵. دکتر فرشته انشاء، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۴ ژوئن ۱۹۹۸.

46. V.S.Naipaul, *Among the Believers: An Islamic Journey*(New York:1981), 56.

۴۷. خلخالی، «خاطرات»، ۸ مهر ۱۳۷۱، ص ۶.

۴۸. برای بحثی پیرامون استفاده از "ماشین" در انقلاب فرانسه،ر.ک.به Schama, *Citizens*, 619-22.

۴۹. دکتر فرشته انشاء، گفتگو با نگارنده، لس‌آنجلس، ۱۵ فوریه ۱۹۹۸.

۵۰. دکتر فرشته انشاء، گفتگو با نگارنده پاریس، ۴ ژوئن ۱۹۹۸.

۵۱. پیشین.

۵۲. پیشین.

۵۳. پیشین.

۵۴. دکتر فرشته انشاء، گفتگو با نگارنده، لس‌آنجلس، ۱۵ فوریه ۱۹۹۸.

۵۵. هُمر، اودیسه.

۵۶. پیشین.

۵۷. دکتر فرشته انشاء، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۴ ژوئن ۱۹۹۸.

۵۸. دکتر فرشته انشاء، گفتگو.

۵۹. دکتر فرشته انشاء، گفتگو با نگارنده، ماجرای مربوط به نقش دکتر گرمان در این ماجرا از منابع دیگری هم تأیید شد.

۶۰. انشاء، گفتگو.

۶۱. خلخالی، «خاطرات»، ۸ مهر ۱۳۵۸.

۶۲. دکتر فرشته انشاء، گفتگو با نگارنده، پاریس، ۴ ژوئن ۱۹۹۸.

۶۳. دکتر فرشته انشاء، گفتگو با نگارنده، لس‌آنجلس، ۱۱ ژوئن ۱۹۹۸.

۶۴. پیشین.

65. William Shakespeare, *Romeo and Juliet, in The Collected Works of Shakespeare*, ed. David Bevington (New York, 1992), act 3, scene 1, 1000.

**کۆتایی وەرگێڕان بۆ سەرزمانی کوردی**

**٢٠١٠/٤/٢٨**

# بەرهەمەکانی خانەی وەرگێڕان (٢٠١١)

| ژ | ناوی کتێب | نووسەر | وەرگێڕ |
|---|---|---|---|
| ١ | ئۆتۆمبیلی لێکساس و درەختی زەیتون | تۆماس ل. فریدمان | بورهان عبداللە عەتار |
| ٢ | دیجلەی گرگرتوو | پیتەر باڵەکیان | رزگاری عومەر عەلی |
| ٣ | نهێنی یاری کاغەز ( چاپی دووەم ) | یۆستاین گاردەر | بەهرۆز حەسەن |
| ٤ | دایک و باوک و پەروەردەی مناڵ | هایم گینات | خەندە عەلی عەباس |
| ٥ | گریک و تەروادەییەکان | ریکس وارنەر | قادر حسێن |
| ٦ | ناودارترین هەڵەگەورەکان لە جیهاندا | نیکل بلیندل | ئەحمەد سەلام |
| ٧ | عەرەب و کورد ناکۆکی یان تەبایی؟ | دریە عەونی | سوارە قەڵادزێی |
| ٨ | هومیرۆس ئۆدیسە | داستان | حەمەکەریم عارف |
| ٩ | کێشەی ئازادیی سیاسی | د. زەکەریا ئیبراهیم | شوان ئەحمەد |
| | بەکام تاوان ئێمەتان کوشت؟ | عەبدول حەی شەماسی | مەریوان هەڵەبجەیی |
| ١١ | کۆمەڵناسی نوخبە کوشتن | عەلی رەزا قولی | شەهرام عبداللە |
| ١٢ | حەمەدۆک (بەرگی پێنجەم) | یەشار کەمال | عوسمان ئیسماعیلی |
| ١٣ | کێشەی سنووریی سینۆ – سۆڤێتی (١٩٦٢ – ١٩٧٠) | هۆمەری شیغموس | رزگاری عومەر عەلی |
| ١٤ | هەموو شتێک لەسەر پیاو | ئالان پیس و باربارا پیس | جەلال دەباغ و کاوە کۆیی |
| ١٥ | مانەوە لە باروودۆخی سەختدا | سوپای ئەمریکا | بەختیار ئەحمەد ساڵح |
| ١٦ | زریانەکان | جبران خەلیل | دڵنیا عەبدوللا |
| ١٧ | پیاوێک | ئۆریانا فالێچی | عەزیز گەردی |
| ١٨ | بنەما و لێکدانەوەی تاقیکارییە سێرۆلۆجییەکان | د. پەرویزی پاکزاد | سەیید جەلال ساڵحی |
| ١٩ | دیزاینی مەزن | ستیڤن هۆوکینگ – لیۆنارد ملۆدینۆ | حوسێن حوسێنی – کامیار سابیر |
| ٢٠ | جەجاڵ یان دژە مەسیح | فریدریش نیچە | مەسعود بابایی |
| ٢١ | KURDISTAN AND THE KURDS | کەریم سورێنی | کەریم سورێنی |
| ٢٢ | سایکۆلۆجیای دەسەڵات | سالم ئەلقەمودی | حەمەرەشید |
| ٢٣ | سەدەکانی ناوەراست | کۆمەڵێ نوسەر | هەورامان وریا قانع |
| ٢٤ | جەنگی شاراوە لە باکووری کوردستان | کرستینا کۆیڤۆنەن | د. یاسین سەردەشتیی |
| ٢٥ | پارادۆکسی نووسین | رەبیع جابر | شوان ئەحمەد |
| ٢٦ | دیزاینی مەزن | ستیڤن هۆوکینگ – لیۆنارد ملۆدینۆ | حوسێن حوسێنی – کامیار سابیر |

| ٢٧ | مەغۆل لە مێژوودا | د. فوئاد عەبدول/ موعتی ئەلسەیاد | ئیهاد جەلال |
|---|---|---|---|
| ٢٨ | رێگا | کۆرمەك مەك کارتی | ئارام رەشید |
| ٢٩ | مێژوو لە تەرازوودا | عەبدول ئەلحسەین زەرینکوب | د. قادر محەمەد حەسەن- سۆران بەهاو ئەحمەد |
| ٣٠ | توحفە نمای ئەدەبیاتی جیهانی | ٢٢،شاکاری ئەدەبی کلاسیکی جیهانی | حەمەکەریم عارف |
| ٣١ | حیکمەتی ڕۆژئاوا | بێرتراند رەسڵ | کامیل قەرەداغی |
| ٣٢ | وشەیەکی نەگوت | هانرش بول | نوری سەعید |
| ٣٣ | چارەسەر بە ناو | ئەلکسی سوفورین | ناسر سەلاحی |
| ٣٤ | دەروازەیەك بۆ میتۆدەکانی رەخنەی هاوچەرخ | د. بەسام قگوس | د. محەمەد تاتانی |
| ٣٥ | کرمانج | مەنسوور یاقووتی | عەزیز گەردی |
| ٣٦ | چەند تێکستێکی وەرگێڕاو | چەند نوسەرێك | رزبین هەردی |
| ٣٧ | کۆتایی مێژوو | فرانسیس فۆکۆیاما | ئیسماعیل کردە |
| ٣٨ | مەتەڵۆکە | عەبباسی میلانی | عبدالله حەسەن زادە |
| ٣٩ | هیگڵ و فەلسەفەی تازەگەری | د. محەمەد شێخ | دلێر میرزا |

هەشتی خاکەلێوەی ١٣٥٨(١٩٧٩) بوو. نیزیکەی شەش مانگ لە سەردەمی بەندیخانەی هووەیدا تێپەڕیبوو. حەڤدەی خەزەڵوەری ١٣٥٧(١٩٧٨)، شا بەو هیوایە کە ئەماعی وەبەر شەپۆلی ڕوولەهەستانی شۆڕش نابێ فەرمانی گرتنی هووەیدای دەرکرد. بەڵام ئەم شەپۆلە ئەماعی وەبەر نەدەدرا. زۆری پێ نەچوو کە لە بەفرانباری ١٣٥٧(١٩٧٨)دا شاو بنەماڵەی پاشایەتی لە ئێران هەڵاتن و هیوایەکی واقیعبینانەش بۆ گەڕانەوە لەگۆڕێدا نەبوو. لەکاتێکدا بەشێکی زۆر لە سامانی خۆیان و بۆ وێنە سەگەکەشیان بە فڕۆکە دەگەڵ خۆیان برد. هووەیدایان کە ماوەی سێزدە ساڵ سەرۆک وەزیری جێی متمانەی شا بوو، لە ئێران بەجێ هێشت.






٤٠٠٠دینار